پێشبار

زاهاریا ستانکۆ ساڵی ۱۹۰۲ لە بنەماڵەیەکی جوتیاری هەژاری گوندی "سالکیا" لە ناوچەی تێلێئۆرمانی باشووری رۆمانیا لەدایك بوو. خێزانەکەیان ئەوەندە هەژار بوون، کە زاهاریا بەر لەوەی خەونە خۆش و شیرینەکانی قۆناغی منداڵیی خۆی ببینێ، ناچار بوو شان بە شانی برسییەکان قۆڵ هەڵماڵێ بۆ دابینکردنی پارووە نانێك. بەو حاڵەشەوە سیویەك ساڵانە بوو کە زانکۆی ئەدەبیات و فەلسەفەی "بوخارێست"ـی تەواو کرد(۱۹۳۲) و ملی نا لە رۆژنامەنووسی. ئەوەی لە مەودای دوو جەنگە دنیاگرەکەدا لە بواری کۆمەڵایەتی و سیاسی و رۆشنبیرییەوە بابەتی نووسیبوو، دواتر لە دوو کۆمەڵەی"شان و یاڵی گاجووتەکان ۱۹٦۵" و خوێ خۆشە ۱۹٦٦ ـدا کۆی کردەوە. دواتر بلاڤۆکگەلی دیموکراتیك "ئازی"(۱۹۳۲ تا ۳۸، ۱۹۳۸ تا ٤۰) و "لۆمیا رۆمانیاسکا" (۱۹۳۷ تا ٤۰)ی دەرکرد هەتا ئەوەی لە سۆنگەی خەباتی بێ سرەوتنیدا دژی فاشیزم کەوتە بەندیخانەوە و بووە هۆی ئەوەی هەتا جەنگی دووەم تەواو بوو لە کوشتارگەی فاشیستیی "تیرگۆ ـ جیۆ"ـدا بە دیلی بژی.
لە ۲۳ی ئۆگۆستی ۱۹٤۵ـدا جارێکی دیکە لە رۆمانی "رۆمانیا لیبێرا"ـدا دەستی بە چالاکی کردەوە.
ساڵانی ۱۹٤٦ تا ۵۲ و هەروەها ۵۸ تا ٦۸ خەریکی بەڕێوەبردنی کاروباری تەلاری شانۆی نیشتمانیی بوخارێست بووە.
جگە لە کۆمەڵێك خەڵاتی حکوومیی رۆمانیا، زانکۆی ڤیەنناش لە ساڵی ۱۹۷۰ـدا لە پاداشتی بایەخی بێ ئەملاوئەولای بەرهەمەکانی و چالاکی و هەڵسووڕانی ماندوویینەناسانەی لە بواری ئەدەبیاتدا، خەڵاتی گۆتفرید فۆن هێردری داوەتێ.
یەکەم جار لە سایەی کۆمەڵە شیعرە سادەکانەوە بوو کە لە ساڵی ۱۹۲۷ـدا سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی راکێشا، ئەو بەرهەمەی زۆری نەبرد کە خەڵاتی "کۆمەڵەی نووسەرانی" بردەوە.
پاش ئەوە کۆمەڵە شیعری "سپییەکان(۱۹۳۰) و زەنگوڵە زێڕینەکان (۱۹۳۹) و سوورەدار(۱۹٤۰) و گیای سیحراوی(۱۹٤۱) و رۆژگاری دووکەڵەکان(۱۹٤٤)ـی بڵاو کردەوە کە نوێنگەی بیر و بۆچوونی سیاسی و فەلسەفی و کۆمەڵایەتیی ئەو بوون و ئەویان وەك شاعیرێکی دەربەست کردە خاوەنی پێگەیەکی تایبەت.
کە رۆمانی "پێخواسەکان" بڵاو بۆوە، وەها درەوشاوە و دەنگی دایەوە، کە ئیتر کەس لەبیری نەما ستانکۆ شاعیرە.
رۆمانی پێخواسەکان هەورەتریشقەیەك بوو. شتێکی چاوەڕواننەکراو کە لە بەرە رۆشنایی و تیشکەکەیدا هیچ شتێکی دیکە دیار نەدەما. کتێبێك کە لە ماوەی دوو ساڵدا بۆ سەر سی زمان وەرگێڕدرا.

بەو حاڵەشەوە ئەو بەسەرهاتە دەستکەوتێکی بە ڕێکەوتە کە نووسەر خۆی ئاوا باسی کردووە:

"خۆر ئاوا ببوو کە گەیشتینەوە بۆخارێست. بەڵام من سەرەڕای ئەوەی هەڵامەتێکی پیسم گرتبوو، لە برسیانیش وەخت بوو بمرم، کەچی هەر نەشچوومەوە ماڵێ. چوومە هۆڵی شانۆی نیشتمانی و لەوێ لە نووسینگەکەی خۆم بە شوێن شتێکدا گەڕام کە بکرێ بیکەمە هەوێنی نووسینی وتارێك و بینێرم بۆ گۆڤاری "کۆنتامپۆرانۆڵ" کە قەولم پێ دابوون. ڕۆژنامەکانم هەموو پشکنی کەچی هیچم دەست نەکەوت... بەو حاڵەوە دانیشتم و دەستم کرد بە نووسین... هیچی لەگەڵ نەدەکرا. دەستەوداوێنی بیرەوەرییەکانی ژیانم بووم... چەند لاپەڕەیەکم نووسی. لە دەفری نامەم نا و ناردم بۆ گۆڤارەکە. لە دووشەممەوە تا پێنج شەممە هەر چاوەڕێ بووم سەرنووسەرەکەی دنیایەك گلەیی و گازەندەم لێ بکا بەڵام هیچ باس نەبوو. ڕۆژی جومعە کە گۆڤارەکە دەرچوو، سەیرم کرد نووسراوەکەی منیان لە بری بابەتە سەرەکییەکە داناوە*."

جا بەو جۆرە بوو کە ساڵی **١٩٤٧** نووسەرێکی تازە لەدایك بوو و ساڵێك دواتر لەگەڵ چاپ و بڵاوبوونەوەی کتێبەکەدا، یەکێك لە گرینگترین ساڵڕۆژەکانی لەدایکبوون لە مێژووی ئەدەبی ڕۆمانیا و جیهاندا تۆمار کرا.

هەر لەو دانپێدانانەدا دەخوێنینەوە:

"بەهاری **٤٧** بوو کە دەستم دایە نووسینی پێخواسەکان... مانگێکی مابوو بۆ **٤٨** تەواوم کرد. هاوین و پاییزی **٤٨** هەر خەریکی پێداچوونەوە و چاکردن و کەم و زیادکردن و گۆڕینی بابەتەکانی بووم."

***

بەسەرهاتەکە، لە زمانی کەسێکەوە دەگێڕدرێتەوە و هەنگاو بە هەنگاو بە یارمەتیی ئەو وێنانەی لە ڕاستەقینەی ژیانەوە سەرچاوەیان گرتووە و بە پاڵوێنەی هەستیاری منداڵانەی دارەیی پێنج ساڵاندا تێپەڕیوە، ڕۆمانەکە بیچمی خۆی وەردەگرێ. ئەو وێنانە، وێنەی ڕاستەقینەی ژیانی ئاوایییە هەژار و نەدارەکانی دەم دانووبە لە درێژایی یەکەم دەیەکانی سەدەی بیستەمدا... هەژاری و داماوی و دەستکورتیی جوتیاران و ئەو قەڵەمبازانەی لە مێژووی میللەتێکدا لەو هەژاری و داماوییانەوە سەرچاوە دەگرێ و ئەو قەڵەمبازە ئەخلاقی و دەروونیانەی کە سەرچاوەکانیان هەر ئەو بزووتن و جووڵە مێژوویانەن، نارەزایەتی و سەرکوتکرانی نارەزایەتییەکان و ڕۆژانی پاش نارەزایەتییەکان کە خۆیان قۆناغی گۆڕانە بنەڕەتی و قووڵەکانی دیکەشن و هوکاری ڕاپەڕینەکان و ئاستی نارەزایەتییەکان، لە زۆربەی بەشەکانی ئەم کتێبەدا وەك شانۆیەکی زیندوو هەر جارە و پەیامێکی نوێ دەدرکێنن. بەشەکانی "بە چلەی زستان، خەتی باریك و قووڵ و ... دوای ئەوانیش جەنگەکانی **١٩١٢** و **١٩١٣**ـە و

---

* دانپێدانان. زاهاریا ستانکۆ. کورتکراوە لە لاپەڕە ٥ تا ٩ی ژمارە ٣١ی گۆڤاری سین تیاکێ دیسەمبەری ١٩٦٦

داگیرکرانی وڵات بەدەست ئەڵمانییەکان لە ١٩١٦ و ١٩١٧ ـدا. کوابوو تەنیا رووداو و بابەتەکانی ساڵی ١٩٠٧ نەبوون کە شوێنەواری خۆیان لە بیرگە و یادەوەریی لە ڕادەبەدەر هەستیاری داریەدا بەجێ هێشتووە.

دیارە نووسەر خۆی راستەوخۆ لەو ژیانەدا بووە و ئازار و نەهامەتی و حەز و ئارەزووەکانی ئەو ژیانەی لە ناخی دڵەوە چێشتووە بۆیە ئاوا چووەتە بنج و بناوانی ئەو ژیانە پڕ لە مەینەتییەی خەڵکەکەیەوە. هەڵبەت ئەم رۆمانە ئەگەر بدرێتە دەست ئەو فەرخە دەوڵەمەندانەوە کە لە ژیانیاندا نەبوونییان نەدیتووە و ئازارەکەیان نەچێشتووە، رەنگە هەر گاڵتەشیان بە وێناکردنی وەها ژیانێك بێ، بەڵام زۆرینەی خەڵکی کوردستانەکەی من کەم و زۆر ئەزموونی وەها ژیانێکیان هەیە. بەتایبەتی لە سەردەمی راکردن و ئاوارەیی و شەڕ و ماڵوێرانییەکاندا کە مێژوومان تژییە لەو تاڵی و سوێرییانە و هەر کەس خۆی گێل نەکا، دەکرێ بڵێین تامی تاڵییەکی هەر وا لە بنی ددانماندا ماوەتەوە. بەتایبەتی "داریە" کە رووداو و بەسەرهاتەکانی رۆمانەکە دەگێڕێتەوە، نموونەیەکە لەو بنیادەمانەی هەزار خۆزگە و ئارەزووی سەرکەوتنیان لەدڵێدایە و بە حەژمەتەوەن خەمی نان بەرۆکیان بەربدات و بتوانن ئارەزووەکانیان وەدی بێنن. داریە نوێنگەی هەوڵدان و کۆڵنەدان...

❊

بۆیە شاملووی مەزنیش کە تەرجەمەی کردووە، دەڵێ: با نهێنییەکتان پێ بڵێم:
یەکەم جار کە ئەم کتێبەم خوێندەوە لە دڵی خۆمدا گوتم: ئای خۆزگە ئەوە ژیاننامەی من بوایە.

❊❊❊

کورتی ببڕمەوە، من پێم وایە نووسینی پێشەکی باش وایە هەر ئەوەندە بێ دەستی خوێنەر بگرێ بۆ خوێندنەوەی کتێبەکە و پێویست نییە کورتەیەکی کتێبەکە لە پێشەکیدا باس بکرێ. بۆیە ناچمە نێو وردەکارییەکانی کتێبەکەوە و لەمەودوا بە ئێوەی ئازیزی دەسپێرم. هیوادارم لە خزمەتی زمان و ئەدەبی میللەتەکەمدا بەم وەرگێڕانە، دارێکم خستبێتە سەر بەردێك.

وەرگێڕ

١

بنەماڵە

*

*

*

هۆی تودۆر، دەرگاکە بکەوە.

تودۆر باوکم بوو. بەڵام بە دەگمەن لە ماڵەوە گیر دەبوو.

هەر گوێم لێ دەبوو، دەردەپەڕیمە دەرێ.

کونەدفنی[*] ئەسپەکان هاڵاوی لێ دەهاتە دەر و شانوشەپیلکە بریقەدارەکەیان دووکەڵی لێ هەڵدەستا. یەکسمەکان، زەنگوڵەی ملیان دەزرینگاندەوە و یاڵی شانەکراو و هۆنراوەیان، کە بە قەیتانی زەرد و سوور و پیرۆزەیی گرێ درابوو، رادەوەشاند.

عارەبانەکە دەهاتە حەوشە.

سەروسەکتی پوورە ئۆتزۆپاری لووت زلی لەخۆبایی، کە لە تەرکی عارەبانەکە دانیشتبوو، دەردەکەوت. بە دەستێکی رەشمەیەك و بەویتری قەمچییەکی پێ بوو. دەموچاویشی ـــ کە لە لووتی بەدەر هیچی دیکەی پێوە دیار نەبوو،ـــ لە خەرمانەی گوڵە زلە پوولەکەدۆزییەکانی گرتبوو. دیتزای کچیشی، لە قوونی عارەبانەکە هەتا نێوقەدی لە یۆنجەکە رۆچووبوو.

دایکم بەهاتنی قەوم و قیلە شاگەشکە دەبوو، چونکە ئیتر دەیتوانی دانیشێ تا چەنەی شل دەبێ قسان بکا. دایکە داماوەکەم لەو ئاوایییەدا غەوارە بوو و، لە هەموو گەڕەکەکە دەستەخوشکێکی دڵسۆزی نەبوو.

باوکم، مێردی دووەمی بوو.

مێردی یەکەمی، ئەودەم کە هێشتا دایکم نەببووە پانزە ساڵان، لە ماڵە باپیرەمی هەڵگرتبوو و سێ فەرسەخ لە سەرووی رووباری کالماتزۆیی، بردبوویە ستانیکۆتز، ئەو شوێنەی کۆچەرە سربیاییەکانی لێ دەژیان.

دایکم هەر جارێکی کۆنەمێردەکەی بیر دەکەوتەوە، وەك ژەهری ماری لێ دەهات و دڵی توند دەبوو و، ئەگەر بابیشم لە ماڵی نەبایە، چەمەریی دەگێڕا ، ئێمە منداڵەکانیش وازمان لێ دێنا.

*

---

[*] دفن/ تفن: کونەلووت بەتایبەتی کونەلووتی چارەوێ و ئاژەڵ

*

*

ئەم رادۆ ئۆكیانە، كابرایەكی ناشیرینی ملهوڕ بووە، وای دانیٚ، ئەوەندە تەمبەڵ و تەوەزەلیش بووە، كە تین و گوڕ و قەڵافەتەكەی بایی تڕێك نەبووە. دایكم دوو منداڵی لێی هەبوو. یەكێكیان ئێڤانگلینی خوشكم و ئەوی دیكەش ئیۆنی برام.

رادۆ هێند لەپڕ سەری نایەوە، دەتگوت تیری نەبەدیی* ویٚ كەوت و، دایكە داماوەكەمی لە تەمەنی حەڤدە ساڵاندا بە دوو هەتیوەوە بە بێوەژنی بەجیٚ هێشت. سێربیاییە كۆچەرییەكان، یارمەتییان دا مێردەكەی بنێژیٚ و، پرسەشی بۆ دابنیٚ. دوای ئەوە دەرگای ماڵەكەی گاڵە دا و، منداڵی بەكۆڵی خۆیدا دا و، هاتەوە ماڵی داپیرەم.

ـ دەی دەی... یانی بێوەژن كەوتیەوە ماری!

ـ ئەدی دایە.

ـ ئەوجار بەو منداڵانەوە ملی رێیەت گرتووە و هاتووی سەرودڵی من بگری؟

ـ ئەی چووبامە كویٚ؟

ـ دەبوو قوون بدەیە سەر دەرپێكەت و لە ماڵەكەی خۆتدا دانیشی.

ـ لە ماڵەكەم؟ جا خۆ لەویٚ قوزەڵقورتیشم نەبو بیخۆم. تا دار و نەدارمانی لەسەر خواردنەوە دانەنا، نەمرد. هەر گاجووتەكانم بەدەستەوە ماوە و داومن بە تۆنیی برام بیانفرۆشیٚ و پارەكەیم بۆ بێنێتەوە.

داپیرە سیٚ كوڕی هەیە و كچێكی تاقانە، كە ئەو دایكەی ئێمەیە.

كوڕەكانی هەر سێكیان لە دایكم گەورەترن. تۆنیٚ و لیساندەریٚ زۆر زوو، هەر بستێك منداڵ بون، كە رۆیبوون و هەر كام ببوونە نۆكەری ئاغایەك و پاش چەند ساڵان و بە هەزار كوێرەوەری تۆزە دراوێكیان كۆ كردبۆوە و هێنابوویانەوە و لە ئۆمینا نیشتەجیٚ ببوون، كە گوندێكی گەورەیە و وێستگەی شەمەندەفەر و ئیدارەی پۆستەی هەیە و رەوەیەكیش یۆنانیی لێیە كە بازرگانی دانەوێڵەن. لە دەم شارێیەكەوە زەوییان كڕی و خانوویان دروست كرد و دەستیان كرد بە كڕین و فرۆشتن. هەردووكیان كچە شارییان هێنابوو و، ماڵ و منداڵیان پێكەوە نابوو.

داپیرە لە دایكمی هەڵكێلا دیسان مێرد بكاتەوە. چاوی بەرایی نەدەدا ببینیٚ ماڵەكەی قەرەباڵغە. خواخوای بوو هەر خۆی و جگەرگۆشە خۆشەویستەكەی پێكەوە بن. تاقە كوڕەكەی، كە گیانی بۆی دەردەچوو. پێدەچوو كاكە دۆمیتراكیٚ، لەبەر ئەوە توانیبووی وا سواری ملی داپیرە بیٚ، چونكە ناساغ و تۆزێكیش گێلۆكە بوو. داپیرە

---

* نەبەدی: بەدینەكراو. نادیار. تیری نادیار. تیری غەیبی.

بوونەوەرێکی لەودا بەدی دەکرد، کە بە رواڵەت نەبێ، هیچی لە بنیادەم نەدەچوو. بنیادەمێکی سەرشێت، کە بەردەوام دەستی بەداوێنی دایکییەوە بوو و، بێ پرسیار، بەگوێی دەکرد:

"دۆمیتراکێ، ژوورەکە گسك بدە.

دۆمیتراکێ، دەستی دەدا گسك و لە سەد کابان باشتر ژوورەکەی دەماڵی.

ـ دۆمیتڕاکێ،، بچۆ گەزگەزك بێنە و جوان بیهاڕە و کەپەکی پێوە بکە و بیکە پڕپۆڵە و بیدە بە مراوییەکان.

دۆمیتڕاکێ، دەچووە قوڵکەکەی ئەوسەری حەوشەکەیانەوە و، قەرتاڵەیەکی پڕ گەزگەزك هەڵدەقەند و، وەك پێی گوترابوو، دەیکردە پڕپۆڵە و دەی دا بە مراوییەکان.

ـ دۆمیتراکێ ئەمشەو لە جێی خۆت ناجووڵێی!

ـ بەچاوان دایە.

ـ دۆمیتراکێ ئەمڕۆ دەبێ بچیتە هەڵپەڕکێی هۆرا.

ـ بەچاوان دایکە.

ـ دەبێ هەڵێشپەڕی ها دۆمیتراکێ.

ـ بەچاوان دایکە.

ـ دەبێ باش هەڵپەڕی دۆمیتڕاکێ، وابێ هەمووان سەیرت بکەن و بارەکەڵات پێ بڵێن.

ـ بەچاوان دایە، قیت هەڵدەپەڕم.

ـ کە "هۆرا"ش تەواو بوو، لەگەڵ کچۆڵان دەچیتە سەر گردێ.

ـ بەو مەرجەی ئەوانیش حەزیان لێ بێ.

ـ بۆ دەبێ حەزیان لێ نەبێ؟

ـ ئاخر چونکە من زۆر لەبەردڵان نیم دایکە.

ـ دەبێ دڵیان بڕفێنی، تێگەیشتی؟ لای ژنان تۆزێك غیرەت بدە بەرخۆت دۆمیتراکێ.

ـ هەوڵ دەدەم دایکە.

ـ هەوڵ بدە، کوڕم، بۆ نادەی؟ ئەلحەمیلا [*] نە کوێری، نە نقوستانی، نە کووڕی.

ـ مەسەلە ئەوە نییە...

---

[*] دەربڕینێکی کوردانەی ئەلحەمدولیللایە....

خاڵە دۆمیتراکێ، کە هەر خۆی بەبەزەیی و دڵێکی نەرمونیانی هەبوو، بە جەستە و گیان چووبۆوە سەر باپیرەم. کوڕەکانی دیکەی، کە ئاوا تووڕەوتۆسن و تۆزێکیش بێبەزەیی بوون، هەر دەتگوت داپیرەم تڕیوە و ئەوان دەرپەڕیون.

داپیرەم دەموچاوێکی چوارگۆشە و ڕەقەڵەی هەبوو و، دەنگیشی ڕەق و وشك وەك بەرد. بەردەوام وابکە و وامەکەی بوو. بە ڕەچەڵەك دەچۆوە سەر تورکێك، کە لەسەر مەسەلەی ئەشق و دڵداری لە دینی خۆی وەرگەڕابوو. چاوە بادامییەکانی داپیرەم تۆزێك خێل بوون و، نەرمەی گوێچکەی تەواو تێك چووبوو. هەر دەتگوت بە مقەست ئاوا شەقارشەقارت کردوون.

ـ ئەوە کێ مقەستی لە گوێچکەی داپیرەم داوە؟

ـ هیچ کەس. ئیکۆشاری وای لێ کردوون.

یەکەم جار کە ئەو ناوەم بیست، لە دڵی خۆمدا گوتم، دەبێ ئیکۆشاریەکان دەستەیەك دێوەزمە بن، کە بە مقەستێکەوە بێرە و ئەوێدا دەگەڕێن و، چێژ لەوە وەردەگرن، لەچکی سەری پیرەژنان بگرن و، ڕایانکێشن و، گوێچکەیان هەڵبڕدابڕ بکەن.

یەکشەممان داپیرەم یان بۆ هۆرا، یان بۆ زەماوەند، یان بۆ ڕێوڕەسمی لەئاوهەڵکێشان(غوسڵی تەعمید)، پڵپڵە و گێلگێلەی بەخۆوە هەڵدەواسین و، تاسکڵاوە تۆڕدارەکەشی لەسەر دەنا، کە لە جێی پوولەکە و نەخشی دەستچن، پوولی قورس قورسی ئاڵتوونی لێ دوریبوو و، کە بە لەنجەولارەوە خۆی بادەدا و دەهاتە بەزمی هۆرا، پوول وێك دەکەوتن و خرینگە و زرینگەیان دەهات.

هەر گوێچکەی حەوت ئیکۆشاری ــ یانی حەوت پوول، کە بە داوێکی هەوریشمینییەوە دەکردن ــ تێ دەکرد، کە شۆڕ دەبوونەوە و دەگەیشتنە سەر شانی. ئەو ئیکۆشارییانە، کە زێڕی بێخەوش بوون، زۆر قورس بوون. هەر بۆیە ئەو کونەی، کە بە میلێکی سوورەوەکراو لە نەرمەی گوێی کردبوو، لەبەر قورسیی ئەوان گەورە دەبۆوە و وای لێ دەهات هەڵدەدڕا. ئیتر داپیرە، کە قەت ئامادە نەبوو واز لەو گوارە زل زلانە بێنێ، ناچار لە سەرووی کونەهەڵدڕاوەکەوە، کونێکی دیکەی لە گوێی دەکرد و، گوارەکەی دەگواستەوە ئەوێ، هەتا ئەویش وردە وردە بە دەردی کونەکەی پێشە خۆی دەچوو و، جێی خۆی دەدا کونی پاشەخۆی. تا وای لێ هات، گوێچکەی داپیرەم هەڵدڕدادڕ بوون.

کورتی بڕمەوە، داپیرەم مێردی کرد و، هێشتا کاغەزی گرێبەستی زەماوەندەکەی وشك نەببۆوە، منداڵ لە دوای منداڵ خستییەوە و گەورەی کردن. لە پێشدا، ماوەیەك هەر وەك جاری جاران، تاسکڵاوەکەی لەسەر دەنا. دوایی بەلایەوە نا و خستیە سندووقەکەیەوە و، تەنانەت ئیتر ئیکۆشارییەکانیشی لە گوێی نەکرد. یەکەم جا هەر جارە و

یەکیانی  بردە لای سەرافەکانی شار و، فرۆشتنی و، زۆری نەبرد ناچار بوو لیرە ئالّتوونەکانی تاسکلاّوەکەشی لیّ بکاتەوە و، پوولّی زیو و وردە پوولّی مسیان لە جێی بدا. دوو لیرەی زێڕی مابوو، ئەوانیشی وەك جیاز دا بە دایکم، کە هێشتا ماونی، لە قوتووەکەی تەرکی بنی سندووقەکەدا شاردوونیەوە. دایکم زۆری حەز لیّ بوو لیرەکان بدا بە کچەکانی خۆی، بۆ ئەوەی بەخۆیانیەوە بکەن. بەلاّم دەسەلاّت چییە؟ کەم و زۆر دوو لیرە و، پێنج کچ، کە لەسەر یەك دە گوێچکەیان هەیە. جا وەرە و بە ئینسافەوە دابەشی بکە.

لەگەلّ ئەوەشدا دایکم، راناوەستیّ و گوێی هەموو کچەکان کون دەکا. وای دانیّ، ئیتر ئەو کونانە فش نابنەوە و، گوێچکەیان وەك گوێی داپیرەم لە کەلك و کار ناکەویّ. خوشکەکانی من، لە بری ئیکۆشاریی زێڕ، کە بریسکەیان بیّ و خرینگەخرینگ دەنگیان بیّ، نقێمی بچووکی شووشەی رەنگاوڕەنگ لە گویّ دەکەن.

گوارەکانی دایکم بچووك و خڕن، وەك تاکشایی.

ـ دایکە، گوارەکانت زێڕن؟

ـ مسن، دایکە.

جا نقێمی شووشە و پوولی مس، چۆن نەرمەی گوێی بنیادەم هەلّدەدڕن؟

*

*

*

رووداوەکەی داوود، زۆر لەوەپێش، تەنانەت پێش مەسەلەی زاڤێرایش (شۆڕشی ١٨١٢ی یۆنانییەکان، بە پشتیوانیی رووسییەکان دژی زۆر و زەبری تورکان) قەومابوو.

ئەودەم، تودۆر ڤلادیمیرێسکۆیش راپەڕیبوو و، هەموو کەلّەپیاو و شەڕکەرەکانی بانگهێشت کردبوو لە بن ئالاّکەی ئەودا چەك هەلّگرن، بۆ ئەوەی حکوومەتی داگیرکەران بڕووخێنن و، پێستی ئەو بێدینانەی ولاّتەکەیانیان داگیر کردبوو و خوێنی خەلّکیان دەمژی، کەولّ بکەن و دەریان پەڕێنن.

پیرەکان دەگێڕنەوە، کە گوندەکان ـ واتە ئەو چەند کون و کاژێرەی بەناوی کووخ هەر وا لە عەرزیدا هەلّیانکۆلّیبوون ـ هەلّچوون و هەستان. جووتیار، کە بەسەر پشتی ئەسپەوە سروودە پالّەوانییە کۆنەکانیان کردبووە وێردی سەر زار و زمانیان، لە بن ئالاّی شۆڕشەکەدا کۆ بوونەوە. ترس و سام، کەوتە دلّی نەجیبزادەکان. ئەوانی زەوی و زار و کۆیلە و غولاّم و ئیجارەگر و رۆژکار و نیوەکاریان پتر بوو، ترس و لەزرەکەیان زیاتر بوو. کەسوکارەکەی ئێمە زۆربەیان لای شۆڕشیان گرت و، تێیدا بەشدار بوون، کە ئێستاش ناوی زاڤێرا هەر ماوە و، توخم و تۆرەمەکەی ئێستاش بەو ناوەوە دەنازن:

ئێلیێ زاڤێرا ستۆییکا زاڤێرا، کۆسیتا زاڤێرا و زۆری تر...

نەجیمزادە و دەرەبەگ، هانایان بردە بەر چەکدارە تورکەکان کە لە باشوور بوون و، ئەوانیش کە هەمیشە بۆ تالآن و برۆ لەسەر هەست و لەسەر پێ بوون ، شمشێریان لە کالان دەرکێشا: تودۆر ڤلادیمیرێسکۆیان پەت کرد و، لەتوپەتیان کرد. شۆڕشگێڕە راپەڕیوەکان لێك بلآو بوون و چوونەوە کون و کاژێری خۆیان.

پاش مەرگی تودۆر، دەرەبەگ، هار بوون و ئەوەندەی دیکە زۆریان بۆ رەشایی هێنا. تورك، تورك بوون و، دەرەبەگیش دەرەبەگ. هەرچۆنێك بێ، گورگ زگی یەکتر نادڕن. بەلآم بیرەوەریی شۆڕشەکە هەروا لە زەینی خەلکیدا مایەوە و، زار بە زار و نەوە بە نەوە بەسەرهاتەکەی زیندوو راگیرا. گۆرانی و بەیتەکانیش مانەوە. ئەو بەیتانەی ئێستاش خەلك دەیانلێنەوە و بۆ یەکتری دەستێننەوە.

پوورە ئۆتزۆپار، بە زارە نیوەقووچاوەکەی، زۆر لە سەرخۆ، وەك بلێی بترسێ نەکا لە پشت پەنجەرەوە و لە کۆلآنێ گوێیان لە دەنگی بێ، دەلۆژێتەوە:

ـ لە هەموو جێ

گاسن زگی زەوی دەدڕێ

تەنیا گاسنەکەی من نەبی

کە هەر دەلێی خوا وای ویستووە

کە بەوجۆرە

کڕ بکەوێ و

بوورە و بەیاران نەکێلێ

بەلآم ئەو رۆژە هەر دادێ

کە خوا بانگی بکا و

بلێ:

"هۆۆۆ، نۆرەتە

هەستە و دەمت ئاوەزەرد بکە

ئەگەرچی زۆر

لە رەوەز و بەردی خاراش سەختترە

ئەو سینگ و دلەی پڕ لە رق و قینی ئەوان

شەقار شەقار

تۆ دەتوانی بیانکێڵی

سینگی لە بەرد ڕەقتری بەگ و ئاغا

شەقاری چۆن، سوور

شەقاری شۆن، باریك

شەقاری چۆن، قووڵ

شەقاری چۆن، تاریك

شەقاری چۆن، کە ناسۆری هەر بمێنێ

تا هەتایە،

کە من دەمی ئەو گاسنەم

لە دووخی کۆنە شیرێك چێ کردووە

کە من ئەو گاسنەم یەکسەر

هەر بە ئانقەست وەك داری عارەبانەی تۆپ

لەو شێوەیە داتاشیوە،

ئیتر لەوەودوا ئەتوانم

خۆڵ بکەمە گلێنەی چاوی برسیی بەگ و ئاغا

شاد و دڵخۆش زەوی و زاری خۆم بکێڵم

شاد و دڵخۆش زەوی و زاری خۆم بچێنم

*

پوورە ئۆتزۆپار دەلەرزێ و من هەرچی دەکەم و دەکرێنم بزانم بۆ! بەڵام سەری لێ دەرناکەم. یانی چونکە ئەوانە هیی زۆر زۆر لەمێژینەن؟

بەیتەکە تەواو بووە، یان چونکە پوورە گیانم باقیەکەی لەبیر نەماوە، بە نیوەچڵی وازی لێ هێناوە؟... هەرچۆنێك بێ، تاوێك بێدەنگ دەبێ. ئەوجار چڵمی هەڵدەلووشێ و قووتی دەدا و دەست پێدەکات:

ـ باشتر ژیان... بەڵێ، خۆ دیارە. ئێمەش هەروا. ئەوە شتێکە، کە ئێمەی ئادەمیزاد تا هەین بە ئاواتیەوەین، هەر ناشیگەینێ. هەر خواپێداو و نەجیمزادەکان باش دەژین. خەڵکیش خۆ زەمانیان مووی لێ هاتووە و، سواریشیان بن دەنگێ ناکەن. بەڵام پێیان وایە ئاخریەکەی تودۆر ڤلادیمیرێسکۆیەکی دیکە ـــ لەوانەشە بەناوی دی ـــ لە دایك

دەبێ. لەوانەیە یەکیش نا و چەندین و چەندان... جا ئەودەم دیسان گوندی، کە یان لەدارن یان لە خوارن* و هەمیشە بۆ پشێوی و یاخیگەری لەسەر پێن، کۆ دەکاتەوە و بە زەبری چەقۆ و تیر و ئاگر، پێستی سەری دەربەگی ماڵپەرست هەڵدەکەنن. کوڕە سەیر بکە من دیسان چەنەم گەرمدا هات و دەستم کردە چەنەوەڕی... ئەوە نیشانەی ئەوەیە خەریکە پیر دەبم.

دایکە لێی دەپرسێ: ـ حەزت لە پیری نییە؟

ـ کێ حەزی لێیە پیر بی؟ بەڵام ئاوایە ئیدی، چیی لەگەڵ ناکرێ. بنیادەم بیەوێ و نەیەوێ پیری هەر دێ و... پاش پیربوونیش...

❊

❊

❊

دەستەی سەربازە تورکەکان زۆربەی جاران، شەوانە بە مەبەستی تالآن و بڕۆ، لە قەلآکانی خۆیانەوە لە تۆرنۆوە بە سواری، دادەگەڕان و بەسەر ناوچەکانی ئێمەیاندا دەدا. زیاتر، پێشنیوەڕۆیانی یەکشەممەیان بۆ ئەو کارە دیاری دەکرد، چونکە لەو دەموساتانەدا، زیاتر خەڵك لە کلێسە بوون و، لە ناخافڵدا بەسەریان وەردەبوون و، ئەگەر بۆ بەرگری لەسەرڕێ نەبوایەن، ئەوا وەك مشك بە تەڵەوە دەبوون و، هەموو دەدرانە بەر دووخی شمشێر. تالآنچییەکان، کچۆڵە و ژنە گەنجەکانیان لە تەرکی ئەسپەکانیان توند دەکرد و وەك کۆیلە دەیانبردنە ئەوبەری دانووب.

داوود، سەرگەورەی ئەو تالآنچییەکانی عوسمانلی بوو.

جارێکیان لە رۆژی جێژنی "پاك"ـدا بوو، کە گوندەکەیان گەمارۆ دا.

لە شیناوەردەکەی دەم هەسێڵی کەرێزەدا، هەڵپەڕکێیەکی خۆش رێك خرابوو. کوڕان و ئەو منداڵانەی گورجتر بوون، رایان کرد و توانیان خۆیان لە نێو گژ و گیا و دەوەنە چڕەکاندا وەشێرن. کچۆڵەکان، کە داوێنە درێژەکانیان لە قاچ و قولیان دەئالآ و نەیدەهێشت را بکەن، خۆیان دەخستە کەرێزەکانەوە و خۆیان دەخنکاند. کچێك نەبێ، لە سەر زارکە چێویەکەی بیرەکە راوەستا و هەر گوێشی نەدایە ئەو دڕندانە...

تورکە جامانە و مەندیل بەسەرەکان بە سمێڵی ئەستوور و بادراو و ردێنی زۆرەوە و بە سواری ئەسپ دەوریان دا. شمشێرە تیژ و هەڵکێشراوەکانیان لەبەر تیشکی هەتاوی "پاك"ـدا دەدرەوشانەوە.

* لێرەدا واتە یان دەنگ ناکەن و کڕ دەبن، یان دنیا وێران دەکەن. ئیدیۆمە.

زارینکا، بەبێ هیچ ترس و دڵەڕاوکێیەك سەیری تاڵانچییەکانی دەکرد و، لە حاڵێکدا ئەو چڵە گوڵەی لە دوودڕکەکەی لێ کردبۆوە، هەر وا لە نێوان ددانیدا بوو.

یەکێك لە تورکەکان ـ نەپیر و نە زۆریش گەنج ـــ کە سمێڵی درێژ و ردێنێکی رەش و جوانی هەبوو، لە دەستەکە جوێ بۆوە و هاتە پێشەوە:

ـ ئەو کچانە بۆچی خۆیان لەو بیرانە هاویشت؟

ـ بۆ ئەوەی نەکەونە بەر چنگی ئێوە، کوڕانی عوسمان! بۆ ئەوەی کۆیلە نەکرێن و بە زۆر سەرجێیان نەکەن.

ئەودەم تورك، کچ و ژنە گەنجەکانیان بە دیل دەگرت، لە پێشدا بێ ئابڕوویان دەکردن و دواییش دەیانبردە شوێنێکی زۆر دوور لە کەنارەکانی دەریای سوور و، وەك ئاژەڵ بە عارەب و قولە زەنگییەکانیان دەفرۆشتنەوە.

ـ ئەی تۆ بۆچی خۆت لە بیر نەهاویشت؟

ـ جا خۆ من لێتان ناترسم.

ئەو بێدینانە، کە بەو قسەیە هەڵبەزیبوونەوە، تاوێك بە زمانە چەپەڵەکەی خۆیان سرتوخورتیان کرد. دوایی تورکە سمێڵ درێژەکە، رووی لە زارینکا کرد و گوتی:

ـ داوود منم. دەتزانی؟

ـ داوود تاڵانچیی؟... نا، بەڵام ئەوە زانیم.

هەروا بێ ترس گەمەی بە لقە گوڵە دوودڕکەکە دەکرد، کە ئێستا خەریك بوو پەلکی گوڵەکانی لە نێو پەنجەکانیدا دەسوی.

ـ ئێستایش ناترسی؟

ـ خۆ دەمبینی، نەخێر.

زارینکا، کەڵەگەت و تیشکەڵە بوو. وەك حەیزەران. چاوی وەك گیای دەشتێ کەسك دەچوونەوە. داوود پڕی دایە و لە سەر خوانی زینی دانا و پیاوە جامانە و مەندیل بەسەرەکان، ئەسپەکانیان بەرەو دانوب تاو دا.

گوندەکە، بۆ کچە خنکاوەکان تازییەی داگرت. پیاوان سەری کەرێزەکەیان داپۆشی و بە یادی هەموان، خاچێکیان لەسەر چەقاند.

خاچی لە داربەڕوو، کە ئەو هەمووە بارانەی بەسەردا هاتووە، هێشتایش هەر لەسەر پێیە.

ئەو کچۆڵەیە چیی کرد، کە توانیی رۆحی داوود گیرۆدەی خۆی بکا؟ ـ هیچ کەس ئەو مەتەڵۆکەی هەڵنەهێنا: پاییزیساڵی دواتر، بەر لەوەی یەکەم بەفر عەرز بگرێ، سێ عارەبانەی گەورە، کە هەر کامەیان سێ گا دەیانکێشان و پڕ بوون لە کەلوپەل و جیاز، گەیشتە سێکارا. داوود دەرپێ فشە تورکییەکەی و کڵاوە

گوڵینگدارەکەی بەلاوە نابوو و، جلوبەرگی لای ئێمەی لەبەر کردبوو. لە دینەکەی خۆیشی وەرگەڕابوو. زەوی و زارێکی زۆری کڕی و خانووبەرەی لێ ساز کرد و، بوو بە بەگ. گۆزەی پڕ لە لیرەی زێڕ زۆر هەبوو. گوندی ماوەیەك لێی سڵەمینەوە و پارێزیان کرد، بەڵام دوایی وردە وردە لەگەڵی راهاتن و ئاخرییەکەشی وەك خۆمانەیەك سەیریان کرد.

زارینکا زۆر منداڵی لێکەوتنەوە. خەڵکی چوار پێنج گوندی ئەم دەوروبەرە، توخم و تۆرەمەی ئەوانن. ئێستایش لێرەو لەوێ داوودزادەیەکت هەر تووش دەبێ، ئەویش لە هەموو جۆرە پیشەیەك: وەرزێر، چێودار، بازرگان، مەلا، پیشەگەر، کۆلکەخوێندەوار و تەنانەت ئۆسقۆفیش... بۆ ئەوەی لێکیش نەگۆڕێن، زۆربەیان ناوی خۆیانیان گۆڕیوە.

❊

❊

❊

پوورە ئۆتزۆپار هەروا چەنەی گەرمە... ئێمە بێهەست و خوست چاومان لە زاری بڕیوە.

دایکە لە ژووریّ چووەتە دەریّ، لە راڕەوەکەدا، کە ئاگرەکەش لەوێ کراوەتەوە، بە خۆشیی میوانان، خەریکە خواردنە تایبەتەکانی "ساڵێ رۆژێك" لێ دەنێ.

ڤانکۆ ناوێك، لە گوندییەکانی پارێزگای کۆتز، بە عارەبانەکەیەوە بە کۆڵانێدا رادەبرێ:

ـ وەرە ماسی، ماسیی تازە.

دایکم ماسییەك دەکڕێ. پوولەکەی لێ دەکاتەوە و مەنجەڵێك پڕ دەکا لە ئاو و لەسەر ئاگرەکەی دادەنێ و بیبەرێکی زۆری تێدەکا. پوولەکەی ماسیەکە، لە وردە پووڵی زیو دەچن. پشیلەکە دەموقەپۆزی لە دڵ و ریخۆڵەی ماسیەکە ناوە. دایکم لە حەوشە، لە پشت عەمبارەکەوە، کەڵەشێرێك دەگرێ. سەربڕینی کەڵەشێرەکە، دەستی براکەم ماچ دەکا... بۆ نیوەڕۆ کەڵەشێری سوورەوەکراومان هەیە. بەڵام چما دەکرێ لەگەڵ پوورە ئۆتزۆپار لەسەر سفرەیەك دانیشی؟ ... ئیتر، ئەگەر بتەوێ دەتوانی. هەروەك ئێستا وا هەمووان لەگەڵی لەسەر سفرەیەکن و خەریکن نان دەخۆن.

پوورە ئۆتزۆپار ددانی دەڵێی کەڵبەی ئەسپن، کۆلکەیان کەسك و رەش و زەرد هەڵگەڕاوە. وەك نەدی و بدی دۆغەواکە هەڵدەقوڕێنێ. ماسییەکە بەدەست هەڵدەگرێ و بە پەنجە لێکی دەکاتەوە و گۆشتەکەی حەپەلووش دەکا و ئیسك و داسووەکانی بە ریز لەسەر سفرەکە و لەبەردەمی خۆی دادەنێ.

ددانی دیتزای پوورم، ورد وردن، دەڵێی ددانی مشکن. لێوی سەرەوەی کەتە، یانی خەندەلێوە.

ـ پووریَ گیانمان، دیتزای هەم بە خەندەلێوی بووە و هەمیش بە کائیتزاوە.

ـ کائیتزا ؟ کائیتزا چییە؟

ـ جۆرە ئارەقچنێکی چەرمییە، کە وەختێك منداڵ لەدایك دەبن، بەسەریانەوەیە. ئیی دیتزا، مامانەکەی لەسەری لابرد و خستیە سەر کڵی ئاگرەکە. کائیتزا لەسەر ئاگرەکە هەڵدەقرچا و هەڵدەبەزییەوە. وەك گیانلەبەرێك. پەلەقاژەی و نووزەنووزێکی بوو، دەتگوت منداڵە. لە سەر ئاگرەکە بای کرد و ئیتر سووتا و بوو بە خۆڵەمێش... دەزانی؟ ئەگەر یەکێك لە کاتی لەدایکبوونیدا کائیتزای بەسەرەوە بێ، پاش مردنەکەی رۆحی دێتەوە سەر دنیا. دیتزاش کە بمرێ، وەك رۆحاناتی لێ دێ. جا ئەودەم شەوانە بە تاریکی دێ بەرۆکی ئێمە کە خزم و کەسی ئەوین، دەگرێ و خوێنمان دەمژێ.

ـ مەرج دەکەم دیتزا نامرێ.

ـ کێ دەڵێ؟ ئەویش رۆژێك هەر دەمرێ.... یانی... مەبەستم ئەوەیە، هەموومان گیای مردنین.

ـ کەواتە، وەختێك دەمرێ، کەسمان نەمابین.

ـ لەوانەشە پێش ئێمە بمرێ. بەڵام کە مرد، شیشێکی چنینی لە دڵی رۆدەکەین. ئەودەم ئیتر ناتوانێ وەك رۆح بگەڕێتەوە.

ـ جا ئەگەر ئەوە چارەیەتی، بۆ هەر ئێستا وای لێ نەکەین؟

دادە ئێڤانگلین دەستی لەسەر دڵی دانا و دایە قاقای پێکەنین.

ـ نا، نا، پاش ئەوەی کە مرد.

رقی ئەو دنیایەم لە شتخواردنی پوورە ئۆتزۆپارە. کە ئەو ئێسکە ماسییانە لە سەر سفرەکە ریز دەکا، دڵم تێکەڵ دێ... هەڵدەستم دەچمە دەرێ، لە راڕەوەکەدا باقی نانەکەم دەخۆم. لە تەنیشت کوانووەکە.

دیتزاشم زۆر لە دایکی خۆشتر ناوێ: ئاشەکە بە درزەکەی لێویدا فیچقە دەکاتە دەرەوە و بەسەر چەناگەیدا دەچۆڕێتەوە...

پاش نانی نیوەڕۆیە خۆ شارۆکێی لەگەڵ دەکەین.

دیتزا سمتی پانن و رانی دەڵێی کۆلکەی دارن. مەمکی قورس و شۆڕن و شل شل. ئامبازی کۆڵی دەبم و بە حەژمەتەوە خۆم بە ملیەوە هەڵدەواسم و پاژنەم لە قوولکەی قەدی دەچەقێنم و توند مەمکی دەگوشم. دەلوورێنێ و دەموچاوە پان و داتەپیوەکەی و لێوە کەتەکەی بەرەولام وەردەسووڕێنێ. خۆم لە کۆڵی فڕێ دەدەمە خوارێ و بە هەر دوودەستم چاوم دەگرم بۆ ئەوەی ئیتر نەیبینم و، خۆم لە پشت دەرگاکە دەشارمەوە.

ـ کوا، کوا؟...

تەپوتۆز تا بن میچەکە هەستاوە. دایکم فڕێمان دەداتە دەرێ.

ـ ئەی هاوار لە دەستتان... واز بێنن دەی... یالاّ بۆ دەرەوە، پێستی سەرتان بە لەعنەت بێ. خۆ مێشکیان خواردین.

پێستی سەر بەلەعنەتبوەکان دەردەپەڕنە دەرێ. چەندەم حەز لێیە منیش راکەمە دەرێ. بەلاّم پێلاّوم نییە. لەسەر تەختەکە و لە دەوروبەری سندووقە دارینەکە، بۆ خۆم گەمە دروست دەکەم.

پوورە ئۆتزۆپار خەریکە لەگەڵ دایکم سرتوخورتێتی.

پوورە ئۆتزۆپار دراوسێیەکی هەیە، کابرایەکە بەناوی مارینا‌کێ پیێلێ، کە لەگەڵی دەژی. باوکی دیتزاش هەر ئەوە. ئەو لێوە کەتەی ئەمیش، سزای گوناحی ئەوانە.

مارینا کە شەوانە بەسەر پەرژین و چەپەرەکەدا فەردە ئارد و گەنمەشامی بۆ پوورە ئۆتزۆپار هەڵدەداتە حەوشەوە و، لەچکی پەشمین و دەسرۆکەی هەوریشمین و قاپقاپەی چەرمینی بۆ دەکڕێ. بەردەوام لە شارییەوە دیاریی بۆ دێنێ. هەوڵ دەدا کوڕێژگەیەکی گوندی ئۆلۆگی هەڵخەڵەتێنێ و، دیتزای بەستۆدا ببڕێ. کوڕێژگەیەکی لاڵە، بەلاّم لەوەی بترازێ، پیاوێکە وەك باقی پیاوانی دی. پیێلێ جیازێکی زۆریش دەخاتە گەڵ کچەکەی: مێگەلە مەڕێك. کار دەکەن و ماڵ و حاڵێکی باش پێکەوە دەنێن. لەوانەیە منداڵێکی زۆریشیان لێ بکەوێتەوە. هەندێکیان خەندەلێو و هەندێکیشیان ئاسایی. دنیا پڕە لە هەموو جۆرە بنیادەمێك. خۆ خەڵك هەموویان جوانکلیە و جوانچاك نین. داری وا دەبینی بەرز و راست و پڕ لك و پۆو چرە، داریش هەیە کورت و پڕ گرێ و خواروخێچ، کە هەر دەیبینی، بێزت هەڵدەستێ. چما جەنگەڵ و لێڕەوار لەبەر ئەو جۆرە دارانە ژیان لە خۆی تاڵ دەکا؟ دنیایش چۆنی پێویستە، ئاوا دەڕوا. خۆرەتاوی دنیاداگر هەڵدێ و، تیشکەکەی بە یەکسانی بەسەر هەموو شتێکدا دەپژێنێ: بەسەر بنیادەم و ئاژەڵ و دەشت و رووباراندا. دواییش ئاوا دەبێ و سبەینێ دیسان هەڵدێتەوە و دەست پێدەکاتەوە. هەمیشە و هەمیشە و هەتا دوا چرکەسات بەردەوام دەبێ. چونکە هەموو شتێك بلێی و نەلێی "دوا چرکەسات"ــێکی هەیە. ئەو "دوایین چرکەساتەش" ئاخرییەکەی رۆژێك هەر دەگاتێ، وای دانێین بەو زووانەش نەگاتێ.

پوورە ئۆتزۆپار لەسەر تەختی خەوەکە، لەبری ئەوەی دانیشێ، هەڵدەتووتەکێ و پشتی بە کوانووە خشتەکەوە دەنێ. ئاگردانەکە گەرمە.

لە دەرێ، لە نێو کۆپەنکە کایەکەدا، هەتیومەتیوی ئەم دەوروبەرانە لەگەڵ دیتزا رایدەبوێرن. ئیۆنی برام هەڵیدەگلۆفێ. ئاڤێندرێیا و دێنیکا ـ برادەرەکانی براکەم ـیشم هەروا. ئەوانیش هەڵیدەگلۆفن.

هەرجارێکی پووره ئۆتزۆپار دێته ماڵمان، دەسبەجێ هەتیومەتیوی ئاوایی وەك مێش کۆ دەبنەوە. بە یەکتر دەڵێن: "کچەکەی ئۆتزۆپار هاتووە." ـ چاو لە یەك دادەگرن و لێویان دەلێسنەوە. بۆ هەنگوینیان خواردووه؟ خۆ لە ماڵی ئێمە هەنگوین هەر نییە. لە ماڵی خۆشیان. هەنگوین...هەهە، ئەوە هەر لە ماڵی دەوڵەمەند و خواپێداوەکانی ئاوایی وەك: ئاگانا و ئۆلماز و ناییدین و ئەو جۆرە کەسانەیە، کە هەنگوین دەست دەکەوێ. نەك هەر هەنگوین، هەمووو شتێك. ئەویش نەك تۆزێك و دوو تۆز. چەندی پێویستیانە. لەوانەیە زۆر زۆر زیاتر لەوەیش کە پێویستیانە.

*

*

*

جا ئەوجار نۆرەی دایکمە بیرەوەرییەکانی تێك بکاتەوە...

ئیۆن و ئێڤانگلین ـــ منداڵەکانی کۆنەمێردەکەی ـــ نەخۆش کەوتوون. ئێڤانگلین کە خەریکە ددانی دێ، شەو و رۆژ دەگری. ئیۆنیش وەك ئەو. دایکم لەسەر کۆشی دایاندەنێ و رایاندەژێنێ، تا گێژ بن و بێدەنگ بن و خەویان لێ بکەوێ. بەڵام ناتوانێ. ناچار لە باوەشیان دەکا. ـ قورسن. بۆ شان و باهۆ ناسکەکەی ئەو زۆر قورسن ـ و بە دەوری حەوشە بچووکەکەی داپیرەدا دەیانگێڕێ.

دۆمیترای برای، کە هەر لە تەویلە خەریکی تاقەتکردنی پاتاڵە و، باپیرەشم لێرەو لەوێ سەرقاڵە: جارێ لە قایمەقامی، جارێ لە مەیخانە، جارێ لە کلێسە.

هەوا جارێ باراناوییە و جارێ بەفری. با، بە نێو دارەکانی باخ و بە نێو بیەکاندا گڤەی دێ و، ریزی دار تەوریزییەکان، کە بوونەتە دیوارێك لەو سەری حەوشەوە، وەك پەردەیەك رادەوەشێنێ. ئەو جۆگەی بە نێوەندی حەوشەکەدا هاتووە، بەستوویەتی.

ـ هەی لایە لایە رۆڵەم لای لایە، شەوگار درەنگە بۆ خەوتان نایە

بەڵام ئێڤانگلین خۆ ژێر نەدەبۆوە. ئیۆنیش لەو خراتر. دەبوو بەردەوام تەڕ و وشکیان بکاتەوە، بیانشوا و وشکیان بکاتەوە.

دایکە، چاوی زۆر جوانن. قژی درێژ و زەردە، وەك گوڵەگەنمی گەیو. تیشکەڵە و کەڵەگەتە.

ـ بێوەژنێکی حەڤدەساڵان.

ـ هەی لایە لایە رۆڵەم لای لایە، شەوگار درەنگە بۆ خەوتان نایە

داپیره نه کەشتیی هەیە و نە دەزمایەی بازرگانی. بەڵام هەر دەڵێی هەردووکیانی هەبووە و یەك جێ لە دەستی بوونەتەوە... لە حەوشە و بەسەر گوند و کێڵگەکاندا باران یان بەفر یەکپشوو دەبارێ و لێی ناکاتەوە. هەناسەی داپیرەشم وەك هەواکە سارد و خەمهێنەرە و، میچەکەی وەك مەلاشووی سەگی یانیگر، رەشە.

هەر کاتێك، گریڤا، دێڵە سەیەکەمان، هەشت نۆ گوجیلەی دەبێ ، حەفتەیەك لێیان دەگەڕێین، تا چاویان دەپشکوێ، دوایی هەمووان لە قەرتاڵەیەك دەکەین و، لای نیوەڕۆیە دەیانبەینە دەرەوە و سەیری مەلاشوویان دەکەین. ئەوانەی مەلاشوویان رەش بێ، ئەوان رادەگرین، چونکە ئەوانەی مەلاشوو رەشەکان، کە گەورەبوون، ئازا و یانیگر دەردەچن. ئەوانی دیکە لە گۆنییەك دەکەین و دەیانبەین لەولای ئاسنەڕێیەکە لە قوڵکەیەکدا بەدار لێیان دەدەین تا دەتۆپن. ئاخر، ئەوان بە هیچ کارێکی بنیادەم نایەن.

گریڤا، هەنگاو بە هەنگاو وەدوومان دەکەوێ و لێمان نابێتەوە.

بۆ، ئەوەی لە خۆمانی دوور بخەینەوە، بەرد و گڵمتکی تێ دەگرین، یان  شانوشەپیلکە شل و بەقووڵداچووەکەی دەدەینە بەر شەقان.

ئێمە دەگەڕێینەوە ماڵێ، بەڵام گریڤا دەگەڕێ و مڵومۆ دەکا و جاروبار بە دزییەوە تووتکە تۆپیوەکانی بە ددان هەڵدەگرێ و دەیانهێنێتەوە ماڵێ. دەچێ یەك بە یەك دەیانهێنێتەوە کولانەکەی و، ناچارمان دەکا دیسان دەست پێ بکەینەوە. ئەم جارە تووتکەکان لە قووڵکەی قووڵتر دەخەین. بەڵام گریڤا دیسانیش دەیاندۆزیەتەوە.... بە چنجرووك گڵەکە هەڵدەکۆڵێ، ئەگەر مانگەشەو بێ، بەرەو مانگەکە و ئەگەر تەمومژ و هەوریش بێ، ئەوا بەرەو هەورەکان وا دەقرووسکێنێ، بنیادەم ئاگری بۆ تێبەردەبێ. ئەوجار وردە وردە هێور دەبێتەوە.

ـ هەی لایە لایە رۆڵەم لای لایە، شەوگار درەنگە بۆ خەوتان نایە

دڵە نەرمەکەی باپیرەم، بەزەیی تێدەگەڕێ:

ـ منداڵەکان بدە بە من لایەلایەیان بۆ بکەم. تۆ خۆتت کوشت.

ـ ماندوو نەبووم بابە.

داپیرەم خۆی تێهەڵدەقوتێنێ:

ـ لێی گەڕێ، ماندووی چییە. ... چاوی دەرێ خۆی خستوونیەوە، با خۆشی گەورەیان بکا. با مێردەکەی نەمردبایە.

ـ جا بۆ من کوشتوومە دایکە؟

ـ نا تۆ نەتکوشتووە. بەڵام دەی بگەڕێ یەکی دی بدۆزەوە. بۆ لەو ماڵەی من کڕ کەوتووی؟ دۆمیتراکێ گێلەش خۆی تێوەردەدا:

ـ راست دەکا. مێردێکی دیکە بدۆزەوە.

دۆمیتراکێ، سمێڵی خورمایین و لووتی دەڵێی دەندووکی هەڵۆیە. چاویشی وەك چاوی مار زەردن.

ـ دایە دەبمە بنێشتەخۆشکەی سەر زاری ئاوایی. خۆ هێشتا کفنی مێردەکەم زەرد نەبووە.

ـ ئەی دوایی؟ بۆ ببیتە بنێشتەخۆشکە، لێت کەم دەبێتەوە؟ خۆ زمانی خەڵکت پێ گرێ نادرێ، مەگەر ئیزراییل زاریان ببەستێ.

دایکم وەك دەنگدانەوەی دەنگی داپیرە پاتەی دەکاتەوە:

ـ مەگەر ئیزراییل زاریان گرێ بدا.

دۆمیتراکێ، لاسارانە لەسەری دەڕوا:

ـ دەبێ مێردێك بۆخۆت بدۆزییەوە. منیش دەمەوێ ژن بێنم. خۆ لەو ماڵەدا جێی ئەو هەمووە خەڵکە نابێتەوە.

ـ راست دەکەی. دەمەوێ ژن بۆ کوڕەکەم بێنم و، ئیدی ئەم ماڵە جێی تۆ و منداڵەکانی ئۆکیانی نابێتەوە.

ـ دایە ئەوانە منداڵی منن.

ـ نەخێر. ئەوانە منداڵی ئۆکیانن. ئەو کە دەیزانی دەمرێ، نەدەبوو توخم و تۆرەمە لە پاش خۆی جێ بهێڵێ.

ـ جا چووزانێ دەمرێ، دایکە. تا ئێستا کێ زانیویێتی؟ تۆ خۆت دەزانی کەی سەر دەنێیەوە؟

ـ ئەرێوەڵا دەزانم. ئێمە، هەر هەموومان ساغ و تۆکمەین. چوارپەلمان پتەو و بدەوە. من سەدساڵ دەژیم. لەوانەشە لە سەد ساڵێش پتر بژیم.

ـ هەی لایە لایە رۆڵەم لای لایە، شەوگار درەنگە بۆ خەوتان نایە

ئاخری سەرکۆنە و لۆمەولەقەم و سیخورمەی داپیرەم، چەقۆ دەگەیەنێتە ئێسقانی دایکم و، دەهری دەبێ. منداڵەکانی بە هەر کوتە پەڕۆیەکی دەستی دەکەوێ، مەلۆتکە دەکا و، لە باوەشیان دەکا و بە گردەکاندا ئاودیو دەبێ. رێك بەو جادەیەدا، بە تەنیشت گۆڕستانەکەی ئاواییدا دەڕوا.

لەوبەری دیوارەوە، خاچی بچووکی دارین دەبینرێن. هەندێکیان تازە و زۆربەیان کۆنن و، بنیان رزیوە و، لەسەر ئەو گۆڕانەی گژ و گیا داپۆشیون، خوار بوونەتەوە.

دایکە، هەر وا دەڕوا و دەڕوا... جار جار رادەوەستێ پشوویەك بدا. هەموو جارێ وەختە وەك ئەو گایانەی لە عارەبانە دەکرێن و لە بن باری قورس و لە لێژاییەکدا دەکەون، بکەوێ. خواخوایەتی بیتوانیایە سەعاتێك دانیشێ و بحەسێتەوە.

هێندە ماندووە، تینی ئەژنۆی نەماوە. بەڵام چۆن دەکرێ دانیشێ؟

بارانێکی ورد و بەخوڕەم بەسەر بەفرە بەستووەکەدا دەبارێ. کۆنەپێڵاوەکانی دایکم قورسن و دەخلیسکێن. گژەبا داوێنە خووساوەکە رادەوەشێنێ و، بە لەشییەوە دەنووسێنێ. لەچکەکەی تەڕە. تەنوورەکەیشی خووساوە.

ـ هەی لایە لایە رۆڵەم لای لایە، شەوگار درەنگە بۆ خەوتان نایە

بیردەکاتەوە: "چەندە خۆش بوو ئێستا گیانم دەرچووبایە و مردبام. خۆ بنیادەم کە دەمرێ، ئیتر هەست بەهیچ ناکا. ئیتر ئازار ناچێژێ و خەمی هیچی نابێ."

منداڵ بێبڕانەوە دەنووزێنەوە.

ـ هەی لایە لایە رۆڵەم لای لایە، شەوگار درەنگە بۆ خەوتان نایە

پەلکە زەردەکانی قژی دەگەنە نێوقەدی. چاوی گەش و بێ بنن. بە زەحمەت هەورازەکە دەبڕێ. بە دەشتەکەدا تێدەپەڕێ. بارانەکە هەر خۆشی ناکاتەوە و تەمومژە. زیندەوەرێك دیار نییە. تەنانەت قڕەی قالاوێکیش نایە. هەر هەموو لە بێدەنگیدا و لەسەر لکی دار ئەرخەوانکان کرووشمەیان کردووە. مردووش لە گۆڕەکانیاندا و لە بن خاچ و گژوگیاکانی گردەکە کڕ کەوتوون.

دایکم بۆ مەرگی مێردەکەی بەداخ نەبوو. قەت خۆشی نەویستبوو. ئەویش دایکمی خۆش نەدەویست. داپیرەم دایکمی ناچار کردبوو مێردی پێ بکا.

دەکەوێتە سەرولێژی.

دایکم دوو برای لە گوندەکەی ئەوبەرن، هەردووکیان کاسبکار و دەوڵەمەند. جا بچێتە لای کامیان؟ براکان پێکەوە نێوانیان نییە. ژنەکانیان بەینیان تێك داون. لیساندەرێ، براگەورەکە، ئازارەباریکەی گرتووە. ژنەکەشی، کە کچە شارییە، شەل و گێڕ بووە. لە منداڵێك پتر بۆیان نەماوەتەوە: ئیانکۆو. باریك و بنێس و بیانووگر، هەر دەڵێی لە خۆڵەمێش زیاتر هیچ ناخوا. چونکە هەرچی دەکەن چنگێ گۆشت بگرێ، نایگرێ و پێوەی نانووسێ، هەر سێکیان نیخەنیخی سینگیان دێ و بەردەوام دەکۆخن.

ئەگەرچی لیساندەرێیش لە نارەسەنیدا زۆر لە ژنەکەی باشتر نیە، بەڵام هەرچۆنێك بێ، هێندەی تۆنێی برای ناجسن نییە.

ئەو تونێیە سێ منداڵی هەیە: سێ کچ. هەمووساڵێ بەهارێش ژنەکەی دیسان وەك فوودانە هەڵدەمسێ و لەسەر پێ و مانگی خۆیەتی.

ماڵەکەی تونێ، رێك جەحەنەمێکی تەواوە. ژنەکەی بەردەوام دەبۆڵێنێ و، پێ دەچەقێنێ لەسەر ئەوەی ماڵ و حاڵیان کۆ بکەنەوە و بچنە شاری. حەزی لە ژیانی لادێ نییە و نەیتوانیوە لەگەڵی رابێ. بەڵام ئاخر تونێ بچێتە شاری، خۆڵی کوێ بکا بەسەر خۆیدا؟ هێشتا ئەوەندەی ماڵ بەسەر یەکەوە نەناوە، بتوانێ لە شار کۆشەکەڵەیەك بکاتەوە.

*

سڵاو کاکە لیساندەرێ.

ـ سڵاو خوشکێ.

ـ من ئیتر لەگەڵ دایکم هەڵناکەم. ویستم بێمە لای تۆ. ئەویش زۆر نا. هەر وا ماوەیەك... تا بەشکم بتوانم تۆزێك بەخۆمدا بێمەوە و ماڵ و حاڵێك پێکەوە بنێم.

ـ دەی باشە، پێکەوە بنێ. ئەی بۆ نەچوویە ماڵی تونێ؟

ـ ئاخر تۆ بە بەزەییتری، کاکە لیساندەرێ.

ـ کێ وای گوتووە؟

ـ خۆم دەزانم.

ـ تۆ هیچ نازانی.

ـ دەی باشە، کە وایە دەڕۆم.

ـ تازە هەر هاتووی، مەڕۆ...

دایکم لای لیساندەرێ مایەوە. کچە شاری، ژنەکەی لیساندەرێ، کە چاوی بە دایکم کەوت، نێوچاوانی تێك نا، بەڵام دانی بەخۆیدا گرت و پێی گوت:

ـ دەبێ دەستێکم لەگەڵ بدەیە کاروباری ئەو ماڵە، کچەکێ. دەستێك بە ژوورەکاندا بێنی. ئاو بێنی، هەویر بشێلی...

دایکم رێك و راست بوو بە کلفەت و کارەکەری دەستلەسەر سینگی ماڵی لیساندەرێ.

رۆژێك، حەفتەیەك، مانگێك و ئاخری، دوو ساڵان.

براکەی دیکەی ــ تونێ ــ لێی راسپارد کە دەیەوێ بیبینێ.

دایکم چووە لای.

تونیێ پێی گوت:

ـ ئەو جۆرەی ئەو برا هیچوپووچەم لەگەڵت دەجوولێتەوە، هیچ بە دڵم نیە. ئێمە سێ براین و تاقانە خوشکێکمان هەیە. تۆش رێك بوویەتە کچە کارەکەرێك. ئەویش لە ماڵی کێ! من یەکێکم بۆ هەڵناوی مێردی پێ بکەی. تۆ دوو هەتیوت بە ملەوە بووە و، ئەویش دوو. لە سەر یەك دەبنە چوار. ئەویش وەك تۆ وایە. ژنەکەی ئەم پاییزە مردووە.

ـ حەزم دەکرد بیبینم، کاکە تونیێ.

ـ دەی باشە. دەکرێ بیبینی... لە تەنیشت مەیخانەکەوەیە. دەتەوێ بانگی بکەم؟

ـ بانگی بکە.

تونیێ، فینیکای ژنی لە پشت دەخیلەکە دادەنێ بۆ ئەوەی مشتەرییەکان بەرێ بکا، خۆی دەڕوا و لەگەڵ کابرایەکی گەنجی قژ رەشی چاو مەڕانی بە سمێڵێکی کورتەوە، دێتەوە. پیاوێك کە دەڵێی باری خەمی دنیایان لە دڵی بار کردووە و، کراسە تۆزاوییەکە، لە تۆز و خۆڵی دەشتێدا رەش دەچێتەوە. چونکە لەگەڵ هاتنی بەهاردا، کاروباری دەشتێ دەستی پێ کردووەتەوە.

ـ سڵاو ماری.

ـ سڵاو.

تونیێ چووەتەوە پشت دەخیلەکەی، بۆ ئەوەی یارمەتیی فینیکا بدا. مشتەریەکان داوای پەرداخێك ئارەق دەکەن، نانە برژیوەیان دەوێ، داوای چارەگێك شەرابی سوور دەکەن... ئەوانەی پارەیان نییە بە قەرز دەخۆنەوە. تونیێ ورد، قەرزەکان یەك لە دوای یەك لە دەفتەرەکەی بەردەستیدا دەنووسێ. قەرزبار، هاوینێ یان پاییزێ، کە حاسڵات و بەروبوویان فرۆشت، حیسابەکانیان پاك دەکەن. ئەگینا، دەمێنێتەوە بۆ ساڵی دادێ. هیچ عەیبیشی تێدا نییە. کاسبی خۆ زەرەر ناکا: دەفتەرۆکەی خۆی دێنێتە پێشێ و، حیسابی قەرزەکان دوو هێندە و بگرە سێ هێندەش زیاتر دەنووسێ.

فینیکا، بە مۆڕەوە لە مشتەرییەکان دەڕوانێ و لە مێردەکەی دەپرسێ:

ـ دیسان ئارەقیان بە قەرز دەدەیەی، تونیێ؟

ـ ئەدی، دیسانیش.

ـ ئاخر بیرێك لە من و کچەکانیشت بکەوە تونیێ!

ـ ئەگەر راستیت دەوێ، هەر لە خەمی ئەوان دام.

سێ پەرداخ پڕ دەکا لە ئارەق و دەیباتە پشت کۆشکەڵەکە.

ـ دەی خوشکێ، بڕیارت دا مێرد بە تودۆر بکەی؟

ـ بەڵێ، مێردی پێ دەکەم کاکە تونێ.

ـ دەی باشە، بە خۆشیتان. بەو هیوایەی هەموو شتێك لەوە باشتر بێ.

پەرداخ لێك دەدەن و پیاوەکان یەکبین هەڵیدەچۆڕێنن. ژنە تەنیا لێوێك تەڕ دەکا.

ـ تۆ ناخۆیەوە؟

ـ نا، حەزم لێی نییە.

ـ منیش.

ـ زۆر باشە.

ـ کەی دەیبەیە ماڵەکەت تودۆر؟

ـ هەر ئەمشەو، ژن برا گیان.

ـ هەر ئەمشەو تونێی برام.

ـ بڕۆن، خواتان لەگەڵ.

کابرا ئێڤانگلین لە باوەش دەکا و دایکیشم ئیۆن. بە کۆڵانە گەورەکانی ئاواییدا دەچنە دەرێ و شان بە شانی یەك بەرەو ژووروی ئاوایی هەڵدەگەڕێن.

شەو داهاتووە. تاریکایی هەموو شوێنێکی داپۆشیوە. پشووەبایەکی گەرم هەڵدەکا و بانی تازەی کێڵگەکان، کە لەگەڵ هەناسەی بەهار لەخەو رابوونە، بەسەر ئاوەدانیدا دەپژێنێ.

منداڵ سەریان وەسەر شانی دایە و بابە کردووە و خەویان لێ کەوتووە.

ئاگری کەمرە* لە بن خۆڵەمێشی کوانووەکەدا دەگرێ. لە بەردەم کوانووەکە، کوڕێژگەیەکی قژسووری دەموچاو شڵە، کە خەریکە خۆی گەرمتر بکاتەوە، لەسەر کۆپەنکە کایەك خەوتووە. چرا نەوتییەکە بە دیوارەوە هەڵواسراوە. چاوە زەردەکەی وەك چاوی نەخۆش پتەپتێتی. ژن و پیاوەکە پێکەوە وەژوور دەکەون. بە داڵانەکەدا رادەبرن و دێنە ژوورەوە. کابرا بە دەستەکوتە تەختی خەوەکە دەدۆزێتەوە و، منداڵە نوستووەکان لە تەنیشت یەك دەنوێنێ و دایاندەپۆشێ. دەستی ژنەکەی دەگرێ و بەرەو لای خۆی دەکێشێ و لە باوەشی دەگرێ و سەر کوڵمەی ماچ دەکا. لێوی زبرن. با، شەقارشەقاری کردوون. کوڵمەی ژنەکەش لە لێوی پیاوەکە زبرترن. دەستی بە سینگی پیاوەکەوە دەنێ و لەسەر خۆ دووری دەکاتەوە.

---

*کەمرە: لە لادێ بەرەبەری پایزان، ڕیخی تەختی عەرزی تەویلە و سەرەنویلك/ سەرەنگوێلك دەبڕنەوە. ئەو ڕیخە کە پەستێوراوە، وشك دەبێتەوە و زستانان دەیکەنە ئاوردوو و پێی دەڵێن کەمرە. جیاوازە لە تەپاڵە و دەوە. تەپاڵە هەر ڕیخی مانگا و گامێشە خۆی وشکەوە دەبێ، بەڵام دەوە، ئەو ڕیخەیە وا ژنان بە دەست دەیشێلن و پانی دەکەنەوە و هەڵیدەخەن تا وشکەوە دەبێ.

ـ ئەی گوتت دوو منداڵت هەیە، کوا ئەوی دی؟

ـ کچەکەمم بە یەکێکی دی سپاردووە. زۆر ساوا بوو، پێم بەخێو نەدەکرا.

ـ کێ وەری گرتووە؟

ـ یەکێك لە دراوسێکان. گوتی دەیکەمە کچی خۆم.

ـ کام دراوسێ؟

ـ ژنەکەی ژیگۆی.

ـ دەچی وەری دەگریەوە.

ـ بەچاوان، بەیانی.

ژوورەکە دەڵێی ساردخانەیە. با لە سواڵەتی سەربان دەئاڵێ و دووکەڵی کوانووەکە لە ژوورێ دەکاتەوە. هەر دووکیان لە تەنیشت ئاگرەکە دادەنیشن. کوڕیژگەکە بەخەبەر دێ. سەیرێکی سەرتاپێی ژنە دەکا. وەك تارماییەك هەڵدەستێ و قیت رادەوەستێ و خۆی بە باوکیەوە دەنووسێنێ:

ـ باوکە ئەو ژنە کێیە؟

ـ دایکتە.

ـ جەحەنم پڕ بکا. کوا ئەوە دایکمە؟ دایکی من مردووە، ناشتوویانە...

زمانە درێژە مۆرەکەی لە ژنەکە دەردێنێ.

❊

❊

❊

ماڵەکە لە نێوەڕاستی حەوشەدا دروست کراوە. لە پشتەوەی دانگەیەکی ئەسپ و عەمبارێکی لێیە، کە ئەو بڕە گەنمەی بە ساڵێکی رەبەق زەحمەت و ئارەقەی نێوچاوان کۆ دەکرێتەوە، لەوێدا هەڵی دەگرن ــ ئەویش بە مەرجێك بەرهەمی ئەو ساڵە بەپیت بووبێ و، خەرمانی گەنمەشامی ـ ئەگەر گەنمەشامییەکیش هەبێ و، عارەبانە کۆنەکە و ئەو گایانەی لە بەر نیردان و، تفاقەکە کاوێژ دەکەنەوە.

لەوسەری باخەکە، پۆلێك داری ئەرخەوانی لێیە، کە سپینداریکی بەرز لە نێوانیاندا سەر لە ئاسمانێ دەسوێ و هەر دەڵێی شەپۆلی نەبەدی بەردەوام گەڵاکانی دەلەرێنێتەوە.

لەبەردەم بیناکە، دوو داری توو و چەند دار هەڵووژە و دار گوێزی نیوەوشکی لێیە و، لە بەر پەرژینەکەشەوە، شۆڕەبییەکی زۆر گەورەی لێیە، کە لقەکانی شۆڕبوونەتەوە نێو کۆڵان. لە بن شۆڕەبییەکە، بیرێکی قووڵی لێیە، کە

دەوری زارکەکەیان بە دار گرتووە و، دەکرێ بریسکەی ئاوە روونەکەی لە تەختی بنیدا ببینی. لە پێشەوە و لای ڕاست، خانووی جیرانەکانی لێیە و هەموو ئاوەدانی. لای چەپ ئاسنەرێیە و، جادەیەك، کە هەر دەڵێی گردەکەی وەك ئەژنۆی خۆی لە باوەش گرتووە و پێیدا تێدەپەڕێ. لە سەر گردەکەوە هەتا چاو هەتەر دەکا، مەزرا و کێڵگەیە، کێڵگەی بێ بڕانەوە، کە جێ جێ گردۆلکەی بچووك بچووکی تێدا دەبینرێ و هەندێکیان پۆل پۆل پیرەداریان لەسەرە و لك و پۆیان پەرش و بڵاوە. نیشانەی لێڕەوارێکی گەورە، کە زۆر لەوەپێش هەموو ناحیەکەی دیارە داپۆشیوە، دارستانی نارەوەنی کێوی و بەڕوو، دارستانی توودڕك و گیانلەبەری کێوی.

ئەم بەشەی بەستێنی دانوب، لەوەپێش خەڵکی زۆر لێ نەژیاوە. شاری تۆرنۆو یەکێك بووە لە قەڵاکانی تورکان و ئەو بێدینە خوانەناسانە هەر کات حەزیان چووەتە کوشتار و تاڵان، ناوچەکەیان گەمارۆ داوە. ئەودەم، گوندەکانی ئەم ناوچەیە، هەندێ وردە ئاوەدانی بوون، کە گەرای گوندەکانی داهاتوو بوون، چەند کووخ و سەیوانی بە جەگەن و گاڵ داپۆشراو لەم بەرو چەند دانەیەك لەوبەر و لە مەودایەکی دوور لە یەکتر. کاربەدەستی دەوڵەتیش کە بۆ وەرگرتنی پیتاك دەهاتن، رێك وەك تورکەکان، ئەم خەڵکی خوایەیان رووت دەکرد، ئەوانەی ماڵیاتیان پێ نەدەدرا، ئەشکەنجە دەکران و تێیان هەڵدەدرا، بە دووکەڵی کا قانگیان دەدان و خۆیان لێیاندەدا دەرۆیشتن و لە پاش خۆیان لە ماڵوێرانی و نەگبەتی زیاتر هیچیان بەجێ نەدەهێشت. جا سکاڵات دەبردە بەر کێ؟ ئەوانە کەسانێك بوون، سەری خۆیان هەڵدەگرت و روویان لە لێڕ و دارستانان دەکرد و وەك حەیوانی کێوی لە چەقی دارستانان‌دا دەژیان. خەڵکێکی دی بۆ ئەوەی پاروە نانێکیان دەست بکەوێ، دەستیان دەکرد بە چەتەیی و رێگری و، رێبوارانیان رووت دەکرد. هەتا چاو هەتەری دەکرد، ناوچەکە دارستانێکی بێ بڕانەوە بوو.

خواردنی خەڵك هەر نانی هەرزن و پەنیر بووە. مەڕ و ماڵات زۆر بووە و لەوەڕگە کەم.

بابەگابۆنێیا، بەسەرهاتێك دەگێڕێتەوە، کە جارێکیان لە سەفەرەکەی دراگانسێتیدا بەسەری هاتووە:

دەڵێ، بەتاقی تەنێ وەڕێ کەوتووە و، کە لە گوندەکەی ئودۆوپ وەدەر دەکەوێ، سۆسەی ئەوە دەکا سوارێکی دەمانچە لەقەد وەشوێنی کەوتووە. بابەگابۆنێیا کە رادەوەستێ ئەسپەکەی پشوویەکی بێتەوە بەر، کابراش رادەوەستێ و بابەگابۆنێیا کە ئەسپەکەی لێدەخورێتەوە، ئەویش بە چوارناڵە بەدوویدا دێ.

پیرەپیاو لەبەرخۆیەوە دەڵێ: "دەبێ بەر لەوەی شەودا بێ و هەوا تاریك بێ، لەکۆڵمی بکەمەوە.

خۆر وردە وردە ئاوا بوو. گابۆنێیا رووی کردە مێشەڵانێك و ئەسپەکەی بەستەوە و راخەر و پێخەفی راخست. کەوڵەکەی لەسەر عەرزی راخستبوو و باوەشێك گەڵاو و چڵوچێویشی لەنێو ئاخنیبوو. دنیا تاریکدا هاتبوو. کە سەیری کەوڵەکەت کردبا، سوێندت دەخوارد ئەوە رێبوارێکە و لە ماندوویێتی کەلەلا بووە و لەو بنە خەوتووە. گابۆنێیا تۆزێك دوورتر خۆی مەڵاس دەدا. زۆری نەبرد کابرای چەتە بەسەری پەنجە نزیك کەوتەوە تفەنگەکەی بە

کەوڵەکەوە نا و داهاتەوە جلوبەرگی تەرمەکە بپشکنێ، کە بابەگابۆنێیا تێڵایەکی لە تەپڵی سەری راکێشا و، بە مردوویی هەر لەوێ بەجێی هێشت و بە فیکەلێدان ملی رێیەی گرت. زۆر باش خۆی لە چنگی ئەو زۆڵە رزگار کردبوو.

ئەوەی لە پاییزێدا بەسەرهاتبوو.

کە بەهار دادێ کابرا دەیەوێ بچێتە بازاڕی مەکارە*، لە دراگانستی. کاتێ بە تەنیشت دارستانەکەدا رادەبرێ، دەبینێ دەعبای کێوی کابرایان لەتوپەت کردووە و خواردوویانە و هەر ئێسقانی ماونەتەوە و قایشەکەی کەمەری. کە بە نووکی دارەکەی بەرزی دەکاتەوە، سەیر دەکا، پڕە لە سکەی زێڕ.

ـ بەڵێ، ئیتر زێڕی پێ بووە، ئەویش چەند؟ جا باشە ئەی بۆچی کەوتبووە شوێن من؟ بۆچی دەیەویست من بکوژێ؟ جا ئاغایەکی بەماڵم، قایش و زێڕم هەڵگرت. قایشێکی پانی چەرمی سوور بوو، کە نقێمی زیویشی پێوە بوو.

*

*

*

دلی ئۆرمان، جەنگەڵە شێتە...

جەنگەڵە شێتە، ئیتر ئێستا ئاسەواریشی نەمابوو. بەڵام پوورە هەنگەکانی باوباپیرانمان لە ئادانکاتا بووە. کە پاییز دادەهات، دەچوون و پوورەیان قانگ دەدا و لەسەرخۆ و زەریف هەنگوینەکەیان کۆ دەکردەوە و، لە گۆزەی داربەڕوویان دەکرد و دەیانبردەوە ماڵێ. منداڵ مڵچەملچ هەنگوینیان دەخوارد. پێمان دەگوتن، بێت و هەنگوین زۆر بخۆن، لە ناوکتانەوە دێتە دەرێ.

ـ ئەی نەدەمردن، پوورە ئۆتزۆپار؟

ـ نا، پێی نەدەمردن.

ـ وەڵاهی بڕوا ناکەم هەنگوین لە نێوکەوە بێتە دەرێ.

ـ هەر وایە... تۆ قەت باوەڕ بە هیچ ناکەی. تۆش وەك سەن تۆماس وای: دیارە دەتەوێ بە چاوی سەر شتەکە ببینی، ئینجا بڕوای پێ دەکەی. باشە، بەڵام لێت عەیان بێ، بنیادەم ناتوانێ هەموو شتێك بەچاوی خۆی ببینێ. بەڵام ناچاریشە دەبێ دانی پێدا بنێ... دەی باشە بلێ بزانم... هاوینانە لە رووبارەکەدا مەلەی دەکەی؟

---

* *بازاڕی مەکارە بازاڕێك بووە هەر ساڵەو لە شوێنێك کراوەتەوە کاڵا و کەلوپەلی وڵاتان و ناحیە و ناوچە جیاجیاکانیان هێناوە لەوێ بیفرۆشن.(وەك پێشانگا نێودەوڵەتییەکانی ئێستا).

ـ ئەی چۆن نایەکم پوورە ئۆتزۆپار.

ـ ئەی قەت بووە بچیتە ئەوبەری بەندەکە، بۆ لای بێستانچییە بۆلگارییەکان؟

ـ چۆن نەچووم! بۆ شووتی دزینێ دەچین. لەگەڵ منداڵان.

ـ دەی کەواتە دەبێ دیتبێتت، ئەو بەندەی ئەمڕۆی رووبارەکە، بە ریزێك بەرد و دیوارێك گڵی پەستێوراو چووەتەوە سەر گردەکەی پۆشارلییێ.

ـ چۆن نەمدیتووە، خۆ کوێر نیم.

ـ ساڵی ساڵان، بەندەکە زۆر لەوەش بەرزتر بوو، زۆریش پانتر، هەر دەتگوت بەنداوێکی گەورەیە. ئەو ئاوەی لە پشتەوەی پەنگی دەخواردەوە، لەم گردەوە تا ئەو کردەی دی، دەبووە دەریایەك، کە پڕ بوو لە زەڵ و جەگەن و بەستێنەکەشی پڕ بوو لە شۆڕەبی. بۆ بەرزکردنەوەی ئەو بەنداوە، خەڵکەکە کوێرەوەریی سەگیان کێشابوو. ئەو هەمووە پیاو و ژن و منداڵە بە قەمچی کاربەدەستی حوکمەتی گیانیان دەرچووبوو.. لە یەکێك لە گۆشەکانی بەنداوەکەوە، یەکێ لە تورکەکان ئاشێکی دروست کردبوو. ئاشەوانێکیشی لەسەر دانابوو، کاربەدەستێکی دەوڵەتیش بۆ وەرگرتنی یەك لە دەی بەرهەمەکان. ئاغا تورکە، خۆی مانگێ جارێك دەهات و بە سەر حیسابەکان رادەگەیشت و پارەی خۆی وەردەگرت. ئاشەکە بە پای فیلان پارەی دەخستەوە، چونکە هیچ ئاشێکی دیکە لەو دەوروبەرانە نەبوو. ئاغا تورکە بە قایقەکەی لە نێو گۆلەکەدا دەگەڕا. دوو کۆیلەی گوندییش سەوڵیان بۆ لێ دەدا و، خۆیشی ئانیشکی دابووە سەر باڵنجی مخمەر و نێرگەلەی نارکیلیی بەبادا دەکرد، قایقەکەی وەك بێشکە رایدەژەند و، تەنانەت راژاندنەکە دەشی خەواند... رۆژێك دەنگۆی ئەوە داکەوت، وا قۆزاقی لای رۆژهەڵات بۆ ئازادکردنی مەسیحییەکان، دێنە شەڕی گەورەی تورکان. خاوەنی ئاشەکە، خەڵکی هەموو گوندەکانی دەوروبەری کۆ کردەوە. بە پاچ و پێمەڕان، ئەمری کرد بەندەکە بشکێنن. ئاو بەربۆوە و هەرچی لەبەری بوو رایماڵی و کاولی کرد. تولەی عوسمانی، بە دەستی خۆی ئاشەکەی ئاگر دا، خۆشی راوەستا و سەیری بلێسەکانی کرد کە چۆن تەڕ و وشکی پێکەوە دەسووتاند و دەیکردە خۆڵەمێش. ئینجا رکێفکوت، ئەسپەکەی بەرەو لای دانوب غار دا. پیاوەکانیشی بە شوێنیدا. ئەوانە هەر هەموو مەسیحی بوون. کە سووڕانەوە پشت گردەکە، بە هێما و چاوهەڵتەکاندن یەکتریان تێگەیاند و، قوڕقوڕۆچکەی تولە عوسمانییەکەیان گرت و خستیانە خوارەوە و کوشتیان و چیی زێڕی لە بەر پشتوێندیدا بوو، هەڵیان گرت و تەرمەکەیان بۆ قەل و داڵ بەجێ هێشت و بە ئەسپەکەوە گەڕانەوە ئاوایی... رۆژی دواتر رووسەکان گەیشتنێ. لە خیز و خۆڵ و گەڵای دارانیش زیاتر بوون. بارگەیان خست، لە دەم رووبارەکە خێوەتیان هەڵدا و تا پاییزێ لەوێ مانەوە. لەگەڵ ئەو رۆمانیاییانەی لە کۆڵانەکاندا هەڵدەپەڕین، کردیانە قریوەی خۆشی. گیرفانیان لە پارە ئاخنیبوو. وردەوردە دەستیان کردبوو بە فێربوونی زمانی

ئێمە... گەنجێکی قۆزاقیان لە نێواندا هەبوو، کە خوا بزانێ ناوەکەی خۆی چ بوو، بەڵام خەڵك ناویان نابوو ساکوش. ساکوش مەرج و گرێوی لەگەڵ خەڵکی ئاوایی کرد، کە بەتاقی تەنێ بچێتە مەیدانی قەڵاکەی تۆرنو و، لەچك بۆ ئەو کچانە بکڕێ کە خۆشی دەوێن و بە سلامەتیش بگەڕێتەوە... لێی سوار بوو و، کەوتە رێ. خەڵکەکەش تا دەرەوەی دێ بەڕێیان کرد. کەس پێی وانەبوو ئەو سەرەی دەیبا، بیهێنێتەوە. هەموو پێیان وابوو مەحاڵە بتوانێ بە زیندوویی لە چنگی تورکان قوتار بێ. ژنان هەر لە ئەوەڵەوە دەستیان کرد بە پێداهەڵگوتن و نووزانەوە...

کە وەڕێ کەوت بەیانی بوو، ئێوارە بوو گەڕاوە. ئەسپەکەی لە ئارەقەدا خووسابوو. بۆ خەڵکەکەی دەگێڕاوە، کە چ ئۆین و ماجەراتێکی لە مەیدانەکەی قەڵایە دەرهێناوە: بەر لەوەی خۆی پێشان ئەو سەربازە تورکانە بدا کە دەسووڕانەوە، عەبایەك بەخۆیدا دەدا و مەندیلێك لەسەر دەکا. کەس پێی نەگوتووە کەرت بەچەندی.

لە نێوەڕاستی شەقامە گەورەکەی قەڵا دادەبەزێ و تووتن دەکڕێ و نانی کڕیوە و چۆنی شەرت و گرێوی کردبوو، ئاوا، چەند لەچکێکی کڕیوە. پاشان لە پڕ خۆی دەخاتە سەر پشتی ئەسپەکەی و عەبا و مەندیل تووڕ هەڵدەدا و، شیر لە کالان دەردەکێشێ و و هەڵدەکوتێتە سەر ئەو سەربازانەی لەوێ هاتوچۆیان کردووە و سەری چەند سەربازێکی پەڕاندوون. هەروا نەڕاندوویەتی و بە زمانی رووسی جوێنی پێ داون و کەڵەوەکێشیی کردووە... تورك زەندەقیان دەچێ و هەر کەسە و دوو قاچ قەرز دەکا بۆ راکردنێ. هەموو وا دەزانن قۆزاق هجوومیان کردووە قەڵا بگرن... تا تورك وەخۆ دێنەوە و دەجووڵێنەوە و لێیان روون بێتەوە، ساکوش رکێفکوت دەروازەی قەڵا دەبەزێنێ و، لە گردەکەوە بەرەو لێڕەوار خلۆر دەبێتەوە... تورك بوونە گاڵتەجاڕی هەموو خەڵکی وڵات. لاوێژگە قۆزاقەکە شمشێرە خوێناوییەکەی بەم و ئەو نیشان دەدا و، دەسرۆکەی هەوریشمین و لەچکی پەشمینی لێك دەکردنەوە بۆ ئەوەی هەمووان ببینن... سبەینێکەی، زۆربەی ژنان لەچکی تازەیان لەسەر نابوو.

سەرما، کە توندتری کرد، رووسەکان بەرەو دانوب کەوتنە رێ و، قەڵا و پەناگەی تورکانیان گەمارۆ دا و ئاخرییەکەیشی بۆ هەتاهەتایە دەریانپەڕاند بۆ ئەوبەری رووبارەکە. هەموو ئەو شتانە، وەختێك بوو، کە داپیرە هێشتا گەنج بوو. یانی چەند ساڵێك پاش هەراکەی زاڤێرا... لەو لەچکە پەشمینانەی پاش دەرپەڕینی تورکەکان لە قەڵاکە بەجێ مان و کەوتنە دەست رووسان، یەکێکیشیان بە داپیرەم بڕابوو.

پووره ئۆتزۆپار پێدەکەنێ و چاوی دەترووکێنێ، دەڵێی هەوڵ دەدا پێشی لووزەوی فرمێسکان بگرێ.

بەیان ئەنگووتووە، بەڵام هێشتا تاو هەڵنەهاتووە. با نیوەگەرمەکەی دوێنێ، هێشتایش دار ئەرخەوان و توو و سپیندارەکانی رادەوەشاند. هەور لە ئاسمانێ تێك دەئاڵێن بەرەو خۆرئاوایان رادەماڵێ. چەند جووجەڵەیەك لە

حەوشەدا لە دان دەگەڕێن و چینە دەکەن. هەر چەند دانەیەکن. گوندەکەی خواروو بەخەبەر هاتووە. دەنگی مانگا دێ. ئاوهەڵکێشی دێتە سەر و دەچتەوە خوار و دێتەوە سەرێ...

ژنە سەیرێکی دەوروبەری خۆی دەکا. ورد ورد سەیری دەکا: کەواتە ئێرەیە ئەو شوێنەی ئەو لێی دەژییێ؟ لێرە، لەسەر ئەم پەڵە زەوییە، لە تەنیشت ئەو پیاوەی یەکەم شەوی لەگەڵ رۆژ کردووەتەوە، لە نێو ئەم ئەرخەوانیانەی دڕکەکانیان زەق راوەستاون، لە نێو ئەم پێچ و خەمانە، لە نێو ئەو ژنانەدا کە بەر لە تاوهەڵات بە پا و پووزی رووتەوە، کۆڵانە بەستووەکە دەپەستێون و دێن ئاو لە بیرەکە هەڵدێنجن؟ دەی باشە، چەندە؟ کەس نازانێ ئەو دەبێ چەندە لێرە بژی. قانوونی دنیا وایە، کە بنیادەم نەزانێ، تا کەی دەتوانێ سێبەرەکەی خۆی کە بە پێیەوە نووساوە بەسەر ئەم خاکەدا بێرەو ئەوێدا بکێشێ.

پوورە تۆتزۆپار لە تەنیشت سۆبەکە قوونی نەبزاوتووە. چرکەیەکیش چییە چەناگەی رانەوەستاوە. زمانی چی، شەمەندەفەری جەهەننەم... سەیری کەڵبەی دەکەم کە لە لێوی سەرەوەی هاتووەتە دەرێ و لەگەڵ خۆ راژاندنەکەی دەلەقێ و دێ و دەچێ.

کە باوکە دێتە ژوورێ، ژنەکان هەر ئاگاشیان لێ نییە... باوکە دێتە ژوورێ و دوایی دەچێتەوە دەرێ. سەری بەرداوەتەوە و خەریکی کاری خۆیەتی. ئێستا کەس ئاگای لە منیش نییە.

بەوحاڵەشەوە پوورەگیان ماندوو دەبێ و لە چەنەوەڕی دەکەوێ. جا ئەو جار نۆرەی دایکمە، کە لەسەرخۆ و یەك یەك دەست بکا بە قسەکردن. ئەو شتانەی دایکم دەیانگێڕێتەوە، زۆر لەمێژە قەوماون. ئەوددەمی گەنج بووە.

وردە چرچولۆچی کەوتووەتە دەوری چاوانی. نێوچاوانی تا بلێی گنجی قووڵی تێکەوتووە. ئێستا دایکە ، جار جارە نەبێ کە پێدەکەنێ، ئیتر جوان نییە. بەڵام پێکەنینەکەی چەندە کەموێنەیە. هەموو ئەوانەی لە دەوروبەرمان دەژین، بە دەگمەن زەردەخەنە و پێکەنینان دێ. زۆربەی جا خەمبار و مرچومۆنیان دەبینم، نێوچاوانیان دەڵێی قوزەڵقورتە. نێوچاوانیان لە پاییزاندا، لە لێزمەی باراندا، چەندە گرژ و مۆنە، لە بەهارانیشدت کە بەفر دەتوێنەوە و شیناوەرد سەر لە خاك دێننە دەرێ و، زەوی لەو شوێنانەی پێشتر وەك قیری رەش وابوو، کەسك کەسك دەچێتەوە، ئەو دەموچاو و قەڵافەتانە لە هاویشنانیشدا کە بەڵاڵووك دەگاتێ، هەر وا گرژ و مۆن و خەفەتبارن. تەنانەت ئەو دەمەی گەنمی گەنمەجاڕانیش زەرد دەبێ و تا چاو بڕ دەکا ئاسۆی دەریا شین دەچێتەوە و لە کەڕەی بەیانییەوە تا تەنگەی ئێوارە شەپۆلەکانی تێکەڵی بارانی تیشك دەکا.

ـ داریە! یانی ئەوەی دەیلێی راستە؟ یانی ئەو ساڵانەی تۆ لەو قۆناغە جیا دەکەنەوە، پەردەیەکی تاریان لە نێوان تۆ و رۆژگاری کۆندا نەکێشاوە؟ ئاخۆ هەر حەکایەتێکی دەیگێڕیەوە، بە دەستی خۆت خۆڵەمێشی بەسەردا ناکەی؟ زۆر ورد بەوە...

ـ باش دەزانم لەو کاتەوە تا ئێستا زۆری بەسەردا هاتووە، بەڵام هیچم لەبیر نەچووەتەوە. ئەو چڵە گەنمەم لە بیر ماوە کە هەڵمکێشاوە بۆ ئەوەی بیکەمە ئەڵقەی پەنجەم. ئەو پەپوولانەی گرتوومن و ڕەنگەکانی ئەو دەعبا سەیرەی بۆ خۆ خافڵاندن و گەمەکردن لە باڵەکانیانم سڕیوەتەوە، هەر لە بیرمە. قوڵکەسمی ئەو ئاژەڵانەی کە دەچوومە دەشتێ و تێیاندا ئاوی بارانەم دەخواردەوە، لەبیرمن. هیچ شتێکی ئەو ساڵانە لە مێشکمدا نەسڕاونەوە. ئەو شتانەی پاشتر دیتوومن یان بیستوومن یان بەسەرم هاتوون، زۆربەیانم لەبیر چووەتەوە، بەڵام چۆن دەتوانم دایك و باوکم لەبیر بکەم؟ خوشك و براکانم چۆن دەکرێ لەبیر بکەم؟ باقی کەس و کارەکەم و، دراوسێکان، گوندەکان، چۆن لەبیر بکەم؟ دار تەوریزییەکە، دار توووەکە، دار ئەرخەوان و دار قەیسیەکە چۆن دەتوانم لە بیریان بکەم؟ .... نا، هیچ شتێکم لەبیر نەچووەتەوە...

دایکم لەسەر گێڕانەوەی بەسەرهاتەکەی دەڕوا:

گیۆرگێ زۆری ئازار دەدام. ئێستا ڕۆیشتووە و زۆر لێرە دوورە. ماوەیەکی دی دەبێتە قەشە زۆری حەز لە خوێندنە. وەك منداڵەکانی خۆم خۆشم ویستووە و فەرقم نەکردوون. قەت ئەزیەتم نەداوە. هەمیشە بە ڕق و قینەوە سەیری کردووم. هەر کات پێکەوە دەمایەنەوە، لاسایی دەکردمەوە و جنێوی دەدامێ. قەت بۆ مێردەکەمم نەدەگێڕاوە. خۆ لەوانەیە ئەگەر بە ئاستەم بۆم باس کردبا، تێی هەڵدەدا و، منیش حەز ناکەم ئەوە ببینم... لێیانا کە ئیتر سەد جار لە براکەی خراپترە. بە مێردەکەمم گوتبوو بیهێنێتەوە. چووە شوێنی. ژنەکەی ژیگۆیی نەیداوە یەکەم ڕۆژ کە هاتم، لە حەوشە نەچوومە دەرێ. ژنانی دەروجیرانم دەدی چۆن لێم بوونەتە ملۆزم و قوتەقوتیانە. وەك قالاو لەسەر پەرژینەکان دانیشتبوون و گوێیان هەڵخست بزانن دەڵێم چی و، چاوێکیان کردبووە چوار، بزانن چ دەکەم. ئاخر دیانویست چ ببیستن یان ببینن؟ حەوشەکەم ماڵی. ئاوپرژێنم کرد. زبڵ و زاڵەکەم سووتاند. دانم دا بە مریشکەکان. منداڵم شووشتن. چێشتم بۆ مێردەکەم لێ نا. چۆنی گوێیان هەڵخستبوو، هەر وا لەسەر هەست بوون، بزانن چ دەقەومێ. هەروا سرتوخرتیان بوو و لەسەر هەست بوون. هەر ئاوڕم لێ دانەوە، سەریان داخست. بەرەبەری عەسرێ، هەوگیانەکەم، ژنەکەی ڤۆیکۆو، یەکێك لە برا گەورەکانی مێردەکەم، هاتە سەردانم. هەر لەو تەنیشتمانن. حەوشەکانمان ئەودەمیش وەك ئێستا بە چەپەرێك لێك جیا کرابوونەوە.

ـ ژنە تازەکەی تودۆر تۆی؟

ـ منم.

ـ دوو هەتیوت هەیە؟

ـ بەڵێ . دوو.

ـ تودۆریش هەر وایە.

ـ دەزانم.

ـ پێت وایە بۆی باش دەبی؟

ـ پێم وایە.

ـ من هیچ پێم وا نییە لێرە زۆر هەڵ بکەی.

ـ بۆ؟

ـ تودۆر کەسێکی شەڕاشۆیە.

ـ جا شەڕاشۆییەکەی لەگەڵ من چ دەبێ؟

ـ کە تۆزێك رابرد، لێت روون دەبێتەوە.

ـ زۆر باشە. کە لێم روون بۆوە، خۆم دەزانم دەبێ چ بکەم. جارێ هیچ شتێك نازانم.

ـ ئەوە من پێم گوتی.

بە ئانقەست ئەو قسانەی دەکرد، بەشکم قسەم لە بن زمانی دەرکێشێ. بۆیە زۆرم ئاگا لە خۆم بوو. تکام لێ کرد دانیشێ، بەڵام دانەنیشت.

ـ حەزم لێ بوو لە ئێستاوە پێت بڵێم. تۆ لێرە هەڵ ناکەی و رەوگیر نابی. ئێمە حەز ناکەین تۆ لێرە وەمێنی.

ـ ئێمە، یانی کێ؟

ـ هەر ئێمە، کەس و کاری تودۆر.

ـ جا کێ رێی بە ئێوە داوە خۆ لە ماڵی من هەڵقوتێنن؟

کە ئەم قسەیەم کرد، هەوگیانەکەم دەهری بوو:

ـ ماڵی تۆ؟ ئێرە ماڵی تۆ نییە، ماڵی تودۆر و منداڵەکانی و کۆنەژنەکەیەتی. تۆ ژنی دووەمی ئەوی و لێرە غەوارەی. ناچارت دەکەین تێ بگەی. ملت بشکێنە.

ملی رێی گرت و رۆیشت، بەڵام تۆزێك دواتر هاتەوە. تۆ بڵێ ئەم جارە بە قەڵافەتێکی دیکەوە: زاری بستێك داپچڕیبوو:

ـ دڵت لێم نەیەشێ ماری... ها؟ پێم وایە ناوت مارییە...

ـ بەڵێ، ناوم ئەوەیە.

ـ پێت ناخۆش نەبێ... ئاردی گەنمەشامیمان نەماوە، ربەیەکمان بدەیە.

هەستام و دوو رەبەم ئاردی گەنمەشامی بۆ لە داوێنی کرد.

ـ خۆ دڵت نەیەشاوە؟

ـ نا، زویر نەبووم. لە دراوسێیەتیدا بنیادەمەکان دەبێ یارمەتیی یەکتری بدەن، چ بگا بەوەی کەسوکاری یەکتریش بن.

پێم وابوو هیچ نەبێ ئیتر ئەو رۆژە جەحەندەم پڕ دەکا و لێم دەبێتەوە، بەڵام دیسان سەروسەکتی پەیدا بۆوە:

ـ خەریکم ماماڵیگا دروست دەکەم. ئەی هێلکەیەکیشت هەیە بمدەیەی؟ بۆ ڤاسیلێی کوڕمە. هیچی بە دڵ نییە.

لەسەر رەفەکە، چوار هێلکەم لە دەفرەکە دەرهێنا و دامێ. بۆ سبەینێ هات داوای ساواری کرد و هێلکەیەکیش. رۆژی سێیەم هات، بەبێ ئەوەی قسەیەکیشم لەگەڵ بکا، یەکسەر چوو فەردەی ئاردەکەی هەڵڕشت و هیزە رۆنەکەشی هەڵگرت. رۆژی چوارەم لە کولانەی پەلەوەرەکان قازێکی کوشتەوە و بردی. ئەوە ئێمە خۆمان خەریکین لۆبیای کولاو و ماماڵیگا دەخۆین. وستەم لێوە نەهات. بەڵام ئیتر شەوێك کوڕەکەیم لە باغەکەدا گرت، کە خەریك بوو باقە شەغرە و یۆنجەی ئێمەی هەڵدەگرت و بەسەر پەرژین و چەپەرەکەدا فڕێی دەدایە حەوشەکەی خۆیانەوە. ئیتر بێتامیان کردبوو. مێردەکەم کە هاتەوە، هەموو شتم بۆ گێڕاوە. لێم پرسی:

ـ ئەوە لە مێژە ئاوا رێگەت داوە بەو دەرودراوسێ و خزم و کەسە، ئاوا تالانت بکەن؟

ـ مەبەستت کێیە؟

ـ میترای هەوگیانم.

ـ کە ژنەکەی پێشووشم مابوو، هەر جارێك شتێکیان کەم بوایە، دەماندانێ. دەی بلێین چی، پێویست بوو. برای گەورەمە و، ئەویش ژنێتی. قەت دەستیانم نەگێڕاوەتەوە.

ـ ئەی دەتەوێ هەروا بی؟

ـ چووزانم. لەوانەشە وا نەبێ.

میترا دیسان بە قاپی سواڵەکەیەوە هاتەوە. شانیم گرت و فڕێم دا دەرێ. مۆڕەمۆڕ سەیری کردم. ئەگەر پێویست بێ تیشی هەڵدەدەم.

درمغەکەم هەڵگرت. تەشك و داوێنی کۆ کردەوە و دوو پێی هەبوو، دووی دیکەشی قەرز کرد و تێی قووچاند. کە گەیشتەوە حەوشەکەی خۆیان، دەستی کرد بە هاتوهاوار:

ـ ئای بمگەنێ، بمگەنێ، ئەی هاوواار، ژنەکەی تودۆر دەیەوێ بمکوژێ...

پێکەنین گرتمی. باشە درۆی وات گوێ لێ بێ، چۆن پێناکەنی؟

دێڵە قەحپەی دەروجیران لە بەر دەرگای کۆ بوونەوە:

ـ دا بلێ بزانم چ قەوماوە؟

ـ کچێ هەر وا چووم بزانم چ دەکا. ئاخر هەر شتێك بێ، هەوگیانمە. کوتوپڕ دەستی دایە درمغ، خۆ ئەگەر دەرنەپەڕیبایەم، خوا بزانێ سەری شکاندبووم. ئەی لەو دێڵە بێحەیایە. خۆ شەیتانێکە و تەواو. چیتان لێ وەشێرم...

هات و لەلای پەرژینەکە راوەستا و چیی جنێو و قسەی ساردوسووك بوو، پێی دام. لە ژیانمدا جنێوی وام نەبیستبوو. تۆزێکم گوێ لێ راگرت، ئیتر هاتمەوە خەریکی کاروبارەکانی ماڵەوە بوومەوە. ئەرێ چەندەی بەسەردا تێپەڕیوە؟ دە ساڵ؟ نا خوایە، چواردە ساڵ... لەوەدەمەوە لەبزمان لە لەبزی یەك نەگەڕاوە. تەنیا لە سەر کانی یەکتر دەبینین. بە پۆزێکەوە سەیرێکم دەکا و لە بن لێوانەوە ورتەیەکی دێ و تفێك دەکا و ملی رێگە دەگرێ و دەڕوا. منیش وەك ئەو تفێك دەکەم و پشتی تێ دەکەم. کوڕەکانیشی سەرمان نادەن. کە ژنی بۆ رۆشیایش هێنا، لێی نەگێڕاینەوە. هەر ڤۆیکۆوی شووبرام جاروبارە سەرێکمان لێ دەدا. پێشم وایە بە دزی ژنەکەی دێ و بە تاریکی. مەسەلەکەی من و میترای هەوگیانم ئاوا بوو. بەڵام لەگەڵ ریمۆئانتا جۆرێکی دیکە بوو.

پوورەئۆتزۆپار باوێشکێکی دا، ددانە کەسکەکانی و ددانە رزیوەکانی خلێنەی و تەنانەت زمانەچکۆلەشی دەرکەوت. زمانی پوورم زەرد زەردە وەك زەعفەران.

ـ ناوەکەی ئەوەیە، یان خۆت ئەو ناوەت لێ ناوە* ؟

ـ من ئەو ناوەم لێ ناوە. دیارە. ناوی خۆی پائۆنایە. یانی پائۆنا بوو. چونکە لەو دەمەوە کە من (هەر بەراست ئیتر لەبیرم نییە بۆچی) ئەو ناوەم لێ ناوە، هەمووی ئاوایی بەو ناوەوە بانگی دەکەن... بە کورتی، مەسەلەکەی من و ئەو بەو شێوەیە بوو، کە بۆت دەگێڕمەوە: وەك خۆت دەزانی، ژنەکەی پێشووی مێردەکەم لەو بەتەمەنتر بووە. وەك بۆیان باس کردووم، زۆریش جوان نەبووە. پێم وایە ژنێکی ئازا و بەمشوور بووە. کە زەماوەندیان کردووە، مێردەکەم هەر حەڤدەساڵێکی تەمەن بووە، بەڵام ئەو بیست و پێنج ساڵی رێك بووە. تودۆر، هەر بستە منداڵێك بووە، کە ژنیان بۆ هێناوە، چونکە خەزوورەم سەری ژنی حەوتەمیشی خواردبوو و، ئیتر ماڵەوە حەوجێی بە ژنێك بوو.

ـ هەر بەراستی خەزوورت حەوت ژنی هێنابوو؟ من پێم وا بوو هەشت بووە.

ـ نا، حەوت. سەری هەر حەوتیشیانی خوارد. ژنەکانیشی هەر کامە و منداڵێکیان دەخستەوە و لە سەر منداڵی دووەم دەمردن. ژنەکان دەمردن و ساواکەشیان بەسەر مێردەدا بەجێ دەهێشت. ئەویش ناچار دەبوو، دەسبەجێ ژنێك بێنێتەوە. کارێك، کە هەتا لە پێ کەوت، هەر ناچار بوو بیکاتەوە.

---

* هیچ باسێکی ناوەکە نەکراوە...

مێردەکەی من، منداڵی دوا ژنی بوو، کە وەك ژنەکانی دیکەی لە سەر منداڵ چوو. تودۆر، خوشکەکانی گەورەیان کرد. کە ئاخر خوشکی مێرد دەکا، تودۆر ناچار دەبێ ژن بێنێ... جا بە حەزی خۆی بووە یان نا، کەس ئەوەی لێ نەپرسیوە. تەنانەت منیش لێیم نەپرسیوە. بەڵام، باشە ئیتر، زۆر زۆر گەنج بووە و، خووخدەی خراپیشی پێوە نووساوە و، تەرکی نەدەکردن. هەر لە سەردەمی ژنەکەی یەکەمییەوە، وەك هەموو پیاوێکی دیکە چاو بەدەرەوە بووە. زیاتریش ژنە جیرانەکان لێی هەژاون. تەنیا هیچی لە ژنە کوورەکەی بان نەکرد.

ئیڤانیکا، ژنە کوورەکەی ئیناکۆبان، وەك بڵێی لەم دنیایەدا هەر ئەم ژنە کوور بێ، بەبێ ئەوەی جوان روونی بکەنەوە بە چ دەڵێن کوور. ئیانکۆی مێردیشی کوور بوو. بابا رۆدانی باوکی، کە پار مردووە و، جا کە دەڵێن، تا ئێستا هەرچی ناشتوویانە، دەسبەجێ پواوە، ئیتر ئێستا دەبێ ئێسکوپرووسکیشی پوا بێ ـ نۆ کوری هەبوو و خوا تەنانەت کچێکیشی پێ نەدابوو... ئیانکۆ پاشەبەرەی بوو...

رێك وەك ئەو سەردەمانەی هەرچی و پەرچیی خوانەناس، لە قەڵاکانی تۆرنۆوە دادەگەران و، وەك کوللە و مێروو بە ئاوەدانییەکان وەردەبوون، پەتای خرۆێلکە هەموو گوندی تەنییەوە. رادۆبان، لە زستانێکدا هەشت کوری مردن. لە گۆرستانەکە بەفری لادەدا و عارەبانەیەك کلۆشی دەبرد و ئاگری دەدا، بەشکم بەستەڵەکەکە بتوێتەوە و بتوانێ قەبرێك هەڵکەنێ. گۆرێکی گەورەی هەڵدەکەند، بۆ دوو کەس، بۆ سێ کەس... کورتی ببرینەوە، جگە لەو ئیانکۆ نارێکە زیقنە، کەسی نەما. ئەی خۆزگە هەر نەبا، دوو کوری دیکەشی مابان.

بابە رادۆبان گەنمی لە عارەبانەکەی دەکرد و دەیبردە ئەو ئاشەی ئەودەم بە ئاوی رووبارەکەی ئۆڵت دەگەرا. خەڵکی خوای مانگەو مانگ لە نۆرەیدا دەمانەوە. ئیدی، چما لەو ماوەیەدا دەکرا هیچ نەخۆی؟ ناچار هەرزنەکانیان لە دەستار دەکرد و، جا وەرە بەسەریدا بچەمێوە و بیسوورێنە و ئاوی چەم راوەستێ تۆ رامەوەستە... بۆ ئەوەندۆکە ئاردەی، کە تاقە جەمێك مامالیگای پێ دروست بکەی، خۆ بنیادەم دەبێ رۆژێك تا تەنگەی ئێواری دەستار بسوورێنێ. خۆ هەر لە سۆنگەی ئەو دەستارگێرانەوە بوو، کە ئیانکۆ پشتی کۆم بۆوە. ئیدی وای لێ هات بنیادەم هەست دەکا کوورە.

ئیانکو ببرای ببر، بیریشی نەدەکردەوە، کچۆڵەیەك بخوازێ وەك سنۆبەر راست و تیشکەڵە بێ. بەڵام دەبێ بەو چاوانەی خۆت ببینی، لە بری کچ چییان خستووەتەوە. هەر مۆتەکەیەك و تەواو، ئەویش مۆتەکەیەکی گن و منگن... بەو حاڵەشەوە هاتوومە سەر ئەوەی بۆ نیۆنی کورمی بخوازم. هەڵبەت وەختایەك هەردووکیان گەورە بوون. کچە زەوی و زاری هەیە خوشکێ. تاقانەشە. خۆ ئەگەر خرۆێلکە نەهاتبایە، زەوییەکەی بابا رادۆبان دەبوو بە شەش کوتەوە. بەڵام ئیانکۆ خوا خوێندییەوە و، بەتاقی تەنێ زەوی و ماڵ و سامانی باوکەی پێ برا. ئێستا

ئیدی خۆی جووتبەندەیەکی[*] تەواوە. ئای، جا چ لەوە باشترە زەوی و زارت هەبێ و تاقانەکچیش بی؟ ... دوور نەڕۆین هەر ئەو ماندیکایەی کچی گۆلیێ. لە ڕۆژە خۆش و بەزمەکاندا، بەیانی تا ئێوارێ هەر تەقەی نالْچەی کەوشی دێ. کراسە یەخەکراوەکەی لەبەر دەکا و، لەچکە هەوریشمینەکەی بەسەریدا دەدا و لە تەڕی دەخوا و لە وشکی دەنوێ. ئەو مێردە یۆنانییەشی، هیچی لێی ناوێ. شیرینی و حولْقوومی دنیای بۆ دێنێ و بە دەمیەوە دەکا.

ماندیکا سپیکەڵە و خرپنەیە. چاوی کاڵن. تەمەنی ناگاتە بیست، کە باباگۆلییێی باوکی، لە پانابیت بارکازی عەلاف[**]ی مارە دەکا (کە گوندییەکان پێی دەڵێن کاك بارکیو. یۆنانییەکی بەتەمەنی ریشدرێژە. گیانی لەگەڵ ژنەکەی دەردەچێ.

دایکم دەڵێ:

ـ وەك دەیبینی، منداڵی ئێمە هەموو پەڵەیەکی سووریان لە تەنیشت کەپۆیە. هەتا دوازدەسالان مەحاڵە ئەو پەڵەیە لابەری، بەڵام دوایی خۆی نامێنێ. ئەوە نیشانەی بنەماڵەییە. هەموو ئەو منداڵانەی دراوسێکانمان، کە بەر لە هاتنی ئێمە بۆ ئێرە لەدایك بوون، ئەو نیشانەیان پێوەیە و هەمووشیان دەڵێی سێوێکن و لە نێوەڕاستەوە لەتت کردوون، لە گیۆرکێ و لێیانا و داریە دەچن. من هێشتا جێ قوونی خۆمم خۆش نەکردبوو، کە زانیم بۆچی ژنانی دەرودراوسێ ئاوا ئیرەییم پێ دەبەن و چاویان پێم هەڵنایە و هیچیان حەز ناکەن داودامەزراو بم و وەمێنم. لەهەموانیش زیاتر، ژنەتیوەکەی ژیگۆیی بوو، کە رقی ئەو دنیایەی لێم بوو و بەخوێنم تینوو بوو: هەر ئەوەی مێردەکەم، لێیانای کچی پێ سپاردبوو.. کە بە تودۆرم گوت بچێ کچەکەی بێنێتەوە، ژنە بەچەقی لەعنەتێدا چوو و نەیداوە... خۆم دەمگوت، باشە من سێ منداڵ تەڕ و وشك دەکەمەوە، با ببنە چوار خۆ کابە کەچ نابێ. نەمدەویست مێردەکەم وا بزانێ فەرق و جیاوازی لە نێوان منداڵەکانی خۆم و ئەو دادەنێم. بەو حاڵەشەوە زۆری پێ نەچوو کە وای بیر کردەوە. دیارە ئەو بیرە خراپەشی نەچووبووە مێشکی. ئەی چی؟ ژیان وردە وردە فێری سەگوسەگبابێتی و شەیتانیی کردم. ئیتر. وەختایەك دیتم نەخێر، ژنەی ژیگۆیی بەتەما نییە کچەم بداتەوە، خۆم لێ مات دا  ڕۆژێك کەڕەی بەیانی هات لە بیرەکە ئاو هەڵێنجێ منیش سەتڵم هەڵگرت و وەشوێنی کەوتم.

پێم گوت: ـ گوێ راگرە پایۆنا. دەچی کچە دێنیەوە و دەمدەیەوە.

ـ کچی تۆ نییە.

ـ ئەگەر کچی مێردەکەمە، دیارە کچی منە. دەچی و دەیهێنیەوە.

---

[*] جووتبەندە: سالْی سالاْن لە گوندەکان سێ چین و توێژ هەبوون. ئاغا، رەشایی، کە خەڵکی بێ زەوی و زار بوون و جووتبەندە، کە زەوی و زار و گاوجووتی خۆی هەبوو.

[**] عەلاف: بازرگانی دانەوێڵە.

ـ ناتدەمەوە.

ـ تۆ پایۆنا، چاوت پێم هەڵنایە.

ـ ڕاست وایە. ڕقم لێتە.

ـ بۆ؟

ـ پێت ناڵێم بۆ. ئەگەر تۆزێك ئەقڵت هەبێ، دەزانی بۆ.

ـ تۆ گانت بە مێردەکەم دەدا؟

ـ ئەی چی؟ هێشتا دەیدەمێ. حەزم لە تودۆرە.

ـ ئەی مێردەکەی خۆتت خۆش ناوێ؟

ـ با، بەڵام حەزم زیاتر لەوی تۆیە.

ئەو دەمیش سەروبیچمی هەر وەك ئێستا وا بوو: وردیلە، دەموچاوپان و قوون و سمتێکی پان وەك هیزە. پێم وایە لە ئێستای تەڕ و بڕتر و گەرموگوڕتر و بەئالۆوشتر بوو.

چاوم چوونە تۆقی سەرم و خوێن بەری چاومی گرت.

گوتم: ـ وا دیارە دەست هەڵناگری.

ـ گوتی، نەخێر، واز ناهێنم. چ گوویەکت پێ دەخورێ؟ دەتەوێ چ بکەی بەرەڵای بێگانە؟

ـ وات لێ دەکەم...

سەتڵەئاوەکەم کە هەڵێنجابوو، هەر بەدەستمەوە بوو. ڕێك پێمدا دا. سەتڵەکە زۆر قورس بوو. شەویلکەی گرت و خستی. لێی تخێڵ بوو و دەستی کرد بە پەلەقاژە. چاوی سپی هەڵگەڕان و زمانی لە نێوان ددان و شەویلکەرەقهەڵاتووەکەیەوە هاتە دەرێ و خوێن لووزەوی بەست و بەلالغاوەیدا هاتە خوار. سەتڵی ئاوەکە هەروا بەسەر سەرییەوە دەلەرییەوە. دەسکی سەتڵەکەم گرت و کێشام و بەسەریمدا کرد. سەتڵێکی دیکەشم هەڵکێشا و سەتڵی خۆمم پڕ کردن و لەسەرخۆ چوومەوە ماڵێ. ئەو لەوێ بەجێ ما و هەروا پەلەقاژەی بوو. ئەوە کەڕەی بەیانی بوو. تاوێك دواتر کە سەیری لای بیرەکەم کرد، دیتم لەوێ نەماوە. کە وەهۆش هاتبۆوە، کلکی لە گەڵۆزی نابوو و ڕۆیشتبۆوە... لەوەدەمەوە هەر جارێکی دەمبینێ، ڕووی وەردەگێڕێ، کە تووشی پیاوەکەشم دەبێ، هەنگاوی خۆش دەکا. ئیتر لە پشت پەرژینەکەوە چاوڕاومان ناکا... کچەی داماو، ئەوەندەیان لەگوێ خوێندووە، کەیفی بە ئێمە نایە. بە شوێن بزنەکاندا بە بەر ماڵماندا ڕادەبرێ. دەچم لە شیپانەی دەرگادا ڕادەوەستم، هەوڵ دەدەم دوو قسەی لەگەڵ بکەم، یان نانێك، سێوێك، هێشووە ترێیەکی یان هەر شتێکی لە ماڵەوە هەبێ بیدەمێ،

تێی دەقووچێنێ و لێمان رادەکا. قەت بە لای ماڵماندا نایە. تەنانەت فێریان کردووە، رقی لە بابیشی بێ. لە سەر ئەو کارە، لە ئاگری دۆزەخدا دەسووتێ.

*

*

*

هەر باسی جەهەننەمە و لە بن گوێی بنیادەمی دەخوێنن.

کە دەچینە نێو کلێسا گەورەکەی تەنیشت قایمەقامیەوە، هەر لە بەر دەرگاوە، بە راست و چەپدا کە لا دەکەینەوە، هەر لە خشتی تەختی عەرزەکەیەوە تا گومبەزی میچەکەی، سەیری هەر دیوارێکی دەکەین، دەبینین دیمەنی جەهەننەمیان کێشاوە... یان مەسیحە، کە زیندوو بووەتەوە و بەبێ باڵ بەرەو ئاسمانێ دەکشێ، یان مەسیحە بچکۆلانە گووپنەکەیە، بە چاوەکاڵەکانییەوە لە هەموو وێنەکاندا، لە باوەشی مریەمدا وا پێدەکەنێ. لەو بەریشەوە مریەمی پاکیزەیان کێشاوە. دڵم بەوە خۆشە، کە دایکیشم وەك مەریەمی پاکیزە، ناوی مەریەم(ماری)ـیە. نازانم بۆچی، بەڵام هەر دەڵێی رۆنی سەم لە قەلبی دەدەن.

هەر جارێکی چوومەتە کلێسا و سەیری تابلۆکانم کردووە، سەرم سوورِ ماوە. بەڵام ئەوەی لە هەموانی پتر لێ وردبوومەتەوە، جەهەننەمەکە بووە، کە قەشە بەردەوام بەرێی ئەوێمان دەکا. هەر ئەو دۆزەخە خەیاڵییەی سەر دیوارەکەی ئەملاولای دەرگای وەژوورکەوتن.

بڵێسەی سوورسووری زل زل لە بن مەنجەڵە زنجیردارەکاندا دەبینی، کە قیریان تێدا دەکوڵێ و هەڵمێکی زۆر و سپی سپی بەرەو گومبەزی کلێساکە لەسەریانەوە هەڵدەستێ. لە هەور و هەڵمەکەشدا، شەتانەکان دیارن، بە کلکی درێژ و تێکئالاّو و شاخی قیت و گوێچکەی پان و کەپۆی خوار و هەڵگەڕاوە و قەپۆزی وەك بەرازەوە. شەیتانی کوڵکن، کە هەر کامەی ئاسنێکی چوارشاخەیان بەدەستەوەیە و، رۆحەکان لەم پاتیلەوە دەردێنن و دەیخەنە پاتیلەکەی دیکەوە. رۆحاناتی ئەو بنیادەمانەی لەو خوار خوارەوە، گوناح و موناحیان کردووە.

بەپێ دزە دەچیە باخی دراوسێکەتان و سێوێك دەدزی؟ ماڵوێران بووی. رۆحت تێدا چووە. کە مردی ئاگری جەحەننەم چاوەڕێتە. ئاگری جەحەننەم و مەنجەڵێکی زنجیردار کە قوڵتەقوڵت قیری تێدا دەکوڵێ و نێزەی چوارشاخە، کە رۆحاناتی بنیادەم مەنجەڵاومەنجەڵ دەکەن.

ئەسپەکانت بردووەتە لەوەڕ و شەکەت بووی و خەوت لێ کەوتووە و چوونەتە نێو گەنم و حاسڵات و گەنمەشامی و یۆنجە و کونجیی خەڵکەوە لەوەڕیون؟ قوڕت بەسەر بووە. هەر ئەو ئاگری جەحەننەمە، هەر ئەو شەیتانانە، هەر ئەو مەنجەڵە پڕ قیرە لەکوڵانە چاوەڕێتن.

گانتزای دەشتەوان، جنێو و قسەی ساردوسووکت پێ دەڵێ؟ وا باشترە هەر حیسابی سەیەکیشی بۆ نەکەی: خۆی لە ڕۆژی قیامەتێدا لە ئاگری جەحەننەمدا دەبرژێ. بەڵام ئەگەر تۆ لێی بگەڕێیەوە و جنێوی بدەیەوە و قسەی پێ بڵێیەوە، هەر مەپرسە، هاوارە، هەر خوا بزانێ چیت بەسەر دێ.

جنێودان بە قەشە و شارەدێوان(قایمقام)، هەر هیچ، هەر بیریشی لێ مەکەوە... ئەوە لە هەرچی گوناحی بیرت لێ کردووەتەوە گەورەترە. جا سوور بزانە، ئەگەر گوناحەکەت ئەوەیە، ئەوە هەر قوڕت بەسەر بووە و ئەها. وا باشترە بیرێك لە حاڵ و وەزعی خۆت بکەیەوە. چونکە، ئاوا بێ، نەك هەر لە ئاگرەکەی دۆزەخدا دەتبرژێنن، بگرە بە قەمچی و قۆناغە تفەنگیش دەتهاڕن. هیچ نەبێ دەمو لەوس و قەپۆزت دەدەنە بەر مست و پێلەقە، دەستیان بگاتە هەر جێیەکت...

قەشە تاوێك چییە دەمی ڕاناوەستێ و یەکپشوو خەڵکی لە ئاگرەکەی دۆزەخ و ئەو مەنجەڵانە دەترساند، کە قوڵتەقوڵت قیریان تێدا دەکوڵێ.

زستانە. بەفر کلووکلوو دەبارێ. توێژێکی سپی، گوندەکەی داپۆشیوە. تاقە شتێکی ڕەش دەچێتەوە، ئەو قالاوانەن*، کە لەم ئەرخەوانیەوە دەفڕنە سەر ئەوی دی. ڕێك وەك قەشەیەکی خاچێکی بەدەستێکەوە و چەند چڵە ڕیحانەیەکی بە دەستەکەی دیکەوە بێ و لەمماڵەوە بچێتە ئەو ماڵ، بۆ ئەوەی بە بۆنەی جێژنی پیر یۆحەنناوە بەرەکەت بە خەڵکەکە بدا.

سەلاکەری کلێساش بە لبادە کاڵەوەبووەکەیەوە سەتڵە ئاوە متفەرکەکەی بەدەستەوە و بە لۆژەلۆژ و بە شوێن قەشەکەدا دەڕوا. قەشە دەچێتە ماڵێکەوە و دەست دەکا بە ئامۆژگاری و دوعاکردن. خەڵك بە منداڵەوە لەبەر دەرگا چاوەڕێی دەکەن. قەشە چەپکە ڕیحانەکە لە ئاوە متفەرکەکە هەڵدەکێشێ و لە نێوچاوانیانی هەڵدەسوێ و نزایەك دەکا. ژن و منداڵ و پیاو دەستی قەشە ـ کە بنی نینۆکی ڕەش بوون ـــ ماچ دەکەن. دەڵێن، دەستی قەشە پیرۆز و متفەرکە و دەبێ ماچی بکەین...

ئێمەش ئەگەر قەشە بۆلبۆك گەورەی کردبایین، کە لە ڕۆژانی نۆیل یان جێژنی پاکدا پێی پیرۆزی خستبایەتە حەوشەی ماڵمان، دەستیمان ماچ دەکرد. بەڵام بۆلبۆك، وا خۆی لە ماڵی ئێمە دەبوێرێ، وەك بڵێی ماڵی کافرانە. سەگی سەگباب وەك بڵێی خۆی ئیمانێکی پتەوی هەبێ و خوا بناسێ. وەك بڵێی ئێمەش هەر بەراستی ئیمانمان بەخودا هەبێ.

خەڵك هەر هەموو باسی خودا دەکەن، بەڵام ئەگەر ڕاستیت دەوێ هەر دەمیان ڕاهاتووە. ئێمەی منداڵ بڕای بڕ بیر لەو شتانە ناکەینەوە.

---

* قالاو/قالاو: قەلەڕەشە

که گەورەکان متفەڕك کران، دەبێ دەست لە گیرفان بنێن و چییان هەیە هەڵیڕێژنە نێو سەتڵی ئاوە متفەڕکەکەوە. بەڵام ئێمە لە بری ئەوەی لاسایی ئەوان بکەینەوە، وامان پێ باشترە، تفێك بکەینە سەتڵە بچووکەکەی قەشەوە.

ئەگەر یەکێك تەنیا دوو دیناری تێ بخا، قەشە لە بن لێوانەوە جنێوێکی دەداتێ. سەڵاکەر، هەر بێشەرمانە بە دەنگی بەرز جنێوی پیس پیسی پێ دەدا. قەشە تەنیا وەختێك کەیفخۆش دەبێ، کە هیچ نەبێ دراوێکی پەنجا لێیەیی بە قوزەڵقورتی بکەن.

قەشە باوەڕی وایە، خاوەنی مەزرایەك، باشترین مەسیحیی دنیایە. خاوەنی مەزرا و زەوی و زار، مەحاڵە ئاگری دۆزەخ بیسووتێنێ. ڕۆژی قیامەتێ قەشە خۆی چاوی بەسەرییەوە دەبێ. لە هەموو وەعز و ئامۆژگارییەکانیدا، پاش ناوی ئۆسقۆف ناوی ملّکدارە گەورەکە واتە بانێئاسا دێنێ، کە ناوێکی زلی هەیە: ناوی گراسیم میلیان میلیارەسیە. لاڵەپەتە و ئیفلیجە. ئەگەر بۆ کارێك ناچار بکرێ بچێتە مەڵبەند(قایمەقامیە)، کە لە پەیتوونەکەی دایانبەزاند، دوو نۆکەر لە کۆڵی دەکەن. قاچی شل و شەوێق لە پشتەوەی جۆلانە دەکەن.

گوندی کە ناوی بەگ دێنن، بێت و دڵنیا بن نە سیخوڕەکانی و نە تازەپێگەیشتوانی ئاوایی گوێیان لە دەنگیان نابێ، بە گاڵتەوە بە کۆلارێز ناوی دێنن، کە بە مانای قاورمە برنجە. ئاوا ئاسانترە.

ـ داریە، تۆ و ئاغا چ جیاوازییەکتان هەیە؟

ـ خوا دەزانێ هەر هیچ.

لە دایکم دەپرسم:

ـ باشە بۆچی قەشە قەت نایەتە ماڵی ئێمە؟

لە ماڵی ئێمە، تەنیا دایکم خەفەتی لێ دەخوا کە قەشە خۆی لە ئێمە دەبوێرێ و بەلاماندا نایە. باوکم، خۆی ردێنێکی درێژی هەیە و دنیایەك بەیاز و کتێبی نزا، کە شەو تا بەیانی خەریکی خوێندنەوەیانە. دایکە، یەکشەمەو یەکشەممە بۆ ڕێوڕەسم دەچێتە کلێسە. ئیتر لەوێ قەشە ناتوانێ بیگێڕێتەوە و نەهێڵێ دایکە خاچ و شکڵی ئەولیا و ئەنبیا ماچ بکا. دێڵەسەگی رق و قینەکەی ئیتر لە کلێسا ڕێی نییە، پێم وایە هەر لێی مۆڕ دەبێتەوە.

لە وەڵاممدا دەڵێ:

ـ رقی لێمانە. بەتایبەتی لە بابت.

ـ باشە بۆ رقی لە بابمە؟

ـ لە سەر گیۆرکێی برات.

ـ جا گیۆرکێی برام چ خراپەیەکی بۆ قەشە هەبووە؟

ـ چووەتە قوتابخانەی ئایین. ئەوانەی دەیانەوێ ببنە قەشە، لە حوجرە دەرزی ئاین دەخوێنن.

ـ دەی باشە. یانی قەشە پێی ناخۆشە کاکە گیۆرکێم ببێتە قەشە؟

ـ نەك بڵێی پێی ناخۆش بێ. قەشە خۆیشی دوو کوڕی هەیە کە لەوێ دەخوێنن و، ماوەیەکی دی دەبنە قەشە. دەیەوێ کوڕە گەورەکەی ببێتە قەشەی ئێرە و کوڕە چکۆڵەکەشی قەشەی گوندەکەی دراوسێمان.

چما براکەم ناتوانێ خۆی جێیەکی دیکە بدۆزێتەوە؟

ـ چۆن ناتوانێ. بەڵام قەشە دەترسێ نەکا گیۆرکێ بیەوێ هەرچۆنێکی بێ، بێتەوە ئێرە.

ـ دەی جا؟

ـ ئاخر... ئێرە گوندێکی گەورەیە و وەرزێری دەوڵەمەندیشی زۆرە.

لە گوندێدا دەمگۆ داکەوتووە، کە لە قوتابخانە کەس نییە هێندەی کوڕەکانی قەشە تەمبەڵ و هەرچی و پەرچی بێ. ئەوە ساڵی خوێندنیش تەواو دەبێ. قەشە بۆلبۆك ئیتر ناحەسێتەوە. ئەگەر یەکێك منداڵێکی هەبێ و بیەوێ لە ئاوی متفەڕکی هەڵکێشێ، یان بیەوێ ژن بۆ کوڕەکەی بێنێ، ناچارە پارەیەکی زۆری بۆ دابنێ. جگە لەوەش، تەنانەت بۆ نوێژ و نزایەکی ئاساییش داوای پارەیەکی زۆرمان لێ دەکا. گازی دەوێ، قەلی دەوێ و، ئەگەر خوا پێی دابێ و وەزێرێکی دەوڵەمەند بی و پوورەهەنگت لە باخیدا هەبێ، جگە لە پارە، کیلۆکیلۆ هەنگوینیشت لە چنگی دەردێنێ. بە توورەکەی پڕ لیرەی زێڕ و زیوەوە کە خرینگەیان دێ و، تێڕ و کورتانی پڕ لە خۆراك و نۆبەرانە و خەرمانانە، دەکەوێتە رێ و دەچێتە شاری. لە بەردەمماڵێکدا خۆی دێنێتە حاڵی مردن و لە بەردەم ماڵێکی دی حەیا بەخۆیەوە ناهێڵێ، ئاخریەکەشی دەحەسێتەوە: ئیتر منداڵەکانی لە تاقیکارییەکان وەك کەرێ لە قوڕ ناچەقن. ئەودەم نیوە بەختەوەر و نیوەداماوە دێتەوە ئاوەدانی. بۆیە خۆی بە بەختەوەر دەزانێ، چونکە کوڕەکانی هەنگاوێك لە قەشەبوون نزیکتر بوونەتەوە و، بۆیەش خۆی بە داماو دەزانێ، چونکە بۆ ئەو یەك هەنگاوە، دنیایەك پارە و بەرتیل و دیاریی داناوە.

لە مەیخانە، یەکێك لەو بەرازە غەزریوانەی کەس نازانێ بۆ وا رقنە، بەبێ ئەوەی بڵێ مەبەستی چییە، هەروا لەخۆوە لە نێوان دوو پێکی ئارەقدا لە قەشە دەپرسێ:

ـ ئەی کوڕەکەی تودۆر، بابا؟ ئەو دەردەچێ؟

ـ خوا بمکوژێ ئەگەر ئاگام لە شتێك بێ، رۆڵە.

ئیتر تەشك و داوێنی کۆ دەکاتەوە و خەڵکی خوای قاقا دەکێشن.

باوکم قەت نەچووەتە بۆخارێست. گیۆرکێی برام بەتەنێ لە ماڵەوە کەوتووەتە رێ. من هەر ئاگا و خەبەریشم لێی نییە. کە رۆیشت، من زۆر منداڵ بووم. وەك تارماییەك بیرەوەرییەکانیم دێنەوە بەرچاو. تەنانەت هاوینانەش کە

وەرزی پشووە، دەرفەتی نییە سەرێك لە ماڵەوە هەڵێنێتەوە. دەچێتە شوێنێكی دی و كار بۆ دەرەبەگێك دەكا. دەڵێن میكانیكێكی باشیشە. پۆپێسكۆ براگادیرۆ، مامۆستاكەی ئاوایی، شتی زۆر سەیر و سەمەرە لە گیۆركێی برام دەگێڕێتەوە و، زۆر ناخایەنیّ، قەشەش ئەو قسانە دەبیسێتەوە.

قەشە زۆر جاران سەرێك بە مەیخانەدا دەكا. هەموو مەیخانەكان. لەم مەیخانەوە بە قۆرتە دەچێتە ئەوی دی. عەبا و كڵاوە مەخمەرەكەی بە دارجلەكانەوە هەڵدەواسیّ و، ئەوە هەر بۆ قەشمەری، پێیان دەڵیّ:

ـ لێرە بن. پاپا بۆلبۆك، یانی تۆماسی لێقەوماو، دەیەویّ تۆزێك رابوێریّ.

عەباكەی قەشە، بە نزاكەتەوە بە دارجلەكەوە خۆ دەگریّ. كڵاوەكەشی هەروەتر. ئینجا تۆماس بۆلبۆك، كە شتە پیرۆز و ئاسمانییەكانی بەلاوە ناوە ، خووی داوەتە شادییەكانی ئەم دنیا بیّ بەقایە، خۆش رادەبوێریّ. هەر هەواڵێكی لە شارەوە بیّ و باسی براكەی من بیّ، چزەی لە دڵی هەڵدەستێنیّ. لێی گەڕیّ با قەشە فجە بكا و ئاگر بگریّ. چونكە بەهیچ كلۆجیّ ناتوانیّ پێشی خوێندنەكەی كاكە گیۆركێم بگریّ، هەوڵ دەدا حەیای ئێمە بەریّ. نایە ماڵەكەمان متفەرِك بكا، ئای لەو سزا گاڵتەجارِە.

بەر لەوەی بزانم بۆچی قەشە ئەوەندە لە ماڵەكەی ئێمە زویرە، هەر كاتێكی لە كۆڵانیّ دەمدی، وەك خەڵكی دەمگوت:

ـ باوە، دەستت ماچ دەكەم.

خەڵك كە وایان دەگوت، وەڵامێكی دەدانەوە. من كە وام دەگوت، لە بن لێوانەوە جنێوێكی دەدامیّ. كە زانیم كەر لە كویّ كەوتووە و كوندە لە كویّ دڕاوە، ئیتر منیش لە جێی سڵاو جوێنم دەدایێ.

ـ چاكم كرد، وا نییە؟

ـ نا، چاكت نەكردووە داریە، دەچیە جەحەندەم.

ـ خۆ ئەمرِۆ ناچم. تازە بچمە جەهەنەم خۆشترە لەوەی بچمە لای قەشە بۆلبۆك. چما ئەسپەكانمان نەبردبوو بیانلەوەڕێنین؟... دەی باشە، میلیكای كورِە چكۆڵەی قەشە كە ئێستا فەقێی قوتابخانەی ئایینە، لەگەڵمان نەهات؟ خۆ هات... ئەودەم، جڵەوی ئەسپەكانی گرت و بردنی لە نێو گەنمەكانی خەڵكی كردن و هەتا بەیانی گەنمیان خوارد.

پێمان گوت: كورِە میلیكا، ئەوە گوناحە. خۆ ئەو گەنمە هیی خۆتان نییە.

گوتی: دەزانم. مەبەست؟

گوتمان: یانی لە ئاگری دۆزەخ ناترسی؟

گوتی: قسەی قۆڕ. یەك دۆزەخ هەیە، ئەویش ئەو دۆزەخەیە، کە بۆ تۆقاندنی ئێوە لەسەر دیواری کلێسا کێشاویانەتەوە... تێگەیشتن؟ رۆژێکیان کە دایکم خەریك بوو لەسەر خواردنەوە بابمی سەرکۆنە دەکرد، باوکم رێك ئەوەی بە دایکم گوت.

گوتمان: ئەی کە بوویە قەشەش ئەو قسانە هەر دەکەی؟

گوتی: دیارە نایکەم.

گوتمان: کەواتە درۆ دەکەی؟ یانی شتێك بە خەڵکی دەڵێی کە خۆشت بڕوات پێی نییە؟

گوتی: بەڵێ درۆیان دەکەم، ئەی چی؟ کاروکاسبییە ئیتر.

گوتمان: عەمرت نەمێنێ بۆخۆت و کار و کاسبیەکەت.

کە ئەوەمان پێ گوت، چاوی قووچاند و دەمی کردەوە و دەستی کرد بە جنێودان. ئێمەش تا کەرەی بەیانی تێمان هەڵدا.

ئێمە سێ کەس بووین، ئەو بەتەنێ بوو. وەخت بوو بیکوژین. ماڵێمان بەجێ هێشت و لە ترسی ژووتێی پۆلیس، حەفتەیەکی رەبەق خۆمان شاردەوە. خۆ نەمانزانی باوکیشی زۆری خۆش ناوێ. کە چووینەوە ماڵێ، نە بای هاتبوو نە بۆران.

*

*

*

خوشکەکانم و ئیۆنی برام لە ماڵێ کردوویانەتە راکەڕاك و راوڕاوێنێك مەگەر خوا بزانێ. دیتزای پووریشم بەدوویاندا رادەکا. جلوبەرگیان هەموو گنج و لۆچ و تلێش تلێش بووە. پوورە ئۆتزۆپار چاوی زەق دەچنەوە، لە سەیرکردنی بەژن و باڵای کچەکەی شاگەشکە دەبێ و چاوی لەسەر هەڵناگرێ. دیتزا بە کەتی لێویدا لیکاوی شۆڕ بووەتەوە سەر چەناگەی و پەیتاپەیتا بە قۆڵی کراسەکەی دەیسڕێتەوە.

پوورە ئۆتزۆپار لێی دەپرسێ:

ـ چەند کوڕ ماچیان کردی؟

ـ چوار پێنجێك.

ـ خۆ هیچی دیکەیان لێ نەکردووی؟

ـ نا، بەس ماچیان کردم.

گنجی کراسەکەی پڕە لە کا و کلۆش. دیارە کوڕەکان باش گەوزاندوویانە و هەڵیانگلۆفیوە.
باوکیشم دێتەوە ماڵێ. وەك نیوەڕۆ لە دەوری سفرەکە کۆ دەبینەوە. کە نانی ئێوارەمان خوارد، باوکم و ئیۆنی برام دەچنە داڵانەکە و لە لای سۆبەکە دەخەون. پوورە ئۆتزۆپاریش لە تەنیشت خۆمان و لەسەر تەختەکە دەخەوێنین. جێی دیتزاش دیاری دەکەین. جێیەکەی ئەو دەکەوێتە نێوان من و دیتزای خوشکم.
خۆم گرمۆڵە دەکەم و ئەژنۆم کۆ دەکەمەوەو بۆ ئەوەی چەندی دەلویٚ لە دیتزا دوور بم، خۆم بەو سندووقە گەورەیەوە دەنووسێنم، کە لە نێوان دیوارەکە و تەختی خەوەکە دانراوە. چراکە پتەپتێتی. رووناکاییەکی کزی هەیە، هەر دەڵێی لە پشت دووکەڵێکی خەستەوە دیوارەکان دەبینم. دایکم هەروا لەگەڵ پوورە ئۆتزۆپار سرتەسرتیانە. شەو، پەردەیەکی نەرمی مەخمەری تاریکایی بە پەنجەرەکانەوە هەڵواسیوە. ئەوەندەم لێ روونە، کە لێرەوە تا ئەوسەری گۆی زەوی و لە زەوییەوە تا ئاسمان، تەنیا تاریکی حوکمڕانە و، ئێمە لێرە هەموومان راکشاوین و لە بن لێفەیەکدا پێکەوە نووساوین.... لە دەرەوە، لە ناخی شەوەکەدا، تەنیا ئاژەڵەکان ماونەتەوە، ئاژەڵی ماڵی و کێوی و درەختەکان و...
دەنگی پوورە ئۆتزۆپار و دایکم دوور دەکەوێتەوە. ئێستا ئیتر بە زەحمەت گوێم لە دەنگیان دەبێ. هەر دەڵێی لۆکەیان لە گوێم ئاخنیوە. هەناسەم جار بە جار هێورتر دەبنەوە و دەستێکی نەرم، دەستێکی مەخمەری، پێڵووەکانم لێك دەنێ... چرا کوژاوەتەوە.
خەوەکەم بۆ زڕا؟ خۆ من پێم وابوو خەوم دێ.
ئەم جارە پوورە ئۆتزۆپار دیتزای کچیشی لەگەڵ خۆی هێناوە. بەڵام بە دەگمەن، مامە پرێکۆپە یۆربان ئۆتزۆپار لەگەڵ خۆی دێنێ.
مامە پرێکۆپە، پیاوێکی کەڵەکەتی نیوشانپانە بەڵام جەستەیەکی لاواز و گورجوگۆڵی هەیە. هەر دەڵێی مارماسییە. چاوی رەش و گەشن و لە بن برۆ کوڵکنەکانیەوە بەقووڵدا چوون. مام پرێکۆپە، قژی خورماییە. بڵێی و نەڵێی دۆمە. دەمگرێ و لەسەر کۆشی خۆیم دادەنێ و وەك لە لانکەیدا بم رامدەژەنێ. زۆری حەز لێیە، گەمەم لەگەڵ بکا. بە دیتنی منداڵەکان بەتایبەتی کوڕەکان شاگەشکە دەبێ. خۆشی دوو کوڕی هەبووە: یەکیان پوورزا گۆتزا، کە بە لاڕەشە مردووە و ئەوی دیکەیان پوورزا پین تیلیێ، کە پار لە تۆرنۆ سەرباز بوو و لەوێ مرد. پوورە ئۆتزۆپار خۆی بە عارەبانەکەی چوو و مەیتەکەی لە تابووتێك نا و هەڵیگرت هێنایەوە و لە تەنیشت پوورزا گۆتزا ناشتی.
جا چ کوڕێکی شۆخ و شەنگ بوو، ئەو پوورزا پین تیلێیە. تازە خەتی لێ دابوو و، کە پێدەکەنی ــ بەردەوامیش دەم بە پێکەنین بوو ــ دوو ریز ددانی سپیی وەك بەفر دەردەکەوتن. هەمیشە و دایم تێلایەکی لە بن هەنگڵیدا

بوو. یەکەم بۆ ئەوەی سەگەلە بەرەڵای نێو کۆڵانان راو بنێ و لەکۆڵ خۆیان بکاتەوە، هەمیش بۆ ئەوەی، ئەو هەتیومەتیوانەی تەماحیان لەو کچۆڵانە بوو وا ئەو دڵی پێیانەوە بوو، رێزی بگرن و سەری لەبەر دانوێنن.

دایکم دەپرسێ:

ـ دەی، پین تی، ئەو کچانەی دڵت پێیانەوەیە، کێن؟ کامانەن؟

ـ هەموو ئەوانەی بالۆکەیان بە لووتەوە نییە، دادە ماری.

جا بە دوای ئەوەدا قاقا پێدەکەنی. ئێمەش هەموو دەتریقاینەوە. ئاخر هیچ کام لە کچەکان بالۆکەیان بە لووتەوە نەبوو و، بەو پێیە هەر هەمووان دۆستی پوورزا پین تی بوون... پین تی، نەمابوو بۆ کیژۆڵە و بۆ کار و بۆ ژیان. هەر هەلی بۆ هەڵکەوتبا، گۆرانییەکی دروست دەکرد و شایەر و گۆرانیبێژە دۆمەکانی کۆ دەکردەوە و و گۆرانییەکەی فێر دەکردن و، رۆژێك کە بە کەیف بوایە، دەیهێنان بۆی بڵێنەوە یان بۆ خەڵکی بڵێنەوە. کەس نەبوو نەیناسێ و لە هەموو جێیەك باس باسی ئەو بوو. تاریفی گەیشتبووە شاریش. تەنانەت بەرپرسانی حکوومییش بۆنیان کردبوو.

پوورزا پین تی، گۆرانیی دەگوت و، دۆمەکانیش بۆیان دەستاندەوە:

ئاغا سێ غەوغەوی هەیە
بە ئاڵووشە و خەوی هەیە
ئەو بەرچێڵەی راپسکێنم
بیگرم تەواو بیخەسێنم

❊❊

یاخوا نەناڵی بۆ را و مشوورت
بۆ تێگەیشتن و ئەقڵ و شعوورت
زەوی و باغ و ئاو، بەپای فیلانە
بۆیە وا زل بووە ملی ئەستوورت
بڵێ خەتخۆشەکان با جوان بنووسن
بەگ و ئاغا کە وا مۆن و عەبووسن
بەدڵ ئاواتەخوازم رۆژی خۆی بێ

له دار بدرێ ئەوی زمانچەورو لووسن

کاکە، سیخوڕی مەملەکەت گوێیان لە هەڵبەستەکانی بوو و، هەواڵیان دا کە ئەوە گوندییەکان دنە دەدا بۆ ڕاپەڕین و، ئاغای دەسەڵاتدار پوورزامی بانگ کردە دەربار.

پێن تی، هەر بەو تێلا بەگرێوگۆڵەوە کە بەردەوام لە بن هەنگڵیدا بوو، چووە بارەگا.

ـ یانی، تۆ هەتیوەکەی ئۆتزۆپار دەتەوێ گوندییەکانم لێ تێن بدەی لە بارەگاکەم ڕاپەڕن؟ ها؟

ـ من گەورەم؟ من گووی وا ناخۆم.

ـ پێیان گوتووم گۆرانی هەڵدەبەستی.

ـ ئەها، ئاغا. چیت لێ وەشێرم، کە حەزی گۆرانیگوتنم دەجووڵێ، ئیتر، تێی دەچریکێنم.

ـ دەی باشە، بزانم گۆرانیی چۆن دەڵێی؟

ـ هەرچی بەسەر زمانمدا بێ.

ـ دەکرێ گۆرانییەکیش لەوانە بۆ من بڵێی؟

ـ ئەگەر لێم عاجز نەبی، بەچاوان، بەندێکت بۆ دەڵێم.

چل بووکی یەکشەوەم هێنا بە جارێ
لەگەڵ چل دانە کیژی گوێ بە گوارێ
هەمووم پێشکەش بەدڵ کرد، چاك نەبۆوە
کەچی هەر دەگری وەك هەوری بەهارێ

ـ نا گۆرانیی ئاوا نا. حەزم لێیە لەوانی دیکەم گوێ لێ بێ.

ـ گۆرانیی دیکە؟... ئەها، لە رووت و قووتەکان... نا، نا. بابیشم ناوێرێ شتی وا بڵێ گەورەم. نەکا لە پڕ ئاغاژن لەم دەوروبەرانەوە بێ و گوێی لێ بێ. جگە لەوەش، پیاو وەختێك ئەو گۆرانییانەی بۆ دێ، کە تەواو بەکەیف بێ.

ئاغای فەرمانڕەوا کە زانیی پوورزام گاڵتەی پێ دەکا، دەهری بوو. پۆلیسی بانگ کرد و پێن تیی پێدا ناردە شاری. بە هەزار شێوە هەڵیانپێچا بەشکم قسەیەکی لە زاری دەرکێشن، نەیانتوانی. ئاخریەکەی ناچار وازیان لێ

هێنا. گوتیان: کوڕە خۆ ناکرێ قسەی قۆڕ و هەڵێت پڵێتی هەتیوە گێلۆکەیەکی دێهاتی بەهەند وەرگری. ئەوە چۆن دەتوانێ بەو هەڵێت پڵێتانەی، وڵات بشێوێنێ؟

ئاخرییەکەی کاتی سەربازیی پوورزا پین تی هات. ناردیانە فەوجی وشکانیی تۆرنۆ و، عەقیدێك بەناوی ژیرسکۆ، کە کوڕی بنەماڵەیەکی دەرەبەگ بوو و ملك و زەوییەکانی نێوان رووبارەکانی کال مات زۆیی و ئۆلت لە گرانژەنی هیی ئەوانە، کردییە بەردەستی خۆی و بردییەوە ماڵێ. ژنەکەی عەقید، یەکی شەڕاشۆی بەدفەڕ بوو، کە بەردەستەکانی دارکاری دەکرد و دەیدانە بەر شەقان و شڕی دەکردن. پێم وایە پوورزا پین تی لەوانە نەبوو یەکێك دەستی لێ بەرز بکاتەوە. لە ژیانیدا کەس لێی نەدابوو، چ بگا بەوەی سەر لەبەر ژنێك دانوێنێ. جا هەر کەسێك بێ، ژنە لووتبەرزەکەی عەقید بێ، یان یەکی دی... ئیتر رۆژێك کە ژنە دەیەوێ بە پشتی دەستی لە دەمی پوورزاکەم راکێشێ، پوورزام لێی رادەسێ و توند لە باوەشی دەگرێ و لە عەرزی قایم دەکا. ئیتر خاتوون لەشی خاو دەبێتەوە و پوورزاشم دەچێتە نێو لینگانی و لەو رۆژەوە پێی فێر دەبێ. رۆژێکیان عەقید بەسەریاندا دەچێ و پوورزام بەسەر ژنەکەیەوە دەگرێ. هەڵدەکێشێتە دەمانچە و فیشەکێك بەسەری پوورزاکەمەوە دەنێ. لە راپۆرتەکەی پزیشکی دادوەردا نووسیان، دەستی لە تفەنگێکی پڕ وەرداوە و کەمتەرخەمیی کردووە و لەدەستی دەرچووە و خۆی کوشتووە. بەڵام شار هەمووی زانیی مەسەلەکە چ بووە و، عەقیدیان نەقڵ کرد بۆ فەوجێکی دی. هەموو سزاکەی ئەوەندە بوو.

بەڵام پوورە ئۆتزۆپارە داماوەکەم، ئیتر وەجاغی کوێر بۆوە و کوڕی نەما.

ـ داریە، دەبی بە کوڕی من؟

ـ نا مامە گیان.

بەرچاوی تاریك دەبێ. دەست لە بنی توورەکەکەی دەگێڕێ و دراوێك دەردێنێ:

ـ ها، بچۆ بۆ خۆت گێوژ بکڕە.

بە غاردان دەچم و لە مەیخانەکەی تۆماس ئۆکی گێوژ دەکڕم. مەیخانەکە لەپێشدا هی خاڵە لیساندەرێی برای دایکم بووە. ژێنای کچە گەورەی تۆماس گێوژەکەم پێ دەفرۆشێ. کرمەکرم دەیانخۆم. شیرینە. ناوکەکەیان رەقە و قاوەیین. بە نێوان ددانمدا فڕێیان دەدەمە دەرێ. ئەلیزابێتی خوشکم، خۆیم لێ مات دەکا و توند دەمگرێ:

ـ براکەم، گێوژم بەش بدە.

سێ چوارێکی دەدەمێ. وەریاندەگرێ و بە قەڵەمباز خۆی بە کۆڵانێدا دەکا، کە منداڵ خەریکی هەڵبەز و دابەزن.

ـ براکەم، لە گێوژەکانی کۆشەکەڵەکەی ئۆکیی دامێ. گێوژی کۆشەکەڵەکەی ئۆکی.

منداڵ ئامبازی دەبن و گێوژەکەی لە چنگی دەردێنن. چاوبەگریان دێتەوە لام و دیسان داوا دەکاتەوە.

*

*

*

تۆماس ئۆکێی مەیخانەچی سێ کچی هەیە: یەکیان ژێنایە کە دوانیوەڕۆیان، ئەو دەمەی ئەو و ژنەکەی لە ژوورەکەی پشتەوەی دووکانێ دەنوون و پەردەکان دادەنەوە بۆ ئەوەی ڕووناکایی خەوەکەیان لێ تێك نەدا، لە دووکانەکەدا و لە پشت دەخیلەکە دادەنیشێ. دوو کچەکەی دیشکەیشی یەکیان ناوی فیفایە و ئەوی دیکەیان بۆبۆکا، کە یەکی کوتکە و گۆشتن و تۆکمەیە و، قژی کاڵە. خۆ ئەگەر کچی ماڵە پێخواسێك بوایە، بە دڵنیاییەوە تا ئێستا سەرچۆپیی هەڵپەرکێی هۆرای دەگرت، چونکە تەمەنی گەیوەتێ. بەڵام ئەویش وەك هەردوو خوشکە گەورەکەی واتە ژێنا و فیفا قەت بەلای هۆرادا ناچێ. هەر سێکیان هێندە لووتبەرزن بە قەڵانگ گوو ناگاتە لووتیان. قژیان لوول دەکەن و کراسی سپیی تەسك تەسك لەبەر دەکەن. رێك وەك جلوبەرگی مادام پاویلینێی کچی نیکۆلاس دیمۆزێلی پوورزام، کە کارمەندی پۆستەیە.

تۆماس ئۆکێی، جگە لەو سێ کچە، کوڕێکیشی هەیە، ناوی میتکایە. دایك و باوکی بەردەوام وەك تازەبووك بەدەوریدا دێن: بەروانکەی لێ دەدەن و، کڵاوی بەنی لەسەر دەکەن و پێڵاوی جوانی لە پێ دەکەن. وەك مریشك، لە سەر بانیژەکە هەڵدەنیشێ و سەیرمان دەکا کە لە نێو کۆڵانێ گەمەی دەکەین. ئەی خوایە، چەندەی حەز لێیە لەوێ بێتە خوارێ و دەرگا بکاتەوە و خۆ بە کۆڵانێدا بکا و لەگەڵمان بیکاتە گەمە. چاوی دەبریسکێنەوە و لیکاوی بە زاریدا دێتەخوار. ئێمەش بەردەوام شووتیی وە بن هەنگڵی دەدەین:

ـ وەرە گەمەمان لەگەڵ بکە میتیکا.

ـ نایەم، نەکا پیس بم.

ـ کوڕە هەستە، دەی وەرە.

ـ نایەم. گەمە لەگەڵ ئێوە ناکەم. ئاخر من کوڕی مەیخانەچیم.

ـ یانی چی؟ جا خۆ رۆڵە تۆش لە قوزی دایکتەوە هاتوویە دەرێ.

میتیکا هاواری لێ هەڵدەستێ:

ـ بابە ئەوانە جنێوم دەدەنێ.

باوکی دەردەپەڕێتە دەرێ و دەمانداتە بەر خڕکەبەردان و راومان دەنێ. دەستی گوجیلەکەی دەگرێ و دەیبا و لە دووکانێ لەسەر رانی خۆی دادەنێ و بە نوقڵ ژیری دەکاتەوە.

ـ میتیکا گیان، تۆ قەت نابێ ببی بە ئاواڵی ئەو بەرەڵایانە. دەتنێرمە مەدرەسە، بۆ ئەوەی ببیتە پیاوێکی گەورە. تۆ دەبێ ببی بە حاکم...

میتیکا دێتەوە سەر بانیژەکە و هەرامان لێ دەکا:

ـ من گەمەتان لەگەڵ ناکەم. من... من... دەبمە حاکم.

چڵمی کە شۆڕ بووەتەوە، بە پۆڵی پاڵتۆکەی دەیسڕێتەوە.

ڕۆژی یەکشەممە لەبەردەم مەیخانە، گەڕی هۆرا گەرمە.

کچانی تۆماس ئۆکێی ـــ دووی قەڵەوە و یەکی کورتەبنەی گووپن ـــ خۆیان دوور دەگرن و هەر سەیر دەکەن. ئەوان چاوەڕێن کوڕە شاری بێن بیانخوازن. بەڵام کەس نایە و ئەوان هەر چاویان لە ڕێیە. ئێڤانگلینی خوشکم دەڵێ، ئەوان لە سەر ئەو پۆز و لووتبەرزیەی خۆیان، هەر بووکی ماڵی باوان دەبن تا دەترشێن.

خەڵکی ئاوایی، هێشتا ئەوەدەمەیان لەبیر نەچووەتەوە، کە تۆماس ئۆکێی پێخاوس بوو. ژنەکەی و کچەکانیشی پێخواس بوون و وەك باقی خەڵك لە سەر زەوی و زاری ئاغا بە سەگمەرگی دەژیان. ئەوەندەیان کار دەکرد، بڕستیان لێ دەبڕا و لە پێ دەکەوتن.

دواتر، تۆماس ئۆکێی، بوو بە نۆکەری بازرگانە یۆنانییەکان. حیسێب و کتێبی بۆ لێك دانەوە و بە گزی و فزیی خۆی، دەستی لە قەپانە گەورەکەی عەمباری ئەو سایلۆیە وەردا، کە دانەوێڵەی وەرگیراوی پێ دەکێشن. بە چاوبرسێتی و گیانسەختی، فلس فلس پارەی وەسەر یەك نا. مردنەکەی خاڵیشمی قۆستەوە. پارەیەکی زۆری بە قەرز لە بانکێکی شاری وەرگرت و لەسەر پارەکەی خۆی دانا و ماڵ و ئیجازەی کارکردنەکەی ئەو خوالێخۆشبووەی کڕییەوە. ئیتر فرۆشگەیەکی کردەوە، کە سەری مار و مێرووی تێدا بوو. بەڵام هەموو جۆرە ساردی و مەشرووبێکیشی دەفرۆشت. کار و بازاڕەکەی برەوی سەند. ئیتر ئێستا سووت و بەهرەش دەخوا. دیارە سووتێکی زۆر وەرناگرێ. بۆ سەد "لێیی" مانگێ بیست لێیی وەردەگرێ، کە هیچ نییە. زۆر کەس کلکیان بەو تەڵەیەوە بووە. ئەگەر سەد لێییت قەرز کردووە و بۆ ئەوەی سەری مانگێ بیدەیەوە، دیارە ئیتر بەقوڕدا چووی. بەڵام کوا پیاو هەیە بتوانێ سەری مانگێ قەرزەکەی پاك بکا؟ جاری وایە قەرزی یەك مانگ، دەچێتە ساڵێك و پتریش، هەر نادرێتەوە. لەو وەختانەدا، خۆ کابرا ئەگەر تەنیا بتوانێ سوودەکەی بداتەوە، هێشتا تۆماس ئۆکێی شوکرانەبژێرە و لەگەڵی ڕێك دەکەوێ. ئەگەر راستیت دەوێ تۆماس قەت زۆر بۆ کەس ناهێنێ. لە دوازدە مانگەی ساڵدا، بۆ هەر سەد لێیی، دوازدە دراوی بیست لێیی لە قەرزبارەکەی سووت وەردەگرێ.

بەر لەوەی ژێنا قەیرە بێ و بترشێ، لاکێی کوڕە گەورەی ئیۆرداکێ دیمان، کە جووتیارێکی دەوڵەمەندە و ماڵەکەی لە لای ماڵەکەی ئێمە و لە تەنیشت شاڕێیەکەیە، داوای کردبوو.

دیمانەکان، دوو بران و، زەوی و زارێکی زۆر و گاڕانێکیان مانگای جوانی مۆڵداڤیایی و خانووی خۆش خۆشی بانیژەداری وەك خانووی ئاغاکانیان هەیە. گاڕانەگامێش و مێگەلی مەڕ و پووڕەهەنگیان زۆر و زەوەندە.

سامانەکەی ئۆکێی، دڵی لاکێی کرمێ کردبوو. بەڵام تۆماس ئۆکێی لە ئیۆرداکێی گوت:

ـ نا، کچم نادەمە کوڕی تۆ. دەمەوێ بیدەمە کوڕێکی شاری، کە ناچار نەبێ لە دەشتێ لە بەر قرچەی تاو هەڵچۆقێ. هەر چۆنێك بێ، من مەیخانەچیم و، کارێکی وام کردووە، ئێوە بە سەپانیش ناگرم. ئیتر منداڵم ناچار نین، بە نینۆك زەوی و بەیاران بکێڵن. ئیتر ئەو زەمان بەسەر چوو. ئیتر لەمەودوا تۆرەمەی ئۆکێی قەدر و قیمەتیان دەچێتە سەرتر و سەرتر.

ئیۆرداکێ دیمان، کە چەقۆت لێ دابا خوێنی نەدەگەڕا، ئامۆگاریکەرانە گوتبووی:

ـ هەموو هەورازێك نشێوێکی لەدوایە. ئاگات لە سەرەنگرێبوون و نسکۆی خۆت بێ تۆماس. چونکە وەك بۆنی دێ، وا هەڵدەدێردرێی، تا هەتایە نەتوانی هەستییەوە سەر پێ. بەر لە تۆ زۆری دیکەشمان دیتوون، کە بەخت رووی لێ وەرگێڕاون.

ـ من سەرەنگرێ دەبم؟ خەمت نەبێ برالە، من پێی خۆمم باش چەقاندووە. پشتم قایمە.

ـ لەوانەیە وابێ. بەڵام تۆماس، تووشی خواردنەوە بووی و، مەشرووبخواردنەوەش ئاخر و ئاقیبەتی باشی نییە. بەیانیان هێشتا سفتاحت نەکردووە، دەبێ پەرداخێك ئارەق بەسەردا بکەی.

تۆماسی تووڕەوتۆسن، وەك فیشەکە شێتە دەرپەڕی و دەستی کردە هەرا:

ـ من پێم باشترە کچەکەم ببێتە ژنی پیپچیکا، بەڵام مێرد بە کوڕە چاودەرپەڕیوەکەی تۆ نەکا.

ـ جا خۆ دیارە، بەو شەرتەی پیپچیکا کچی تۆی بوێ.

ئیتر دەمبەدەمەکەیان بڕایەوە و بۆ تاهەتایە لەبزیان لە لەبزی یەکتر نەگەڕا.

جار و بارە، شەوانە هات و هاوارێك دێ. تۆماس ئۆکێی لە ژنەکەی هەڵدەدا. لەگەڵ مشتەریەکانی مەیخانەکەی ئەوەندە پێك هەڵدەدا، سەرخۆش دەبێ و هۆش لە سەری نامێنێ. ئیتر کە دەچێتەوە ماڵێ، بەربینگ و بیانوو بە ژنەکەی دەگرێ. ژنەی داماو، تەشك و داوێنی کۆ دەکاتەوە و، دەچێ لە کادێنێ لە نێو کا و وێنجەکەدا لەگەڵ سەگەکان دەنوێ. وشك و رەق هەڵاتووە. جەرگی جەرگ دەخواتەوە. کچە گەورەکانیشی تازە کۆخەڕەشەیان گرتووە و دەستیان بە بەردەمیانەوە دەگرن و دەکۆخن، هەر بۆبۆئاکا هێشتا کۆخەی پێوە نەنووساوە.

ئیۆنی برام کە جارێکی ویستبووی بۆبۆئاکا ماچ بکا، دەڵێ:

ـ راوەستە. ئەویش کۆخەڕەشەی پێوە دەنووسێ. لێم سوورە.

*

*

*

دیتزای پوورم لە خەوێدا مستی دەقووچێنێ و، وەك مار دەفیشکێنێ. بەڵام پوورە ئۆتزۆپار، وەك بۆقی نێو گۆلاوان هەر قرەقرێتی...

دایك و باوك و خوشك و برای من لە خەوێدا، نە جووڵەیان دێ و نە جگە لە هەناسە هێمنەکەیان دەنگیشیان لێوە دێ.

ماوەیك لەوەپێش، چەرچییك، کە بە عارەبانەیەکی پڕ لە دیزە و گۆزەوە لە کوێستانێوە هاتبوو، شەوێکیان لە ماڵەکەی ئێمە مایەوە.

هەوڕگەر(گۆزەکەر)، کە پاییز دادێ، لە کوێستانێوە بەرەو دەشتایی دادەگەڕێن و، کەلوپەلەکەیان بە هەموو جۆرە دانەوێڵەیەك دەگۆڕنەوە. بۆ وێنە، تۆ دوو قاپت پێویستە؟ ـ دەی باشە، لە عارەبانەکە هەڵیاندەگری و، پڕیان دەکەی لە گەنمەشامی یان گەنم. کابرای هەوڕگەر، لە هەنبانەکەی خۆی دەکا و قاپە بەتاڵەکانت دەداتێ. گۆزەیەکی هەنگڵدارت دەوێ، یان جەڕەیەکی ملداری تاسولووسکراوت دەوێ، بۆ ئەوەی لە مردارەمانگی هاوینێدا، ئاوەکەت وا وەك بەفراو بۆ سارد بکا؟ دەی باشە، دەکرێ چەندی پێت خۆشە چەنەی لەگەڵ لێ بدەی.

هەوڕگەرەکان، تەنانەت لە ئێمەی گوندییش هەژارترن. لەڕ و لاوازن و دەموچاویان رەقەڵەیە و ئێسکی پەراسوویان دەرپەڕیوە. پانتۆڵ بە قوونیانەوە راناوەستێ و لە سمتە بێ گۆشتەکانیانەوە شۆڕ دەبێتەوە و دادەکەوێژ کە خواردنێکیان دەدەیەی، زۆر خۆمانە بنی قاپەکەش دەلێسنەوە. بۆ نموونە ئەگەر کە چێشتی مامالیگا لە قاپێکدا دەخۆن، وای دەلێسنەوە قاپەکە شوشتنی نەوێ.

ئەو گۆزەکەرەی ئەوێ شەوێ لە ماڵی ئێمە مابۆوە، ناوی ڤێنسانت یۆیۆ بوو. بارگینە بڕستلێبڕاوەکانی، کە وا رەق هەڵاتبوون، بەحاڵ بەکاری ئەوە دەهاتن لە قوولکەیەکیان بخا و لە کۆڵ خۆیان بکاتەوە، لە عارەبانەکەی بەستن و باقەیەك یۆنجەی لەبەر کردن. دوایی دایکم خواردنێکی زۆری لە پێش دانا. کوڕیژگەیەکیشی لەگەڵ خۆی هێنابوو و، دەیگوت، پێنج کوڕ و کچی دیکەیشی لە ماڵەوەن.

گەروەخڕەی بوو. دەتگوت دوو توورەکەی زلت بە بن چەناگەیەوە کردووە، کە لە قسەکردنێدا وەك هیی قەل، هەڵدەمسا و دەپووچاوە و، قسەکانی وەك ئاوێکی وەکوڵ هاتبێ، لە ئەوکیدا قوڵتەیان دەهات. کوڕەکەشی هەر

گەروەخڕەی بوو. هەوڕگەرەکە دەیگوت، لە وڵاتی ئێمە، دەگمەن کەسێك هەیە گەروەخڕەی نەبێ. وەك بەخۆداهەڵگوتنێك دەیگێڕایەوە:

ـ ژنەکەم، غەوغەوێکی زۆر جوانی هەیە، دوو هێندەی ئەوەی منە. منداڵەکانیشمان، خوایە هەزار و هەزارجار شوکرانەبژێرم. یەکێکیان نەبێ، هەمووان غەوغەویان هەیە. شەوانە لەپێشدا منداڵەکان دەنوون. لە خەوێدا، غەوغەویان دەنگێکی وا خۆشی دێ، پیاو چێژ وەردەگرێ و حەز دەکەی تا بەیانی دانیشی و گوێ راگری. هەر پاشەبەرەکەم غەوغەوی نییە و بێدەنگ دەبێ. جار جار ژنەکەم بە نیگەرانییەوە هەڵدەستێ و دەست لەسەر سینگی منداڵەکە دادەنێ دەڵێ بزانم پشووی دێ و زیندووە؟ دەترسم نەکا لە خەوێدا گیانی دەربچێ. ئیتر وردەوردە دڵنیا بووین. بەڵام ترسی ئەوەی نەکا لە خەوێدا بمرێ، هێشتا بەرۆکمانی بەرنەداوە. ئاخر لەبەر ئەوەی غەوغەوی نییە.

تاوێك بێدەنگ بوو و، دیسان لەسەری رۆیشت:

ـ ئێرە، لای ئێوە بەهەشتە. لە وڵاتی ئێمە، لەو بنارە، زەوی سوور سوورە و پڕە لە خڕکەبەرد. لە داماوی و هەژاری و کاری تاقەتبڕ بۆ دانی پیتاك، هیچی دیکە دەست ناکەوێ. بەڵام لێرەوار: بۆ چی دەبن؟ وەختێك نەتوانی دەست بۆ گەڵایەکی بەری؟ وەختێك هەقی ئەوەت نەبێ تەڵاشەدارێك، وشکەڵێك هەڵگری، یان باقەیەك گیای لێ بدروویەوە یەك سمەکانت بیخۆن؟ دەشتەوانەکان ئاغا، بە تفەنگەوە لەوێ قۆڕخچین. ئەستەمە، بە راستی ئەستەمە. شوکری خوا ژیان زۆر دووردرێژ نییە و تەمەنی بنیادەم کورتە، هەر چاوێك بتروکێنی تەواو دەبێ.

ئەوەندە دەڵێ و بێدەنگ دەبێ. گەروەخڕەکەی تاوێك پاش قسەکانی، دەنیشێتەوە، بەڵام قوڵتەی هەر دێ. وەك بڵێی ئەو قسانەی هەوڕگەرەکە، پێی وابووە بێ کەلك یان خەتەرن، لەوێدا ماونەوە و، زەویرن لەوەی بۆچی نەگوتراون و دەنگی نارەزایەتییەکەیان دێ.

هەوڕگەر و کوڕەکەی، هەر بە جلوبەرگی بنەوەیانەوە، لە بن دارتووەکە پشت بە پشتی یەکەوە دەنێن و دەنوون. هەر خەویان لێ دەکەوێ، بەرچێڵەیان پرخەی دێ. هەندێکیان گوێ لێ دەگرین و دوایی ئێمەش دەنووین. هەوڵدەدەین زووتر خەومان لێ بکەوێ.

ـ تۆماسی مەیخانەچی گوتی، کچەکەی دەداتە کێ، کە لەو خراپتر نەبێ؟

ـ بە پیچیکا.

دەبێ زۆر هەڵچووبێ، بۆیە وەها بڕیارێکی داوە.

خۆ ئەگەر راستیت دەوێ، ناکرێ بە کوڕەکەی ئێرداکێ دیمانی دەوڵەمەندیش بڵێی چاودەرپەڕیو. تۆزێك خێلە. هەر ئەوەندە. بەڵام جوان دەبینێ. خەڵك، قسەکانی تۆماس ئۆکێیان کردە بنێشتەخۆشکە. پیچیکا چۆن شاگەشکە بووە. لە دەم رێگا هەڵترووشکاوە و تێلاکەی خستووەتە نێوان لاقی و لەپڕ وەسەری کردووە:

ـ کوڕە جا کچەکەی کە هێشتا بۆنی شیری خاوی لە زاری دێ و من بە ترێکم ناوێ، گوتوویەتی دەیدا بە من.

خەڵکەکەش پێیان سەیر بوو.

یەکێك لێی پرسی:

ـ بۆ ناتەوێ پیچیکا؟ پێت وایە زۆر جوان نییە؟ یان ئەوەندەی دەتەوێ خانم و خاتوون نییە؟

ـ دیارە هەیە. زۆریش کابانە. بەڵام من حەوجێم بە کچێك نییە کە هەر خەریکی پۆزلێدان بێ و لەوەش پتر، خانم هەر ناوێ... نیکۆلای کوڕی دیمۆزێل، کە چوو کچە شارییەکی هێنا، لە کن ژنەکەی وەك مەڕی پێغەمبەری وایە، درۆ دەکەم؟ ئۆکێی منداڵەکانی وەك منداڵی خواپێداوان گەورە کردووە و وای راهێناون. ئاخری رۆژێك لێیان دەقەومێ. یانی رۆژێك نەگبەتی هەر لەو جلوبەرگە جوانەیاندا ئەوکیان دەگرێ... راستە بنیادەم وەك خوو بە شتێکەوە دەگرێ، دەتوانێ ئاواش وازی لێ بێنێ، بەڵام بەلاوەنانی خووخدە زۆریش ئاسان نییە.

ـ ئەی ئێمە؟ بۆ ئێمە هەژار نین؟ خۆ هەژارین. دەی باشە، ئەوە دەبینی، لە برسان نامرین.

ـ ئاخر ئێمە بە هەژاری راهاتووین. رێك وەك توورەکەیەکی راهاتبێ پینە بکرێ.

پیچیکا کەسی نییە. کە ژنانی ئاوایی لە دەم کانییەکە هەڵیانگرتەوە، تازە لەدایك ببوو. لە ئاوی متفەڕکیان هەڵکێشا و ناوێکیان لێ نا، کە هەروا زووش لە بیر چۆوە. لای ئەم و ئەو گەورە بوو. کە دەستی داری گرت و کاری پێ کرا، بوو بە نۆکەری ئێۆرداکێ دیمان. بەراتەکەشی هەر نانەزگێ بوو، کە دەیاندایە و دەیخوارد و شڕەیەکیشیان بۆ دەکڕی لەبەری دەکرد. هەتا رۆژێکیان وەگیان هات: دیمان ئەوەندەی کار پێ دەکرد بڕستی لێ دەبڕی ، لە بری دەسمز و هەق و بەراتیش، تێی هەڵدەدا.

لە پشت ئاوەدانی و لە دەم زۆنگەکە، هەر ئەو شوێنەی لافاوە بەهارییەکان، چیمەنەکەی رادەماڵێ، لەوێ پارچە زەوییەکیان دایێ. پیچیکا لەوێ کوخێکی بۆخۆی دروست کرد و، لەوێدا هەر بەتەنێ ژیا و بە هیوا بوو چارەی لە ژنێك بنووسرێ. بوو بە دەشتەوان و، قۆڕخچیی لەوەڕگە و مێرگ و بژوێن و کێڵگەکان.

پیچیکا کوڕێکی چوارشانەی قژزەردی چاوکاڵە، کە لەم دنیایەدا کەس لەو هەژارتر نییە.

بزن دەبەمە قوڵکەکە بلەوڕێ. پیچیکا بەبێ ئەوەی ئاگام لێی بێ، دێتە پێشێ و ئەوەندە لەسەرخۆ دێ، گوێم لە دەنگی پێی نابێ. هەر ئەوەندەیە، کە سەر هەڵدێنم لەبەردەمم قوت بووەتەوە.

ـ بزنەکەت دەلەوەڕێنی؟

ـ بەڵێ.

ـ وریا بە نەچنە نێو گەنمەکانەوە.

ـ ناچن.

ـ گوێ بگرە داریە...

لەسەرگازەرای پشت لە نێو گژوگیایەکەدا رادەکشێ و، چاوی دەبڕێتە گەواڵە هەورەکان، کە با وەك کەشتیی چارۆکەدار بەرەو باکوور رایان دەدا.

ـ ئێ؟

ـ لە تەنیشتم دانیشە، دەمەوێ هەقایەتێکت بۆ بگێڕمەوە. هەقایەتێکی شیرین.

ـ کاکە پیچیکا، هەقایەت شەوانە دەگێڕدرێتەوە.

ـ من بە رۆژ دەیگێڕمەوە.

ـ دەی باشە، چ هەقایەتێکم بۆ دەگێڕییەوە؟

ـ هەقایەتی پێشنوێژە کەچەڵەکە.

ـ ئەوەت بۆ گێڕاومەوە.

ـ دەی باشەـ یەکی دیت بۆ دەگێڕمەوە. هەقایەتی بەرانی ئەو پیرەژن و پیرەپیاوەی، نیوەی لە دارستانەوە گەڕاوە...

ـ دا بیگێڕەوە بزانم.

ـ هەبوو... نەبوو...

با، لە ژوور سەرمانەوە گەواڵە هەورەکان رادەدا. لە کەلێنی هەورەکانەوە ئاسمان دەردەکەوێ، شین شین...

زستانان بازاڕی هەقایەت گەرمترە. بەتایبەتی وەختێك بۆ هەڵوەراندنی گەنمەشامی لە ماڵەکەی ئێمە، یان لە ماڵی تودێیانۆ کۆ دەبینەوە. قەول وایە، بەیانی گەنمەشامی بەرینە ئاشی لێی بکەن؟ ـــ ئەوەکەی، گەنجی دەرودراوسێ بە کچ و کوڕەوە لە ماڵەکەی ئێمە کۆ دەبنەوە و هەرەوەزە. دایکم دەنکی گەنمەشامییەکان دەکاتە مەنجەڵێکی گەورەوە بیکوڵێنێ. زۆری پێدەچێ تا دەکوڵێ. بەر لەوەی دەنکەکان وەك وردەگوڵی سپی بپشکوێن، دەبێ سێ جار ئاوەکەی بگۆڕن. بەر لەوە دایکم، شۆربای دونگی بەرازمان دەداتێ: ئاردی گەنمەشامییەکە لە مەنجەڵ دەکا و دەیکوڵێنێ و دواییش پڕی کەوچکێك رۆنی دونگە بەرازی تێ دەکا. زۆر نابا، ئاوگۆشتەکە خەست دەبێتەوە. زۆر خۆش و بەتامە. ئەوەندە دەخۆین وەختە بدڕێین. جا چونکە، بەشی هەموومان کەوچك نییە، هەر کەسە و کەوچکی خۆی دێنێ.

گەنمەشامی هەڵدەوەرێنین. دەنك لە سەر یەك دەبنە كۆگا. كۆگای دەنكەكان هەر دێ و بەرزتر دەبێ. ئەگەر سۆرێیانیش لە گوندەكەی ستانیسكۆتزەوە بێ، ئیدی شاگەشكە دەبین. چونكە هەر لە ئێوارێوە دەست دەكا بە نەقلگێڕانەوە و ئۆین و ماجەراتە خۆشەكانی پاكالا*. جاری وایە رۆژیش دەبێتەوە، ئەو هێشتا هەقایەتەكانی تەواو نەبوون. ئەگەر خەو كوێریشمان بكا، هێشتا هەقایەتەكانی ئەومان پێ خۆشترە.

سۆرێیان، كوڕی فۆینێیای سەربازە، كە مێردی پوورە سۆرانا، یەكێك لە خوشكەكانی باوكمە. باپیرەی سۆرێیان كە لە مێژ نییە مردووە، زۆر پیر و زورهان ببوو. قژی وەك بەفر سپی ببوون. بە لاوێتی، فەرمانێك دەگاتە ئاوایی، كە یەكێك بە مەبەستی سەربازی بنێرنە شار. دەمڕاست و ریش چەرمو كۆ بوونەوە و زۆریان تەگبیر كرد و ئاخری ساغ بوونەوە فۆینێیا بنێرن. جەندرمەی پۆلیسخانەیان ئاگادار كردەوە و چوون دەوری ماڵەكەی فۆینێیایان گەمارۆ دا و، بانگیان كرد بێتە دەرێ... فۆینێیا كە ئاگای لە مەحموودی بێ زەواد نەبوو، دەنگی كوێخا و ردێن سپییەكان ناسییەوە و لە ماڵێ هاتە دەرێ. چەكدار هەڵیانكوتا سەری و گرتیان و چۆڵەپێچیان كرد، بەڵام فۆینێیا وا لێیان وەدەست هات، كە توانیی خۆی راپسكێنێ و را بكا و خۆی بە لێڕەوارەكەدا بكا. چەكداریش بە ئەسپەوە سەریان لە دووی نا و ئاخری توانیان بە كەمەند بیگرن و چۆڵەپێچی بكەن و بینێرنە شار... لە شاری سەریان تاشی و بە تاوانی راكردن و دەستكردنەوە، حەوت ساڵیان خزمەتی سەربازی و ئیجباری بۆ بڕییەوە و، هەر لەودەمەوە ناوی ڤۆئینێ سەربازی بەستۆدا بڕدرا.

ئێستا پوورزا سۆرێیان، هەر تاقەتی هەقایەتگێڕانەوەی نەماوە، چونكە قۆرتێكی گەورەیان بەسەر هات و نەگبەتییەك بەرۆكی بنەماڵەكەیان گرتووە: خوشكە ئۆلیكای خوشكی سۆرێیان، تێك چووە. ئای لەو كچە، لە جوانیدا هاوتای نییە... بەستەزمانە دەڵی دەچێتە سەر هەتیوێكی سێربستانی، بەڵام كوڕە بەبێ ئەوەی ئاوڕێكیشی لێ بداتەوە، لەگەڵ كچەتیوێكی ناشیرینی سەرمایەدار زەماوەند دەكا. خوشكە ئۆلیكاش لە داخان شێت دەبێ. لە پێشدا سەروقژی خۆی دەرنێتەوە و جلەكانی تیتۆڵ تیتۆڵ دەكا، دوایی وردە وردە هێور دەبێتەوە و ئاوا واق وڕماو دەبێ. دەم لە نان و ئاو نادا. ئیتر هەر وەك مریشك دەنووك لەملاوئەولا دەدا و دەلۆژێتەوە و دەنگیشی دەرنایە.

لە نێوان باخەكەی ئێمە و ئاسنەرێیەكەدا، شوێنێكی پان و بەرین هەیە، كە پڕە لە داری ئەرخەوان. لە نێوەڕاستی ئەو ئەرخەوانیانە دوو دار هەڵووژەی خواروخێچی هەڵبزڕكاوی لێیە، كە كووخێكی بچووكیان لە بن لكوپۆكانیاندا شاردووەتەوە... لەو كووخە ساردوسڕەدا سێ پیاو، سێ برا دەژین: پێتری گەورە و پێتری گچكە و شاندۆ گەورە و

*پاكالا، پاڵەوانێكی ئەفسانەییە، لە بیچم و جلوبەرگی نۆكەرێكی ساویلكەی دەستەوەستاندا، كە بەردەوام سەریش دەكەوێ. ئەو نوێنگەی سوعبەتچێتی و زیرەكییە بەتایبەتی فێڵبازیی گوندە رۆمانییەكان.

شاندۆ گەورە. شاندۆ گچکەش کە برای چوارەمە، لە کۆڵانەکەی ئێمە دەژی.ماڵەکەی ئەویش لە دەم ئاسنەڕێیەکەیە، پێم وایە تۆزێك دوورتر و دەکرێ بڵێی لەوبەری ئاوایی.
لەو چوار برایە، هەر شاندۆ گچکەیان ژنی هێناوە و بە ژن و منداڵەوە سەروسامانێکی بۆخۆی پێکەوە ناوە. براکانی دیکە هەروا سەڵت و رەبەن ماونەتەوە و پێکەوە لە کەپرەکەی نزیك ماڵی ئێمەدا دەژین. ئاخ، کوڕە خەریك بوو بە درۆزن دەرچم: ئەگەر راستیت دەوێ، پێتریَ گەورەش ساڵێکیان هاوینێ ژنی هێنابوو.
ـ ئەی چۆن هێشتا هەر وا زگورتە؟
ـ ژنەکەی بەجێی هێشت.
ئەو برایانە، شۆرەتیان باڵانە. برای هەرە گەورەیان، پێتریَ گەورەیە، کە شێست ساڵی ساغ کردووەتەوە. پیاوێکی وردیلەیە دەڵێی سیرمەیە، کە دەڕوا، لاقی بەدووی خۆیدا دەخشکێنێ. جا هەقایەتی ژنهێنانەکەی زۆر خۆشە: جووتیارێکی بێلیتۆری، کە کوڕی نەبوو، هەوای ئەوەی کەوتە سەری، بیکاتە زاوای خۆی.
رۆژێکیان خەزوور و زاوا پێکەوە خەریکی گیادروون و کار دەبن. لە پڕدا پێتریَ گەورە، چاوی بە کۆلکەی چقڵەشینکەیەك دەکەوێ و لە جێی خۆی رادەوەستێ و سەیرێکی دەکا و، تەپلەی سەری دێنێتە سەر تیلاگی چەپەی و دەیباتەوە سەر گوێی راستی و دەڵێ:
ـ مامە... بنە دڕوو!
ـ دەی چیە، لە بنەوە بیگرە و هەڵیکێشە و تووڕی هەڵدە.
پێتریَ گەورە هەڵیدەکەنێ و دوور هەڵیدەدا و، مل لە گیادروونەوەکەی خۆی دەنێتەوە. تاوێك دواتر دیسان تووشی بنەدڕووەکی دیکە دەبێتەوە. سەرسووڕماو رادەوەستێ و تەپلەکەی ئەملاوئەولا دەکاتەوە و دیسان بە خەزووری دەڵێ:
ـ مامە... بنەدڕکێکی تر... چیی لێ بکەم؟
ـ هەڵیکەنە و بە قوڕگتیدا بکە و ملت بشکێنە و برۆ جەحەنەمت لێ پڕ بێ، با چڕوچاوت نەبینمەوە.
..................
برا گچکەکەی لێی پرسی:
ـ چ بووە کاکە؟
ـ شتێك قەوما و ناچار بووم بێمەوە. لەگەڵ خەزوورم لێمان بووە دەمەقاڵە و نێوانمان تێك چوو.
ئیتر تا هەتایە هەر چاك نابنەوە.
پێتریَ گچکە، قەت ژنی نەهێنا.

شاندۆ گەورەش جارێکیان هەوای کەوتە سەری ژنێك بێنێ، بەڵام دوو پێترییەکە نەیانهێشت. شاندۆ دەیتوانی زۆر سووك و سانا لە ماڵێ بڕوا، بەڵام وای پێ باشتر بوو بمێنێتەوە و لەگەڵ براکانی بیکاتە هەرا. ئەوانیش کە زانیان براکەیان داناکەوێ و هێور نابێتەوە و، واز لە بڕیاری کەرانەی خۆی ناهێنێ، شەوێکیان لە یەکێك لە دار ئەرخەوانکانیان شەتەك دا و، بە داران هەموو گیانیان رەش و مۆر کرەوە... شاندۆ لەو دەمەوە تێك چوو و شێت بوو.

ئەو مەسەلەیە، هیی کاتێکە باوکم هێشتا منداڵ بووە.

شاندۆ ئیتر چاك نەبۆوە. زەڕی بۆ کەس نییە، ئەوەندەی لە سیوادی بەیانییەوە تا تەنگەی ئێوارێ بە حەوشەدا دەخولێتەوە و، لە بن ئەم دارەوە دەچێتە لای دارەکەی دی و یەکبین قسە دەکا. ئەستەمە بزانی چ بە دارەکان دەڵێ. جار هەیە لە دارەکان توورە دەبێ و ئیتر دەست دەداتە تێلاکەی و بەردەبێتە سەروگوێی دارەکان، جا وەرە لێ بدە. زەوییەکەی ئەوان سەدان ئەرخەوانی تێدایە،  بە پیرەدار و نەونەمامەوە، هەر هەمووانی شلوکوت کردووە. شاندۆ بە توورەییەوە دەیانداتە بەر کوتەك. بەڵام ئەوان قەت لێی زویر و دڵمەند نابن. ئەرخەوان دەنگیان نییە. چاویشیان نییە بگرین... هەر گەڵایان هەڵدەوەرێ و، گەڵای دیکەیان لە جێ دەڕوێتەوە. شاندۆ بە پێچەوانەوە، بەینی لەگەڵ دار هەڵووژەکان خۆشە و، قەت بە دار لێیان راناسێ و دەستیان لێ هەڵناهێنێتەوە. رۆژی وایە، لە حەوشەکەی خۆیان دەردەپەڕێ  بۆ ئاوێ دێتە سەر بیرەکەی ماڵی ئێمە. ئاو هەڵدەهێنجێ و، گۆزەکەی پڕ دەکا و، ئەوجار دادێتەوە و لە نێو چەوی دەوری بیرەکە هەرە درشتەکان کۆ دەکاتەوە و لە کۆشی دەکا و دەچێتەوە ماڵێ و گۆزەکە دەباتە نێو کووخەکەوە. هەروا بەردەوام لە بن لێوەوە ورتەورتی دێ و نازانی دەڵێ چی. ئەژنۆیەکی لەسەر عەرزی دادەدا و، وەك بڵێی بیەوێ تفەنگ باوێ، سێرە لە ئەرخەوانکان دەگرێ و، چەوەکانیان تێ هەڵدەکا. یەك بەردیشی بەختا ناچێ. بەو سەرشێتییەی خۆیەوە، زۆر لەسەرهەستە، کە نەکا بەردێکی سەر بکا و لە پەرژینەکە ئاودیو بێ و یەکێك بریندار بکا. جلوبەرگی شڕ و شیتاڵی لەبەرن. وا شڕ بوون، دەکرێ بڵێی هەر هیچی لەبەردا نییە. ئەگەر شەوانە کرمی سەری ببزوون، کەس خۆی تێ ناگەیەنێ. لە کووخەکە دێتە دەرێ، خولێك بە نێو ئەرخەوانکاندا دەگەرێ و، دەچێتەوە ژوورێ و، وەك تاتە بەردێك بەلادا دەکەوێ و خەو دەیباتەوە. براکانی چەند جاران بردوویانەتە شێتخانە. دکتۆرەکان پشکنیویانە، بەڵام نەیانتوانیوە چاری بکەن. تەنانەت دکتۆر گانچۆیش نەیتوانی چاکی بکاتەوە. هەر بەراستی لەوەتەی دکتۆر گانچۆ هاتووەتە ئاوایی، کەسی چا کردووەتەوە؟

ئەمشەو دیسان شێتە، دڵی لە دارەکان هاتووەتە کوڵ. بایەکەش هەروا. بایەکی سەیر هەڵیکردووە. بای چی، تۆفانێکە، بە خۆڵ و گەلای دارانەوە بەرەو ئاسمانێ کۆڵەکە دەکا.

کچەپوورەکەم گوێ لە گڤەی با دەگرێ و، هیچ لێی ناترسێ. ئەو تەنیا لە قسەی پڕنهێنیی شێتە تۆقیوە و زراوی لێی چووە. خۆی لە باوەشم رادەپسکێنێ و، دەخزێتە ئەو سەری تەختەخەوەکە، کە پوورە ئۆتزۆپار لێی خەوتووە و پرخەی دێ.

ـ دایکە، چراکە داگیرسێنە، من دەترسم.

پوورەئۆتزۆپار هەڵدەستێ و دەستەکوتە دەکا بۆ شقارتەکە و چراکە دادەگیرسێنێ. باوکیشم لەخەو هەڵدەستێنێ. باوکم لەنتەر(فانۆس)ـێك هەڵدەکا و بۆ هێورکردنەوە شێتە دەچێتە دەرێ و شێتە ئارام دەبێتەوە. باوکم یەکێکە لەو چەند کەسە دەگمەنەی، شاندۆ بە هەموو سەرشێتییەکەی خۆیەوە قسەیان لەعەرز نادا.

هەر خوا دەزانێ بۆ.

حەفتەیەك دواتر پوورە ئۆتزۆپار بارگینەکانی لە عارەبانە دەکا و عارەبانەکەش پڕ دەکا لە یۆنجە. کزەی سەرما وەك شیر دەبڕێ. دیتزای کچەپوورم هەتا قورقوڕۆچکەی دەچێتە نێو یۆنجەکە.

پوورە ئۆتزۆپار رێك وەکوو پیاوێك، قیت و رەپ لە شوێنی خۆی دادەنیشێ و جڵەوەکە دەگرێ و دەست دەداتە قەمچی. ئەسپەکان کە باش حەساونەتەوە، کوڕژن دەکەن و بم دەکوتن و ملە درێژەکانیان رادەوەشێنن و، خرینگە لە زەنگوڵەکانیان هەڵدەستێنن.

ـ تودۆر، دەرگا بکەوە.

پوورە ئۆتزۆپار دەڕوا. دیتزای پوورزاشم هەروەتر.

ئێمە رادەوەستین و سەیریان دەکەین کە دوور دەکەونەوە. تۆپەی عارەبانەکە لەسەر زەویی بەستەڵەك دەنگی دێ.

لەوانەیە تا ساڵێکی دی، لێوە کەتەکەی دیتزای پوورم نەبینمەوە.

شتێکی لیچقی گەرم و نووسەك بەسەر نووکی پەنجەکانمەوەیە.

## ٢

## بە چلەی زستانێ

گەردەلوول[*]، تەختەداری سەربانی هەڵکەندبوون و بەملاوئەولایدا دەدان.

گردەکەی ئەوبەری ئاسنەڕێیەکە، تا ئەم چەند ساڵەی دواییش، ڕەزێکی گەورە بوو، کە تا بڵێی ترێی پێوە دەبوو. پەتایەك، کە لە دوورەوە هاتبوو، وەك مێگەلێکی لە قاتوقڕی رای کردبێ، لە ڕەزەکە کەوت و، ڕەگی مێوەکانی وشك کرد. ئیتر ئێستا ئەگەر کرمت بجووڵێ و بتەوێ قومێ مەشرووب بخۆیەوە، تەنیا ئارەقی گەنمەشامیت دەست دەکەوێ و، جۆرە شەرابێك کە لە ناوچەکانی نزیك کوێستانەوە دەیهێنن و شتێکی سپیی ناخۆشە... ئێستا ئەگەر حەزت بچێتە میوەیەکی خۆشی پڕ ئاو، هەی چڵێسی نەفرەتی، دەبێ بە دوودڕکی سوور یان ڕەش نەوست کوێر بکەیەوە.

باخەکە پڕە لە داری توو. ئەگەر وەرزیشی بەسەر چووبێ، ئیتر لەوە پتر چارت نییە، کە خۆت بە چقڵەشینکە و لێڕەواردا بکەی، بەشکم ترێ مارانە، هەڵووژەکێوییەکت چنگ بکەوێ. بەو مەرجەی ئەسپەکان، بە لمۆزە شێدارەکانیان لە ڕەگەوە هەڵیاننەکێشابێ.

ئەو شوێنەی پێشتر ڕەز بوو، گاسن ورد ورد شیو و وەردیان داوەتەوە و، جووتیار گەنم و جۆی ڕەش و گەنمەشامییان لێ چاندووە.

ئەو زەوییە رێکەی لەسەر گردەکەوە، کە تا چاو هەتەر دەکا، هەر نابڕێتەوە و، ئەو ئاسمانەی وەك گومبەزێك بەسەریدا سەیوانی کردووە، هیی ورگنێکە، کە کلاوێکی ڕەنگاڵەی تووتنەڕەنگ لەسەر دەنێ و، کراسی یەخە ڕەق لەبەر دەکا و مامزەیەك بە دەستەوە دەگرێ. بەو ورگە زلەیەوە، جاری وایە بە ئەسپ دەگەڕێ و جاری وایشە بە گالیسکە. ئەسپەکانی زەنگوڵەی زێڕ و زیویان پێوەیە. عارەبانەچییەکە کلاوێکی قوتی فەرمی لەسەر دەنێ بە نیشان و پەڕەوە و، ویزە لە مامزە نەرمە دەسکدارەکەی دێنێ.

ورگن، ناوی گۆگۆیە. گۆگۆکریستۆفۆر ئاغای ملکی بلیتۆری. یانی یەکێك لەو سوار شێوازەی ئێمە ژیانە سەگمەرگییەکەمانی بە حاڵی سەگ لەسەر دادەنێین.

پێخواسەکان هەرا دەکەن: زەوی و زار، زەوی و زار، زەوی و زار.

زەوی زۆر و زەوەندە، بەڵام زەوییش نییە. یانی: زەویی هیی ئەو کەسە نییە کە بە ئارەقەی نێوچاوان ئاوی دەدا.

---

[*] دەقە فارسییەکە دەڵێ تۆفان. بەڵام لە زمانی کوردیدا تۆفان زیاتر لافاوەگەورەکە دێنێتەوە بەر زەینمان. کورد کەم وا هەبووە یان من نەمبیستووە بە گەردەلوول و گژەبا و ڕەشەبا و باهۆز بڵێ تۆفان.

باوکم دەڵێ: ئەگەر زەوییەکەی هیی خۆمان دەبوو، ژیانمان تەواو دەگۆڕا. وەك شا دەژیاین. بەڵام زەوی و زار هەموو بەدەست ئاغا و تازەبەسەرکەوتووەکاندایە، ئەوانەی لە پڕێك بوونە کوڕێك. ئاغاکان باش دەژین. ئەو تازە بەسەرداکەوتووانەش هەروا. ئێمەی چارەڕەشی داماو، هەر خۆمان بەتەنێ دەمێنینەوە و ئێسکوپرووسکمان، کە لە بن بارستایی کاردا، خەریکن ورد دەبن. ئەو پیاوە، شازادەی کۆزا بوو. ئەم بەسەرهاتە زۆر لەمێژینەیە. بەڵام ئاغا لە بنەیان هێنا و، کابرای ئەڵمانیان هێنا و لەجێی ئەو کردیانە شا و، ئیتر خۆ دیارە، ئەویش لایەنگری ئەوانەیە وا ئەویان هێناوە. بنیادەمی ئاوا کوا خەمی ژیانی خەڵکیەتی؟ وەك گۆرانییەکە دەڵێ:

باوکی میللەتی گاوە
ئەو شا بەڵالێدراوە

ـ کوڕە قسەی وا نەکەیەوە تودۆر. نەکا یەکێ بیبیستێ و لێت بخوێنێ[*].
ـ با بچن لێم بخوێنن. بەڵام کێ ئەوەی بە زەینیدا دێ؟ هەژاری داماو، خۆشیان هەر قسەی من دەکەن. کام بنیادەمی لێقەوماوت پێ شك دێ، دژی ئەو وەزعە نەبێ و تووك و نەفرەتی نەکا؟ ئەگەر وەزعەکە باش نییە، دەی باشە، خۆ دیارە لەبن سەری کێ دایە. ئاگری بن کایە، ئاخری ڕۆژێك بڵێسەی هەڵدەستێ.
باوکم ئاگری کوانووەکە لێك دەدا، دارەکان گڕ دەگرن و بڵێسەی هەڵدەستێ، سەر دەکێشێ و دووکەڵێکی شین هەڵدەستێ و داو داو دەبێ و نامێنێ. دووکەڵکێشەکە هەڵیدەلووشێ. بڵێسە لە پێشدا زەرد و دوایی سوور، هەڵدەستن و بە بن مەنجەڵەکەدا خۆ دەبزێون. ئاوەکە گیزەی دێ. تۆقڵەی گەورەگەورە لە ئاوەکە دێتە سەرێ و ئاوەکە قوڵت قوڵت دەکوڵێ.
ـ کچێ ژنەکە، ئاردی گەنمەشامی لە مەنجەڵەکە بکە.
دایکم بە لوێچی دەستی ئاردەکە دەپێوێ و، بەبێ دابێژتن، لە مەنجەڵەکەی دەکا. دوایی بە دارێك تێکی دەدا بۆ ئەوەی ماماڵیگاکە پێ بگا و، خوێ بەسەر شلەکەیەوە دەکا، کە بە چاو دەیبینی وردە وردە خەست دەبێتەوە. چەند خولەکێکی دی ماماڵیگا پێ دەگا. من دەم و لێوم دەلێسمەوە و، تفم قوت دەدەمەوە. خاڵە دۆمیتراکێیش لێوی دەلێسێتەوە و، تف قوت دەدات و قورتمەی گەرووی کە هێندەی سەلکە پیازێکە، لە بن پێستە چرچەکەی لاملیەوە، ساتێکیش چییە لە خواروژوورکردن ناسرەوێ.

[*] لێخوێندن: واتە خراپەگوتنی پاشەملە بە مەبەستی رووخاندن و هەڵداشتنی. چاڵ هەڵکەندن بۆ کەسێك...

ئێمە زۆر بەختەوەرین، چونکە هێشتا نیوە فەردەیەکمان ئارد لە هەمبانەدا ماوە. کێ هەیە لە چەند مستێك ئاردی پتر مابێ؟ خەڵکێکی زۆریش هەن، کە هەر زۆر لە مێژە دەستیان لە بنی هەنبانەی گیراوە.
ـ ئاخ، ئەگەر زەوی و زارم دەبوو.
خاڵە دۆمتیراکێ ئاخ هەڵدەکێشێ. ئاخە بە ژانەکەی لە ناخی دڵییەوە دێتە دەرێ، لەوانەشە لە زگییەوە بێ، کە لە برسان کەوتووەتە قووڕەقووڕ. ئەو زگە بەلاڵێدراوە، ئەگەر برسیی بێ، خۆ حەیای پیاو دەبا. دەیکاتە هاتەوهەرایەك هەر مەپرسە.
جا بۆ ئەوەی هێوری بکەیەوە، بۆ ئەوەی بیخەڵەتێنی و برسێتییەکەی لەبیر بەریتەوە، کلۆیەك خوێ هەڵدەگری و دەیلێسییەوە و، شەربەیەکیشی ئاو بەسەردا دەکەی. هەست دەکەی، وا بەلادا دێی. زگت هەر وا بەتاڵە، پێم وایە ریخۆڵەت نقەی لێ براوە.
دایکم لە بن لێوانەوە دەڵێ: زەوی و زار بۆ ئاغاکانە، یاخوا سەریان بخوا و گژ و گیا لەسەر سینگیان شین بێتەوە.
سەرەڕای ئەوەش، دایکم خۆی لە سەرووی گوندەکەی کۆتزەوە، ڕێك لە دوندی گردەکە پارچە زەوییەکی هەیە. ئەو زەوییەی پاش مردنی یەکەم مێردەکەی دایکم، بە میرات بۆ ئێڤانگلین و کاکە ئیۆنم ماوەتەوە. باوکم، جار و بارە بۆ کێڵان یان داچاندن یان دروێنە دەچێتە ئەوێ و منیش لەگەڵ خۆی دەبا... زەوییە بەلاڵێدراوەکە هەمووی لم و چەوە. هەموو هێزی خۆمان دەخەینە سەر گاسنەکە و پاڵی پێوە دەنێین. دەستمان بلۆق دەکا. بەری دەستمان سوور هەڵدەگەڕێ و ئەستوور دەبێ. بلۆقەکان دەتەقن و دەبرژێتەوە و دەبنە برین...
گا، پاڵ وێك دەکەن و لە شەکەتیان، لە نیوەی شێڤەکەدا بەچۆکدا دێن. بە قەمچیان چەرمی لەشیان شوخاڵ شوخاڵ دەکەین. دیسان هەڵدەستنەوە و، بە زەحمەت دەجووڵێن. دەمی گاسنەکە جیڕەی دێ و دەخلیسکێ و ناچەقێ. باران دەبارێ. تۆوی پێوە دەکەین و شێوەکە وەرد دەدەینەوە. ئەو گەنمەی لێرە شین دەبێ، دوو بست پتر باڵا ناکا. تەنانەت بۆ ئەوەی نابێ بە داسیش بیدروینەوە. دەبێ دەسکەنەی بکەین. هەمیشەی خوای، گیشەیەك دڕوو لە نێوەڕاستی مەزراکەمان دادەنێین، بۆ ئەوەی ئەوەندە بمێنێتەوە، تا خۆی دەڕزێ. دایکم هەر وا دەڵێ: زەوییەکەی بەهێز دەکا.
لە گردە وشکەڕۆکان، کە زەوییەکەی بەیار و بێ حاسڵە، جووتێری دیکەش چەند کوتە زەوییەکیان هەیە. بەڵام دۆڵە بەرێژەو و بە پیتەکان و دەشتە پڕ بەرەکەتەکە، هیی ئاغاکانە. هەر کام لەو زەوییانە، ڕۆژەڕێیەکی غارە ئەسپە. جا کە گەیشتیشە ئەوسەری، زەوییەکی دیکەت دێتە پێش.
پێخواسەکان تاسەبار و تینووی زەوین. برسێتی لە هەناویانەوە هاوار دەکا. کەس ئەو هاوارانە نابیستێ. ئەگەر بیشیانبیستێ، کلاوە چەرمینەکەی دەکێشێتە سەر گوێچکەی و خۆی لێ کەڕ دەکا.

خالۆ دومیتراکیٚ دەڵیٚ:

ـ خوشکە ماری، مامالیگاکەت زۆر خۆش دەرچووە.

من بێدەنگم، کە بە کەوچکە دارینەکەم بنکڕە ناسکەکەی مامالیگاکەم تاشی و خواردم، دەرفەتی قسەکردنم دەبیٚ.

ئەو پەتایەی رەزی باخەوانەکانی بنەبڕ کردووە، رەزەکەی ئاغاشی، کە لەوبەری وێستگەی ئاسنەڕێیەکە وەك جەنگەڵێك هەموو گردەکەی داگرتووە، خاپوور کردووە. ئاغا بە چلەی گەرمای هاوینیٚ، هەموو گوندەکەی هێنا، پیاو و ژن و منداڵ، نەمامە وشکبووەکانیان هەڵکەند و، زەوییەکەیان خاوێن کردووە و، زەوییە وشك و رەشەکە بەجیٚ ما. ئیتر تەراکتۆر هاتن و هەموو گردەکەیان قووڵ قووڵ کێڵا. خەڵکی خوای پێیان وابوو، ئاغا دەیەویٚ گەنم یان جۆ یان گەنمەشامیی پێوە بکا.

بەرەبەری پاییزیٚ دەنگۆ داکەوت، کە لە جێی کۆنەڕەزەکە، رەزێکی تازە لیٚ دەدرێتەوە، کە ئاغا رایسپاردووە لە دەرەوەڕا مێوی بۆ بێنن.

مێوەکانیان لە چەند فارگۆنێکەوە لە وێستگە بچووکەکە دابەزاند. لەشکرێك پیاوی ئاغا باقەی مێوەکانیان لەسەر یەك دانا. دوایی، رۆژێك بەیانی، ئەلمانییەکی سوورهوولی کەڵەگەت بە چاویلکەیەکی زلەوە لە شەمەندەفەر دابەزی و بە نێوەڕاستی مەزراکاندا بەرەو لای کۆشکی ئاغا رۆیی. ڤیۆنیکۆ پانتزی پۆستەچی رێیەکەی پێشان دا و، زۆری نەبرد، هەموو ئاوایی زانیان ناوی کابرای ئەلمانی فرانتس کاپکایە و پسپۆڕی رەز و باخە.

حەفتەیەك پاش هاتنی ئەلمانییەکە، ژنێك، کە پێستی لە پەڕی کاغەزیش سپیتر بوو و، چاوی شین و قەڵافەتێکی درشت و پتەوی هەبوو، بە چوار منداڵەوە هات. ژنە و منداڵەکانی پسپۆڕەی ڕەز و باخ. یەکێك لە گالیسکەکانی کۆشك بردنی بۆ ئەو باڵاخانەیەی بۆیان تەرخان کرابوو. کابرای ئەلمانی زەوییە کێڵراوەکەی پشکنی و، چاوەڕێی وەرزی نەمام ناشتنیٚ بوو: پاییزیٚ، پاش هەڵگرتنەوەی گەنمەشامی.

باران دای کرد. شەو و رۆژ. بارانێك بوو هەر خۆشی نەدەکردەوە. دەتگوت دەیەویٚ زەوی و زەمان ئاو ببا. بەڵام وا نبوو. هەور لێك رەوینەوە و، هەتاوی پاییز، بەو کزی و بیٚ تینییەی خۆیەوە زەویی هەڵبرینگاند و وشکی کردەوە.

هەر ئەو رۆژە لە هەر سیٚ گوندەکەوە لە کەرەنایان تووڕاند. هەر کاتێکی قایمقام هەواڵێکی هەبیٚ و بیەویٚ هەموان بیبیستن، دەڵیٚ کەرەنا لیٚ دەن. خەڵك، وەك مێگەلە مەڕ کۆ دەبنەوە لە بەردەم قایمەقامیە. کەس حەز ناکا گوێی لەو کەرەنایانە بیٚ، چونکە بۆ جارێکیش چییە، خەبەرێکی خۆشی بۆ نەهێناون. هەموو جاریٚ یان

خەبەری زیادکردنی پیتاکە یان بانگکردنی ئەو کەسانەیە وا سەربازی دەیانگرێتەوە، یان بۆ سۆخرە و بێگارییە بە عارەبانە و گاسن. ئەوانەی هەیانە، ئەوانەی گا و عارەبانەشیان نییە، بە شان و باهۆ.

دیش، جارچییەکەی ئاوەدانی، لە پێشدا لەبەردەم قایمەقامیە لە شەپیوورەکەی دەتووڕێنێ، دوایی لە ژوور ئاوایی و ئاخر جار لە خوارووی ئاوەدان لە دەم رووبارەکە، بۆ ئەوەی هەموو خەڵکی ئاوەدانی گوێیان لێ بێ. دوایین جار لەو کۆڵانەدا لێی دەدا، کە ماڵەکەی بۆلبۆکی قەشەی تێدایە و، بۆ ئەو سەری دێ و گەیشتنە لای زۆنگاوەکانیش دەبێ هەر بەو کۆڵانەدا رابرێ.

ئێستا گوندی هەموو لەبەردەم مەڵبەند کۆ بوونەتەوە. بۆبۆلێتێی قایمقام و ستانسکۆی سکرتێری و سەرۆکی دایرە پۆلیسیش هاتوونە دەرێ و لە بانیژەکە راوەستاون. بنیادەم لەوێوە چاوی بەسەر هەموو ئەو جەماعەتەوە دەبێ، کە لە گۆڕەپانەکە کۆ بوونەتەوە. بە چاوێك دەتوانی هەر هەمووان ببینی.

بۆبۆلێتێی قایمقام دەمێك ساڵ لە دیوەخانەکەی ئاغا میلیان میلیارەسی، کە گوندییەکان جاری وایە پێی دەڵێن میلارز و جاری واشە کۆلارز، کوێخا بووە. کارێکی چەور و بەداهاتی بووە، چونکە ئێستا خۆیشی زەوی و زار و ماڵاتێکی زۆری هەیە. بۆخۆی بووەتە جووتبەندەیەکی تەواو. پاشان، لەسەر داوای ئاغا، پارێزگار، کردوویەتی بە قایمقام. ئەمڕۆ ئیتر کێ گونی ئەوەی هەیە جوابەنجەنگێی بۆبۆلێتێ بکا؟ وەختێك ئاغای لە پشتە، ئیتر شەرمی لە کێیە؟ تەنانەت پارێزگاریش دەسکی لە دوو ناکا. جا ئەوە بەخێر پارێزگار زاوای ئاغاشە، قایمقام بۆ دەبێ لێی بترسێ؟ دەی باشە، ئەو خەزوورە و ئەمیش زاوای ئیتر.

قایمقام، سەردەمانێك لە سوپادا عەریف بووە. هەر ئەوەندە دەتوانێ حیساب و کیتابێك بکا و شتێك بنووسێ.

بە دەنگێکی گڕ و ناخۆش روو دەکاتە خەڵکی، دەستێك بە ورگەزلەکەیدا دێنێ، کە قایشێکی چەرمی لێوار سوورچنراوی پانی لێ بەستووە و، ئەوجار دەستی دەخاتە گیرفانەکانی پانتۆڵە فشوفۆڵەکەی و سەری بەرەو دواوە دەبات و، غەوغەوە دوو چین سێ چینەکەی دەردەخا:

ـ باشە، هەمووتان هاتوون؟

یەکێکی بنەماڵەی زگامای پیرێ، وردیلە و تاوەسووت، کە ئێسکی پەراسووی دەرپەڕیون، دەچێتە پێشێ:

ـ ئەرێ پرسیارێك، جەنابی قایمقام. خۆ بەچاوی خۆت دەبینی هەمووومان لێرەین. نەکا کوێر بوویێ؟ دەی باشە، ئەوە شکوری خوای لە کەنگێوە؟

ـ تیتزا ئۆیتێ، بە قەشمەرییەوە گوتی:

ـ لەوەدەمەوە کە بووەتە قایمقام. لەو دەمەوە جووچکە بە خڕی قووت دەدا. دەی وایە، یەکێکی هەموو رۆژێ جووچکە حەپەلووش بکا، چاوی سوور دەبن. کێ هەیە ئەوە نەزانێ؟

ژن و پیاو و منداڵ، هەموو وەك مریشك دەكەونە گارەگار و ئانیشك لە یەك دەكوتن.

قایمقام بە دەنگێكی نووساو دەڵێ: من مشووری ئەو جووتە چڵمنە دەخۆم. پەلە مەكەن. پێتان دەڵێم پووتێك چەند كیلۆیە. خەمتان نەبێ. ئەمڕۆ نەبێ، سبەی لێكی دەردەكەین.

ـ وا باشترە بڵێی لەم شەوانەدا، قایمقام. شەوێك لەم شەوانەی بە پردەكەدا دەپەڕیەوە و دەچیتە لای دنكەكەت.

خەڵكەكە جار بە جار غیرەتیان وەبەر دێ: ژنێك لە ئاپۆراكە دێتە دەرێ و، چەند هەنگاوێك دەكشێتەوە: ئەوە سیڤا پیرشۆیە، ئەو بێوەژنەی دنكی قایمقام.

نیكۆلاس نرانكا، لە تەنیشت زگامائێوە خۆی داوەتە سەر گۆچانەكەی و، روو دەكاتە خەڵكەكە و بە بۆڵەبۆڵ دەڵێ:

ـ بە خوای لە دڵم چەقیوە ئەمڕۆ شتێك دەقەومێ.

ژووڤێتێی پۆلیس دەستێك بە قۆنداغی تفەنگە كارابینیەكەیدا دەكێشێ. دەڵێی دەیلاوێنێتەوە.

ئینۆ ئودۆدۆیی دەڵێ: ئەو هەرامەیە فڕێ بدە سەرۆك. خۆ ئیشەڵا لە سەر سوعبەتێك بەتەما نی قورقوشمان پێوە بنێی؟

تیتزا ئۆیێ لەسەر قسەكەی دەڕوا: جا خۆ ئەگەر بشیهەوێ وا بكا، تۆ پێت وایە قوونی ئەوەی هەبێ؟ خۆ یەك دوو كەس نین، بەشی هەمووشمانی فیشەك پێ نییە.

پۆلیسە رەنگێك دێنێ و دەبا و، دەست دەكا بە پڕكردنەوەی تفەنگەكەی. گوندی لێی دەچنە پێش و تەنگی پێ هەڵدەچنن. پۆلیسە تفەنگەكەی سوار دەكا، پەنجەی لەسەر پەلەپیتكە دادەنێ و نیو هەنگاوێك دەكشێتەوە. سكرتێر هەنگاوێك دەكشێتەوە. بۆبۆلێتێی قایمقام دوو هەنگاو دەكشێتەوە و لە پڕ خۆی بە ناحیەدا دەكاتەوە.

پۆلیس دەڵێ:

ـ خۆ بانگهێشتمان نەكردوون بێن لێرە قسەی قۆڕ بكەن. بۆیمان بانگهێشت كردوون، ئەمرێكی تازەی پارێزگارتان پێ رابگەیەنین. پارێزگار بڕیاری داوە، بەیانی، تاوهەڵات، هەموو ئەو گوندییانەی لە سەر زەوییەكەی گراسیم ئاغا كار دەكەن، بچنە گردەكەی ئاغا بۆ مێوچەقاندن. لە سبەینێوە تا تەواو دەبێ.

ئەلسکاندر ئۆڤێدێینیێ، بە دەنگێکی زۆر ناخۆش هەرا دەکا: دەی دیارە، پارێزگار هەر دەبێ ئەمری وا بفەرموێ. چما ئاغا خەزوورەی نییە؟ خۆ وایە، ئەگەر هات و ئەمڕۆ نا سبەی بە ویستی خوا یان شەیتان ورگە زلەکەی گراسیم ئاغا تەقی، ئەوا رەزەکە بە میرات بە والی دەبڕدرێ.

ئێلییێ گاسکانۆ دەپرسێ: ـ ئەرێ سەرۆك، ئێمە بۆ دەبێ بچینە بێگاری؟ خۆ لە گرێبەستەکەماندا مەرجێکی وا نییە. من خوێندەوارم و، بەر لەوەی گرێبەستەکە ئیمزا بکەم، ورد خوێندوومەتەوە. دەی باشە، وەختایەك شتێکی وا لە گرێبەستەکەدا نەنووسرابێ، دیارە منیش ناچم بە سوخرە مێو بۆ ئاغا بچەقێنم. حەزم لێیە بزانم دەتوانن چم لێ بکەن. خۆ بە زیندوویی کەولّم ناکەن؟

پۆلیسە دیسان تفەنگەکە بە کۆڵێدا کردەوە و قاقایەکی کێشا.

ـ بەو قسە قۆڕانەتان دەتانەوێ بڵێن چی؟ گرینگ نییە لە گرێبەستەکەدا چ نووسراوە و چ نەنووسراوە. جا ئەوە دەیبینی، وەك بڵێی ئێمە بێکارین گوێ لەوانە بگرین. فەرمانمان پێیە بتانهێنینە دەرێ و بتاننێرینە سەر کار و، ئەوانەش کە سەربازییان کردووە، دەزانن، فەرمان بێ ئەملاوئەولا دەبێ جێبەجێ بکرێ. جا بۆ کەرێتی دەکەن؟ دەتانەوێ خوێن بڕژێ؟ لەسەر من نییە. وەك باوکێك نسحەتتان دەکەم، بێ یەك و دوو بچنە سەر گردەکە و فەرمانەکە جێبەجێ بکەن. دەبێ یارمەتیی بدەین ئەو بەستەزمانە رەزەکەی بچەقێنێتەوە. ناردوویە لە فەرەنساوە نەمامی وایان بۆ هێناوە هیچ پەتایەك باشاری نەکا. بۆچی ئەوەندە کەرن؟ حەز ناکەن لە رەزێکی باش و بەپیت لە بەر گوندەکەتان بێ؟ حەز ناکەن ترێیەکی باش بخۆین؟

ـ دەی دیارە لە خوامان دەوێ. بەڵام حەز دەکەین ترێیەکە هیی رەزی خۆمان بێ، نەك هیی رەزی ئاغا. چونکە شەیتانیش ناوێرێ دەست بۆ شتی ئاغا بەرێ.

تا ئێستا هەر پیاوەکان جوابەجەنگێیان کردبوو. ئەوە چ شتێك ئەو غیرەتەی وەبەر ژنەکەی کیریتزا سپێریاتۆ نابوو قسەی وا بکا؟

پۆلیسە دەمی بوو بە تەڵەی تەقیو.

ستانسکۆی سکرتێر دەمی هێنا پێشێ و گوتی:

ـ جا کێ پێشی گرتوون؟ ئێوەش بۆخۆتان ڕەز بچەقێنن. سەرۆك ڕاست دەکا. ئێوە دەتوانن چەندی پێتان خۆشە ڕەز بچەقێنن، بەڵام جارێ وا باشترە لەسەر زەوی و زارەکەی ئاغا تاقیی بکەنەوە، بزانن ئەو نەمامە بیانیانە ئاو و هەوای ئێرەیان پێ دەکەوێ یان نا.

ـ یانی بە کاری خۆمان، تاقیکردنەوەکەمان لەسەر زەویی ئاغا بێ!

ـ زۆر دڵخۆشن ها؟ ئەی پێتان وایە کەی دەبێ تاقیی بکەنەوە؟ ئەقڵتان بەوە ناشکێ، کە بزانن ئاغا ئاخرییەکەی...

دەنگێك لە نێو ئاپۆراکەوە دەڵێ:

ـ دیارە، دیارە. ئاغا ئەوەندەی خواردووە، ورگی خۆی پێ هەڵناگیرێ.

پۆلیسە دیسان بەسەریاندا زاڵە. بۆبۆلێتێی قایمقام دیسان سەروسەکتی لەبەر هەیوانەکەوە دەردەکەوێتەوە و، بە سرتە شتێکی پێ دەڵێ و بە لەبزێکی گاڵتەجاڕانەوە دەڵێ:

ـ دەی باشە، یانی ئاوا... ناتانەوێ بچنە سۆخرە؟

خۆ دیارە غیرەتی هاتووەتە بەر.

ـ لە گرێبەستەکەماندا نییە، دەی بۆ بچین؟

ـ بەڵام من پێتان دەڵێم "دەچن".

خەڵکەکە وێکڕا دەڵێن:

ـ ئێمەش دەڵێین "ناچین".

لە لای وێستگەوە زرمەی ناڵی ئەسپێك دێ. شەش پۆلیسی سوارە لە پشت ئاپۆراکەوە ریز دەبەستن. گوندی بانێئاسا زۆر نزیکە: هەر وا چەند قۆناغێك دەبێ. دەستەیەکی دوازدە کەسی پۆلیس، لەوێن. دیارە جگە لە عەریف بۆرلا. پۆلیس تفەنگ بە شانەوە و دار بە دەستەوە لەسەر پێن. عەریف بۆرلا کە ئاسایش و تەناهیی ناوچەکەی پێ سپێردراوە، پیاوێکی خڕیلەی سمێڵ شۆڕی ملکورتە، دەڵێی سەری لە نێوشانی چەقیوە.

ـ چ باسە؟ دەڵێن چی؟

ئۆدۆدۆیی دەپرسێ: ـ هاتوون چییان پێ گوتووی جەنابی عەریف؟

ـ دەڵێن ئێوە بەتەما نین بچنە کار.

ـ دیارە ناچین. خۆ لە گرێبەستەکەماندا نییە.

ـ گرێبەست؟ جا ئێستا لێتان روون دەکەمەوە.

ئاماژەیەك دەکا و پۆلیس دەوری ئاپۆرا دەگرن. دار لە ئاسمانێ ویڕەی دێ و، لە کوێ بێ دادێ: بە سەر و بە دەموچاو و پشتەملدا، بە نێوشاندا... گوندی دەست دەکەن بە راکردن... رادەکەن، سەرەنگرێ دەبن، دەخلیسکێن، دەکەون. پۆلیس بە ئەسپ وەسەریان دەپەڕن. تا نێو کۆڵانانیش هەر راویان دەنێن. زەبری دار و تێلاش هەر دەبارێ. ژنان دەزیرێنن.

ئودۆدۆئێ و تیتزا ئۆئێ و ئۆڤێدنێ دەگرن و دەیانبەنە مەڵبەند. پۆلیس لە ئەسپ دادەبەزن. لە بەردەم ناحیە کێشك دەگرن و، تفەنگە سوارکراوەکانیان بە دەستەوە دەگرن. بەندییەکان لە فەلاقە دەکەن و ئەوەندەیان بە قەمچی و حەیزەران و خەرەزەن لێ دەدەن، ئازای ئەندامیان دەبێتە شوخاڵ و خوێن. بۆرلا خۆی قەمچییەکانیان لێ دەدا. دوایی هەر دوو دەستیان لە پشتەوەڕا شەتەك دەدا و، بەرەولای بانێئاسا وەپێش خۆیان دەدا.

دواتر دەبیستینەوە، کە بۆ سبەینێکەی، کەرەی بەیانی هەر وا بە پێیان هەڵیانستاندوون و بنکەو بنکەی پۆلیس بردوویانن و ناردوویاننەتە تۆرنۆی ناوەندی شارەدێ، بۆ ئەوەی بە تۆمەتی ئاژاوەگێری دادگایی بکرێن.

رۆژی دوایی، تاوهەلات، دەستەیەك پۆلیس بەشەمەندەفەر هێنراون و، دابەش دەکرێن و، دەبنە چەند دەستەیەکی هێرشبەر و، ماڵەوماڵ گوندەکە دەگەڕێن و، هەموو خەڵکی ئاوەدانی بە سوخرە دەگرن و دەیاننێرنە سەر گردەکە مێو بچەقێنن.

پۆلیس حەفتەیەك لە ئاوابیدا دەمێننەوە. لەو ماوەیەدا رەزەکەی ئاغا، لە ژێر چاودێریی فرانتس کاپکادا لێ دەدرێ و، ئاخرییەکەی گوندی ناچار دەکرێن، پەرژینێکی گەورە و بەرزیش بەدەوری رەزەکەدا بکێشن.

سێ "ئاژاوەگێڕەکە" پاش نۆئێل هاتنەوە ئاوایی. سێ مانگ لە زیندانێ تێهەڵدانیان خوارد و... هەموو شتێك بڕایەوە.

چەند ساڵێك بەسەر ئەو مەسەلەیەدا تێپەڕیوە. ئیتر ئێستا رەزەکەی گراسیم ئاغا بووەتە شتێکی بێوێنە. لەو کەوشەنەدا شتی وا نابینی. بەهارەوبەهار هەموو خەڵکی ئاوایی دەچن و ئەو مێوانەی پار وەبن کا و کلۆش دراون بۆ ئەوەی شەختە نەیانبا، دەریان دێننەوە و، هێچکیان وەبەر دەدەن. بۆ تەکمیش و وەرددانەوەی رەزەکەش هەموو گوند دەچن. ساڵێ چوار جاریش بۆ بژار. پاییزانەش کە یەکەم زوقم کەوت، جارێکی دی هەموو خەڵکی ئاوایی بانگ دەکرێنەوە و، ئەمجارە بۆ ترێ ڕنین.

جا پێش ئەوەی بچنە نێو ڕەزەکەوە، هەر یەکەی زەمبیلێکیان دەدەنێ و دوو پیاویشیان لەسەر سەری دادەنێن و تەنانەت منداڵەکانیش دەمبێن دەکەن.

دەزانن دەمبێن چییە؟* جۆرە دەمامکێکە، لە تۆڕێکی ئاسن دروست کراوە و پێش دەمی بنیادەم دەگرێ. ئەو دەمامکە وەك تۆڕی هێڵەگ وایە. بنیادەم دەتوانێ پێیدا هەناسەش بدات، تەنانەت ئەگەر پێویست بوو، دەتوانێ تفیشی پێدا فڕێ بدا، بەڵام بەهیچ کلۆجێ ناتوانێ یەك گلارە ترێ بخاتە زارییەوە. ستانسکۆی سکرتێر هەوڵ دەدا، گوندییەکان تێ بگەیەنێ و بۆیانی ڕوون بکاتەوە.

ـ خۆ جوان دیارە ئاغا بۆ وا دەکا. هەموو ڕۆژێ چوارسەد تا پێنج سەد کەس دێنە ترێ ڕنین. خۆ ئەگەر وای دانێین هەر کامەیان لە بەیانییەوە تا شەوێ هێشووە ترێیەك بخۆن، زەرەرەکەی پشتی ئاغا دەشکێنێ.

لك و پۆی مێو، لەسەر هێشوو داهاتوونەوە و سەریان گەیوەتە عەرزی. ترێ ڕەشە، ترێی سپی، سوور، هەر دەنکی هێندەی گوێزێك. چما دەکرێ ئەو سەروەت و سامانە جوانە بەفیڕۆ بدرێ؟ دەی دیارە ناکرێ. ئەگەر ترێ ڕنینەکە هەر یەك ڕۆژ بوایە، دیسان دەکرا چاوی لێ بنووقێنی و بڵێی چش لەوەندە ترێیە. بەڵام ساڵێکی بەپیتە و، ڕەزەکەش بە پێشکەوتووترین ڕێوشوێنی چاودێری دەپارێزرێ و خزمەتی دەکرێ، بەروبووەکەی بێ چاوێنی بێ، زۆروزەوەندە و، کاری ترێڕنەکان، بەلانی کەمەوە دوو حەفتە دەخایەنێ.

*

*

*

زستانە و ئاگری نێو کوانووەکە نێڵەی دێ. بەفر دەبارێ و خۆشی ناکاتەوە. هەر دەڵێی هەموو کون و کاژێری ئاسمانیان کردووەتەوە. هەر لە پاییزێوە ئاوا بەفر دەبارێ و لێی ناکاتەوە. لەسەرخۆ و خۆش خۆش، لە پێشدا هەتا گوێزینگ و قولەپێ هات. تا سەر ئەژنۆ و دواجار لەوێش ترازا و گەیشتە پشتوێنی بنیادەم. لە بەر ماڵەوە ڕێچکەی باریك باریك لە کۆڵانێ کراونەتەوە، یەکێکیان تا سەر بیرەکە و، یەکیش تا کادێن و ئاخەڵی بەرخەکان و دانگە.

یەك، دوو، سێ، چوار... نۆ.

---

* مامۆستا هەژار لە تەرجەمەکەی خەیامدا دەفەرموێ:

گێرەی ڕەمەزان بەربوو ئەوا جێژن هات.... دەمبێنی لە دەم گا و کەران داماڵێ

نۆ منداڵین لە ژوورێکدا. ئەگەر ڕاستیت دەوێ، لەوەش زیاترین، بەڵام یەکێکمان غیرەتی ناوەتەبەر خۆی و ڕۆیوە. هەواڵی تازەمان بۆ دەنێرێتەوە. هەواڵی خۆش. هێشتا زیندووە و ئیزرایل بەربینگی نەگرتووە.

بە سەروگوێلاکی یەکتر هەڵدەپڕووسکێین، بەڵام ناتوانین بە کەیفی دڵی خۆمان هەڵبەز و دابەز بکەین: ژوورەکە تەسکە. ئێرە دیوارە، ئەولا تەختی خەوە، ئەوێ دەرگایە و ئەولا پەنجەرە. بەو حاڵەشەوە ئێمە گەمەی خۆمان دەکەین. چۆنی بتوانین یارییەکەمان دەکەین و، ماڵەکە وەسەرخۆمان دەگێڕین. هەقایەت بۆ یەکتری دەگێڕینەوە. مەتەڵە لە یەکتری دادێنین. ئاخ کە نەقڵی "مانگا سوورە" چەندە خۆشە، خۆ پیاو لە بیستنی تێر نابێ.

پەنجەرە خۆڵەمێشییە و لە دەرەوە بەستوویەتی. لە ئاسمانە هەورو تاڵەکە و لە هەموو دنیامان جوێ دەکاتەوە. سوێسکەی کلك بەڵەك و قالاوی دەم پڕ لە هەرا و بەقیڕەقیڕ، کە وەك عاباکەی ئەو قەشەیەی لە وەڵامی سڵاومدا تف دەکاتەوە، ڕەش ڕەشە، لە نێو ئەرخەوانکاندا فڕکان فڕکانیانە. چۆلەکە خۆیان بە شووشەی دەرگا و پەنجەرەکەدا دەدەن. چۆلەکەی وەك ئاسمانەکە خۆڵەمێشی، بگرە لەویش خۆڵەمیشیتر... سەیرە، یەکێکیان خاڵی سوور سووری بە سینگەوەیە.

زستانە.

هەرا و هۆریا. سەگوەڕێکە هەر مەپرسە. کابرا وەژوور دەکەوێ. کڵاوەکەی بستێکی بەفر لەسەر کەوتووە. دایدەنێ و دەیتەکێنێ. دیسان سڵاو دەکا و دادەنیشێ:

ـ خۆشحاڵم هەمووتان بە ساغ و سڵامەتی دەبینم.

ـ بەخێرهاتی خوارزا گیان.

پاسکۆی پوورمە. مەتارەیەکی گەورەی بە نێوقەدەوەیە، کە ڕەنگی سوورە و خەتی پانی ڕەشی پێوەیە. بۆ لای باوکمی ڕادەدێرێ. هەر کام دەبێ قومێك ئارەقی لێ هەڵدەن.

ـ هاتووم ئەمشەو بۆ زەماوەندی ستانی دراوسێمان لێتان بگێڕمەوە. من برازاوام*.

ـ دێین.

باوکم وەڕێ دەکەوێ و دەڕوا. دایکیشم. خوشکە ئێڤانگلین و ریتزایش. کاکە ئیۆنیشم لەگەڵیان دەچێ. منیش خۆمیان لێ دەکەمە بار. زەماوەندەکە لەو ماڵەی تەنیشتمانە. سێ چوار گۆچانێك لێمان دوورن.

زاوا، واتە دادا ستانیکای برای دادا میهالاکێیە، کە ماوەیەك لەوەبەر لەگەڵ خوشکە میترا زەماوەندیان کرد. کوڕی نەنەپێتران. ئەو بێوەژنەی، وەختایەك ئاڵوومان دێ و قوڕگمان دێشێ، کەوچك کەوچك نەوتمان بەگەروودا دەکا.

* دیارە بە هەموو ئەو گەنجانەی دەچنە سەر شایی و زەماوەند پێیان دەڵێن برازاوا، زۆر جاریش تایبەت بەو کەسە دەڵێن کە دەچی پشتوێنی بووك دەگیرێ.

هەردوو کوڕەکەی بوێر و ئازا و بەغیرەتن، کە وەك ئێمە لە سەر سێ پارچە زەوییەکەی بلیتۆری و سایلێ و سێکارا ڕەعیەتی دەکەن.

دادامیهالاکێ، لە جێیەکی زۆر دوور ژنی هێناوە. لە گوندی ئایۆئاسای نیزك ئۆلت. ژنێکی چاوبزی گەش و پیتۆڵە، کە وەباڵ بەستۆی بوختانکەری ئاوایی، دۆخینیشی تۆزێك شلە. لە کارکردنێ زۆر گورجوگۆڵە. گۆنییەکی سەدوبیست کیلۆیی وا بە کۆڵی دادەدا، وەك بڵێی تووکی مریشکی تێدایە. کەڵپنە و دەنگێکی ناخۆشیشی هەیە، وەك دەنگی گڕی پیاوێکی پەسیوگرتوو. کە تاریکان بەسەردا دێ، ئەو گەنجانەی تازە خۆیان ناسیوە و میزیان کەفی کردووە، لە دەوری کووخەکەی نەنە تێرا دەخولێنەوە.

ڤاسیلێی ـ کوڕی ڤیکۆ مامە گەورەکەم ـــشم، لەوانەیە کە چاویان هەر لە لای ماڵی نەنە پێترایە.

ئەگەرچی ئێمە نێوانمان لەگەڵ ئامۆژنم نییە، باوکم شەو و ڕۆژ ڤاسیلێ لۆمە و سەرکۆنە دەکا: ـ ئاخری هەڵی دەگرییەوە. ئەمرۆ نا سبەی میهالاکێ تێلایەکت لە تەپڵی سەری رادەکێشێ و مێشکت دەپژێنێ. هەتیو، خۆ تازەت ژن هێناوە، دیسانیش چاوت هەر بەدوای ژنی ئەم و ئەوەوەیە.

ـ مێشکی من دەپژێنێ؟ ئیی من؟

جا وەك کەڵەشێر دەست بە قاسپەقاسپ دوور دەکەوێتەوە. هەر بەراستی، بەس پۆپنە و پەڕی لە کەڵەشێر کەمترە. ردێنێکی بزنانیی تەنکی لە سەر چەناگەی داناوە و، لاسارانە نایتاشێ.

ـ ئەرێوەڵاهی مێشکی تۆ.

ـ ئەی ئەو تێلایەم بۆ پێیە؟

باشە، دادا میهالا، هەر بە خەڵکی وەك ڤاسیلێ و هەرزە و پەرزەکانی دی ناشڵێ کەرتان بەچەندی. خۆ دیارە ژنەکەی وەجاغی کوێرە و نەزۆکە. بەڵام خۆ دوور نییە هیی بێ گونیی میهالاکێ بێ. سەرسپییەکانی ئاوایی وایان لە گوێ خوێندووە، کە ئەگەر چاو بنووقێنێ و، گوێ نەداتە هێلکەدۆڕاندنەکانی ژنەکەی، هیچ دوور نییە منداڵێکی کاکۆڵ زێڕینیان ببێ و، وەجاغیان رووناك بێتەوە. ئەوەی لە باخەکەی تۆدا شین بێتەوە، هیی خۆتە. جگە لەوەش، بۆ پێتان وایە دادا میهالاکێ ئەو ملوانکەیەی لەبیر دەچێتەوە، کە خوشکە میترا لە ڕۆژی زەماوەندەکەیدا بەخۆوەی خستبوو و، شەش لیرەی زێڕی پێوە دەدرەوشانەوە؟ خۆ لەوەدەمەوە تا ئێستا، شەش لیرەی ملوانەکەکەی بووەتە نۆ لیرە و هەر زیاتریش دەبن. ئەی لەو ژنە گورجوگۆڵەی. ئەوەش لە سایەی ئەو مەسەلەیەوەیە، کە ئەم ساڵ پاییزێ لە کاتی هەڵگرتنەوەی گەنمەشامیدا قەوما.

کریستۆفورە ورگن، بەو قەمچییە گوڵێنگە سەوزەی بەدەستییەوە بوو، وردە ئاماژەیەکی بە خوشکە میترا کرد : کە بێتە نێو عەمبارەکە، بۆ لای من...

جا بۆ نەچیٚ؟

ژنەکان کە لە دەوری کۆگا گەنمەشامییەکە هەڵترووشکابوون و هەندیٚ لەسەر ئەژنۆ بوون، لە بنەوە پیٚدەکەنین و سرتوخرتیان بوو و، چاوەڕاویان بوو بزانن کەی دیٚتەوە.

خوشکە میترا زۆری نەگنخاند و بەدەم کۆکردنەوەی تەشکوداویٚنییەوە لە عەمبارەکە هاتە دەریٚ.

ژنان بە راکردن بەپیریییەوە چوون: دەی دەی، بۆمان بگیٚڕەوە بزانین چیی لیٚ کردی؟

ـ کچیٚ دە لاچن لا، وەڵا هیچی پیٚ نەکرا، ئەو کەرە دەستوپیٚ سپیلکەیە، خۆ هەر لە قسەی زل ئازایە.

ئیٚواریٚ کە دادا میهالاکیٚ هاتەوە ماڵیٚ، عارەبانەکەی ئەوەندە قورس بوو، هەر جیڕەی تۆپەی دەهات. ئەسپەکان وا کەوتبوونە هانکەهانك، دەتگوت بەردت لیٚ بار کردون. بەڵام گوندییەکانی دیکە، هەرچی دەستیان کەوتبوو، پیٚنچ شەش ربە پتر نەبوو. ئەوەندەی کە بکریٚ لە قوونی عارەبانەکەیانی پەستیٚون و بیهیٚننەوە ماڵیٚ.

ئەوانەی لە ملّکی ئاغاکاندا رەعیەتی دەکەن، زۆر زەحمەت دەکیٚشن و شەکەت دەبن. ئەو کریٚکارانەش ئەگەر پارچە زەوییەکیان هەبیٚ، بەر لە کیٚلاّن و داچاندنی زەوییەکانی ئاغا، بۆیان نییە دەست بۆ ئی خۆیان بەرن. پۆلیسیٚك لەوێیە، بۆ ئەوەی وەبیریان بیٚنیٚتەوە.

گەنمەشامییەکە کۆ دەکەینەوە و دەیبەینە بەردەم عەمبارە و سایلۆکان. کە لە هەڵگرتنەوەی بووینەوە، سەروسەکتی ئاغا و کویٚخاکەیمان لیٚ پەیدا دەبن، بۆ ئەوەی ملّکانەی خۆیان هەڵگرن. سیٚ بەش هیی ئاغایە و بەشیٚك هیی تۆ. یانی هیچمان لە هیچ. چونکە تا نۆئیٚل دەنکە گەنمەشامییەکیش چییە لە هەمبانەتدا نامیٚنیٚ بیبەیە ئاشی لیٚی بکەی. ئیتر هەڵدەستی دەچیە عەمباری ئاغا گەنمەشامی یان گەنم قەرز بکەی. پاش دوو سەعات مەحتەلبوون لە دەم پەرژینەکە، جا نۆرەت دیٚ.

ـ ئیٚ، تۆ چەند توورەکە گەنمەشامیت دەویٚ تودۆر؟

ـ سیٚ توورەکە گۆگۆئاغا.

ـ کەیفی خۆتە چۆنی پاك دەکەی بیکە: یان نەقدی بیدە، یان ساڵی دادیٚ، پاییزیٚ هەر توورەکەی، سیٚ توورەکەی دیٚتە سەری.

ـ خۆ پارەی نەقدم نییە گۆگۆئاغا.

ئاخری بۆ سیٚ توورەکە، دەبیٚ نۆ کیسە بدەی، جاری واشە دوازدە توورەکە.

بەر لە نۆئیٚل گەنمەشامی زۆر گرانە، بەڵام لە پاییزیٚدا دەبیٚتە گەپجاڕ و هەر سووك دەبیٚ. بەو حاڵەشەوە وەرزیٚر ناچارن بەرهەمەکەیان هەر بەو نرخە سووکە بە ئاغا بفرۆشنەوە. کاربەدەستی خەزیٚنەی حوکمەت، هەر

خولەکێکیش چییە لەسەریان راناوەستێ. ماڵیاتەکان دەبێ یەکدابەدوو بدرێن و، گوندیش دەیدەن. هەر کەس نەیدا، مامالیگا و راخەر و سیپاڵی ماڵەکەی لەبەر چاوی خۆی هەرزانفرۆش دەکرێ.

*

*

*

دادا میهالاکێ، زلە و کەتەیەکە، هەر دەڵێی هەرچی خواردوویەتی، داینەناوەتەوە. دادا ستانیکا، بەپێچەوانەوە وردیلەیەکە، دەڵێی بە دار لە سەریان داوە و نەیانهێشتووە هەڵ بدا. لووتی، وەك دەنووکی مریشك هاتووەتە سەر زاری. چاوی حیز و بلێی و نەڵێی خێلن. کچۆڵەیەکی خەڵکی ئاوایی مارە کردووە، جیازێکی باشی هەیە: کچە کاڵ و رەقەڵە و وردیلەیە. دەموچاوی شڵەیە و قژە کاڵە درێژەکەی کەزی کردووە. دەڵێی گورزەی گەنمە بادراوە. تەنوورە گنجاوییە کۆبەگێراوەکەی لەپێ دەکا و، لەسەر کراسەکەی، کە لێوارەکەی بە رەنگێکی شین دووراوە، ئێلەگێکی کەوڵە بەرخ لەبەر دەکا، یانی باوکی جگە لە زەوی و زار مەڕیشی هەیە. مێگەلێکی زۆر. شەش شەکی دابەستەش لەگەڵ جیازەکەیەتی و، مانگایەکیش کە تازە زاوە. سەرباری هەموو ئەوانەش، عارەبانەیەك پڕ لە قوماش و جلوبەرگی جۆراوجۆر و مافوور. جگە لە هەموو ئەوانە، ئەو زەوی و زارانەی لەو دۆڵەدان وا، کە بێستانی بێستانچییە بۆڵگارییەکانی ئەوبەری دانووبیش لەوێیە، هەمووی لە قەباڵەی کچە کراون.

لاوان، کە لەبەردەم ماڵەکەی کۆ بوونەتەوە، دەڵێن:

ـ خۆشبەختی سەگباب.  وەڵا گەوهەری وا لە هیچ کوێ دەست ناکەوێ.

خانووەکە دوو ژووری هەیە و دوو کوانوو. یەکێکیان جیازی بووکی تێدایە و، ئەوی دیکەشیان لەگوڵ داوە و رازاندوویانەتەوە و کردوویانەتە پەردووی بووك و زاوا. نازیمەی پەشم و باڵنجیان داناوە و، مافووریشیان لەسەر حەسیرەکانی جاران راخستووە.

ئەی لەو بەزمەی. تازە گەڕی شاییان گەرم داهێناوە. لە دەم دیوارەکانەوە، کورسی و نیوکورسیی دۆشەکچە لەسەریان ریز کردووە. مەنجەڵی بچووك لەسەر کوچکاورن. بۆنی شۆرباوی سارمالیس و بەزی بەراز دنیا دادەگرێ. میوان ئارەقی گەرم دەخۆنەوە، لە دەفری گڵێندا و، بە دەست دۆڵمە لە زاریان دەئاخنن. چێشتی کەلەم و گۆشتی بەرازنیش بەپای فیلانە. نانەکە گەرمە و گەڵاگەڵایە و زەردە وەك زێڕ، چونکە بەر لەوەی بە تەندوورییەوە بدەن، زەردێنەی هێلکەیان تێ هەڵسووە. زۆڕنا و دووزەلەکەش گەرمیان کردووە. دۆمێکی دەموچاوی خڕوێلکاوی کەوانە بە ژێی سازەکەیدا دێنێ، کە لاوەشی گرتووە. نان و خواردن بۆ ئەو گەنجانەش دەنێرن، کە لەو دەموساتانەدا بەبێ ئەوەی کەس بانگهێشتی کردبێن، هاتوون و لە دالانەکەدا کۆ بوونەتەوە. هەر وا بەسەر پێیانەوە، پاروو و

قەپووچکەی کەلەمەکە لە زاریان رۆ دەکەن و ئاودیوی ورگیانی دەکەن. ئارەقی راکییشیان دەدەنێ، لە دەفری گەورەگەورەدا. هەر چەند خولەك جارێك، یەکێکیان دێتە نێوەڕاستی خەڵکەکەی نێو حەوشە و، لە خۆشیان یەك بە خۆی دەقریوێنێ، هەر دەڵێی قریوەی رێگرەکانی سالأنە، کە دەیانقریواند، بۆ ئەوەی لێك ئاگادار بن.

تاریکە شەوێکە شیر نایبڕێ. کچان یەك یەك و جووتجووت فیزماڵکی دەدەنێ و دەچنە دەرێ، بەرەو لای کادێن و نێو کلۆش و قالۆرە وشکەی گەنمەشامی. کە دێنەوە، هەموو تەشك و داوێنیان گنج گنج بووە و سەر کولمەیان شین و مۆر بووەتەوە... لە سەرمان!؟

شەمەندەفەرەکەی نیوەشەوێ، کە پزیسکبارانێت و هەموو گلۆپەکانی داییسێن، بە هانکەهانك دێ و رادەبرێ و لە دۆڵی گردەکەدا لەچاوان ون دەبێ. ئاورینگی نیوەسووتی رەژوو، وەك پۆلە زەردەواڵەیەکی سوور و بنەوشە بەسەر گوندەکەدا هەڵدەفڕن و لەسەر ئەو دەریا بەفرە دێوەزمەئاسایە دەنیشنەوە، کە هەتا چاو بڕدەکا وڵاتی داپۆشیوە و ئینجا دەکوژێنەوە.

نیوە شەوە. زاوا دەستی بووك دەگرێ و دەیباتە پەردوو.

ـ وەرە ماری.

ـ ئەگەر پێت خۆشە.

وەك بیی نێو ئاو دەلەرزێ.

خۆم دەخزێنمە نێو تەشك و داوێنی ژنانەوە و، خۆ دەگەیەنمە بووك و، سەیری نێو چاوی دەکەم. چاوی هیچیان لێ ناخوێنرێتەوە. لە چاوی گوێرەکەیەك دەچن، کە خەریکن بەرەو کوشتارگەی دەبەن. دۆمە خروێلکاوییەکە، گەرمدا هاتووە و گشتتر لە سازەکەی دەدا و گۆرانییەکی مەستانە دەچڕێ:

ئەودەمەی من

کچێ جوان بووم

تاقانەی ماڵی باوان بووم

دایکی بووك، کە ژنی بەقسەوباس و شەیتان و شۆفاری ئاوایی بە رەوەیەك منداڵەوە دەوریان دابوو، پەردەی پێش ژووری پەردوو هەڵدەداتەوە و، بەربووك کراسە هەوریشمینەکەی بنەوەی بووك دێنێ. وەك چاوی قرژاڵ روونە، هێندە روون دەتوانی ئەودیوی جوان جوان ببینی و، سەری زمانی پێدا بێنی دەدڕێ. دەیداتە بووك و دەڵێ:

ـ هانێ ماریسیکا، نەکا رووڕەشی نێو ئاواییمان بکەی.

دێنە دەرێ و دەرگا پێوە دەدرێ و، دەنگی داخرانی چلمێردەی پشت دەرگاکە دێ.

یەکێك گوێم دەکێشێ، ناستازیا ورگن، ژنەکەی بۆبۆکە.

ـ ئەوە لێرە چ گوویەك دەخۆی، دایکەخۆگێ؟

ـ ئێ، گوویەك هەر دەخۆم ئیتر...

خوشکە میترا، دارە نیوەسووتەکەی نێو ئاگردان بە خاکەنازێك هەڵدەگرێ و لە گۆزە ئاوەکەی هەڵدەکێشێ، بەبێ ئەوەی سەر هەڵێنێ، دەیداتە دەست لاوەکان، کە لەبەر دەرگا کۆ بوونەتەوە و پێیان دەڵێ:

ـ لە عەرزی راکێشن، وەك تفەنگ دەنگی دێ. زیاتریش.

دووزەلەچی گووپ هەڵدەدا و بەتاڵی دەکاتەوە و دووزەلەی دەنگی دێ. زورِناکە دەنگێکی ناخۆشی لێ هەڵدەستێ. دۆمە خرِوێلکاوییەکەش دەنگی لێ هەڵێناوە:

رەشئەسمەر مەرِۆ، خۆری ئاواتم
تا رۆژی قیامەت هەر بەتەماتم

هەتیومەتیو گۆزەی پرِ لە سکڵ و پۆلوو هەڵدەگرن و لە بەر پەنجەرە گرم بە عەرزیدا دەدەن. بە دەمانچە تورکییەکانی کۆن، کە لوولەکەیان درێژ و دەسکەکەیان سەدەفدار بوو، تەقە دەکەن. گردەکان دەنگەکە دەگرن و دەنگ دەدەنەوە.

زاوا وەك بای شەماڵ لە پەردوو دەردەپەرِێ و، بە هەموو تینی خۆی، دەرگاکە پێوە دەدا.

چ بووە، ماڵەکەمان ئاگری تێبەربووە؟ بوولەرزە هەستاوە؟ چ بووە؟ چ قەوماوە؟

بەربووك بە پارِانەوەوە دەڵێ:

ـ بنکراسەکە.. بنکراسەکەی بووکمان بدەیە، بیدە بەمە!

ـ بنکراسی چی؟ تەرِەماشی چی؟ من هیچم پێ نییە بتاندەمێ. ئەو قەحپەیە دەمێکە دۆرِاندوویەتی. لە نەنکیشم ژنترە. تێگەیشتی؟

ژن هرووژم دەبەنە پەردوو. لائێ مارسیسیکا، لەو سەر تەختی خەوەکە هەڵکورماوە و دەستی لە لاکەلەکەیەوە ناوە و دەناڵێنێ:

ـ خواغەزەبلێگرتوو پەراسووی شکاندم.

چاوی هەڵمساون. کابرا بە مست و پێلەقە شرِی کردووە.

ستانیکا هاوار دەکا:

ـ هۆی دۆم، بێدەنگ بن. دابونەریت چۆنە دەبێ وا بکەین. دەبێ بە سواری درمخ[*] بیبەینەوە ماڵی بابی. دامودەستوور وایە. بێت و وا نەکەین، ئەمساڵ تەرزە لە حاسڵاتمان دەدا و مانگاکانمان دەمرن.

خەسووی بووك واز ناهێنێ:

ـ بەکێ؟ بەکێت داوە، بزانم، بە کێت دۆڕاندووە؟

ماریسیتکا متەقی لێ نایە. جا فایدەی چی، ئەگەر بشیلێ.

هەموو بە فانۆسەوە دێنە حەوشە. درمخەکە لە کۆڵەکەکەی قوونەبانی عەمبارێ دێننە خوارێ و دەیبەنە دەر و گایەکانی لێ دەبەستن. دوو داری درێژیش راست و چەپ و یەك دوو مەلۆ دڕوویان لەسەر داناوە. دەبێ بووکی لەسەر دابنێن.

مارسی سیتکا، تەندوورە کەوڵەبەرخەکەی لەبەر دەکاتەوە. لەچکێك لەسەر دەکا و دەموچاوی بە لکی لەچکەکە دادەپۆشێ. خەریکن دەیبەنەوە ماڵی باوانی. میوانی زەماوەند هەموو کەوتوونە شوێنی و، چاوەش و شایەریش لە پێش پێشەوە دەڕۆن، بە تەپڵ و زوڕنا و دەهۆڵ. بۆخۆیشی پێشتر دەیزانی دەبێتە ئەو بەزمە و، هەموو خەڵکی ئاوایی لە خەو هەڵدەستن و دەرگا و پەنجەرە دەخەنە سەر گازەرای پشت بۆ ئەوەی بزانن چ قەوماوە. دەی باشە، خۆ ئێستا هیچ دەسەڵات نییە، بە قەبری بابیانەوە.

بە راکێش راکێش دەیهێننە دەرێ و فڕێی دەدەنە سەر درمخەکە. حەشاماتەکە دەکەونە رێ. چاوەش بەندان دەڵێن، بەڵام ئەمجارە بە گاڵتەوە. زۆڕنا وەك بۆق دەقرێنێ و، ژێی کەمان سیڕەی دێ و، کەڕەنا دەڵێی قرپ دەداتەوە. زوڕناچی لیکی شۆڕ بوونەوە و لەسەر لێوی بەستوویەتی. پەنجەرە دەکرێنەوە و دەرگا لێك دەدرێن و، سەگەل وەك ئەوەی لە نەکاو هار بووبێ، دەیکەنە حەپە و لوورە.

بەفر دەبارێ، دەڵێی لۆکەت هەلاجی کردووە. لە ئاسمانێکی نادیارەوە، کە نازانی چەندە بەرزە و، دەکەوێتە سەر ئەو بەفرە قورسەی زەویی داپۆشیوە و بەستوویەتی و لە بن پێیاندا کرتەی دێ، بەفرێکی تازە، نەرم و ئاودار دەکەوێ.

حەشامات، بە رووبارە بەستووەکەدا، کە هەر دوو بەشەکەی ئاوایی لێك دابڕیوە، تێدەپەڕێ.

ماڵی ماریسیکا لە تاریکیدا دیار نیە. خەڵکەکە مەشخەڵەکانیان رادەوەشێنن. سەروسەکتی باوکی لە لاشیپانەدا دەردەکەوێ. برای بووکیش یەك یەك دێنە دەرێ. دوای هەمووان دایکی بووکیش کە خۆی لە چارۆکەیەك وەرپێچاوە.

ـ چ قەوماوە، براینە؟

[*] درمخ/ درمغ: (ئەو شتە ددانداره‌ی کا و کلۆش و زۆر جاریش چەوی پێ کۆ دەکەنەوە)

ـ کچەکەتمان بۆ هێناویەوە، خەزوور! شەقڵی شکابوو.

خەزوور وەك لە ئاسمانڕا بەربووبێتەوە، دەحەپەسێ. ئەوجار بەسەرخۆیدا زاڵ دەبێتەوە و دەزانێ کەر لە کوێ کەوتووە و کوندە لە کوێ دڕاوە. لە پڕ هەلینگ دەدا و، قژی ژنە دەگرێ و رایدەکێشێ و بەعەرزییدا دەدا. باشە بەفرەکە نەرمە و، گیانی رەش و مۆر نابێتەوە.

ـ دێڵە سە، تۆ دەتزانی، تۆ دەبوو بزانی...

هەر دەڵێی فەردە گەچ بەعەرزیدا دەدا. میوان نێوبژیوانی دەکەن و دەڵێن: وازی لێ بێنە، برا خەریکە دەیکوژی.

ـ یانی چی؟ بەئێوە چی؟ ژنی خۆمە. ئێوە بۆ دەمتان دێنە پێش؟

لە کۆڵ ژنەکەی دەبێتەوە. بووکێ لە سەر درگەکە نەبزووتووە. دڵی، کە هەر هێندەی نیسکێکی لێ هاتووەتەوە، وەك باڵی چۆلەکە فڕەی دێ، دەڵێی دەیەوێ لە سینەی بێتە دەر.

زاوا و برازاوا و هەموو میوانەکان خۆ دەخزێننەماڵەوە. دایکی بووك و زاوا لە تەنیشت درگەکەوە دادەنیشن و دەست دەکەن بە سرتوخرت. خۆ لەسەر شتێکی وا بچووك ئیشەڵا سەری نابڕن. چما ئەو کراسە هەر بە بەژنی وی بڕاوە؟

زاوا، کە لەداخان پیاڵەیەك پتری هەڵداوە، هەقدارانە دەڵێ:

ـ جگە لەوەی لەگەڵتان خستووە، دەبێ هێکتارێك زەوی و شەش شەك و گایەکی دیکەشم بدەنێ.

ـ ترحێو، مەگەر گووت بدەمێ، هەتیوە قوون رووتە. نەکا بتەوێ گیانیشم دەرکێشی... نەخێر، ئیتر گووشت نادەمێ... ئەگەر پێت خۆشە ئەوە...

ئارەق راکیبیان لەسەر ئاگری کا گەرم کردووەتەوە. پەرداخ لێك دەدەن و، وەك باران جنێو بە یەکتری دەدەن. دەگمەن هەڵدەکەوێ شتی ئاوا.

ستانیکا وەك سواڵکەران دەپاڕێتەوە: تۆزێك چەورتری کەن دەی...

ـ دەی باشە، با خەڵکی ئاوایی وا نەزانن گوونەکەرم، قەیناکا شتێکت دەدەمێ. نیو هێکتار زەوی و سێ شەکی کەوەسێر. بەڵام هەر ئەوەندە و تەواو. دێڵە چەتە.

ـ بە من مەڵێ چەتە.

ـ جا کەیفم بێنێ بۆ ناڵێم؟ ئەگەر پێت ناخۆشە، هەر ئەوەندەی داومێی، بەسە. کەرێکی دیکە بۆ کچەکەم دەدۆزمەوە، سەد لە تۆ باشتر. هەستە ملت بشکێنە دەی.

ـ گوتت چەندم دەدەیەی؟

ـ نیو هێکتار و سێ شەك.

ـ باشە، قەیناکا، چونکە زۆرم خاتر و جامینی ئەو ناسك و نازدارە دەوێ، ئەگینا نەمدەهێشت کڵاوم لەسەر بنێن. ئەرێ هەر بەراست، شەکەکان با دابەستە بن.

ـ دابەستە؟

خەڵکەکە دەگەڕێنەوە، بەڵام بەلایەکی دیکەدا. ماریسیکا لەسەر درگەکە فرمێسك هەڵدەوەرێنێ. کەس ئاوڕیشی لێ ناداتەوە. شایەر بە زڕەزڕی زوڕنا، هەم گاڵتە بەو خەڵکی خوایە دەکەن و هەمیش بە موسیقا.

خەم باڵی بەسەر گوندەکەدا کێشاوە. ئاسمان بەسەر کۆڵانەکاندا شۆڕ بووەتەوە. چرچولۆچ و شیتاڵ شیتاڵ وەك ورگی پیرەژنان.

ماریسیکا ئیتر کەلەکەی نایەشن.

بەڵا لە نێو ئاوەدانی، کەلەکەی زۆر کچ ژانی تێ دەوەستێ. وەختێك شینکە دێتە دەرێ، پاش هەڵپەڕکێ، کوڕان لەگەڵ کچان دەچنە سەر گرد و نێو شیو و دۆڵان. لە پێشدا ژوانگەیان دیاری دەکەن*.

ـ تۆ لەگەڵ من دێیە گردێ ئیلینکا؟

ـ ناوەڵا.

ـ باشە بۆ؟

ـ چونکە حەزم لێ نییە. دەمەوێ لەگەڵ گیۆرکێ بچم.

ـ ئاگات لە خۆت بێ، ئەمشەو نەوتی ڕەش لە دەرگەتان هەڵئەسووم.

ـ جا ئەگەر حەز دەکەی باوکم شەقترێنت بکا، وەرە تێی هەڵسوو.

ـ پێترۆتزا، تۆ ئەمشەو پاش هەڵپەڕکێ، لەگەڵ من دێی بۆ سەر گردێ؟

ـ بەو مەرجەی ئاقڵ بی، دێم.

زەردەپەڕ کە سوور هەڵگەڕا، دەستی داوەتێ بەردەبێ. کوڕان وەپێش دەکەون. یەکێکیان لە پێش هەمووانەوە زوڕنا یان شمشاڵ لێ دەدا. کوڕە پوورەکەی خۆم، پارووگابۆنێئا، ئۆکۆردیۆن لێ دەدا. باوکی زۆری پێ دەنازێ و لە مەیخانە لە سینگی خۆی دەدا و دەڵێ: ـ سەد هەزار ماشەڵای لێ بێ، ئەی لەو توانایە. پارووی جگەرگۆشەم، هەر پەنجەیەکی هەزار هونەری لێ دەبارێ.

ـ تۆدۆسێ، وازمان لێ بێنە برا، ئەوەندە بەخۆت مەنازە، زۆر کەس دەتوانن وەك ئەوی لێ بدەن.

---

*مامۆستا هەژار دەڵێ:

وا کیژ و لاون دەچنە دەر لە دێوە.... لە ڕێوە تێك دەگەن ژوانگە کێوە

گۆوەند لە کەوشە دوور لە وشکە سۆفین.... دەرفەتە مەم گوشین و هەڵگلۆفین

ـ لەوانەشە. بەڵام کەس وەك پارووی منی لی نادا، باب بەقوربانت بی. ئەوان دەمیان شل دەبیّ.

کچانیش پۆل پۆل و دەستەدەستە، ئەو ڕێیە دەگرنە بەر کە دەچێتەوە سەر گردەکان و، ئێمە منداڵەکانیش وەشوێنیان دەکەوین. جاری وایە یەکێکیان رادەوەستیّ و پێمان دەڵێ:

ـ ئەوە بۆ وەدووی قوونمان کەوتوون، بەڵالێدراوینە؟

ـ بۆ سواری قەڵاندۆشتان بووین؟

کچە بەردمان تیّ هەڵدەکا بۆ ئەوەی بمانترسێنیّ و بگەڕێینەوە. زەحمەتی بیّ سوود: بەردەکان هەر ناشمانئەنگێویّ. دەزانین چۆن خۆمان مات بکەین و خۆ لادەین. بە بن گوێماندا دێن و وەعەرزی دەکەون و پەرش و بڵاو دەبن و کچەش کە شەکەت بووە وازمان لیّ دێنیّ و بەهەندمان ناگریّ.

لە مێشەڵانە بچووکە ئاقاقیاکەدا، هەر کوڕە و دەستی نازداری خۆی دەگریّ و جووت جووت دوور دەکەونەوە و دەچنە قوژبنێك و باسی زەماوەند و بووك و زاوایەتیان بۆ دەکەن. ئێمە منداڵەکانیش چاوێکمان دەکەینە چوار چاو. کوڕەکان جار جار دەردەپەڕن و جنێوبارانمان دەکەن و، ئێمەش جنێویان دەخەینەوە هەمبانە و لەوان نامێنینەوە.

کوڕەکەی ئەنگلۆش بێلدییّ، وەك شازادەی نێو هەقایەتی پەرییەکان جوانە. بەڵام پێم وایە تا بڵێی ڕەشووڕووت و هەژارە.

ـ ئیڤانواش دەیکاتە زاوای خۆی، ئاخر چونکە هەر ئەو تاقە کچەی هەیە... کچە ناشیرین نییە، هەڵبەت زۆریش لەبەردڵان نییە.

ـ جوانی تا سەر نامێنیّ، بەڵام زەوی و زار نافەوتیّ. یەکێك زەویی هەبیّ، ئیتر خەم لە چی دەخوا؟

ـ ئەی دەنگوباسی ئاپۆشتای کچی کۆکلیا؟

ـ هیچ، زگی گەیوەتە بەر چەناگەی، بەڵام ئاشکرای ناکا منداڵەکە لە کێیە؟

ئاپۆشتا بە دزیی هەموانەوە منداڵەکەی بوو. لە پڕ ڕۆژێك خەڵکی ئاوایی سەیر دەکەن زگی پووچاوەتەوە و نێوقەدی باریك بووەوە. جا سرتوخرتەکان دەستیان پیّ کردەوە:

ـ نەکا لەباری بردبیّ؟

ـ یانی پێت وایە؟ نا لەباری نەبردووە، بوویەتی و کوشتوویەتی.

ئاپۆشتایان بانگ کرد و بردیانە ناحیە. ژووتێی پۆلیس بردییە پۆلیسخانە.

ـ دەی، بڵێ بزانم. چیت لە منداڵەکە کرد؟

ـ کامە منداڵ؟

ـ ئەوەی بووت؟

ـ من منداڵم نەبووە.

ئاخری هەڵیانپێچا تا درکاندی. منداڵەکەی لە بن کۆپەنکە پەین شاردبۆوە. ئاپۆشتایان ناچار کرد بچێ دەری بێنێتەوە. پارچەگۆشتێك بوو، کە شوێنی پەنجە بەسەر لامل و قوڕگییەکەوە شین و مۆر هەڵگەڕابوو.

ـ دڵم نەهات زیندەبەچاڵی بکەم. بەزەییم پێیدا هاتەوە. چاوی شین شین بوون، وەك چاوی میلۆتزا.

ـ کەواتە لە میلۆتزا بوو...

ـ بەڵێ، لەو بوو. هاوینێ کە هاتبۆوە ئاوایی، بەڵێنی دامێ گوتی دەتهێنم. بەڵام کە زانیی زگم هەستاوە، ئیتر شەوانە نەهاتە لای ماڵمان فیکە لێ بدا. پێی گوتم، چۆنی بۆم دەلوێ لەکۆڵی بکەمەوە. دەبوومە تنۆکێك ئاو کە خەڵکی دێ دەیاندیتم... بەبێ زەوی و زار و ملوانکەی زێڕ و منداڵێکیش بە باوەشەوە... بەو حاڵ و باڵەوە کێ دەهاتە خوازبێنیم؟ کێ دەیویستم؟

منداڵەکانیان لەو پەڕۆوپاڵانەی تێی وەرپێچابوو، هێنا دەرێ و هەر لەوێ لە نێوەڕاستی حەوشەکە لەسەر کۆپەنکی پەینەکەیان دانا. ئاپۆشتا مات و خەمبار وەك بەردێك تێی راما. پاشان وەك ئەوەی ویستبێیان لێی بستێنن، خۆی بەسەر کێشا و لە باوەشی کرد و دەستی کردە گریان:

ـ رۆڵەگیان، کوڕەکەم، کوڕە نازدارەکەم...

فرمێسکی وەك لووزەوی بارانی بەهار بەسەر گۆنایدا دێتە خوارێ.

ئاپۆشتایان لە زیندانێ توند کرد.

میلیۆتزا کوڕی ئیزۆپسکۆی ئاشەوانە، کە لە شاری دەخوێنێ. لە کاتی پشووی هاوینەدا دێتەوە ئاوایی و بە پاسکیلێك لە کۆڵاناندا دەخولێتەوە و بە هۆڕنەکەی مریشك و منداڵان دەترسێنێ.

## ٣

## شتەکان و خەڵکی دی

فلۆریا پانکۆ، ئیتر وەك پیرەپیاوێك سەیری دەکرێ. گای تۆکمە و عارەبانەی گەورەی هەیە، کە تۆپە[*]ی عارەبانەکەی تازە نوێ کردوونەوە. کچێکی بەمێرد داوە بەڵام هێشتا سێی ماوە. سێ کچ و کوڕێك. کوڕ وەختایەك دەچوە شار، زرت و زل و بەخۆوە بوو، ساغ و تۆکمە، کە هاتەوە، چاوی کوێر ببوون. ببووە کرێکاری بینایەك، بزمارێکی لە چاوی ڕۆچووە و کوێری کردووە. دواتر چاوەکەی دیکەشی کوێر بوو.

کوێری داماو، سەرباری ماڵەوەیانە. سێ کچ هێشتا شوویان نەکردبێ، ئەوانیش هەر باری سەربارن. بەڵام لە هەموو ئەوانە ناخۆشتر و دەردی سەرباری دەردان، ژنەکەی فلۆریایە، کە پشتی شکاندووە.

ئەمساڵ پاییزێ، یەکێ لە دراوسێکانی مرد. بێوەژنەکەی ئەوپەڕی بیست ساڵان دەبێ. لووتێکی قیت و جوان و پێستێکی وەك هوڕەی لۆکە. تەڕ و گورج و گۆڵ و ئازا و بەزاکوون. فلۆریا پانکۆ هەموو شەوێ شتی بۆ نەبا ناحەسێتەوە: جاری وایە ئارد و جار هەیە گەنمەشامی یان بەزی بەراز. جاری واشە مریشکێك... کورتی ببڕینەوە، هەرشتێکی لە ماڵ و عەمبار و هەمبانەی ماڵەکەیدا دەستی بکەوێ. بۆ ئەوەی خۆی لای بێوەژنە گەنجەکە شیرین بکات و بکەوێتە بەردڵی، نازانێ قوڕی کوێ بەسەردا بکا. ژنەتیوە سەلکەبزووتە ئاوا سووك و ئاسان شلی ناکا.

ـ حەح، ئەگەر توانیبات واز لە ژنەکەت بێنی و من بێنی، ئەوە شتێك...

لە پێشدا فلۆریا وا دەزانێ ژنە گاڵتەی پێ دەکا. دوایی وردەوردە تێ دەگا، نا، خۆ بەراستێتی. ئەوەڵێ حەپەسا و خۆی هێنا و برد و مەسەلەکەی سەنگوسووك و شەنوکەو کرد و، بیری خۆی لێ کردەوە و بڕیارەکەی دا:

ـ تەڵاقی دەدەم.

ئێستا چووە پارێزەرێکی دۆزیوەتەوە، بۆ ئەوەی کارەکانی بۆ ڕێك بخا. پارێزەر عەریزەیەکی داوتە دادگا. فلۆریاش کاغەزەکەی لە گیرفانی ناوە و تووشی هەر کەس دەبێ لەخۆباییانە پێشانی دەدا:

ـ بەڵێ، تەڵاقی دەدەم و ژنێکی مندالکارە دێنم. ئەوەندەم هەیە بتوانم بەخێوی بکەم و تێری بکەم.

خەڵکی ئاوایی گاڵتەی پێ دەکەن، بەڵام فلۆریا بیری لای کاروبارەکەی خۆیەتی.

ڕۆژی دادگا ژنەکەی سواری عارەبانە دەکا و دەچێتە شاری. دووبەدوو چەند سەعاتان لە بەر دادگا چاوەڕێ دەکەن.

---

[*] تۆپە: لە موکریان هەر شتێکی خڕ بێ بە تۆپی دەشوبهێنن و بیستوومە گوتوویانە: تۆپی زەوی. بەتایبەتی بە تایەی عارەبانە دەڵێن: تۆپ/ تۆپە

ژنە وردیلە و وشکهەڵاتووە، مەمکی چرچ و لۆچ و پشتی کۆم بووەتەوە. کاروباری تاقەتبڕی مەزرا و منداڵبوون و گەورەکردنیان، تێك و پێکی شکاندووە.

دەرکەوانی مەحکەمە بانگیان دەکا. فلۆریا دەستی ژنەکە دەگرێ و پاڵی پێوە دەنێ بۆ ژوورێ و خۆی قیت و رەپ و هەقدارانە رادەوەستێ. نە لە هەیبەتی دادوەر مێشێکی میوانە و، نە شەرمێك لە کۆتەڵەکەی مەسیح دەکا. هیچ کامەیان یەکەم جاریان نیە دێنە ئەوێ. بەڵام ژنەکەی، هەر دەڵێی لە ئەستێرەیەکی دیکەوە بەربۆتەوە.

دادوەر: کەی زەماوەندتان کردووە؟

فلۆریا: سی و پێنج ساڵە جەنابی حاکم.

دادوەر: چەند منداڵتان هەیە؟

فلۆریا: پێنج منداڵ جەنابی حاکم.

ژنە: (بەبێ ئەوەی پرسیاری لێ کرابێ، وەڵامی مێردەکەی تەواو دەکا) چواریش مردوون. سێیان بە ساوایی و یەکیشیان ئەمساڵ...

چاوی پڕ دەبن لە ئاو. وەك فرمێسکی کپ و بێدەنگی بارگینێکی راهاتبێ هەموو شتێك، بەبێ چۆن و بۆ قەبووڵ بکا.

دادوەر: بۆ دەتەوێ ئەو ژنە تەڵاق بدەی؟

فلۆریا: زۆر ناشیرینە جەنابی حاکم.

دادوەر: یانی سیوپێنج ساڵە تازەت زانیوە؟ دەبوو زووتر زانیبات.

فلۆریا: هەر یەکەم رۆژ زانیم جەنابی حاکم، بەڵام تازە زۆر لە مێژ نییە توانیومە یەکێکی دی، یەکی جوانکیلە بدۆزمەوە.

دادوەر: دیارە زۆریش لەوەیان گەنجترە.

فلۆریا: بەڵێ بەڵێ قوربان، زۆر زۆر لەوەیان منداڵترە.

تروسکاییەك لە چاوی دەگەڕێ. زەردەیەکی دێتێ و بەبێ ئەوەی ئاگای لەخۆی بێ، سمێڵی با دەدا

لە رێی گەڕانەوەی بەرەو ئاوایی، نێوچاوانی گووی لێ دەبارێ، چونکە نەیتوانیوە ژنەکەی تەڵاق بدا. کە لەگەڵی دەگاتەوە ماڵێ، بە قەستی کوشت لە ژنەکەی دەدا و، دوو حەفتە دواتر دەینێژن.

❊

❊

❊

زێڕین، جگەری مۆر، سوور و نارنجی، گەڵا لە دار هەڵدەوەرن و بە چەرخوخول بەر دەبنەوە. پاییز داهاتووە. مەزرا رووتاونەتەوە. ئیتر سوێسکە لە پەرێز و کێڵگەدا دەنگیان نایە. رێژنە هەوسارپچڕاو دەشتەکە دادەگرێ. خۆی بە خانووەکاندا دەکێشێ و دەیکاتە قریوە. ئێمەیش دەیکەینە قریوە. بۆ ئەوەی وەزعەکە بگۆڕین، بۆ ئەوەی ئیتر لە سەرمان هەڵنەلەرزین دەقریوێنین. قاچە پێخواسەکانمان هەتا ئەژنۆ لە قوڕ و لیتە رۆدەچن. ئیتر سەتاپا قوڕ و لیتەین. دڵمان بە هەموو جۆرە گەمە و یارییەك خۆش دەکەین. بەڵام دەستەکەمان جێی یەکێکی بەتاڵە: ئیلیێ برای ئیتزیکۆ. بەستەزمانە مردووە.

هێشتا بە ئاواڵێکی گیانی گیانیی خۆمی دەزانم. گیانێك لە دوو جەستەدا. بەڵام ئیلیێ مردووە. چۆن دەکرێ لەگەڵ مردووەك گیانێك بین لە دوو جەستەدا؟ لەوەتەی زیندوو نییە، ئیتر هەموو شتێ براوەتەوە. سبەینێ دەبێ بچین بینێژین. گوێتان لە دەنگی زەنگوڵەکەی کلێسایە؟ چەندە جوان زرینگەی دێ زەنگوڵە، ئەو دەمەی بۆ یەکێکی دیکە لێ دەدرێ. کە تۆ بتوانی گوێت لە دەنگی بێ و مردووەکە نەتوانێ.

لەوانەیە رۆحاناتی مردووەکەش گوێی لە دەنگی زەنگوڵەکە بێ، هەڵبەت ئەگەر رۆحاناتێك هەبێ...

هەر لەگەڵ ساردبوونەوەی لاشەکەدا، خزم و کەس مەنجەڵی بۆ وەسەر ئاگر دەنێن و ئاوی بۆ گەرم دەکەن. داڕنینی ئەو شڕوشاڵاتەی لەبەریدا بووە و گەمەی پێوە کردبوون و ئازاری تێیاندا چەشتووە، زۆریش سووك و ئاسان نییە.

جەستەی وەك قوماشێکی نەرم وایە و رووت رووتە: هەر چەند ئێسقانێکە. لەسەر دەستان هەڵی دەگرن و دەیبەن لە سەر تاتەبەردەکە درێژی دەکەن و بە سابوونی رەش و رنەکی زبر و ئەو ئاوە گەرمەی لە خۆڵەمێش پاڵاوتوویانە، دەیشۆن. ئاوێکی زۆری پێدا دەکەن بۆ ئەوەی چڵك و چەپەری لێ بێتەوە. بەستەزمانە، خۆ ئەگەر بەحاڵ گیانی لەبەردا بوایە، لینگەفرتەی دەکرد و دەینەڕاند و دەردەپەڕییە دەرێ، بەڵام ئێستا، چۆنی پێیان خۆش بێ، دەیشۆن. جا مردوو باڵغ بێ یان منداڵ، پاش ئەوەی شوشتیان، جلی تازەی لەبەر دەکەن. دەستوورەکە وایە. دیارە هەموو کەس نا، ئەوانەی جلوبەرگی زیادەیان هەیە... بەڵام ئیلیێ هەر جلوبەرگە چڵکن و شڕەکانی خۆی لەبەر دەکەنەوە.

لەو ماوەیەدا، ئاردەکە کراوەتە هەویر و هەڵاتووە و ئەنگوتکیش کراوە و بە تەندووریشەوە دراوە. ئیدی ئێستا کولێرە تەواو برژیون.

ـ ئیتزیکۆ، بانگی منداڵەکانی دیکە بکە بۆPraznik پرازنیك.

ئێمە بە ئانقەست لەو دەورەبەرە دەخولێینەوە. ئیتزیکۆ دەمانباتە ژوورێ. خۆیمان لەسەر گران دەکا، یانی ها، یەکێکمان لێ مردووە. کولێرەکان هەر بە داغی قووت دەدەین. هەر کامە و دەفرێك شەرابیشمان دەدەنێ. بەر لەوەی پارووەکە لە زارمان بئاخنین، لە شەرابە ترشەکەی هەڵدێنین و دەیخووسێنین. کە

تێر بووین، لێومان دەلێسینەوە و دەچینە حەوشە. ورگمان وەك دەهۆڵ هەستاوە و وا رەق بووە، دەكرێ بە نینۆك كێچێكی لەسەر بكوژی.

بایەكە لە سەروچاومان دەدا. ئەوەندە بە تەوژمە، كە خەریكە بەعەرزیماندا بدا. بە دیوارەكە هەڵدەپرووسكێین و، بەكەیف و شاد سەیری كۆڵانێ دەكەین. پۆلێك لەو منداڵە چڵكن و شڕانەی لە كۆڵانێ كۆ بوونەوە، گانگۆ و ئۆدۆرالێ، لە دەستەكەیان جوێ دەبنەوە و دێنە پێشێ. گانگۆ بە قەد منە و قژی كە هاتووەتە سەر چاوی، وەك قژی من پڕە لە كا و كۆت و پەین و پاڵ. دەستی تۆدوراكێی برای، كە زۆر لە خۆی منداڵترە، گرتووە. تودۆراكێ، یەكێك لە كراسە چڵكنە چل پینەكانی خوشكەكەی لەبەردایە، كە تەشك و داوێنی ئەوەندە درێژە، بە نێو قوڕەكەدا دەخشكێ. چاوی گانگۆ، ئەوەندە برسیانە دەگەڕێن، خەریكە دەرپەڕن. تودۆراكێیش لەو خراپتر. چاوی هەردووكیان دەلێی شووشەی ماتن. بۆن و بەرامەی نانی گەرم و شەراب، لیكاوی بە زاریاندا هێناوە. گانگۆ غیرەت وەبەر خۆی دەنێ و دەڵێ:

ـ ئیتزیكۆ، تۆ خوا لێمگەڕێ منیش بێمەماڵتان، جا منیش دەهێڵم بێی لە ماڵی ئێمە نانی گەرم بخۆی و شەرابی بەسەردا بكەی.

بە دەست براكەی نیشان دەدا:

ـ ئەوەتا تودۆراكێی ئێمە چیی نەماوە بمرێ.

تودۆراكێ بە نیگای برسیی و پڕ داواوە، لە تەنیشت گانگۆ راوەستاوە و چاوەڕوانە. بەڵام ئیتزیكۆ قایل نابێ. بڕوا ناكا تودۆراكێ بەو زووانە بمرێ.

❊

❊

❊

ئەو بینایەی لەو سەری کۆڵانەکەمانەوە لە نێوەندی حەوشەکەدا دروست کراوە، ماڵی ماری دانچۆیە، کە خزمەتی ئیجباری* ی لەگەڵ باوکم و لە لیوای سوارچاکاندا تەواو کردبوو. بالاسای ژنی زۆرجار دێتە سەردانی دایکم.

دوو کچیان و دوو کوڕیان هەیە: ستانکای هاوتەمەنی ئێڤانگلینی خوشکمە و لینیکایش هاوتەمەنی ریتزا. مینیکای کوڕە گەورەیشی هاوتەمەنی زڕبراکەمە، کە چووتە شاری بخوێنێ و، دینکای کوڕە چکۆڵەی ئاواڵی ئیۆنی برامە.

کچەکانی دانچۆ خرپنە و گووپن و کاڵ و سپیکەڵەن. تۆزێکی دی سپی بوایەن، لە پشتیشیانەوە شتت دەدی. وەك بلوور. بەڵام بۆ کارکردن، هەی لەبەریان مرم، وەڵاهی پووشێك ناژین*. حەوشەکەیان پڕە لە داری توو. هاوینان پەڕۆیەکی لە بن رادەخەن و بەیانی تا شەوێ لێی رادەکشێن. بێ دەردوبەڵان، بەڵام هیچ دیاریش نییە تۆکمە و بەتاقەت بن. چوارپەلیان ساغە، بەڵام بێت و بچنە مەزرا، هەر چوون و هاتنەوەکە شەکەتیان دەکا و لەپەلوپۆ دەکەون.

کوڕەکانی درشت و هەراش و تۆکمەن: دووی ناشیرینی بەشانوباهۆ، مینیکایان تا پار، سەڵت و رەبەن بوو. وەك کەڵەشێرێکی بەهێز تەنانەت لە کەڵەشێریش بەهێزتر: فەردەیەکی چل مەنیی بە دەستێك هەڵدێنێ و دەیخاتە سەر کۆڵی و نێوچاوانیشی تێك نانێ. کە بەڕێدا دەڕوا، هەر زرمەی پێیانی دێ. قسەکردنیشی هەر وایە و، سەیر ئەوەیە، کە شەوانە وەختێك بە کۆڵانی ئاواییدا رادەبرێ، یەك سەگیش پێی ناوەڕێ. دەنگێکی نەرمونیانی هەیە. جا سەیر ئەوەیە، هەموو ئەو دێیە گەڕا بۆ ئەوەی ژنێك بۆخۆی بدۆزێتەوە، بەڵام هیچ کچێکی نەکەوتە بەر دڵ، تا ئەوەی چوار ئاوەدانی ئەولاوەتر، ژنێکی لەباری دەست کەوت. بەتاقی تەنێ هەستا چووە خوازبێنی و، کە گەڕاوە ماڵێ، دەستی ژنەی لە دەستدا بوو. ناوی سیدایە و، شانوملێك لەو بەرزترە. تیشکەڵەیە، کە سەیری دەمولێوی دەکەی، دەڵێی هەزار ددانی لە زاریدایە. کە پێدەکەنێ ریزێك ددان دەبینی و تەواو. چاوی رەشن و، لە بن نێوچەوان و برۆ گەورەکانییەوە تۆزێك بەقووڵدا چوون.

---

*ئیجباری: سەربازی.

*پووشێك ناژین: پووشێك ناهێنن. پووشێك نایەنن. بایی پووشێك نین.

ساتێك چییە، ناسرەویّ، تەنانەت کە لەسەر سفرەش: دوو پاروو دەکا و هەڵدەستیّ دەچیّ بیست کاران دەکا و دێتەوە و لە جێی خۆی دادەنیشێتەوە. ژنی گەڕەك ناویان ناوە زاڤاکا، واتە پەیتووکە*.

دێتە ماڵمان و لە سەر لێواری تەختەکە، جیّ قوونی خۆی خۆش دەکا و لەگەڵ دایکم دایدەبەستنە قسەکردن.

پەنجەرەکە تارە و هەر دەڵێی بە ئاسمانەوە نووساوە.

ـ ئەریّ دەڵێی چی لەسەر ئەوەی بەسەر ماریسیکا هاتووە؟ کە مێردی کرد، بوو بە بنێشتەخۆشکەی سەر زار و زمانان، بەڵام ئێستا وا لەگەڵ مێردەکەی جووت بووە. یانی دەکریّ پیاوێك هێندە کۆیلەی پارچەزەوییەك بیّ؟ ماریسیکایش وەك هەموو کچان، کەرێتیی کرد. خۆ ئەگەر هاتبایە تەگبیرێکی بە من کردبا، فێرم دەکرد چۆن کڵاوێك بکاتە سەر مێردەکەی تا مردن نەزانیّ. شەوی زاوایەتی، کابرای زاوا خۆ هۆشی لەخۆی نییە و نازانیّ چەند پێك زیاتری بەسەردا کردووە، یان سەماکردن لە پەلوپێی خستووە، یان ئەوەندەی خواردووە و گۆرانیی گوتووە، وڕ و کاس بووە. دەبیّ ژنە چەندە گێل بیّ، کە نەتوانیّ کەری بکا... یەکێکیان خۆم: فوودانەماسییەك و چەند دڵۆپەیەك خوێنی کۆتری بەسە. جا با پێت بڵێم: کە هاتە خوازبێنیم، وەختێك دیم ئەو زرتە زەلامەیە و ناشیرینیشە، بەر دڵم نەکەوت. ئەو قسەکردنەی، ئەوەندە لەسەرخۆ دەدویّ، هەر دەڵێی قسەکان دەبنە دەمی مردوو، جا لە زاری دێنە دەریّ. گوتم جا پیاوی وا داهێزراوم بۆ چییە؟ بەتایبەتی تۆزێکیش گێلووکە دیار بوو. زۆربلّیّ نییە. خۆ بۆخۆتان دەزانن. هەر ئەوەندەی لیّ پرسیم: "سیدا مێردم پیّ دەکەی؟" گوتم: "راوەستە با بیرێکی لیّ بکەمەوە. حەفتەی دادیّ وەرەوە." بیرم دەکردەوە، یان خۆی نایەتەوە، یان خۆی لیّ دەشارمەوە. وام دانابوو ئەو رۆژەی دیّ، لە ماڵ نابم. بەڵام رێك لەوەدەمەدا کە وەدەردەکەوتم، لە لاشیپانەی دەرگادا تووشی هاتم. بە جۆرێك دەستمی گرت و بە پەنجەگەورەی نێو دەستمی ختۆکە دا، قدیلانەم بۆوە و موچڕکەم پێدا هات. گەڕاوە و رۆیشت و منیش چوومەوە ژووریّ. لەبەرخۆمەوە گوتم: "ئەی، خۆ ئەو هەتیوە زۆریش گێل نییە. شتێکی لیّ دەزانیّ." بە

---

* پەیتووکە: کلکهەڵتەکێنە.

باوکمم گوت، وەشوێنی بکەوە و بیهێنەوە. گوتم: "مێردت پێ دەکەم مینیکا، ساغ بوومەتەوە." بار و بوخچەم پێچاوە و وەشوێنی کەوتم. هیچیش لێی پەژیوان نیم.

قۆپچە زلەکەی یەخەی دەکاتەوە و سوخمەکەی هەڵدەداتەوە و، مەمکۆڵەی کە هێندەی سێوك دەبن و گۆیەکەیان رەشە، دەردێنێ و، لە زاری منداڵەکەی دەنێ.

زاڤاکا لە سێ ساڵاندا، سێ منداڵی بووە. دەیەوێ کۆشێکی دیکەش منداڵ بخاتەوە. خۆی دەڵێ: هەر نەبێ دوازدە منداڵ.

بەلەباریك و کزە، بەڵام سمت و کەفەڵی پان و پۆڕن. خوا دایناوە بۆ زاوزێ. دیارە ژنانی ئاوەدانی باوەڕیان وایە.

ـ هیچ دەزانی ستانای جوانکیلەی خوشکەمێردم چ خەیاڵێکی کەوتووەتە سەر؟ دەیەوێ مێرد بە کوڕەکەی ئۆرچێیاگ بکا.

ـ یانی بە تاسیکا؟

ـ ئەدی چۆن، کوڕەکەی دیکەی ئۆرچێیاگ دەمێکە ژنی هێناوە.

ـ لەبیرم نەبوو.

پیاوی بنەماڵەی ئۆرچێیاگ هەموو کورتەبنەن. دەکرێ بڵێی گرگنن. هەر بۆیە هەمووان حەزیان لێیە، تا بکرێ ژنێك بێنن زۆر کەڵەگەت بێ. پارێزێك، کە هیچ ئاکامێکی نییە. منداڵەکانیان هەر کورتەبنە و وردیلە لەدایك دەبنەوە.

تاسیکا، لە ناحیەکەی ئەوبەر، سکرتێری دادگایە. بنیادەمێکی تازەپێگەیشتووە. جلوبەرگی وەك خەڵکی شاری لەبەر دەکا. کەڕەی بەیانی لە ماڵێ دێتە دەرێ و بە پێیان بەرەو گارلیزگاتس، کە ناوەندی دادگای ناحیەیە، وەڕێ دەکەوێ. لە گەڕانەوەشدا، بەو پێڵاوە نووکتیژە بریقەدارانەیەوە کە تەقەی پاژنەیان دێ و پێی وایە ئەوە نیشانەی گرانوسەنگینییە، بە پێیان دێتەوە. ستانای کچی دانچۆی لەبەر ئەو پێستە سپیە و باڵا بەرزەی خۆشی دەوێ. تاسیکا ئۆرچێیاگ خۆی دەڵێی بنی مەنجەڵە رەش بووە، بەو حاڵەشەوە خەون و خەیاڵی بووەتە ئەوەی تاسیکا بیهێنێ، چونکە دەزانێ سکرتێری دادگا ئەستەمە ژنەکەی بنێرێتە مەزرایە و کاری دەشتێی پێ بکا.

بڵێنی داوەتیێ، هەموو جۆرە کڵاوێکی بۆ بکڕێ. زاڤاکا لە داخان لێوی خۆی دەکرۆژێ و خوێنی خۆی دەخواتەوە:

ـ زۆرم حەز لێیە بەچاوی خۆم ببینم: قەڵافەتی ستانا، کە وەك خانمان کڵاوی لەسەر کردووە.

ـ باشە، باشە، بۆچی لەسەر نەکا؟ بۆ پولینێ لەسەری ناکا؟

ـ راست دەکەی. جا بەینوبەینەڵا لێشی دێتەوە.

*

*

*

پولینێ پار هاتە گوندەکەی ئێمە. یەکێکە لە کچەکانی شارەدێیەکە و، ژنی نیکۆلای دیمۆزێلی کوڕە پوورمە، کە لە دایرەی پۆستە کالا وەردەگرێ.

من رەوەیەك مام و خاڵ و پوور و کوڕە پوور و کچەمام و کچە پوور و کچە خاڵم هەیە... خۆ ئەگەر بەدەم رووباری کالمات زۆئیدا بەرەو ژوور هەڵکشێم و ئەوەندەی تینم لە ئەژنۆیدا هەبن بڕۆم، هەرچی تووشی بم خزم و کەسوکارمە. خۆ خزم و کەسێك کە تۆزێك کەیفی بەمن بێ و رووم بداتێ، لە ماڵەکەی ئێمە وەك شیلەتریاك وایە و دەست ناکەوێ، ئەگەریش پەیدا بوو و، رووی دامێ، من وەك قوڕنوو پێوەی دەنووسێم و بەری نادەم. بۆیەش یەکێك لە براگەورەکانی باوکمم زۆر خۆش دەوێ. تەمەنی زۆرە و قژی وەك بەفر سپی بوون. سمێڵێکی سپیی ئەستووریشی هەیە. لە گوندەکەی ئەوبەری رووبارەکە دەژین. ناوی ئالیساندەرێ ناشتایە. ئامۆژنە جان لۆلۆتزای ژنیشیم زۆر خۆش دەوێ.

ئەو باخچەیەی دەوراندەوری ماڵەکەی گرتووە، بەشی خۆی گەورەیە، داری قەیسی و سێو و گوێزی تێدایە، لەو سەری باخەکەشەوە، ئەو شوێنەی خاکەکەی نەرم و بەپیتە، قامیشەڵانێکە، مووی لەبەرەوە ناچێ.

لە مامەکانم، هەر ئەوەیان، خوێندەوارە.

زۆر جار دەچمە ماڵیان. زستانان بۆ ئەوەی کتێبە وێنەدارەکانی هەڵبدەمەوە، هاوینانەش بۆ ئەوەی بە درەختەکان هەڵگەڕێم و تێر زگی خۆم میوەی بخۆم.

ـ مامە گیان ماندوو نەبی.

ـ ئەی بەخێر بێی داریە.

ــ خۆ شکور باشی مامە گیان؟

ـ زۆر باشم داریە، باشم، قەیسی دەخۆی؟

ـ ئەرێوەڵا دەخۆم.

ـ کەواتە بچۆ سەر دارەکە و بەدڵی خۆت بخۆ. ئەگەر هەڵووژەشت حەز لێیە، لە چڵووکی ئەو دارەیان چەند دانەیەکی گەیوە، بچۆ سەرێ لێیان بکەوە.

ئاواییەکەیان لە سەر لێواری رووبارەکە و لە لێژاییەکەوە دروست کراوە. لە هەر لایەکەوە سێ هەنگاو بڕۆی، دەگەیە ئاو. ئاوی بیرەکانی ئاوایی قوڕاو و سوێرە. گڵەسوورە دێنن و لە باریکە زەوییە پڕ پیت و بەرێژەوەکانی دەکەنن بۆ ئەوەی بەهێزتر بن. ئەو زەوییانەن نەك هەر دار بی و گەز و بووز و ئەرخەوان، بگرە داری میوەشیان لێ شین دەبێ و پێ دەگا. مامە ئەلیساندەرێیش خانووەکەی خۆی لە یەکێك لەو باریکە زەوییانەدا دروست کردووە. مامەگیانم، لە باخچەکەی خۆیدا، داری گوێز و قەیسی و هەرمێ و هەڵووژە و کۆخی چەقاندووە. داری میوە عومریان درێژ نییە و دوای چەند ساڵێك وشك دەبن. مامم بەو پیرییەی خۆیەوە، پیرە دارەکان هەڵدەکەنێ و نەمامی تازەیان لە جێی دەچەقێنێتەوەو، بەو جۆرە باخەکەی بەردەوام تازە و لاوە. هەموو ساڵێ بەهاران نوقمی گوڵ و گوڵووك دەبێ و، پاییزانیش پڕ میوە. چەند پورەیەکیشی لە باخچەکەیدا داناوە، بایی ئەوەندە دەبێ، کە لە جێژن و بۆنە ئایینیەکاندا، لە کولێرە و نانی هەڵبسوون و بیکەنە خێری مردووەکانیان.

بە دار قەیسییەکە هەڵدەگەڕێم. لکەکان نەرم نەرم لە بن پێمدا دەلەرێنەوە و، بۆن و بەرامەی شیرین و سەرخۆشکەری میوە گەیوەکان، مەستم دەکات.

مامە گیانم داخی کوڕەکانی خۆی زۆر لە دڵە. ئامۆژنم هەر دوو کوڕی خستووەتەوە. بەڵام هەر دووکیانن زۆڵ و حەرامزادەی رۆژگار دەرچوون. ئەو پیرەمێردە، زەوییەکەی خۆی بەسەردا بەش کردوون و، لە دەم روبارەکە هەر ئەو باریکانەی بۆ خۆی هێشتووەتەوە، بۆ ئەوەی سەوزە و کەوەری شلە و ئاشەکەی لێ دابین بکا. بەڵام کوڕەکان، هەر دوو پێیان کردووەتە کەوشێکەوە و، دەیانەوێ

ئەوەندکۆکەش لە چنگی بابیان دەربێنن. چاوەی فیتنە و مشتومڕەکان لێرەوەیە. خۆیان لەو پیرەپیاوە داماوە خۆش کردووە بیکوژن. نیاگۆ، کوڕە گەورەی رۆژێکیان بانگی دەکا بۆ نانخواردن بچێتەوە ماڵی ئەو. خۆ ئەو خانووەش هەر مامە ئەلیساندەرێم لە دەم جادەکە بۆی دروست کردووە و ماڵێکی زۆریش خۆشە. نیاگۆی ئامۆزام لەوێ دووکانێکی کردووەتەوە و، لە پشتەوەی کارگەیەکی بەرگدوورینی داناوە. جلوبەرگ دەدووریێ لە خەیاتی شارییش جوانتر. مەکینەیەکی بەرگدوورینیشی هێناوە، کە بەروانکە و قۆڵچاخ و بەرهەڵبێنەی ژنانی پێ گوڵدۆزی دەکا. کە مامە گیانم دەچێتە ماڵەکەی، ئامۆزاکەم پەرداخێکی ئارەق بۆ تێ دەکا. ئەوەندەی ژەهر لەو پەرداخە کردبوو، فیلێکیش خواردبای دەسبەجێ دەمرد. بەڵام منداڵەکانی نیاگۆ کە سۆسەی ئەو بەزمەیان کردبوو، رێك لەو دەمەدا وا پیرە دەیەوێ پەرداخەکە هەڵ بدا، یەکێکیان ئامبازی دەبێ و، هاوار دەکا:

ـ باپیرە، نەیخۆیەوە، ژەهری تێدایە.

ئەو مەسەلەیە لە ئاواییدا هەرای نایەوە.

لەوەدەمەوە، مامە ئەلیساندەرێم ئیتر پێی نەناوەتەوە ماڵی کوڕەکانی، بەڵام بەردەوام خەفەتبار و خەمینە و، سەری لە قەپێلکی خۆیدایە. دایکم پێی وایە مامە ئەلیساندەرێم بێ و نەبێ بە گەنجێتی کەتن و گوناحێکی گەورەی کردووە. بۆی ناچێتەوە سەر یەك، کە باشە ئەگەر وا نییە، بۆچی مامە گیانم وەك قەشەکەی ئاوەدانی ردێنی هێشتوەتەوە و، بەتایبەتیش بەردەوام خەریکی خوێندنەوە و سەرلەبەرخوێندنەوەی سەربردەی پیروپیاوچاکانە؟

هەر بەراستی مامە ئەلیساندەرێ هەر لە سەرەتای زستانێوە تا بەهارێ سەر لە سەر ئەو کتێبە هەڵناگرێ.

هەر سێ کتێبیشی هەیە، کە بەردەوام دەوریان دەکاتەوە و، قەتیش ماندوو نابێ. بۆ خوێندنەوەیان چاویلکەیەك لە چاوی دەکا. کە هەست دەکا ئیتر چاوی ماندوو بوون، کتێبەکە بەلاوە دەنێ و دەست دەداتە یەکێکی دی.

پاتاڵی زۆر نییە، دوو سەر بزنی هەیە، کە لەگەڵ ئامۆژنم ئەو دوو بزنە و مریشك و کەڵەبابەکانیش بەخێو دەکەن.

مامە ئەلیساندەرێ لە تەنیشت کتێبەکانیەوە، کە زۆر رێك و جوان لەسەر رەفەکە ریزی کردوون، شەش قەڵەمتاش(دادەر)ی هەیە، لە مووسی دەلاکیش تیژترن. زستانان کە دەچمە سەردانی مامە گیانم، رێگەم دەدا دەست لە قەڵەمتاشەکانی بدەم:

ـ داریە گیان، هەر مەیانکەوە، چونکە قامکت دەبڕی.

قامکی من، بەبێ ئەوەش، هەموو زامدارن، چونکە منیش وەك باپیرەم قەڵەمتاشێکم هەیە. راستە هێشتا نازانم هیچ بخوێنمەوە. رۆژێك هەر فێر دەبم. با تۆزێك گەورەتر بم.

قەڵەمتاشەکەی من تووریکی تەڕ ناهێنێ، یەکی خراپۆکەی بێ کەلکە.

مامەم بە دار شت دروست دەکا. خاچی بچووك بچووکی وا دروست دەکا، کە وردە پیتیان لەسەر نووسراوە و من لێیان تێناگەم. مامە ئەلیساندەرێ لە حەفتەی پارێزدا، زەمبیلێك پڕ دەکا لەو خاچانە و دەیباتە کلێسە و لە دەم میحرابەکە دایدەنێ. لێدەگەڕێ زەمبیلەکە شەش حەفتە لەوێ بە هەڵواسراوی بمێنێتەوە. قەشە نزا دەکا و فوو بەسەر زەمبیلەکەدا دەکا. مامە گیانم رۆژی جەژنی پاك لە بەر دەرگای کلێسا رادەوەستێ و بەسەر خەڵکیاندا دابەش دەکا. چەندی چەند ساڵان ئەوە پیشەی بووە. ماڵی ئەو ئاواییە نییە لەو خاچانە، یەکێکی لە بن کۆتەڵی پیرۆز هەڵنەواسیبێ. ژنان رۆژانی خێر و خێراتێ، کە بۆ خێری مردووەکانیان ئەنگوت دەگرنەوە، خاچەکە لە ئاوی متفەرك هەڵدەکێشن و، لەسەر هەویرەکە دایدەگرن، بۆ ئەوەی نەخش و نیگارەکەی بکەوێتە سەری. مامە ئەلیساندەرێ بەر لەوەی خاچەکان بەرێتە کلێسا، بە دڵی خۆی رەنگی شین و جگەری و سووریان لێ دەدا.

زۆر زۆر پێش ئەوەی من لەدایك ببم، ئەودەمەی مامە ئەلیساندەرێ عارەبانە و چەند گای جووتی هەبووە، رۆژێکیان چووەتە گوندەکەی ئەولا و، دوو خاچی گەورەی کڕیوە، کە نەخشونیگاریان لەسەر هەڵکۆڵراوە. لەوسەری گۆڕستانەکە و لە پەنا دیوارەکەوە شوێنێك دەسنیشان دەکا و خاچەکان لەوێ دەچەقێنێ و، قەشە بۆلبۆك تێدەگەیەنێ، کە حەز دەکا خۆی و ژنەکەی پاش مردن لەوێ بنێژن.

قەشە سەری سووڕ دەمێنێ و لێی دەپرسێ: باشە بۆ چی وا بەپەلەی؟

ـ ئاخۆ من لێم سوورە کوڕەکانم هەر بەلاشمدا نایەن، کەواتە با خۆم مشوورێکی خۆم بخۆم.

خاچەکان لە دوورەوە دیار بوون. جوانترین خاچی گۆڕستانەکە بوون، بەڵام ساڵەو ساڵ با و باران کاڵی کردبوونەوە و رزاندنی. لە پێشدا ئەو خاچەیان کەوت، کە لەسەری نووسرابوو "گۆڕی خوالێخۆشبوو ئەلیساندەریێ ناشتا" و دواییش ئەوەی لەسەری نووسرابوو: "گۆڕی خوالێخۆشبوو خاتوو لۆلۆتزا ناشتا."

مامە ئەلیساندەریێ کە برای هەرە گەورەی بابمە، هێشتا چوارپەلی تۆکمە و پتەون. ژنەکەش وەك خۆی. ئەو رۆژەی دەمرن، ئەگەر بیانەوێ بیاننێژن، دەبێ لە پێشدا کۆنە خاچەکان لابەرن، بۆ ئەوەی بتوانن جێیەکەیان هەڵکەنن و بیکەنە گۆڕ. پاش ناشتنیان دەبێ دیسان خاچەکان وەك ئەوەڵێ، لە سەر گۆڕەکانیان درێژ بکەنەوە.

ـ باشە دایکە بۆ وا دەکەن؟ بۆچی لەسەر گۆڕەکانیان نایانچەقێنن؟

ـ زۆر شت هەیە داریە تۆ نایزانی کورِم. وەختایەك خاچێك دەکەوێ، ئیدی نابێ هەڵیستێنیەوە. دەبێ ئاوا بمێنێتەوە تا دەرزێ.

*

*

*

زاڤاکا بیری هەر لای مادام پۆلینێی ژنی نیکۆلای دیمۆزێلی پوورزامە. بە دایکم دەڵێ:

ـ باشە گوێ بگرە خوشکە ماری: نیکۆلای کە مامزە سپییەکەی لە بن هەنگڵی نابوو و دەچۆوە ماڵێ، دەبینێ ئەوە دایکی لەبەر دەرگا دانیشتووە و هەر لەوێوە لەگەڵ خاتوو پۆلینێ دایدەبەستێتە قسەکردن. خاتوو پۆلینێ لە پشت مێزەکەوە لە سەر جێیەکی گەرم و نەرم دانیشتبوو، بەڵام پیرەژنە قوونی دابووە سەر چرپایەکی وشك و رەق.

ـ دەی دایکە، هاتوویە سەردانی ئێمە.

ـ ئەدی کچم، ئەوە هاتووم.

ـ بۆ؟

ـ دەڵێی چی کچم؟

ـ پرسیم بۆ؟

ـ تێناگەم، نازانم دەڵێی چی.

ـ جا تۆ ئاوا ساویلکە بی، چۆن تێدەگەی؟

ـ هاتووم سەر لە تۆ بدەم کچم.

ـ لەوانەیە لای من بێتاقەت بی.

ـ وایە، کچم، وایە.

ـ باشە، خۆ دەکرا وازی لێ بێنی.

کوڕە پوورەکەم، لەو دەمەوە بووەتە وەرگری پۆستە، وەك خەڵکی شار جلوبەرگ لەبەر دەکا. کڵاوی لبادیی زەیتوونی دەکاتە سەری و پاپیۆن لە یەخەی دەدا. کچێکی شاریی هێناوە، کە وەك ئەسپەدارینەی منداڵان بە ئاستەم سەری پەنجەی لە عەرزی دادەنێ و، لە نێو سوخمە و ستیانەکەیدا، لەشی وەك مێشەنگوین بازنەبازنەیە.

کەس کەیفی بە پۆلینێ نایە. پێڵی سوور و هەڵمساون. دەموچاوە پۆدرەلێدراوەکەی دەڵێی لە کاغەز دروست کراوە. بە سەری زمان قسە لەگەڵ پیاوی دەکا. رۆژە پیرۆزەکان نینۆکی تیفتیفە دەدا و رەنگیان دەکا. دەست لە رەش و سپی نادا. مێردەکەی ناچار بووە، لە کوێستانێ کچێك بێنێ کاروبارەکانی ماڵێیان بۆ بکا. خزمەتکارێك.

ئەدی. نەنە دینای دایکی نیکۆلای، هەر لەوێ لە بەردەرگاکە دادەنیشێ. کارەکەر مێزەکە دەڕازێنێتەوە. فڕووجاو بۆنێکی خۆشی لێ هەڵدەستێ. بۆنی نانی سپی، کە لە شارییەوە بە شەمەندەفەر هاتووە، لە لە بۆنی فڕووجاوەکەش خۆشتر و ئیشتیابزوێنترە.

پوورزام لەگەڵ ژنەکەی لەسەر سفرە دادەنیشێ و دەست دەکا بە خواردن. ئەو هاڵاوەی لە قاپەکان هەڵدەستێ، لیکاو لە دەمی مردووش دێنێ. پەڕەی لووت دێنێتە لەرزین. بۆنی خواردنەکە ئیشتیای دەکاتەوە. بۆنی خۆشی فڕووجاو و بۆنی خۆشی نانی سپی.

نیکۆلای لەم بەرەی مێزەکەوە و ژنەکەشی لەوبەرەوە، پیرەژنەش لە بەردەرگا لەسەر کورسیە دارینەکە تێکشکاو و لاواز و چرچولۆچ، قاچوقولی رووت و رەشهەڵگەڕاو و کەمرەبەستوو.

فرووجاوەکەیان کە خوارد، کەبابەکە لە فێڕ دەردێنن. وەك دەرەبەگان سفرەیان دەڕازێننەوە. بەخۆیان رادەگەن و، پیاڵەیان پڕ دەکەن لە شەرابی سوور و لێکی دەدەن.

ئەوجار نۆرە دەگاتە نانی مرەبایی، پاش نانی مرەباییش، نۆرەی قاوە دێ.

پوورزام جگەرە دادەگیرسێنێ. ژنەکەشی. دووکەڵی جگەرە بە کونە تفنیاندا دەردەدەنەوە. شەپۆلێکی شین و سەماکەری دووکەڵ بەرەو میچەکە دەڕوا و، کارەکەر سفرە کۆ دەکاتەوە.

ـ ئای دایکە، لە بیرم نەبوو لێت بپرسم نانت خواردووە یان نا.

ـ خواردوومە رۆڵەگیان. بەر لەوەی لە ماڵەوە بکەومە رێ قاپێکم شلەی برنج خواردووە.

خاتوو پۆلینێ بەدەنگێکی بەرز دەڵێ: تەح لەو خواردنە ناخۆشە...

نیکۆلای بە فیزێکەوە دەڵێ: دەی باشە، دێهاتین ئیتر.

پیرەژنە وەك بلێی بە نیگا کوڕەکەی بلاوێنێتەوە. کوڕەکەی، گەوهەرەکەی، پێڵاوی بریقەدار و پانتۆڵی رەشی خەت خەت سپیی لە پێ کردووە. چاکەتەکەی هەتا سەر ئەژنۆی هاتووە. یەخە شەق و رەقە سپییەکەی و دەستی خاوێن و جوانن...

پیرەژنە بە دتنی ئەو شتانە شاگەشکە و خەنی دەبێ. جگەرگۆشە ئازیزەکەی بۆخۆی بووەتە پیاوێك. ئاغایەکی تەواوە و، کچی شاریی هێناوە بۆ ئەوەی دایکی سەربەرز بێ.

ـ چاکەچاکە، کەواتە زۆر باشن. ئیدی من دەڕۆمەوە.

ـ خوات لەگەڵ بێ.

زاڤاکا خۆی با دەدا و دەمێك گاڵتە بە نیکۆلای دیمۆزل و ژنەکەی دەکا و، ئاخری دەڵێ: ژنەتیوە ئەدادارە حەیابەرەیە.

بەلاَم نەنە دینا خەنی بووە. بەپەلەیە زوو بگاتەوە ماڵێ و بۆ مێردەکەی بگێڕێتەوە، کە کوڕەکەی لەگەڵ ژنە شارستانییەکەی ژیانێکی چەندە خۆش و تەبایان هەیە.

دایکم نێوچاوانی تێك دەنێ و دەڵێ:

ـ چاکە، تۆ پێت وایە گیۆرکیێ ـ کوڕە مێردەکەم ـــ کە بوو بە قەشە، دیسانیش هەر سەیرمان ناکا؟ ئەویش کە پێی لە جێیەك گیر بوو، دەبێتە یەکێکی وەك نیکۆلای.

ئاوڕێك لە من دەداتەوە و دەڵێ:

ـ ئەتۆش یەکێك دەبی لەوان خراپتر.

زاڤاکا ماڵاوایی دەکا و، من دایکم دەدەمە بەر پرسیاران:

ـ دایکە، باشە ئەوە بۆ برایەتیی باوکم و مامە ئەلیساندەرێم هیچ لە برایەتی ناچێ؟ باشە بۆچی خزم و کەسەکانمان هەندێکیان خزمی بەرە دایك و هەندێك خزمی بەرەبا و هەندێك لە باپیرەوە و هەندێکشیان هەر لە داپیرەوە خزممانن؟

ـ خوا دەزانێ. وا دیارە ئەو ئاگرە هەمووی لە گۆڕی باپیرەوە هەڵایساوە. مەبەستم بابی بابتە.

ـ تۆ دیتبووت؟

ـ هەر جارێك. ئەودەم هێشتا کچۆڵەیەك بووم. تۆ زۆر چوویەتەوە سەر ئەو داریە. بەتایبەتی چاوت. بەڵام خوا بکا چارەنووست بە چارەنووسی وی نەبێ. خوا ژیانی ئەو نەسیبی کەس نەکا. حەوت ژنی هێنا و سەری هەر حەوتیشیانی خوارد.

ـ بۆ؟

ـ وای لە نێوچاوانی نووسرابوو. لە گۆڕستانێ، گۆشەکەی ئەوبەری فلۆریا، هەر هەمووی گۆڕی ژنەکانی باپیرتە. هەمووان لە تەنیشت یەکتر نێژراون. هەشتەمین گۆڕیش گۆڕی خۆیەتی. پاش هەر نوێژێك، بۆ هەموو مردووەکان دەپاڕێمەوە.

ـ لە گۆڕستان مردوومان زۆرە، دایە؟

ـ دەکرێ بڵێم هەموو ئەو گۆڕستانە مردووی ئێمەن... کێشەیەکی دیکەی ئێمەش ئەوەیە، کە ژنەکانی باپیرەت، هەر هەمووان لە یەکەم شەودا زگیان پڕ دەبوو و، منداڵیان دەخستەوە. هیچ نەبێ بیست منداڵیان دەخستەوە، کە هەمووان زڕبرا و زڕخوشکی بابتن. ئەوانەش هەر کامە و لە دایکەوە دەبنە زڕبرا یان زڕخوشکی بابت. ئەوە ئاوا بووە کە ئێستا ئێمە سەدان خزم و کەسوکاری ناسراو و

نەناسراومان هەیە، کە هەندێکیان زیندوون و زۆریشیان مردوون. خوا لە هەموو مردووەکان خۆش بێ. ئێمەش رۆژێك سەر دەنێینەوە و دەمرین.

ـ بۆ دەمرین دایە؟

ـ رۆڵە ئەوی لە دایك بێ، رۆژێك هەر دەبێ بمرێ داریە. گیا، هاوینێك دەژی. بەهارێ شین دەبێتەوە و پاییزێ وشك دەبێ و زستانێ لە بن بارستای بەفردا دەڕزێ... درەختەکان هێندەی ئادەمیزاد دەژین، جاری واشە هەندێ زیاتر. بەڵام پەپوولەکان هەر چەند سەعاتێك دەژین... چەند سەعاتێك و هیچی دی...

## ٤

## لۆتکەی* رزگاربوون

بەفر... بەرز هەتا گوێسوانان.

باو بۆرانەکە کەوتووە، بەڵام هێشتا تاو هەڵنەهاتووە.

لە دەوری ئاگردانەکە هەڵتووتەکاوین و، لە ماڵەوەدا قەتیس بووین. ئیتر کە تەواو وەڕەز دەبین، کەوڵێك بەسەر شانمان دادەدەین و دەچینە کۆڵان. لە هەر لایەکەوە رێچکەیەکمان بە نێو بەفرەکەدا کردووەتەوە.

جاری وایە لە چەقی شەوە ئەنگوستەچاوەکەدا، شەوگەڕەکەی گەڕەك، بە گۆچانەکەی لە دەرگا دەدا، سەگەل خۆ هەڵدداوێن و دەوەڕن، بێت و بیگەنێ زگی دەدڕن.

ـ کێیە لە دەرگا دەدا.

ـ منم کاك تودۆر... ژانتای زێرەڤانم.

ـ دەی، دەنگ و باس چیە؟

ـ خێراکە ئەسپەکان لە عارەبانەکە بکە. دەبێ یەکێك لە بازرگانە یۆنانییەکان بگەیەنیە بالتاساراتا.

ـ ئێستا؟ بەو نیوەشەوە؟

ـ ئەدی، هەر ئێستا. زۆر بەپەلەیە.

ـ پێی بڵێ ئەوە هاتم.

ـ باوکم خەنی دەبێ. چاکە چاکە، خراپ نییە: لییەکی وەگیر دەکەوێ. دراوێکی زیو.

بە دەستەکوتە ئەسپەکان لە عارەبانە دەکا. هەر شتێکی گەرمی دەست بکەوێ، لە خۆی وەردەپێچێ. شەوێکی ئەنگوستەچاوە. گوێمان لە دەنگی وەڕێکەوتنی عارەبانەکە دەبێ. دەنگی زەنگوڵەی ئەسپەکان...

---

*لۆتکە/ گەمی: قایق.

بالتاساراتا دووره. کابرای یۆنانی بێ ئەملاوئەولا دەبێ خۆی بگەیەنێتە ئەوێ. شارێکە لە دەم دانوب و پڕە لە یۆنانی، کە هاوین و زستان هاموشۆی گوند و شار دەکەن و، دانەوێڵە لە جووتیاران دەکڕن. باوکم هەمووان دەناسێ. بە عارەبانەکەی خۆی هاتوچۆیان پێ دەکا و دراوی خۆی وەردەگرێ.

کە دێتەوە ماڵێ، تاو هەڵاتووە. لە سەرمان کەسیرە بووە. بە کا و کلۆش کوانووەکە نێڵ دەدا و خۆی گەرم دەکاتەوە. تاوێك هەر جنێو بە زەمین و زەمان دەدا. جنێو، یەك لەویتر خراپتر. جا بێدەنگ دەبێ. ئەوەندەی هەیە تووتنەکەی خۆی پێ بکڕێ. ئەوەندەی هەیە چەند ربەیەك ئاردی پێ بکڕێ. زستانان ئارد زۆر گران دەبێ و بنیادەم فلسێکیشی نەبێ، هەر ناچارە بڕە ئاردێك بۆ ماڵەوە دابین بکا. جێژنی پاك نزیکە و، بێ ئەملاوئەولا دەبێ چەند نانێك بەریە کلێسا و بیکەیە نەزری مردووەکان.

تۆزێکمان ئارد هەیە. دایکم دەیکاتە نان و دەیباتە کلێسا. قەشە نیوەی بۆخۆی گل دەداتەوە و، ئەوی دیکەشی دایکم دەیهێنێتەوە بۆ ماڵێ. هەر نانەی لەتێك مۆمی لەسەر دادەنێ و تۆزێکیش بخوور لە پیاڵەیەك دەکا و لەسەریان رایدەگرێ. بۆنی بخوور ژوورەکە دادەگرێ. ئەو بۆنە مردوو دەخاتەوە بیر بنیادەم. حەز ناکەم کەسمان بمرێ.

دووکەڵی بخوورەکە گەرمە. نانەکان سارد و سڕن. دەیانخۆین، بەڵام هەر دەڵێی لەودیوی کراسەکەمانمان کردوون.

قەشە لە کلێساوە، عارەبانەیەکی پڕ لە نان دەباتەوە ماڵی خۆی. ژنێك لە دەرگای ماڵەکەی دەدا. تیتینا، ژنەکەی ئیڤان تزانتزۆیە. دەڵێ:

باوکە، نانێکم دەدەیەی؟ لە هاوینێوە منداڵەکانم زەوادی نانی گەنمیان نەشکاندووە.

قەشە دێتە بەر دەرگا و بەنێوچاوانێکی گرژەوە دەڵێ:

ـ نانم لە کوێ بوو ژنەتیوە! نانم لە کوێ بوو.

ـ هەر ئێستا بە عارەبانەیەکی پڕ لە نانەوە لە کلێساوە هاتییەوە... تۆ خودا، بەزەییت هەبێ.

ـ نازانی نیمە یانی چی؟ بۆ خۆم زیاتر پێویستمە.

دیارە. دیارە نان زیاتر بەکاری قەشە دێ... نۆکەرەکەی، دەستەوانەی نانەکان لە عارەبانە دادەبەزێنێ و دەیانباتە ژێرزەمینەکە. کلیلەکەی لێ وەردەگرێ و، لە گیرفانی دەنێ. هەموو بەیانیان خۆی دەچێتە عەمبار و، زەمبیلێك پڕ دەکا لە نان و دەیباتە گەوڕ دەیدا بە مانگاکانی...
قەشەش سێ ئەسپی هەیە، کە بە نانی نەزر و خێرات بەخێویان دەکا. ئەسپەکانی قەشە ئاشقی نانن.

*

*

*

بەفر... بەفر...
بلێی و نەلێی هەتا گوێسوانەی سەربانان.
ئەرخەوان قرچەقرچیانە. بەستەڵەك توێکڵیان شەقارشەقار دەکا. قەدیان وا شەقار دەبێ، دەڵێی بە تەورت ئەنجنیوتن. داربەستی ئاوهەڵێنجانەکەی بیرەکەش لە سەرمان قەڵشیوە. سنۆبەرەکەی ئەسەری حەوشەش هەتا سەری چڵووکی بەستوویەتی. وا قیت و راست و بێجووڵە راوەستاوە، دەڵێی یەکپارچە لە بلوور داتاشراوە. سەری چڵووکەکانی بە پشووەبایەك دەپەڕن و بەر دەبنەوە. قەلەڕەشە لەسەر لکی زەنگوڵەئاسای سنۆبەرەکە هەڵدەنیشن. چڵووکە تورتە بەستووەکەی سنۆبەر لە بن بارستایی قالاوەکاندا دەشکێ و، بە قرچەقرچ بەر دەبێتەوە و، قالاو بە قیڕەقیڕ هەڵدەفڕن.
بیرەکە زۆر قووڵە، بەڵام چەندی قووڵیش بێ، توێی سەرەوەی جەڵغەیەك دەبەستێ و وەك ئاوێنە دەدرەوشێتەوە. بەیانیان بەر لە هەڵێنجانی ئاوەکە، دەبێ بە قوونی سەتڵەکە سەهۆڵەکەی سەرەوەی بشکێنین. باوکم ناچارە لە هەر جێیەك بێ، هەندێ جل و گۆنی و پەڕۆوپاڵ بدۆزێتەوە، بۆ ئەوەی مانگا و ئەسپەکانیان کە لە تەویلەدا ماونەتەوە، پێ داپۆشێ. سەگەکانیش لەسەرمان چاویان ئاوی لێ دێ. لە ڕاڕەوەکەدا بە کا و کڵۆش جێیەکمان بۆ چێ کردوون. مریشکەکانیشمان بەناچاری هێناوەتە ژوورێ. بزنەریشنەکەش، کە هاوینانان پاش ئەوەی کاریلەکەی لێ سەردەبڕین و دەیخۆین، هەر کامە و پیاڵەیەك شیرمان دەداتێ.

دایکم چەند پیاڵەیەکیش ئاو لەو شیرە دەکا، کە لە بزنەکەی دەدۆشێ و لەسەر ئاگرەکەی دادەنێ بۆ ئەوەی جوان بکوڵێ، جا مامالیگاکەی تێ دەکوشێ. بەیانیانی هاوین هەر ئەوە دەخۆین. ئەوەندەی چاوترووکاندنێك، وەك نەدی و بدی هەڵیدەقوڕێنین و، ئاوا برسێتییەکەمان دەخەڵەتێنین. بەڵام وەرزی پاییز گوانی بزنەکە وشك دەکا و، تەڕایی لەو بەستەزمانە دەبڕێ. دەبێ نێرییەکی بۆ پەیدا بکەین و لێی چاکەین.

نێرییەکە، هیی بابا بیکۆیە. تەگەیەکی رەشە، مووی هەر بریقەیان دێ، بەری ناوەوەی قاچی سپین و خاڵ خاڵی قاوەییان پێوەیە و شاخی درێژ و تیژ و پێچەوپێچن.

ـ کوڕە ئاگات لێ بێ، شاخێکت لێ بدا، زگت دەدڕێ.

ـ بزنەکەی بابا بیکۆی بۆم هات. چیی نەمابوو بە نووکەشاخێك بۆ بابم ئاقڵ بکا.

ـ تۆ هەر بەڵایەکت بەسەر بێ، خەتای خۆتە.

ـ خەتای خۆم نەبوو. خۆ بە ئانقەست وام نەکرد.

ـ لەوانەیە وابێ، بەڵام هەر وەك یەکە... ئەوە دیسان دەستت چیی لێ هاتووە؟

ـ بە چەقۆکەم بڕیومە.

کە پاییز دادێ، بابا بیکۆی لە پڕ سەیر دەکا، هەرچی بزنی ئاواییە، لە ماڵەکەیدا کۆ بوونەتەوە. بەیانیان ئەوەندەیان دەدۆشێ، بەشی خۆیان شیر لێ دەستێنێ. شیرەکە هەوێن دەکا و دەیکاتە پەنیر و جار هەیە هیزیەك پەنیری دەست دەکەوێ. زستانەکەی خۆی پێ دەباتە سەر و تەنانەت بڕێکیشی دەفرۆشێ.

بەفر دایدەداتەوە.

گوندی بەشوێن بزنەکانیاندا دێن و، هەر کامە چەند فلسێك، وەك هەقی ماندووێتی دەدەن بە بابا بیکۆی.

*

*

*

باوکم دەڵێ:

ـ لە ١٨٩٦ـەوە هیچ زستانێك هێندە سارد و سەخڵەت نەبووە. ئەوێ ساڵێ منیش ناچار بووم لەگەڵ ئەوانی دیکە بچمە بەفر ماڵین. تازەیان ئاسنەڕێییەکە دروست کردبوو. بەفرەکە وای داپۆشیبوو، کە ئیتر شەمەندەفەر نەیاندەتوانی بجووڵێن و دانەوێڵە و باراشی ئاغاکان بەرنە بازاڕ. پۆلیس، چۆنی دەستیان پێمان گەیبایە، جا زۆربەی جارانیش بە رووت و قووتی، لە ماڵەوە دەیانهێنایینە دەرێ و دەیانبردین ئاسنەڕێییەکە خاوێن بکەینەوە. بەفر ماڵدرا و شەمەندەفەر کەوتە رێ، بەڵام زۆربەی گوندییەکان قاچوقولیان سەرما بردی و تا هەتا ئیفلیج بوون. ئەوانەی شانس و بەختیان هەبوو، هەر دەستیان لەگۆ چوو. من خۆم چیی وای نەمابوو کوێر بم.

بەساڵاچووەکان باوەڕیان وایە، هەمیشە پاش زستانێکی سەخت و وەیشوومە، کە سەرما و بەستەڵەك و بەفرێکی زۆری بەدواوە بێ، هاوینەکەی وشك و گەرم دەبێ.

باوکم پەیتاپەیتا کا و کلۆش لە ئاگردانەکە دەکا و، ئاگرەکە خۆش دەکا. ئێمەش بەردەوام پشتمان بە دیواری کوانووەکەوە دەنێین، بۆ ئەوەی گەرم بینەوە. کزەی سەرما لە بن دەرگاکەوە، کە جوان کیپ نابێ، دێتە ژوورەوە و تەزوومان پێدا دێنێ. وەك سەگ هەڵدەلەرزین.

هاوینەکەی ئەمساڵ سەیر گەرم بوو. خۆر، زەوییەکەی هەڵدەبرینگاند. دڵۆپێکیش چییە، باران نەباری. ئاسمان لاساریی کرد و وشك داگەڕا. ساو و روون و بێ پەڵە وەك شووشە و، وەك کێڵگەیەکی کاسنییش پڕ لە گوڵ.

کاتێ کاسنی گوڵ دەکا، با بۆنێکی تاڵ لەگەڵ خۆی دێنێ.

بۆن و بەرامەی مەزرا، ئەوددەمەی ترشەجۆ دەگا، ترشە و، ئەوددەمەی گەنم پێ دەگا و گەنمەشامی وردە وردە دان دەکا، شیرینە.

دێیەکەمان هەمیشە پڕە لەو بۆنانەی لە کێڵگەکانەوە دێن. بەڵام کە ئەرخەوان ــ وەك بڵێی هەمووان وێکڕا ملکەچی فەرمانێك بووبێن ــ گوڵ دەکەن، با، عەترێکی شیرینی گێژکەر، کە لە بۆنی پەلکەگەلای ژاکاوی لێ دێ، هەتا دوور دوور دەبا.

ئەو دەمانە، من لە هەموو کاتێکی دی پتر لەسەر گردەکان دەمێنمەوە. لەو سەرەوە کە دەڕوانی، گوندەکە لە دەریاچەیەك دەچێ، هێندەی کەف کردبێ، ئاوەکەی سپی هەڵگەڕابێ. هەوڵ دەدەم چەندی پێم دەکرێ کۆلارەکەم پتر هەڵبدەم. من و مارین ئیەپۆرێی ئاواڵم، کە بەو جەستە وردیلە و گورج و گۆڵەیەوە لە من لەسەرپێتر و زیرەکترە، یارمەتیی یەکتر دەدەین بۆ هەڵفڕاندنی کۆلارەکانمان. ئەو فێری کردووم چۆن کۆلارەیەکی وا دروست بکەم، هەم زوو هەستێ و هەمیش گڤەگڤ دەنگی بێ. کلکی کۆلارەکە زۆر درێژە و بەدەم باوە دەشەکێتەوە. داوەکەی لەدوو دەدەین و، کۆلارە بەرز دەفڕێ. ئێستا رێك گەیوەتە سەر کلێسا، ئەوە بەسەر ئاواییدا دەڕوا، ئێستا لەسەر ئەو زۆنگاوانەیە، کە وشکەساڵی وای هەڵچۆڕاندوون، دەکرێ بە پێیان، پێیاندا بڕۆی.

کۆلارەکە داوەکەی توند رادەکێشێ. بە زەحمەت رایدەگرین.

برسیمانە. کۆلارەکە دێنینەوە خوار. لەسەرخۆ، زۆر هێدی داوەکەی لە دەوری دارێك دەئاڵێنین.

ـ داریە، با بچینە سەر دار ئەرخەوانەکان.

بە پارێزەوە کۆلارەکان لە پەنایەك دەشارینەوە. لەسەر هەستین نەکا کاغەزەکەی بدڕێ و باڵەکەی بشکێ.

من بە دارێکدا هەڵدەچم، کوڕەکەی ئیەپۆرێیش بە یەکی دی گوڵی ئەرخەوان لێ دەکەینەوە و دەیخۆین. شیرینە و تۆزە تاڵییەکی تێدایە. خۆمانی لێ تێر دەکەین و چەند ساتێك لە بیرمان دەچێتەوە کە برسیمانە.

ئەوە هیی ئەودەمانە بوو، کە ئەرخەوان گوڵی دابوو... هەتاو کە گەرمتر بوو و، سروشت تۆزێك شڵەژا، ئەرخەوانش خێر و بەرەکەتی نەما. گژ و گیاش ژاکان. تەنیا هەندێك سەوزایی لکوپۆی دار بییەکانی دەم رووبارەکە مابوو. گەنم بستێك پتر باڵای نەکرد، هەڵپرووزا و کوێرووی کرد. لاسکەکەی ئەوەندە کورتە، بۆ دروێنە نابێ و داس نایگرێ. ناچارین دەسکەنەی بکەین. چار نییە... بەروبووی گەنمەکە هەر هەمووی فەردەیەکە. ئەوەش نیوەی زیاتری زیوان و زیزانەیە. دایکم چەند جاران شەن و کەوی دەکا و دایدەبێژێتەوە، چەند جاران دەیشواتەوە و لە حەوشە لەسەر قوماشێك هەڵیدەخا بۆ

ئەوەی تاو وشکی بکاتەوە و، کێشکی دەکێشێ بۆ ئەوەی مریشك نەیخۆن. هەر ئەوەندە دەبێ، کە بکرێ کۆلیڤا[*] یەك و نانێکی گەورەی لێ دروست بکەین.
ئەمجارەیان کوێخا و جەندرمە بێگاریی دروێنەی ئاغایان پێ نەکردین: وایان پێ باشتر بوو لە گەنمەکە بگەڕێن لە بەر قرچەی هەتاوەکە هەڵبرینگێ و گوڵەکەی بپەڕێ و بوەرێ و ببێتە هێزدەری زەوییەکە.
گوتیان: قەیناکا، لە بری ئەوە، کە باران باری و زەوی و زارەکە نەرم بۆوە، وەرن بۆمان بکێڵن.
هەر واشی لێ هات: تازە گەنمەشامییەکان تا ئەژنۆ هەستابوون، کە دیسان وشکەساڵیی بەسەردا هاتەوە. گەنمەشامی ئیدی هەڵی نەدا، گوڵی نەکرد و پێوەی نەبوو. بەرەبەری پاییزێ کێڵگە و گوند هەموو رەش دەچوونەوە و تاوەسووت ببوون. قرچەی گەرماکە هەموو وڵاتی کردبووە دەشتێکی وشك و قاقڕ.
عەرزی دەشتەکەمان هەڵدەکۆڵی بەشکم رەگی گیا بدۆزینەوە. ئەگەر رەگ و ریشەیەکمان دۆزیباوە، لە ئاودا دەمانکوڵاند. ئاوەکەی تاڵ بوو، بەڵام چار نەبوو دەبوو بیخۆینەوە. پێستی لەشمان زەرد هەڵگەڕا و وشك هەڵات و لۆچ بوو. باوك و دایکمان چەند جاران و هەموو جارێکیش چەند سەعاتان پێکەوە دانیشتن و تەگبیریان کرد، داخوا دەتوانن چ شتێك بکەنە پارە و شتێکی وای پێ بکڕن بخورێ، هەر نەبێ نەمرین و، ئێمەی منداڵ، کە لەو برسێتییە سامناکەی لە ناخمانەوە هاواری دەکرد، رزگار بکەن.
باوکم بەناڵینەوە دەیگوت:
ـ ئەگەر گایەکان بفرۆشم، ئەی بە چی کار بکەم؟ ئیتر ئەودەم دەبێ دانیشین تا لە برسان دەمرین.
گا، وا لەڕ بوون، پەراسوویان دەرپەڕیوە. دەڵێی ئێسقانەکانیان خەریکە سەر شانیان هەڵدڕن و بێنە دەرێ. لە کاتی کارکردندا، لە بن قورسایی نیرەکەدا، پشوویان سوار دەبێ. عارەبانەکەیان تەنانەت بە بەتاڵییش پێ ناکێشرێ. کەشکەژنۆی ئەسپەکان دەلەرزێ. سەلکە درێژەکەیان دەڵێی درێژتر بووەتەوە. لە دەم رووبارەکە بەرەڵایان دەکەین بلەوەڕێن. چونکە تەنانەت زۆنگاوەکانیش وشك بوون. بە شوێن

[*] کۆلیڤا: کولێرەناسکەیەکی شیرین و تایبەتە، کە بەپێی بیروباوەڕە ئایینیەکان، بۆ خێری مردووان دروستی دەکەن و لە ساوار و شەکر و گوێز دروستت دەکرێ.

ڕەگی گیادا ئەوەندە لمۆزیان لە عەرزەکە خشاندووە، هەموو لمۆزیان بریندار بووە. پووکیان هەموو خوێنی لێ دێ.

ئاخرییەکەی باوکم دەڵێ:

ـ وا باشترە زەوییەکە بفرۆشین.

تەواو تێك شکاوە. بڕستی لێ بڕاوە. سەرلەبەری زەوییەکەی هێکتارێکە. جگە لەوە، پارچەمێرگێکیشی لە شیوەکەدا هەیە. ناتوانێ دەست بۆ زەوییەکەی دایکم بەرێ، ئەو زەوییە هیی ئەو هەتیوانەیە، کە دایکم لە مێردەکەی ئەوەڵی خستوونیەوە. میراتێکە لەو باوکیانەوە پێیان بڕاوە، با بڵێین هێشتا منداڵن و خۆیان نەناسیوە.

ـ ئیۆرداکێ دیمان، کڕیارە. زەویی خەڵکی دیکەشی کڕیوە. گوتوویەتی، هەر هێکتارێك بە سێ فەردە گەنمەشامی و دوو فەردە گەنم دەکڕێ. ئەگەر پێخۆری پێوە بکەین، تا بەهارێ پێی بەڕێ دەچین.

ـ ئەی دوایی؟

ـ دواییش، وەك هەمیشە خوا گەورەیە.

ئاخری، ئیۆرداکێ دیمان بوو بە خاوەنی زەوییەکە. زەوی و زاری زۆر کەسی دیکەشی لە چنگیان دەرهێنا. فەردەی گەنمەشامی و گەنمەکەمان بردە ماڵەوە. گایەکان بڕستیان لێ بڕاوە و لەپێ کەوتوون و بەحاڵ هەناسەیان دێ.

تەح لەو مامالیگا بچووکە! هەر کامەمان لەتێکمان پتر پێ نابڕێ. شەو و ڕۆژ خواردنمان نۆکاوە. حەفتەی جارێکیش شەوی یەکشەممان، دایکم هەویر دەشێلێ. ئاردەکە نەك دانابێژێ، بگرە هەندێ ئاردی گەنمەشامییشی تێکەڵ دەکا بۆ ئەوەی نانەکان تۆزێك گەورەتر بن. ئەو نانەی ئاردی گەنمەشامیی لەگەڵە، ڕەشێکی مەیلەوزەردە، توێی سەرەوەی ئەستوورە و نێوەڕاستەکەشی هەر هەویرێکی لیچقە.

دەوڵەمەندەکانی ئاوایی ملهوڕتر بوون. ئەوانەی دەستیان نەدەگەیشتە دەمیان، زەوییەکانیان لەبری زەواد و خۆراك لە دەست ملهوڕەکان کردووە. قەباڵەکانیش، ستانسکۆی سکرتێری ناحیە ڕێکی خستوون و، دادوەری مەحکەمەش مۆری کردوون. کەس نەیتوانیوە یەك دەنکە گەنمەشامییش لە

ئاغاکان قەرز بکا. ئەوان خواخوایانە سالێکی دیکەش ئاوا وشکەسالی بێ. بەروبووی خۆیان شاردووەتەوە، بۆ ئەوەی لە کاتی خۆیدا زۆر گرانتر بیفرۆشنەوە. دووکان و عەمباری ورگنەکانی ئاوایی هەتا خنخناگە ئاخنراوە.

پاش نەگبەتیی ئەو وشکەسالییە، بەلای ئەو زستانە بێبەزەییەش دنیای داگرتووە و بووەتە گونی قۆڕ.

دویمترۆپالیکای پوورم، کە مالی لە گوندەکەی ئەوبەری رووبارە، دێتە مالمان. بە هەزار کوێرەوەری توانیویێتی چیا و بەفرەکە ببڕێ. لەگەڵ دادە ماریتزای خێزانی وەژوور دەکەون.

ئەوان پێنج مندالیان هەیە، بەلام ئەسپێ لە گیرفانیاندا سەوزەلە دەلێ. رۆژ هەتا ئێواری پێکەوە لە لای ئاغاکان یان جووتبەندەکان یان هەر شوێنێکی کاریان دەست بکەوێ، کوێرەوەری دەکێشن. جاری جاران ئەویش چەند سەر مانگایەکی هەبوو، بەلام لە دەستی بوونەوە. پار زستانێ پارەیەکی لە تۆماس ئۆکێی مەیخانەچی قەرز کرد و، چونکە کۆلکەخوێندەواریشە، بۆی ئیمزا کرد. وەختی قەرزدانەوەکەی بەسەردا هات و تێپەڕی و پوورزام نەیتوانی پارەکەی بداتەوە. تۆماسیش گایەکانی لێ هەرزانفرۆش کرد.

دادە ماریتزا تووکی لێ کردبوو:

ـ کوڕە یاخوا ئەو پارەیە بدەی بە داودەرمان و حەکیم، چونکە ئێمەت ئاوا دەستەشکاو کرد و مالوێرانت کردین، کا تۆماس... یانی تۆ بەراستی نەتدەتوانی تۆزێکی دیکەمان لەسەر راوەستی؟ نەتدەتوانی دەرفەتێکی دیکەمان بدەیەی؟

ـ جا بۆ راوەستم؟ بۆ سەبر بکەم؟ چما ئەو دەمەی ئێوە حەوجێ بوون، دەستم نەگرتن؟... وەلا خۆشە، ئەو تووك و دوعایەشت بە پووشێك. من لە هیچ شتێك ناترسم.

زۆر جاران خزم و کەسی گوندەکەی ئەو بەری رووبار هانامان بۆ دێنن و دێن لە دەوری کوانووەکەمان کۆ دەبنەوە و، دەستە زل و قەلشیوەکانیان، کە لەسەرمان رەش هەلگەڕاون، بە ئاگری کا و کۆتەکە ـ کە دووکەلێکی رەش رەشی لێ هەلدەستێ ـ گەرم دەکەنەوە.

خوشکە ماریتزا دەست دەکا بە لالانەوە:

ـ تودۆر گیان، پشتمان تێ مەکە. دەزانین زەوییەکەت بە ئیۆرداکێ دیمان فرۆشتووە و زەوادت لێ کڕیوە. هەر نەبێ نیوە توورەکەیەکمان گەنمەشامی بە قەرز بدەیە. ئەو منداڵە داماوانەمان وەختە لە برسان بمرن، لە حاڵێکدا دەکرێ نەهێڵین پێڕا بێن. خوای گەورە تا ئێستا لە هەموو نەخۆشینێك پاراستوونی.

یەکپشوو دەپاڕێتەوە و دەلاڵێتەوە. چاوی، کە ئیتر حوکمیان تێدا نەماوە، بڕیوەتە بڵێسە زەرد و لاوازەکەی ئاگرەکە و، یەکپشوو دەنووزێتەوە. پوورزا دۆمیترۆ پالیکا بێدەنگە. باوکیشم وەك ئەو بێدەنگە. مەسەلە ئەوەیە، بۆ ئەوەی ئێمە بگەینە بەهارێ و کاتی بەفرتوانەوە، حیساب لەسەر دەنك دەنکی ئەو گەنمەشامییە کراوە.

بەڵام پوورزاژن هەر وا خەریکی پاڕانەوە و لالانەوەیە:

ـ دوو رۆژە هیچ کاممان زەوادمان نەشکاندووە... کوڕە خۆمان بە جەهەننەم، بەڵام کە دەبینین ئەو منداڵە داماوانە وەختە لە برسان بمرن، ئاگرمان لە جەرگی بەردەبێ.

دایکم هەڵدەستێ توورەکەیەك پڕ دەکا لە ئاردی گەنمەشامی و بە ماریتزا دەڵێ:

ـ بێنە داوێنت با چەند ربەیەك ئاردی گەنمیشت بدەمێ بۆ منداڵەکانتی بکە بە نان. خێری مردووانمان.

باوکم سەیری دەکا. لەوانەیە بیەوێ نەهێڵێ، بەڵام چما دڵی دێ؟

پوورزاژن دەڵێ:

ـ تودۆر گیان، هەتا هەتایە ئەو چاکەیەتمان لەبیر ناچێ.

ـ کوڕە ئەوە بەلایەك... هەر بیر لەوە دەکەمەوە کە هەتا هاوینێ چ بەڵایەکتان بەسەر دێ. بیر لەوە دەکەمەوە هەمووومان چیمان بەسەر دێ.

ـ لەوانەیە دەست بدەینە تێڵا و، ئەو کارە بکەین، کە هەر بەراستی دەبێ بیکەین. چونکە ئیتر ناکرێ ئەو وەزعە قبووڵ بکەین. ئێمە وا گیانمان دەردەچێ، ئەوەندە زەحمەت دەکێشین، تینمان لە ئەژنۆدا نامێنێ و، ئاخرییەکەیشی زەوادی خوامان لەماڵێدا نییە.

ـ وایە. ئاخری ڕۆژێك هەر وا دەکەین. بەڵام ئەگەر وەك پێویستە وا نەکەین، لەوەش خراپترمان بەسەر دێ. بەڵام کێشەکان هەر بەوەندە چارەسەر نابن، کە سەری چەند کەسێك بە تێلا تێك بکەینەوە.

ـ من هەر بیر لەوە دەکەوەوە، کە جۆرێك ئۆخژنم لەو دڵەی بگەڕێ کاك تودۆر، چونکە ئیتر چەقۆم گەیشتووەتە ئێسقان و وەگیان هاتووم. من ئیتر تاقەتی ئەم ژیانەم نەماوە.

پوورزا دۆمیترۆپالیکا و ژنەکەی هەڵدەستن دەڕۆن. باوکم هەتا بەر دەرگا بەڕێیان دەکا. ئەوان بە بەر دەمی سەیەکاندا کە لە حەوشە خەوتوون، رادەبرن. سەگەکان سەرێك هەڵدێنن، بەڵام نووزەیان لێ نایە. ئیتر لە حەپە کەوتوون.

شەوە، شەوی زستانە، درێژ و رەش.

چرا نەوتییەکەمان، کە بە دیوارەوە هەڵواسیوە، بە شۆڵەتیشکێك ژوورەکە تۆزێك رووناك دەکاتەوە. باوکە و دایکم زۆر بەدەگمەن قسەیەك پێکەوە دەکەن. مامە ڤۆنیکۆ کە دیواریان بە دیواریماڵمانەوەیە، تۆزێك تووتنی بۆ باوکم هێناوە. بەشی سەبیلەیەك دەکا. تووتنەکە بۆنی تووتنی خاوێنی لێ نایە. زیاتر گژ و گیایە.

باوکم باسی پوورزا دۆمترۆپالیکا دێنێتەوە گۆڕێ:

ـ ئەگەر زەوییەکی هەبوایە، ئێستا فرۆشتبووی. هەر چارەڕەشێك پارچە زەوییەکی هەبووە، بۆ تێرکردنی زگی و قوتاربوون لە مەرگ سەلەمی کردووە و لەدەستی بووەتەوە. خۆ زگی برسی نازانێ بەخشین و لێبوردن چییە. تۆزێك رادەوەستێ، ئەگەر نەیدرایێ و هیچ دەست نەکەوت سەری بخافڵێنێ و بیخەڵەتێنێ، حەیای پیاو دەبا. پێشتریش چەند جارێك قاتی و قڕی هاتبوو. بەڵام ئەودەم بنیادەم هەرچۆنێکی بێ، دەیتوانی بەرەی خۆی لە قوڕ دەرکێشێ. هێشتا تازەپێگەیشتووەکان بۆیان نەلوابوو زەوی و زاری خەڵك بخەنە بن چنگی خۆیان. ئێستا ئیتر هیچ نەماوە تاڵانی بکەن. بستێك زەویی چییە بە دەستمانەوە نەیانهێشتووە. رۆژ بە رۆژ بێشەرەفتر و چاوبرسیتر و هیچوپووچتر بوون. هەرە دیارەکەیان ئەو گراسی ئاغایەی بانیاسایە. ئەو قورومساغە پێیەکی لەسەر لێوی گۆڕە. هەر ئێستا نا تاوێکی دی لەوانەیە ئیزرائیل لە دەرگای بدا و گیانی بستێنێ. ژنەکەشی لەخۆی خراپترە. جا وەرە

لێیان بپرسە و بڵێ بۆ ئەوەندە دەکڕووزێنەوە؟... هەیانە و نیانە کچێکیان هەیە، کە ئەویشیان بە ئەستۆی ئەو دراکۆلیا گێژ و وێژە - کە ئێستا بووەتە پارێزگار ــ دا بڕیوە و لە کۆڵ خۆیان کردۆتەوە... ئەوەندەیان پارە هەیە نازانن لە کوێی بکەن، بەڵام بۆ ئەوەی خۆشی و سەیرانەکەیان لێ تێك نەچێ، نەیانهێشتووە منداڵی دیکەیان بێ... خۆ راستە منداڵی زۆر، خەم و ژانی زیاتری بەدواوەیە، هێشتا ئەوەیان نەمردووە، ئەوی دیکە گیانەلایەتی، یان یەکێکیان هێشتا لە جێ و بان هەڵنەستاوەتەوە، ئەوی دیکە پەتای گرتووە، بەڵام بەو حاڵەشەوە منداڵ ژیان شیرین دەکەن. بنیادەم کە دەیانبینێ، وردە وردە هەڵ دەدەن و گەورە دەبن، لەپێشدا گاگۆڵکێ دەکەن و دوایی دەکەونە دارەدارە و، ئاخریەکەشی وەك خۆمان لەسەر قوون دادەنیشن و گەورە دەبن و باڵا دەکەن و بەقەد پیاوێکیان لێ دێ، لەپێشدا لاسایی دەنگی بنیادەم دەکەنەوە، دواتر زمان دەگرن و ئاخرییەکەشی فام دەکەنەوە و زیرەك دەبن. خۆ بنیادەم ئاگای لەوە نامێنێ چۆن رۆژ و مانگ و ساڵ رادەبرن و، وەختێك چاو هەڵدێنی، سەیر دەکەی ئەوە قیت و قنج لەتەنیشتت راوەستاوە... یەکێکی سۆرە و تۆرەی لێ نەکەوێتەوە و منداڵی نەبێ، ئەی بۆچی زیندووە؟ رێك وەك درەختێك وایە، کە بەر نەگرێ. داری بێ بەر بۆ بڕینەوە باشە، وا باشە بکرێتە ئاوردوو.

مامە ڤۆیکۆ هەڵدەداتێ:

ـ لە نێو ئەو خەڵکەی خوادا، زۆر کەس نەماون بۆ ماڵ و سامانی دنیا، بەڵام لە چاوبرسێتیدا کەس ناگاتە ئاغاکان.

ـ جا ئاغاکانی لای ئێمەش لە سەگوسەگبابێتیدا، ئاغای هیچ وڵاتێك دەسکیان لەدوو ناکەن. ئەمساڵ رێك وەك چۆن کوللە لە زەرعات دەدا، ئاوا خۆیان بە زەوی و زاری ئێمەی هەژاردا کرد و، بە خوت و خۆڕایی زەوییەکانیان لە چنگمان دەرهێنا. هەر دیتیان برسین و هیچمان نییە، هەلیان بە دەرفەت زانی و، قۆڵیان بۆ تاڵان و کەولکردنمان هەڵماڵی. ئێمە برسێتی دەچێژین بۆ ئەوەی ئەوان دەوڵەمەندتر بن و، ئێمە کار دەکەین، بۆ ئەوەی ئەوان توورەکەی پارە لەسەر یەك هەڵچنن. بەیانی تا ئێوارێ بۆیان بمری، هێشتا ئەوەندەت نادەنێ زگی خۆتی پێ تێر بکەی. تۆ لە کەڕەی بەیانییەوە تا تەنگەی ئێوارە خۆتیان بۆ دەکوژی، بەڵام ئاغا تەنانەت زەحمەتی ئەوەش بەخۆی نادا خۆشی

راوەشێنێ. زۆربەی جاران تەنانەت پاش رۆژئاوابوونیش راتدەگرن. گوێت لە دەنگێتی کە دەڵێ: "هۆ، کورینە، دەی گورج بن، دەست ببزێون، خۆ هێشتا گەوزێکتان ماوە و ئەو گۆشەیەتان نەدووریوەتەوە. شەرمە بێت و هەر ئەمرۆ تەواوی نەکەن." تۆی ماڵوێران وەختە پشتت بشکێ، ئەویش ئەوە دەستی لە پشتەقوونی هەڵپێکاوە و پیاسە دەکا.

دووکەڵێکی خەست ژوورەکەی داگرتووە و، دوو سەبیلەش پەیتاپەیتا خەستتری دەکەنەوە. برا و خوشکەکانیشم خەوتوون. من چاوم هەڵدەگلۆفم.

ـ داریە، بۆ وا دەکەی؟

ـ چاوم دێشێن باوکە.

ـ بخەوە.

ـ خەوم نایە.

دایکم کراسێکی پێیە، بەحاڵی سەگ دەیەوێ پینەی بکا. وا شڕ بووە، پینە هەڵناگرێ و نازانێ لە کام لاوە دەست پێ بکا.

ـ هەر ئێستا ماڵی پالیکا لێرە بوون و من ناچار بووم لێیان مۆڕ ببمەوە... دەمزانی ئەوان لە خۆڕایی ئەو هەمووە رێگە و ئەو کێوە بەفرەیان هەروا نەبڕیوە. ئاسانیش نییە بنیادەم تاقە پاروەکەی دەمی خۆی لەگەڵ خەڵك بەش بکا. بۆ ئەوەی پاروە نانێکم هەبێ بە دەمی ئەو منداڵانەوەی بکەم، ناچار بووم زەوییەکەم بفرۆشم... باشە. کێ هەیە زەویی خۆی بفرۆشێ؟ ئەگەر "گا"ت نەبێ، دەتوانی بکڕیەوە، ئەی زەوی؟ کە فرۆشتت تازە دەمت لە پووش. تازە، کێ ئێستا مانگا و مەڕ و ماڵاتت لێ دەکڕێ؟... هەر وەك گوتم، لەپێشدا نێوچاوانم لێ تێك نان، بەڵام دوایی بەخۆمم گوت، سواڵکەر نانێکی بدەیەی و نانێکی لێ بستێنی وەك یەکە. پیاو لە ربەیەك ئارد نە دەوڵەمەند دەبێ و نە ماڵی وێران دەبێ. ئەودەم وەبیرم هاتەوە، پار نا پێرار، دوو سێ رۆژێك پاش ئەوەی ژنەکەی منداڵی ببوو، جەندەرمە پالیکایان بە شەق بردە بێگاریی ئاغا لە سێکارا. ناچار بوو ژنەکەشی بەرێ، خۆ نەیبردبا، مەحاڵ بوو بەتەنێ بتوانێ خۆیان لەدەست قوتار بکا. منداڵەکەیان لە نێو گژ و گیایەکە دانابوو. لەشکرێك مێش و مەگەز لە دەموچاوی نیشتبوون و دەچوونە نێو زار و

لووتی. مندالّە داماوە وا دەگریا، دەتگوت ئێستا نا تاوێکی دی نێوکی دەدڕێ... پیاوەکانی ئاغا مامزە و قەمچی بەدەستەوە و دەست لە پاشقوون، دەهات و دەچوون و چاویان بەسەرمانەوە بوو.
هەر لەوەدەمودەستەدا، فیلیپی کوڕی کوێخا پیسیکۆی پەیدا بوو. ئەسپێکی لەبندا و کلاّوێکی گەورەی حەسیریشی لەسەرنابوو، بۆ ئەوەی تاو نەیبا. گوتی:

ـ ئەو بۆقەی لەو گژ و گیایەدا قیڕەی دێ، ئیی کێیە؟

ماریتزا گوتی: هیی منە فیلیپ ئاغا. بۆقیش نییە و کچەکەمە.

ـ ئەی بۆ دەقیڕێنیّ؟

ـ چونکە پیاوەکانت ناهێڵن بچم شیری بدەمیّ.

ـ دەستیان خۆش بیّ، بۆ بهێڵن؟ دەبیّ زووتر کارەکان تەواو بکەن. ئەگەر گەنمەکە لە کاتی خۆیدا نەدرویّتەوە، دەپەڕیّ و ئاغا ــ جەنابی عەقید پیێنارۆ ــ زەرەری ویّ دەکەویّ.

دۆمیترۆ پالیکا غیرەتی نایە بەرخۆی و لەبن لیّوانەوە گوتی:

ـ ئاخر کچەکەم وەختە لەبرسان بمریّ.

فیلیپ بە گالّتەپیّکردنەوە گوتی:

ـ دەی با بمریّ. ڕۆژ نابیّتەوە؟ گوێی مەدەریّ. سالّێکی دیکە ژنەکەت یەکی دیکەت بۆ دەخاتەوە. خۆ تا ئەودەم کۆتەرەدار لە کونە کولّکنەکەی نائاخنیّ.

دۆمیترۆپالیکا دەهری بوو و، لە بن لیّوانەوە جنیّویّکی حەوالّە کرد. ئەوە شتیّك نەبوو کوڕەی کوێخا وەسەرخۆی نەهیّنیّ و، بە قەمچی بەربووە سەروگویّلاکی دۆمیترۆپالیکا. شووخالّی قەمچییەکە هەتا مردیش هەر بەدەموچاوییەوە بوو.

ـ ئەو فیلیپ پیسیکۆیە، لەو دایکەخۆگێیانەی ڕۆژگارە. جووتیار نییە لەو زەوی و زارەی سیّکارا بیّگارییی کردبیّ و، قەمچییی ئەوی وەپشتی نەکەوتبیّ.

دایکم تووك دەکا:

ـ یاخوا لە سەر کلّەکەی جەهەننەمدا ببرژێن.

برا گەورەکەی باوکم، دەست هەلّدێنیّ و لە ناخی دلّەوە دەلّیّ:

ـ خۆی و ئاغاکەشی، هەردووکیان. پیاوەکانی ئاغا، کۆمەڵێك لات و لووت و نامەردن، بەڵام ئاغاکان لەوانیش ناپیاوترن.... نۆکەرەکان چاو لە ئاغاکانیان دەکەن و لەوان فێر دەبن. من حەفتەیەکی رەبەق بە عارەبانەکەم لە سایلێوە گەنمی ئاغام کێشا بۆ عەمبارەکەی، بەڵام دەشتەوانەکەی هەر مز و هەقی رۆژێکی دامێ. کە سکاڵام بردە لای ئاغا، گوتی: "لە قسەکەی و تۆ و دەشتەوان، گومانم نییە هەقی دەشتەوانە. من لە دەشتەوانەکەم دڵنیام و متمانەم بەوە، نەك بە ئێوەی بێ دایکوباب، کە هەزار درۆی شاخدار هەڵدەبەستن بۆ ماڵوێرانکردنی من."

پێم گوت: لەوانەیە وانەبێ گەورەم، چونکە ئەنجامی ماڵوێرانکردنی جەنابت ئەوەیە، کە ئێمە هەمیشە حەوجێی نانی شەوێین و، ئێوەش جێتان نەماوە پارەی تێ بئاخنن. کەواتە ناکرێ بڵێی ئێمە بە کارەکەی خۆمان ماڵی جەنابتمان کاول کردووە.

پرسیی: ئەوە تۆ خەڵکی ئۆمیدای؟

گوتم: بەڵێ ئاغا. ناویشم ڤۆئیکۆیە.

گوتی: زوو زانیم. ئۆمیداییەکان هەر هەموو وەك تۆ سەربزێو و لاسارن. هەمووتان باش دەناسم. چار ئەوەیە ئیتر نەهێڵم لەسەر زەویوزاری من کار بکەن. چەندی پێتان دەکرێ دەدزن و ئاخریەکەشی هەر هاوارتانە. زۆر باشە. جارێ برۆ جەهەننەم پڕ بکە، دەی ملت بشکێنە.

منیش گوتم، حاشا لە گۆشتی کەروێشك و بۆ تسی تاژی. چیم دەسەڵات بوو؟ پێم وایە هەر خوا دەیزانی چەندەم حەز لێ بوو کۆتی عارەبانەکە هەڵگرم و لە تەختی نێوچاوانی راکێشم.

باوکم لەبن لێوانەوە دەڵێ:

ـ رەنگە رۆژێك دابێ هەموو ئەو کارانە بکەین. چونکە ئیتر چەقۆ گەیشتووەتە ئێسکمان. ئەو سەگبابانە تەنانەت مۆخی ئێسقانیشیان مژیوین.

ـ راست دەکەی تودۆر. پار زستانێ بۆ جێژنی نۆیل، بەرازێکم کوشتەوە، لایەکیم هەڵگرت و لە خاولییەکی پاك و خاوێنم پێچا و هەستام بردمە ماڵی ئاغا لە بانیاسا. حەوشەکەی ماڵی ئاغا لەبەر خەڵك هەر جمەی دەهات. هەموو خۆیان هەڕوگێڤ دابوو و ریزیان بەستبوو، یەك بە یەك دەچوونە ژوورەکەی کوێخا و مازەپشتی بەرازەکانیان پێشکەش دەکرد. میرزائاکسێنتێ مازەپشتەکانی

وەردەگرت و سەنگوسووکی دەکردن و، لە دەفتەرۆکەکەدا شتێکی دەنووسی و ئیتر لە قەرتاڵەیەکی داویشتن. هێشتا هیچ نەببوو، سێ قەرتاڵەی گەورە پڕ ببوو، سێی بەتاڵیش هەر وا مابوونەوە. گراسیم ئاغا خۆیشی لەسەر کورسییەکی نەرم دانیشتبوو و چەند بالیفیکێیان وەبن قاچی دابوو و، بە تیلەی چاو گۆشتەکانی هەڵدەسەنگاند.

ـ لاڕانەکەت لاوازە ڤۆئیکۆ.

ـ بەڵێ ئاغا، ئاخر بەرازەکەی بچووك بوو.

ـ جا بۆ بچووك؟ ئیی گەورەترت نەبوو؟

ـ دیارە ئەگەر ئەمساڵ مابایە گەورەتر دەبوو، بەڵام نەدەکرا چاوەڕێ بم تا گەورە بێ، چونکە ماڵ و منداڵ هیچ نەبوو بیخۆن.

گراسیم ئاغا گوتی:

ـ ئێوە تەمبەڵ و تەوەزەلن. تەمبەڵ و دەستوپێ سپی. هەر هەمووتان. هیچتان ئەو پیاوە نین کاروبارتان دیار بێ.

دەبوو چ جوابێکی بدەمەوە؟ وەڵامدانەوە کات بەفیڕۆدان بوو. ئەوەندەی ئەو خەریکی پشوودان و حەسانەوە و رابواردنە، ئێمە خەریکین لە بن باری کاردا دەپرووکێین و، ناتۆرەی "تەمبەڵ و تەوەزەل"ـیشمان لەسەرە. رۆژانی جەژنی پاك، کە ناچارم هێلکە مریشکی بۆ بەرم، ئاغاژن بازنەیەکی دروست کردووە و هێلکەکانی پێ دەپێوێ و، هەرچی لە بازنەکە بەربێتەوە، نایەوێ. دەڵێ:

ـ ئەوە زۆر بچووکە. گەورەتر بێنە.

ـ ئاخر ئاغاژن، هێلکەکان مریشك کردوونی، ئەگەر خۆم کردبامن، دڵنیابە هیی گەورەترم دەکرد.

ـ هەی بێ حەیای چاوقایم، بڕۆ چغە بە.

ئیتر رۆیشتم. چیم دەسەڵات بوو؟

ئەم ساڵ لاڕانم بۆ نەبرد. چونکە ئیتر بەرازم نەبوو بیکوژمەوە. بەهاریش هێلکەی بۆ نابەم. چونکە مریشك و کەڵەبابەکانم لە سەرما و برسێتیدا قڕیان تێکەوتووە.

دایکم هەرا دەکا:

ـ چۆن شتی وا دەبیٚ؟ کچیٚ بنیادەم کە دەبیستیٚتەوە لە ماڵی ئاغا چ باسە، پەنا بەخوا وەختە خۆ بکوژیٚ.

دایکم دوو پینەی گەورەی بە کراسەکەی باوکمەوە داوە، بەڵام هێشتا ماویەتی. دیسان چەند درووماٮێکی دیکەش هەن، دەبیٚ پینەیان لیٚ بداتەوە: چەند وردەپینەیەك و پینەیەکی زۆر گەورە لە پشتەوە، ئەو جێیەی هەتاوەکە بەتینتر لێی دەدا، ئەو شوێنەی ئارەقە قوماشەکە دەخووسێنیٚ و دەیڕزێنیٚ و هەمیشەش کراس لەوێوە دەدڕیٚ.

ـ کچەکەی پراکادێرا، کە قەرەواشی ماڵی گۆگۆکریستفەرئاغا بوو، دەیگوت، ئاغا ژن زۆر بە دەگمەن دێتوە گوند و، زۆربەی کات لە بوخارێست لە کۆشکەدا دەژی کە پانزە خزمەتکاری هەیە. قاپ و قاچاخەکان لە سەری مێردەکەیدا دەشکێنیٚ. شێتێکە ئاو ناپیاڵێویٚ. کەس زاتی نیە پێی بڵیٚ پشتی چاوت برۆیە. نابیٚ قسەی لە قسەیدا بکەیەوە. ئاغا بەرهەمەکەی دەفرۆشیٚ و، توورەکەتوورەکە پارە لە مستی ژنەکەی دەکا، بۆ ئەوەی بچێتە خاریج و خۆی پێشانی دکتۆری گەورە گەورە بدا. کوڕەکەشی وەك دایکی بەڕەڵایە. ئەفسەری سوپا بووە، بەڵام دەریان کردووە. چونکە خۆشی و ئیشی هەر ئەوە بووە، سەربازەکان بداتە بەر مست و شەق، یان ئەوەندەیان بە قەمچی لیٚ بدا، تا شەڵاڵی خوێن دەبن. تەنیا ئەودەمەی کۆنکەن دەکا، لەسەرخۆیە. هەتیوە هەرچی رەعیەتی گوندێکی شەشدانگ بە ساڵێك خوێنی دڵ هەڵیانگرتووەتەوە و لە توورەکەکەی باوکی ئەویان کردووە، ئەو بە یەك شەو دەیدۆڕێنیٚ. ئاغاش بەو شتانە کەر دەبیٚ و، جا دێتەوە و وەك سەگ لە ئێمە بەردەبیٚ و کەوڵمان دەکا. کەس نازانیٚ رەچەڵەکی یۆنانییە، یان رۆمی. هەر خوا خۆی دەزانیٚ.

باوکم دەڵیٚ:

ـ ئاغاکان سەر بەهیچ میللەتێك نین. ئەوان نە ئیمانیان هەیە و نە یاسا. هەر ئەوەندەی ئاغان بەسیانە. رەچەڵەکیان هەر شتێك بیٚ، هەمووان وەك یەك دایکی ئێمەمانان دەگێن.

پووره ڤۆیکۆ بە لەرزەلەرز دەڵیٚ:

ـ وەی ڕۆۆ وەی رۆۆ، دیسان دەریٚ چ وەیشومەیەکە.

تەنوورەکەی، کە بەری ناوەوەی چەرمە، رێك دەخاتەوە و دەڕوا.

باوکم بە دایکم دەڵێ:

ـ گوند جموجۆڵی تێکەوتووە. خەڵك ئیتر سەبر و تاقەتی نەماوە. ئەم ساڵ بەهارێکی پڕ لە شەڕ و بەڵا و خوێن و خوێنڕشتنمان لەپێشە.

ـ خۆزگە زووتر بەهار دابێ. هیچ نەبێ گژ و گیامان دەست دەکەوێ. بنیادەم هیچ نەبێ شۆربای گژ و گیا دروست دەکا و قووڕەقووڕەکەی زگی دەبڕێنێتەوە. لێگەڕێ ئەوەی تۆ دەیڵێی با بقەومێ. لێگەڕێ هەرچی دەبێ با ببێ.

بەفر، بێبڕانەوە بەفر.

خەریکە بەهار دادێ، بەڵام ئەو بەفرە بەتەمای توانەوە نییە. ئیلیۆتزا، هەر هەموو نەخۆشن. قوڕگیان دێشێ.

گوێم لە دەنگی ئیۆنی برامە، کە دەڵێ: منداڵەکانی دادە زواکا، هەموو ئاهۆیان گرتووە و قوڕگیان دێشێ.

گوێم لە دەنگی ئێڤانگلینی خوشکیشمە کە سەری دراوسێکەمانی داوە و، دەڵێ:

ـ ماڵی تۆتانۆ سەرجەم ژانەقوڕگیانە.

لە ناحیە، سکرتێرەکە لە بەیانییەوە تا شەوێ نێوچاوانی تێك دەنێ، دکتۆر گانچۆش لەو خراپتر و، سیرەشی کارمەندەکەی نەخۆشخانەش لەهەردووکیان خراپتر.

سیرەش یەکپشوو پرتەوبۆڵەیەتی: هەموو کاروبارەکان لەسەر شانی منن.

ئیۆنی برام بە چەقەنەلێدان دێتەوە و دەڵێ: دایە، قوتابخانە داخراوە.

ئینی، زۆری حەز لە قوتابخانە نییە.

باوکم سەیرێکمان دەکا و دەڵێ: منداڵینە، پەتاکە لێگرەوەیە. ئیدی نابێ لە ماڵێ بچنە دەرێ.

ـ ناچینە دەرێ.

بۆ بەیانی بە چەپەرەکە هەڵدەگەڕێین و سەیری کۆڵان دەکەین. ژۆتەی پۆلیس و دکتۆر گانچۆ و سیرەش دەبینین، کە بەکۆڵانێدا رادەبرن و، ئێشکگرەکانی ئاواییش بەشوێنیانەوەن. تاقمێك لەم ماڵە دێنە دەرێ و دەچنە ماڵەکەی تر. پێم وایە هەر ناشچنە ژوورێ. هەر سیرەش دەچێتە ژوور.

ـ ئێوە نەخۆشتان نییە؟

ـ نیمانە، نەخێر.

لە هەر کوێ نەخۆشێك ببینن، دایك و باوکەکەی ناچار دەکەن، بیباتە قوتابخانەکە. کورسییەکانیان کۆ کردووەتەوە و خستوویاننەتە دەرێ و لە حەوشە لەسەریەکیان کەڵەکە کردوون. عارەبانەیەکیان کا هێناوە و لە پۆلەکاندا رۆیان کردووە. نەخۆشەکان بە تەنیشت یەکەوە لەسەر کایەکە درێژ دەکەن. دایك و باوکەکان هەوڵ دەدەن لەودیو پەنجەرەوە بیانبینن. بەڵام پەرژینێکی بەرز لە نێوان پەنجەرە و کۆڵانەکەدا هەیە و، ئێشکگریشیان لەبەر دەرگاکە داناوە. هەر سیڕەش و ئێشکگرەکان دەچنە نێو قوتابخانە.

ـ ئەمڕۆ چەندیان مردوون سیڕەش؟

ـ شەشیان دکتۆر.

ـ بڵێ بیانبەنە دەرێ.

مردووەکان دەخەنە نێو سندووقەدارینەکان و دەیانبەنە گۆڕستان. دایکەکان دوور دوور وەشوێنیان دەکەون و شین دەکەن و پێیان هەڵدەڵێن.

منداڵەکانی قوونهەڵتەکێنە مردوون، هەر سێکیان...

ئیلیۆتزاش هەر یەکی بۆ ماوەتەوە.

لە پێنج منداڵ، ماڵی تۆتانۆ، دوویان بەزیندوویی دەرچووە.

هەتا بەهارێ، نزیکەی سێ لەسەر چواری منداڵی ئاوایی پێڕادێن*.

❊

❊

❊

بەهار داهاتووە. هەورەکان وەك بڵێی دەستێکی نەبەدی رای ماڵیبێن، ئیدی دیار نین. هەتاو وردە وردە گەرم دادێ. کەویی بەفران لەبەر چاوت دەتوێنەوە. لافاو تێکەڵ دەبنەوە و شێتانە و بەلرفە و

---

*پێڕاهاتن: مردن. بەلاداهاتن.

لووزەو بەرەو رووبار دەخوشیٚ و، دەوروبەری گوندەکە دادەگریٚ و هەر دیٚ و بەتەوژمتر دەبیٚ. پەتاکەی زستانیٚ سووکتر بووە. هیٚشتا چەند منداڵیٚك هەروا لە قوتابخانەکە لەسەر کا کەوتوون. ئەم ساڵ ئیتر دەرسخویٚندن تەواو بووە. خاویٚنکردنەوەی خانووەکان و رشاندن و پشیلەشۆرکردنیان هەڵدەگرن بۆ هاوینیٚ.

پۆپسکۆبراگادیرۆ، ماڵەو ماڵ دەکا و بانگی منداڵان دەکا و پیٚیان دەڵیٚ:

ـ منداڵینە، ئیدی نەچن هەر کتیٚبەکان بەلاوە بنیٚن و هەڵیان نەدەنەوە ها، جاروبارە بیانخویٚننەوە، چەند دیٚریٚك بنووسن و مەسەلەیەك حەل بکەن.

ئەوەش پیٚتریٚ رادۆییە، کە هاتووەتە ماڵمان.

پیٚتریٚ، جووتبەندەیەکە، لە کۆلانیٚ دادەنیشیٚ و، زۆر لەمیٚژە بیٚ ژنە، بەلام کەس لەو گوندە هیٚندەی ئەو پاکوخاویٚن و تەرپۆش نییە. ئۆپینچی** ی پینەکراو لەپیٚ ناکا و، قەیتانەکانیشی وەك هیی خەڵکی لەتوکوت و گریٚ گریٚ نین. پشتویٚنەکەی سپییە و پانتۆڵەکەشی پەشم و بیٚپەڵەیە. پەستەکیٚك بەسەر شانیدا دەدا، کە دەوراندەورەکەی کۆبەی گیراوە و، نەخش و نیگاری سوور و رەشی هەیە. کراسەکانی هەر دەڵیٚی ئیٚستا شۆراون. کلاوە چەرمینەکەی تیفتیفە دراوە و خاویٚنە و خۆڵ و خاك و کا و کۆت لە نیٚو تووکەکانیدا نییە. ماڵەکەی پڕە لە کچ: لە حەوت کچ چواری بۆ ماوەتەوە.

لەگەڵ بابم ملەی دەکا و، ئاخریەکەی ریٚك دەکەون: سیٚ فەردە گەنمان دەداتیٚ، لەبری ئەوە، ئەمساڵ هیٚکتار و نیویٚکی زەوییەکەی بۆ بدروویننەوە.

باوکم دەڵیٚ:، کاك پیٚتریٚ، ئەوە کەم نییە؟

ـ لەوانەشە. بەلام تۆ زۆر حەوجیٚی و، بنیادەمیش کە دەستکورت و حەوجیٚ بوو، ناچارە قبووڵی بکا. ئیۆنی برامیان ناردووە لە مەیخانە چەتوول(چارەگیٚك) ئارەق بکریٚ و بیهیٚنیٚتەوە. ئەوە ریٚیەکی قەول و قەرارە، گریٚبەستەکە دەبەستریٚ. ئیٚمە لەسەر گفتی خۆمانین.

پیٚتریٚ رادۆیی دەست لە رەش و سپی نادا. خەڵك کاری بۆ دەکەن. زەویی هەیە، پاتاڵی نییە و، کچەکانی تەڕ و وشکی دەکەنەوە.

---

** پیٚلاوی تایبەتی گوندییەکانی رۆمانیایە، کە ریٚك لە قاپقاپە و کالەی لای خۆمان دەچیٚ. بنی پیٚلاوەکە چەرمی گا یان بەرازە و، بە قەیتان لە دەوریٚ پیٚ و گویٚزینگ توند دەکریٚ.

دەڵێ: بەشی هەرە زۆری منداڵی ئاوایی مردوون.

باوکم دەڵێ: نەگبەتییەکی گەورەیە.

پێترێ دەڵێ: هەرگیز، ئەی باشە بۆ وەختێك منداڵی من دەمرن، کەس مێشێکیشی لێ میوان نییە، کەواتە بە دەرەك، خۆزگە جووقەواریان ببڕێ ئەوەی ماویشە بمرێ.

نۆبەتێ ماڵەکەی پێترێشی داگرتووە. ئەم بەهارە، لە جێژنی پاکدا، یەکێك لە کچەکانی گەیشتە تەمەنێك، کە دەیتوانی بچێتە گەڕی هوڕا. پاییزێ خەڵکی ئاوایی تابووتەکەیان هەڵگرت و بردیان لە گۆڕستانێ ناشتیان. کراسی سپیی بووکێنییان لەبەری کردبوو. ئەو کچانەی بەر لە مێردکردنێ دەمرن، بە جلی سپییەوە، بە جلی بووکێنییەوە دەیاننێژن. پێترێ لە سێ ساڵدا سێ کچی ئەسپاردەی خاك کرد. لینا و ئیۆنیتزا و ماریۆکا... لینا و ئیۆنتیزا، زۆر حەیابەخۆ بوون. کراسە سپییەکە هەقی خۆیان بوو. بەڵام ماریۆکا، ئیتر، پاش مردووان ڕەحمەت باشە، هەرچۆنێك بێ ئەویش کراسە سپییەکەی پێ بڕا.

خۆشی دەیزانی بەو زووانە نۆرەیەتی. دەچووە لای ئاسنەڕێیەکە و لەبەر سێبەری ئەرخەوانکاندا پیاسەی دەکرد و حەزی لێ بوو دەمەوئێواران گۆرانی بڵێ. دەنگە زوڵاڵەکەی لە گرد و شاخەکاندا دەنگی دەداوە. ڕەشکێنەی چاوە درشتە کەوەکانی پڕ بوون لە ترس و دڵەڕاوکێی مەرگ. روخساری بزڕکابوو. کوڵمەی دەتگوت گوڵن پشکووتوون.

ـ ئێڤانگلین، حەز ناکەم بەر لەوەی چێژ و خۆشی لەخۆم ببینم بمرم.

خوشکیشم پێی گوتبوو: مێرد بکە ماریۆکا.

ـ کەس نایەوێم. کابرا کەر نەبێ، چۆن ژنێکی نخۆش دێنێ.

ـ ئەی ئاخری؟

ـ حەزم لە پێتریشۆرە.

ـ ئەی خۆی دەڵێ چی؟

ـ ئەویش دەڵێ دڵی پێمەوەیە.

بە عالەمی ئاشکرا، بە بەرچاوی هەموو خەڵکەوە لەگەڵ پێتریشۆر جووت بوو. کەس لەڕووی هەڵنەهات قسەیەك بکا. هەر ئەوەندەیان گوت: چەند رۆژێکی دیکە میوانی ئەم دنیایەیە. رێبوارە. و رۆیشتیش...

ـ ئەمساڵ بەهارێ کام کچی پێترێ دەچێتە هۆڕا؟

ـ جۆردانا.

هەموو سوور دەزانین جۆرداناش هەر تا پاییزێ دەژی. چوار ساڵی دیکە پێترێ رادۆی سەڵت و رەبەن دەمێنێتەوە. بێ ئۆقرە چاوەڕێیە ئەم چوار ساڵەش رابرێ. ژنێکی دیکە دێنێ. ژنێکی گەنج دێنێ. هەر بەو تەمایەش دەژی. هەر لێوێکیش تەڕ دەکاتەوە، لەوە پتر بیر لە هیچ ناکاتەوە.

لرفە و خوڕەی لافاوەکان هەر دێ و پتر دەبێ. رووبارەکە هەڵدەستێ و باغاتی گوند دەداتە بەر شەپۆلان. بەفری لووتکەی کوێستانەکانیش تواونەوە.

لە دەم رووبارەکە ریز بووین و سەیری لووزەی بەخوڕ و قوڕاوی ئاوەکە دەکەین، کە چیخ و پەرژین و پرد و کۆتەرەدارەکان را دەماڵێ... نێزەی درێژ درێژمان دروست کردووە و، ئەو شتانەی پێ دەگرینەوە کە ئاوەکە دەیانهێنێ.

ـ خۆ ئاوا بڕوا، لافاو ئاواییەکەمان دەبا.

ـ قسەی قۆڕ، تا ئێستا شتی وا نەبووە، بۆ دەبێ راست ئێستا وای لێ بێ؟

بەڵام ئاوەکە هەر وا هەڵدەستێ و خەریکە بەستێنەکە دەبەزێنێ. هەر دەڵێی لە لای سەروو بەنداوێکی گەورە لەنەکاو شکاوە. با ئەوەش بڵێم، هاوینی ئەم ساڵ هەموو شتێك هەڵپڕووزا، تەنانەت دارەکانیش وشك هەڵاتن. خەڵکیش بە چاوی پڕ لە نیگەرانییەوە چاوەڕوانی پەڵەهەورێك بوون بە ئاسمانەوە. رەگی گیاکانیش تامەزرۆی دڵۆپە بارانێك بوون. کچە قەرەجیش تاسەباری باران بوون.

جاروبار دەستە قەرەجێکی قژکاڵ و چاو کەسك و شین لە کوێستانەکانەوە بەرەو دانووب دادەگەڕێن و، بە ئاواییەکەماندا رادەبرن. ئەوانە لینگۆڕارییەکانن. ئەو دۆمانەی بە دار، کەوچك و ئەسکوێ و قاپ و

بلوێر و شتی دیکە دروست دەکەن. سەروقژیان وەك گەنمی گەیو ئالۆزکاوە، دێن و بەکۆلاناندا دەگەڕێن و هەرا دەکەن:

ـ وەرە کەوچك، پیاڵە، شانە...

جاری جاران ئەو دۆمانەی دەهاتن، ڕەش ڕەش بوون، وەك قورمی بەرمیچ، قژیان درێژ و کەزیکراو بەسەر شانیاندا و، ریشێکی چڕوپڕ، کە دیاربوو لە سەرووەدەرنانەوە مقەستی نەدیوە.

ئەوانە سامناکترین هۆزی بیابانگەڕ بوون، کە بە عارەبانەی سەرداپۆشراوەوە دەهاتن و بە دێهاتاندا دەگەڕان و، ئەسپیان دەدزی و ژن و کچیان لە چاوترووکانێکدا دەیانتوانی پیاو رووت بکەن*. لەکۆڵت نەدەبوونەوە هەتا بە روویاندا دەختی و قایلیان دەکردی فالێکت بۆ بگرنەوە. جا ئەوجار گوێماسیلکەیەکی گەورەیان لە توورەکەکە دەردێنا و دەیاندایەی لە بن گوێت رایگری و، لە رووی ئەوەوە بەخت و شانسیان بۆ دەگرتیەوە.

بەڵام ئێستا دۆم و قەرەج زۆربەیان وەرزێك لە رەشماڵدا دەبن. ئەوانە دێن روخسەت وەردەگرن بۆ ئەوەی حەفتەیەك لە دەرەوەی ئاوەدانی لە نێوان ئاوایی و رووبارەکە، بار و بنە بخەن. زۆربەی جاران زستانان هەر لە ماڵەکانیان وەدەر ناکەون و، کە بەهاردا هات، لێی سواری عارەبانەکانیان دەبن و ملی رێ دەگرن بۆ کارو کاسبی و، سەرەتای پاییزێ دیسان دەگەڕێنەوە نێو خانووەکانیان. ژن و کچەکانیان مقەست و چەقۆ و ئەموستیلەی کانزایی دەفرۆشن. لە هەر شوێنێك بار بخەن، خێوەتەکەیان هەڵدەدەن. سۆرە و تۆرەیان بە قوونی رووت و ورگە زلەکەیانەوە پێك وەردەبن و دێن و دەچن و دەیکەنە هەرا و هەنگەمەیەك، پیاو مێشکی سەری دەچێ. شەوانەش لە دەوری ئاگرەکە کۆ دەبنەوە و بە شمشاڵ و ڤیۆلۆن و گیتار دەیکەنە بەزمی خۆیان.

پار، کە گەیشتنە ئۆمێدا، وشکەساڵی تەنگی بە وڵات هەڵچنیبوو. کۆلانی ئاوایی پڕ ببوون لەو کچۆڵە دۆمە دە یازدە ساڵانەی چڵوچێو و دەوەنیان لە دەوری سەر و قەدیان ئاڵاندبوو، رووت و

* رووتکردن: واتە تالانکردن. بۆ ئەو کاتە بەکار دی کە چەتە و رێگر لە شیو و دۆڵ و دەربەندان پێشی رێبواران دەگرن و هەرچی پێیانە لێیان دەستێنن. لەوکاتەدا دەڵێن: ئەمڕۆ فلانەکەسیان رووت کردووە.

قووت لەبەر ئەو قرچەی هەتاوە دەگەڕان و لەبەر دەرگای دووکانان رادەوەستان و سەمایان دەکرد. ئەو گۆرانییەی سەمایان پێ دەکرد، بەندێك بوو، کە پیرەدۆمێك دەیگوت و دەفەی زەنگیی لێ دەدا:

وەرن پێکەوە کچە دۆم
لەم باخی پستەیەدا
بیکەنە بەزمێکی وا،
باران بنێرێ خودا

وەرن کچە دۆم هەمووتان
گەش و دەم بە پێکەنین
بڵێن رێژنە ببارە
گەنمەشامی ببێ شین

کچەدۆم، باران نەمردووە
خودا دڵی لێی چووە
بە سەد دڵ ئاشقی بووە
کۆتی لە مل کردووە

کچە دۆم هەموو هەرا بکەن
بارانە خاکی دەوێ
بێت و نەگەن بە یەکتر
ناسرەون رۆژ و شەوێ

خوایە پێڵاوی زیوین

بکە پێی و لەلات بێ
سبەی بینێرە بۆمان
بۆ ژیانمان خەڵات بێ

کچەدۆم بڵێن خوایە گیان
ئەگەر باران بباریێ
دەشت و دەوەن سەوز بێ
گوڵ بدا لکی داریێ

خوایە باران بنێرە
دەنك دەنك بە رێژنە
سواری ئەسپی ئاگری کە
زەوی بیکاتە جێژنە [*]

[*] ئەم هۆنراوەیە دەقاودەق نەکراوەتە کوردی،

کچە دۆم چەپڵە لێ دەدەن و بۆ پیرەی دەستێننەوە و لە سەمایەکی بەجۆش و خرۆشدا پێ بەعەرزدا دەدەن و سمتیان هەڵدەخلێننەوە. هەر دەڵێی شەیتان چووەتە کەلەشیانەوە. لەنجەولاریانە. نێوقەدیان با دەدەن و مەمکیان هەڵدەبەزێننەوە و وا پێ بەعەرزیدا دەدەن، کە لەبەر تەپوتۆزەکە لە ئەژنۆ بەرەوخواریان هەر نابینرێ. لە هەر جێیەك کچە دۆم بیکەنە بەزم و سەما، ژنانی گەڕەك گۆزە و جەڕەی پڕ لە ئاو دێنن و بەسەریاندا دەکەن. کچەکان لە جۆش و خرۆش دەکەون و سارد دەبنەوە و پیرەکەیان چیی بخەنە پێش، هەڵی دەگرێتەوە. بۆ وێنە ئەسکوێیەك ئارد یان گەنمەشامی، کە توورەکەکەی دەکاتەوە بۆی تێکەن.

تا هاوین تەواو بوو، کچەدۆم لە سەما و گۆرانی نەکەوتن، بەڵام بارانیش هەر نەباری.

ڕۆژێکیان میرزاستانسکۆی ناحیە هەروا لە زاری دەرپەڕی:

ـ ئەرێ دەڵێن چی هەر کەسە شتێك یان دراوێك لەسەر یەك دانێین و بیدەینە قەشە نوێژەبارانەمان بۆ بکا؟

تیزائۆدۆدۆی کە گوێی لەو قسەیە بوو، بە گاڵتەوە گوتی:

ـ هەر ئەوەمان مابوو قەشە بۆلبۆك دەم و لەوسی لەو کارەش وەربدا، شەرتە تا هەین باران نابینینەوە. جگە لەوەش، بیستوومە  لە ئاواییەکەی ئەولا نوێژەبارانەیان کردووە. ئەگەر لەوێ باری، ئەوە لێرەش دەبارێ. خەمتان نەبێ.

هەر ئەوەندە بەسە ماوەیەك بێبارانی بێ و تۆزە وشکەساڵییەکی پێوە دیار بێ، جا قەشە بۆلبۆك قۆڵی هەڵدەماڵێ و دەست پێ دەکا.

لە کلێسەکەی لای مەیخانە بەربینگ بە خەڵکەکە دەگرێ و دەڵێ:

ـ کوڕم، دەبێ هەمووتان بێن و بچینە دەرەوەی شار بۆ نوێژەبارانە، بەشکم خوای ئاسمان بەزەیی پێماندا بێتەوە.

ـ باشە باوە. با وا بکەین. هەر ئەم حەفتەیە.

ـ زۆر باشە. کەواتە پارە کۆ بکەنەوە.

ـ پارە؟ پارەمان بۆچییە باوە؟

ـ بۆ خەرجی پێویست، بۆ دامودەستووری ئیداری، کوڕم.

ـ بۆ ئارەق... ئاخر باوە. خۆشت کە زەوی و زارت هەیە و کاروبارت هەیە، هەر بەڵایەك لە زەوی و زاری ئێمە بباریێ، بەسەر حاسڵاتەکەی تۆش دێ.

ـ من زۆری گوێ نادەمێ رۆڵە گیان. عەمبارم لیپاولیپن. تفاقی مەڕوماڵاتیشم تەواو داخستووە. بەڵام هەر نزایەکی سەرقەڵەمانەکەی نەدرێ، لای خودا گیرا نابێ. زەحمەتەکە بەفیڕۆ دەچێ.

ـ وەك بڵێی ئەگەر بەفیڕۆ نەچێ، شتێك دەبێ.

*

*

*

پێش هەمووان گەرووی من ئەستوور بوو و بەدوای مندا گەرووی ریتزای خوشکم و دووسبەشی گەرووی ئیۆنی برام هەڵتۆقی.

دایکم دەستمانی گرت و بردینی بۆ ماڵەی نەنکی دیوائیکا. پیرە قۆتڕ سەیری قوڕگمانی کرد. ئەوجار پشتەملمانی گرت. لەپێشدا نۆرەی من بوو. دەموچاومی بەرەو لای خۆی وەرسووڕاند:

ـ زارت بکەوە.

زارم داپچڕی. پەنجەی لە نێو قوڕگە ئەستووربووەکەم نا و رێکیگوشی. بلۆقەکان تەقین. هێڵنجم دا و رشامەوە.

ـ دەبێ نەوت غەڕغەڕە بکەی.

ـ نەوت؟

ویستم تێی قووچێنم و راکەم، بەڵام دایکم پشتەستۆمی گرت و توند رایگرتم. پیرەقۆاڕ پیاڵەیەکی پڕ کرد لە نەوت و، بە زۆر زارمی داپچڕی و پیاڵەکەی نخوون کردەوە.

ـ قووتی بدە شەیتان.

چار نەبوو. نەوتەکەم قلّپ قلّپ قووت دا. جا نۆرەی ئیۆنی برام و ریتزای خوشکم هات.

نەنە دیوائیکا رووی لە دایکم کرد و گوتی: جا ئێستا بیانبەوە. ڕۆژێ سێ جار نەوتیان بدەیە. بەڵام زۆر نا، کەوچك کەوچك. بەیانی و نیوەڕۆ و شەوێ. پەتاتەیان لە گەرووی ببەستە.

باوکم توورەکەیەك پەتاتەی کڕیوە. دایکم پاکیان دەکا و، وەك ئەودەمانەی کە دەیەوێ لەسەر ئاگرەکە سووریان بکاتەوە، خڕخڕ لەتیان دەکا، بەڵام لەبری ئەوەی لە تاوەیان بکا، لە دەوری گەروومان وەك خشتێکی دیواری پێ هەڵچنن، ئاوا ریزیان دەکا و پەڕۆیەکیان لێ دەبەستێ.

لە حەوشەدا دەسووڕێمەوە. سەرم وا ژان دەکا وەختە بتەقێ. تەنانەت ناتوانم بشیجوولێنم. دەڵێی ملمیان لە لوولەیەك ئاخنیوە. چەناگەمم قوت ڕاگرتووە. کە تف قووت دەدەم، جێی ئەو بلۆقانی دیواییکای پیرەقۆترِ تەقاندوونی، دەبرژێنەوە.

دایکم شەوێ پەتاتەکانی لاملمان دەگۆڕێ. سبەی بەیانی دیسانیش هەروا.

بەرەبەری نیوەشەوێ بە دەنگی زەنگوڵەکەی کلێسا لەخەو رادەپەڕین. تەنیا یەکێك لە دوو زەنگوڵەکەی کلێسا توند لێی دەدرێ و دەنگی دێ. زەنگوڵە گەورەکە بەو دەنگە گڕ و ناخۆشەیەوە... ئاگادارکردنەوەیە لە مەترسی.

باوکم بەپەلەپەل پێڵاوەکانی دەکاتە پێی. جلەکانی لەبەر دەکا. بەپەلە رادەکا بەرەو ناحیە بزانێ چ قەوماوە. ئیۆنی براشم بەشوێنیدا رادەکا.

ئێڤانگلینی خوشکم لێی دەپاڕێتەوە و دەڵێ: زوو وەرەوە بزانین چ قەوماوە.

دایکم لەبن لێوانەوە دەڵێ:

ـ زەنگوڵەی نیوەشەوان، نیشانەی نەگبەتی و بەدبەختییە. هەمیشە هەر وا بووە. دیارە رووبارەکە هەستاوە و خوارووی گوند ئاو بردوویەتی. وەك بڵێی دەرد و خەممان کەم بێ. راستیان گوتووە، نەهامەتی قەت بەتەنێ نایە، ئەگەر هات بەلەشکر دێ... وەڵا بڵێم چی. لەوانەشە شەڕ هەڵاییسابێ.

ئێلیزابێتی خوشکم دەڵێ: شەڕ چیە دایکە؟

ـ جا دەتەوێ چ بێ؟ ماڵوێرانییەکی گەورەیە. پادشا و ئیمپراتۆرەکان لەسەر ماڵی دنیا دەبێتە قڕەیان. لەسەر زەوی و خاك چاو لەیەکتری سوور دەکەنەوە و، ئینجا پێخواس و ڕەشووڕووتی ماڵوێران

دەنێرنە پێشەوە بۆ ئەوەی بە زەبری شیر و رمب و تفەنگ دایکی یەکتر بگێن. شەڕ شەڕی ئاغاکانە، بەڵام پشتی رەعیەت دەشکێ و، خەڵکە داماوەکە دەبنە قوربانی.

ئیۆنی برام دێتەوە.

ـ دەی، چ بووە؟

ـ ئێشکگرەکان دیتوویانە ئاوی رووبارەکە زۆر هەستاوە. بەستێنەکەی لای ئێمەشی هەموو داگرتووە. گوندەکەی ئەوبەر تەواو نقوم بووە. پردەکەیشی بردووە. ناچار بە زەنگوڵەی کلێسا خەڵکی خوایان لەخەوێ هەستاندووە نەکا لە خەودا بمێننەوە و بن ئاو بکەون. ویستم بچم سەیر بکەم، بەڵام بابم نەیهێشت و گێڕامیەوە.

باوێشکێك دەدا و خۆی رووت دەکاتەوە و دەخزێتە بن لێفەکە.

ـ پێم وابوو یەکێك خنکاوە. بەڵام وا نەبوو.

کەڕەی بەیانی بابم دێتەوە ماڵێ. ئێمە خەریکین گەنمەشامی دەخۆین.

ـ ئای لەو چارەڕەشییە. ئاو هەتا لێواری گڵەقووچەی شاڕێیەکە هەستاوە. ئاغەڵ و دانگە گەورەکەی کاراباشی بردووە. پاتاڵی خەڵکیشی بردووە. گوندەکەی ئەوبەری رووبار هەر شڕە، ئەو خەڵکە داماوە هاوار دەکەن و بەو تاریکییە بەملاولادا رادەکەن. پیاو نازانێ چۆن فریایان بکەوێ، چونکە نە رێیەك هەیە و نە شتێك. پردەکە ئاو بردوویەتی، دەبێ راوەستین دنیا رووناك بێتەوە بەشکم بتوانین کەڵەکێك، گەمییەك دروست بکەین. زۆربەیان ناعیلاج چوونەتە سەربانەکان.

لە ماڵێ دەردەپەڕمە دەرێ و تیلەگی خەندەقەکەی دەم ئاسنەڕێدا بەرەو وێستگەکە پێی پێوە دەنێم. ئاو دنیای راداوە. رووبارەکە، کە ئیتر ناکرێ بڵێی رووبارە، دار و پەلەوەرگە(کێڵگەی مریشك) و عارەبانە و جاری وایشە سەربانی کوخێکی بەتەواوی و کەلاکی بزن و مەڕ و مریشك و کەڵەشێر و هەرچی ئاوە بەلرفە و کەفچڕەکەی گەیوەتێ، رایداوە و لە ژوورەوە هێناوێتی.

گوندەکەی ئەوبەر یەکسەر وەبن ئاو کەوتووە. هەندێ ماڵ هەر کاول بوون و، ئەوانەش کە هێشتا بەپێوەن، هەر سەربانەکانیان دیارە.

منداڵ رووت و قووت خۆیان پێکەوە نووساندووە. خەڵك رایانکردووەتە سەر لووتکەی گردەکان. لافاو، بە شەوێك دار و نەداری راماڵیون، ماڵ و عەمبار و تەویلە و ئاغەڵ و دانگە و پاتاڵەکەیان... هەر توانیویانە خۆیان رزگار بکەن.

دکتۆر گانچۆ، ستانسکۆی سکرتێر و قەشەبۆلبۆك و ژووتێی پۆلیس، لەسەر گڵەکە راوەستاون و سەیری وەزعەکە دەکەن.

سکرتێر دەڵێ: دەبێ شتێك هەر بکەین.

ژووتێ دەڵێ: هەوڵم داوە. داوام لە پارێزگار کردووە گەمی و لۆتکەی رزگارکەر بنێرێ.

ـ بۆچی؟ چما شتێك ماوە قوتاری بکەن؟

ـ ها، یان، نا؟ مەبەستم ئەوەیە، کە لافاو هەستاوە یان نا؟

ـ ئەی چۆن هەڵنەستاوە!

ـ دەی باشە، ئەگەر لافاو هەستاوە، یانی دەبێ لۆتکەی رزگاردەریش هەبێ.

سێ لۆتکەی رەشی درێژ و باریك، کە پارێزگار هەر وا بەرێکەوت توانیوێتی لە قەراغ دانوب بیانگرێ و "بە سێ گەمیەوانەوە بیاننێرێ" لە شەمەندەفەرەکەی دوانیوەڕۆ دادەبەزێنن. ستانسکۆی سکرتێر سواری یەکێکیان دەبێ و قەشەبۆلبۆکیش سواری یەکێکیان و ژووتێی پۆلیسیش سواری ئەوی دیکە. ژنەکانیشیان سوار کردووە. بە سەر ئاوە رەش و قوڕاوەکەدا دەگەڕێن و دەڵێن:

ـ ئەگەر ئێمە هەر نەچووینە دانوب، دانوبی داماو خۆی هاتە لامان. هیچ نەبێ توانیمان تۆزێك بەسەر دانوبە جوانەکەی خۆماندا گەمی لێخوڕین.

هەمووان خەنی بوون کە لۆتکەی رزگاریدەر گەیوەتێ. دڵی خۆمان بەوەخۆش کردووە، کە لەوانەیە، ئیشەڵا ئەگەر بەرپرسە پایەبەرزەکان و خێزانە بەڕێزەکانیان بەکەیفی دڵیان بەسواری گەمی سەیرانیان کرد و لێی تێر بوون، نۆرەی ئێمەش بێ. مەبەستم ئێمە منداڵەکانە، کە خەنی ببووین. چونکە ئەو وەزعە شتێکی پێشان داوین، لە ژیانماندا خەونیشمان پێوە نەدەدی. بەڵام باوکمان، هیچ دڵیان پێی خۆش نییە و، جگە لەو چەند منداڵە، کەس دڵی خۆش نەبووە. پاش ئەو وشکەساڵی و ئەو زستانە

وەیشوومە و قاتی و قڕییە، ئەم لافاوە بێ ئامانەی مریشك و پەلەوەر و مەڕ و ماڵاتی خەڵکی هەموو راداوە، خۆ تاقەت و تین و گوڕی لەکەس دا نەهێشتووە.

پیاوی گوند، پۆل پۆل لە سەر رێیەکان لەدەوری یەك کۆ دەبنەوە.

بەتەنیشتیاندا کە رادەبرین، گوێمان لێدەبێ دەڵێن:

ـ نا ئیتر ناکرێ ئەو وەزعە هەر وا بڕوا.

**٥**

جۆگەلەی باریك و قووڵ

❊

❊

❊

ئاوی چۆمەکە حەفتەیەکی ڕەبەق هەر نەنیشتەوە، نیشتنەوەکەی مانگێك دەبا.

ئەوەش چۆم: ئێستا دیسان دەکرێ لە دەراوەکەوە لێی بپەڕیەوە...

ئەی ئەوە نییە لە بەشی قوولاّیی ئاوەدانییەکە، لای زۆنگاوەکان و لە گوندەکەی ئەوبەری چۆم تاقە دیوارێکیش چییە بەپێوە نەماوە؟ ئەی ئەوە نییە پاش هەستانی چۆمەکە، لە کاولاش و وێرانی زیاتر هیچ نەماوەتەوە؟ جا ئێستا وەك هیچ نەبووبێ و، تەنانەت بەچاوی خۆشت ببیینی، بڕوا ناکەی ئەو هەموو نەگبەتی و بەلاّیە بەسەر ئەوێ هاتبێ.

خەڵك قۆڵیان هەڵماڵیوە و، بە جەگەن و زەل و لکوپۆی داران کووخیان بۆخۆیان هەڵبەستووە. هەرچۆنێك بێ، ژیانیان خستووەتەوە سەر پێ. بەلاّم ئیتر ئەو وردەو پردەیەی جاران هەیانبوو، ئەوەشیان نەماوە. ئیتر نە مانگایان هەیە و نە مریشك و کەڵەشێرێك. تەنانەت هیی وا هەیە هەر کراسێکیشی لەبەردا نەماوە.

ئەو شوێنانەی لافاوەکەی لێ ڕاوەستاوە، لیتەیەکی لیچقی زۆری لێ نیشتووە، کە هەتا ئەژنۆ تێی دەچەقین.

ئەو هەموو بەفرە، هەر بۆ دەرمانیش پەڵەی نەماوە. هەتاوی بەهار، کە زوو داهاتووە، نەرمە گەرمایەکی پێوەیە، وەك گەرمای نێوەڕاستەکانی مانگی گولاّن، لە حالێکدا ئەوە تازە لە نێوەڕاستی ڕەشەمەداین و هێشتا هەر حەفتەیەکی ڕۆیوە. هێشتا لەگلەگ[*] نەهاتوونەوە. قورینگ و هەڵەتانجیش هەروا.

---

[*] لەق لەق

هێشتا شەوانە زۆر سارد دەبێ. زەوی ڕەش دەچێتەوە و، گیا چووزەرەی نەداوە. بەپێخواسی دێین و دەچین و لەسەرمان هەڵدەلەرزین. ئەها، ڕاستە، بەهار زووتر داهاتووە.

دەچینە گوندەکەی ئەوبەری چۆمی، بۆ ئەوەی بزانین ئەو خەڵکەی کوخ و کەپریشیان نییە، چۆن دەژین. پتر دەچینە دەوروبەری گوندەکە، لای وێستگەی شەمەندەفەرەکە، بۆ ئەوەی سەیری ئەو سێ شتە زەبەلاحە ناشیرنە بکەین، کە ئیتر بێکار و بار لەوێ کەوتوون. لۆتکەی ڕزگارکەر، کە دوور لە ئاو و تەڕایی لەسەر زەوییە وشکەکە کەوتوون.

گەمیەوانەکان چوونەتەوە زێدی خۆیان.

پیاوان لە مەیخانە لەدەوری یەك کۆ دەبنەوە. هەر بۆ ئەوەی لە دەوری یەکتر بن، نەك بۆ خواردنەوە. مەیخانەچییەکان وەك ئەوەی لە زاری یەکتر تفیبن* لە ناکاو بڕیاریان داوە بەقەرز شت نەفرۆشن. خەڵك هەموو قەرزبارن. هاوینی پار کە وشکەساڵ و قاتی بوو، ئەمساڵیش ئەوە بەڵای لافاو هیچی نەهێشتووەتەوە.

ـ کاك تۆماس، بەستەیەکم تووتن بدەیە.

ـ ناکرێ. ئیتر مسقاڵێکیش بەقەرز نادەم. مەگەر قەرزەکۆنەکانتان بدەنەوە. ئیتر یەك فلسیش چییە پارەم لە دەخیلەدا نەماوە. هەرچی هەم بوو داومە بە زەوی و زار.

تۆماس ئۆکەی، سمێڵە ماشوبرنجییەکەی دادێنێ. بۆ ئەوەی ئیتر کەسی لێ نەبێتە مێمل، بە دەنگی بەرز و لەبەرچاوی هەمووان بڕیارەکەی خۆی رادەگەیەنێ:

ـ وا باشترە پیاو شەڕی سبەینێی ئەمڕۆ بکا، وا نییە؟... ئیتر قەرز بێ قەرز... خەڵك کەیفی خۆیانە، من شت بە قەرز نافرۆشم، حەز دەکەن بچنە مەیخانەی مارێش بزانن چ باسە، بەشکم ئەو دەست و دڵاواتر بێ. ئاخر ئەو منداڵ و پاڵی نییە. یان بچنە لای بۆسیۆك، بزانن دەراوی دەمی ئەو چۆنە.

بەڵام مارێشیش هەر بەو زمانە قسەیان لەگەڵ دەکا و بۆسیۆکیش.

---

*لەزاری یەکتر تفین: واتە یەك قسەیی. خەڵکی ئەوشارە هەموو دەڵێی لە زاری یەکتر تفیون. واتە هەموو قسەیان یەکە.

ـ بۆم هەڵناسوورێ کوڕینە. ئیتر بەقەرز دەری ناهێنێ. زەمانەکە ناخۆش بووە. هەواڵی خۆش نایە. کەس نازانێ سبەینێ چیی بەسەر دێ و چ داوێکیان بۆ ناوەتەوە.

گیۆرکێ تاراش، دەڵێ: لەوانەیە شەڕەکە هەڵاییسێ.

ئەو تاراشە خانووەکەی رێك لەسەر لێواری چۆمەکە بوو، ئاو رای دا و بردی... بە پەلەپڕووزێ کەپرێکی لە نزیك گردەکە هەڵبەست و ژن و منداڵەکەی لەوێ نا. نە زەوی و زاری هەیە و نە گاجووت. بوو بەکرێکاری رۆژمز. یانی کارێك کە یەك لەسەرچواری خەڵکی ئاوایی ناچار بوون بیکەن.

تۆدۆدۆیی قسەکەی پێ دەبڕێ:

ـ شەڕی چی؟ شەڕ لە گۆڕێ نییە. هەر دەڵێن گوندییەکانی مۆلداڤی لە ئاغاکان راپەڕیون و، عەمبارەکان دەسووتێنن و زەوییەکان دیسان بەسەر خۆیاندا بەش دەکەنەوە. ئێمەش دەبێ بجووڵێین و تا ئێستا کە راوەستاوین، ئیتر سەبر نەکەین...

لە نێوان قاچەکانی باوکمدا هەڵکورماوم و، ناهێڵم یەك قسەشم لەکیس بچێ. گەرووم نیشتووەتەوە.

ـ لە سەر پێشخانەکەوە دوو ریز برێتزێل* هەڵواسراوە.

ـ بابە، برێتزێلێکم بۆ بکڕە.

ـ رۆڵە پارەم نییە.

تۆماس ئۆکەی، کە گوێی لە قسەکەم بووە، دێ و دەڵێ:

ـ ئەوە بۆ منداڵ باش نییە. زگیان بای پێ دەکا.

وایە، ئەگەر زۆر بخۆم لەوانەیە با بکەم. بەڵام من هەر یەك دانەم دەوێ. هەر یەکدانە...

ئەوەی کە پار بیچکۆی هەمیشە سەرخۆشەکەی ناحیە ـ بای کردبوو، راستە. بیچکۆ لەگەڵ ستانسکۆی سکرتێر گرێوی کردبوو. هەردووکیان سەرخۆش دەبن. بیچکۆ، کە خۆی دابووە سەر تێلاکەی، هەروا بە گاڵتەوە گوتی:

ـ من بە یەك دار، دەتوانم باقەیەکی سەد دەنکی بێرتزێل ورد و خاش بکەم.

---

*برێتزێل: جۆرە شیرینییەکە. بە ئەسڵ ئەڵمانییە. نانێکی شیرینە نێوەندەکەی بەتاڵە و خوێن و زیرەی بەسەرەوە دەکەن.

ستانسکۆ هەڵی دایە:

ـ ئەگەر توانیت، من دەیبژێرم... بەڵام بەو مەرجەی هەمووان بهارِی و یەك دەنکیشی بەساغی نەمێنێتەوە. دواییش هەر هەمووی بخۆی.

جا ئەگەر راستیت دەوێ، بێرتزێل خۆی وشك و برینگ و ناسکە و، هەر ئەوەندەی بیچکۆ دارێکی لێ راکێشا، هەمووی ورد و خاش بوو و هەر لەتەی بەلایەکدا بلاو بۆوە. ئیتر بیچکۆ هەر هەمووی کۆ کردەوە و لە لەپی دەستی کرد و قرتەی لێ برِی. شەوێ زگی وەك دەهۆڵی لێ هات، بای کرد و چیی نەمابوو بتەقێ و بەگونمدا برِی. شووشەیەکی گەورەی رۆنی گەرچەك هەڵقورِاند و ماوەیەکی زۆر بەجێ و بان لێی کەوت. رەنگی وا سپی هەڵگەرِابوو، دەتگوت سپیاویان تێ هەڵسوە... کورتی ببرِینەوە، هێشتا ئەجەلی نەهاتبوو، بۆیە پێی نەمرد.

مامۆستا پۆپسکۆ براگادیرۆ، میرزاکەی ناحیەی لۆمە کردبوو، کە:

ـ چۆن کاری واتان کردووە؟ یانی نەتانگوت لەوانەیە پێی بمرێ؟

ـ دەی با مردبایە، چ دەبوو؟ خۆ دنیا خراپ نەدەبوو، پێخواسێك کەم بێتەوە یان زیاد بکا، چییە؟

پیچکۆ لەمەودوا وازی لە خواردنەوە هێنا و ئیتر دەمی لە ئارەق نەداوە. هەر ئەوەندە دێتە مەیخانە و بەستەیەك تووتن دەکرِێ و دەرِوا. بەڵام ماوەیەکە بەپێچەوانە لە مەیخانە وەدەر ناکەوێ. بەردەوام گوێ قوڵاخە بزانێ چ باسە و حەز دەکا توانیبای لەوەش زیاتر ببیستێ و پتر لەوەش تێ بگا. هەمووان ئاوا تامەزرۆ بوونە و حەز دەکەن بزانن لەو شوێنەی عەمبار و خەزێنەی ئاغاکانیان ئاگرداوە، چ باسە. هەزار جۆر دەنگوباس لەسەر زار و زمانانە. ئەو خەبەر و دەنگوباسانەی لە دوورەوە هاتوون.

پراکادێرا دەڵێ:

ـ گوێم لێ بوو دەیانگوت شۆرِشەکە خەریکە هەڵدایسێ. لە مۆلداڤیەوە سەری هەڵداوە و تەنانەت گەیوەتە ملکی دراوسێمان...

رێك لەودەمەدا کە پراکادێرا ئەو قسەیە دەکا، قەشەبۆلبۆك دەرگای مەیخانە دەکاتەوە و وەژوور دەکەوێ:

ـ سڵاو ڕۆڵەکانم.

ـ سڵاو باوە.

ـ تۆماس پەرداخێ ئارەقم بدەیە.

ـ پەرداخی گەورە باوە؟

ـ گەورە ڕۆڵەگیان. بەڵێ، بەڵێ، ئەی چی. ئەی دەڵێی پەرداخێکی بچووك هەڵدەم؟ پەرداخە بچووکەکان ئەوەندە نابەن، کە ددانەکانی پێشەوەشیان پێ تەڕ بکەی.

پێتریَ ڕەش ــ کوڕەکەی زگامانیێ، بە گاڵتەوە پێدەکەنێ، یانیها:

ـ باوە، خۆ ماشەڵا جەنابت ددانیشت کەم نییە ها، لە پێش و دواوە.

ـ سی و دوو ددانم هەیە کوڕم. بەڵێ سی و دوو. لەبەر ئەوەی ئێمە خەڵکی ئەوبەری چۆمە گەورەکەی ئۆڵتین. ڕەچەڵەکمان هیی ئەوێیە و خەڵکی ئەوێ چوارپەلیان زۆر تۆکمەیە و ددانیان لە سی و دوو کەمتر نایە.

خەڵکەکە قاقا دەکێشن. لەبەر ئەوەی قەشە دەمێکە ددانی هەموو کەوتوون و هەر سێ ددانی ماون. ئەویش لەق و لۆق و ڕزیون و زۆریان نەماوە هەڵوەرن.

کوڕەکەی ئۆڤێدێنێ لێی دەپرسێ:

ـ باوە، دەنگوباسی ڕاپەڕینەکەت بیستووە؟ وەك باسی دەکەن، جووتیارەکانی مۆلداڤیا ڕاپەڕیون. لە ئاغاکان ڕاپەڕیون.

قەشە بۆلبۆك چارەگە ئارەقەکەی یەك بین هەڵدەقوڕێنێ. ئارەقەکە لە نێو قوڕگیدا قولپەی دێ و دەڕژێتە گەدەیەوە. قەشە چاوی لەسەر یەك دادەنێ. تیژایی کحوولەکە هەناوی دادەماڵێ.

ـ یەکی دیکەشم بۆ تێکە کوڕم.

شۆکی چارەگێکی دیکەشی لەپێش دادەنێ. قەشە پەرداخەکەی هەڵدەگرێ و ئاشقانە لەنێو لەپی دەستیدا دەیگوشێ و، ئیتر دێتە سەر ئەوەی وەڵامی هەتیوەکەی ئۆڤێدێنێ بداتەوە.

ـ بەڵێ، گوێم لێ بوو باسیان دەکرد کوڕانم. بەڵام کوا بنیادەم چۆن بزانێ ئەوانە ڕاستن یان نا؟ هەرچۆنێك بێ کارێکی باش نییە ڕەعیەت لە بەرپرسە پایەبەرزەکان هەڵگەڕێتەوە و سەربزێوی بکا.

ترۆکانە شوان قسەکەی پێ دەبڕێ بۆ ئەوەی تێی گەیەنێ:

ـ لە بەرپرسە پایەبەرزەکان نا، باوە. لە ئاغاکان ڕاپەڕیون.

تیتزائۆیێ دەکشێتەوە و دەڵێ:

ـ تۆ وا باشترە بێدەنگ بی. ئەی "بەرپرسان" کێن؟ ئێمەین یان ئاغاکان؟... هەر ئەو ناحیەی خۆمان بێنە بەرچاوت: لێرە کێ والیە؟ دینۆدراکۆلایە، کە لە لایەکەوە کوڕی خاوەنشکۆ باربۆ دراکۆلای ئاغای فۆرکۆلێشتێیە و لە لایەکیشەوە زاوای گراسێ ئاغای بانیاسایە... بەرپرس و ئاغا، هەر یەکێکن. تێگەیشتی؟ وەك ڕۆژ ڕوونە. بەڵام ئەوەی لە ڕۆژیش ڕوونترە، ئەوەیە، کە ئاغاکان ئەوەندە زۆر نین، کەچی ئێمە لە ئەژمار نایەین. ئەگەر هەمووان ڕاستەوە بین، دەتوانین ڕەگ و ریشەی ئەو سەگبابانە بنەبڕ بکەین.

قەشە دووەم چارەگەکەش هەڵدەدا و پێیدا دەکا.

ـ پەکوو، چەندە توندە ئەو مەلعوونە.

ـ چی باوە؟ شۆڕش؟

ـ نا کوڕم، ئارەقەکە دەڵێم... بە دین و ئیمانم، پێم وایە ئێوە نابێ خۆتان لەو شتانە هەڵقوتێنن و خۆی تێوەردەن. ئاغاکانیش بەرهەم و نیشانەی خیلقەتی خوای گەورەن. خودای گەورە وای ویستووە، کە یەکێك زۆری هەبێ و یەکێك هەر هیچی نەبێ. بەڵام بەهەشت بۆ خەڵکە هەژارەکە دانراوە خۆشەویستانم.

ـ باوە، واباشتر نەبوو خوای گەورە تۆزێك لەو بەهەشتەی ئێمەی دابایە بە ئاغاکان، بەڵام لەبری ئەوە تۆزێك لە زەوی و زارەکەی ئەوانی بەسەر ئێمەدا بەش کردبایە؟ ئەگەر وای کردبا، ئێمەش گرفتمان نەدەما.

ـ ئۆیێ، کوڕم، من کەیفم بەو قسە بێتامانەی تۆ نایە. ئەوەی تۆ دەیڵێی، هەمووی کوفرە. گوناحێکە دەیخەیە سەر ویژدانی خۆت. تۆ دەبێ زۆربەی جاران بێیە کێسا و گوێ بدەیە وتەکانی مەسیح.

ـ کوڕە هەموویم بیستووە باوە. نەك جارێك، چەند جاریشم بیستوون. ئەگەر جوانیشی لێ تێگەیبێم، ئەوا نابێ مەسیح لایەنگری ئاغاوات بووبێ...

ـ تۆماس چارەگێکی دیکەم بۆ بێنە. گەدەم دەبرژێتەوە... ها، بەڵێ، وا بوو، وەك پێم گوتن، رۆڵە خۆشەویستەکانم. هەوڵ مەدەن مل لەبەر ملی بەرپرسان یان ئاغاکان بنێن و، جوابەجەنگێیان بکەن. ئەوان دەسەڵاتدارن ئازیزانم. زۆریش بەدەسەڵات. ئەوە ویستی خوای گەورەیە... کڵاوی خۆتان بکەنە قازی: ئاخەر ئەگەر هەموو خەڵکی دنیا ئاغا بوایەن، ئەی کێ هاتبایە بە نووکی پەنجە زەوی و زارەکەی وەرد دابایە و گەنم و گەنمەشامیی تێدا بچاندبایە؟ کێ دروێنەی کردبا؟ ئەوە شەیتانی رەجیمە هاتووەتە کەلەشتانەوە و سەربزێوتان دەکا و واتان لێدەکا ملکەچ نەبن. شەیتانی رەجیم.

ـ نا باوە، شەیتانی رەجیم نییە، ئارەزووی دادپەروەری و برسێتیی زگمانە. زگی خۆمان و منداڵمان.

ـ زۆر باشە رۆڵەکانم، زۆر باشە... بەڵام دوایی نەیەن بڵێن بۆچی روونت نەکردینەوە...

ئەو قسەیە دەکا و دەڕوا. خەڵکەکە دەیکەنە قریوە: مەیخانە دەڵێی قانگ دراوە.

ـ بەڵێ، دیارە: لە پشکەکەی ئاسمانمان پارچەیەکی دەدەینە تازەپێگەیشتووەکان، لەبری ئەوە پارچە زەوییەك لەو دنیا بێ بەقایە هەڵدەگرین... قەشە بەو بەهەشت و جەهەندەم و شەیتانەی، ئێمەی.... شەیتان، شەیتان، هەر شەیتان و شەیتان... باشە ئەگەر ئەو ئاغایانە شەیتان نەبن، شەیتان کێیە؟

ـ ئەو دەمەی باوکم دەستم دەگرێ و دەمباتەوە ماڵێ، ئیدی تاریك داهاتووە. تا درەنگانێ لە مەیخانە بووین...

ـ کوڕینە! وەرنە سەیر: ئەی لەو ئاگرە گەورەیەی لە لای خۆرهەڵاتەوە دیارە.

ورد و درشتی خێزانەکە پاڵەپەستۆیانە و لە ژوورێ دەردەپەڕنە دەرێ و دێنە سەر هەیوانەکە. هەموو چاو لە خۆرهەڵات دەبڕین. ئاسمان وا سوور داگەڕاوە، هەر دەڵێی بەلای ئاسۆوە لێڕەوارێك تەواو گڕی گرتووە. سەرەڕای ئەوەش، خۆ ئەوێ دارستانی لێ نییە. لەوە پتر هیچ نابینین. هەر بۆیە دەچینە سەر گردەکە. لەوێوە دەتوانین سووتمانەکە بە هەموو جوانی و دڕندەییەکەیەوە ببینین.

ئیتر لێمان روون بووەتەوە، ئەوەی دەسووتێ، عەمبارە گەورەکەی سێکارایە.

بەڵام هەر بەراست چ قەوماوە؟ یانی تۆ بڵێی یەکێك کادێنەکانی ئاگردا بێ؟

ریتزای خوشکم رووردەکاتە لای باکوور و هەرا دەکا:

ـ باوکە، لە بلیتۆرییش سووتمانە.

زۆر زۆر دوورتر، لەلای قەڵای رۆچییشەوە، لەوپەڕی ئاسۆی باکوورەوە، ئاگرێکی گەورەی دیکە بڵێسەی دێ. لە پێشدا دەبینین تەنیا دوو هێڵ بەرز دەبنەوە. دواییش لەپڕ دەبنە یەك و، پان و پان بڵاو دەبنەوە و، دووکەڵ بەسەرییەوە کۆڵەکە دەکا بەرەو ئاسمان.

شەوێکی ساوە. نە مانگەشەوە و نە پەڵەهەورێکیش بەئاسمانەوەیە. لێرە و لەوێیش بڵێسەی گەورەی ئاگر ئەنگوستەچاوەکە دەدڕێ. سووتمانێکی گەورە لە سێکارا لای خۆرهەڵات و یەکی دیکەیش لە تەنیشت رۆچی لای باکوور.... سووتمانەکان پەردەی شەویان دڕیوە.

سەیرە، لە لای خۆرئاواشەوە سووتمانی دیکە هەڵدەستێ: یەکێك لە لای کارلیگاتزی و یەکێك لە دەم دانووب بەلای زارکی رووباری تۆلت لە سایێلێ. دەزانین فۆرکۆلسکۆ ــ ملکەکەی دراکۆلای والی ــ لەوێیە.

ئیتر لە هەموو جێیەك، شەو ئاگر دراوە. کێڵگەکان رووناك بوونەتەوە. ئاگرەکە کردوویەتە قیامەتێك، دەرزی هەڵاوێی دیارە و دەکرێ زەنگیانەی لەبەر پێوە بکەی. لە هەموو لاوە بڵێسەی گەورە هەستاوە. بڵێسەی هێندە گەورە، کە تەنیا مەودا دوورەکان وای لێکردوون بچووك دیار بن.

باوکم دەڵێ: لە ئاوایی گوێبیستی هەندێ دەنگۆ ببووم. دەنگۆی شۆڕش، کە دەیانگوت ئەملایەش دەگرێتەوە.

سووتمان هەر دێ و پتر دەبێ و، باڵای بڵێسەکان، کراسی شەو دەدڕێ. بەڵام دوورە، دوورە، دوورە و ئێمە گەرم ناکاتەوە.

لە سەرمان هەڵدەلەرزین.

هەموو ئاوایی لەسەر گردەکە کۆ بوونەتەوە و سەیر دەکەن.

دەنگی کاك میلاکاکێم گوێ لێ دەبێ، کە لەباوکم دەپرسێ:

ـ ئەوە بۆ کوێ تودۆر؟

ـ منداڵەکان دەبەمەوە. لەسەرمان هەڵدەلەرزن.

ـ نەچی بنووی کاك تودۆر.

ـ کوڕە خەوی چی.

لە کاتی ئاوادا، منداڵ نەبێ، کێ بیر لە نوستن دەکاتەوە؟

بۆ ئەوەی گەرم بینەوە، دەخزێینە بن لێفەکەوە، بەڵام ناتوانین خۆ گەرم بکەینەوە. چرکەیەکیش چییە لەرزەکەمان ناڕەوێتەوە. بە سرتە دەست دەکەین بە قسەکردن. ئیۆنی برامە دەست پێ دەکا:

ـ عەمباری ئاغاکانیان ئاگر داوە. جووتیار زگیان هەڵدەدڕن و کایان لە پێستی دەئاخنن.

لە تەختەکەی خۆ فڕێ دەداتە خوارێ و پێڵاوەکانی دەکاتە پێی و دەردەپەڕێتە دەرێ. خۆ دایکم لێرە بوایە نەیدەهێشت. بەڵام دایکم لێرە نییە، لەگەڵ ئەوانی دیکە لەسەر گردەکەیە...

دادە ئێڤانگلینم دەڵێ:

ـ ئەگەر دێیەکەی ئێمەش عەمباری لێ بوایە ئاگرمان دەدا. بەخوای حەیفماڵی ئاغا لە گوندەکەی ئێمە نییە.

ئەوەندە لەسەر گردەکە راوەستان بۆ سەیری سووتمان، ئاخری تاقەتیان نەما و پۆل پۆل بەرەو خوار داگەڕان. هەندێکیان لە ماڵی ئێمە کۆ دەبنەوە.ئێمە ئەژنۆمان کۆ دەکەینەوە بۆ ئەوەی لە دەوری تەختەکە جێیان بێتەوە. هەندێکیان لەبەر دەرگا راوەستاون، هەندێکیان لە بن دیوارەکان دانیشتوون. دایکم یەك دوو کورسیی سێ پێچکە دێنێ و لە راڕەوەکە بۆیانی دادەنێ.

ـ دانیشن.

دادەنیشن. چاو لە بەرپێیان دەبڕن. شۆڵەچراکە دووکەڵ دەکا.

باوکم دەست دەکا بە قسەکردن:

ـ وڵات راپەڕیوە. هەر ئێستاش وا راپەڕینی دیکە بەڕێوەیە. ئەوانە هەر ئەو کەسانەن کە مڵکدارەکان لە خوێنی خۆیانیان گەوزاندوون. بەڵام راپەڕینی خەڵك بە هەموو نەگبەتییەکانیەوە، هەر باش بووە. هیچ نەبێ بۆ ماوەیەکی کورتیش بووبێ، ترسی خستووەتە دڵی ئاغاکانەوە و وای لێکردوون تۆزێك لەگەڵ وەرزێران باش بن. ئێستا ئیتر ناتوانین دەست لەسەر دەست دانێین و بێدەنگ دانیشین. بە گوێرەی پێویست ئازارمان چێشتووە و چارەڕەشیمان دیتووە. بەشکم خوا هێنای و تەخت و بەختی ئاغاکانمان تێك دا. بەو حاڵەشەوە، پێم وایە شتێکمان کەمە. شۆڕشەکەمان سەرکردەی نییە.

خەڵکەکە لەوانەیە کوێرانە هێرش بکەن و بسووتێنن و تەنانەت لە خۆڕاییش دەست بکەن بە کوشتار...

دۆمیترۆ پالیکا لەپڕ هەرا دەکا:

ـ من ئیتر خۆم پێ ناگیرێ. منداڵەکانم هەر ئێسك و پرووسکێکیان لێ ماوەتەوە. هەر کەس بیانبینێ دەڵێ، ئێستا نا تاوێکی دی دەمرن. بڕوا بکە "کا"م کوڵاندووە و داومنەتێ خواردوویانە. سەیری دەستم بکەن: تۆخی هەڵداوە. دەزانی ئەمە چییە؟ پێلانگەرە، ئەرێ گولییە... دەستی ژنەکەشم هەروا توێژی هەڵداوە. پێلانگەر واتە شێتی، واتە مەرگ... ئاخر بۆ؟ گوناحی ئێمە چییە؟ ئەوەندەم کار کردووە و خۆم کوشتووە، لە پێ کەوتووم. پشتم هەمووی شووخاڵی قەمچییە. پشتی ژنەکەشم هەروەتر. بنیادەم خۆ لە جارێك زیاتر ناژی. جارێکیش پتر نامرێ. دەی باشە. کەواتە مردن جارێك و شیوەن جارێك. لە بری ئەوەی بێدەنگ و کپ لە بن وەك کەر لە بن باردا بتۆپین، لێگەڕێ لە پێناوی ژیاندا و لە خەباتدا بمرین. هیچ نەبێ بەشکم منداڵەکانمانی لەبەر بحەسێنەوە...

پیچیکا دەڵێ:

ـ کاك دۆمیترۆ، من بەتاقی تەنێم و لەم دنیایەدا کەسم نییە. مەبەستم ئەوەیە، بشمرم کەسم نییە بۆم بگری. خۆ ئەو ژیانە سەگمەرگەشم لەکۆڵ دەبێتەوە. دەڵێم ژیانی سەگمەرگی. چونکە ئەوەی من هەمە ژیانی ئادەمیزاد نییە...پێم وایە وا باشترە هەر سبەی کەڕەی بەیانی هەموو خەڵکی ئاوایی کۆ بنەوە و وێکڕا دەست پێ بکەین.

مامە ڤۆیکۆ، برا گەورەکەی باوکم ـ دەڵێ:

ـ کۆ بینەوە وێکڕا. بەڵێ، ئاوا زۆر باشە. نابێ لە شۆڕشەکەماندا بەهەڵە بچین. هەر بەراست بیستم باسی قوتابیی قوتابخانەکانیان دەکرد. لەوانەیە تا بەیانی ئەوانیش بێنە لامان.

ـ قوتابییەکان بێن یان نەیەن، ئێمە ئیتر نابێ چاوەڕوان بین. لەوانەیە ئەو مەسەلەی قوتابیانە هەر قسەی زیادە بووبێ. ئەوەی لێمان سوورە، ئەوەیە کە عەمبارەکان وا دەسووتێن و، وەرزێرەکانیش ئاگریان داون. لە هەموو لاوە ملکی ئاغاکان دووکەڵی لێ بەرز دەبێتەوە.

ئەی خۆ ناکرێ ئێمە هەر وا دەست لەسەر دەست دانیێین و سەیرکەر بین، بێت و وابین، تێدا دەچین. هەم خۆمان و هەمیش سۆرە و تۆرەمان. ئیتر تێداچووین و ئەها.

دەڤید فلۆریایە، ئاوا نوتقی کراوەتەوە. لە لای دیوارەکەوە راوەستاوە و، قەلافەتی بە تێلاکەیەوە لە قوژبنێك گرمۆڵە بووە. چاوی بڕیوەتە بەرپێی خۆی، لەوانەشە سەیری کالە پینەکراوەکانی بکا، کە بەبێ چەرم و قایش، هەر بە شریتێك لە قاچی بەستوون. سمێڵە زل و درێژەکەی لە بن دەمییەوە تێکەڵی ردێنە سپییەکەی بووەتەوە. کە قسەکەی تەواو دەکا، بیرێکی دیکەی بە زەینیدا دێ و بەپەلە دەڵێ:

ـ من حەوت کوڕم هەیە. خۆم وەپێشیان دەکەوم و شۆڕشەکە وەڕێ دەخەین. تەنانەت شەڕی دەستەویەخەش دەکەین. یان سەردەکەوین، یان دەمرین.

پیاوەکان هەر خەریکی قسەن. چراکە هەروا پرتەی دێ. هەر دەڵێی لەودیو تەمومژێکەوە دەیانبینم. خەو دەمباتەوە. خەوێکی قووڵ. خەون بە شۆڕشەوە دەبینم. خەون بە خانووی گڕگرتووەوە. لە من وایە، تەنانەت درەختەکانی ئاوەدانیش وا دەسووتێن. لە خەودا دەناڵێنم. دەناڵێنم و تەنیشتاوتەنیشت دەکەم. دایکم بەخەبەرم دێنێ:

ـ ئەوە چتە داریتە؟

ـ خەونێکی ناخۆشم دی دایە.

زۆر جار لە خەودا دۆڵپا سواری شانم دەبێ و، دەناڵێنم و شتی وا دەڵێم کەس تێم ناگا. رێك وەك بەزمانێکی بیانی قسە بکەم.

لە خەونما بەسەر ئاوێکی بێبڕانەوە و بێ بندا، کە لە ژیانمدا شتی وام نەدیتووە، سواری گەمیەك بووم و لەپڕ تۆفانێکی سامناك هەڵدەکا. ئەو کۆتەرە دارەی سواری بووم و خۆمم تێدا گرمۆڵە کردووە، دەکەوێتە گێژاوێکەوە و لوول دەخوا. چیی نەماوە نوقم بم. ماسیی سەیروسەمەرە، هەر کامە لە گایەك زلتر، زاریان داپچڕیوە و بەدەورمدا دەخولێنەوە و دەیانەوێ هەڵمدرن. ددانم لەچیڕەوە دەبەم. چەندی دەتوانم لەسەر یەکیان دادەگرم، بەڵام ترس و دڵەخورپە بەچۆکمدا دێنن. لە ترسان هاوار دەکەم.

ـ ئەوە چتە داریە؟

ـ خەونێکی ناخۆشم دی دایە.

زۆربەی جاران لە خەونمدا ئەوە لەسەر چڵووکی دارێکم. بایەکی گەرم رامدەوەشێنێ. حەزم لە لانکەی دارەکەیە و کەیفیشم بە با گەرمەکە سازە. دارستانێکی پان و بەرینم لێ دیارە و بە گەڵا پان و لەلەکانیەوە دەلەرێتەوە. لە پڕ پێم هەڵدەخلیسکێن و لەو ئاسمانەڕا بەردەبمەوە خوارێ. وا بەردەبمەوە فیشەك نامگاتێ و بەهەموو تینی خۆم هاوار دەکەم.

ـ ئەوە چیتە داریە؟

ـ خەونی ناخۆشم دی دایە.

جارێکیان لەمن وابوو، ورچێکی رەشی کرێت سەری لەدوو ناوم. زۆر لەو ورچانەی پێشان دەدرێن زبەلاحتر. لەبەری هەڵدێم و لە رەوەز و گابەردان وەسەر دەکەوم و دەخزێمە نێو ئەشکەوتێکەوە کە تێدا ئاگرێك لە بن خۆڵەمێشەوە نەرم نەرم داییسێ. دارە نیوەسووتەکان هەڵدەگرم و فڕێیان دەدەمە بەر دەرگای ئەشکەوتەکە.

شەوێکیان شەمەندەفەرێك لە ئاسنەڕێیەکە لای دا و سەری لەدوو نام و گرتمی و خولخولەکانی هێنایە سەر پشتم. لێخوڕی شەمەندەفەرەکە، وردەوپردەکانی جەستەمی هەڵگرتەوە و پێکیەوە نووساندنەوە. من لە خەونەکەمدا پێدەکەنیم، دەمزانی خەونە.

دیڤایکا، بۆ رەواندنەوەی ئەو ترسەی من زۆری نوشتە و سیحر کردووە. پێتریایش هەروا. بەڵام هیچ کامەیان کاریان نەکردووە. هێشتا هەر وەك خۆمم، هەر جارێکی خەوم لێ دەکەوێ، دۆڵپا سواری سینگم دەبێ و دەمتۆقێنێ.

چراکە هەروا دووکەڵ دەکا. خەڵکەکەی دیکە رۆیون. هەر خۆمان ماوینەوە. باوکم، کە لەبەر پەنجەرەکەوە دانیشتووە، سەبیلەکەی دەکێشێ و دووکەڵەکەی لە لووتیەوە دەردەداتەوە. خەوی لێ ناکەوێ.

ـ بخەوە دەی داریە.

ـ خەوم لێ ناکەوێ باوکە.

ـ دەی باشە بێدەنگ بە. ئەوەندە جینگڵ مەدە. ئەوانی دیکەش لەخەو هەڵدەستێنی.

ـ لە ئاواییەکەی ئێمەش شۆڕش دەکرێ بابە؟

ـ دەکرێ، دەکرێ.

ـ سبەی؟

ـ لەوانەیە. لەوانەشە هەر بەراستی سبەینێ.

تاریك و روون، سپی، زەرد خۆی بە شووشە تەمگرتووەکاندا دەکێشێ. جیڕەی سەتڵی بیرەکە دێ. دەنگی گایەکان کە بۆ تفاق و ئالیفی تازە دەهۆڕێنن، لە تەویلەوە دێ، بەڵام خۆ هێشتا گیای تازە چووزەرەی نەداوە.

بەیانی، هەموو خەڵکی ئاوەدانی لە کۆڵانێن. هەموو لەبەردەم ناحیە کۆ دەبنەوە.

کوا قایمقام؟ سکرتێرەکەی ناحیە لە کوێیە؟

بەدوایاندا دەگەڕێن و هیچیان نادۆزنەوە. ناحیە چۆڵە و سریوەی لێوە نایە. بۆیان دەردەکەوێ، ژووتێی پۆلیس ئێشککگری لە وێستگەکە داناوە.

کارمان بەو و بە ئێشککگرەکەی نییە.

تیتزای کوڕی ئۆیێ دەپرسێ"

ـ خۆمان چ دەکەین؟ دەست پێدەکەین یان نا؟ شۆڕش گەیوەتە سێکارا. عەمباری ئاغایان سووتاندووە. ئەگەر بڕوا بکەین بەو قسانەی زارەو زار دەگەڕێن، جووتیار لە هەموو شوێنێك ڕاپەڕیون. ئەرێ ئێمە زەوی و زارمان دەوێ یان نا؟

جەماوەرەکە یەکدەنگ دەڵێن:

ـ بەڵێ، دەمانەوێ.

ـ دەی باشە، کەواتە دەبێ ڕاپەڕین. تەنیا ئەوانەی بەشداری شۆڕشەکە دەبن، زەوییان پێ دەبڕدرێ.

لەو دەمەدا گیۆرکێ کاراباش لە خەڵکەکە دادەبڕێ و، دێتە پێشەوە. پیاوێکی چوارشانەیە و چوار پەلی تۆکمەیە. زەوی و زار و مەڕو ماڵاتێکی زۆری هەیە. لە دەم چۆمەکەی بەری پارێزگای کۆتز دەژی. دیواری حەوشە و باغەکەی نیوەی شیوەکەی داگرتووە. دەڵێ:

ـ کامە شۆڕش؟ هەی تەوەزەلینە. کام شۆڕش؟ پێتان وایە ئەگەر عەمبارەکانی ئاغاکان بسووتێنن، جووقەواریان دەبڕێتەوە؟ یان ئەگەر دەستتان بە چەند کەسێکیان را بگا و بیانکوژن، پێتان وایە دەبنە خاوەنی زەوییەکانیان؟ تەڕی ناخۆن! بەو کارە کەرانەیەی خۆتان، هەر خۆتان دەخەنە داوی قانوونەوە. قانوون پیرۆزە. نابێ خۆی لێ بدەن.

پێترێ زگامایە لێی وەردەسووڕێتەوە:

ـ زەوییەکانی خۆشتت لێ دەستێنین. بەڵێ، ئی تۆش. بێچووە دەوڵەمەندی تازە پێگەیشتوو. بەسەری بابت زۆرمان گوێ لە قانوونە. خۆ ئێمە قانووغان دانەناوە. ئەوانەی داشیان ناوە، خۆ لە ئێمەیان نەپرسیوە ئاخۆ پێمان خۆشە یان نا.

ئەو پێترێیە، لە هەرە هەژار و دەستکورتەکانی ئاواییە. جاری وایە دەشتەوانە و جاری وایە بەرازەوان. جا کامەیان نانی باشتری تێدا بێ. خۆی داوەتە سەر تێلاّ زل و ئەستوورەکەی. کەس بەچاوی خۆی نەیدیتووە ئەو زگامایە دەستی بەتاڵ بێ. تێلاّکەی وەك بەشێکی خۆی لێ هاتووە. کە دەشخەوێ هەر لە پشتەسەریەتی. وەك بڵێی هەمبانەیەکی پڕ زێڕی بە نێوقەدەوە هەڵواسیبێ و بترسێ نەکا لە خەوێدا لێی بدزن. بەڵام کەس لەو هەژارتر و لاتتر نییە. دار و نەداری، ژنێك و پێنج منداڵە و، جووتێك قاپقاپەی شڕ و دڕاو و، کراسێکی پینەکراو و کۆنەپانتۆڵێك.

ـ باش دەزانم کاراباش، دەزانم تۆ پێت خۆش نییە خەڵك عەمبارەکان بسووتێنن.

لەوە تۆقیوی نەکا زەوییەکەی خۆشت داگیر بکەن. بەڵام نا، ئەرخەیان بە جارێ کەس کاری بەتۆ نییە. ئەگەر کالەت هەڵبەستی و وەك ئێمە جلوبەرگت لەبەر بکەی، بەخۆمانەت دەزانین، ئەگەرچی بە دڵیش لەگەڵمان نەبی. ئێمە دەمانەوێ خۆمان لەگەڵ ئاغاکان یەکلایی بکەینەوە. تۆش ئەگەر بتەوێ پێشمان بگری، دەمت دەشکێ. نەك تۆ و نە هەزاری وەك تۆ...

نیتزاپرۆکا دەڵێ:

ـ باشە چۆن شۆڕش بکەین؟ هەر ئەوانەی ئاغایان لە گوندەکەیان هەیە، دەتوانن شۆڕش بکەن. خۆ ئاواییەکەی ئێمە ئاغای لێ نییە، ئەی چۆن شۆڕش وەڕێ بخەین.

مارین رارۆ قسەکەی پێ دەبڕێ:

ـ سووتمانەکەی دوێ شەوتان دی؟ ئەگەر ئەمشەو لەم ئاواییە سووتان نەبینرێ، جووتیارە راپەڕیوەکان دێن تۆڵەمان لێ دەکەنەوە، کە بۆچی قۆڵمان هەڵنەماڵیوە. دێن و ماڵەکانمان دەسووتێنن. ئێستا کاتی ئەوەیە، ئیتر هەرچی رەشووڕووتە دەست بدەنە دەستی یەك.دروست نییە دانیشین خەڵك خەبات بکەن و سووتمان بکەن و ئێمەش دەست لەسەر دەست دانێین و لە گۆشەیەك پاڵی لێ بدەینەوە و ئەگەریش کارەکە سەری نەگرت بڵێین: "خۆ ئێمە دەستەوستان بووین." وا نیە براینە؟

ژنێك دەپرسێ:

ـ ئەی دەبێ چ بکەین؟ ماڵی کێ ئاگر بدەین؟

ـ ماڵی کاراباش... ماڵێکی جوانی هەیە و لەهیچی کەم نییە... ماڵێکە، ئاگر بگرێ، حەفتەیەکی رێك دەسووتێ.

ـ کوڕە ئەی هاوار. بۆچی ماڵی منی داماو دەسووتێنن؟ بۆ من ئاغام؟ ماڵەکەی مارێش بسووتێنن باشترە.

ئیۆڤیتزا مارێش مەیخانەچییە. خەڵکی ئاواییەکەی ئێمە نییە. ئەوەدەمەی براکانی دایکم لە ئۆمێدا دەڕۆیشتن، ئەو لە شارەکەی تەنیشتمانەوە هات و لێرە مەیخانەیەکی کردەوە. سامانێکی زۆری وەسەریەك ناوە. گوندی هەموو قەرزباری ئەون. هەر هەموو ئیرەیی پێ بدەن. کەس چاوی پێی هەڵنایە.

ـ وەڵڵا فکری چاکە.

پالیکا دەڵێ:

ـ کوڕە خۆ دوێشەوێ ئێمە وەمان نەگوت. ئەوە پێچەوانەی بڕیارەکەمانە.

پیچیکاش لەدووی دەدا:

ـ راست دەکا. بڕیارمان وە نەبوو.

دەنگیان لە نێو زەنازەنا و هاوارەکەدا بزر دەبێ. خەڵکەکە دەیانەوێ دەمودەست راپەڕن. تاقەتیان نەمابوو.

ئیڤان تزانترۆ دیسان دەڵێ:

ـ ئەوەی ئێمە دەبێ بیکەین، ئەوە نییە. لەپێشدا ئاغاکان. ئێمە دەبێ ئەوان لەکۆڵ بکەینەوە.

مەیخانەکەی مارێش دووهەنگاو لەولاوەی ناحیە. خەڵك دەچنە ژووری. مارێش کە دەیانبینێ، لە خۆشیان خەنی دەبێ. بەتایبەتی کە مەیخانەی دیکەش لە ئاواییدا هەن و یەکیان رێك بەرامبەریەتی.

ـ دەی باشە، فەرموون. پێڵاوتان سەرچاوم. چیتان بێنمە خزمەت؟

گیواکا دەڵێ:

ـ ئەگەر راستت دەوێ نەهاتووین خزمەتمان بکەی. هاتووین شۆڕش وەڕێ بخەین.

ـ دەی وەرێیی بخەن براینە، دەی... منیش لەگەڵ شۆڕشم، بە قەبری بابی ئاغا و دەرەبەگان.

زگامایێ دەڵێ:

ـ بەڵێ، دیارە. بەڵام هاتووین لێرەوە دەست پێ بکەین.

ـ جا چۆن؟

ـ ئێستا پێت دەڵێم. لە پێشدا تێر و پڕت تێ هەڵدەدەین و پشتت لە زگت نەرمتر دەکەین. دواییش ماڵ و حاڵت دەسووتێنین.

ـ چی؟ بۆ شێت بوون؟ بۆ لێم دەدەن؟ ماڵ و حاڵم بۆ لێ دەسووتێنن؟

ـ چونکە ئاغایەکمان وەگیر ناکەوێ بۆیە...

ـ جا باشە، پیاوی چاك، بۆ من ئاغام؟ خۆ من لە خۆتانم. منیش وەك ئێوە پێخواسم.

بێچکۆ دەڵێ:

ـ ئەگەر تۆش لە ئێمەی، ئەی بۆ لەسەر تەخت و دۆشەگی نەرم دەنووی و لەگەڵ ژنەکەت نوقڵ و نەبات دەخۆی؟

ئیلێ گاسکانۆ دەپرسێ:

ـ ئەگەر وەك خۆمانی، باشە ئەی بۆ وەك میرزاکەی ناحیە جلوبەرگ لەبەر دەکەی؟

زواکا، کە لەبەر وردیلەیی لە نێو خەڵکەکەدا دەڵێی زەنگیانەیە و دیار نییە، بەسەریدا دەنەڕێنێ:

ـ ئەگەر خۆمانەی، ئەی بۆچی کاتێ قەرزێکمان دەدەیەی، ئەو هەمووە سوودەی دەخەیە سەر؟

مارێش دەزانێ کار لە کار ترازاوە و ئیدی چاری ناچارە:

ـ باشە... باشە... زانیم مەسەلەکە چییە. لە راستیدا ئێوە لە من دڵمەند نین، چونکە من هیچ خراپەیەکم بۆتان نەبووە.

ـ خراپەت بۆ سۆرە و تۆرەشمان نییە.

ـ ئەوپەڕەکەی تۆزێك زیادەتان لێ دەستێنم. خۆشم ئەوە دەزانم. بەڵام، ئاخر کارەکەی من وایە و ناچارم. ئەگەر وا نەکەم، کارەکەم سەر ناگرێ. دەی باشە، یانی دەڵێن دەتانەوێ سووتمان وەرێ بخەن... با پێکەوە تەگبیرێکی لێ بکەین بزانین ئەمشەو ماڵی کێ بسووتێنین باشترە...

ـ ماڵەکەی خۆت دەسووتێنین، تێگەیشتی؟

ـ باشە، باشە. خۆ من ناتوانم پێشتان بگرم. هەر مەبەستم ئەوە بوو، بزانم بۆچی دەتانەوێ ماڵەکەی من بسووتێنن؟ باشە ئێوە هەر ئەوەتان ناوێ لە گوندەکانی دیکەوە دیار بێ کە لێرەش شتێك دەسووتێ؟ من لە پشت

جێخوونەکانەوە عەمبارە کایەکی زۆر گەورەم هەیە. ئەمشەو ئەوێ دەسووتێنین. خۆشمان بە سەتڵی ئاوەوە لە دەوری کۆ دەوبینەوە بۆ ئەوەی ئاگرەکە نەگاتە شوێنی دی. پێتان چۆنە؟

کاراباش بەپەلە دەنەڕێنیٚ: زۆر باشە،زۆر باشە.

تیزا ئۆییٚ بە نارەزایەتییەوە دەڵیٚ:

ـ هیچ باشیش نییە. بەڵام شتێکی دیکە هەیە، ئەگەر ئەویانت کردبا، زۆر باش دەبوو.

ـ چم کردبا؟

ـ ئەو دەفتەری حیسابات و قەرزانە بدەیە من و لە ئاگرەکەی باوێم.

ـ جا ئەوە چیە. چۆنت نادەمیٚ. بەسەر چاوم. بۆ نایدەم؟

ـ زگامایێ رازی دەبیٚ:

ـ جا ئاخر لەو وەزعەدا دەبیٚ لیٚوێکیشی بۆ تەڕ بکەین. باشە، چ بخۆینەوە؟

ـ حەزتان لە چیە؟

ـ بەرمیلێك شەراب.

مارێش، بەرمیلێك شەراب خلۆر دەکاتەوە و دەیهێنێتە پێش دووکان.

باوکم و پالیکا و باوە دەیڤید و کوڕەکان دەکشێنەوە و، مات و سەرسووڕماو سەیری ئەو خەڵکە دەکەن، کە وا لە خۆڕا خۆیان کەر کردووە. چاوەڕێن بەشکم بەخۆیانا بێنەوە، دیارە چاوەڕوانییەکەیان، چاوەڕوانییەکی بیٚ جێیە. چونکە خەڵك خۆی چاکە و خراپە لێك ناکاتەوە و، ئەقڵی وەبەرخۆی نایەتەوە.

چەند کەسێك تاسەبارانە، لە بەرمیلەکە دەچنە پێش و، دەست دەبەن بۆ ئەو پیاڵە شەرابانەی ژنەکەی مەیخانەچی لە سەر سینییەکەی داناون.

لەپڕێك دادە زواکا گورج وەك بزووت قەڵەمبازێك دەدا و خۆی دەخاتە نێوان ئەوان و بەرمیلەکە. چاوی کە هێشتا تار و لێڵن و، ئەوەندەی فرمێسك بۆ منداڵەکانی رشتووە کە ئەم زستانە لەبەر چاوی وەك گوڵ هەڵوەرین، هیچ هەستێکیان پێوە دیار نییە و، هەر دەڵێی لە پڕ پریسکێك دایگیرساندوونەوە. لەچکەی رەش و تەنوورەی رەش و بەروانەکەشی رەشە. کوڵمەی وەك زەعفەران زەرد هەڵگەڕاون و لێوی لە کوڵمەی زەردترن. بەڵام وەك بڵێی لە پڕ بەژن و باڵا وردیلەکەی، ئاگرێکی بیٚ ئامانی تیٚ بەربووە. ئاگرێکی بێئامان، کە سەرتاپای گڕ دەدا و، داهێزراوی و بێهێزییەکەی دەڕەوێنێتەوە و تینێکی تیٚ دەگێڕیٚ و، دەنگێکی بەتین و هێزێکی بەزاکوونی وەبەر دەنیٚ. دەستی هەڵدێنیٚ بەرەو لای ئەو کەسانەی دەوری بەرمیلەکەیان داوە، پەلاماریان دەدا و بە تووڕەییەوە پاڵیان پێوە دەنیٚ و دەیانکشێنێتەوە و یەکبەخۆی هاوار دەکا:

ـ بکشێنەوە. بکشێنەوە. هەی بێکارەی بەرەڵا و هەرچیوپەرچینە. ئەوە لێگەڕان ئەو سەگبابە، ئەو داردەستەی ئاغاکان بە بەرمیلە شەرابێك بتانخەڵەتێنێ و چەواشەتان بکا؟ ئەوە مانای چییە؟ ئەوە دامنا یەکی پیاڵەکیش شەرابتان لەو ورگە دڕاوەتان کرد، ئاخرییەکەی چی؟ تۆخوا یەکێکی خۆی بە پیاو بزانێ ئاوا دەکا؟ شەرم ناکەن؟ ئەی بۆ لەو زستانە وەیشووم و رەشەدا کە منداڵەکانمان لە برسان دەمردن، یەکێك نەهات بڵێ کەرتان بەچەندی؟ بەڵام ئێستا ئەو مەیخانەچییە هیچپووچە غەوارەیە هاتووە و بەرمیلێك لەو شەرابە گلاوە ژەهراوییەی لە سەر سەری دەگێڕێ و بە خێر دەتانداتێ؟ جا ئێوەی بەرەڵاش مەعامەلەکەی لێ قەبووڵ دەکەن... دەتانەوێ بزانن چ لە خێر و سەدەقەی ئەو غەوارەیە دەکەم؟... تف... تف...

تف دەکاتە نێو ئەو بەرمیلەی تازە سەرەکەیان هەڵپچڕیوە و لێوانلێوە لە شەرابی سوور. دیسان پەیتاپەیتا تفی تێ دەکا. دوایی پێی وایە هێشتا کەمە و بەس نییە. دادێتەوە و تەپاڵەیەکی گەورە هەڵدەگرێ و لە بەرمیلەکەی دەهاوێ. مست مست گووسەگ هەڵدەگرێ و تێی دەکا. دەستیشی لە شەرابەکەدا دەشوا و، بە تەشکی کراسەکەی وشکی دەکاتەوە. جا دەڵێ:

ـ یالا دەی، ئەگەر حەزتان لێیە، دیسان بخۆنەوە...

پاش ئەو هەمووە شتە، روو دەکاتە ئەو ژنانەی لە پشتەوە راوەستاون سەرسووڕماوانە زاریان داپچڕیوە و سەیری دەکەن، پێیان دەڵێ:

ـ ئەوە بۆ لاڵ بوون، بۆ وا وەك قاز راوەستاون و سەیرم دەکەن؟ یالا دەی دەست بدەنێ با ئەو بەرمیلە تووکلێکراوە قلپ بکەینەوە.

ژنان وێکڕا و بە هەڵەداوان دێنە پێشەوە و، پاڵ بە بەرمیلەکەوە دنێن. جارێك، دوو جار... ئەوەندەی پاڵ پێوە دەنێن، تا بازنەکانی دەترازێن و تەختە و پارچەکانی لێك بڵاو دەبن.

عەرزەکە دەسبەجێ شەرابەکە هەڵدەمژێ، چونکە بای بەهاری وشك و برینگی کردووەتەوە. ئەو بایەی هێشتا سۆزێکی سەرمای پێوەیە. بایەك، کە لە رۆژهەڵاتەوە دێ و ئەرخەوانەکان دادێنێتەوە و تەختە و دەستەکی سەربانەکان رادەژێنێ.

یەکێك لە نێو جەماوەرە بێدەنگەکەوە دەنەڕێنێ: هەی لەمنت کەوێ ژنە.

ـ مەیخانەچی و ژنەکەی فیزماڵکیان دایێ.

ـ بەپەلەپەل دەرگای دووکانیان گاڵە داوە.

ـ لە پشت دووکانەکە خۆیان شاردووەتەوە.

تیتزائۆیێ دەڵێ: ئەوانە دەبێ باشتریان لەگەڵ بجووڵێینەوە. جاری کاتی ئەوە نییە مەیخانەچییەکان تەمبێ بکەین. کاتی ئەوەش دێ. با جارێ مشوورێکی ئاغاکان بخۆین. راستە ئاغاکان لە ئۆمێدا کۆشك و دیوەخانیان نییە. بەڵام بۆ هەر چوار قوڕنەی ئەو ناوچەیە ئێمە بە سوخرە ناگرن؟ دەمانبەنە بانیاسا و کاری گراسێ گۆجمان پێ دەکەن. لە بلیتۆری نۆکەریی گۆگۆ کریستۆفەرمان پێ دەکەن و لە کارلیگاتزی ستاتێ ئاغا خوێنمان دەمژێ، لە سێکاراش بێگاریی پیەنارۆ دەکەین، کە کوێخاکەی دەڵێ، دەبێ خەتی شیوەکە باریك و قووڵ بن" ئەگینا بە قەمچییەکەی کراسمان لەبەردا دەدڕێنێ. تەنانەت گوندیی وا هەن، جگە لەو چوار دانگە زەوییە، دەچن لەسەر زەوی و زاری سائێلێش کار دەکەن. بەو حیسابە پێنج ئاغامان هەیە کە دەبێ لەگەڵیان لێکی دەرکەین و مشوورێکیان بخۆین. یالاّ، با بڕۆین و بە سووتمان و تێهەڵدان حیسابەکانمانیان لەگەڵ پاك بکەین و تۆڵەیان لێ بکەینەوە.

گوندی بەجۆش و خرۆشەوە دارەکانی سەر شانیان رادەوەشێنن و، یەکدەنگ هەرا دەکەن:

ـ راست دەکا، تیتزا راست دەکا.

ـ ئەو سەگبابانە جەندەرمەمان لەسەر دەکەن، بۆ ئەوەی بە شەقان بمانبەن و لە ملکەکانی ئەواندا بێگاریمان پێ بکەن.

ـ ناچارمان دەکەن، زەوییەکانی ئەوان رەعەمەل بێنین* .

ـ کوێخاکانیان وەك لە دز و پیاوکوژ هەڵدەن، ئاوا تێمان هەڵدەدەن.

ـ گۆگۆ کریستۆفەر پیاوی نارد بەزۆر کچەکەی منیان بردە کۆشەکەکەی، بێ ئابڕووی کرد.

ـ پیەنارۆ گوێی خۆی لێ دەخەوێنێ و رێك لە نێوەڕاستی زستانێدا دێ دەڵێ گەنمەشامی هەڵدەگرینەوە. ئەودەمەی ئیدی گەنمەشامی لە بن بەفر و باران رزیوە.

ـ کوڕە خۆ بابیان گاین هێندەیان بێگاری پێ کردین.

ـ ورچە، لە کاتی ترێ ڕنیندا دەمبێنمان لە دەمی دەدا.

ـ لە کاتی وەرگرتنی ملکانەشدا، دەرپێکەشمان لەپێ دادەکەنن.

ـ قەرزەکانمان پێنج یەك لەسەر حیساب دەکەن.

ـ ئاغای ئێمە نۆ بە یەك.

ـ ئاغا سەگبابەکەی ئێمە، گەنمەشامیی رزیومان دەداتێ و، گەنمەشامیی تازەمان لێ دەستێنێتەوە.

ـ لە جێژنەکەی سەری ساڵێشدا، دەبێ ئەوان مازەپشتی بەرازەکانی ئێمە بە قوزەڵقورت بکەن.

ـ ئەو بیژووانە، هێلکە مریشکمان لە بازنە دەخەن، نەکا تۆزێك بچووکتر بن.

---

* رەعەمەلهێنان: رەنێوهێنان. هێنانەبەرهەم. پێڕاگەیشتن و کارلەسەرکردنی زەوی.

ـ کوڕە خۆ بنیادەم نین.

ـ سەگن.

ـ سەگی هارن.

ـ دەبێ بە مست و پێلەقە سەگتۆپیان بکەین.

ـ ئاگریان بدەین.

ـ جووقەواریان ببڕین.

ـ چیی دەبێ با ببێ.

ـ ئەگەر وێکڕا ڕاپەڕین، باشاریان دەکەین.

ـ بەرپرسانیش ناتوانن گوڵمان بگرن. ئەگەر بیانەوێ بمانکوژن، ئەوا دەبێ هەموو وڵات نوقمی خوێن بکەن.

ـ ئاغاکان هێندەش زۆر نین.

ـ ڕاستە، بەڵام زۆر و دەسەڵاتیان هەیە.

ـ ڕاستە، چونکە شیلەی ئێسقانی ئێمە دەمژن.

حەشیمەتەکە وێکڕا دەجمێ و هەرا دەکا:

ـ با بڕۆین، با هەر ئێستا بکەوینە ڕێ.

هەواکە بۆنی شەرابێکی لێ دێ، بەسەر خۆڵەمێشیاندا کردبێ. بۆنی دووکەڵی لێ دێ. لە ناحیە چۆلەکوژ دیار نییە. سکرتێرەکەی ناحیە خۆی شاردووەتەوە. قایمقامیش هەروا. ئیۆرگیۆ گێدیای پیتاکوەرگر، خۆی خستووەتە سەر خوانی زین و نێوبڕ بە نێو مەزراکاندا بە لینگدان خۆی گەیاندووەتە شاری.

تازەپێگەیشتووەکان لە ترسان زەندەقیان چووە.

نیکۆلا دیمۆزێلی پوورم وازی لە کڵاوە ڕەنگاوڕەنگەکەی هێناوە. ئەوە یەکەم جارە دەبینین لە کاتی ڕۆیشتنیدا بۆ پۆستخانە، ئەو کڵاوە چەرمینەی لەسەر کردوە، کە بە ئەمانەت لە ئیانکۆی برای وەرگرتووە. پۆلینی ژنیشی پەردەکانی داداوەتەوە، ناوێرێ بێتە حەوشە یان خۆی دەربخا. بە مێردەکەی دەڵێ:

ـ نیکۆلای، گوندی ڕاپەڕیون. دەمانکوژن.

ـ باشە بۆچی دەمانکوژن؟

ـ نازانم، بەڵام دێن دەمانکوژن.

خۆی نەخۆش دەخا و پەڕۆیەك تەڕ دەکا و لەسەری خۆی دەبەستێ.

ئەو شتانە، پوورە دینای دایکی نیکۆلای بۆمان دەگێڕێتەوە، کە کەڕەی بەیانی دێتە ماڵمان.

ـ یالاّ دەی، دەبێ بڕۆین. لە کوێوە دەست پێ بکەین؟

ـ بە رای من لە کارلیگاتری.

تا کارلیگاتری، دوو گوندی دیکەمان لەپێشن و دەبێ بەوێدا بڕۆین. ئەو دووگوندە ئەوەندە لێك نزیكن، هەر دەڵێی شارەدێیەکە. هەر نیوسەعاتێك لێك دوورن.

ڕێیەکەی پڕپێچ و گەوە. ئەگەر بنیادەم بەپەلە بێ، دەبێ بە نێو شاخ و داخەکاندا قەدبڕ لێی بدا. بە گۆرگاندا بەرەو ژوور هەڵکشێ و لەولاشەوە خلۆر بێتەوە و گردێکی دیکەش ببڕێ تا بگاتە کارلیگاتزی.

تیتزا ئۆیێ وەپێش کەوتووە. پالیکا و کۆمەڵێك خەڵکی دیکەش شان بە شانی دەڕۆن و، بەدواشیاندا خەڵکەکەی دیکەی ئاوەدانی بە ژن و منداڵەوە... پیاوان لە پێشەوە و ژنانیش بەدوایاندا.

تیتزا بە روویەکی گرژەوە بە ژنەکەی دەڵێ:

ـ تۆ دێی چ گوویەك دەخۆی؟

دەیەوێ لە نیوەی ڕێیە بیگێڕێتەوە، بەڵام ژنە هەڵدەچێ:

ـ نەکا پێت وابێ لەبەر تۆ دێم؟ من لە داروودەستەی تۆ نیم. من لای شۆڕشم. تەواو. ئەی بۆ من بنیادەم نیم؟ ئێمە خەریکین لە بن باری کاری زەویوزاردا گیانمان دەرچێ، بۆیە ئەگەر شۆڕشێك دەکرێ، دەبێ هەمووانی تێدا بین.

ژنان یەکدەنگ دەڵێن: قسەکەت راستە.

ـ لەوانەیە تۆزێك لە دواوەتر راوەستین. بەڵام پشتتان بەرنادەین. لە کۆشکی ئاغاشدا هەندێ کاروبارمان هەیە دەبێ رایانپەڕێنین، دەبینە پشتیوانێکیش بۆ ئێوە.

ئێمە منداڵەکانیش لە بەر دەست و پێی ژن و پیاواندا دەخولێینەوە.

ئیۆنی برام شان بە شانی ئاواڵەکانی لە گردەکە سەر دەکەوێ. لەگەڵ ئاڤێندێرا و دیناکا و ئیشپاش. من و داروودەستەکەشمان لێیان دوا نەکەوتووین. شان بە شانیان هەنگاو دەنێین، بەڵام کە گەیشتینە سەر شاخەکە، وەپێشیان دەکەوین. لەو سەرەوە، گوندە راپەڕیوەکە وەك لەپی دەست لێت دیارە. بڵێسەی ئەو ئاگرەی دوێ شەو دەگەیشتە ئاسمان، لێرەوە بوو. هەر لۆدە کایەکان سووتاون.

هەنگاومان خۆشتر دەکەین و... دەگەینێ. پیاوەکانیش دەگەنێ و، ژنانیش بەدوویاندا. هەموو خەڵکی ئاوایی لەبەردەمماڵەکەی ئاغا کۆ بوونەتەوە و تێك چڕژاون.

دیوارێکی بەرز بە دەوری حەوشەکەدا کێشراوە. دەرگا گەورە ئاسنەکانیان لە ژوورەوە کلۆم داوە و، کوێخا و ئێشکگر دەست لەسەر پەلەپیتکەی تفەنگ لە پشت دەرگاکانەوە راوەستاون. خەڵکی کاریگاتزی وەك خیز و خۆڵ جنێویان بەسەردا دەبارێنن:

ـ دەرگاکان بکەنەوە، دەمانەوێ ئاغا ببینین.

ـ ئاغا لەماڵ نیە.

ـ زۆر باشە، با نەبێ، ئێوە دەرگاکان بکەنەوە.

ـ نابێ.

ـ بە ئاڵودار دەیانشکێنین.

دەنگێك لە پشت دەرگاوە دەڵێ: بێنە پێشەوە تەقەتان لێ دەکەین.

خەڵکەکە هاوار دەکەن: ئەگەر کوڕی باوکتانن تەقە بکەن. لووتی یەکێك لە خوێن بێ، هەمووتان دەئەنجنین.

ئاڵودارێکی قورسیان لە حەوشەکەی ناحیەدا دۆزیەوە. دە پیاو هەڵیانگرت و هێنایان و لەبەر دەرگاکە راوەستان، چەند هەنگاوێك لێی کشانەوە و بە هەموو تینی خۆیان ئاڵودارەکەیان بە تایەکی دەرگاکەدا دا. وەك تۆپ دەنگی هات و لەرزی، بەڵام مێشێکی لێ میوان نەبوو.

ـ دیسانیش...

ـ دیسانیش...

ـ دیسانیش...

دەرگاکە دەلەقێ. چەند پیاوی دیکەش دێنە یارمەتییان. ژنەکانیش دێنە پێشێ و، زواکا وردیلەکەشیان لەگەڵە.

ـ یاڵا دەی...

ئالۆدارەکە دیسان بە دەروازەکەدا ـ کە تەقە و شەقەی دێ ـ دادەرێ. کلۆمەکەی دەپەڕێ و دەرگا دەکەوێتە سەر پشت. سێ چوار نۆکەر کلکیان لە گەلۆزیان دەنێن و رادەکەن. یەکێکیان تاپڕێکی لە شاندایە. خەڵکەکە دەیگرن و ئەوەندەی خوریشۆری دەکەن و بەجێی دێڵن. هەموو هرووژم دەکەینە حەوشەکە. تێکەڵ و پێکەڵ، پیاو، ژن، منداڵ.

کۆشکەکەی ئاغا سپییە و دەڵێی کولووی بەفرە. تا ئێستا پێم تێ نەناوە. ئای لەو پەنجەرە بەرز و گەورانە. خۆ لە پەنجەرەکانی قوتابخانەکەی دێیەکەی خۆشمان گەورەترن. پلیکانێکی بەردینی پانی لە بەر دەرگای ژوورەکەیەتی.

دچینە پێشەوە. وەی کە پەلەمانە. خۆمان بە ژوورێدا دەکەین و دەچینە دیوەخان. دەستمان بگاتە هەر شتێك بە عەرزیدا دەدەین.

چەند کەسێك بەرەو لای تەویلە و یەسترمەخان را دەکەن، کە پڕن لە ئەسپ و مانگا. یەسترمەخان درێژ و پانە. خەڵکەکە ئاگر بە بن میچەکانەوە دەنێن. هەتا بن میچ پڕن لە تفاق و ئالیفی وشك. یۆنجەی وشك گڕ دەگرێ. میچ و کادێن بڵێسەیان لێ هەڵدەستێ. تەویلە و یەسترمەخان بەو گەورەییەوە، یەکدابەدوو دەبنە خەرمانەی ئاگر. بای دێ. دووکەڵ و پزیسك و بڵێسە بەرەو ئاسمان هەڵدەکشێن. بایەکی توند هەڵیکردووە، حیلە و کوڕژنی ئەسپ و بۆڕەی گا و مانگا زراوچووەکان گوێی ئاسمان کەڕ دەکا. چەند کەسێکمان دەست دەدەینە دەستی یەك و بەرەو لای یەسترمەخانەکان دەڕۆین و دەرگاکان دەکەینەوە. ژوورەوە دەریایەکە لە ئاگر. هەر ساتەی ئەسپێك کە وەکوو مەشخەڵێك ئاگری لێ هەڵدەستێ دەردەپەڕێتە دەرەوە و دوو سێ جار بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە و خۆی بە نێو خەڵکەکەدا دەکا و وردە وردە خۆی ناگرێ و دەگەوزێ و دەسووتێ. بۆکرووزی سووتانەکەی دێ. دواجار لینگەفرتەیەك دەکا و پەڕەی لووتی دەلەرزێن و لەپڕ جووڵەی لێ دەبڕێ.

من سەیری ئەو ئەسپە دەکەم وا لە لای خۆم کەوتووە، چاوی تەقیوە و زگی وا برژاوە، دەڵێی یەکێك لەسەر ئاگر رایگرتووە. ئەی لەو بۆنەی. بۆنێکی قورس و خەست، بۆنی خۆڵەمێش، بۆنی بڵێسە، بۆنی گۆشتی سووتاو. ئیتر ئێستا کۆشکەکەی ئاغاش هەم دووکەڵی لێی هەستاوە و هەم ئاگر.

پیاوێکی سمێڵ بابڕ هاوار دەکا:

ـ ئاگاتان لێ بێ، ئاگادار بن کەس لە ژووریٚ نەمابێ.

کەس لەوێدا نەماوە. گوندی هەر بۆنی دووکەڵیان بەسەردا هاتووە، هەموو رایانکردووەتە دەرێ.

هەتیوێکی لاسار، چاکەتێکی کەوەی بەسەر شانیدا داوە، کە هەتا سەر ئەژنۆی دێ. سەیرێکی قاچوقولە رووتەکەی و کەشکەژنۆ چڵکنە کەمرەگرتووەکەی دەکا و، لە سەریانەوە چاکەتێکی پاکوخاوێنی قۆپچەبریقەدار، کە هیچ لەو قەڵافەتە ناکاڵێتەوە. دەستێکی پێدا دێنێ و دەڵێ:

ـ ئەمڕۆ ئیتر منیش بوومەتە ئاغا. چاکەتی ئاغایانم لەبەردایە. چاکەتی ئاغایەتیم کردووەتە بەر...

ـ ئاگات لە خۆت بێ، خووخدەی گڵاوی ئاغایان نەگری.

هەتیوەکە، بەرەو لای کۆشك ـ کە ئیتر ئێستا خەرمانەیەکە لە ئاگر ـ دەچێ، چاکەتەکە لە شانی دەکاتەوە و دەیخاتە نێو بڵێسەکان.

ـ ئەوە چ دەکەی؟ شمەکی ئاوا باشت بۆ لە ئاگرەکە هاویشت؟

ـ وا باشترە هەر وا رووت و قووت بم، نەك خولّق و خووی ئاغایان بگرم.

هەر بەراستی، کە چاکەتەکە فڕێ دەدا، رووت و قووت دەمێنێتەوە. کراسەکەی شڕشڕە و بە ئاستەم بە لەشییەوە گیر بووە. کراسێکی پەمۆی زبر و زووی لەسەر ئەو کراسەوە لەبەر کردووە، کە سەر ئانیشکەکانی خڕ دڕاوە.

یەسترمەخان دەسووتێن. گەوڕ دەسووتێن. ئاژەڵ دەبرژێن. ئێشکگر دیار نین و بێسەروشوێنن. چاودێرەکانیش هەروەتر. ئاغاژنیش هەر دیار نییە.

تیتزائۆیێ خەڵکەکە لە دەوری خۆی کۆ دەکاتەوە:

ـ ئێمە شۆڕشی خۆمان کردووە. جا براینە، با ئێستا بچینەوە سەر ماڵوحاڵی خۆمان. دەبێ دیسان کۆ بینەوە بزانین سبەی دەبێ چ بکەین.

دەچینەوە ئاواییەکەی خۆمان، با کارلیگاتزیچییەکان خۆیان بەتەنێ شۆڕشی خۆیان بکەن.

لێرەو لەوێ چەند سیمێکی تەلەفۆن دیارە پچڕاون. بە دارەکان هەڵدەگەڕێین و فەخفوورییەکانی سەریان بە بەرد دەشکێنین. کەس نەیگوتووە وا بکەن. هەر خۆمان وامان بە پێویست زانیوە لە شۆڕشێکی ئاوادا هەقی خۆمانە چیمان بە زەیندا هات بیکەین. بەر لە شۆڕشیش یەکێك لە گەمە و

خۆشییەکانی ئێمە ئەوە بوو، کە  فەخفوورەی سەر داری تەلەفۆن و تەلەگرافەکانی دەم ئاسنەڕێیەکە بشکێنین. تەنانەت منداڵی وامان لەگەڵ بوو، نەك یەك و دووان بگرە زۆر زۆریشیان شکاندبوو. ئەوەندە بوو، دەبوایە وریا بین جەندرمە و ئێشکگرەکان ئاگایان لێ نەبێ و نەمانگرن. ئێستا ئیتر نە ئێشکگری لێیە و نە جەرندەرەمەیەکیش. دەڵێی هەموو بوونەتە نانێك و سەگ خواردوونی. لەوانەشە هەر بەراست، بووبێنە دلۆپە ئاوێك و زەوی قووتی دابن...

ئاواییەکە سەیر قەوغایە. لە خۆشیان شاگەشکە بووین، کە چووینەتە یارمەتیی گوندییەکان بۆ سووتاندنی ماڵ و حاڵی ئاغا و مڵکەکەی کارلیگاتزی.

تاو دەپەڕێ. ئاسمانیش هەروا سوور داگەڕاوە. تا چاو هەتەر دەکا، هەر عەمبارە و دەسووتێ. هەرچی عەمبارە و هەرچی کۆشك و دیوەخانی ئاغان. کە جۆش و کوڵمان دادەمرکێتەوە، سەیر دەکەین، شەوگار شەق بووە.

ئیۆنی برام لە کۆشکەکەی کارلیگاتزییەوە، دەمە گاسنێکی لەگەڵ خۆی هێناوەتەوە. دەمە گاسنەکە زۆر قورسە. بەڵام ئینۆ توانیوێتی لەسەر شانی دابنێ و بەو گردانەدا سەری بخات  و بیهێنێتەوە خوارێ و بیگەیەنێتەوە ماڵێ. پێشانی بابمی دەدا و دەڵێ:

ـ سەیرکە چ دەمە گاسنێکی جوانم هێناوەتەوە باوکە. پۆڵای خالیسە. ئەگەر بیخەینە سەر گاسنەکەمان، جا بزانە شیوبڕینەکە چەندە خۆش دەبێ.

ـ کوڕە هەتیوە بێ مێشکە، نەتدیوە چەندە گەورەیە؟ ئەو دەمە بۆ گاسنی ئاغایان دەبێ نەك گاسنی قوونڕووتی وەك ئێمەمانان.

بەو حاڵەشەوە ئەم ئیۆنە زۆر هەوڵ دەدا لە گاسنەکەی خۆمانی بکا. بەڵام ئیدی لێی روون دەبێتەوە دەمەگاسنی ئاغایانە و، هەڵگرتن و هێنانەوەی لەوێڕا کەرێتییەکی گەورە بووە.

ـ ئەی چیی لێ بکەم؟

ـ چووزانم. بیبە لە باخەکەدا لە گۆشەیەك بیخە بن گڵ. بەشکم رۆژێك پێویستمان پێی بوو.

ئیۆن دەست دەداتە پێمەڕەکە و دەچێ قوڵکەیەك لە نێو باخەکە هەڵدەکەنێ و دەمەگاسنەکەی تێ داوێ و بە کا و کلۆش و پووش دایدەپۆشێ بۆ ئەوەی دیار نەبێ.

دایکم دەڵێ، دەی باشە، یانی پێتان وایە بەو شۆڕشەتان کێری فیلتان شکاندووە؟ جا ئەم جارە ئاغا قۆشەن و لەشکرمان دێننە سەر و رەحم بەکەس ناکەن و جووقەوارمان لێ دەبڕن.

ـ دوور نییە هەر وابێ. بەڵام تۆ بڵێ، ئەوەمان نەکردبایە، چیمان کردبا؟ هەموو ئاوایییەکان راپەڕیون بۆ زەویوزار. خۆ ئاخری دەبێ رۆژێك خۆمان لەگەڵ ئاغا و نۆکەر و بابنۆکەرەکانیان یەکلا بکەینەوە. ئەگینا خاکمان بەتوورەکە دەکێشن. ئەی نابینی چەند سەر خێزان لەسەر یەك سفرە دانیشتووین؟

دوازدە کەسین لە دەوری سفرەیەك کۆ بووینەتەوە. سفرەکە بچووك و خڕە. هەموو پاڵمان بەیەکەوە داوە و پاڵەپەستۆمانە. دایکم مامالیگایەك، کە لەنێوەڕاستی سفرەکە هەڵمی لێ هەڵدەستێ، بە دەزووەك بەشی دەکا. هەر کەسە و لەتێك هەڵدەگرین ولەپێش خۆمانی دادەنێین. دایکم مەنجەڵێکی گەورە، کە سووپی سەوزەی تێدا دروست کردووە، لە نێوەڕاستی سفرەکە دادەنێ. لە ماڵێ کەوچك بەشی هەمووومان نییە. من و ئێڤانگلین بە کەوچکێك نان دەخۆین. من پارووەك هەڵدەگرم، کەوچکەکەی دەدەمە ئەو. ئەویش کەوچکێك دەخوا و دەیداتەوە بە من.

لە دێیەکەماندا خێزان هەیە هەشت کەسن و، یەك کەوچکیان هەیە. لە سەر سفرە کەوچکەکان دەستاودەست دەیگێڕن. باشترە بە ئێمە بڵێن خێزانە تێروپڕەکان. ئاخر هەر نەبێ پێنج کەوچکمان هەیە.

دایکم دیسان دەڵێ:

ـ پێتان وایە ئاغا دەهێڵن وەك چەپکەگوڵ سەریان بقرتێنن؟ وای دانێ ئەوانەی لێرەن، هەمووشتان کوشتن، ئەی ئەوانی دیکە چ لێ دەکەن؟ ئەوانەی بۆی دەرچوون؟ ئەوان سەرباز هەڵدەگرن و دێنەوە سەرتان.

ـ منیش هەر وای بۆدەچم.

هیچترووسکایییەك لە چاوی باوکمدا نییە. هیچ رووناکایییەك لە روخساریدا نییە. ئەمڕۆ بەشداری راپەڕین بووە، سبەینێش دیسان دەچێتەوە بۆ سوتمان.

شەو بەسەردا هاتووە. رەش، قورس، شیر نایبڕێ.

ـ با بخەوین. بخەوین بزانین سبەی چیمان بەسەر دێ.

خەڵك رادەكشێن. شەوگەڕ لە كۆڵان و لاكۆڵاناندا دەخولێنەوە و دڵنیان لەوەی كەس خەوی نەچووەتە چاو. هەر ساتە و دەنگی دەرگایەك دێ. گوندی بەردەوام بەبێدەنگی لە ماڵ وەدەردەكەون و گوێ هەڵدەخەن بزانن دەنگ و سریوەیەك دێ یان نا، بەڵام هیچ دەنگێكی نامۆ نایە. تەنیا ئاسۆیە جار و بارە سوور دەچێتەوە، ئەوە سووری عەمبار و كادێنەكانە، كە دەسووتێن. هیی ماڵی ئاغاكانە، كە بڵێسەی دێ.

دنیا هەتا چاو هەتەر دەكا، ئاسمانەكەی سارد و ساوە و ئەستێرەكانی دەڵێی لە بێژینگت داون. ئاسمان ئاسمانەكە بە هەزاران چاو، لە بنیادەمەكان راماوە.

بە چاوی ئەستێرەكانی، بە چاوە تررووسكەدارەكانی.

ئێمە لە هەموو جێیەك خزم و كەسمان هەیە. بە درێژایی دانوب و تەنانەت لە دەم رووبارەكەی ئۆڵتیش، جا هەر لە كەنارەكانییەوە، تا دەگاتە سلاویتزێشتی، كە سەرچاوەكەیەتی. خزم و كەسەكانی دەم چۆمی دانوب كەم دەبینین و، خزمانی ئۆڵتیش لەوان كەمتر. هەر دوو بەری ئۆڵت مێرگ و دارستانی پان و بەرینی لێیە. زستانان كە بۆ كڕینی عارەبانەیەك وشكەڵەدار دەچینە ئەوێ، پارەی دارەكان نادەین، چونكە قەت پارەمان بەدەستەوە نییە. باوكم سواری عارەبانەكە دەبێ و منیش خۆم دەخزێنمە بن باڵی و، پێكەوە بەرەو لای سایلێ وەڕێ دەكەوین. رێگا پڕ پێچ و گەوەكە، بە نێوەڕاستی كێڵگەكانی گەنمەشامیدا تێدەپەڕێ. تەنگی ئێوارە دەگەینێ . باوكم ئێشكگرەكەی دارستان دەدۆزێتەوە:

ـ ئەرێ عارەبانەیەكم لك و پۆی داران دەدەیتێ؟

ـ ئەی بۆ نایدەم.

لە تەنیشت عارەبانەكە ئاگرێكی گەورە دەكەینەوە بۆ ئەوەی گەرم بینەوە. پاییزێكی كەوەیە.

گەنمەشامییەك دەبرژێنین، دەیخۆین و دەخەوین. باوكم ئامۆژگاریم دەكا و پێم دەڵێ لە عارەبانەكەدا بنوم. دەترسێ سەرمام بێ. كۆنەراخەرەكە لەخۆم وەردەپێچم. باوكم لە تەنیشت ئاگرەكە خۆی گرمۆڵە دەكا و كلاوە چەرمینەكەی دەكێشێتە سەر گوێچكەكانی و پاڵتۆكەی بەخۆیدا دەدا و، پاش ئەوەی چەند جگەرەیەك بەبادا دەكا، دەنوێ.

گایەکانیش کە بەستراونەوە، دەخەون. خرمەی کاوێژکردنیان دەبیستم. شەوێ لە شوێنێکی کراوە و بێ داری نێو دارستانەکەدا ڕۆژ دەکەینەوە. دەوروبەرمان، پڕە لە باڵندە و بە زمانی خۆیان بانگی یەکتر دەکەن. داری دارستانەکە، بەرز و تێك ئالاون و، مارمێلکەی سەوز و خۆڵەمێشی و مشکی ڕەش خۆیان لەبندا دەشارنەوە. ژیانی ڕاستەقینەی دارستان، شەوانە دەست پێ دەکا. لەبەر چاوم هەر دەڵێی کۆمەڵێك باڵندەی زەبەلاح لە تاریکاییەکەدا باڵیان لێك کردووەتەوە و نابزوون. ئەوەی دەبینیم، لەبەر دیدەی خەیاڵمە، ئەگینا چاوی خۆم لە ئاسمانە کووڕەکەی ژوورسەرمان زیاتر چ نابینێ. کەڕەی بەیانی لەخەو هەڵدەستم. لە ڕاستیدا ئەوە دارستانەکەیە وەخەبەرم دێنێ. قاوقیژێکە مەگەر خوا بزانێ.

پووشی پاییز خووساوە. بەپێخواسی بەسەریدا دەڕۆم. قاچەکانم دەشۆنەوە. دەستیان لە نێو دەگێڕم بۆ ئەوەی ئەوانیش بشۆنەوە. خۆرەتاو، لە ئاسمانەکەدا کە لەپێشدا زەردە و دوایی شین دادەگەڕێ، زۆر خێرا بەرز دەبێتەوە. هەتاوەکە گەش و شێدارە. هەر دەڵێی ئەویش، لەو دوور دوورەی کە خەوتبوو، لە نێو گژ و گیا تەڕەکاندا گەوزیوە و، گژ و گیا بە شەونمی خۆیان دەموچاویان بۆ شوشتووە.

جەنگەڵوانەکە، تفەنگێك لە شاندا، سەروسەکتی دەردەکەوێ. هەمیشە بە سواری لە نێو دارستانەکەدا دەگەڕێ. دەستی بۆ گۆشەیەکی دارستانەکە ڕادەدێرێ و دەڵێ:

ـ ئەوانەن تودۆر، ئەو دارانەن کە دەبێ بیانبڕین. چەند لك و پۆت پێ بڕدرا، سواری عارەبانەکەتیان بکە و بیانبەوە ماڵێ.

ـ ماڵت ئاوەدان بێ.

ـ دیارە قازیشت بۆ ئاغا هێناوە.

ـ بەڵێ، هێناومە.

ـ بێدە بە من.

قازەکە وەردەگرێ و دەڕوا. باوکم قۆڵی لێ هەڵدەماڵێ و دەست دەکا بە بڕینی دارەکان. تەورەکە تەواو لە دارەکەدا نوقم دەبێ. تەڵاشە دار بە هەمووولادا بڵاو دەبنەوە. کە دارەکە بە هاشوهووش و

قرچەقرچ بەلادا دێ، من خۆم لادەدەم. باوکم تەورێکی بچووکی بۆ منیش هێناوە. دەچمە سەر پشتی دارە کەوتووەکە و، لکوپۆی دەبڕم و دەیانبەمە تەنیشت عارەبانەکە لەسەر یەکیان دادەنێم.

ڕۆژەکە ئاوا دەبێتە شەو.

باوکم بە جەنگەڵوانەکەی گوتبوو: گیتزا، ئەرێ بەسەر پێیەکەوە، سەرێك لە گابۆنیای ئامۆزام هەڵدێنی؟ پێی بڵێ، من لە دارستانەکەم و بێ چاوێکم پێی بکەوێ.

ئامۆزاکەی باوکیشم تەورێك لەسەر شان، دەگاتێ و لە بڕینی دارەکاندا یارمەتیمان دەدا. بە دەم کارەوە، باسی کێشە و گرفتەکانیان دەکەن و پرێسکەی دڵیان بۆ یەکتر دەکەنەوە و کوڵی دڵیان هەڵدەڕێژن. مامە تاکیتزا گابۆنیا، لەو خزم و کەسانە دەپرسێ، کە چەندی چەند ساڵە نەیدیتوون. باوکیشم لە خزم و کەسەکانی دۆڵی ئۆڵت دەپرسێ. ئەوانەی لەو ماوەیەدا مردوون، ئەوانەی ژنیان هێناوە و مێردیان کردووە، کێ و بەکێ؟ ئەو منداڵانەی لەو ماوەیەدا لەدایك بوون...

ئیۆڤانیش مرد و سەری نایەوە...

من لە هێلانەی مەل و باڵندان دەگەڕێم و بە داران هەڵدەگەڕێم. لە هێلانەکاندا هێلکەی کەسك کەسك دەدۆزمەوە، کە خەتی شین شینیان بەدەوردا هاتووە. لە هێلانە دەیانهێنمە دەرێ و ، گەمەیان پێدەکەم و دەیانشکێنم. جاری وایە لە هێلانەکاندا جووچکەی وا دەدۆزمەوە، سەریان زل و دەنووکیان درێژە. دەستێك بە تووکە نەرمۆڵەکەیان دا دێنم و وازیان لێ دێنم...

مامە تاکیتزام لە پارەکە ئەوەدەمانەوە نەدیتووە. ئۆڵت خۆ بستێك لەولای دێیەکەمانەوە نییە، کە هەر کات حەزت لێ بوو بچی. ساڵێ جارێکیش هەر ئەستەمە.

لە نەکاو سەگەکانمان دەوەڕن. سەگی دراوسێش دەست بە وەڕین دەکەن. تڕیان بووەتە تۆپ. پاتاڵ لە برسان قڕیان تێ کەوتووە، خەڵك کەلاکیان هێناون و لە پشت ئاوەدانی فڕێیان داون، ئەو سەگانەی لە سەرمای زستانێ خەلەستوون و نەتۆپیون، تێر زگی خۆیان خواردووە.

یەکێك لە دەرگا دەدا. باوکم دەچێ دەیکاتەوە و لەگەڵ پیاوێکی دیکە دێتەوە:

ـ ژنێ، چراکە داگیرسێنە.

مامەتاکیزا گابۆنیایە. کڵاوە سپییە چەرمە مەڕەکەی دادەنێ و لەسەر لێواری تەختەکە دادەنیشێ.

نیوه شەوە. سەرمان لە بن لێفەکە دێنینە دەرێ. هیچ کاممان خەومان لێ نەکەوتووە. نەك هەر دایك و بابمان، بگرە ئیۆنی براشم کە هەتا نوێژی نیوەڕۆیە لەخەو هەڵناستێ، هەر نەخەوتووە.

ـ چ قەوماوە گابۆنیا؟

مامە گابۆنیا زۆر لە باوکم لاوترە.

ـ وەزعەکە شڕە کاکە تودۆر. زۆر شپرزە. هاتووم لە ماڵەکەی تۆ خۆم بشارمەوە. لە ئۆڵت هیچ شتێك ئاداری بەسەر پادارەوە نەماوە.

ـ باشە لەوێ چ قەوماوە؟

ـ کوڕە شۆڕش و مۆڕش و شتی وایە، ئەی لێرە نەبووە؟

ـ چۆن نەبووە؟ لە کارلی گاتزی. سبەینێش لە سێکارا. دیارە ئێمە پێرێ شەو هەندێ سووتاندمان لە لای ئۆڵت دی.

ـ ئەوە دەڵێی چی؟ لە گرایۆڤاوە دیتوویانە، چۆن لێرەوە نایبینی؟ بەحاڵی سەگ توانیومە خۆم قوتار بکەم. خوێن و ترسێك هرووژمی بۆ دۆڵی ئۆڵت هێناوە هەر مەپرسە.

ـ بۆم بگێڕەوە بزانم چ بووە.

دایکم چووەتە دەرێ. چووە لە راڕەوەکەدا لەتێك مامالیگا بۆ مامەتاکیتزا بێنێ.

ـ تاکیتزا، دیارە هیچیشت نەخواردووە.

ـ دەمم لە هیچ نەداوە خوشکە ماریا. لە پێرێوە زەوادم نەشکاوە.

دایکم لە تەنیشت تەختەکە سفرەیەك رادەخا.

ـ منداڵینە قاچتان کۆ بکەنەوە. لەگەڵ ئێوەمە رۆڵە.

پیازی بۆ دێنێ. لە پیاڵەیەکدا تۆزێکیش خوێ. مامم پیازەکە بە مستەکۆڵەیەك ورد دەکا و، لەتێکی لە خوێیەکە وەردەدا و بە مامالیگاوە دەیخوا. شەویلکەی جیڕەیان دێ. پیازەکە زۆر تیژە. چاوم دەبرژێنەوە. مامە گابۆنیا چاوی وەك چاوی من ناسك نین. یەکپشوو دەخوا. پاروو بەدوای پاروودا. لە گەڵ پاروەکانیشدا دەگێڕێتەوە:

ـ ئێمە دیتمان، لە چەند جێی ئەوبەری ئۆڵتەوە ئاگر هەستا. گوتمان با بە ئەسپ یەکێك بنێرین بزانین چ بووە. کوڕەکەی جیگانیێ گوتی من دەچم. چوو. سەیر دەکا ئەوە گوندییەکانی لیۆ راپەڕیون و ئاغای دێیەکەیان کوشتووە و کۆشك و دیوەخانیان لێ ئاگر داوە. ئیتر لێی روون بۆوە، کە هەموو خەڵکی ئەوبەری ئۆڵت راپەڕیون و ئاغایان کوشتووە، بۆ ئەوەی کەس کۆیلە و دیل نەبێ و خۆیان دەست بەسەر زەویوزارەکاندا بگرن. هەتیوەکەی جیگانیێ وەك برووسکە و بای شەماڵ هاتەوە و خۆی گەیاندەوە ئاوەدانی و گوتی: "شۆڕش، شۆڕش، ئاغاکان بکوژن، لە هەموو دێیەکان، وەرزێر بەربوونەتە ئاغا کوشتنێ. ئەگەر ئێمەش رانەپەڕین و هەر ئەمڕۆ ئاغاکانمان نەکوژین، گوندیی ئەوبەری ئۆڵت دێن دەیانکوژن و زەوییەکانیش داگیر دەکەن و بەسەر خۆیاندا دابەشیان دەکەن." دەی ئیتر. کوێر چیت دەوێ، دوو چاوی ساغ. وەك دەڵێن کار لە کار ترازابوو. زۆر دەمێك بوو بیرمان لە راپەڕین و شۆڕش دەکردەوە، لە بەرخۆمانەوە هەر دەمانگوت: "با تۆزێکی دیکەش راوەستین، بەشکم خەڵکیش بیانەوێ راپەڕن." ئەگەر بێت و هەر یەك ئاوایی راپەڕێ، ئەوا بەرپرسان دەیدەنە بەر رەهێڵەی تۆپ. بەڵام ئەگەر هەمووان وێکڕا راپەڕن، ئیتر ئەوکات وەزعەکە دەگۆڕێ. ئێستاش ئەوە ئاگادار کراوینەوە، کە هەموو وڵات هەستاوە. لەمسەرەوە تا ئەوسەری... ئەتۆ تودۆر، ئاغای ئەم ملکە دەناسی؟

ـ وەڵا پێم وایە.

ـ ئاغا زاگۆریتزی سەگباب، هێندەی شەیتان دەستی دەڕوا. زیاتر لە بۆخارێست دەژی. هەر بۆ یەکلاکردنەوەی هەق و حیسابەکانی دێتەوە ئاوایی. زیاتر کوڕەکەی بەسەر ملکەکانی رادەکا، کە ملازمێکی سوپایە. سەرت نەیەشێنم، هەر وەك گوتم هەموو کۆ بووینەوە و لەبەر دەم ناحیە و، کێ چیی لە دڵدا بوو، گوتی. کاتمان زۆر نەبوو. جیگانیێ بەرەبەری ئێوارێ هەواڵی شۆڕشەکەی بۆ هێنابووین. حەوشەی کۆشکەکەی ئاغا، دیوارێکی بەردینی ئەستووری هەیە. دەرگاکانی لە دار بەڕوون. لەودیو دەرگاکانیشەوە، سەگەلی یانیگر دەسووڕێنەوە، کە هێندەی گەلەگورگێك برسین و، بێت و یەکێك نەناسن، ورد و پردی دەکەن. چرایەکی گەورەشیان داناوە، کە هەر چوارقوڕنەی حەوشەکە وەك رۆژ رووناك دەکاتەوە.... بڕیارمان دا، ئەوەندە راوەستین تا شەو بەسەردا دێ.

ئەنگوستەچاوێك بوو، شیر نەیدەبڕی. ئێمەش کە لە بەردەم ناحیە کۆ ببووینەوە، دووسەدکەسێك دەبووین. زۆرم حەز لێ بوو منیش بچمە نێو کۆشکەکەی ئاغا. ئەگەر راستیت دەوێ، دەمویست و نەشمدەویست. ئیتر ئیانکۆداکین وەپێش کەوت. خۆ باشی دەناسی. خەڵکی خوا ناویان ناوە شێتە. دیارە شێت نییە، تۆزێك بێمێشکە. نازانێ ترس و مرس چییە. دیمۆدینکا و ئیۆن گیمپالێشی لەگەڵ بوون. گیمپالێ چووە حەوشەکەی ناحیە و چوارپێچکەیەکی لەبن پێی نا. ژنەکانیشمان لەگەڵمان بوون. منداڵەکانیش سەرەڕای ئەوەی شەویشدا هاتبوو، هەر هاتبوون. گیمپالێ دەستی کرد بە قسەکردن:

ـ دەچین کۆشکەکە دەسووتێنین. ئاغا لێرە نییە، خۆ دەستمان پێی راگەیبایە، پشتیمان لە زگی نەرمتر دەکرد. بەڵام قەیناکا، خۆ کوێخامان لەبەر دەستە:

دایکی ئەو ستفانسکۆ گەوادە، رەشپۆش دەکەین. ئێمە بە هەر نرخێکی بێ، دەبێ راپەڕین. کەس هەیە لەگەڵمان نەبێ؟ ئەگەر یەکێك هەیە، با خۆی ئاشکرا بکا، با پێی بڵێین پووتێك چەند کیلۆیە.

لە تەنیشت گیمپالێوە دەنگی دارجۆی هات. نەتدەناسی؟ لەو دنیایە لەوی بێعارتر و ناشیرینتر و زۆڵتر و نارەسەنتر تێدا نییە.

بابم دەڵێ:

ـ کوڕە چۆن نایناسم... پێکەوە لە سەربازی لەبەشی سوارچاکاندا بووین. کە سوار دەبوو، بارگینەکە لە بنیدا تڕ لە سەر تڕ لێی بەردەبوو.

ـ ئیتر دارجۆ هەرای کرد: "کێ لەگەڵمان نایە؟ کەس هەیە بترسێ؟ کورتی ببڕمەوە، ئەگەر بزانم یەکێك هەیە خۆی دەدزێتەوە یان فیزماڵکی دەداتێ، هەر لێرە ورگی دەدڕم. یاڵا دەی بکەونە رێ، وەشوێنمان بکەون.

ئەوان وەپێش کەوتن. ئێمەش بەشوێنیاندا.

بە کۆڵانە پرپێچ و خەمەکاندا زۆر کەس کەلکیان لە تاریکی وەرگرت و خۆیان دزییەوە. هەندێ لە بن پەرژینەکان خۆیان حەشار دا. هەندێ هەوڵیان دا خۆیان بەدوا دەن. سەرەڕای ئەوەش، کە گەیشتینە کۆشکی ئاغا، جگە لە ژن و منداڵەکان، هەر سەد و پەنجا کەسێك دەبووین. وەك لە نێو لەشکردا

بین، پەیژەیەکی گۆشتمان لە بنیادەمەکان دروست کرد بۆ ئەوەی بەدیوارەکەدا هەڵبچین. دوو سێ کەس کە وەسەر کەوتن، بن پیلی ئیانکۆداکینیان گرت و هەڵیانکێشا سەر دیوارەکە و خۆی فڕێدا حەوشە. تێلاکەشیان بۆ هاویشت، کە هەر لە ئاسمانەوە قۆستییەوە. یەکەم کاری ئەوە بوو، چراکەی حەوشەکە بکوژێنێتەوە. بەڵام چۆن توانیبای بە کۆڵەکەکەیان هەڵبچێ و خۆی بگەیەنێتە چراکە؟ سەگەلیش هەشاولیان بۆ هێنابوو و چیی نەمابوو ورگی بدڕن. بە زەبری تێلا دەموقەپۆزی هەندێکیانی تێك کردەوە، بەڵام بەوەندەیە وازیان نەدەهێنا و دەیانقڕووسکاند، کەچی هەر نەدەکشانەوە. چراکە سوورِا و کوژاوە. تاریکییەکی خەست حەوشەکەی ئاغای داپۆشی. چەند کەسێکی دیکەشمان خۆیان هاویشتە ئەودیوی حەوشەکە. دیوارەکەمان بڕی و سەگەکانمان راو نا و بەرەو دەرگاکان غارمان دا و دەرگاکانمان خستە سەر پشت. پەلامارەکە دەستی پێ کرد. ئەگەر راستیت دەوێ لە پێشدا پەلاماری کۆشکەکەمان دا. ئەوەندە لە ناخافڵ بەسەریانماندا دا، کە نۆکەر وەك سەی خوێڕی کلکیان لە گەلۆزیان نا و رایان کرد. کارمان بەوان نەبوو، لێیان گەڕاین بەسەر دیوارەکاندا خۆیان فڕێ بدەن و لە دارستانەکەدا خۆیان بشارنەوە. کوڕە چاویان دەرێ. ئەوەی ئێمە لێی دەگەڕاین، کوێخا ستفانسکۆ بوو. پێم وایە ئەویش سۆسەی کردبوو، کە کەڕەی بەیانی تێی قووچاندبوو چووبووە شار. لە ژوورێکدا بەسەر ژنەکەیدا کەوتین. نەخۆش و کەلەلا لەسەر تەختەکەی کەوتبوو. هەموو گیانی لەودیو کراسە تەنکەیەوە دیار بوو. سێ کچۆڵەکەشی لە دەوری بوون. ژیکا و سیکا و میلیکا. هەر چاویان بە ئێمە کەوت، ژنە دەستی کردە ناڵەناڵ و، کچ دەستیان کردە زریکاندن. گیمپالێ ویستی بە دار لە سەریان راکێشێ، کە من دەستیم گرت. گوتم: کوڕە گیمپالێ، خۆ ئێمە نەهاتووین ژن و منداڵ بکوژین. مێشکت بخە کار کەرە. لەخۆوە بۆچی خوێنێك بەخۆڕایی برژێ؟ ئەگەر لێرە ئاغامان دەست کەوت، دیارە دەیتۆپێنین. کوێخا ستفانسکۆیش هەر وا. بەڵام لەپای چی خوێنی ئەو ژنەتیوە کەرە و ئەو بێچووە مشکانە بخەینە ئەستۆی خۆمان؟

دارجۆ لە بن لێوانەوە گوتی: تاکیتزا راست دەکا.

گیمپالێ تفێکی لە رووی ژنە کرد و پشتی تێ کرد.

من ژنەکەی کوێخام بە خێزانم سپارد بیباتە شوێنێکی ئامان. ژنەکەم ئەو و منداڵەکانی سواری عارەبانەیەك کرد و بردیە ماڵی یەکێك لە دارەوانەکان و، لەوێ شاردنیەوە. هەزار جار شوکرانەبژێر بووم، کە توانیم فریای لێقەوماوێك بێم. کارێکی خێرم لە دەست هات و کردم. بەڵام شتێکی دیکەش هاتە پێش، دیارە ئەویان شتێکی وا نەبوو و، بەردەوام ویژدانم عەزاب دەدا: بە یارمەتیی خەڵکەکە عەمبار و کادێنەکەمان ئاگر دا. یەسترمەخان و گەوڕمان سووتان. پێش سووتاندنی عەمبارەکە، هەموو شووشەکانیمان شکاند. قاپ و قاچاخ، چیمان وەبەردەست هات، ژن هرووژمیان هێنا و هەر هەموویان وردوخاش کردن. کای کادێن و عەمباری دەغڵ و دان و تفاق، هەر هەموومان سووتاند. دووکەڵ و بڵێسەیەك بەرەو ئاسمان کۆڵەکەی کرد، مەگەر خودا بزانێ، خۆشتان لێرەوە دیتتان. کۆشکەکەی ئاغا یەکدابەدوو سووتا. دەرگای ژێرزەمینەکانمان لە ڕێسمە برد و شکاندمانن. خۆ تاناسیۆیۆ گووپنە دەناسی: ئەوەی لە ڕێگەرۆیشتنێدا دەڵێی قوونی لە عەرزی دەخشکێ. ئەدی، ئەو نۆ مراویی دزی.

شۆڕشەکەمان تەواو ببوو. گەڕابووینەوە سەر ماڵوحاڵەکەمان و لەسەر هەست و چاوەڕوان دانیشتبووین، بەڵام لەسەرهەستبوونی چی؟ کەس لێی مەعلووم نەبوو. پێشم وایە چاوەڕێ بووین قوتابی بێن و زەوی و زارەکەی ئاغامان بەسەردا بەش بکەن، بەڵام ئەوەی هات شتێکی دیکە بوو:

دوێنێ بەیانی، پۆل پۆل هاتینە کۆڵان و لەپڕ هەتیوەکەی ئاغا، ئاتانازێ زاگۆریتز کە ملازمە لە ریزی سوارچاکەکان ـــ دیتمان ئەوە لەسەر گردەکە بە فەوجێك سواری تفەنگچییەوە قوت بووەتەوە. ریز ریز و چڕ بەرەو لامان دەهاتن و نێزەیان رادەوەشاند. بە لینگدان لە گردە بچووکەوە داگەڕان. خۆ دەزانێ ئەوێ چۆنە: کە لە گردەکە داگەڕای، ماڵەکەی رادۆکان دەکەوێتە شانی راستت. ئێلی رادۆکان، ماوەیەك لە شاری رۆژنامەفرۆشیی کردبوو، ئەمساڵ پاییزێ بەو تۆزە پارەیەی کۆی کردبۆوە، هاتبۆوە و پێی وابوو ئیتر ژیانی نێو کووخ و کاژێران بەلاوە بنێ. وای دانابوو بێتەوە و وەك ئەو خەڵکە چواردیوارێك بۆخۆی پێکەوە بنێ و، چێژ لە هەتاوێ وەرگرێ. سەرەتای پاییزێ دەستی بە کاران کردبوو. چیی وای نەمابوو دیوارەکا سواخ بدا و سەربانەکەی تەختەبەند بکا. خۆی لە

شۆڕشەکەش نەگەیاندبوو[*]. کە ئاتانازیێ زاگۆریتز سەروسەکتی پەیدا بوو، ئێلی لەسەر گوێسوانەکە دانیشتبوو، خەریك بوو سەربانەکەی تەختەبەند دەکرد. ئاتانازیێ ئەسپەکەی راگرت و سێرەی لێ گرت و تەقەی کرد. فیشەکێك سەری پێکا و لەو سەرەوە وەك پارچە گۆشتێکی خوێناوی بەربۆوە نێو حەوشە. ژنەکەی لەگەڵ دەنگی تفەنگ دەرپەڕیە دەرێ. لەپێشدا هەر نەیزانی چ قەوماوە. دوایی چاوی بە مێردەکەی کەوت ئەوا شەلاڵی خوێن بووە و لرخەلرخی دێ و ئاتانازێش بەسەر ئەسپەکەیەوە لە نێوەندی کۆڵانەکە راوەستاوە و هێشتا دووکەڵ لە لوولەی تفەنگەکەی دێ. بەدوای ژنەدا منداڵەکانیشی دەرپەڕینە دەرێ. چوار. بە باوکەڕۆ باوکەڕۆ خۆیان بەسەر تەرمەکەیدا کێشا. تەرمەکەیان بەراوەژوو کردەوە. هەموو گیانیان خوێناوی بوو. ژنەی داماو وەك دڕندەیەك خۆی بە ئەفسەرەکەدا دا:

ـ مێردەکەمت کوشت. هەی پیاو کوژ. خودا غەزەبت لێ بگرێ.

ئەو بێشەرمە، هەڵیکێشایە شمشێر و بە پانایی شمشێرەکەی وا لە روومەتی ئیلینکای ژنی ئێلیی راکێشا، لەتی کرد. ژنەی داماو لە خەوێن گەوزی. بە زەحمەت خۆی گەیاندەوە ژوورێ، بۆ ئەوەی برینەکەی بپێچێ و ئاردی پێدا بکا خوێنەکەی راگرێ. هەتا دەمرێ، شوێنی ئەو برینەی پڕ نابێتەوە.

ئیتر سوار کەوتنە نێو کۆڵانەکانی دێ. دێهاتی خۆیان لە کەلێن و قوژبنی ماڵێ کوتا و، بۆ ئەوەی پێیان نەزانن و وابزانن لە ماڵێ نین، چراکانیان کوژاندەوە.

سەرباز بەدوای قایمقامدا گەڕان، هەتا ئاخریەکەی ئاتازیێ دۆزییەوە و هێنایە دەرێ و بردییە ناحیە. ئەمری کرد قەشەشیان هێنا. ئاخر قەشەش وەك قایمقام نۆکەری ئاغایە. پێی گوتن:

ـ ناوی هەموو ئەو وەرزێرانەم بۆ بنووسن، کە سەربزێوییان کردووە.

قایمقام لیستەی بۆ گرتەوە. دیارە ئیتر، بە یارمەتیی قەشە. سەرباز و نۆکەری ئاغا چوون هەرچی ناوی لە لیستەکەدا هەبوو، هێنایانە دەرێ. هەر کەس لە ماڵێ بوو، بە راکێش راکێش هێنایانە ناحیە. من خۆمم شاردەوە. ژنەکەشم هەروا. هەرچۆنێك بوو توانیم لە ئاوەدانی بێمە دەرێ. بە

---

[*] خۆی لەو شتە گەیاند، یان نەگەیاند: واتە ئاوڕی لێ نەداوە. بەلایدا نەهات. بۆ وێنە دەڵێ: دوو رۆژ لەوێ راوەستێ، خۆی تێ ناگەیەنم، واتە ئاوڕیشی لێ نادەمەوە.

سینگەخشکە خۆمم گەیاندە دارستانەکە. لەوێ زانیم ئیانکۆداکینیان لە کۆڵەکەی چراکەی حەوشەی ئاغا بەستووەتەوە و، ملازم دوو سەربازی بۆ تەرخان کردووە هەتا دەجوولێتەوە تێی هەڵدەن.
بەسەربازەکانی گوتبوو: دەستی لێ بدەنە دوو دار، جا لێی دەن لەو سەگی سەگبابە.
سەرباز گوتبوویان: ناتوانین لێی بدەین جەنابی ملازم. ئێمە خەڵکی پلۆپیین، هەر ئەو دێیەی تەنیشت ئێرە. ئەوەش ئامۆزامانە و ناتوانین لێی بدەین. جگە لەوەش، چۆن دەمانتوانی کاری وا بکەین؟ خۆ ئەگەر سەرباز نەبوایەین، خۆشمان لەگەڵ راپەڕیوەکان شۆڕشمان دەکرد.
ـ راست دەکا، جەنابی ملازم، هەقێتی.
ملازم زاگۆریتز خۆی لەو گوندە گەورە بووە و هەموو دێهاتییەکان دەناسێ. دواییش کە چۆوە شاری، زۆربەی جاران سەری لە ئاوایی هەڵدێناوە. کەس لێرە لەگوڵ کالێتری پێ نەگوتبوو. دێهاتییەکان قەت گێچەڵیان بۆ نەنابۆوە. راستە، جاروبارە دەینەڕاند و پرتەوبۆڵەیەکی هەبوو، بەڵام زۆری مابوو دەست بداتە دار و لەخەڵك بدا، ملازم هەر پێی وا نەبوو رۆژێك وای لێ بێ و، ئێستاش وای هەست دەکردن ئەو خەڵکەی لەبەر چاوی راوەستاون، خەڵکەکەی جاران نین. ئیتر نەیدەناسین. وەك زۆر کەسی دیکە لەدڵی خۆیدا گوتبووی: "شۆڕش دەبێ بە یارمەتیی لەشکر، هەر ئەو لەشکرەی هەر کاتێك ئەمری پێکراوە، بێ بیرکردنەوە لەگوێی گرتووە، سەرکوت بکرێ."
لە دە ساڵ لەمەوبەرەوە کە ملازم زاگۆرتیز لە بن سێبەری ئاڵادا خزمەتی دەکرد، هەتا ئێستا کەس جوابەجەنگێ و سەرپێچیی بکا. ئێستاش، لەوەها دۆخێکدا و لەبەردەم ئەو راپەڕیوانەدا کە فەوجەکەی دەورەیان داون، دو سەرباز، دوو سەربازی داماوی قوونڕووت کە گونی خۆیان و گوێز لێك ناکەنەوە، جوابەجەنگێیان کردووە و پێیانگوتووە: "نەخێر، ناتوانین لێی بدەین." فەرمانەکەی ئەو روون بوو و وەڵامی سەربازەکانیش روونتر.
ـ ئاوا؟ دیارە ئێوەش لەگەڵ ئەو سەربزێو و ئاژاوەچیانەدا هاودەستن!
هەڵیکێشایە شەشلولەکەی و یەکی فیشەکێکی پێوەنان. سەربازەکان وەك هەڵا هەڵوەرین و لەخوێن گەوزین.
ئەفسەر، رووی لەوانی دیکە کرد و گوتی:

ـ ئەگەر ئەو ئاژاوەچییانە خزم و کەسیشتان بن، ئەوەتان لێ روون بێ کە ئێستا ئێوە سەربازێکن و دەبێ ئەمر و فەرمان جێبەجێ بکەن.

ـ ئێمە ئەم فەرمانەمان پێ جێبەجێ ناکرێ قوربان. خۆ ئێمە هەر بەخوێن خزمایەتیمان لەگەڵ ئەو خەڵکەدا نییە. تەنیا ئەو دوو سەربازەی کوشتتن، ئەوان خزمایەتییەکەیان ئاوا بوو. چونکە خۆشیان خەڵکی ئێرە بوون. منداڵی ئۆڵت بوون. ئەوی دیکەمان هەموو خەڵکی ئارگەشین. بەڵام مەسەلەکە شتێکی دیکەیە: ئێمە هەموو منداڵی گوندین. ئێستا خەڵکی هەموو گوندەکان لە ئاغاکان راپەڕیون. دیارە خزم و کەسەکانی خۆشمانیان لەگەڵە. ئەگەر تەقە لە راپەڕیوەکان بکەین، وەك ئەوە وایە تەقەمان لە برا ئارگەشییەکانی خۆمان کردبێ. هەربۆیە بڕیارمان داوە نە تەقەیان لێ بکەین و نە دەستیان لێ هەڵێنینەوە.

ـ "ئێمە" یانی کێ؟ مەبەستت کێیە عەریف ئاماریێ؟

ـ ئێمە، ئەو فەوجە قوربان.

ملازم فیشەکێکیشی بە سەری عەریفەکەوە نا و ساردی کردەوە. ئەوجار هەرای کرد:

ـ دیسان کەس هەیە مێشکی حەزی لە قورقوشمی داغ بێ؟

سەرباز ترسیان رێنیشت و ملیان کەچ کرد. هەندێکیان ترس لە مردن بەلایانەوە لە مردنەکە قورستر و سامناکتر بوو. دوو سەرباز بە ئاماژەی ملازم لە ریزەکە هاتنە دەرێ و داکینیان دایە بەر داران و ئەوەندەیان لێ دا لە بەر لێداندا گیانی دەرچوو.

ملازم کە دەیزانی دینۆدینکا و ئیۆن گیمپالێ و دارجۆ زۆر چیڕن و سەربازەکان لە گۆڕیان نایەن، رێیەکی دیکەی گرتە بەر. ناردی هەندێ پەت و کۆتیان بۆ هێنا. مەچەکی لە کۆت کردن و هەڵیواسین. کۆتی لە ملیشیان کرد، وای لێ کردن جووڵەی لێ بڕیبوون. ئەوجار دەمەوڕوو خستنیە سەر عەرزی، دەمیان لە عەرەزەکە چەقیبوو. جا ئەوجار بە سەربازەکانی گوت، ئەوەندەیان لێ بدەن هەتا پشتیان لە زگیان نەرمتر دەبێ. سەرباز بەربوونە گیانیان هەتا مردن. بەتایبەتی ئەمریان پێ کرابوو، بە دار لەسەریان نەدەن، بۆ ئەوەی زەجرکوژیان بکەن. لە نێوقەدیانەوە دەستیان پێ کردو، وردە وردە بەرەوژوور هەڵکشان تا گەیشتنە پشتەستۆیان. جا لەوێوە بەرەو پانێیان داگەڕانەوە. ورد

ورد دەیانکوتان. دەتگوت بڕیاریان داوە بیانئەنجنن. هەر بەراستی ئەنجنیشیانن. ئەو داماوانە، تاوێك هاواریان کرد و ئیتر دەنگیان لێ بڕا. لە تاوان قەپیان بە عەرزەکەدا دەکرد. ئەوانی دیکەش کە چاوەڕێی نۆرەی خۆیان بوون، راوەستابوون و سەیریان دەکردن. سەربازەکانیش دەست لەسەر پەلەپیتکە لەسەرپێ بوون. ژنی ئەو لێقەوماوانەش تەنانەت نەیاندەوێرا بکڕووزێنەوە و بۆشیان بپاڕێنەوە. ئەشکەنجەکە زۆری خایاند. هەر کام گیانی دەردەچوو، تەرمەکەیان هەر وا بە تەختەبەند و کۆتەوە فڕێ دەدایە سەربانەکەی ناحیە.. ملازم زاگۆریتز سێ کەسێکی بەو مەرەدە کوشت. هەر کەسیان لە ماڵێدا گرت، ئاوا ئەشکەنجەیان دا و کوشتیان. جا ئەو جار ئەمری کرد تەلی پچڕاوی تەلەفۆنەکانیان بەستەوە و لەگەڵ شاری قسەی کرد و بە عەقیدی گوت:

ـ سێسەد زیندانیم هەیە.

عەقید لە تەلەفۆنەکەدا دەنگی لێ هەڵێنا و گوتی:

ـ ئەوەی من دەمەوێ ژمارەی بەندییەکان نییە، دەمەوێ بزانم چەندەتان کوشتووە؟ دەستیان لێ هەڵدەگری؟

ـ دەستهەڵگرتنی چی؟ نەك دەست هەڵناگرم، بگرە هەر لە کۆلیشیان نابمەوە.

ئەشکەنجە دیسان سامناکتر ببوونەوە، بەڵام ملازم زاگۆریتز پێی وابوو ئەشکەنجە و کوشتارەکە، هێشتا بەگوێرەی پێویست خەڵکەکەی نەتۆقاندبوو و چاوترسێنی نەکردبوون. بۆیە بە یارمەتیی ئەفسەرەکانی بەردەستی و بە رێنوێنیی قەشە و جەندەرمەکان، هەر هەموو ئاوەدانییەکەی سووتاند.

هاواری دەکرد: ئەوە ئێوە بوون کادێن و عەمبارەکانی منتان سووتاند؟ دەی بخۆن دەی، جوابی پەحا، تەحایە.

نیوەی پتری ئاوەدانی بوو بە تەپۆڵکەیەك خۆڵەمێش. بە شمشێرە پانەکەی کەوتبووە گیانی ژن و منداڵ و لە ماڵێ دەریدەپەڕاندنە دەرێ و ماڵەکانی دەسووتاند. خەڵکەکە داماو و بێ ماڵوحاڵ کەوتوونەوە و لە جادەوبانەکاندا خەریکی سواڵن. ئەو پیاوانەی لەبەر ئەشکەنجەدا نەمردوون، بردوویاننەتە شاری تۆرنۆ.

مامەگابۆنیا، قسەکەی تەواو دەکا.

باوكم روو دەكاتە ئێمە و پێمان دەڵێ:

ـ لەگەڵ ئێوەمە. دەبێ ئاگاتان لە زمانتان بێ. ئەو قسانەی بیستووتانن، نابێ بۆ کەسیان بگێڕنەوە. ئەتۆش هەروەتر تاکیتزا. ئیتر بەسە و بیبڕەوە. لە خۆڕا خەڵکەکە بۆچی زراویان بچێ؟ هەرچی دەبێ با ببێ. ئێمە دەبێ لەسەر شۆڕشەکەمان بەردەوام بین و لێی نەکشێینەوە. هەرچی دەبێ با ببێ. چ بشکێین و چ ئاوا بمێنینەوە، هەر یەکە.

هەر رۆژ دەبێتەوە، خەڵکی دێ وەك شێت بووبێتن، دێنە کۆڵانەوە و لەبەردەم ناحیە کۆ دەبنەوە.

ئیتیزاتۆیێ دەڵێ:

ـ با بچینە سێکارا و لەوێیش دەستباریکیان بۆ شۆڕشەکە لەگەڵ بدەینێ.

گائینا ـ چکارمان بە سێکارایە؟ دەڵێن هەموو سەربازەکانی تۆرنۆ دەنێرنە ئەوێ بۆ ئەوەی شۆڕشەکە سەرکوت بکەن. ئەوەی دوێنێ کردمان بەس نییە؟

تیتزا ئۆیێ ـ نەخێر بەس نییە. جگە لەوەش، خۆ ئێمە هیچ زانیارییەکی وردمان لە سەربازەکان نییە.

ـ گایینا: وەڵا چووزانم، وا دەڵێن.

تیتزا ئۆیێ، زۆر شت دەڵێن. خۆ نابێ هەر قسەیەکی کرا، بڕوای پێ بکەین. یاڵا دەی بەرەو لای سێکارا.

هەر بەراستی زۆر شتیش باس دەکرێ. خۆ دەنگوباس لە باڵندەکان خێراتر دەفڕن.

خەبەر هەیە خۆشە و خەڵك بە دڵخۆشییەوە وەریدەگرن و دەیگێڕنەوە. ئەو ئاغایانەی خەڵکە راپەڕیوەکە نەیانتوانی لە کۆشکەکانیاندا بیانگرن و، کلکیان لە گەڵۆزیان نا و سواری گەمی بوون و لە دانووب پەڕیونەتەوە و پەنایان بردووەتە بولگاریا، ئیتر تا هەتایە بەو دۆڵەدا نایەنەوە.

قەشە بۆلبۆك غیرەتێك دەنێتە بەر خۆی و، لە کونێ دێتە دەرێ، بەڵام ئەو پیاوە نیە پێ بنێتە کۆڵان:

ـ رۆڵەکانم، ئەوە هەمووی خەون و خەیاڵە، کۆشێك ئەفسانە و قسەی پڕووپووچن. ئاغا دێنەوە. ئێوە زەویوزارتان دەوێ؟ ئاغا زەویتان دەدەنێ، خەمتان نەبێ. ئەوەندەتان زەوی دەدەنێ تێیدا ون بن. کوڕە

هۆی کۆستیکا، رۆڵە گیان وەرە ئەوەندە دراوە بگرە و بچۆ لە دووکانەکەی بۆسیۆك نیو قاپ ئارەقم بۆ بکڕە. نا، خوایە گیان، با قاپێکی تەواو بێ. قاپێکی تەواو.

کوڕەکەی تزانتزۆ سەیری درێژایی کۆڵانەکە دەکا، کە خەڵك تێیدا دەجمێن.

هەر هەواڵی خۆشە و دەگاتە ئاوەدانی. خەڵکی دیکەش دەگەنێ. جاری وایە دەڵێن سوپا گوندەکانی ئاگر داوە و لە خوێن شەلاڵی کردوون و ئەفسەرەکان تووشی هەر کەس بن دەیکوژنز جاری واشە خەڵك دڵنیا دەکەنەوە و دەڵێن، سەربازەکان خۆ دەبوێرن و تەقە لە راپەڕیوەکان ناکەن و خۆشیان دێنە گەڵ شۆڕشگێڕەکان.

ـ ئاخ، خۆ ئەگەر سەربازەکان بە چەکەکانیان لای ئێمەیان گرتبا، هەموو مەملەکەتمان دەگرت. ئەگەر خەڵکەکە گوێیان گرتووە، کڵاوە چەرمینەکانیان بە تیلاکی سەریانەو دەنێن و لەبەر بێ بڕیاری سەریان دەخورێنن. دیسان بێ بڕیاری بەرۆکی گرتوون.

تیتزائۆییێ و ئۆدۆدۆیی و پیچیکا دنەیان دەدەن:

ـ با بچینە سێکارا، هەر هەموومان بەرەو سێکارا.

زواکاش قسەکەی ئەوان پاتە دەکاتەوە.

هەموو بەرەو سێکارا دەکەونە رێ. کە دەگەینە ئەوێ، تازە خۆر گەیوەتە نێوەندی ئاسمانێ. کۆشکەکەی ئاغا لە هەموو لاوە کراوەتەوە. چەند کەسێك لەوێدا خەریکی هەڵبەزودابەزن. پەنجەرەکان شکاون و گەوڕ سووتاون.

ـ ئەی خەڵکی ئاوایی کوان؟

ـ لەسەر گردەکەن، عەمبارەکەی ئاغا.

عەمبارەکەی ئاغا دەڕوانێتە ئاوایی. هەرا و زەنازەنایەکە دەڵێی رۆژی حەشرە. لۆدەی کا دەسووتێن. هەرچی هەیە دەسووتێ. عەمباری گەنم، گەنمەشامی، هەرزن. خەڵکی ئاوایی دەوراندەوریان گرتووە. لەو نێوەڕاستەوە، فیلیپ پیسیکۆی دەشتەوان تخێڵ کراوە و کەوتووە.

ئەو کابرایە خدەیەکی پیسی هەبوو. بە سواری دەهات و بە ناوچەکەدا دەگەڕا و هەر بەدەم رۆیشتنەوە سەرو ملی جووتیارانی دەدایە بەر قەمچی و دەینەڕاند:

ـ خەتی جووت دەبێ قووڵ و باریك بێ، گەواد.

جاری وابوو جنێوی لەوەش پیستری دەدا.

خۆ وایە، خەتی جووت دەبێ باریك و قووڵ بن. چونکە ئاوا مەزراکەش بەری باشتر دەدا. دیارە بۆ ئەو کارە پێویستە گای تۆکمەتر و بەهێزترت پێ بێ و تیژ تفاق بن و گاسنەکەشت گاسنی چاك بێ.

دەی ئەگەر گاسنەکەت ترێك نەهێنێ و، گایەکانیشت بە قەد مەڕێك بن، خەتی جووتەکەت نە باریك دەبێ و نە قووڵیش. بەڵکو پان و پەل دەبێ. گایەکەت چۆن بێ، ئەویش وا دەبێ.

بەڵام پسیکۆی دەشتەوان ئەو قسانەی بەگوێدا ناچێ. جا گای باشت دەبێ یان نا، ئەو خەتە جووتەی لە زەویی ئاغادا لێی دەدەی، دەبێ باریك و قووڵ بێ ئەوە ئەمری ئاغایە و دەشتەوان دەبێ چاوی بەسەریانەوە بێ ئەمری ئاغا جێبەجێ بکرێ.

عەقید پێنارۆ ئاغای سێکارایە، کە ساڵ دوازدەی مانگێ لە بۆخارێست دەژی. جەنابی عەقید جگە لە فیلیپ، کوێخا دیمۆفتیە ستریبۆیشی لەبەر دەستە و پیاوی جێمتمانەی خۆیەتی. بەخوای حەیف نەکەوتە دەستی راپەڕیوەکان. هەر دەستیان بە دەشتەوانەکە راگەیشت. هەر لەوێ لە دەوری عەمبارەکان بوو، کە لە ناکاو بەسەریاندا دا و خوریشۆریان کرد.

فیلیپ پیسیکۆ خەڵکی دێیەکەیە. جاری جاران، ژنەکەی وەك هەموو گوندییەکانی دیکە پێخواس بوو، بەڵام بەو دواییانە پێڵاوی خانمانە لەپێ دەکا و، جلوبەرگەکانی ئاغاژن لەبەر دەکا. دەشتەوانیش سۆلەکانی بەلاوە ناوە و پۆستاڵی لەپێیە و ئەو جلوبەرگانە دەپۆشێ، کە ئاغا دەیداتێ. خۆ ئاغاش جلوبەرگی وای ناداتێ زۆر کۆن بووبێن. هاموشۆی یەك کەسی ئاوایی ناکا. لە دەشتێ وەك ئیزراییل بەسەر سەری خەڵکەوەیە و، لە هەموو جێیەك، تەنانەت لە کووچەو کۆڵانانی ئاواییش ئەوە ئێشکی خەڵك دەگرێ:

ـ ئەوە بۆ ئەمڕۆ نەچوویەتە دەشتێ؟

ـ گایەکانم نەخۆشن فیلیپ ئاغا.

دیارە دەشتەوان بڕوا بەو قسانە ناکا. کابرای داماو دەداتە بەر قەمچی و شەقان. کابرای لێقەوماو هاوار دەکا، هاوار دەکا و هیچیش ناڵێ.

دەشتەوانەکە دوو برا و دوو ژن برای هەیە. زۆر لە خەڵك خراپتر بەوان دەکا. ئیتر تەنانەت کەسوکارەکەی خۆشی ناناسێتەوە:

ـ کوڕە هەی سووکوچرووکینە. هیچ دەزانن خوای من کێیە؟ دەزانن کێ رسق و رۆزیی من دەدا؟ رسقدەری من عەقید پیەنارۆیە. تێگەیشتن؟

ـ تێگەیشتین قوربان.

ئیتر، خەڵکەکە لە دەوروبەری عەمبارەکان گرتیان و هەڵیانکوتایە سەری. لە نێوەندی گۆڕەپانەکە بە سەر ئەسپەکەیەوە بە قەمچییەکەوە راوەستا، بۆ ئەوەی بێنە پێشەوە.

ـ دەی، چیتان دەوێ؟ خۆ کۆشك و دیوەخانتان سووتاند و ئادارتان بەسەر پادارییەوە نەهێشت. خۆم یەك بە یەکتانم دیتووە و ناوتانم نووسیوە. سبەی جەنابی عەقید بە لەشکرەوە لە بۆخارێستەوە دێ و وەك سەگەلی هار دەتانداتە بەر دەسڕێژ. ئەدی، رێك وەك سەگەلی هار... هەر هەمووتان هار بوونە...

مامە ئۆتزۆپار هەرا دەکا:

ـ کوڕە خۆ ئەو بێدایك و باوکە هێشتا دەوێرێ جنێومان بداتێ. یالاّ کوڕینە، کوڕە خۆ هەر راوەستاون؟

خەڵکەکە دار و شەنە و تەوریان لێ راوەشاند.

دەشتەوان بە چاوی خۆی دەیدی، بەڵام بڕوای نەدەکرد، کە ئاخری ناچار بوو بڕوا بکا.

دەستی کرد بە راوەشاندنی قەمچییەکەی، بەڵام ئیتر کەس لە قەمچیی ئەو نەدەپرینگاوە. پشتوێنیان گرت و لە ئەسپەکەی هێنایانە خوارێ. چیی نەمابوو بە داران سەگتۆپی بکەن، کە مامە ئۆتزۆپار هەرای کرد:

ـ نا، نا، بە دار و تێلاّ نا، بە مست و پێلەقەش نا. دەبێ بە جۆرێکی دیکە مشووری بخۆین، بیرم لێ کردووەتەوە...

دەی باشە، ئەگەر مامە ئۆتزۆپار بیرێکی کردووەتەوە، دەبێ خەڵکەکە دەست راگرن و بزانن فکرەکەی چییە. هەمووان دەزانن مامە ئۆتزۆپر چ شەڕلاتانێکی بێسەروبەرە.

ـ هەر ئەوەندەتان ئاگا لێی بێ، لەچنگتان دەرنەچێ.

مامەگیانم چوو، ئاسنەواڵە و زبڵ و زاڵەکانی وەرگێڕوداگێڕ کرد و بە دەمە گاسنێکەوە هاتەوە. لە حەوشەی عەمبارەکان، کۆمەڵە کارگەیەکی لێیە، کە لەوێدا قەرەجە چەلەنگەرەکان، گاسن و سندەکوت و خەرمانکوت و ماڵوو چاك دەکەنەوە. لەو کارگەیانەدا، هەموو ساڵێ بەهاریێ لەگەڵ توانەوەی بەفر، سەدان دەمە گاسن بۆ ئاغاکان تیژ و دەمەزەرد دەکرێنەوە.

مامەگیانم کامە دەمەگاسن لە هەمووان گەورەتر بوو، ئەویانی هەڵگرت و هێنای. وەك دەمەگاسنێکی تازە دەبریسکاوە و وەك مووسی دەلاك تیژ بوو.

ـ دەی! یانی خەتی جووت دەبێ باریك و قووڵ بن، وایە؟

کوێخا، کە رەنگی وەك گەچ سپی هەڵگەڕابوو، دانی بەجەرگیدا گرتبوو و خواخوای بوو قسەیەکی لە زاری دەرنەپەڕێ.

ـ خەتی باریك و قووڵ. ئێ، جا ئێستا پێت دەڵێین خەتی باریك و قووڵ یانی چی...

خەڵکەکە زانییان مەسەلەکە چییە و مچووڕکەیەك بە تیغەرەی پشتیاندا هات. کەسێکیان لە نێودا نەبوو، قەمچییەکی کوێخا شووخاڵی لە پشتی نەخستبێ. کەس نەبوو، کوێخا جنێوی بە دایك و خوشکی نەدابێ. ژنێك نەبوو، دەشتەوان بە زۆر راینەکێشابێ و لاقەی نەکردبێ. کەس نەبوو دەشتەوان نەیکردبێتە پەڕووەبەگوو. تەنانەت منداڵێکیش چییە، لەنێویاندا نەبوو، کە قەمچەییەکی ئەوی وەلا ڕوومەتی نەکەوتبێ.

ـ توند دەستوپێی بگرن...

مامە گیانم ئەژنۆی دادا و لە تەنیشت کوێخا دانیشت و، قۆپچەی چاکەتەکەی کردەوە. ئەو چاکەتەی ئاغا پێی دابوو. یەخەی کراسەکەشی کردەوە. زۆر لەسەرخۆ، قۆپچە قۆپچە، کە نەکا کراسەکەی بدڕێ. کە گەیشتە سەر ناوکی، تاقەتی نەما و لە پڕ راییسکاند و دایدڕی. پزووی پانتۆڵەکەی دڕی و لەپێی داکەند. چاکی کراسەکەی بەلادا کرد و سینگی پێ رووت کرد. کوێخا سینگێکی کوڵکنی هەبوو، نیوەی تووکەکەی سپی ببوو. تاك و تەرا مووی سپیی کەوتبووە سمێڵی.، بەڵام سینگی سپی

ببوو. پشتوێنێکی پەشمنیەی لە پشتی بەستبوو، کە کردیانەوە، ورگە زل و سپی و پڕ بەزەکەی دەرکەوت.

یەکێك لە نێو حەشاماتەکەوە هەرای کرد:

ـ کوڕە زگی ئەو سەگبابە سێ چینە.

تفێکی لە رووی کرد.

مامە ئۆتزۆپار، دەمەگاسنەکەی هەڵگرت و ئەوەندەی قەوەی پێی شکا، لە قوڕگی کوێخای نا. خوێن فیچقەی کرد و دەستی کرد بە لرخەلرخ، مامە ئۆتزۆپار هەر مێشێکیشی لێ میوان نەبوو. دەموچاوی هەروا گرژ بوو و، رەش وەك خاك. دەستیشی هەر وا دەڵێی گڵە رەشەن. کوێخا هاوارێکی لێ هەستا، بەڵام کورت و دڵتەزێن. هەر ئەوەندە . ئیتر کەوتە قرخەقرخ. خوێن بە هەموو لایەکدا فیچقەی دەکرد. مامم وەك سواری بارگین بووبێ، سواری کوێخا بوو و، لەسەر سمتی دانیشت و جێ قوونی خۆی خۆش کرد. هەر دوو دەستی لەسەر دەمەگاسنەکە دانا و بەرەو ناوکی پاڵی پێوە نا، هەتا ئەوێی هەڵدڕی و لەوێش بەرەوخوارتر.

مام ئۆتزۆپار هەرای کرد:

دەی بڕۆن مامالیگام بۆ پەیدا بکەن و بیهێنن. لەتێك مامالیگا.

ژن رایانکردە لای مەتبەخەکە، کە هێشتا ئاگریان نەدابوو. پوورە مارگیۆلا ئۆتزۆپار و دیتزا خەندەلێوی پوورم، لە پێش هەموانەوە رایان دەکرد. کە هاتنەوە، دیتزا مامالیگایەکی لە باوەشدا بوو، کە هێشتا گەرم و داغ بوو. مامالیگایەك، کە کەپەکی زیاتر تێدا بوو هەتا ئارد. مامالیگایەکی سووری برژاو، کە سەری توێ توێ ببوو. ژنێکی دیکەش مەنجەڵێکی گەورەیان هێنابوو، پڕ پڕ لە لۆبیای کوڵیو. لۆبیاکەیان بە قوڵتەقوڵت رشتە نێو سینگ و زگە هەڵدڕاوەکەی کوێخاوە. مامالیگاکەشیان تێ ئاخنی... منداڵێك بە هەڵەداوان بەدوای ژنەکاندا هات، کە کەوچکێکی بەدەستەوە بوو. دەسکی کەوچکەکەشیان لە ورگەپیسەکەی کوێخا ئاخنی، کە پڕ کرابوو لە مامالیگا و لۆبیای کوڵیو.

ـ جا، با کوێخا فیلیپیش مامالیگای کەپەك بخوا، بزانێ دنیا بە دەست کێوەیە.

خەڵکەکە وێکڕا گوتیان:

خەتەکە قووڵ و باریکە

کوێخا، کوێخا، هەی کوێخا

خەتەکە ڕەش و تاریکە

کوێخا، هەی کوێخا، کوێخا

ئەوە ئێمە هەموو سەیر دەکەین. کەس تنۆکە فرمێسکێکیشی لە چاوی نایە. کەسیش شایی ناکا. کەس پێناکەنێ. مامە ئۆتزۆپار دادێتەوە، مستێك خۆڵ هەڵدەگرێ و دەستی پێ وەشك دەکاتەوە. ئاخر، خۆڵ خوێن خاوێن دەکاتەوە. دەستی لە پانتۆڵەکەی دەخشێنێ.

جەماوەر لە گردەکەوە دادەگەڕێن بەرەو ئاوەدانی.

ئێمەش دادەگەڕێین.

دەنگی تیتزائۆییێم دێتە گوێ، کە دەڵێ: پێم وایە ئیتر کارێکمان لە سێکارا نەماوە. با بچینەوە ماڵێ.

هەر بە ڕێی گردەکەدا ــ ڕێك ئەو ڕێیەی داپیرەمان، بەوێدا لە کارلۆمانەوە دێتە لامان ــ دەگەڕێینەوە ماڵێ. بە دەوری کارلۆماندا دەسووڕێینەوە و بە تەنیشت گۆڕستانەکەدا دەڕۆین تا دەگەینە سەر گردەکە. لە ڕەزەکەدا تووشی دەستەیەك جووتیار دەبین. دە دوازدە کەسێك دەبن. کە دەیانگەینێ، زگاماییێ دەپرسێ:

ـ ئەوە چ دەکەن؟

یەکیان بەدەم داخستنەوەی قۆپچەی پانتۆڵەکەیەوە دەڵێ:

ـ ئەوەی دەبوو بیکەین، ئەوەمان کرد.

ئەوانی دیکەش هەموو قوڕاوین. هەر هەموو قوڕاوین، بەتایبەتی لە پشتوێنەوە بەرەو خوار.

ـ دەی باشە. دەبوو کارێك هەر بکەین کە... ئیتر کردمان.

ژنێك لە نێوەڕاستی قانەکە ڕاوەستابوو. خۆی کردەوە و، قیت ڕاوەستا. جلوبەرگەکانی چرچولۆچ بوون. تەشك و داوێنی شڕ ببوون و سەروقژی ئاڵۆز و قوڕاوی بوو. دوو منداڵی بچووکی لە تەنیشتن، کە لە ترسان زەندەقیان چووە و وستەیان نایە. ئەوانیش لە قوڕ کەوتوون. چڵمیان شۆڕ بووەتەوە و لیچیان داچەقیوە. هەر چاویان بەدەرەوەیە، بەڵام پێڵووشیان لە قوڕ شەلاڵە.

تیتزا ئۆیێ دەپرسێ: ئەوە کێیە؟

یەکێك لە پیاوەکانی دەستەکە دەڵێ:

ـ ژنەکەی کوێخایە. خاتوو ڤۆتا. تۆزێکمان بیراز* کردووە.

بۆگەنی ئارەقیان لێ دێ. چاویان پڕە لە ترس. دەردەکەوێ، کە لە کاتی ئاگردانی کۆشکەکەدا، ژنەکەی ستریبۆ بە منداڵەکانییەوە ڕای کردبوو و ویستوویەتی خۆی بگەیەنێتە کێڵگەکان و، لە وێستگەی شەمەندەفەرەکە تووشی دەبن. چونکە تەواو مەست و سەرخۆش بوون، وەشوێنی دەکەون و دەیگرنەوە و دەینێننە نێو قانە باخەکانەوە و، یەك بە یەك بە زۆر سواری دەبن.

تیتزا ئۆیێ بەسەریاندا نەڕاندی:

ـ کوڕە هەی بە لەعنەت بن، چەپەڵینە. یانی دەتانەوێ ئاوا بەرەوپێش بچن و ببنە خاوەنی زەوی و زار؟

کۆستاکێ تۆتۆریکا بە یارمەتیی تراکالییێ ژنەکە هەڵدەگرێ و لەکۆڵی دەکا. ژنەکانیش دیکەش منداڵەکان لەباوەش دەگرن. منداڵ لە ترسان دەلەرزن و دەیانەوێ ڕا بکەن. دەگرین و دەست دەکەن بە زیقاندن و هاوارکردن. ماگارێتێ بە بەزەییەوە سەیری ژنەکەی کوێخا ستریبۆی دەکا و دەڵێ:

ـ کوڕە ئەوە داماوییە. دیارە جار و بارە شتی ئاوا دێتە پێش. هیچ نەبێ ئەوانە خواردوویانەتەوە و خۆشیان نەیانزانیوە چ دەکەن، بەڵام مێردەکەی ئەو چیها کچی بێ بن کرد. چیها ژنی بەمێردی بە زۆر ڕاکێشا و لەگەڵیان نوست. هەر نەبیچ ئاغا ناڕەسەنەکەی، ئەگەر گوویەکیشی دەخوارد، گەنج

---

* بیرازکردن: واتە تێهەڵدان. بیرازکردن/ ڕەقاندندنەوە/ دەمەزەردکردنەوە دەستەواژەی کشتوکاڵین. بیراز بۆ بەرداش بووە. بەرداشیان بیراز کردووە بۆ ئەوەی لێك و لووستر بی و دانەوێڵە باشتر بهاڕێ. جا لە موکریان کە بیانەوێ لە یەکێك بدەن، دەڵێن بیرازێکی دەکەین.

بوو... سەگباب، ئیتر بۆی گرینگ نەبوو ئاخۆ ئەوانە پێیان خۆشە یان نا... دیارە ئەو ژن و کچانە، لە بن مێردە چەپەڵەکەی ئەو ژنەتیوەدا نەمردن. تەنانەت ئیی وایان تێدا بوو پێشی کەوت... ئەو خاتوونەش، خۆ نامرێ کە دوو سێ کەس زۆرگێیان کردووە. هەر لەوانەیە ئەو پەندە کۆنەی بێتەوە بیر: جێی مست پێلەقەیە.

ژنەکەی ستریبۆیان بردە وێستگە. منداڵەکانیشی. ژنە هاتەوە هۆش خۆی. شەمەندەفەر بردنی بۆ شاری، کە لەوێ مەترسییان لەسەر نەبوو.

بەڵام پێخواسەکانی ئاوایی: ئەوان نە شوێنێکیان هەبوو، نە شتێك، کە سبەینێ و لە رۆژانی بێبڕانەوەی دادێ خۆیانی پێ بپارێزن لەو شتانەی بەسەریان دێ.

هەر ئەو شەوە سوارچاك گەیشتنێ و ئاوەدانییەکەیان گەمارۆ دا.

قایمقام و قەشەکان و جەندەرمە، ریزی ناوی راپەڕیوانیان رێك خست.

خەڵکەکەیان هێنا و بردیاننە ناحیە و لەسەر عەرزی درێژیان کردن و، لە پشتەستۆیانڕا هەتا پاژنەی پێیانیان دارکارییان کردن. زۆر پیاو لە بن ئەشکەنجەدا مردن. گەلێ پیاوی دیکە بە دەستوپێ شکاوی و بە دەستی شەتەکدراو، هەشت هەشت و دە دە لە ئالۆدارێکی قورسیان بەستن و بە پێیان ناردیاننە ناوەند. ئەو پیاوانەی لەبەر شەکەتی تینیان تێدا نامێنێ هەنگاو بنێن، سەد کەس سەد کەس لە لای باکوورەوە دێن و بەرەو لای دانوب بەڕێ دەکرێن. هەر هەموو برسین. چەند رۆژێکە ردێنیان نەتاشیوە و جلوبەرگیان پیس و شڕە... سەرماکە هێشتا بەتەوژمە. زۆربەیان بێجگە لە لا کراس یان لا پانتۆڵێك، هیچی دیکەیان لەبەردا نییە و سەریان رووتە. دەرەجەداری لەشکر، بە قەمچییەکەوە وەك مێگەلە مەڕ و گاڕان لێیان دەخوڕن و تێیان دەخوڕن. کە یەکێکیان تینی لەبەردا نامێنێ و بڕستی دەبڕێ و دەکەوێ، ئەفسەرەکان بە شمشێری رووت تێی بەردەبن.

لە پشت پەرژین و چەپەرەکانی ئەمبەروئەوبەری جادەکە خۆمان مات دەکەین و، سەیری کاروانی بەندیە راپەڕیوەکان دەکەین کە بە ریز دێن و رادەبرن.

تۆتۆریکا بە سرتەیەك پێم دەڵێ:

ـ ئەوانە خەڵکی کارلیگاتزین. هەمووان دەناسم، چونکە لە زەویوزارەکەی ستاتیێ پانتازی ئاغا بێگاریم لەگەڵ کردوون.

دەیانژمێرم: هەشتا کەسن. مێرمنداڵیشیان لەگەڵن هێشتا خەتیان لێ نەداوە، تەنانەت چەند منداڵێکیان لەگەڵە زۆر لە من گەورەتر نین.

بەدوایاندا دەستەیەك ژن دەگەنێ، بیست کەسێك دەبن. بە زەحمەت قاچ و قولیان لە نێو قوڕ و لیتەی کۆڵانێ دەکێشنە دەرێ و لاقیان لەدوو نایە. لە سەرەدای کاروانەکە، چاوم بە پیرەژنێکی پشتکۆماوە دەکەوێ، کە هەر چوار پێنج هەنگاو دەنێ و سەرسمێك دەدا و سەرەنگرێ دەبێ. کە دەگاتە لای ئێمە، شل دەبێتەوە و بەرەودەم دەکەوێ. هەوڵ دەدا هەستێتەوە، یەکێك لە ئەفسەرەکان دێ و پیلی دەگرێ. بەڵام بەر لەوەی بتوانێ لەسەر پێیانی راوەستێ، نووکە جزمەیەکی لە کەلەکەی دەسرەوێنێ و جنێوبارانی دەکا:

ـ فەرموو، ئەوەش شۆڕشەکەتان، پیرە قۆترِی کەمتیار.

پیرەژنە بە چاوی پڕ لە ترسەوە سەیرێکی دەوروپشتی دەکا. لە قوڕولیتەیەکی رەش بەولاوە کە سەد قاچی وەك قاچەکانی خۆی پێخواس و پڕ بلۆق شێلاویانە، چ نابینێ. جگە لە پەرژینێکی کۆن و پواو و، لە پشتەوەشیان جگە لە کاولاشی سووتاو و چۆڵ هیچ بەدی ناکا. چاوی هەڵدێنێ. لە سەرووی دێ، ئاسمانەکە خۆڵەمێشییە. گیراو و گرژ و توورِە و پڕ لە هەڕەشەیە. ئامادەیە ئێستا و چرکەیەکی تر ببێتە گۆزەی سەروبن.

هەڵدەستێتەوە. تلاوتل دەڕوا. زۆر دوور نەکەوتەوە. هەموو ئەوانەی دیکەش کە دوێنێ لە کاروانەکەدا بەرەو شاری دەڕۆیشتن، لە قوڵکەکەدا بە ئەمانی خودا فڕێ دران.

سەگەلی برسی لە دەوری قوڵکەکە دێن و دەچن.

ماری نیکا بە سرتە پێم دەڵێ:

ـ درایە، بڕوانە، دوو پیاو هۆ لەوێ کەوتوون.

سەیر دەکەم: دوو پیاو، لە پیاوانی نێو کاروانەکە لە قوڕەکەدا کەوتوون. ئەوەندەیان لێ دراوە، سەرودەموچاویان ڕەش و مۆر بۆتەوە و هەڵمساوە. ئێسکیان هاڕیون. ردێنیان زبر و تیژە. خاچ دەکێشن و لەبەر سەربازەکان دەپاڕێنەوە:

ـ کوڕە دە نەجاتمان دەن. دە بمانکوژن و تەواو. ئێمەش کوڕمان لەگەڵ لەشکرن. ئەوانیش وەك ئێوە سەربازن.

سەرباز دەستیان بەرەو تەوێڵیان هەڵدەبڕن. چاویان دەگرن بۆ ئەوەی نەبینن. هەنگاویان خۆشتر دەکەن. یەکێکیان خاچ دەکێشێ و دەڵێ:

ـ ببوورە، خوایە لێم خۆش بە...

یەکێك لە سوارەکان قەمچییەك لە کەفەڵی ئەسپەکەی دەدا، قەمچییەکەی وا ئەسپەکە دەگرێ، خوێن فیچقە دەکا. ئەسپەکە هەڵدەستێتە سەر پاشووان و قەڵەمباز دەدا. دوایی کە هەست دەکا جڵەوی شل کراوە، وەك شێتان دەردەپەڕێ و دەڕوا. لە ڕیزەکە دێتە دەرێ و سوار، خۆی دەخاتە یەکێك لە کۆڵانەکانەوە. پزیسك لە بن سمی ولاخەکەیەوە دەردەپەڕێ.

ئەو ئەفسەرەی بەسەر کاروانەکەوەیە، ماوەیەك چاو دەبڕێتە ئەو سەربازەی رای کرد.

دەچێتە لای ئەو سەربازەی هێشتا هەر وا خاچ دەکێشێ، دوو قەمچیی لە لاڕوومەتی دەسرەوێنێ:

ـ ئەوە تۆش بە ملی شکاوت جەنگاوەری ئاوا بەزەییت جوولاوە؟ تۆ ترسنۆکی نەك جەنگاوەر.

دوو جاران ئەسپەکەی بەسەر ئەو دوو پیاوەدا کە ئەژنۆیان داداوە، دەکێشێ و، لە عەرزەکەیان توند دەکا. ئەوجار هەڵدەکێشێتە دەمانچەکەی و تەقەیان لێ دەکا. جەستەی تێککشاوی دوو بەندییەکە، جارێك، دوو جار، سێ جار وێك دێ و لەبەر یەك دەکشێتەوە و جووڵەی لێ دەبڕێ و هەر وا بە گرمۆڵەیی لەسەر جادەکە بەجێ دەمێنێ. باران دایدەکا. بارانێکی توند و سەربەکڵاوەی بەهاری...

هێشتا گوێمان لە گرمەی ئەو تۆپەیە وا لە زیمنیچیا دەیتەقێنن.

لە دایکم دەپرسم: ئەرێ هێشتا لە جێیەك هەر شۆڕشە؟

ـ لە تۆدۆپ و گۆریچی، هەندێك لەولای ئەسکەندەرییەوەیە وا تۆپ داوێن. خەڵکی ئەوێ ڕێك وەك کاتی جەنگ، راپەڕیون و، کاتێ سوارچاکان گەویونەتە ئەوێ، خەڵکەکە بە گوللەتۆپ بەرەنگاریان

بوونەتەوە. لەشکری سوارچاك شکاوە و پاشەکشەی کردووە و دیسان گەڕاوەتەوە. بەڵام ئەمجارە بە تۆپ گوندەکەیان گەمارۆ داوە و داویانەتە بەر رەهێڵەی تۆپ... وا دەڵێن.

چووزانم، دەنگۆ زۆرن. سەد جۆر قسان دەکەن. قسەی وا، هەندێکیان تۆقێنەرن. سەرباز رێگەیان گرتووە، بەڵام شەو تاریکن و مەزراکان لافاو دایگرتوون و گوندی بە سۆل و قاپقاپەی پینەکراوەوە وا بەڕێدا دەڕۆن، کە رۆحلەبەرێك گوێی لە دەنگی پێیان نابێ. رێك وەکوو پشیلە. ئەوان لەم گوندەوە پەنا دەبەنە بەر گوندەکەی دی و، بەو کوێرە رێ قەدبڕانەدا دەڕۆن، کە هەر خۆیان دەیزانن. دێنە لای خزم و کەسەکانیان و خۆیان دەشارنەوە، بەشکم نەیاندۆزنەوە.

دایکم دیسان دەڵێ:

ـ لە بلیتۆری سەربازیان بە شەمەندەفەر هێناون. گۆگۆ ئاغا بە پشتیوانیی قۆشەن توانیوێتی هەڵکوتێتە سەر گوندەکە و بیگرێ. بەرپرسەکان چلوحەوت کەسیان گوللەباران کردووە. دوێنێ عەسرێ لە ئادانکاتا لە داوێنی گردەکە ناشتوویانن. پیاوی حوکمەت، راپەڕیوەکانی بالتاساراتایان لە گۆلەکەدا خنکاندوون، بۆ ئەوەی فیشەکیان لێ خەسار نەکەن. ئاخر بالتاساراتا گۆلێکی باریکی لێیە، زۆر زۆر قووڵە.

سوارچاك گەیشتوونە دێیەکەی ئێمەش. ئەوان باوکمیان بردووە. ئیۆنی براشمیان بردووە. کەلەپچەیان لە ژنەکانیش دابوو و بردبوویاننە ناحیە. دادە زواکای داماویان کۆت و زنجیر کردبوو.

تیتزا ئۆێێ، ئۆدۆدۆیی، تزانتزۆ، پیچیکا، باوە فلۆرۆیۆ و هەر حەوت کوڕەکەی هاواریان دەچێتە ئاسمان. هەر هەموویانیان خوریشۆر کردووە و لە بن دیوارەکەی ناحیە، زنجیریان لە دەست و پێ داون.

قەشە بۆلبۆك، کە بە هەڵپە خۆی گەیاندووتە مەیخانەکەی تۆماس ئۆکێ و چەند پێکێك ئارەقی هەڵداوە و تۆزێك وەکەیف هاتووە، بە بەردەمیاندا رادەبرێ. ئاخر، هەر لەشکر گەیشتنێ، مەیخانەچی دەرگایان خستە سەر پشت.

بەڵێ. قەشە کە دەیانبینێ، رادەوەستێ و بە گاڵتەوە پێیان دەڵێ:

ـ دەی، رۆڵەکانم، خۆ پێم گوتبوون، نابێ لە کاربەدەستەکانی سەرێ راپەڕن، چونکە خوای گەورە خۆی ویستوویەتی ئەوان بگەنە ئەو پۆست و پلەیە. قسەی منتان لەگوێ نەگرت. دەی بخۆن دەی رۆڵەکانم،

دەی بخۆن، خراپیش نییە، گوناحەکانتان بە ئاسانی هەڵدەوەرن. خوای تەبارەك و تەعالا ئەرحەموڕاحمینە و لە گوناحی بەندەی خۆی خۆش دەبێ.

فلۆرۆیۆ پیر و زورهان، لە نێوان لێوە ئەستووربووەکانیەوە، کە بە زەبری دار شەقار بوونە، دەڵێ:

ـ وا باشترە بێدەنگ بی باوە. پێویست نییە گاڵتەمان پێ بکەی. مخابن ئەوێ رۆژێ نەمانکرد ئەو دەموقەپۆزەت بشکێنین.

ئیتر قەشە بۆلبۆك قورس و قایم دەڕوا و بە پارێزەوە لێیان دوور دەکەوێتەوە.

باوکم لەو کەسانەیە کە لە قوتابخانەکەدا بەند کراوە و چاوەڕێن نۆرەیان بگاتێ و لە بن ئەشکەنجەدا مارکوژیان بکەن.

ئەفسەرێك دەپرسێ:

ـ شۆڕشت کرد، چیت دەست کەوت؟

ـ ئۆخژنم لەدڵی گەڕا... دەبوو شۆڕشەکە بکرێ. ئیتر خۆم پێ نەدەگیرا...

ئەفسەرێکی دیکە لە ئیۆنی برام دەپرسێ:

ـ تۆ چیت دزی؟

ـ دەمە گاسنێك. لە کارلیگاتزی.

ـ ئەی چیت لێ کرد؟

ـ لە قوڵکەم خست.

دوو سەرباز وەپێش خۆیانی دەدەن و دەیهێننەوە ماڵێ. وەك گچ دارکارییان کردووە. سەربازەکان دەباتە قوونەبانی باخەکە بۆ بن دار بووزەکە.

ـ دەمەگاسنەکەم لێرە لە عەرز ناوە.

سەربازەکان گڵەکە هەڵدەکەنن و دەمەگاسنەکە دەردێننەوە و دەیبەنە ناحیە. ئەوەندە لە سەری ئیۆن رادەکێشن، تا لە خۆ دەچێ. ئاوی ساردی بەسەردا دەکەن، بۆ ئەوەی وەخۆ بێتەوە. دیسان تێی هەڵدەدەنەوە. عەریف و نایب عەریف وێکڕا.

ئەفسەر و سەرباز، دەستەونێزە ئاگایان لە بەندییەکانە.

لە سێکارا، عەقید پینارۆ، خۆی لە بۆخارێستەوە بە لەشکرەوە هاتووە. هەر یەکەم بەیانی، ئەمری کرد سی و حەوت کەسیان گوللەباران کرد، کە چەند مێرمنداڵێکیشیان لەگەڵ بوو. مامە پرێکوب ئۆتۆزپاریش لەگەڵ ئەوان گوللەباران کرا.

عەقید پینارۆ هەر پێی خۆش بووە داوێکی بۆ دێهاتییەکان بنێتەوە:

ئەمری کردبوو لە کەڕەنا بتووڕێنن و، جاڕچیی راسپاردبوو خەڵکی خوای، بە ژن و منداڵ و پیاوەوە لە بەر دەرگای ناحیە کۆ بکەنەوە. جاڕ بکێشن و بڵێن، عەقید لە هەمووان خۆش بووە و دەیەوێ بەو بۆنەوە چەند قسەیەکتان بۆ بکا.

خەڵك لە ماڵەکانیان دێنە دەرێ و لە کۆڵانان کۆ دەبنەوە. سەرباز وەپێشەخۆیانیان دەدەن و دەیانبەنە بەردەم ناحیە و دەوریان دەگرن.

سەر و سەکتی عەقید پینارۆ پەیدا دەبێ. بە سەر ئەسپێکەوە و ئەفسەرەکانیشی دەوریان گرتووە. ملازم کانتاکۆزێنۆی دەستەڕاستیشی لەگەڵە.

ـ ئەوانەی لە شۆڕشەکەدا بوون، هەنگاوێك بێنە پێشێ.

گوندی پاڵەپەستۆیانە، پاڵ بەیەکەوە دەنێن، بەڵام کەس لە ریزەکە تاق نەکەوتووەتەوە.

ـ فەرمانم کرد، ئەوانەی لە شۆڕشەکەدا بوون، هەنگاوێك بێنە پێش... چ بووە؟ یانی گوێشتان کەڕ بووە؟

مامە ئۆتزۆپار دەڵێ:

ـ بەڵێ، جەنابی عەقید.... فەرموون، من لەم ئاواییەدا شۆڕشەکەم هەڵگیرساند.

لە ریزەکە دێتە دەرێ، بەبێ ئەوەی کڵاوەکەی هەڵگرێ، پاپاخە چەرمینە کونکونەکەی کە لەبەر کۆنەییان تووکی پێوە نەماوە، بە تیلاکی سەرییەوە دەنێ.

پوورە ئۆتزۆپاریش دەنەڕێنێ: منیش لە شۆڕشەکەدا بووم.

قیت قیت دێتە پێشێ و لە شانی مێردەکەی رادەوەستێ.

دیتزا لێوکەچی پووریشم بەپەلەپەل دەڵێ: منیشیان لەگەڵ بووم. منیش بووم.

کورتی ببڕمەوە، بەشی هەرە زۆری خەڵکی ئاوایی دێنە دەرێ و لە دەوری خێزانی ئۆتزۆپار کۆ دەبنەوە.

ـ خۆ هەڵدەکێشن جەنابی عەقید. خۆ هەر ئەوانە نەبوون، هەر هەموومان بووین، پێکەوە. هەموو ئاوایی. هەر ئەو گوندەی جەنابت وەختی وەرگرتنی ملکانە، نێوفەکی پانتۆڵەکەشیان دەبڕی و بێدەرپێیان دەکەی.

ـ ئەو زماندرێژە چاوقایمە کێیە؟ دا دەموقەپۆزی دەربخا بزانم.

ـ هەر دەموقەپۆزم جوان نییە جەنابی عەقید، پشتیشم شیاوی دیتنە.

لەگەڵ ئەو قسەیەدا، رادۆتۆرکۆ دەچێتە نزیك عەقید و، بە خۆ راوەشاندنێك گەزە جاوە پینەکراوە شڕەکەی دادەکەنێ و رووت و قووت رادەوەستێ. قەڵافەتە لەڕ و رەقەڵەکەی هەر دەڵێی پێستێکی تاوەسووتی کوڵکنە بەسەر ئێسکوپرووسکێکەوە کێشراوە.

ـ جا وەرە سەیری پشتم بکە قوربان. پڕە لە داغ و شووخاڵ. هەندێکیان شوێن پەنجەی دەستی مبارەکی خۆتن، ئەو دەمەی هێشتا گەنج بووم، هەندێکیشیان فیلیپ پیسیکۆی سەگباب و باقیشی یادگاری دەستی جەندەرمەکانە، کە جارێکیان لە زەماوەندێکدا یەکێك لە گۆرانییەکانی کوڕەکەی ئۆتزۆپارم دەگوتەوە، گرتمی.

رادۆتۆرکۆ بێدەنگ بوو. هەموو خەڵکی ئاوەدانی چاویان لە شووخاڵ و برینە قووڵەکانی جێ قەمچییەکە بڕیبوو، کە وەك خەتی جووت، لە سەر پێستی ئەو بنیادەمەی وا لەبەردەم مەرگدا راوەستابوو، قووڵ ببوون.

پیاوەکان کە چاویان وەك پزیسکی ئاگر گرشەی دێ، دەڵێن: پێستی لەشی هەموومان ئاوا پڕە لە داغ و شووخاڵ جەنابی پینارۆ. ئەی بۆ راوەستاوی؟ ئێستا کە هەموومانت گرتووە، دەی بمانکوژە... چەندەین، چەند کەسین، با ببین.

پوورە ئۆتزۆپار هەرای کرد:

ـ بمانکوژە دەی پیاوکوژ. پیاوکوژ.... ئەمجارە هەروا شۆڕشمان کرد: بە دەستی بەتاڵ و بەبێ خۆرێکخستن. ئەمجارە بێتەوە، شۆڕشێك دەکەین نەبێتەوە.

خەڵكی دێ هەموو گوێیان لێ بوو كە ملازم كانتاكۆزێن گوتی:

ـ ئەوانە تەواو هار بوون.

قەشە می تیتزا لۆنچسكۆ، هەر وا دەستی بە ردێنیدا دێنا، هەر بۆ ئەوەی ئاورەكەی خۆش كردبێ، گوتی:

ـ خوای گەورەیان لەبیر چووەتەوە. كلێسای پیرۆزیان بەلاوە ناوە. شەیتانی رەجیم ئەقڵی لە مێشكدا نەهێشتوون.

ئەو سەربازانەی لە باكووری مۆلداڤییەوە هێنراون، چاویان لە عەرزەكە بڕیوە و، ئەفسەرەكان بۆ ئەوەی جڵەوی كارەكەیان لەدەست دەرنەچێ، دەیاندەنە بەر نقورچك.

عەقید ددانی لە چیڕەوە دەبا و لە پڕ قەمچییە چەرمەگایەكەی لە پشتی گوندییە داماوەكە دەسرەوێنێ. پێستی زار دەكاتەوە و رادۆتۆركۆ بەبێ ئەوەی نووزەی لێوە بێ، بەرەودەم دەكەوێ.

جا عەقید دەسرۆكەكەی دەردێنێ و ئارەقەی نێوچاوانی دەسڕێتەوە و ئەمر دەكا:

ـ ناوی ئەو هەرچی و پەرچییانەم لە لیستەكەدا بۆ بخوێنەوە، ملازم.

كانتاكۆزێن، ئەو لیستەیەی قەشە لە سەر دوا لاپەڕەی كتێبەكەی نزای كلێسا نووسیوێتەوە، دەخوێنێتەوە. بیست كەس لە ریزەكە دێنە دەرێ، كە مامە پرێكۆپ ئۆریان ئۆتزۆپار لە یەكەمەكانە.

لە سێكارا قوتابخانەكە رێك كەوتووەتە رووبەڕووی ناحیە. هەر بیست كەسەكەیان شان بە شانی یەك لەبەردەم دیواری قوتابخانەكە ریز كرد. سەریان قیت و بەرز راگرتبوو و چاویان لە چاوی عەقید بڕیبوو.

ـ ملازم، خۆت فەرماندەرێتیی ئەو گوللەبارانە بەعۆدە بگرە.

ملازم كە بەلای سەرۆكدا نوشتابۆوە، گوتبووی:

ـ جەنابی عەقید. بە بڕوای من، با خۆمان ئیعدامیان بكەین. مەبەستم ئەوەیە خۆم و ئەفسەرەكان. هەر وەك دەبینی، سەربازەكان لاسارانە سەریان بەرداوەتەوە. دوور نییە شتێك بقەومێ.

ـ دەی باشە، گورج بن.

کانتاکۆزێن، ئەفسەرەکانی بانگ کرد. ئەفسەر لە ریز هاتنە دەر، ملازم خۆیشی لە ئەسپەکەی دابەزی و وێکڕا سێرەیان لەو پیاوانە گرت، وا لە بەردەم دیواری قوتابخانەکە ریز کرابوون.

عەقید فەرمانی دا: تەقە....

تەنیا حەوت کەس کەوتن.

عەقید دیسان فەرمانی تەقەی دا: دەی...

دووی دیکەش کەوتن.

ـ هەی داوەشێن، تەقەشتان لەبیر چووەتەوە؟ بچنە پێشێ و لوولەی تفەنگەکانیان پێوە بنێن.

ئیتر توانیان هەموومان بنگێون.

زریکە و هاواری دڵتەزێنی چەند ژنێك هات، کە دەتگوت هەر نابڕێتەوە. ریزی سەربازەکان هەر وا توند و چڕ لە جێی خۆی مایەوە. کەس نەیتوانی درز بخاتە ریزەکەوە و لە گەمارۆکە دەرباز بێ. هەموو دەبوایە لەوێ بمێننەوە و چاویان لەو کوشت و کوشتارە بێ. مامە ئۆتزۆپار ئاخر کەس بوو کەوت. فیشەك بە دەوریدا ویزەیان دەهات بەڵام وێی نەدەکەوتن. خۆی بە راست و چەپدا دەچەماندەوە و هەرای دەکرد:

ـ ئێمە گوللەباران دەکەن. زۆری دیکەش گوللەباران دەکەن. بەڵام مەحاڵە بتوانن هەموو خەڵکی ئەم وڵاتە کە لە چنگی ئێوە ئاغاکاندا دەناڵێنن و زەجرکوژتان کردوون و شیلەی گیانیان دەمژن، گوللەباران بکەن. بایی زەحمەتەکەی نابێ جەنابی عەقید کە چاوت هەڵێنی. خۆ ناتوانن لە گیانم زیاترم لێ بستێنن. دەی، من کە لەو ژیانە تاقەتپڕووکێنە نەترساوم، چۆن دەتوانی لە مەرگم بترسێنی.

فیشەك ویزەی دەهات. ئەفسەر سێرەیان بۆ نەدەگیرا و دەستیان دەلەرزی.

دەنگی ئۆتزۆپار بەهێزتر لەپێشوو، دەهات:

ـ نۆرەی ئێوەش دێ جەنابی عەقید. دەبێ ئەم قەرزە بەخوێن بدەنەوە. بە خوێن خۆتان و هەموو وچە و سۆرە و تۆرەی ئاغاکان. ئەوە وشترێکە لەبەر دەرگای هەموو ئاغایەك ئیخ دەخوا.

کانتاکۆزێن ئیتر خۆشی نەیزانی چ دەکا: چووە پێشێ، چووە پێشتر و دەسرێژی لە ئۆتزۆپار کرد. ئەوجار وەختێك کەوت، هەڵیکێشایە دەمانچەکەی و هەموو فیشەکەکانی لە جەستە گەرمەکەی دا.

خەڵکەکە ئەژنۆیان لەرزی. پیاو و ژن و مندال داهاتنەوە و چیی بەرد و کەرسەکی دەستیان کەوت، هەڵیان گرت و، عەقید و ملازم و ئەفسەرەکانیان ـ کە وەك میرغەزەب جووڵابوونەوە ـ بەردباران کرد. بەردێك ڕێك وە لارروومەتی عەقید کەوت. پێیان لە کلکی سەگی هار نابوو. فەرمانی دا ئەفسەرەکان تەقە بکەن.

سەرباز خۆبەخۆ ئاڵقەی گەمارۆکەیان کردەوە.

یەکێك لە سەربازەکان نەڕاندی: را کەن.

خەڵکەکە هرووژمی کرد.

تفەنگ شریخەیان هات و خەڵکەکە لە لاقانیان وەراند. بەڵام هەمووان نا. حەڤدە کەسێك مانەوە. بێدەنگ و کڕ وەك مردوو: هەشت پیاو و سێ ژن و شەش منداڵ، کە سەربازەکان لە کۆڵانێ هێنایاننەوە. سەرباز مردووەکانیان کۆ کردەوە و، لە بێدەنگیدا و بە رقێکی پەنگخواردووەوە. لە دەرەوەی ئاوایی، لە دەم گلەکەی قەراغ ئەو شارێیەی دەچێتە تۆرنۆ، قووڵکەیەکی گەورەیان هەڵکەند و هەمووان پێکەوە ناشتن، بۆ ئەوەی، ئەو کەسانەی بەوێدا رادەبرن، لەبیریان نەچێتەوە، سزای ئەو هەژارە قوونڕووتەی لە ئاغا راپەڕێ، مەرگە.

پاش ماوەیەك ــ دیسان هەر لە زمان مامە گابۆنیاوە ــ بیستم، کە لە لێپێچینەوەدا، کاتێ لە تاناسۆیۆیان پرسیبوو، ئاخۆ هیچ شتیکیشی لە حەوشەکەی زاگۆریتس ئاغا دزیوە یان نا، گوتبووی:

سێ مراویم دزی.

ـ چیت لێ کردن؟ برژاندتن و بە ژەهرت کردن؟

ـ نەخێر، لە عەرزم نان.

ـ لەکوێ؟

ـ لە دەم گۆلەکەی گالێ.

ـ وەرە نیشانمان بدە.

تاناسۆیۆ سەربازەکانی بردە ئەویٚ و مراوییەکانیان لە بن گڵەکە دەرهێنا. ملام زاگۆریتس بە شەقان ناچاری کرد مراویە رزیوە کرم لێدراوەکان بخوا.

تاناسۆیۆش خواردنی.

باوکم و ئۆنی برام و پالیکا و تیتزا ئۆییێی پوورزام و زۆر کەسی دیکەشیان کۆت و زنجیر کرد و بردیاننە تۆرنۆ.  هەموانیان لە عەمباری کەشتی کردن و، چەند مانگان هەرلا لەو عەمباری کەشتییەدا لەسەر دانوب رایانگرتن، تا دادگایی کران.

دادە زواکا و پوورە ئۆتزۆپار و دیتزای پووریشم، یەکێك بوون لەوانەی لەو کەشتییەدا بەند کرابوون.

ئێمە بەتەنیٚ لەگەڵ دایکمان مابووینەوە. ژنە داماوە ئیتر ناگرییٚ. شەوانە کە دەمانەویٚ بخەوین، باسی ئازار و خەم و خەفەت و تاڵی و سوێرییەکانی ئەو رۆژانەمان بۆ دەکا، کە لە رۆژانی شۆڕش و پاش شۆڕشەکەوە زار بە زار لە خەڵکی بیستوون.

ـ لە بیرتان نەچیٚ ئازیزەکانم، بەشکم ئێوەش بتوانن ئەوانە بۆ منداڵەکانتان بگێڕنەوە.

ئێڤانگلینی خوشکم دەڵیٚ:

ـ لەبیرمان ناچنەوە دایکە. لەبیرمان ناچنەوە.

ـ لەبیرت نەچنەوە داریە. هیچ شتێکت لەبیر نەچێتەوە. ئەوانە بۆ منداڵەکانی خۆت بگێڕەوە. بۆ منداڵی منداڵەکانیشتیان بگێڕەوە. گوێت لێیە داریە؟ لەبیرت نەچیٚ. هیچ شتێکت لەبیر نەچێتەوە...

## ٦
## گیا

بای دانوب، هەورەکانی لەگەڵ خۆی هێناوە و هەورەکانی بارانەی بەپیت و بەرەکەتی بەهار.
جا زەوی و زارە بە فرمێسك و خوێن چێنراو و هێزدراوەکەش، شین بووەتەوە.
دێیەکەش لە شەوێکدا جلوبەرگێکی نوێی پۆشیوە. لەو شوێنانەی نە گەنمیان چاندووە و نە هەرزن، نە جۆیان چاندووە و نە مەندێ، گژ و گیا رواوە.
گیای تورت و ناسك.
گیای بریقەدار و بلوورین.
لەو پیاوانەی بە دەستی لە پشتەوەڕا شەتەکدراو دە کەس دەکەس و دوازدەکەس دوازدەکەس لە ئالۆوداری قورس قورسیان بەستن و بردیاننە شاری، چەند کەسێکیان گەڕاونەوە.
ئەوان بە دەستی کراوەوە هاتوونەوە.
ئازادانە هاتوونەتەوە باوەشی بنەماڵەیان.
بەڵام ئێسك و سێبەندەیان شکاوە و پێست و گوێیان هەڵدڕاوە.
بە کۆڵانەکانی ئاواییدا تێدەپەڕن، هەر دەڵێی پێ لە دڕك و پێکوڵ دەنێن.
کۆڵانی ئاوایی چقڵی لێ نییە.
تێدەپەڕن و توند توند چەنگیان لە ئەستۆیان توند دەکەن.
مۆخی ئێسکیان دەزریکێنێ.
پەراسوویان تێك شکاوە.
لە هەموو گوندێك، سەدان ژن سەریان لە خم ناوە.
بەڵام واش نییە هەموو مێرد مردوویەك سەری شین بکا:
جا باشە خم بە چی دەکرێ و، ئەو هەمووە خمە لە کوێ پەیدا دەبێ؟
بای دانووب هەڵیکردووە. بایەکی مەیلەوگەرم.

باش، هەورەکانی هێناوە.

هەورەکانیش بارانیان هێناوە، بارانی بە پیت و بەرەکەت، بارانی گەرم، بارانی بەهار... بارانی بەپیت و بەرەکەت، زەویی ژیاندووەتەوە.

دەشتە کاکی بە کاکییەکە، دەشتە پان و بێ بنەکە، دیسان گیانی تێگەڕاوەتەوە.

هەموو لایەك بۆنی گیای تازەی لێوە دێ، چووزەرەی گیا، بۆنی چرۆی دارە و چووزەرەی گەنمی تازە، کە سەری وەدەرناوە.

لە سەر گڵی گوللەبارانکراوەکانیش، کە لە دڵی خاکدا نوستوون، گیا رواوە.

گیای تازە، چووزەرەی گیا...

## ٧

ورچەکان

بۆ کوێ دەچی؟

ـ دەچمە جەهەننەم.

ـ منیش دەبەی؟

ـ نەخێر ناتبەم.

ـ بەڵام دێم.

ـ وەڵاهی وەدووم کەوی، گوێت دەردێنم.

ئەوە ئێڤانگلینی خوشکمە ئاوا هەڕەشەم لێ دەکا. چۆن دەتوانێ گوێم دەربێنێ؟ نا، وا ناکا. ئەوپەڕەکەی تۆزێك رایاندەکێشێ و بایان دەدا، بەڵام من ناهێڵم. بە مستەکۆڵە پەراسووی تێك دەکەمەوە.

لە ماڵێ هەر کەس بە دڵی من نەجووڵێتەوە، دەیدەمە بەر مستەکۆڵە. دایك و باوکم نەبێ، کە ناتوانم دەستیان لێ هەڵێنمەوە. چونکە ئەگەر منداڵێك دەست لە دایك و بابی بەرز بکاتەوە، دەستی رەق دەبێ. لە ئانیشکیەوە هەتا نووکی پەنجەی.

ئەوانەی لێشیان دەدەم، بۆ هەر مستێك، سێ چوار مستم تێ دەسرەوێننەوە. زۆرم لێ گران نییە: بنیادەم لەو دەمەوە کە فێری لێدان دەبێ، دەبێ حیسابی تێهەڵدانیش بکاتەوە. لە جەنگەی گەمە و یاریدا، هەتیومەتیوەکانی برادەرم کە هەمیشەش یەکی دارێکیان پێیە، ئەوەندەیان لە سەروگوێلاکم داوە، سەرم هەموو گرنج گرنج بووە. سەلکی هاوەڵەکانم لە هیی من خراپترە. چونکە لێدان و وێکەوتن پێکەوەن. یەك تێهەڵدە و یەك بخۆ. دیارە ئەگەر لە پشتت بدەن ئێشی کەمترە، شوێنەواریشی نامێنێ، ئەوپەڕەکەی تۆزێك دەماسێ، ئەویش حەفتەیەك پتر ناخایەنێ. بەڵام ئەوەی وەسەرت دەکەوێ، لە هەمووان خراپترە. پێستەکەی زۆر ناسکە، دەسبەجێ درز دەبا و خوێن فیچقە دەکا. بۆ راگرتنی خوێنیش دەبێ، لوێچێ خۆڵی بەسەردا بکەی. ئەگەر برینەکە قووڵتر بێ، دەبێ ئاردی گەنمەشامیی بەسەردا بکەی. خۆ درەمانی دیکە دەست ناکەوێ.

ئێڤانگلین کراسە جوانەکەی خۆی لەبەر کردووە و چڵە ریحانەیەکی لە بن گوێی چەقاندووە.

جێژنی نۆیل رابردووە. جێژنی ئێدیفانیی‌یش هەروەتر. بەڵام هێشتا زۆری ماوە بۆ بەهاریێ.

بەفر، لە بن پێیانم نەرمە. ئەگەر تۆزێك هەنگاوت خۆشتر بکەی، دەتوێتەوە لاقمان خووساون.

پار ئەودەمانە، ئێڤانگلین هێشتا منداڵ و دەستوپێ سپیلکە بوو. ئەمساڵ پاییزێ بوو بە پانزە ساڵان و هەڵیدا و لەپڕ باڵای کرد. ئێستا ناسکتر دیارە. زۆر ناسکتر. ئیتر کچۆڵەیەکی تەواو تورت و ناسکە. چاوی گەش و درشت و بادامی بوونە و، تروسکەیەکی گەشیان لێ دێ. برۆشی درێژن، وەك برۆی دایکم. مژۆڵیشی درێژن و هەڵگەڕاونەوە.

ـ منیش دەبەیە کاولاش؟

ـ گوتم نا.

لێوی سوورتر دەکا. لە لەتە ئاوێنەیەکدا سەیری خۆی دەکا، کە نازانم لە کوێی هێناوە.

تا ئەمڕۆ ئاوێنە لە ماڵماندا دەست نەدەکەوت. دایکم قەت لە ئاوێنەدا سەیری خۆی نەکردووە. بۆچی سەیری کردبا؟ سەیر بکا بزانێ چۆن رۆژ بە رۆژ پتر دەشکێ و دەپرووکێ؟ جا خۆ ئەوە باقی خێزانەکە دەیبینن.

ـ دایکە، دادم لەگەڵ خۆی نامباتە کاولاش...

ـ لێی گەڕێ با خۆی بەتەنێ بچێ.

ـ حەز ناکەم لێی بگەڕێم.

ـ بۆ؟

ئێڤانگلین وەڕێ دەکەوێ. جار جار دەگەڕێتەوە و، کلۆ بەفرێك هەڵدەگرێ و تێمی دەگرێ:

ـ بگەڕێوە ماڵێ داریە.

ـ ناگەڕێمەوە.

ـ دەبێ بگەڕێیتەوە.

ـ نابێ.

بەرەو لام دێ. بێت دەستی پێم را بگا، تێهەڵدانەکەم خواردووە. باشە من لە هەموو منداڵەکانی ئاوایی گورجترم. کە دەزانێ نامگرێتەوە، دەکەوێتە پاڕانەوە:

ـ بگەڕێوە داریە. بەس ئەمڕۆ وازم لێ بێنە. ئەگەر نا، بگەمە کاولاشەکە، خۆت دەزانی و من.

ـ لە رووت هەڵنایە کاری وا بکەی.

ـ ئەگەر بگەڕێیەوە، دوایی کە هاتمەوە گەزۆت بۆ دەکڕم.

ـ درۆیان دەکەی، پارەت لە کوێ بوو گەزۆ بکڕی؟

دەکەوێتەوە رێ. منیش بە دوویدا.

کاولاش، کوخێکی رووخاوە ، کە نە دەرگای تێدایە و نە پەنجەرە و لە دەرەوەی ئاوەدانییە.

ئێڤانگلین دەگاتێ و منیش بەدوویدا. ئەو وەژوور دەکەوێ و منیش دوا بەدوای. ئێمە یەکەم کەس نین گەیشتووینێ. ئەوانی دیکە، کە بەپەلەتر بوون، زووتر گەیشتوونەتێ.

کاولاش، مەکۆی ئەو کوڕ و کچانەیە وا ئەم بەهارە بێتەوە دەگەنە تەمەنی هوڕا. لەوێ کۆ دەبنەوە بۆ ئەوەی فێرە سەما بن. دیارە لۆتی و شایەرە دۆمی لێ نییە. بەس یەکێك لە کوڕەکان شمشاڵ یان نایە لێ دەدا.

ئێمە منداڵەکان، لە کۆڵ خوشك و برا گەورەکانمان نابینەوە. بە ریز لە بن دیوارەکانەوە دادەنیشین و، سەیریان دەکەین، کە دەست دەگرن و سەما دەکەن. هەندێکیان گورجوگۆڵترن و هەندێ خاو و شلەپەتە. قەڵەوەکان بە ئاستەم پێ دەبزێون. هەر دەڵێی خڕکە بەردت لە گوێزینگ بەستوون.

ئەو کوڕ و کچانەی چووبێتنە هوڕا، ببڕای ببڕ پێ نانێنەوە کاولاشەکە. چکاریان بەوێ داوە؟ ئەوان هەموو یەکشەممۆیان لەبەردەم یەکێك لە مەیخانەکان کۆ دەبنەوە. ئاوەدانییەکەی ئێمە حەوت مەیخانەی تێدایە، کە خاوەنەکانیان چاویان بە یەکتر هەڵنایە. هەر کام دەیەوێ هوڕا لە بەردەم مەیخانەکەی ئەو بێ و، بۆ ئەوەش، تەماح دەنێنە بەر هەندێ زوڕناژەن و شتی وا و پارەیان دەدەنێ بۆ ئەوەی بێنە ئەوێ. دیارە خراپیشیان لێك نەداوەتەوە: خەڵك دێنە مەیخانە و دەخۆنەوە و دەخۆن و ناچارن پارە خەرج بکەن. جا ئەوە گەنجەکانن دیاری دەکەن لە کوێ بیکەن. بۆ ئەم کارەشیان،

بەرمیلێك شەراب، یان ئارەق و نانەقەیسی و زەمبیلێك لەو سێوە سوورە جوانانەی دێوەرەکان لە کوێستانەوە بە عارەبانە دەیهێنن و بە مەیخانەچییەکانی دەفرۆشن، وەك بەرتیل لێیان وەردەگرن.

وەی لەو دەنگوهەرایەی کاولاش.

کە سەماکە راوەستا ـ کە دیارە هەر راناوەستێ، مەگەر ئیتر بلوێرژەن هەناسەی ببڕێ ــ کوڕەکان کچان دەبەنە کەلێن و قوژبن و لێیان با دەدەن و لە باوەشیان دەگرن و رایاندەمووسن. ئێمەش مندڵەوردکە، رەگی غیرەتمان دەبزوێ و، هەر بۆ خۆڕانان دەستێك دەگەیەنینە کچۆڵەکانی هاوتەمەنی خۆمان.

جاری وایە یەکێك لە کوڕەکان، کە تازە خەتی لێ داوە، بەسەرماندا دێ و دەڵێ: کوڕە ئەوە شەرم ناکەن هەتیوانە؟

ـ ئەی خۆت، تۆ شەرم ناتگرێ؟

ـ من ئیدی گەورەم.

دەی ئێمەش گەورە دەبین.

شەو داهاتووە. مژێکی خەست. هەر دەڵێی لە شوێنێك لە بن عەرزدا ئاگرێکی نەبەدی دەگڕێ، چونکە وا هەست دەکەی مژەکە لە بن عەرزەوە هەڵدەستێ. هەرچۆنێك بێ خۆ لە ئاسمانەوە نایە. وەك بڵێی وێکرا لە گشت لاوە دێتە دەرێ بۆ ئەوەی رۆژە گرژ و مۆنەکە کورتتر بکاتەوە.

بەزمەکە کاولاش تەواو دەبێ. کوڕە بلوێرژەنەکە دەڕوا. زوڕناژەنەکانیش هەروەتر، ئێمەش وەك رانەمەڕێکی سەری لە دووی شوانەکەی نابێ، بەدوویدا.

لە بەردەم کاولاشەکە و لەسەر جادە عارەبانەیەکی چوارئەسپ راوەستاوە. سێ کوڕی لەسەرە: ئاڤێندرێیا برادەرکەی ئیۆنی برام، ڤێردێ و ئالڤیتزا.

بە تەنیشت عارەبانەکەدا رادەبرین. ئالڤیتزا بەسەر دیوارەی عارەبانەکەدا خۆی دەچەمێنێتەوە. قونچکە جگەرەیەکی بە قولینچکی لێوەوەیە. بانگی خوشکم دەکا و دەڵێ:

ـ ئێڤانگلین، وەرە پێشێ دەمەوێ شتێکت لێ بپرسم.

خوشکم رادەوەستێ و دەڕوانێ.

ـ دەبێ بە سرتە پێتی بڵێم.

خوشکم لێی دەچێتە پێشێ. منیش کە وەك گەنەی پێوەی نووساوم، دەچمە پێشێ. وەك جوانوو کە هەنگاوێکی چییە لە ماینەکە دوور ناکەوێتەوە.

هێشتا تەواو نەچووەتە پێشێ، کە ئالڤیتزا ئامێزی تێ وەردێنێ و دەیرفێنێ. وەك باقە یۆنجەیەك و، فڕێی دەداتە نێو عارەبانەکە. ئاڤێندرێ دەیگرێتەوە. خوشکم جارێك دەزریکێنێ. هەر جارێك. بەڵام چ زریکەیەك. ئاڤێندرێیا توند زاری دەگرێ:

ـ کچێ ئەوە بۆ دەزیقێنی؟

ئالڤیتزا خۆی فڕێ دەداتە سەر رکێفی عارەبانەکە و ڤێردێ ئەسپەکان دەداتە بەر قەمچی. ناڵی ئەسپەکان پزیسکی لێ دەبێتەوە. تۆپەی عارەبانە لەسەر چەوەکە قرچوهۆڕی دێ و عارەبانەکە بەرەو سەر گردێ دەڕوا.

چەند کەسێك لە لای منەوە هەرا دەکەن:

ـ هەڵیانگرت، هەڵیانگرت، وەرن هەموو پێکەوە بچینە ماڵی ئالڤیتزا. ئەمشەو لەوێ بەزم و هەڵپەڕینە.

بە غاردان خۆم دەگەیەنمەوە ماڵێ:

ـ دایە، دادەمان دزی.

ـ کێ؟

ـ ئالڤیتز.

دایکم سۆلەکانی لەپێ دەکا و کولۆانەکەی لە دەوری شانوپیلی دەئالێنێ و دەڵێ:

ـ وەرە داریە، دەبێ بچین باوکت بدۆزینەوە.

باوکم لە مەیخانەکەی تۆماس ئۆکێی دەدۆزینەوە. تۆزێك سوور هەڵگەڕاوە. هەر کاتێك چارەگێك ئارەق پێدا دەدا، روومەتی سوور هەڵدەگەڕێن.

ـ چ قەوماوە؟

ـ ئێڤانگلینیان لە بەردەم کاولاشەکە رفاندووە.

ـ کێ؟

ـ ئالڤیتزا.

نووکی سمێڵی دەجاوێ.

دایکم، دادە ئێڤانگلین و ئیۆنی برامی لە مێردە کۆنەکەیەتی. ئەوان، لەسەر ئەو گردەی وا ستانکۆتز و ئادان کاتا لێك جیا دەکاتەوە، پەڵە زەوییەکیان بە میرات لە باوکیانەوە پێ براوە. زەوییەکی کەم و بێهێز و بێ بەرەکەتە، بەڵام هەر شتێك بێ خۆ زەوییە. بە گای باش و گاسنی چاك، کە دەمەگاسنەکەی تیژ بێ و قووڵتر بچەقێ، دەکرێ بەرووبووی باشتری لێ هەڵگری.

ئێڤانگلین و ئیۆن کە گەیشتنە تەمەنی یاسایی، بەشی دەکەن. ئێمە پێمان وا نەبوو ئێڤانگلین ئاوا زوو مێرد بکا، بەڵام ئالێتڤیتزا پەلەی بوو و هەڵیگرت. دیارە زۆربەی کچەکان وایان بەسەر دێ. لە راستیدا نەریتێکی کۆنە. کەسوکاری کچ و کوڕە رێك دەکەون و مەسڵەت دەکەن و ئاو بە ئاگر دا دەکرێ.

ئیۆن سۆچیۆ، کە پێی دەڵێن ئالڤیتزا، کوڕێکی جوانکیلەی تۆکمەیە. ماڵەکەیان لەوبەری ئاوایی و رووبەڕووی ماڵی قەشەبۆلبۆکە و لەگەڵ دایکی دەژی. ماڵەکەی جوانە و هەندێ زەویوزاریشی هەیە. ئەو و خوشکم چەند منداڵێك دەخەنەوە. کار دەکەن. بەو شتانەی خوشکم وەك جیاز و باربوو لەگەڵ خۆی دەیبا و ئەوەی خۆیشی هەیەتی، وەزعیان باش دەبێ. هەر ئەوەندەیە، سەری سوورماوە کە بۆچی گومانی لە هیچ شتێك نەبووە و سۆسەی نەکردووە؟

دایکم کە هەوڵ دەدا تووڕەییەکەی بنیشێنێتەوە، پێی دەڵێ:

ـ زاوا، بەو جۆرە کەمداواترە، ئیتر داوای باربووی زیاتر ناکا.

ـ چی؟ با نەیکا. یانی دەتەوێ کچەکە بە قوونی رووتی بە مێرد بدەین؟ هەر هیچ نەبێ دەبێ دەستێك جلوبەرگی بۆ دابین بکەین.

جا ئەوجار دادەنیشن و بیر دەکەنەوە کە چ بکەن و چ بکڕن.

چیت و قوماشی کراسێك لە شێربۆی بە قەرز دێنن.

بەپێی نەریتی خۆمان، کراسە تایبەتەکەی زاوا و باوکی (تعمیدی) و برازاوا، ئەوە خوشکە بچووکەکان دەیدروون.

پارەیەك لەو ئاغایانە وەردەگرین کە کاریان بۆ دەکەین، دیارە بە قەرز و سەلەم و، کاتی دروێنە، چەند رۆژێك پتر کاریان بۆ دەکەین، بۆ ئەوەی قەرزەکە پاك بێ.

پێڵاوەکان دەبێ لە شاری بکڕین...

جا وەرە ئەم هاوینە، بەو هەمووە قەرز و کارەوە....

تەقەی چەند تفەنگێك لەو سەری ئاواییەوە هەڵدەستێ. گڤەی با، دەنگی ڤیۆلینەکە لەگەڵ خۆی دێنێ.

لە لاقام وەردێنم.*

لە حەوشەکەی ئالڤیتزا، دەرزی هەڵاوێی وەعەرزی ناکەوێ. قەشە بۆلبۆك و ژنەکەی لەوبەرەوە وەك مریشك لەسەر چینەی دیوارەکەیان هەڵنیشتوون. شاگەشکە بووە لەوەی باوکم وا حەیای چووە، ئیدی نازانێ باوکم هەر بیریشی لەوە نەکردووەتەوە.

خۆم دەخزێنمە نێو لینگ و لاقی خەڵکەکە و خۆ دەگەیەنمە ئەو دالانەی ژنان لێی دانیشتوون و مریشك چا دەکەن.

ـ ئەی کوا دادم؟

ژنەکەی تیتزائۆییێ دەڵێ:

ـ لەو ژوورەیە، لای ئالڤیتزا.

لە ژوورەکەوە دەنگی قاقای پێکەنین دێ. ئەگەر ئەوە پێکەنینی دادم بێ، وا دیارە هەموو شتێك بەجێ و رێیە. بەو حاڵەشەوە، زۆرم پێ ناخۆشە کە لەمەودوا دەبێ لە ئالڤیزا بڵێم، کاکە ئیۆن، چونکە ئەو دەمەی دادمی هەڵدەگرت، نەیهێشت لەگەڵیان سواری عارەبانەکە بم. خۆ ئەگەر هێشتبای، گەشت و سەیرانێکی خۆشم بەنەسیب دەبوو. ئەویش چ سەیرانێك، هەر بە خەیاڵیشدا

* لەلاقوەراندن: واتە دەرپەڕین. راکردنی لەنەکاو.

نایە، کە سواربوون لەو عارەبانەیەی ئەسپەکان بەهەموو تینی خۆیان رایدەکێشن و ئەو گەنجانەی لەسەرین، بە خۆشییەوە دەقوولێنن و بە پێوە میز دەکەن. هێندە خۆشە بەخەیاڵیشدا نایە.

کورتی ببڕمەوە، تەدارەکی زەماوەندی بووکێ زۆری نەخایاند: هەر سێ حەفتە. خۆ دەنا ناچار دەبوون لێی بگەڕێن بۆ دوای جێژنی پاك و، جا ئەودەمیش کەس تاقەتی بەزم و رەزمی نابێ، چونکە کار هێندە زۆرن کەس نە دەرفەتی هەیە و نە تاقەتی دەمێنێ.

کە پێ لە ئاوایی دەنێیە دەرێ، تا چاو هەتەر دەکا، دەشت و مەزرایە، مەزراکان بانگی بنیادەم دەکەن کە وەرە بماندوورەوە. هەتا تینت لە ئەژنۆدایە، لە سەر پشتمان ئارەق بڕێژە و خۆ بکوژە. هەر بۆیە لە لادێکاندا، زەماوەندەکان دەخەنە جێژنی نۆیل و سەن تیۆدۆر. چونکە پاش سەن تیۆدۆر، ئیتر بە بۆنەی حەفتەی پاك، حەرامە پەنیر بخۆی.

ئاخ، کە نازانی ئەو رۆژەی بەر لە رۆژانی رۆژوو چەندە خۆشە. باشترە بڵێی چ "شەوێکە".

سەر بە هەر ماڵێکدا بکەی، بەزم و سەمایە. دیارە هەر ماڵێك و بە پێی توانا.

چونکە لە سبەینێکەیەوە نابێ پەنیر بخۆین، عادەت وایە، ئەو شەوە هەتا خنخناکە پەنیر دەخۆین. بەڵام ئەوانەی پەنیریان دەست ناکەوێ، هەرشتێکیان دەست بکەوێ، تۆڵەکەی لەو دەکەنەوە. لە فەریکەنۆکەوە بگرە تا پیاز و گوڵەکەلەم. ئەوەندە دەخۆن هەناسەیان لێ دەبڕێ و، ئەوەندەش ئارەقی بەسەردا دەکەن، لە لووتیانەوە دێتەوە دەرێ.

خوا نەکا، ئەو شەوە کچێکی عازەب لە ماڵی باوانیدا مابێتەوە. چونکە ئیتر تا زستانەکەی دادێ، کەس پێی ناڵێ کەرت بەچەند. سێ مانگەی بەهار و هاوین خەڵك گرفتاری کاروبارن و نایانپەرژێ سەری خۆیان بخورێنن. ئەگەر کچەکەتت بەمێرد نەدابێ، لە سەر گردەکەوە بانگت دەکەن و گۆرانیت پێدا هەڵدەڵێن و گاڵتەت پێ دەکەن.

ئێمە هەموو جارێ بەبێ ئۆقرەییەوە چاوەڕوان دەبین، بۆ ئەوەی تۆزێك بەو گۆرانیانە کەیف بکەین.

گەنجەکان دەبنە دوو دەستە. دەستەیەکیان دەچێتە سەر گردەکەی بەری خۆرهەڵات، کە بەسەر ئاواییدا دەڕوانێ، ئەوی دیکەش دەچێتە سەر گردەکەی رووبەڕووی.

ئەوەش دەنگە نەرم و نیانەکی رادۆتاناسێیە، کە دەچریکێنێ:

ـ خوایەگیان، خوایەگیان، خۆشەویستان، هاوڕێ ئازیزەکان.

ـ هۆ، کوڕە ئەوە چیت لێ قەوماوە وا دەنووزێنی؟

لە گردەکەی دیکەوە دەنگی گیونیا رۆتارۆ بۆی دەستێنێتەوە:

ـ بۆیە دەناڵم، تۆماس ئۆکێ کچۆڵەیەکی ناسك وخرپنەی هەیە و هێشتا بە مێردی نەداوە.

ـ بۆ؟ لەبەرچی نەیداوە بە مێرد؟

ـ لەبەر ئەوەی باوکی ئەوەندەی زەوی بۆ لە قەباڵە نەکردووە، بەو دوعایەی بڵێین ئامین.

ئێمەش خۆشی خۆشی گوێمان مووچ کردووە.

ـ من چاوەڕێی قسەی زۆر لەوە خۆشتر بووم.

ـ ئەوە شەرم ناکەی داریە؟

ـ تۆزێك.

ـ چاو و دڵمان روون.

خەڵکی ئاوایی بە ژن و منداڵەوە لەبەر دەرگای ماڵەکانیان کۆ بوونەتەوە و پاڵیان بە لاشیپانەی دەرگاوە داوە و گوێیان راگرتووە و پێدەکەنن.  بەڵام پێکەنینەکەیان زوو دەڕەوێتەوە، چونکە تەنانەت یەك کەسیش چیە، لە چزووی زمانی هەتیومەتیوی سەر گردەکە دەرناچێ. تەنانەت لە نێو پیاوانیشدا هیی وا هەیە، کە ئەگەر پێدەکەنێ، بۆیە پێدەکەنێ فرمێسکی نەڕژێ. هەندێکیان ددانیان چیڕ کردووەتەوە و جنێوان دەدان و، دەچنەوە ماڵێ، هەندێکیان دەهری دەبن و دەست دەدەنە تێڵا و بەرەو گردەکە دەچن و ئەو هەتیوە بێ چاوڕووانە راو دەنێن و هەر کامیان بگرنەوە خوریشۆری دەکەن. بۆ بەیانی زۆر لەو لاوانە و تەنانەت پیاوەکانیش دەبینی، سەروگوێلاکیان هەڵپێچاوە. ئیتر مەسەلەکە دەبڕێتەوە.

ئێڤانگلینی خوشکم دەرفەت نادا ناوی بەرنە سەر گردەکە و، تەنانەت بەر لەوەی تەمەنیشی بگاتە بەشداری لە جێژنی هوڕادا، مێردۆکێ دەکا.

شەوی بەر لە دوازدەرۆژەی رۆژوو، تەنانەت قەیرەکوڕەکانیش بە نۆرەی خۆیان دەکەونە بەر تیر و چزووی زمانی هەتیوەمەتیوی سەر گردەکە. کوڕەکان سەریان لە دوو دەنێن و دەیانگرنەوە و، ئەو

هەمبانەیەی فوویاندا، بەسەریاندا دەدەن. کارێکی باش دەکەن. دەبێ شەرم بکەن لەوەی ڕەبەن کەوتوونەتەوە و بوونەتە پیرەکوڕ. هیزەکە گرمەی دێ.

ـ داریە دەزانی هەبانە چییە؟

ـ کوڕە چۆن نازانم، چەرمە گایەکە و هەڵیاندووریوە. کون و کەلێنی دەگرن و بای تێدەکەن. وەك دەهۆڵ دەنگی دێ.

ئاخر شەوی پێش دوازدەشەوەکە، ڕووداوێکی دیکەش لە ئاوەدانیدا دەقەومێ:

ئەگەر کچێکی عازەبت هەبێ و هێشتا بە مێردت نەدابێ و، گەنجەکان لەبەر شتێك نەیانەوێ لە سەر گردەکەوە تانە و تەشەرت تێگرن، ئەوە بە سەگەکانتی هەڵدەڕێژن.

سەگەکانت بانگ دەکەن، کە هاتنە پێشێ، قوتووەکی بەتاڵیان لە کلکی دەکەن و لە قوتووەکە دەدەن. پێیان وایە ئەو سەگەی شەوی سەنت تیۆدۆر تەنەکەی لەکلکی نەخا، بەر لە کۆتایی ساڵ هار دەبێ.

حەز دەکەی سەگەکەت هار بێ؟ خۆ سەگی هارت نییە. کەواتە ئەگەر دیتت ئەوە گەنجەکان لە سەگەکەتیان هەڵکێلاوە، پێت ناخۆش نەبێ.

بەهارێ، جگە لە هاری، بەڵایەکی دیکەش دەبارێ: جەندەرمە، ئەو داماوانەی دەستیان لە پشتەوەڕا شەتەك دراوە، وەپێش خۆیان دەدەن و دەیانبەنە نەخۆشخانەی شار. ئەو داماوانە پێستی دەستیان داماڵراوە. گول بوون، چونکە گەنمەشامیی رزیویان خواردووە.

هەموو ساڵێ بەهارێ، ژن و پیاوی لادێ زۆریان تووشی پێلاگرێ دەبن. جەندەرمە دەیانگرن و قۆڵبەستیان دەکەن و دەیاندەنە نەخۆشخانەکە. ئەو نامانەی دێن، هەواڵی مەرگی ئەوانیان تێدایە، بەڵام دوای ئەوانیش هەر رۆژ دەبێتەوە.

دوو برا دراوسێمانن، برایەکی شێتیان هەیە ناوی ساندۆیە. ئەوانیش گول بوون. قەشەبۆلبۆك دیتوونی کە چۆن ژووتەی پۆلیس راپێچەکی داون بەرەو وێستگەی شەمەندەفەر.

ـ بۆ دەیانبەی جەنابی پۆلیس؟

ـ پێلاگرێ شێتی کردوونە باوە.

ـ نا رۆڵە، ئەوانە بە پێلاگرێ شێت نەبوونە، بۆیە شێت بوون شەوی سەنت تیۆدۆر، دوو تەنەکەیا لە کلکیان نەخستوونە.

ـ بەڵام باوە، خۆ تەنەکە لە کلکی سەی دەخەن.

ـ راست دەکەی جەناب گیان. ئاخ ئەوانەش هەر سەن. لەو سەگانەی قەت سەرێك بە کلێسادا ناکەن. دەبێ تەنەکەیان لە کلی بخەی.

❊

❊

❊

حەفتەیەك پاش ئەوەی ئالڤیتزا خوشکمی هەڵگرت، بە جووتە دێنەوە ماڵی خۆمان. ئێڤانگلین دەڵێی لاوازتر بووە. رەنگی بزرکاوە و دەوری چاوی شین و مۆر هەڵگەڕاوە.

ئالڤیتزا قونچکی جگەرەکەی لە بن سمێڵە حیزەکەی ناوە و، کە بە رێدا دەڕوا، دەڵێی خۆی دەلەنگێنێ. هەر وا جگەرەش بە جگەرە دادەگیرسێنێ. دایکم زۆری خۆش ناوێ.

ـ سلاو باوکە.

ـ سلاو دایە.

ـ یانی ئاوا، کچی منت هەڵگرتووە.

ـ چاوم بەرایی نادا ببینم بووەتە ژنی کەسێکی دی. زۆرم خۆش دەوێ.

ـ ئەی بیرت لەوە نەکردەوە، ئەو کچۆڵەیە هێشتا پێنەگەیوە؟

ـ جا منیش هەر کەیفم بەوەی دێ: ژنەکەت منداڵکار بێ.

ـ زۆر باشە، باشە.

ـ منیش هەروام حەز لێیە.

ئێڤانگلین هەر بەدەوری مێردەکەیدا دێ. چاوی لێ ناترووکێنێ. لەوەتەی مێردی کردووە، هەر سەیری ئەو دەکا. ئیتر چاوێکیش چییە لە لای ئێمە ناکا: نە لە براکانی، نە لە خوشکەکان و نە لە دایە و نە لە باوکیشم.

ـ باوکە، هاتووینەوە بزانین کەی زەماوەندەکە بکەین.

ـ دەی باشە، با بڕیار بدەین، کەی باشە؟

ـ دوو حەفتەی دی.

ـ ئاخر جیازی ئامادە نییە.

ـ قەیناکا، تا دوو حەفتەی دی ئامادەی دەکەن.

ـ ئەی کێت دەسنیشان کردووە بۆ برازاوا[*] ؟

ـ کوڕەکەی گایینا.

کوڕی گایینا دراوسێی ئالڤیتزایە.

باوکم دەڵێ: دەستت لەسەر کەسێکی باش داناوە. کوڕێکی باشە... دەی باشە بڵێ بزانم چەندەت زەوی دەوێ؟

ـ بیرم لەو شتانەش کردووەتەوە باوکە. نیوەی ئەو زەوییەی بە ئێڤانگلین بڕاوە بدەن بە ئێمە و ئەوی دیکەش بۆخۆتان. ئەگەر دواتر منداڵەوەردکەمان لێ زیاد بوون لەوانەیە ئەوی دیکەشتان لێ بستێنین.

ئێمە ئەو هیوایەمان نەبوو.

لەسەر جلوبەرگیش دەست دەکەن بە چەنەلێدان.

ئالڤیتزا دەڵێ: باوکە جووتێك جزمە بۆ تۆ دەکڕم. جووتێك پێڵاو دەدەمە ئیۆن. مشووری گیۆرکێی ژن براشم خواردووە: جووتێك پۆستاڵی بۆ دەکڕم و بە پۆستەدا بۆی دەنێرین. بۆ هەر کام لە کچەکانیشت جووتێك قاپقاپە. بۆ ئەو خنجیلانەیەش، ئەلیزابێتی خوشکم دەڵێ، جووتێك قاپقاپ و کراسێك.

زمانی بە سمێڵیدا دێنێ و ددانی کە وەك بەفر سپین، وەدەر دەخا. هەتیوەیەکی ژیکەڵەیە ئالڤیتزا. چاوی دەڵێی دوو پشکۆی ئاگرن، دەگەشێنەوە.

---

[*] بەپێی دەقەکە، ئەو برازاوایە، برازاوایەکی جیاوازە لەوانی دیکە و وەك بەربووك وایە و زاوا فێری کاروبارەکەی شەوی پەردوو دەکا. دەشکرا لەسەر کێشی بەربووك پێی بڵێین بەرزاوا....

باوکم دەڵێ: ماڵت ئاوەدان بێ. ئێمەش پارچە زەوییەکە دەدەینە کچەکەمان و، جلوبەرگ و کەلوپەلەکەشی بۆ دابین دەکەین. کراسی بووکێنیی ئیڤانگلین و کراسی زاوا و برازاواش هەر ئێمە دەیکڕین. تەنانەت بڕیاری ئەوەشمان داوە، کە کراسێکیش بۆ دایەش بکڕین. هیچ نەبێ ئەو تۆی گەورە کردووە و پێی گەیاندووی.

دایە، مەبەست دایکە رادای ئالڤیتزایە، خەسووی ئێڤانگلین. هەموو ئاوایی پێی دەڵێن ورچەکۆن. خوشکیشم کە لەگەڵ ئێمە باسی ئەو دەکا، هەر وای پێ دەڵێ.

ـ بەڵام وا باشترە تۆ هەر پێی بڵێی دایکە.

ـ بۆ پێی بڵێم دایکە؟ بۆ ئەو گەورەی کردووم؟ خوا ئەو سەروسەکتەی بەرێتەوە. لە قسەکردنیشدا ئەوەندە لەچەرە، دەڵێی لاڵەپەتەیە. پێی حەیفە قسەکانی لە بن ددانییەوە بتفێتە دەرێ. بیستوچوارسەعاتە بە دەوری نیکی شای کچیدا دێ.

ئیتر ، ئەوەش زەماوەند.

لە ئێوارەی جومعەڕا خزم و کەس بەسەردا دێن. خزم و کەس لە بنی دنیاوە وەڕێ کەوتوون و پێش هەمووشیان ـ خۆ دیارە ـــ سەروسەکتی پوورە ئۆتزۆپار و دیتزای کچی پەیدا دەبێ. ئەوان لە سێکاراوە دێن. وەك هەموو جارێك هەتیوەبەرەڵای گەڕەك، لە کچەپوورەکەم کە گەورە بووە بەڵام زیندان تۆزێکی شکاندووە، کۆ دەبنەوە.

باپیرە و داپیرە و براچکۆڵەکەی دایکیشم، خاڵە دۆمیتراکیێش لەگەڵ دادە ئانیکای ژنی لە کارلۆمانەوە هاتوون.

خاڵە دۆمیتراکیێم دوو ساڵ نابێ ژنی هێناوە. ژنەکەی قژکاڵ و دەموچاوخڕ و چاوشینە. هێشتا هیچ نەبووە، کوڕێکی کاکۆڵ زێڕینی بۆ مێردەکەی خستووەتەوە.

دادەئانیکا دێتە نزیك کوانووی ئاگرەکە و، منداڵە مەلۆتکەکراوەکەی پێشانی دایکم دەدا:

ـ پوورە ماریا، دیوتە ئیۆنیکای من چەندە لە بابی خۆی دەچێ؟

خاڵە دۆمیتراکیێ، ناشیرین و سوورهوولە، منداڵەکەی لووتپان و رەشە، هەر دەڵێی خۆڵەمێشیان لە روومەتی هەڵسویوە. دایکم سەیرێکی منداڵەکە دەکا و دەڵێ:

ـ باشە، دەی دیارە لەگەڵ براکەم دەڵێی سێوێکن و لە نێوەڕاستەوە لەتت کردوون.
ئەو قسەیە دەکا و چاوێك لە ئێمە دادەگرێ. خاڵە دۆمیتراکێ، سینگی دەردەپەڕێنێ و لەخۆشیان شاگەشکە دەبێ. منداڵەکەی لە باوەش دەگرێ و رایدەژێنێ.
منداڵەکە دەڵێی سێوێکە و لەگەڵ یەکێك لە دراوسێکانی باپیرەم بە ناوی نیتزالیتزا، کە پێی دەڵێن "قەرەج" لەتت کردوون. خاڵە دۆمیتراکێ نەبێ، هەمووان ئەوەیان لێ روونە.
کچە پوورەکانی دایکم، بنەماڵەی چیپۆریایش لە کارلۆمانەوە هاتوون.
سیکا چیپۆریای کچەپووریشم کە چاوێکی تانەی لەسەرە، هەشت منداڵی خستووەتەوە کە یەك دانەشیان نەمردووە. ژنی بۆ هەمووان هێناوە. لە تەنیشت کۆنەماڵەکەی خۆیەوە داوێتی سێ خانووی دیکەشیان بە ریز دروست کردووە، کە ئاخر خانوویان کەوتووەتە سەر لێواری ئاوەکە. ئەگەر لە پەنجەرەوە دەست بەری، سەری قامیشەکان وە پەنجەت دەکەون. گۆلەکە لەو شوێنەوە پاناوکە و قامیشەڵانە. چیپۆرییەکان، بۆ ئەوەی خۆیان بگەیەننە رەزەکەیان لە نێوەندی گۆلەکەدا، گەمیشیان هەیە. خەڵکی کارلۆمان لەسەر گردێکی ئەوبەری گۆلەکە رەزیان چەقاندووە. ئەو رەزانە ترێیەك دەگرن، کە دەنکە سوورەکەیان جووت جووتن و وەك هەنگوین شیرینن.
پار، پوورە چیپۆریا ماوەیەك لە نەخۆشخانە کەوت. ئێستا کە لەسەر سێ پێچکەیەك دانیشتووە و مریشکە کوڵاوەکەی لە ئاوەکولێوەکە دەرهێنا و هەڵمی لێ هەڵدەستی، لەتوپەت دەکا و باسی نەخۆشینەکەی بۆ دایکم دەگێڕێتەوە:
گوێت لێمە ماریا؟ شەمەندەفەرێکی ئاسنەرێ لە مێشکمدا بوو، کە دەنگێکی سەیر و سەمەرەی لێ هەڵدەستا و بێبڕانەوە هۆڕنی لێ دەدا. شەو و رۆژی خوای، بە تەقوتۆق و گرموهۆڕی تایەکانی و دەنگی ئەو هۆڕنە نەفرەتییەی گوێمی کەڕ دەکرد. هەر خوا خۆی دەزانێ چوومە سەردانی چەند نووشتەنووس و جادووگەران و چیها دەرمان و گیراوەی سەیروسەمەرەیان دەرخوارد دام، بەڵام هیچ کامەیان دەرمانی دەردم نەبوون. ئیدی کوڕە گەورەکەم هەڵی گرتم و بردمی بۆ تۆرنۆ بۆ لای حەکیم. حەکیم. حەکیمێکی ردێن درێژ، دەتگوت بزنە. لەسەر مێزێك درێژی کردم. نازانم چ بوو لە بن لووتمی دانا، جا هەر شتێك بووبێ، ژانێکم لەدڵی گەڕا هەر مەپرسە. بەر لەوەی خەوم لێ بکەوێ، پێی گوتم

هیچ نەترسم. چونکە دەیەوێ کاژەڵاکی سەرم لێك بکاتەوە و شەمەندەفەرەکەی لێ دەربێنێ. نازانم چەندە نوستم. دەتگوت عومرێکە. ئەرێوەڵا عومرێك. کە هەستام سەرم پێچرابوو و شەمەندەفەرێکی بچووکی تەنەکە لە سەر بالیفەکەی ژوورسەرم بوو.

حەکیم هەڵیگرت و پێشانمی دا و گوتی: ئەوەیە، ئەوەتا دایکەکەم. ئەوەی لە کەللەی سەرتدا بوو، ئەمە بوو. کاسەی سەرتم هەڵگرت و ئەم شەمەندەفەرەم لێ دەرهێنا و دیسان سەرتم دوورییەوە... ئازارێکت هەیە؟

ـ نەخێر رۆڵە گیان، ژانم هەر نییە.

ـ هەر دەبێ واش بێ. دیسان لە مێشکی سەرتدا دەنگ دێ؟

ـ نا رۆڵەگیان.

دیسان قەیرێك لە نەخۆشخانە رایگرتم و ئیتر هاتمەوە ماڵێ. گورجوگۆڵتر لە جاران. ئەی لەو حەکیمەی.

ـ ئەی پوورە گیان چیت لە شەمەندفەرە چکۆڵەکە کرد؟

ـ شەمەندەفەر؟ دکتۆر گلی داوە. گوتی دەینێرمە مۆزەخانە.

هەر هەشت کوڕەکەی پوورە چیپۆریا هاتوونەتە سەر زەماوەندەکە. بە چوار عارەبانە هاتوون. ژنەکانیشیان هێناوە. لەگەڵ کوڕی گەورەیان. بەخوای کارێکی باشیان کردووە هاتوون.

لە خزم و کەسەکانی هەر دوو لای ئۆڵتێمان، تەنیا مامە گابۆنێ و ئارێتیای ژنی هاتوون. لە هەردوو بەری کاڵمات زۆیی خوشکەکان و خوشکەزاکانی بابم هاتوون. جا باشە ئەو هەمووە خەڵکە لە کوێ بنوون؟ بەسەر دەرو دراوسێ و دۆست و برادەرەکانی ئاواییدا دابەشیان دەکەین. خۆ پیاو هەموو رۆژێ شایی و لۆغانی نابێ، ئێڤانگلین خۆ هەموو رۆژێ مێردێ ناکا.

ئەوەش شەوی شەممە. میوانەکانمان هەتا بەیانی لە ماڵی ئێمە دەبن، دەخۆن و دەخۆنەوە و شەوچەرەی دەخۆن.

لە ماڵی زاواش، شایەرە قەرەجەکان بە تەپڵ و دەهۆڵ و زوڕنا بەزمیان گەرمە. من و ریتزا و ئەلیزابێتی خوشکم کە هێشتا زۆر منداڵە، دەچینە لای ماڵی زاوا. ریتزا لە پێشەوە دەڕوا و ئێمەش بەدوویدا.

خزم و کەسی ئاڵڤیتزا ـــ ئامۆزا و خاڵۆزا و پوورزاکانی ـــ هەر هەموویان لە ماڵەکەی کۆ بوونەتەوە. بەربووك هێشتا نەهاتووە. وەك لە ئاواییەکەدا باوە، ڤێردێ، کە ئاڵڤیتزا کردوویەتە برازاوا، لە خەڵکەکەی گێڕاوەتەوە: قومقمۆکەیەکی پڕ کردووە لە ئارەق و بە کۆڵانەکانی دێدا دەگەڕێ و تەنانەت بۆرە خزمەکانی زاواشی داوەت کردووە...

بەیان ئەنگوتووە. شایەر هەتا کەڕەی بەیانی گۆرانییان گوتووە و لۆتی لە دەهۆڵ و زوڕنایان داوە. بەرەبەری بەیانی هەر کەسە و لە گۆشەیەکەوە سلار دەبینەوە و وەنەوەزێك دەدەین.

زەماوەندە راستییەکە لە بەیانیی یەکشەممەوە دەست پێ دەکا. جێژنەش، هەر دوانیوەڕۆ و ئێوارەی ئەو رۆژەیە. من خۆم وەك گەنە بە ئێڤانگلینەوە نووساندووە. تا ئێستا، لە ژیانمدا ئاوا جوانم نەدیتبوو. هاوڕێ و دەستەخوشکەکانی هەموو لێرەن.

ئەو لکە دارەی ڤێردێ لەگەڵ خۆی هێناوێتی، دارێکی تەواوە: چووە خەڵفێکی ئاڵوباڵووی هەڵکەندووە و کچان بە چڵەریحانە و گوڵی رەنگاوڕەنگ دەیڕازێننەوە. ئەو قردێلانەی لێی دەبەستن، وا دەدرەوشێنەوە، دەڵێی زیون، بەڵام نا زیو نین.

ریتزای خوشکم دێ و پێم دەڵێ: ئەوەی دەیڕازێننەوە سنۆبەری بووکەخانە. منیش کە تۆزێك گەورەتر بووم، دەبمە بووك و جا ئەودەم ئاوا سنۆبەری بووکێنی بۆ منیش دەڕازێننەوە.

هەرچۆنێك بێ، ئەوە سنۆبەرەکەی بووکێ ئامادە بووە. لە راڕەوەکە رازاندوویانەتەوە و دەیبەن لە بەردەم ماڵێ قوتی دەکەنەوە. هەموو خەڵکی ئاوایی لەپشت پەرژینەکانەوە کۆ بوونەتەوە و سەیری دەکەن.

ـ ئەی لەو سنۆبەرە جوانەی بووکێ.

ئێڤانگلین دەبەنە ژوورەکەی خۆی. من خۆم دەخزێنمە نێو کچەکانەوە، کە یەکدەنگ وەك قالاو دەقیڕێنن و وێکڕا هرووژم دەبەن و بەرەو لای بووك رادەکەن. رووتی دەکەنەوە و ختووکەی دەدەن و نقورچکی لێ دەگرن و کراسە جوانەکەی لە باولەکە دێننە دەرێ و دەیکەنە بەری.

لەسەر ئەو کراسەوە، جلی بووکێنییەکەی کە لە تۆڕ چنراوە، لەبەر دەکەن. بە گۆرەویی سپی و پێڵاوی سپییەوە. سەری بۆ دادێنن و قژی بۆ دەکەنە کەزی. چلە ریحانەشی لە نێو کەزییەکانی دەچەقێنن و ئەوجار تارای بووکێنیی کە لە شار کڕیویانە، بەسەردا دەدەن. تۆڕەکە سپی و ناسکە و هەموو شتێك لە ئەوەڵەوە دیارە. بووك رێکەوڕاست وەك خێوەکانی سەر خەرمانی لێ هاتووە. هەر وا بەسەر پێوەیە. پێڵاوەکەی لاقی دەگرێ. هەموو کچەکانی دێ، شەوی زەماوەند، پێڵاوەکانیان لاقیان دەگرێ. ئاخر قۆندەرەکان تەسك وباریکن و پاژنە بەرز و قاچی بووکیش زل و پان. کە بە پێخواسی گەڕای، پێت پان و زل دەبن. پەنجەی پێت گرنج گرنج دەبن و خواروخێچ.

تاراکەی سەری ئێڤانگلین ئەوەندە درێژە، لە عەرزی دەخشکێ. نیوتاجێکیان لەسەری ناوە، لە گوڵەکاغەزیی سوور و زەرد و شین چنراوە.

بووك، خوشکەکەم، تەنانەت ناتوانێ لە جێیەکیش دانیشێ. هەتا شەوێ، تا دەچێتە سەر جێوبانەکەی، دەبێ هەروا لە بن ئەو خشڵ و قایش و قرووشانەدا قیت قیت راوەستێ، وەك گۆچانی قووت دابێ.

ئیتر بووك حازرە. لەبەردەرگا، سنۆبەر چاوەڕێیە. ڤێردە، برازاوا پیلی بووك دەگرێ و دەیباتە سەر کانییەکەی بەردەم ناحیە. ئەو کانییە لە هەمووکانییەکان پتر لە ماڵەکەی نزیکە. کانییەکە، کە ئیتر تا مردن هەر دەبێ بێ و لەوێ ئاو بۆ ماڵەکەی بەرێ.

لەو رۆژەوە کە هەڵیانگرتووە، چەند جاری دیکەش چووەتە سەر ئەم کانییە، بەڵام ئێستا برازاوا دەیباتە ئەوێ.

برازاوا چەندی لە توانایدایە، سنۆبەرەکەی بووکێ بەرزتر رادەشەکێنێ. شایەرە قەرەجەکان لە پێشیانەوە دەڕۆن. شایەر و لۆتی چوار کەسن، کە یەکبین لێی دەدەن و دەیلێن. دەنگی دەهۆڵ و

زوڕناکەیان لە هەموو دێ دەگەڕێ. ئەوە یەکەم جارە من دێمە زەماوەندێك، کە شایەرەکانیان لە شارەوە هێنابێ. ئەویش شایی ئێڤانگلینی خوشکم.

ـ ئەی لەو فێڵەی ئەو ئالڤیتزایە، تووتکە سەگ چەندەش لە خۆڕازییە. دەیەوێ هەمووومان وڕ و گێژ بکا. تەنانەت کوڕەکەی قەشەش شایی و لۆغانی وا ناکا.

ـ جا باشە، وەختایەك بۆی هەڵدەسووڕێ، بۆ نەیکا؟

ـ بەو کارەی دەیەوێ بڵێ، بووکەخانی زۆر خۆش دەوێ.

لەوانەیە وابێ، لەوانەشە ویستبێتی چاوبزەی ئێمە بدا.

ئێڤانگلین، دەسکێکی تازەتاشراوی لەسەر شانی داناوە و، دوو سەتڵی یەك لە پێشەوە و یەك لە دواوە، لە جەمسەرەکانی بەستووە و شۆڕی کردوونەتەوە، کە وەك جیاز، لەگەڵ خۆی هێناونی و هێشتا نەیداونەتە مزگەر سپییان بکاتەوە. نەیداوە مشتومالّیان بدەن بۆ ئەوەی هەمووان ببینن و بزانن مسی بێخەوشن و تازە کڕدراون. هەر بەراستی، بەر لەوەی مێردیش بکا، نایەوێ بۆ کارەکانی ماڵەوە دەکاریان بێنێ. ئەمڕۆ هەموو ئاوایی دەبێ بزانن بووکەخان، جووتێ سەتڵی تازەی لە دایك و باوکی وەرگرتووە مسی بێخەوشن، ئەسکوێیەکی دەسکدرێژی لەوی پێشەوە خستووە، ئەویش هەر مسە. ئەسکوێیەکەی وا خستووەتە سەتڵەکەوە، کە چەندی بکرێ دەسکەکەی جوانتر دیار بێ و لەچاو بدا، چونکە وەستا مزگەرەکەی شاری، گوڵی لەسەر هەڵکۆڵیوە.

بووك و هاوڕێیانی گەیشتوونەتە کانی. خوشکم، دۆلکەکە شۆڕدەکاتەوە نێو بیرەکە و هەڵیدەکێشێ و لە سەتڵە مسە جوان و تازەکانی خۆی دەکا و هەڵیاندەگرێ و چەند مەترێك لەولای بیرەکەوە دایاندەنێ. شایەر دیسان دەست پێدەکەنەوە. بووك و برازاوا و کچ و کوڕان لە دەوری سەتڵەکان دەست دەکەن بە سەمای هۆرا. بەڵام هێشتا سێ گەڕ هەڵەپەڕیون، لە سەما دەکەون. خوشکم سەتڵەکان هەڵدەگرێ و بە سەری دەسکەکەیاندا دەکا و دەیخاتە سەر شانی. شانی دەنوشتێتەوە. سەتڵ قورسن. ئاخر مسن. مسەکەیان ئەستوورە و تازە پڕیشن لە ئاو. ئەوە بۆ ئەوەیە بووك بزانێ لەمەودوا قورسترین کارەکانی ماڵەوە لە ئەستۆی ئەون. بۆ ئەوەیە بزانێ دەبێ خۆی لەبەر بارستایی کار و زەحمەت ڕاگرێ. داماوە، خوشکم لە بن قورساییەکەیدا دەچەمێتەوە، بەڵام هەموو تینی خۆی کۆ

دەکاتەوە، هەرچی قەوەتی هەیەتی. پشتی قیت دەکاتەوە و دەڕوا. سەربەرز و بە شانازییەوە. دەگاتەوە بەردەم ماڵێ. لەبەردەرگای ماڵێ، ورچەکۆن ـ خەووی ـ بە نان و خوێوە بە پیریەوە دێ. بووکێ سەتڵەکان دادەنێ و لەتێ نان لە خوێیەکە وەردەدا و لە زاری دەنێ و ئەوجار بە درۆ دەست دەکا بە گریان. ئەوەش دابە. سەنتوورژەنی دەستەی موتریبەکان تێی دەچریکێنێ

بووکێ مەگری مەبارێنە
سەرهەڵێنە، سەر هەڵێنە
خەسوو لێت رازییە بووکێ
سەتڵ سەتڵ ئاو بهێنە

شایەر دەڕۆن. لەگەڵ برازاوا دەچن بەربووك بێننە ماڵی ئالڤیتزا.
خەریکن مێزەکە بۆ نانی نیوەڕۆیە دەڕازێننەوە. تا ئەودەم خوشکم سواری عارەبانەیەك دەکەن. منیش خۆم فڕێ دەدەمە سەرێ. دەی خۆ دیارە.
ـ ئەوە دیسان تۆی. ئەرێ دەکرێ دەست لەو سەرە کەچەڵەی ئێمە هەڵگری؟
ـ دەمەوێ هەموو شتێك ببینم.
ـ دەی باشە، سەیر بکە.
عارەبانەکە دەچێتە بەر دەرگای ماڵمان. دایکمان جیازەکەی خوشکم دێنێ و سواری عارەبانەکەی دەکا. سندووقێکی سوورە و لە شاری کڕیویانە و جلوبەرگەکەی بووکیان تێ ناوە. دۆشەگ و باڵنج و لێفە و بەتانی، هەر هەمووی لەسەر سندووقەکە هەڵدەچنن. برازاوا لە تەنیشت بووکێ دادەنیشێ. گەنجەکان وەك هێشووی ترێ، خۆیان بە عارەبانەکەوە هەڵدەواسن. هێشتا جێی دوو گۆرانیبێژەکە ماوە سوار بن. وای لێدەدەن و وای دەڵێن، ژێی سازەکانیان شەڕیانە. عارەبانە بەو وەزع و رواڵەتەوە بە هەموو کۆڵانەکانی دێدا دەسووڕێتەوە. هەتا رۆژ ئاوا دەبێ بە ئاواییدا دەگەڕێ.

ئیتر تاو خەریکە ئاوا دەبێ. هەرچی خزم و کەسی هەمانە و حەزیان لێبووە بەشداری زەماوەندەکە بن، لە حەوشەکەی ماڵی زاوا کۆبوونەتەوە. دەهۆڵ و زوڕنا بێ پسانەوە لێی دەدەن. ئارەقە لە سێبەندەیان دەچۆڕێ. ئاڵقەی شاییەکە، هەر دێ و گەورەتر دەبێتەوە* .

عارەبانە بە شوێن یەکتردا ریز کراون. زەنگوڵەی ئەسپەکان زرینگەیان دێ. قەمچی لە ئاسمان گڤەی دێ. تەقەی خۆشیە. کاروانی عارەبانەکان لەبەردەم ناحیە رادەوەستن. بووك و زاوا دەچنە بەردەم شایەتەکان لە دایرەی ئامار و قایمقام لە دەفتەرەکاندا ناویان تۆمار دەکا. دوایی دەچنە کلێسا و قەشە مارەیان دەبڕێ. جا دەچنەوە ماڵێ، کە لەوێ هورا تۆزی هەستاندووە. گۆرانیبێژ لە نەکاو خاوی دەکەنەوە و دەست دەکەن بە تەدارەك بێ مەبارەك بێ. زاوا لە شانی راستی بووکێ راوەستاوە و برازاواش لە شانی چەپی. لەمبەرو لەوبەریشیان خەزووران، کە هەر کامە و مۆمێکی گەورەی داگیرساویان بەدەستەوەیە. مۆمەکان سپین و هەر کامە و قردێلەیەکی سووریان لێ بەستراوە. ئاڵقەی سەماکە سێ جار بە دەوری قەرەجەکاندا کە لەو نێوەندە راوەستاون، دەخولێتەوە. کە خولی سێیەم تەواو بوو، خەڵکەکە وەك دیوارێکی گۆشتی، دەورانددەور راوەستاون، بۆ ئەوەی باشتر سەمای هۆرا ببینن، رێیان بۆ دەکەنەوە بۆ ئەوەی دەستەی لۆتییەقەرەجەکان بێن و سەما بە ورچەکانیان بکەن. منداڵ زراویان دەچێ و بە زیق و هۆڕ رادەکەن. ئاڵقەی سەماکە لە چاوترووکانێکدا دەشێوێ و مەیدانەکە دەکەوێتە دەستی ورچبازەکانەوە. ورچەکان دەژمێرم. دوازدەن. ورچبازەکان لە شانی گۆرانیبێژەکان رادەوەستن و دەفە زەنگییەکانیان دەزرینگێننەوە. ورچ باوێشك دەدەن و دڕدۆنگن. ورچباز دادێنەوە و هەندێ قسەی رەمزاوی بە گوێیاندا دەچپێنن، نازیان دەکێشن و بە ئەژنۆ پاڵیان پێوە دەنێن و، داردەستە ئەستوورەکانیان بە پشتەملیاندا دەکێشن تا سەر کلکیان، وەك بڵێی بیانلاوێننەوە. ورچ غیرەتیان وەبەر دێ و هەڵدەستنە سەر پاشوان و دەستی یەك دەگرن. رێك وەك چۆن بنیادەم دەست لە نێو دەستی یەکتر دەنێن. دەهۆڵکوت لە دەهۆڵ دەدەن و زوڕناژەن لە زوڕنا دەتووڕێنن و شایەر دەنگ هەڵدێنن. هۆرا لە هەوەڵێش گەرمتر دەبێتەوە و دەست دەکاتەوە بە سووڕانەوە. خەڵکەکە بە پاڵەپەستۆ وەك دیوار لە دەوری هۆرا کۆزیلکەیان بەستووە. ورچەکان

---

* لای خۆمان دەڵێن: شاییەکە ئەوەندە گەورە ببۆوە، بە دوودەست هەڵنەدەگیرا. واتە بە دوو سەرچۆپییش هەر هەڵنەدەستا.

هەڵدەپەڕن، ڕێك وەك دەستەیەك بنیادەم. ورچباز بە چاوی لکرێژکراو، وەك شێتان دەفی زەنگی لێ دەدەن و، زنجیری ورچەکان دەزرینگێننەوە.

ورچ لە سەما دەکەون. بنیادەمەکانیش.

ئەرێ کەس هەیە گرۆیا دۆدایۆی ورچباز نەناسێ؟ ورچبازەکانی دیکە، یان کوڕین یان زاوای. دەستەکەیان دوازدە ورچی هەیە. باوە دۆدایۆ سەری زنجیرەکەی دیدینای دێڵەورچە پیرەی گرتووە. من ئەو ورچە دەناسم. ئەوەندە گەڕاوە، سەری نینۆکەکانی سواون. چاوی مەڕانین و مژۆڵی نییە. زۆر بەتەمەنە. پیرە، بەڵام زۆر بەهێزە: دەستەکەیان پێوەی دەنازن. ورچەکانی دیکە لەو بچووکترن، بەڵام گەنجتر و گورجوگۆڵتر.

گرۆیا دۆدایۆ دەڵێ:

ـ خوا ئەو زەماوەندە لە هەمووان مبارەك بکا.

شەوکڵاوەکەی هەڵدەگرێ و دەیداتە ورچەکە. ورچبازەکانی دیکەش لاسایی دەکەنەوە. ورچەکان کە هەستاونەتە سەر پاشوویان، شەوکڵاوەکان بەرەو لای خەڵکەکە رادەدێرن. خەڵك وردە پوولێیان بۆ لە کڵاوەکان دەکەن. ورچ باوێشك دەدەن. منداڵ ترسیان رەویوەتەوە. لە ورچەکان کۆ دەبنەوە و تووکیان لێ دەردەکێشن. بۆ رەواندنەوەی ترس هیچ دەرمانك لە تووکەورچ باشتر نییە. تووی ورچەکە دەخەنە سەر ئاگر و بەسەر دووکەڵەکەیدا دەنووشتێنەوە... و هەستە بەسە، چاك بوویەوە.

ـ دیدینا، وەرە ژووری، ببە بە بووك.

گرۆیا دۆدایۆ زنجیری پیرەورچەکە رادەکێشێ و دەیباتە ژوورەکەی کاکە ئالڤیتزا.

بووك و زاوا و هەندێ لە میوانەکانیش خۆیان دەخزێننە ژووری. ئەوانی دیکەش بۆ ئەوەی لە سەیرەکە بێبەش نەبن، هرووژم دێننە بەر پەنجەرەکان. دێڵەورچ، بە قەڵەمبازێك خۆی داوێتە سەر تەختەخەوی بووك و زاوا. دۆدایۆ تەدارەك و مبارەك دەڵێ. دێڵەورچ لەسەر تەختەکە خۆی دەتلێنێتەوە. لاقی وێك دێنێ، دەستی لەسەر چاوی دادەنێ. وەك بڵێی لە شتێك بترسێ. گرۆیا بەدەم گۆرانیگوتنەوە دەفەزەنگییەکە لێ دەدا و زڕە لە زەنگوڵەکان هەڵدەستێنێ. دیدینا، کە لەسەر تەختەکە درێژ بووە، باوێشکی سامناك دەدا. لەسەر گازەرای پشت دەکەوێ و لاقی لێك دەکاتەوە و

بن زگی، کە تووکی سووری پێوەیە، وەدەردەخا. گوانی رەش و چرچن. نێوقەدی دەلەنگێنێ. دەلەرزێ و رانی دەجوولێنێ. دیسان دەستی لەسەر چاوانی دادەنێ و لەسەرخۆ دەنالێنێ و ئاخریەکەی سەری دادەخا و لە تەختەکە دێتە خوارێ.

ورچبازەپیرەکە بە خوشکم دەڵێ:

ـ بووکە خان، منداڵی جوان و گووپنت دەبێ. دێڵەورچەکەم بەرەکەتی بە جێوبانەکەت بەخشی.

ئاخرییەکەی دیدینا دەبەنە گەورِ و کۆلێتی مریشکەکان، بۆ ئەوەی نەخۆشیی لێگرەوەیان لێ دوور بخاتەوە، دەیبەنە عەمبارەکە، بۆ ئەوەی بەروبوومەکەشیان بەپیت بێ و بەرەکەتی تێکەوێ.

باوە بچکۆ، لەسەر عەرزەکە درێژ دەبێ و بە پیرەورچبازەکە دەڵێ: پشتم دێشێ دۆدایۆ، بە ورچەکەت بڵێ تۆزێك پشتم بشێلێ.

دێڵەورچ گورج خۆی داوێتە سەر پشتەملی پیرەپیاو و لە پشتەستۆیەوە هەتا گوێزینگانی دەشێلێ. وەك بڵێی یەك بە یەك ماسوولکەکانی بۆ داماڵێ. ئاخریەکەشی لەسەر کەمەری هەڵدەترووشکێ و تەقەتەق لە ئێسك و گەوی پیرەپیاوە هەڵدەستێنێ. کە باوە بچکۆ هەڵدەستێ، هێشتا جومگەی هەر تەقەیان دێ.

ـ ئۆخەیش، وەڵا وەخۆ هاتمەوە.

ئینجا دراوێکی پەنجایی دەخاتە کلاوەکەی ورچبازەوە.

"ورچەکۆن" ربە دارینەکەی پڕ دەکا لە کەپەك. ورچەکان بۆنی پێوە دەکەن و دەمی تێدەنێن. ورچباز دیسان لە پیاڵە رەشە گڵێنەکاندا مل دەنێن لە شەرابخواردنەوە.

تاریکی گوندەکەی قووت داوە. لە ماڵی ئالڤیتزای زاوام بەزم و شای و خواردن و خواردنەوەیەکە هەر مەپرسە. کەسوکاری خۆی، خزم و کەسی ئێمە، دۆست و دراوسێی هەردوولامان...

خەڵکی خوای دەخۆن و دەخۆنەوە و، کە زانیان ئیدی ورگیان جێی هیچ دیکەی نابێتەوە و تا خنخناکە تێیان ئاخنیوە، ئەوجار دەچنە حەوشە بۆلای لۆتی و گۆرانیبێژەکان و، ئەگەر بەسەر پێیانەوە خۆیان راگرن، ئەوا دەیکەنە سەمای هۆرا.

کاتی دابەشکردنی دیارییەکانە:

برازاوا کراسێکی وەگیر دەکەوێ، کە دەوراندەورەکەی گوڵدۆزی کراوە، بەربووکیش هەروا. جگە لەوەش، هەر کامە و دەسرۆکەیەکی گەورەیان پێ دەبڕدرێ، کە ئەمبەروئەوبەریان دوو گوڵی گەورەی سووریان لێ دووراوە. دەسرۆکەکان هەوریشمین و دەسچنن.

برازاوا داروێکی پێنج لەیی زیو لە گیرفانی دەردێنێ و لەسەر ئەو سینییەی دادەنێ کە دەسرۆکەیەکی بچووکیان بەسەردا داوە. میوانەکانی دیکەش چاو لەو دەکەن. هەرکەسە و چەندی لەدەستی دێ، دەیهاوێتە سەر سینییەکە. هەندێ یەك شایی و هەندێ دە شایی. ئەو پارەیە بۆ دابینکردنی خەرج و مخاریجی زەماوەندەکەیە.

بەیان ئەنگوتووە و چیی نەماوە تاو هەڵێ، بەڵام بەر لەوەی تاو هەڵبێ، دوو ژن و دوو پیاو لەگەڵ گۆرانیبێژەکان دەچنە شوێن دایك و باوکی بووکێ، بۆ ئەوەی هەواڵێکی خۆشیان بدەنێ: بووکەگیان کچ بوو.

ئارەق بە مزگێنیدەر دەدەن. دواییش هەر کامە و دوو مریشکی سپی، کە پەڕەکانیان سوور کردوون، لە دایك و باوکی بووکێ بە مزگێنی وەردەگرن و بە چەقەنەلێدان دەگەڕێنەوە ماڵی زاوا.

جا ئێستا نۆرەی بووك و زاوا و بەربووك و برازاوایە، کە بەرەو ماڵی باوکی بووکێ بکەونە رێ.

لە مەودای گەڕانەوەی راسپاردە خۆشخەبەرەکان و هاتنی کەژاوەی بووك و زاوادا، دایکی بووکێ، مێزێکی تێروتەسەلی رازاندووەتەوە و "راکی"ی سووریشی داناوە. هەموو دادەنیشن و مل لە خواردنێ دەنێن. شەوێکی درێژیان پێکەوە رابواردووە و سەمایەکی خۆشیان کردووە، هەر هەموو برسیانە.

هەر لەو دەمەدا کە خەڵکی خوای لە ماڵەکەی ئێمە خەریکی خواردنەوەی راکی، لە ماڵی زاوا کە چەند گۆرانیبێژ ماونەتەوە، تاقمێکی میوانی گەنج بە دەوری ئاگرە خۆشەکەدا، لەبەر سەما ئاگایان لە خۆشیان نەماوە.

ئاڤێندرێیا تێی دەچریکێنێ

هەستە بەشان هەڵپەڕە

بووکێ ئاگری گرتووە

هەتا نوێژی نیوەڕۆ هەر دوو ماڵ دەخۆن و دەخۆنەوە.

دووشەممە دایك و باوکی بووکێ لە دەوری یەکتری کۆ دەبنەوە و حیساب و کیتابەکان لێك دەکەنەو و ئەو پارەیەی کۆ کراوەتەوە دەیژمێرن، بۆ ئەوەی دەرکەوێ بووك و زاوا چیان هەیە و چیان نییە. خزم و کەس چوونەتەوە ماڵی خۆیان، بەڵام شایی هەر دەگەڕێ. سێ شەممە بەیانییەکەی، خوشکم سێ بوخچە دەپێچێتەوە، یەکیان دێنێتەوە ماڵی خۆمان وەك "داوای لێبوردن و ئەمەگداری" و ئەوی دیکەش دەباتە ماڵی باوکە تەعمدیدییەکەی و دیسان هەر بەو ناونیشانە و، سێهەمیش دەباتە ماڵی برازاوا، بۆ ئەوەی سپاسی ئەو کەسانە بکا زەحمەتیان پێوە کێشاوە و لەگەڵی ماندوو بوون.

چەند رۆژ دواتر سەروسەکتی ئێڤانگلین لە ماڵەکەمان پەیدا دەبێتەوە. وەك تەشی باریك بووە و دەموچاوی رووشاوە و چاوی راستەی هەڵمساوە.

ـ ئەوە چ بەڵایەکت بەسەر هاتووە کچم؟

خوشکم لە تەنیشت تەختەکەی ئێمەوە دادەنیشێ و دەموچاوی دەخاتە نێو لەپی دەستییەوە و جا وەرە بگری... ماوەیەك فرمێسك هەڵدەوەرێنێ.

ـ باشە بۆ؟

ـ مێردەکەم...

ـ قسەتان لێك هەڵبەزیوەتەوە؟

ـ نا، دوێ شەوێ بە مەستی هاتەوە ماڵێ، لێم پرسی لەکوێ بووە، بە مست و پێلەقە تێم بەربوو. بێت و خۆم لانەدابایە، هەر کوێری دەکردم.

❊

❊

❊

رۆژانی رۆژوو تەواو نەبوو. جگە لە مامالیگا و نۆکاو، هیچی دیکەمان نییە بیخۆین.

چاوەڕێی بەهارین.

بەهاری ئەمسالٚ ئیتر خەڵك وەك پار شۆڕش ناکەن. هێشتا گیابەختکردووانی شۆڕش لەبیر نەکراون. ئەوانەی بەزیندوویی دەرچوون، زۆربەیان نقوستان بوون. بریندار و زامار و قینهەڵگرتوو.

جەندەرمە چاویان بەسەرمانەوەیە.

چاوەڕێی بەهارین.

بەهار کە داهات، دیسان زگمان تێر دەبێتەوە، هیچ نەبێ ئەودەم مامالیگا و سڵمۆکە کولاّو دەخۆین. لە قولّکەیەکدا، کە لەو سەری حەوشەکەی ماڵەوەمانە، باوەش باوەش سڵمۆکە شین دەبێ. کە بەهار داهات، ژنان لەو سەری دێوە دێن و بە حەوشەکەی ئێمە دا دەچنە بن سپینداراەکە و چەندی دڵیان بخوازێ لەوێ گەسگەسك و سڵمۆکە دەڕننەوە.

## ٨
## جمکەکان

بۆ ئەوەی کاروباری ئەو زەویوزارانەی باری زەحمەتەکەیان هەر لە ئەستۆی خۆمانە، لە کۆڵ بکەینەوە و ئەو چەند پەڵە زەوییەش کە دەبێ بۆ ئاغای بدرووینەوە، زووی تەواو بکەین، هەر لە ئەوەڵی بەهارێوە لەگەڵ ماڵی بێکا و میسیرلیۆ و ئۆییێ رێك دەکەوین بۆ هەرەوەز. دیارە هەر لەگەڵ ئەوان، نەك لەگەڵ ماڵەکانی دی.

لەگەڵ ماڵی بێکا، چونکە مەکینەیەکی نوێ و سووکی دروێنەیان هەیە: ئاڵبیۆنێك، کە هەر بە دوو گا دەکێشرێ. دەمەگاسنەکانی دەڵێی مووسی دەلاکین و هەر لە دوورەوە کرتەیان دێ:

ـ گوێت لێیە؟ ئاڵبیۆنی ماڵی بێکایە.

لەگەڵ میسیرلیۆکان، چونکە ئەوانیش بە قەد ئێمەن، لە سەر یەك دەبینە دە کەس.

بەڵام ماڵی ئۆییێ... هەر لەبەر ئەوەی بە دوو کەسیان، کاری چوار کەسان دەکەن.

ـ هەر بەراست، دا بڵێ بزانم ئۆییێ، دەبێ چ بکەین؟ ژنەکەت لەسەر مانگ و رۆژی خۆیەتی.

ـ دەی جا چییە؟ جگە لەوەش، دەزانین چەند مانگ و رۆژە و، دوای دروێنە منداڵەکەی دەبێ.

ـ دەی باشە، پێکەوەین. هەرچۆنێك بێ، بەرەی خۆمان لە قورێ دێنینە دەرێ.

ئەو کێڵگەیەکی دەبێ بیدرووینەوە، لە بادۆلیاسایە. نیو فەرسەخێك لەو لای خانووەکەمانەوەیە. بە عارەبانە خۆمان دەگەیەنینە ئەوێ. رێك نیوەی شەوێ بەخەبەر دێین. لە وەرزی دروێنەدا، خەڵکی ئاوایی لە نیوەی شەوێوە بەخەبەرن. کەڵەشێر لە خەومان هەڵدەستێنن. کەڵەشێرەکان و بەر لەوانیش، لە ترسی ئەوەی نەکا کارەکەمان وەدوا بکەوێ و لەگەڵ ئاغا کلاومان تێکەڵ بێ.

ــ هەی ی ی هاا!.

رێگەکە نەرم و سپییە. عارەبانەکە ددانەچیرە دەکا و قرچەی دێ و دەجووڵێ. خەو، پێڵوەکانمان وێك دێنێ و دەیانخاتەوە سەر یەك، لە قوونی عارەبانەکەدا دیسان وەنەوز دەدەینەوە.

ـ هەی ی هاا!..

باوکم شقارتەیەك لێ دەدا بۆ ئەوەی جگەرەکەی داگیرێنێ.

لە ژوور سەرمانەوە ئاسمانەکە قووڵ و بێبنە. خڕ، وەك گومبەز. ئەستێرەکان وەك میوەیەکی گەیو، بە لکوپۆی دارێکی نەدیارەوە ـ داری شەوەوە ـ شۆڕ بوونەتەوە.

مانگ کوانێ؟

هیچ سۆراغی نییە.

کە مانگەشەو نییە، ئاسمان دەڵێی دووکەڵاوییە.

کە مانگەشەو نییە، دەڵێی ئەستێرە لە زەوی نزیکترن.

کە مانگەشەو نییە، ئەستێرەکان درشتتر دیارن.

ئەگەر دەست بۆ چڵووکی سپیندارەکە بەری، دەتوانی یەك یەکیان لێ بکەیەوە؟

نا ناتوانم.

ئەی بۆ دەڵێی ئەستێرەکان لە زەوی نزیکترن؟

هەی ی ... ویستم شتێکم گوتبێ.

هەندێکیان سپیترن. خەریکە بەردەبنەوە. گوڵی مروارین.

ئەوانی دیکە زەردن: ئەوانە بەهێن.

ئاسمانیان پڕ کردووە. کرۆر کرۆر ئەستێرە، ئاسمانیان تا ئەو شوێنەی ئاسمان و زەوی دەگەنەوە یەکتر، پڕ کردووە.

لەو ژوورسەرە ئەستێرە

لەو خوارەوە ئەستێرە

شنەی بەیان چ ساردە

بە ئەستێراندا دەگەڕێ

ئەستێرە ببە یارمان

زەردەت بێتێ و جوان بێ

ـ ئەو ورتە ورتەت لە چییە داریێ؟

ـ هیچ. سەیر بکە دایە، ئەوە "رێگەی شیرییە". ئەوەش ورچەزلەیە، ئەوی دیکەش ورچەقوڵە... ئەی کوانێ "شێر"؟ حەز دەکەم شێر ببینم.

ـ تۆزێك بێدەنگ دەبی سەلکەبزووت؟

بێدەنگ دەبم.

ئەستێرەکە دەخوشێ. داوێکی شینی درەوشاوە بە شوێن خۆیدا دێنێ. خۆی ون دەبێ، دەسڕێتەوە. نەدیار دەبێ. جا ئەوجارە کلکەکەی. دیارە یەکێك مردووە. ئەستێرەیەك رادەخوشێ و یەکی دیکەش بەدوویدا، دیسانیش یەکێکی دی. هەر ئەستێرەیە و دەخوشێ. تەنانەت لە رێگەی شیرییشەوە.

ـ دایکە، "شێر"م دیتەوە.

ـ کلکی بگرە.

ـ ئاخ.

سیخورمەیەك لە کەلەکەم. کار کاری ئیۆنە. نارەحەتە کە خەوەکەیم زڕاندووە. خۆی لە عارەبانەکە فڕێ دەداتە خوارێ و دەڕوا. ئیتر خەوی لێ ناکەوێ. دەڕوا، بەشکم تۆزێك گەرمی بێتەوە.

ـ هەی ی هااا

لە ئاسنەڕێ پەڕیوینەتەوە. ئیتر خەریکین لە یاڵەکە سەردەکەوین.

ـ بەرمیلەکەتان پڕ کردووە لە ئاو؟

ـ پڕمان کردووە.

ـ ئەی هەمبانەکە؟

ـ ئەویش.

لە پشتەوەمان، لە پێشمانەوە، لە شانی راستمان، چەپمان دەوراندەورمان عارەبانەیە، کە هێدی هێدی بەرەو گەنمەجاڕەکان بەڕێوەن. هیچ کام لە کوڕەکان گۆرانی نالێن. ژنەکانیش هەروا. هەر گەنمەجاڕەکەی دەنگی دێ. لەوانەیە ئاسمانیش گۆرانی بلێ، وا دیارە ئێمە نایبیسین.

ـ ئەوێ کوێیە؟

ـ منم، نیكۆلای.

ـ ئاگرت پێیه؟ من چەرخەكەمم بزر كردووه.

ـ پێمه.

ئەستێرەكان ئیتر ناخوشێن. رەنگیان دەبزركێ و دەڵێی بەرەو ناخی ئاسمان هەڵدەكشێن. نەكا بچنە پشت پەردە ئاشینەكەی ئاسمان بنوون. ئەستێرەكان بە رۆژ دەخەون و بە شەو بەخەبەرن. تەنگی ئێواری لە قوژبنەكانیان دێنە دەرێ و چاو بە زەویدا دەگێڕن بزانن بنیادەم و شیو و دۆڵ و پێدەشت و دارستانەكان چۆن پشوو دەدەن.

ـ وا نییە باوكە؟

ـ لەوانەیە. خوا نەبێ كەس نازانێ. ئەگەر جێیەك خوایەكی لێ بێ.

تاریكوڕوونی بەیانی، ئاسۆ سپی دادەگەڕێ. دوایی وردە وردە زەرد دەبێ و ئەوجار سوور هەڵدەگەڕێ. باوكم هۆ ورە لە گایەكان دەكا.

ـ هەی ی هاااا

گایەكان هەنگاو دەنێن. بە سەری كلكیان لە شانوپیلی خۆیان دەدەن.

گەیشتینێ.

نیر، لە ئەستۆی گایەكان دادەماڵین و بەپەلە چەند باوەشێك گیا دەڕنینەوە و دەیخەینە بەردەمیان. خوا دەزانێ ئەو حەیوانانە چەندەیان گەنمی گەیو پێ خۆشترە. خوا دەزانێ چەندەمان حەز لێیە توانیبامان تاقە گوڵەگەنمێكیان بدەینێ. بەڵام هەقمان نییە. خۆ گەنمی خۆمان نییە. ئەگەر ئاگامان لێ نەبێ و گایەكان بچنە نێو گەنمەكە هەر باسی سەرە.... پار وام بەسەر هات:

گایەكانم بردبوو لەو پووشەدا بیانلەوەڕێنم. نوێژی نیوەڕۆیە بوو. چاوم لە ئاسمان بڕیبوو. هەور سەریان لە دووی یەك نابوو، لە سەیركردنیان تێر نەدەبووم كە جاری وابوو وەك گاكێوییان لێ دەهات. یەكێك لە گایەكان چووە دەم گەنمەكە و قەپاڵێك گەنمی خوارد. خەریك بوو كاوێژی دەكردەوە، كە شەقوهۆڕ پەیدا بوو.

ـ وەی دایكە.

قەمچییەکەی گانتزا پشتەملی پێکام و وەك مارێك تێم ئالا. نێو شانم وەك هەنار زاری کردەوە و خوێن فیچقەی کرد. هەی کافر، قەمچی ئاگرت تێبەر دەدا. تا ئەودەم نەمدەزانی چ ژانێکی هەیە. ئێستا دەزانم. هێشتا شوخاڵەکەی لەسەر پشتمە. هەر دەتگوت هەورەتریشقە لە پشتمی داوە، لە سەر شانی راستمەوە تا کەلەکەی چەپم.

باوکم پڕی دا کەڵەوەکە و هەرای کرد:

ـ ئەی هاوار، کوڕە کوشتت...

کەڵەوەکە ئاسنە.

گانتزا سوار بوو. گوتی: نەمکوشت، کردمە بنیادەم.

ئەسپی لینگدا و بۆی دەرچوو. خۆ رای نەکردبایە باوکم مێشکی سەری هاڕیبوو. بەڵام رانەوەستا و دەرچوو. شانسی هێنا.

گانتزا لە باوکم تۆقیوە. کەس ناوێرێ بە باوکم بڵێ پشتی چاوت برۆیە. تەنانەت ئاغاش تا ئێستا شتی وای نەکردووە. جا چۆن کوێخایەکی بەڕەڵا دەوێرێ وا بڵێ؟

چەند مانگێك لەوە پێش، ژووتێی پۆلیس لە نەگبەتی و نەزانی هەندێ قسەی ساردوسووکی بە بابم گوت، ئەویش لەسەر خوت و خۆڕایی. بابم ئاد و بەڵێنی بەخۆی دا، هەر خۆی پێشان نەداتەوە. هیچ مقۆمقۆشی لەگەڵ نەکردبوو. ئێستاش کە ئێستایە، لەبزی دەلەبزی نەگەڕا. خۆ جگە لە دارێك ئەویش بۆ ئەوەی سەگەلی لەخۆی پێ دەرکا، هیچی بەدەستەوە نەبوو. بەڵام پۆلیسە چەکی پێ بوو. بەو حاڵەشەوە هەر ئەو شەوە باوکم لەسەر ئەو پردەی وا ژۆتێ پێیدا دەپەڕییەوە بۆ ئەوبەری رووبارەکە، خۆی لێ مات دا و بە مست و پێلەقە پشتی لە زگی نەرمتر کرد. تفەنگەکەی لێ ئەستاند و هێنایە دەم ئاوەکە و ناچاری کرد خۆی لە ئاوەکە بهاوێ. خۆ دیارە نەیدەویست بیکوژێ. ئەگەرچی کوشتباشی هەر هەقی بوو.

شەوگەڕەکان ژۆتێیان بەبێهۆشی دۆزییەوە و بردیانەوە پۆلیسخانە و لەوێ وەهۆش خۆیان هێناوە.

ـ ئەوە کێ وای بەسەر هێناوی؟

ـ کەس. لەو تاریکەسەلاتەدا پێش خۆمم نەدی و هەڵخلیسکام و لە چۆمەکە کەوتم... پیاوکوژینە، خۆ ملتان نەکشاوە، بۆ دوو ئاسنەپەرژین لەمبەروبەری ئەو پردە نادەن؟

ـ قوربان، خۆ پردەکە پەرژینێکی زۆر قایمی هەیە.

ـ کە من دەڵێم نیەتی، واتە نیەتی و تەواو.

ـ بەڵێ گەورەم، نیەتی.

ژۆتێ دەینالاَند و لێوی دەکرۆشت و سەری سمێڵی دەجاوی. ناچار بوو ماوەیەك بەجێ و بان بکەوێ. کە هەستاو و پێی گرتەوە، چووە ناوەند و داوای کرد لەو شوێنە بیگوێزنەوە جێیەکی دیکە. لایانبرد و مێلۆچێلیان لەجێی دانا. نایب عەریف نیکۆلای مێلۆچێل.

بەینمان لەگەڵ ئەوەشیان زۆر خۆش نییە.

خەڵك لە پێش ئێمەدا گەیشتوونێ.

بێکا خەریکی چەورکردنی مەکینەی دروێنەکەیەتی. وەك میکانیکێك لێی شارەزایە. تاوێك دواتر میسیرلیۆش دەگاتێ، لەگەڵ ژن و کچ و کوڕەکانی.

ژنەکەی لەو حەکەدارانەی رۆژگارە. ناوی ئیلینایە، بەلاَم لە دێ پێی دەڵێن: "حەوت ناوکە". کچەکانیشی یەکێك لەوی دی حەکەدارتر. دیارە ئەوە زۆر گرینگ نییە، چونکە کچی ئاوا لە دێیەکەماندا یەك و دووان نین. گرینگ ئەوەی پاش ئەو هەمووە قسەیە، ئیتر هیچ کوڕێك بە تووڕێکیشی ناوێن.

میسیرلیۆ تاقە کوڕێکی هەیە، کە ناویان ناوە "دێڵە سەگ."

خوشکەکانی کە قسەی لەگەڵ دەکەن، دەڵێن "کاکمان"، دایکی دەڵێ "کوڕە تاقانەکەم"، باوکی دەڵێ "ئەو هەتیوە بێکارە تەوەزەلەم"، بەلاَم کە یەکێکی خێزانەکەیان بانگی دەکا، هەر پێی دەڵێ: "کوڕە هۆی یارۆییێ."

"دێڵەسەگ" گوێی لە هەموو شتێك دەبێ و هەموو شتێکیش دەزانێ، بەلاَم قسەی پێ ناکرێ. هەندێ دەنگی گڕ و ناخۆش لە قوڕگی دێتە دەرێ. بنیادەم کە گوێی لەو دەنگانە دەبێ، ناتوانێ بڵێ لە چی دەچن. لە دەنگی فلاَنەی مەلی سەیروسەمەرەی نێو زۆنگاو، یان قرووچکەی سەیەك.

جارێکیان هەتیوە بەڕەڵای ئاوایی لە نێو خۆیاندا لەسەر دەنگەکەی کردبوویانە گرێو، کە لە دەنگی دێڵەسەگێك دەچێ، ئیدی لەو ڕۆژەوە ناوی "دێلەسەگ"ی بەستۆدا بڕدرا. ئیدی کەس ناوەکەی خۆی لەبیر نەماوە. زۆر شت هەن لەبیر دەچنەوە، نامێنن و ئیتر کەسیش سەروسۆراغیان ناگرێ، وەك هەر نەبووبێن. ناتۆرەی "دێڵەسەگ"ی بەستۆدا بڕا و لێی نەسڕایەوە.

منیش هەر پێی دەڵێم "دێڵەسەگ" و پێشی ناخۆش نییە. منداڵێکی نەرمونیان و دڵپاکە و جگە لە هەموو ئەوشتانە، زۆریش ژیکەڵەیە. برۆی درێژ و پڕن و چاوی کەسك کەسك، وەك چاوی زەردەقۆڕە. وەك کەریش کار دەکا. هەمووان ئەوە دەزانن.

ـ ئۆیێ نەهاتووە؟

ـ نا هێشتا، بەڵام دێ.

گژ و گیا تەڕن. گەنم تەڕە. تەنانەت، هەر دەڵێی شەونم ئاسمانیشی خووساندووە. ئاسمانێك کە تا بەیانی شەونمی لێ باریوە.

ـ کووڕ، کووڕ، کووڕ...

دەنگی ئەو کووڕکووڕانەی لە نێو گەنمەکەدا خۆیان شاردووەتەوە، دێ. قەتێ ـ کە دەڵێن بە داوەدەزووەکی نادیار بە تەشقی ئاسمانەوە هەڵواسراوە ـ سەرخۆشی تیشکی هەتاوەکە، دەنگە خۆشەکەی لێ هەڵێناوە و بە دەشتەکەیدا بەشیوە. کڵاوە سوورەی گوڵاڵە بە دوگمە ڕەشەکەیانەوە، لە نێو گوڵەگەنماندا دیارن. گوڵاڵەکان هەڵدەپسێنم و لە کڵاوەکەمیان دەدەم. دەڵێی کوا کڵاوم؟ هەر لەبیریشم نەبوو کڵاوم نییە.

ـ گایەکان لە مەکینەی دروێنەکە دەکەن. خۆر خەریکە دێتە چەقی ئاسمان. ئەوە دەبینی، ئێمە هەر خەریکین خۆمان دەگنخێنین.

ئەو گەوزە دەسنیشان دەکەین، کە ئەمڕۆ دەبێ بیبڕین.

تیشکەکە، وەك ئاوێکی روون نوقمی کردووین. ئالبیۆن، چەقەچەق دەنگی دێ. لە دەوروبەرمانەوە دەنگی مەکینەکانی دیکەش دێ. گەنم باقە باقە دەکەونە خوارێ. باقەکان هەڵدەگرین و لەسەر یەکیان دادەنێین. ئەو سێ مەڵۆ گەنمەی بە گورزە و باقەبێنێك لێك بەستراون، دەکەینە باقە.

باقەکەش قیت دەکەینەوە بۆ ئەوەی جوان تاو لێی بدا و تا ئێوارێ لە شوێنێك دەیکەینە خۆیان، بۆ ئەوەیە باشتر هەڵبرینگێ.

ئەگەر لەگەڵ ماڵێك یەکمان نەگرتبایە، ناچار بووین بە داس دروێنە بکەین. دەبوایە حەفتەیەك وەکوو بۆق لەسەر چینچکان بڕۆین و، ئەژنۆ رووتەکانمان بە دڕك و داسووی گوڵەگەنمان شەڵاڵی خوێن بکەین و سەر و پشتمان لەبەر قرچەی هەتاوەکە ببرژێنین... ئێستا بەو حاڵەمانەوە هەڵبەز و دابەزمان کەمترە.

ئێوە کە لە ژیانتاندا پشتتان بۆ دروێنە دانەنواندووە، قەت نازانن نانێك بایی چەندەیە.

ئێوە هەر دەزانن نان تامەکەی چۆنە.

ئەوەش تیتزائۆیێ. دەگاتێ،شەڵاڵی ئارەقەیە. ژنەکەشی بەدوایەوە. وەك ماینێکی شەکەت هانکەهانکێتی و توورەکە و نانەبەرە و خواردنەکەیانی بەکۆڵەوەیە. خواردن. مەبەست لەتێك مامالیگایە و هێلکەیەك و هەندێ تەرەپیاز. هەر ئەوەندە و بڕایەوە.

ئۆیێ خۆیشی جەرەی ئاوەکە دێنێ. جەرەیەکی جوانە، دوو زارکی هەیە.

ـ دروێنەی ئێمە لەکوێوەیە؟

ـ لەوێوە.

هەتا چاو هەتەر دەکا، تا نێو دانوب، لە گەنم بەولاوە هیچ دیار نییە. مەزرای بێبڕانەوەی گەنم. گەنمێك، هەر گوڵێکی هێندەی پاسارییەك. بەلای باکووردا، هەتا ئەو شارێیەی دەچێتەوە رۆشی، هەر هەموو کێڵگەی گەنمەشامییە. گەنمەشامیی سەوز و بەرز. با، خشەی گەڵاکانیان دێنێ و بەلالە ریشنەکانی دەلەرێنێتەوە.

ـ کوڕە هۆۆۆ... ئێوە.... ئەوانەی خواروو...

ئەوە دەنگی گانتزایە.

گانتزای دەشتەوان لێوی کەتە. هەر بۆیە بنیادەم هەمیشە ددانی دەبینێ و، بەردەوام لیکی شۆڕ بووەتەوە. بە مەلۆتکەیی، مریشك دندووکیان لە لێوی داو و خواردوویانە. بۆیە ئێستا لێوی نییە.

ـ کار بکەن، رامەوەستن، دەی بجووڵێنەوە.

ـ زۆر دەمێکە دەستمان پێ کردووە.

بەو پشتەوە، کە خەریکە دەشکێ، مەلۆ گەنمەکان هەڵدەگرین و دەیانکەینە باقە. هەتاو دەمانبرژێنێ. خۆ مەزرا نییە مەقەڵە. ئەوەندە داهاتووینەوە، پشتمان دەزیرێنێ. دەست و پێمان شەلاڵی خوێنە. خۆڵی بەسەردا دەکەین و هەوڵ دەدەین خوێنەکەی راگرین. خوێنەکە دەمەیێ. گۆشتە شەقاربووەکە زاری وێك دێتەوە. ئەگەر زاری زۆر داپچڕیبێ، یانی گەیبێتە سەر ئێسقان، تۆزێك دەکشێینەوە و میزی پێدادەکەین. وا دەبرژێتەوە وەختە چاومان دەربێ. بنیادەم لە داخان ددانی چیڕ دەکاتەوە. زۆر دەبرژێتەوە، بەڵێ، بەڵام تەواو دەبێ.

ـ دەی کوڕینە، دەی.

خۆ ئێمە کە هەزار جار ماشەڵا هەر وا دەجوولێین.

ئەوە گانتزا بوو بانگی کردین، بەڵام لە زۆر دوورەوە و بە پارێزیشەوە. هێشتا لەبیری نەچووەتەوە کە باوکم چۆن پڕی دابووە کەڵەوەکە و ئامبازی ببوو. باوکیشم نە هیچ شتێکی لەبیر دەچێتەوە و نە لێشی خۆش دەبێ. بە زیادەوە دەیداتەوە. تەنانەت بە زیادەیەکی زۆرەوە، وەك قەرزەکانی بانك. ئەگەر وا نەبوایە، ئێستا جەندرمە و دەشتەوانەکانی ئاغا لە بن پێیاندا فلیقاندبوویانەوە. تەنانەت لە بن پێ و پۆستاڵە رەقەکانی قایمقامیشدا، کە خەڵکی شارە و ملی لە نێو لوولەیەکی سپیی بریقەداری شەق و رەقدا قەتیس ماوە و بەملاولادا دەسوورێ.

کراسەکەم خووساوە. بە گیانمەوە دەنووسێ. دەستم دەبرژێنەوە. پێم دەبرژێنەوە. سەرم قورس و رووتە. خوڕخوڕ ئارەقەم لێ دەچۆڕێ. باشە چۆن دەسڕدرێتەوە؟ بە چی دەکرێ بیسڕیتەوە؟ بەسەر دەموچاومدا لووزەو دەبەستێ و دێتە زارمەوە. تامەکەی تفتە. لێی گەڕێ با بتکێتە سەر زەوی و خاکەکە تەڕ بکا. بەشکم خاکەکە تۆزێك فێنك بێتەوە... لەو قسەقۆڕە... ئاخر خاك بە ئارەقەی لەشی بنیادەم فێنك دەبێتەوە؟

هەتاو بەرز دەبێتەوە. هەر وا بەرەو نێوەندی ئاسمان. ئیلینا دەکەوێتە رێ بەرەو لای گەنمەشامیە چڕەکە. ئیۆنی براشم هەروەتر. زۆر نابا. هێندەی کێشانی قونچکە جگەرەیەك. باشە بۆچی خۆیان

دەشارنەوە؟ هەرکامە و لە لایەکی کێڵگەی گەنمەشامییەکەوە دێنە دەرێ. دەچنەوە نێو سەپانەکان و سەر جێیەکەی خۆیان و مل لە کار دەنێنەوە و دەکەونە پێش ئەوانی دیکەش.

گایەکانی مەکینەی دروێنەکە دەگۆڕین. ئەوانی پێشوو هیی بێکا بوون، جا ئێستا نۆرەی گای ئێمەیە. دوانیوەڕۆ گای میسیرلیۆیان تێ دەکەین، کە هەتا شەوێ کار بکەن. ئاخر گای ئەو گەورەتر و بەتاقەتترن. گای میسیرلیۆ هیی مۆلداڤین، رێك وەکوو ژنەکەی.

ئیلینا کە هاتە گوندەکەی ئێمە، زاراوەیەکی دیکەی هەبوو. دەنگی دەتگوت دەنگی شمشاڵە. بەڵام ئیتر ئێستا ئەویش وەك خۆمان قسە دەکا. زاراوە مۆلداڤییەکەی نەماوە. ئیتر کە گوێت لە دەنگی دەبێ، هیچ پێت وا نییە لە جێیەکی دوورەوە هاتووە. لەگەڵ ئەوەشدا لەگەڵ ژنەکانی دیکەی لای خۆمان، عەرز و ئاسمانی فەرقە. بەردەوام دەڵێ ناخی دەکولێ و بە جۆرێك دەبێ کولێ و کۆی خۆی دامرکێنێ. میسیرلیۆیش هەر گوێی بە هەوەسبازییەکانی نابزوێ: جڵەوی بۆ بەرداوە بۆ ئەوەی چیی دڵی دێنێ، بیکا. جا چونکە بەردەوام ئاگری تێبەربووە و ئەو کوڵەی دانامرکێتەوە، ژنان دەنگۆیان داخستووە، کە حەوت ناوکی هەیە. ئیلیناش بۆ ئەوەی وەدرۆیان بخاتەوە، تووشی هەر پیاوێك بێ، تەشك و داوێنی هەڵدەداتەوە و ناوکیان پێشان دەدا. بەڵام سەرەڕای ئەوەی توانیویشێتی پێشانی هەمووانی بدات کە هەر یەك ناوکی هەیە، دیسانیش ناتۆرەی حەوت ناوکی هەر بەسەردا بڕدرا. تاقە خەمێکی هەیەتی، ئەوەیە، هەر سێ کچەکەشی چوونەتەوە سەرخۆی.

ـ هەی ی ی هاااا، هۆۆۆ وەرەوە.

ئێستا ئیتر من هۆوەرەوە لە گایەکان دەکەم. دیارە بەشی خۆم گەورە بوومە.

ئەوە هەر بەدەوری مەزراکەدا دەسووڕێینەوە و، مەزراکەش چەندی گەنمی پتر لێ بدرووینەوە، ئەوەندە گەورەتر دێتە بەرچاو. باقەی گەنم کە وەك بنیادەم لەسەر پێ راوەستاون، ریز دەبن. لە بنیادەمەکان قەڵەوتر بەڵام کورتتر. گوڵە خۆڵاوێکانیشیان دەڵێی مووی لەشن گرژ بوونەتەوە.

بە بەردەم ئیلینادا تێدەپەڕم.

دەڵێ: داریە، وەرە بچینە نێو گەنمەشامییەکان شتێکت پێشان بدەم.

ـ ناوکت؟ تۆ حەوت ناوکت هەیە دادە ئیلینا؟

ئۆیێ گوێی لێ دەبێ و ئاوڕ لە حەوت ناوك دەداتەوە و دەڵێ:

ـ ئەوە ژنەتیوە تۆ حەیات نییە؟ ئەوجار لە منداڵانت هەڵکێڵاوە؟

ـ هەتیوە، خۆ ئەوە ئیدی منداڵ نییە. زۆر لە من بچووکتر نییە... وەرە با بڕۆین داریە.

ـ خوا لە جێیەکی دیکەوە رسقت بدا.

ئیدی گایەکان لێ دەخوڕمەوە.

ئالبیۆن چرکەی دێ، چرك چرك.

ئیلینا لەگەڵ گۆگۆی کوڕە گەورەکەی بێکا، کە دەڵێن قالۆنچە دەموچاویان خواردووە، لە نێو گەنمەشامییەکاندا بزر دەبێ. هەتا ئێواریێ لەگەڵ زۆری دیکەش دەچێتە پشت گەنمەشامییەکان.

پەڵەهەوری وەك جلێکی تیسکن و ریشاڵ ریشاڵ دێن و لەسەر یەك کەڵەکە دەبن. خۆزگە دایداتە گۆپاڵ باران. بارانێکی سەربەکڵاوە بێ و ببڕێتەوە و هەواکە تۆزێك شێدار بکا و تەشقی خۆرەکە بشکێنێ. تۆزێك عەرزەکە فێنك بکاتەوە بۆ ئەوەی بنی پێم نەبرژێ.

بنی پێم دوو برینی گەورەی تێکەوتووە. چەندەیان خۆڵ بەسەردا بکەم؟

خوێنەکە دەکوڵێ و دێتە دەرێ و دەمەیێ.

ئای خۆزگە رێژنەیەك...

هەر نەبێ خۆزگە قوماشێکمان هەبوایە کە بە دوو داران سەیوانێکمان پێ دروست دەکرد بۆ ئەوەی سێبەرمان لێ بکا.

هەورەکە بەرەو دانوب دەکشێ. بەسەر دانوبدا تێپەڕیوە و زۆر دوور کەوتووەتەوە، لە داوێنی چیاکانی بەڵکان کە رۆژە تاو و ساوەکان لووتکە خڕ و رژد و خەتخەتی و ماش و برنجی و رووتەنەکانیان دەبینم و لەبەر تاوەکە دەدرەوشێتەوە.

تا ئێستا لە دانوب نەپەڕیومەوە و نەچوومەتە لای بۆلگارەکان، بەڵام مەلەم تێدا کردووە و هەتا مانگێکی دیکەش کە خەرمان هەڵدەگیرێتەوە، دیسان هەڵدەکەوێتەوە کە مەلەی تێدا بکەمەوە.

گەنمەکەی ئاغا ئەوەندە زۆرە، هەموو عەمبارەکانیش بەشی ناکەن. هەر بۆیە ئەمری کردووە بەشێك بە بەرهەمەکە بەرنە نێو ئەو پاپۆڕانەی لە قەراغ دانوب لەنگەریان خستووە. فەرمان فەرمانی ئەوە

و، دیاره له ئەستۆی ئێمەیە کە گەنمەکە هەڵگرین و بیبەینە دانوب: لە سەر ئێمە و بنەماڵەی بێکا و میسیرلیۆکان و هەموو خەڵکی ئاواییە کە لەسەر زەوی و زارەکانی وی گیانمان دەرچووە و عارەبانە و گامان هەیە.

ئۆییێ نە عارەبانەی هەیە و نە گا. حەیف، چونکە تا ئێستا نە پاپۆڕی دیتووە و نە دانووبیش.

پاپۆڕەکان گەورە و رەشن. دەکرێ تا رۆژی قیامەت گۆنیە و توورەکە گەنمیان تێدا کەڵەکە بکەی.

دانوب مەند و هێمن و قووڵ و قوڕاوە. جا ئەگەر با لە خوارەوە بەرەوژوور بەسەریدا بشنێ، کەف دەکا.

وەختێك گەنم بەرینە دانوب، لە هەر "سەنار"ێك سێ "شایی"مان گیر دەکەوێ. توورەکەیەکی بیست سەنتیم مز و دەستخۆشانە دەدەن. جارێك بچی و بێیەوە، کە سوارکردن و بەتاڵکردنی کیسە و توورەکەکانیشی لەگەڵدایە، پیاو یەك لییێ Lie دەست دەکەوێ. بەو پارەیە پیاو ئەگەر پێخواس بێ، دەتوانێ شتێك بکرێ و هەر نەبێ قاچێکی داپۆشێ. کەواتە ئەگەر دوو جار بچی و بێیەوە و حەمباڵییەکە بکەی، دەتوانی هەردوو قاچت لە رووتی رزگار بکەی. ئەگەر حەزیشت لێ بێ، کراسێکی کێشچن یان گەزە جاوێك بۆخۆت بکڕی، ئەوە دەبێ بەرهەمی پێنج رۆژ دروێنە بە عارەبانەکەت بەریتە ئەوێ. بەڵام ئاخۆ کاری وا دەکرێ؟ چما دەکرێ ئەو هەمووە لە عارەبانەکەت بنێی و بیبەی و ئەو هەمووە پارەیە کۆ بکەیەوە؟ ئەوەیە کە بنیادەم ناچارە قەناعەتی هەر بەو کڵاوە دابێژ دابێژە چرچولۆچە بێ و لەبری کەوڵی بەرخ، دڵی بەو گەزە جاوە تیسکنەی بەری داکەوێ. خۆ پیاو بەو شتانە نامرێ.

ئەگەر بنیادەم پارەیەکی نەقدی بەدەستەوە بێ، واباشترە لەبری ئەوەی ئەو شتانە بچێ وەك ماڵیات بیداتە کاربەدەستی دارایی. یان بیداتە مەیخانەچی. خۆ ئەگەر هەتا ئاخر دیناریشت بدەیە مەیخانەچی هەر خراپ نییە و زەرەرت نەکردووە: هەر نەبێ دەتوانی شەوێك بەبێ خەم و خەیاڵ سەر بنێیەوە.

دانوبم زۆر خۆش دەوێ.

ئاو. ئاو. چەندی دڵت بخوازێ ئاو. دەتوانی بە مەراقی دڵی خۆت تێیدا مەلە بکەی. دەتوانی وەك ماسی بچیتە تەختی ئاوەکە. تەنانەت مەلەش بزانی دەبێ زۆر ئاگات لەخۆت بێ لە بنەوە لە هیچ

نەگیرێی. تا ئێستا زۆر منداڵ بە تەختی بنەکەیەوە نووساون، تەنانەت هەندێ جار، پیاوی زۆر زل زلیش کاتێ لە شەکەتییان تینیان تێدا نەبووە، لەسەر ئەو تەختەیەوە کە وەك پردێك لە نێوان پاپۆڕ و دیوارە بەردینەکەی کەناردا رایەڵ کراوە، خلیسکاون و لە چۆمەکە کەوتوون و بە تەختی عەرزەکەیەوە نووساون. ئەو پیاوانە بەو فەردە گەنمانەی بە کۆڵیانەوە بووە دەخلیسکێن و دەچنە بن پاپۆڕەکان. دەی باشە، جا ئەگەر پیاوی بچۆ و دەریان بێنەوە.

راستە، گانتزای دەشتەوان وەك شێتان جنێو دەبارێنێ و قسەی ساردوسووك دەکا، بەڵام ئێوە هیچ وەسەر خۆتانی مەهێنن: جنێودانەکەی لەبەر ئەو پیاوە نییە کە سەری تێدا چووە، چونکە ئاخری رۆژێك ئاو تەرمەکەی، کە وەك هیزە هەڵمساوە فڕێ دەداتەوە قەراغێ. جنێوەکانی لەبەر ئەو فەردە گەنمانەن کە ئیدی لەکیس چوون و لەسەر ئەو حیسابن و کوێخا لە بەراتەکەی ئەویان کەم دەکاتەوە. بەڵێ.

ـ تۆ بە جوانی ئاگات لە فەردە گەنمەکانی ئاغا نییە.

ـ بۆچی قوربان، جەنابی کوێخا، من ئاگام لێیانە. بەڵام ئیدی بڵێم چی، ئەوە وای لێهات.

ـ نەدەبوایە وای لێ هاتبا.

ـ دەست ببزێون کوڕینە، پەلەی بکەن.

جا خۆ ئێمە خواخوامانە پەلە بکەین. بەڵام ئیدی دەرەقەت نایەین.

مەزراکە ئیتر مەزرا نییە، جەهەننەمێکی تەواوە. گۆشت و پێستمان بڵێسەی لێ هەڵدەستێ. پیاو پێی وایە ئێسقانەکانی دەتەقن و سێبەندە و گەی بەدەنی لەبەر یەك دەچن. کاسەی سەر وەك مەنجەڵی رۆن دەکوڵێ. پێستە خووساوەکەی گایەکان، هەڵمی لێ هەڵدەستێ. خۆشمان پشوومان سوار بووە. گایەکان هانکەهانکیانە. ئەژنۆیان لە بن بارستایی قەڵافەتیاندا دەنوشتێتەوە. ئیتر تینمان لەبەردا نییە قەمچیشیان لێ بدەین.

ــ هەی ی ی یهاااا، هۆوەرەوەەوەەە

ـ کوڕە هۆووو، ئێوە لە خوارەوە، خێر بن دەی ببزوون.

ئەی خوا ئەو دەموقەپۆزەی کوێخا گانتزا پڕ بکا بە خۆڵ و گڵ.

ـ راوەستە. چرکەچرکی ئاڵبۆینەکە دەبڕێتەوە و هەمو مەکینەکانی درویّنە دەنگیان لەبەر دەبڕێ. هەر هەمووان پێکەوە.

مەکسنەکان ئاوا بەبێ کار و جووڵە، بە پەڕ و دەمەکانیانەوە دەڵێی کۆنە ئاشی بان، کە بە ئەمانی خوا بەرەڵا کراون.

ـ نانی نیوەڕۆ.. هەمووان بۆ نانی نیوەڕۆ.

بە شوێن داوە سێبەرێکەوە دەخزێینە بن عارەبانەکەوە. هەر بەراست، چما سێبەری عارەبانە چەندەیە؟ هەر ئەوەندە دەبێ، کە کولله و مارمێلکە یان ئەو جانەوەرانەی لە گژ و گیادا دەژین، بتوانن پەنای بۆ بەرن.

سەتڵەکان پڕ دەکەین و، گایەکان ئاو دەدەین. بە یەك تەکان، سەتڵێك بەتاڵ دەکەنەوە.

پشت و کەلەکەی حەیوانەکان، بە کا و کلۆش دادەماڵین.

پیاوەکانیش ئاو دەخۆنەوە. گۆزەکە دەست بە دەست دەگەڕێ. ئاوەکە گەرم و بۆگەنە. هەروا بە زگی برسێتی قووتی دەدەین، بۆ ئەوەی زگمان پڕ بکا، با جێیەکی زۆر بۆ خواردن نەمێنێتەوە.

سفرەکان بە تەنیشت یەکەوە و لەسەر کایەکە رادەخەین.

میسیرلیۆ لە نانەبەرەکەی سێ هێلکەی کوڵاو و ماماليگايەك و چەند پیازێك و خیارێك و شووشەیەك سرکە دێنێتە دەرێ بۆ هەر شەش کەسەکەیان.

ئەی لەو سفرە رەنگینە.

میسیرلیۆ کابرایەکی دەوڵەمەندە و زەوی و زاریشی هەیە.

ڤاسیلێ بێکا وەزعی لەویش باشترە: لە تەنیشت مامالیگاکەوە چەند سەلکەپیازێکی خڕ و گەورە ریز دەکا و سەلکێك پەنیری سپیشی لە تەنیشت دادەنێ.

ئێمە سێ دەنکە سیر لە قاپێکدا ورد دەکەین، خوێی پێدا دەکەین و پیاڵەیەکیشی ئاو بەسەردا دەکەین. نانی نیوەڕۆ ئامادەیە. لەتەکانی مامالیگاکەمان لە قاپەکە دەکەین و دەیکەینە پاروو و لە زارمانی دەنێین. دەبێ زۆر ئاگامان لە دەم و لێومان بێ. هەر هەموو بە تاو و با شەقار بووە، بێت و ئاوی سیرەکەی وێکەوێ، ئاگر لە بنیادەم بەردەدا.

خۆ دەرفەتمان بوایە، پارووەکانمان دەجوی. بەڵام دەرفەت نییە. پارووەکەم وا قووت دەدەم، ددان و زمانم هەر پێشی نەزانن.

ماماليگا و ئاوی سیر... تێکوشینی ماماليگاکەی ئێمە شتێکی ئەوەندەش گران و گەورە نییە. زۆر کەس هەن ئەوەندەشیان نییە بیخۆن.

لێرە، لەو مەزرایە، هەر کەسە و چیی لە ماڵەوە هێناوە لە ورگی خۆی دەکا.

ئۆییێ هێلکە کوڵاوەکەی دەشکێنێ و پاکی دەکا و نیوەی بۆخۆی دەیخوا و نیوەکەی دیکەی دەدا بە ژنەکەی، کە ورگی ئەوەندە زلە بە حاستەم هەناسەی دێ.

ئۆییێ بۆ ئەوەی قسەیەك لە قساندا بکا و خەم و خەفەتی بەبادا بکا، دێتە بەر دەرگا و دەڵێ:

ـ مەکینەی دروێنەکەت زۆر باشە کاکە بێکا.

ڤاسیلێ پێدەکەنێ و دەڵێ:

ئەوە لە سایەی سەری ئیانکۆئاگانیێوەیە. یانی قەرزباری ئەو و ژنەکەمم. ژنەکەی بێکا بە مست پیازەکە ورد دەکا و بەپەلە دەیجوێ و کەوچکێك سرکەی بەسەردا هەڵدەقوڕێنێ.

"حەوت ناوك" قاقا دەکێشێ و روو لە ژنەکەی بێکا دەکا:

ـ دا بۆمان بگێڕەوە رادا، وا دیارە بەزمەکە زۆر خۆشە.

رادا بێکا چاوێك لە ڤاسیلێ دەکا و دەڵێ:

ـ با بۆخۆی بۆتان بگێرێتەوە، کە بۆ گێڕانەوەی ئەو باسە کێچی لە کەوڵی کەوتووە.

*

*

*

وەڵا مەسەلەکە ئاوایە.

پار زستانێ ژنەکەم پێی گوتم: ڤاسیلێ، ئەو ئیانکۆئاگانایە هەر وەشوێنم دەکەوێ، وەگیانی هێناوم و لێم نابێتەوە.

پێم گوت: دەی لەوە باشتر، ژنەکە، ئەو کابرایە لە بەرامبەر ماڵەکەی خۆمان دووکانێکی هەیە. مەیخانەیەکیشی لەوبەری دێ هەیە، کارگەیەکی دەباغی و چەرمدوورینەوەشی هەیە. ئەوەندەی پووڵ هەیە شوێنی نییە تێی بکا. ... دەی باشە، ئێستا کەیفی لە تۆیە؟ دەی ژنەکە لەوە باشتر؟ ئەوە شانسە و لە دەرگای داوین... پێی بڵێ با هەر ئەمشەو بێتە دانگەی مەڕەکان. پێی بڵێ بە دەرگا گەورەکەدا بێ. سەگەکان دەیناسن و پێی ناوەڕن. پێی بڵێ مێردەکەم دەنوێ و تۆپیشی پێوە نێی وەخەبەر نایە. جا من بە تێڵایەکەوە لەوێ لەبەردەمی قیت دەبمەوە.

ژنەکەم گوتی بەچاوان.

ئاگانا چووە لای دەلاك و، قژی کورت کردەوە و ردێنێکی تاشی و دەستێکی بەخۆیدا هێنا و خۆی تیفتیفە دا و جلی گۆڕی... دەی باشە خۆ دیارە... وەك بۆمان دانابوو، هات.

سەگەل نەك پێی نەوەڕین، بگرە کلکەسووتەشیان بۆ کرد. گەلێ ئێسقانی خستبووە بەر دەمیان و حیزی کردبوون.

ـ لێرەی رادا گیان؟

ـ من لێرەم باوە ئیانکۆ، بەڵێ.

ـ تۆخوا پێم مەڵێ باوە. ئاخر ناکرێ و یەك ناگرێتەوە... دوای ئەوەش، بۆ من پیرم پێم دەڵێی باوە؟ نەك پیر نیم، بگرە زۆریش تۆکمە و بەهێزم.

راست لەودەمەدا من کە لە قوژبنێك خۆم مات کردبوو، دەرپەڕیم و دەرگاکەم خستە سەر گازەرای پشت بۆ ئەوەی دانگەکە رووناك بێتەوە. سپیایی بەفرەکە نێو دانگەکەی وەك رۆژ رووناك کردەوە.

گوتم: یا ئەڵڵا باوە ئیانکۆ، وا دیارە هاتوویە ژوانی ژنەکەی من، وایە؟

زاری گەزێك داپچڕی.

بە تێڵایەکەوە بەردەرگام لێ گرتبوو، کە ئەگەر بیەوێ دەرپەڕێ پێی بڵێم پووتێك چەند کیلۆیە.

دەستی کرد بە پاڕانەوە و لالانەوە: تۆ خوا مەمکووژە و لێم خۆش بە ڤاسیلێ.

گوتم: ناتکوژم، قاپووتەکەت داکەنە.

دای کەند و لە سەر عەرزەکە داینا.

پانتۆڵەکەشت داکەنە.

ئەویشی داکەند و خستییە سەر قاپووتەکەی.

ـ کڵاوە چەرمینەکەشت لەسەر پانتۆڵەکەت دانێ.

داینا.

ـ جزمەکانیشت داکەنە.

ـ ڤاسیلێ، لێم خۆش بە.

ـ گوتم جەزمەکانت دانێ. دەتەوێ دەهریم بکەی؟ ئەستەغفیرۆڵا. ئاگات لە خۆت بێ ها.

جزمەکانی داکەند. جزمە نوێ نوێ. کە دایدەکەندن، دەتگوت گیانی دەردەچێ. لە سەرمانیش وەك سەگ هەڵدەلەرزی.

ـ جا ئێستا دەتەوێ چیم لێ بکەی ڤاسیلێ گیان؟

ـ هیچت لێ ناکەم چاوەکەم. وەك چەپکێ گوڵ دەچییەوەماڵێ و سێسەد "لیێی" هەڵدەگری و بۆم دێنی، با ئالبیۆنێکی پێ بکڕم.

ـ بڕوانە ڤاسیلێ گیان: دووسەد لییێ دێنم بچۆ کلیتۆنێکی پێ بکڕە. ئەویش مەکینەی دروێنەیە و بۆ ئاگاداریت مەکینەیەکی زۆر زۆریش باشە.

ـ زۆری لێ مەڵێ. کلیتۆن لە هینەکەی پوورت بنێ. من ئالبیۆنم پێویستە. هەتا ئێستا هەر ئاغا مەکینەی ئالبیۆنی هەبووە بۆ دروێنە، منیش دەمەوێ ئالبیۆنم هەبێ. ئێستاش کە ئاغایەکی وەك تۆ مەگێرانی بە گانی ژنی منەوە دەکا، بۆچی نەمبێ؟

ـ ڤاسیلێ گیان؟

ـ ڤاسیلێ و ژەهری مار سەگباب.

چوو پارە بێنێ. بە پێ دزە چۆوە ماڵێ و هەرواش بە پێ دزە گەڕاوە. پارەکەم ژمارد. سێسەدی تەواو.

ـ زەحمەت نەبێ، دیسان دەبێ بچییەوە و بێیەوە.

ـ ئەمجارە بۆچی؟

ـ یان دوو دراوی زێڕ، یان بیست لیێی دیکە.

ـ ئەوەیان بۆ؟

ـ لەبەر ئەوەی، کە دەچمەە شاری بۆ کڕینی ئالیبۆن، دەمەوێ خۆشم وەك ئاغایان بچمە کافتریا و بەزم و خواردنەوەیەك ڕێك بخەم.

ـ کوڕە ڤاسیلیێ گیان....

ـ ڤاسیلیێ و ژەقنەمووت...

ـ دارم لێ ڕاست کردەوە و لیێ ڕاسام. دەیتوانی چ بکا؟ چوو هێنای. بە نووزەنووز گوتی:

ـ ماڵوێرانت کردم، چەتەی گیرفانبڕ.

ـ من چەتە و گیرفانبڕم؟ ئەوە تۆی زۆڵی سەگباب چەتە و تاڵانچیی، کە خەڵکی داماو دەبەیە دووکانە کاولەکەت و گیرفانیان هەڵدەتەکێنی.

جا لیێی گەڕام بڕوا ملی بشکێنێ. قاپووت بەسەرشانەوە و کڵاوە چەرمینە لەسەر، بەڵام بە بندەرپێوە. جزمەکانی بەدەستێکییەوە و پانتۆڵەکەشی بەدەستەکەی دیکەیەوە. بە هەر گۆرەوییی لەپێ بوو بەسەر بەفرەکەدا ڕۆیشت.

چوومە شاری ئالیبۆنێکم کڕی، لە کافتریان خواردنێکی باشم خوارد و خواردنەوەیەکی باشیشم پێدا کرد و گوێم لە گۆرانی و مۆسیقاش کرد و لە سایەی سەری ژنەکەمەوە خۆشم ڕابوارد.

❊

❊

❊

وەختە لە گەرمانا بخنکێین.

سفرەکان هەڵدەتەکێنین. خواردن تەواو بووە. قالۆنچە و مێرووله و مێش هرووژم دێننە سەر سفرەکە.

چرکەچرکی مەکینەدروێنەی بێکا هەڵدەستێ و مەکینەکانی دیکەش هەروەتر. لەمسەرەوە تا ئەو سەری گەنمەجاڕەکە...

ـ هۆۆۆۆ، دەی وەرن زوو بن خێرا.

ژنەکەی ژانی لێ هاتووە.

زەوی وەك کوورە داییسێ. هەوا گڕەی دێ. وەك بازنەی هۆرا، لە دەوری ژنە کۆ دەبینەوە، دێتەوە هۆش خۆی و هەڵدەستێ. هەناسەیەکی بەبەردا دێتەوە و دەڵێ:

ـ وا دیارە وەختیەتی.

ژنەکان داوێنی هەڵدەدەنەوە و دەست بە زگیدا دێنن.

ـ نا، هێشتا زووە. لەوانەیە بەرەبەری ئێوارێ بتبێ.

"حەوت ناوك" بەتایبەتی وا دەنوێنێ زۆر شارەزای ئەو شتانەیە. لە ئاوایی وا بلاوە، دەڵێن، "حەوت ناوك" کچەکانیشی فێر کردووە، چۆن منداڵ لەبار بەرن.

ـ تیتزا ببمەوە ماڵێ.

ـ با بڕۆین.

تیتزا دەستی ژنەکەی دەگرێ.

ـ دوایی ئێوە عارەبانە و کەلوپەلەکانم لەگەڵ خۆتان بۆ بێننەوە.

ژنە بەلادا دێ و لەتر دەبا. تەشقی گەرماکەی نیوەڕۆ شکاوە. ژنەکەی دەچێتە بن پیلی. دەکرێ بڵێی بەسەرشانی خۆیدا داوە.

ژنە بە ناڵینەوە دەڵێ: تینوومە.

ـ داریە، گۆزەکە هەڵگرە و تا ماڵێ لەگەڵیان بڕۆوە.

کوێرەوەری و تاڵی و سوێری لەسەر کوێرەوەری. ڕێگە دوور و خۆڵ وتۆزە. نەك هەر تۆز، خۆڵەمرەیەکە سوور بووەتەوە.

من بە گۆزەکەوە بەدواییاندا دەڕۆم. ئەگەرچی چەند دڵۆپەیەك پتری تێدا نەماوە. هەر چەند هەنگاوێك رادەوەستین بۆ ئەوەی ژنە پشوویەکی بەبەردا بێتەوە و زارێك تەڕ بکا.

ـ ژانت پێدا دێ، فلۆریا؟

ـ ئەدی، ژانم هەیە.

سەپان و مەکینەی درویّنە بەجیّ دەمیّنن. ئیّستا ئیتر لە وزەوزی میّش و میّشوولە زیاتر، کە وەك هەوریّك سەریان لە دوو ناوین و لەگەڵمان دیّن و گویّمان لەهیچ نابیّ. گوندەکە زۆر دوورە. زۆرمان ماوە بگەینەوە. هەروا ریّگە دەبڕین. ئەوان لە پیّشەوە و من بە دوویاندا. وەك جوانووە ئەسپیّك بە شویّنیانەوەم. ئاگام لەخۆمە نەکا سەرسمیّك بدەم و گۆزەکەم بشکیّ. بەخوای بابە هەر ئەوەمان کەمە.

دیسان ژنە هاوار دەکا: خنکام لە تینووان.

ئاوی دەدەنیّ. هیّشتا ریّگەیەکی زۆرمان لەبەرە. دەڕۆین و دەڕۆین. لە بن پیرە ئەرخەوانکان کە نیشانەی سنوورن، ژنەکەی ئۆییّ ئەژنۆی دەنووشتیّتەوە و یەك بەخۆی دەزریکیّنیّ.

ـ ئاو.

لە نیّوگەڵییەوە دەنگی گریانیّك هەڵدەستیّ.

تیتزا ئۆییّ تەشك و داویّنی ژنەکەی هەڵدەداتەوە و پلەگۆشتیّك کە دەجووڵیّ و پەل دەکوتیّ، دیّنیّتە دەریّ.

ـ داویّك... تیتزا. داویّك... داویّك بدۆزەرەوە و بیبڕە.

تیتزا دەست دەبا و پەڕۆکەی نیّوقەدی دەکاتەوە و ناوکەکەی دەبڕیّ. کراسەکەی تیتزا لەبەر ئارەقە رەش دا گەڕاوە. دوو لەت لە داویّنی کراسەکەی دادەڕیّ و منداڵەکەی تیّوە دەپیّچیّ.

ـ چییە؟

ـ کچە.

پلەگۆشتەکە بەزەحمەت هەناسەی دیّ.

ئیتر هەتاو شۆڕ بووەتەوە.

ـ بیشۆ، نەکا بەبیّدینی بمریّ.

ـ داریە، گۆزەکە ئاوی تیّدا ماوە.

ـ نەوەڵا.

ـ یەك دلۆپەش؟

ـ یەك دلۆپەش.

کچیّ لە باوەشتی بکە، من دەبیّ ببمە قەشە.

ـ دەی ببە.

ژنە منداڵەکە لە باوەش دەکا. مەمکە خۆڵاوییەکانی لە یەخەی کراسەکەی دێنێتە دەریّ و دەیگوشیّ بۆ ئەوەی ژەکەکەی تۆزێك برێژیّ و رۆژووی بکاتەوە.

پیاوەکە دەڵیّ: ـ شەیتان رەجم دەکەی؟

ژنە دەڵیّ: ئا رەجمی دەکەم.

پیاوەکە دادێتەوە و مستێك خۆڵ هەڵدەگریّ و بەسەری منداڵەکەیدا دەکا. سەری منداڵەکە درێژ و بێتووکە.

ـ بەناوی دۆمیترای دایکمەوە تەعمیدی دەکەم.

دیسان وەڕیّ دەکەوینەوە. ئێمە لە لێژایی گردەکە ئاودیو دەبین و خۆرەتاویش لە شیوی ئاسمان. قاچە پێخواسەکانمان لەسەر خۆڵەکە تەپەی دیّ. لە پشتەسەرمانەوە، سیّ سێبەری درێژدرێژ کە هەر دێن و درێژتریش دەبنەوە بە پێمانەوە نووساون و لەسەر عەرزەکە دەجووڵێن. سێبەری منداڵەکە نابینریّ:

ـ سێبەری ئەو لەگەڵ سێبەری تیتزا کە لەباوەشی گرتووە، بووەتە یەك.

ـ گویّ بدەیە.

ـ چ باسە؟

ـ ژانم هەیە.

منداڵەکە لە تیتزا ئۆییّ وەردەگرم و رایدەژێنم. لە شووتییەکیش سووکترە.

ژنە دیسان ئەژنۆی نووشتاونەوە. زریکەیەکی دیکە، دڕ بە هەوا گەرم و شێدارەکە دەدا. ئەوجار ئیدی ئاواییە بێدەنگەکە لە قووڵایی شیوەکەدا دیارە. بە کوخ و ئەرخەوان و دار بییەکانی دەم بەنداوەکەی سەر ئەو چۆمەی ئاشێکیشی لەسەر دیارە. ئاسنەڕێیەکە لە نێوان ئێمە و ئاوەدانیدایە و وێستگەش بە هێما و عەمبار و ئاسنەپەرژین و بیرەقووڵەکانی و ئاوهەڵکێشە گەورەکانییەوە.

دەنگی نقەنقێکی دیکەیش لە نێو رانەکانی ژنەوە هەڵدەستیّ.

ـ ئەتۆ سەیری مەکە داریە.

ـ سەیری ناکەم.

چاوم بەرەو لای گردەکە هەڵدەبڕم. لەوێوە گەنمەجاڕێکی دیکە دەست پێدەکا و هەتا چاوهەتەر دەکا هەر گەنمە. لەوانەیە تا لێوارەکانی ئۆڵت لەوبەری ئاسۆوە.

دۆمیتراکێ هەروا لە باوەشمدا رادەژێنم.

گوێم لە دەنگی ژنە دەبێ، کە دەپرسێ: ئەوەشیان کچە؟

ـ ئەدی کچە.

دیسان:

ـ شەیتان رەجم دەکەی؟

ـ رەجمی دەکەم.

تیتزا مستەخۆڵێك بەسەر باریك و گۆشەدار و بێتووکەکەی ئەمشیاندا دەکا.

ـ بەناوی دۆبرای دایکتەوە تەعمیدی دەکەم.

ئیدی باوکە هیچی پێ نەماوە منداڵەکەی پێ مەلۆتەکە بکا. شڕوشاڵاتە تیتۆڵ تیتۆڵەکەی بەری دادەکەنێ و ئەوەشیانی تێوەردەپێچێ. جا ئێستا لە نێوقەدی بۆ سەرەوە رووتە. پانتۆڵەکەی رەق رەقە و پڕ لە پینەیە و سینگە تووکنەکەی تاو بردوویەتی. هەر دوو ساواکەی لە باوەش گرتووە و بەرەو ئاوەدانی لە گردەکە دادەگەڕێ. جادەکە خۆڵەمڕەیە و خۆڵەکەش نەرم و سپی. ژنەکەی تێك شکاوە و شەکەت و کەنفت بە لاتراسکە بەدوویدا دێ. هەر هەنگاوێك دەنێ، وەختە تلّپ بەعەرزیدا بکەوێ، بەڵام هەرچۆنێك بێ خۆی رادەگرێ. سێبەرەکانیش هەر دێن و لەسەر خۆڵەکە درێژتر دەبنەوە.

دەگەینەوە دێ و دەچینە ماڵی ئۆیێ. نێو خانووە هەڵاشکراوەکە و پەرژینی زیندووی ئەرخەوان و پیرەدارتووەکە، کە توێکڵی شەقار بوون و مێرووڵەی گەورەگەورەی سوور تێیدا شاریان کردووە.

زەیستانەکە لە بن دارتووەکە دادەنیشێ و پاڵی وێ دەدا.

تیتزا لە ماڵی دراوسێکاندا بەدووی ژنێکدا دەگەڕێ بێ و تۆزێکی پێ رابگا. لە گرادینای ژنی ئاسنگەرەکە زیاتر کەس نادۆزێتەوە.

ـ دەبێ ساواکان بشۆرێن و مەلۆتکە بکرێن. چوو بەدوای قەشەدا بێ و غوسڵیان لێ دەربکا.

قالاو [*]، له مەزراكەيەتی. خۆم ئەو داماوانەم بە خۆڵ تەعمید كرد.

سەری ئەرخەوانەكان زەرد هەڵگەڕاون. شەو بە هەنگاوی بەرز و مەخمەریەوە دێ. هەوا بۆنی گەنمی گەیوی لێ دێ. ئاوایی دەڵێی دوورگەیەكە لە نێو زەریایەكی گەنمدا.

تیتزا ئۆیێ باوەشێك تەپاڵە دێنێ و ئاورێكی گەورە دەكاتەوە و مەنجەڵێك ئاوی بۆ شوشتنی ساواكان وەسەر دەنێ. گرادینا دۆمە، بە دوای چەند لەتە پەڕۆیەكی خاوێندا هەمووماڵەكە سەنگوسووژن دەدا بەشكم منداڵەكانی پێ مەلۆتكە بكا.

زەیستانەكە هەروا لە بن دارتووەكە كەوتووە. ئەژنۆ و داوێن و گوێزینگانی شەلاڵی خوێنن. چاوی وشك هەڵگەڕاون، رەنگی بە روخسارەوە نەماوە. ساواكان لە لەتە كراسی ئۆیێ پێچراون و لە مەمكی دایكیان دەگەڕێن. زەیستانەكە لەبن لێوانەوە شتێك دەڵێ، لەوانەیە لای لایی بكا، یان لەوانەشە نزایەك بێ، یان چەمەرییەك.

ـ جمكەكانم، جمكە نازدارەكانم، باشە ئەی بە چی گەورەتان بكەم دوانە خۆشەویستەكانم؟

قاچی رادەكێشێ بۆ ئەوەی بحەسێنەوە. لاق چ لاق، دوو ئەستووركی گەورە، دوو پەنجەی سڕن و نینۆكیان رەش بووە و پاژنەی پێی ئەوەندەی كەمرە گرتووە، وەك دەڵێن، سەد سەگ بیلێسنەوە تێر دەبن و هێشتا پێوەی دەمێنێ.

فلۆریا پشوو دەدا.

مریشكێكی سەربەكلاوە لە عەرزە وشك و رووتەنەكەی حەوشە چینە دەكا.

زەیستان، بە دەنگە بێ زایەڵە و كزەكەی هەوڵ دەدا كشەی لێ بكا و دیسان دەست دەكاتەوە بە نالاندن و لە بن لێوە بەبار و شەقارشەقارەكانییەوە بە نووزەنووز دەڵێ:

ـ دووانەكەم، دووانە ئازیزەكانم، ئەی بە چی گەورەتان بكەم بە قوربان؟

---

[*] مەبەستی قەشەیە.

# ٩

## ئەلێلویا*

ئەلێلویا، کار لە کار ترازابوو. پێم وایە ئیدی هەر بەراستی بێهودە بوو ئاوا لە ترسان ئاگام لە خۆم نەمێنێ.

زۆر خێرا، بە شان و باهۆ درم بە ئاوەکە دا و خۆم گەیاندە قەراغێ. گیانم هەروا قوڕ و لیتاوی بوو و، دەستم کرد بە هاوارکردن. هاوار نا، دەکرێ بڵێی دەمنەڕاند:

ـ ئەی هاوار، فریا کەون، ئیۆن خەریکە بخنکێ.

وەك شێتان دەمنەڕاند.

ئیتر ئیۆنی کوڕی کلێشیە لە تەختی بنی چۆمەکەدا نوستبوو. لەسەر دەم یان لەوانەشە لەسەر گازەرای پشت بە لیتەکەوە نووسابوو و زگی وەك دەهۆڵ هەستابوو.

من خنکاوی دیکەشم دیتبوو. کە شەپۆل جەنازەکەیان فڕێ دەداتە قەراغێ، ڕەنگیان ڕەش هەڵگەڕاوە و بۆگەنێکی ئەوەندە ناخۆشیان لێ دێ، کە ئەگەر پیاو بیەوێ بچێتە پێشێ بۆ ئەوەی باشتر بیبینێ، ناچارە لووتی توند بگرێ.

کراسەکەم کە لە ئارەقەدا خووسابوو، لەسەر گیاکان هەڵگرت. شمەکەکانم لەبەر کردەوە. بەر لەوەی خۆرەتاو لەودیو گردی گورگان خۆی بشارێتەوە، تیشکێکی سووربامان پێدا دەپژێنێ. تیشکێکی سوورباو بەسەر گۆلەکەدا دەپژێنێ. رووکاری گۆلەکە ئەرخەوانییە. دوایی زەرد دادەگەڕێ و ئاخری دەبێتە خۆڵەمێشی.

گانگۆ و تۆدۆراکێی برای لە تەنیشتمەوە لەسەرمان وەك سەگ هەڵدەلەرزن. تۆردۆراکێ، بێت و گانگۆ دەستی نەگرێ، ناتوانێ هەنگاوێکیش بڕوا. ئەو دوو برایە دەڵێی پێکەوە نووساون. تەنانەت بۆ ئاودەستێش هەر دەستی یەکتری دەگرن.

جگە لەو دووانە، ئاواڵەکانی دیکەشم: ناکۆ و ئیتزیکۆ و تۆتانۆ و تۆرتۆریکایش لە لامن.

---

* Alleluia وشەیەکی عیبرییە وەك "ماشەڵا" کە مەسیحییەکانیش لە کاتی جۆراوجۆری خەمباری و دڵخۆشیدا دەیڵێن.

کراسەکەی ئیۆن لەویٚ لە دەم چۆمەکە کەوتووە. شاقەلی پڕە لە پەڵەی چەوری و پینەیەکی زلی ناقۆڵاش پەڵەیەکی ناڕێکی خستووەتە پشتی. ئەگەر بنیادەم دەست لە کراسی خنکاوێك بدا، نەگبەتی بەرۆکی دەگریٚ، بەڵام لەبەرکردنەکەی باشە. کوڕە چکۆڵەکەی کلێشیٚ کە ناوی ستیڤانە، بەڵام ماوەیەکە ناویان ناوە گۆرکیٚ، هەڵیدەگریٚ و لەبەری دەکا.

دیارە ستیڤانیان بۆ گۆڕینی ناوەکەی نەبردە کلێشا کە سەرلەنویٚ غوسڵی لیٚ دەرکەنەوە. نەیانبردە نووسینگەی ناحیەیش بۆ ئەوەی ناوە تازەکەی لە دەفتەری تۆمارەکاندا بنووسن. ئەو کارانە نەدەکران: میرزا قەلەی ریش بزن، هەر تاقە جارێك لە ژیانتدا سەرت لە بن ئاویٚ دەنیٚ. لە هەموو ژیانتدا، لە ئەوەڵەوە تا ئاخری هەر تاقە جارێك ئەو شانازییە بە قسمەتی بنیادەم دەبیٚ کە حەزرەتی قەشە فوووی بەسەرو چاویدا بکا و لە بن لێوانەوە بڵیٚ:" بە ناوی باوك و کوڕ و رۆحی پیرۆز، ئەو غوڵامە گوێلەمستەی باری تەعالام تەعمید کرد."

سکرتێرەکەی ناحیەیش هەر تاقە جارێك دەکریٚ ناوی بنیادەم بنووسیٚ و بیدا بە باوکی بن پسوولەی لە دایکبوونەکەی پەنجەمۆر بکا... ئاخۆ خەریك بوو هەڵە بکەم: چونکە لێرە دوو جاری دیکەش ناوی بنیادەم دەنووسریٚ: یەکێکیان کاتی ژنهێنان و یەکیانیش کاتی مردن. جا بنیادەم بە مردنی خۆی و لەسەر نوێن و بانی خۆی بمریٚ، یان بە مەرگی ناوەخت و بۆ وێنە لە ئاودا بخنکیٚ، هەر وەك چۆن ئێستا ئیۆن مردووە.

ستیڤان، دایك و باوکی ناوەکەیان گۆڕی و کردیانە گیۆرکیٚ. ئەنگێل نابادیەی جادووگەر ئەمری کردبوو.

گیۆرکیٚ فێدارە. خۆ لە دێیەکەی ئێمەدا هەر ئەو فێی لیٚ نایە، بەڵام کەسیماڵی ئێمە فیٚ نایگریٚ.

ـ ئەریٚ هەر بەراست بنیادەم بۆچی فێی لیٚ دیٚ؟

لە کۆڵانیٚ خەریکین یاری دەکەین، لە حەوشە هەر وا خەریکی گەمەین، لە شینکە و چیمەنی دەم چۆمیدا خەریکی کایەین، گیۆرکێش لەگەڵمان یاری دەکا، کە لە پڕێکدا پەتا نەناسراوەکە بینەقاقای دەگریٚ. گیۆرکێی داماو دەتلێتەوە و دەکەویٚ و پەلەقاژە دەکا و خۆی وێك دێنیٚ و چاوی سپی هەڵدەگەڕێن و ددان و شەویلگەی توند دەبن و کەفێکی سپی لە زاری دێتە دەریٚ. یەکێکمان، کچ یان

ئەو كوڕەی لە هەمووان بەغیرەتترە، دادێتەوە و پەنجەتووتەی دەستی چەپەی دەگرێ و توند دەیگوشێ. دەبێ وا بكا بۆ ئەوەی فێدارەكە بێتەوە سەرخۆی، بەڵام ئەو ماڵوێرانە هەست بە هیچ ناكا: دیلی دەستی خێو و جنۆكانە و نیوەی رۆحیان لەگەڵ خۆیان بردووەتە ئەودنیا. ئەوان هەرچۆنی پێیان خۆش بێ، هەڵیدەسووڕێنن. قۆچە و بەرانەی لێ دەدەن و بە كلكە چەماوەكەیان لێی رادەكێشن. تا خێو و جن دەستی لێ هەڵنەگرن، نایەتەوە سەرخۆ. دیارە زۆر زووش بەرۆكی بەردەدەن، ئاخر دەبێ بە زۆر خەڵكی دیكەی ئەم دنیایە رابگەن و دنیاش هەر خوا بزانێ چەندە گەورەیە...

دیلی دەستی جنۆكان دێتەوە سەرخۆ. هەر دەڵێی لە خەو هەڵدەستێ. چاوە درشتە ماندووەكانی هەڵدێنێ و نازانێ چیی بەسەرهاتووە. هەر دەڵێی برسێتی. ئەوەندەی پەل كوتاوە، تینی تێدا نەماوە. رێك دەڵێی رێیەكی دووری بڕیوە. هەر بەراستی لە رێیەكی دووریشەوە هاتووەتەوە، بەڵام لە كوێ؟

دەم و لەوسی بە سەری قۆڵی كراسەكەی خاوێن دەكاتەوە، ، هەڵدەستێ و قیت رادەوەستێ و وردە وردە تینی وەبەر دێتەوە. وەك لە سەریاندا بێ، بە لاتراسكە دەكەوێتە رێ. كارمان زۆر پێی نییە. تەنانەت لە دواوەش سەیری ناكەین كە دەڕوا. لێی گەڕێن با بڕوا. دەچینەوە سەر گەمەكەمان.

دایك و باوكی ناوەكەیان گۆڕی، بەڵام ئەوەی كە ئێستا لەبری ستیڤان پێی دەڵێن گیۆركێ، هیچ دەردێكی لێ دەرمان نەكردووە. ئازارەكە دەیناسێ. ناكرێ هەڵیخەڵەتێنی. كە قەرار بێ بیگرێ، لە هەرجێیەك و هەرچۆنێك بێ، هەر بەرۆكی دەگرێ. جا ئێستا كە براگەورەكەی خنكاوە، كراسەكەی ئەوی لەبەر دەكەن بەشكم بەختی بێنێ و رزگاری بێ (یانی هەر بەراستی دەبێ شوكرانەبژێر بی بە بەختی وا؟" ئەویش چ كراسێك: زبر و چڵكن و تیسكن، پینەیەكی زلی ناڕێكیش بە پشتییەوە. دیسان ئەگەر كراسێكی نوێ بوایە شتێك.

هاوار و زیقەی ئێمە خەڵكەكە ئاگادار دەكاتەوە و هەمووان لە دەوری گۆلەكە كۆ دەبنەوە.

من تازە لەگەڵ تیتزائۆییێ و فلۆریای ژنی و جمكەكەیان كە هێشتا چاویان نەپشكوتبوو و دەتگوت دوو بێچووەپشیلەن چاویان لێك ناوە، لە مەزراوە گەڕابوومەوە و هەرچی تین و گەرمای ئەو رۆژە و مەزرا سوورەوەبووەكەی بەر قرچەی هەتاو بوو، لە پێست و گیانمدا مابوو.

یەکەم شتێکی بەزەینمدا هات، ئەوە بوو، کە منداڵان کۆ بکەمەوە و خۆ بە ئاوەکەدا بدەم و تۆزێك خۆم فێنك بکەمەوە و بچم گەمەیەك بکەم و ماندوویەتیم تووڕبدەمە پشت حەوت کێوی رەش.

خولێك لە کۆڵانەکاندا سووڕاینەوە و کۆ بووینەوە.

ـ بچینە مەلەی؟

ـ با بچین.

وەك دەستەی تەتەران، بەرەو لای چۆمەکە بازرە بووین.

کە بە گەورەرێیەکەدا دەڕۆیشتین، دێوەزمەیەك لە پێشمان قوت بۆوە. جەنجەڕ بوو، کە چوار گایان تێکردبوو، رایاندەکێشا بەرەو مێرگەکەی لای مەکینەی هەڵمەکە.

وردەوردە گێرەکردنی خەرمانەکان دەستی پێ دەکرد. بەڵام بەر لەوە جۆی شەشپەڕ و جۆڕەشەیان دەهاڕی.

کلەشێ جووتێك گای لێ دەخوڕی. ئیۆنیش شان بە شانی باوکە دەڕۆیی. هەر ئێمەی دیت، بزۆزییەکەی بزووت و جەنەی گرت لەگەڵمان بێ و هەر واشی کرد.

ئیۆن کوڕە نازدارەی دایکەیەتی ــ ئیدی ئێستا دەبێ بڵێین بوو ــ سەرەڕای ئەوەی تۆزێك زمانی دەیگرت و بسك بوو، تۆزێکیش ئەقڵی پارسەنگی دەویست، نازدارەکەی دایەی بوو. بەڵام ناسك و نازدارەی کلەشێ، مارینای کچێتی، کە هیچ عەیب و عیللەتی نییە و یەکێکە وەك باقی بنیادەمان... هەموو کوڕی دێ کلکەسووتەی بۆ دەکەن. دیارە نەك لەبەر ئەوەی زەویوزارێکی هەبێ، چونکە کلەشێ زەوییەکی وای نییە و، ئەگەر هەشی بێ نایداتە زاوا. گوو ناکا دەڵێ برسیم دەبێتەوە. بەڵام هەمووان ئاگادارن، لە بن کۆڵەکەکەی نێو حەوشەی کلەشێ، کەس وەبیری نایە لە کەیەوە، گەنجینەیەك شاردراوەتوە: کووپەیەکی گەورەی پڕ لە زێڕ و زیو.

گەنجینەکە، جاری وایە حەزی سەمای دەکەوێتە سەر. کاتی سەماکردنەکەشی شەوانەیە. جار هەبووە دراوسێکان بڵێسەیەکی شینباویان دیتووە، کە لە کۆڵەکەکە و پەرژینەکەی دەورییەوە هەڵدەستێ. بڵێسەکە لە بن کۆڵەکەکەوە دێتە دەرێ، ماوەیەك هەڵبەز و دابەز دەکا، بەبێ ئەوەی کۆڵەکەدارینەکە بسووتێنێ. ئەگەر بنیادەم دەستی لە بڵێسەی گەنجەکە رۆبکا، کە خەریکی

سەمایە، هیچ هەست بە سووتانەوە ناکا. ئەو ئاگرە تەنانەت جگەرەشی پێ داناگیرسێ. کەس دەست بۆ گەنجینە شاراوەکەی بن ئەو کۆڵەکەیەی نێو حەوشەی کلەشێ نابا. چونکە لە بن گڵەکەدا تەلیسمیان کردووە و، هەر کەس ڕێزی تەلیسم نەگرێ، تووکی خودا دەیگرێ. کە وەختی خۆی هات، بۆخۆی لە خاك دێتە دەرێ.

هەر لە سۆنگەی ئەو گەنجەوەیە، وا هەموو کوڕەکانی کلەشێ بە نیشانەوە لەدایك دەبن.

ژنەکەی کلەشێ، کە دووگیان بووە، نەیزانیوە پێی لەسەر گەنجینەکە داناوە. لە بیری چووە ئاگای لەخۆی بێ. هەر لەودەمەوە، کلەشێ کۆڵەکەیەکی لەسەر گەنجینەکە داناوە و پەرژینێکی بەدەوردا کێشاوە، بۆ ئەوەی کەس پێی لەسەردا نەنێ و تووکی خودا نەیگرێ.

❊

❊

❊

جۆگەلەئاوێکی قوڕاوی تەوەزەل، لە ڕێیەکی دوورەوە لە کوێستانەوە شۆڕ بووەتەوە و، پێچەڵەپێچ بە نێوان گردەکاندا رادەبرێ. لە هەر جێیەك بە نێو دێهاتدا تێپەڕیبێ، بە شووڵك و دار بەنداوێکیان لەپێش هەڵبەستووە و، گڵیان لەپشتەوەی کردوە و ئاوەکەیان گل داوەتەوە.

ئاوەکەی کە پەنگی دەخواردەوە، چونکە بەرلووزەوەکەی تەسك بووە، ناچار بووە بەرخۆی قووڵ بکا. لێرەو لەوێ جاری وایە بەستێنی چۆمەکەش لەبەر یەك دەکشێتەوە و گۆل و تالاّوی لێ دەکەوێتەوە، کە ئەگەر بنیادەم لە هێزی شان و باهۆی خۆی رابیینێ، دەتوانێ لەم بەرەوە بەردێك باوێتە ئەوبەری، بەلاّم هەر بەو مەرجەی شانوباهۆیەکی بەهێزی هەبێ. ئەگینا هەر بە گەمی دەتوانی شتێك لەم بەرەوە بەریتە ئەوبەر.

لە سەرووی ئاوایی، یانی لەو شوێنەی کەس ئاوەکەی لێڵ ناکا، هەسێڵەکە، تۆڕێکی هەوریشمینی کەسك دایپۆشیوە. ئەو تۆڕە هەوریشمینە، تەنیا ئەو قاز و مراویانە دەیدڕێنن، کە بۆ بژێوێك بەرەو سەرووی چۆمەکە هەڵدەکشێن. ئەو بۆقیلانەش کە قەپۆزێکی سپی و سەرێکی خەت خەت و چاوی دەرپۆقیویان لەبەر تاوەکە هەڵخستووە، تۆڕە هەوریشمینەکەش دەدڕن. چاویان لە سەمەرەی ئەو شتە سەیرانەی لە تەرکی ئاوەکەدا دەیبینن، ئاوا لە ژێلا هاتووە: لەبەر دیتنی قرژاڵی چەنگ سوور، ماری رەشی درێژ و خاڵ خاڵ، ماسیی زەردباو، جنۆکەماسیی گورجوگۆڵ کە وەك نەیزەك تێدەپەڕن، ماسیی کارێزان، کە پوولەکی سپییان هەیە، بۆقیلە، کە لبادەی فش و رەشیان خستووەتە سەر شانیان، سەرەمێکوتە و سەرمازەڵە، کە سەریان زل و جەستەیان روون روونە، وردەکرم، کە وەك دەزوو باریکن و سوور و رەش و کەسك و یاقووتی تێك دەئاڵێن. چاوی بۆیلە شتی سەیروسەمەرەی دیکەشیان دیوە ئاوایان لێ هاتووە: لە سەیری ئەو شتانەی لە نێوان ئاوەکان و مانگدا، لە نێوان ئاوەکان و ئەستێرەکاندا روو دەدەن.

شەوانە، ئەستێرەکان دێنە خوارێ و لە چۆمەکەدا مەلە دەکەن. ئاسمانیش هەروا شەقڵ نەشکاو و بێکەموکوڕی، شەوانە بۆ مەلەکردن دێتە نێو هەسێڵەکە. شەوانی مانگەشەویش، مانگ دێتە خوارێ و لە چۆمەکەدا خۆی دەشوا.

شۆڕەبی خەویان زۆر قورسە. زۆر لە بنیادەمەکان قووڵتر و بێخەمتر دەنوون. با، بۆ ئەوەی گەڵاکان بنوون، بۆ ئەوەی لکوپۆ بنوون، لای لاییان بۆ دەڵێ و شۆڕەبییەکان هێور و ئارام خەویان لێ دەکەوێ و بایەکەش خەوەکەیان قووڵتر و هێورتر دەکاتەوە. ئاوەکان قەت خەویان لێ ناکەوێ. ئەوان قەت قەت چاو لێك نانێن. ئەوان شەو و رۆژ بەرێوەن. شەو و رۆژ. کێ چووزانێ؟ لەوانەیە بییەکان هەرگیز نەخەون.

گایەکان دێنینە دەم بەنداوەکە بیانشۆین. ئەسپ و بەرازەکان و خۆشمان... خۆشمان لەوێ، لە تەنیشت کۆگا گلّەکەی بەنداوەکە خۆمان دەشۆین. ئەوێ لە شوێنەکانی دیکەش قوولّترە و روونتریشە. تەنیا وەختێکی چەند کەسێك پێکەوە مەلە دەکەین، ئاوەکە قوڕاو دەبێ. زیاتر یەکشەممۆیان وای لێ دێ، بەلاّم ئەمڕۆ یەکشەممە نییە، رۆژێکە وەك باقی رۆژەکان. یەکێك لە رۆژەکانی ئیشکردنە.

پێمان وابوو ئەمڕۆ چۆمەکە هەر بەدەست خۆمانەوەیە، بەلاّم وا نەبوو: خەلّکێك وەپێش ئێمە کەوتوون. هەموویان، یان پیرو پەککەوتە و نەزۆك و لە زگوەستاون، یان تازەپێگەیشتوون و تازە میزیان کەفی کردووە. چونکە ژنەکانی دی لە مەزرایە خەریکی ئیشن. لەگەلّ نزیکبوونەوەمان لە چەمەکە، گوێمان لە دەنگ و هەرایان بوو، کە دەیانزیقاند و دەتریقانەوە.

ـ ژنان لە گۆلەکە خەریکن خۆیان دەشۆن.

ـ وەرن بچینە سەرتر، پشتەوەی گەوی چەمەکە.

بەلاّم کە دەمانەوێ با بدەینەوە، شتێك رامانده‌گرێ: وەبیرمان دێتەوە، کە تەنیشت مالّەکەی کلەشێ نووسینگەی پۆستەیە و لە تەنیشت نووسینگەی پۆستەش مالّەکەی رۆتزۆ.

رۆتزۆ، پار وەك پاسەوانی ئاسنەڕێ هاتووەتە ئێرە. لەوەدەمەوە وەك ئاغایەك دەژی. یۆنیفۆرمەکەی لەبەر دەکا، کە قۆپچەکانی ئاسنن و، کلاّوئاسنێك لەسەری دەنێ، خەتێکی سووری بەدەوردا هاتووە. لەگەلّ ژن و مندالّەکەی و دارونەداری هەلّگرتووە و چووەتە وێستگە دانیشتووە و خانووەکەی بە کرێ داوەتە دیماکیێ میکۆی سەرکرێکاری ئیدارەی رێگەوبان.

سەرکرێکارەکەی ئیدارەی ڕێگەوبان، خەڵکی شارە. هاتووە ڕێگەوبانەکان چاك بکاتەوە و قوڵکە و درزەکانی بگرێ. کابرایەکی تاوەسووتی دەمولیوگۆشتنی سمێڵ زلە. سەڵتە و نانەکەی لەگەڵ دکتۆر گانچۆ و مامۆستا پۆپسکۆ کە دەنگێکی خۆی هەیە و، باقی حاکمە یەکرۆژەکانی ئاوایی لە مەیخانە دەخوا.

سەرکرێکار میکۆ، دووربینێکیشی هەیە. من هەندێ شەوان دەچمە ماڵەکەی و بە دووربینەکەی سەیری ئەستێرەکان و مانگ و ڕێگەی شیری و چیی دیکەی دڵم بخوازێ، دەکەم.

لەو سەری باخچەکەی ماڵی ڕۆتزۆوە، چۆمەکە دیارە.

ئێوارەو ئێوارە، وەختێك هەتاو بەرەو ئاسۆ دادەکشێ و، ژنانی دێ وێکڕا دەچنە چۆمی خۆیان بشۆن، سەرکرێکاریش دووربینەکەی لە بن باڵی دەنێ و رادەکاتە ئەوسەری باخچەکە و، لە نێو گژ و گیا و دڕوانەی لە بەر پەرژینەکان دەڕوێن و وەسەر پەرژینەکەش دەکەون، رادەکشێ و، دووربینەکەی راست دەکا و لەسەر چاوی دادەنێ و ئەوەندە سەیری ژنەکان دەکا، هەتا لیکاوی لە زاری دەتکێ.

ژنان پێیان زانیوە. پێتان وایە چ دەکەن؟ کردیانە هەرا؟ نەخێر، لەو دەمەوە رێك وەك مانگای سەرخۆش دەهۆقێنن و یەکتر راو دەنێن و، بە شانوملی یەکتر هەڵدەپڕووسکێن و، خۆیان دەخەنە سەر پشت و زۆرانبازی دەکەن و هەزار جۆر ئەداو ئەتوار دەردێنن. بەتایبەتی پیرەژنە لە زگوەستاو و قوونزلەکان، کە رێك دەیانەوێ جێیەکیان وەدەر بخەن، بێت و داپۆشن زۆر باشترە.

ـ دەی باشە، دا پێم بڵێن منداڵینە، دەڵێن چی بچین بزانین، راستە کە هەر دەڵێن سەرکرێکارەکە بە دووربینەکەی سەیری ژنان دەکا؟

جا چووین. گژوگیا خۆڕسکەکانی پشت پەرژینەکەمان هەڵنا و، چیی بەرد و کەرسەکی[*] وەدەستمان کەوت، تێمان گرت. چەند جێیەکی چەپەرەکەمان شکاند و، هەموو گژ و گیا و پووش و دڕووەکانمان لێك دا. هیچ، هەر هیچ. سەرکرێکار لەوێ نەبوو. ملی رێیەمان گرت و چووینە لای چۆمی.

ـ دەی باشە، حەزتان لێیە بچینە سەر گەوی چۆمەکە مەلەی بکەین؟

کوڕەکەی کلەشێ دەڵێ:

ـ ن ن ...نا. ب ب باشترە ب ب بچینە د د دەم هەهە هەسێڵەکە و سەسەسەسەیری ژژژنەکان بکەین.

هەمووان کەوتینە شوێنی. بەستەزمانە.

ژنەکان لە خۆشی فێنکبوونەوە، خۆشی خۆشی خۆیان بە ئاوەکەدا داوە. خۆیان رووت کردووەتەوە و لە ئاوە قۆڕاوەکەدا قەرەقەرێنیانە. کەس حیسابیشمان بۆ ناکا، هەر بۆیە زۆرمان پێ ناخۆش دەبێ. ئێمەش لە داخان خۆیان لە نێو داوێین. بین دەکێشین و دەچینە بنیان. ژنان دەزریکێنن، تووکمان لێ دەکەن، دەتریقێنەوە، بە دەستە تەڕەکانیان لە پشتەملمان رادەکێشن، پشتملمان دەگرن و راماندەکێشن و وا دەنوێنن دەیانەوێ بمانخنکێنن.

شێتانە رادەبوێرین.

لە پڕ پێریکای کوڕی ئیڤانۆش لە دەستە پڕ هەراکەمان جوێ دەبێتەوە. حەزی لێیە بە مەلەکردن بپەڕێتەوە، بەرەو نێوەڕاستی هەسێڵەکە دەڕوا. ئیۆنی کوڕی کلەشێش کرمی لە کەوڵی دەکەوێ وەشوێنی بکەوێ. ئیۆن مەلە نازانێ. لاقیشی ناگاتەوە بن ئاوەکە. لەوانەیە هاواریش بکا و داوا بکا فریای بکەون، بەڵام لەو قریوە و هەرایەدا کێ دەنگی دەبیستێ؟ لە جەنگەی گەمە و قەرەقەرێنەکەدا، بووەتە قریوەیەك سەگ خاوەنی خۆی ناناسێتەوە. لەوانەیە زۆریش پەلەقاژەی کردبێ و ویستبێی سەری نوقم نەبێ. لەوانەیە بە دەستە لەڕ و باریکەکانی پەلەقاژەشی کردبێ و ئاوەکەشی لادابێ، ئێمە تەنانەت بڵقەبڵقی ئاوەکەش نابینین. رێك نوقم دەبێ و تێدادەچێ. ئێمە کە هیچ نابینین

---

[*] کەستەك. گڵمەت. گڵمتك

و ئاگامان لە هیچ نییە هەروا خەریکی قیڕە و هەرا و خۆپێکدادان و رابواردنین. دوایی، لە پڕ دەزانین چ قەوماوە. لە ترسان موچڕکەیەك بە تیغەرەی پشتماندا دێ و وەك بریسکە لە ئاوەکە دەردەپەڕین:

ـ کوڕە هۆۆۆۆ ی ی ی ، کوڕی کلەشێ خنکا.

ژنەکانیش دەترسن: لەو تەرکی ئاوەدا تەرمێك کەوتووە.

پیاوەکان رادەکەن. بە پەلەپەل کراسەکانیان دادەکەنن و خۆیان بەئاوەکەدا دەدەن و دەگەڕێن.

ـ لەکوێ نوقم بووە؟

ـ ئەو شوێنەی لە تەرکی ئاوەکەدا کونێکی لێیە، ئەوێ کوێیە کاك سیمۆن؟ هەر لەوێ خنکاوە.

ـ نا، لەوێ نا کاکە پێتراکێ. گۆمە قوولەکە لەملایەوەیە.

ـ کوڕە هەر ئاگاشتان لێ نییە. ڕێك لەملایەوە نوقم بووە.

قوڕ و لیتەکەی تەرکی ئاوەکە، هەموو کون و قوژبنە. پیاوەکان چاویان دەنووقێنن و دەچنە بنەوە. سەریان وەتەرکی عەرزەکە دەکەوێ. وەك کوێران دەستەکوتەیانە و پێ دەکوتن. کە پشوویان سوار دەبێ، دێنەوە سەرێ و پشوویەك تازە دەکەنەوە و بین دەکێشنەوە. بەردەوام و بێبڕانەوە. ئەگەر یەکێك لە دوورەوە سەیری چۆمەکە بکا و نەزانێ چ قەوماوە و ئەو هەمووە خەڵکە لە چی دەگەڕێن، پێی وادەبێ گەمەیەکی تازەیان داهێناوە. جۆرێك باوەخولێ و لە بن تەوژمی نیگا ترساو و پەرێشانەکانی ئەوانەوە کە لە دەوری هەسێڵەکە کۆ بوونەتەوە و ئەوەندە نیگەرانن هەناسەیان دەرنایە، بە دڵێکی خۆشەوە خەریکی گەمە و رابواردنن.

سەروسەکوتی کلەشێ کە چەڵەکەیەکی درێژی بەدەستەوەیە لەولای دێوە دەردەکەوێ. وا را دەکا دەڵێی ئیزراییل سەری لە دوو ناوە. ژنەکەشی بە لەخۆدان و هانکەهانك بەدوایدا دێ. تەشك و داوێنی هەڵداوەتەوە بۆ ئەوەی بتوانێ خێراتر را بکا. ئەوانیش ئاگادار کراونەتەوە کە کوڕەکەیان خنکاوە.

ـ دۆزیتانەوە؟

ـ نا، هێشتا نەماندۆزیوەتەوە.

کلەشێ شمەکەکانی دادەکەنێ و خۆی لە ئاوەکە داوێ. چەڵەکەکەی بەدەستەوەیە و بن ئاوەکەی پێ دەپشکنێ.

ـ شەنە... دەی، کوڕینە شەنە بێنن.

ئێستا ئیتر هەمووان لە دەوری هەسێڵەکە کۆ وەبوون. هەندێ سەیر دەکەن و هەندێکیش دەکەونە گەڵ ئەوانەی خۆیان لە ئاوەکە هاویشتووە. هەسێڵەکە جێی کەسی دیکەی نابێتەوە. شەنە دێنن. درمغ دێنن. تەنانەت تۆڕێکی گەورەی ماسیگرتنیش دێنن.

کلەشێ لە پڕ هەرا دەکا:

ـ ئەوەتا، دۆزیمەوە، لێرەیە.

ئەوانەی مەلەوانی باشن، بەپەلە خۆیانی دەگەیەننێ و بین دەکێشن و دەیهێننە دەرێ.

ئیۆن وەك پارچە قوماشێك شل و شۆڕ بووەتەوە. چاوی لە ژێلا هاتوون و دەڵێی شووشەن. زگی وا هەڵمساوە، کە پیاوی وەدەزانێ ئێستا نا تاوێکی تر دەتەقێ. لە دەم ئاوەکە درێژی دەکەن بە گژ و گیا دایدەپۆشن و ئەو چەند مۆمەی هێناویانە دایاندەگیرسێنن. لە کاسەشکاوێکدا چەند ژیلەمۆیەك کە سوورسوور دەگەشێنەوە دێنن، دووکەڵی ئەسپەندەر هەڵدەستێ. تاو لە پشت گورگانەوە ئاوا دەبێ و دەکوژێتەوە.ئێستا چەند داوێکی کەوە و رەش رووکاری ئاوەکەیان خەت خەت کردووە.

لە لای سەرەوە، هەورە هاوینییەکان تێك دەئالێن.

هەرچی شیاوی دیتن بووە، دیتوومانە.

با بگەڕێینەوە ئیتر.

حەوشەکەمان سریوەیەکی لێ نایە. دەرگای ژوورەکان داخراون. مریشکەکان چوونەتەوە کولانکەی خۆیان. لە نیوەڕۆوە تا ئێستا زەوادم نەشکاوە. بە پێیان هاتنەوە لەو رێگە دوورەی مەزراوە تا ماڵێ، مەلەکردنی نێو هەسێڵەکە و ترسی خنکانی ئیۆن بڕستی لێ بڕیوم. پێم وایە بچمە ماڵی یەکێك لە دراوسێکان پارووەك ماماڵیگا وەرگرم باشترە. بەڵام لە کامیان؟ هەمووان لە مەزران. لە پێگۆڕکێی هەیوانەکەدا رادەکشێم و هەوڵ دەدەم چاوێك گەرم بکەم.

جیرەجیری عارەبانە ماتندووەکان لە کۆڵانەکانی ئاواییەوە هەڵدەستێ.

دایکم هەڵمدەستێنێ.

ـ وەرە نان بخۆ داریە.

هەڵدەستم. نە زانیومە کەی هاتوونەوە و نە کەنگێ مامالیگایان لێ ناوە.

ـ ماڵی ئۆیێ چییان لێ هات؟

ـ دادە فلۆریا لە ڕێیە دوو کچی بوو.

کەس پێی سەیر نییە کە دادە فلۆریا لە ڕێیە منداڵی بووە. ئەو شتانە لای ئێمە ئاساین و، لێرە ژن لە کوێ ژان بیگرێ، منداڵەکەی دەبێ. تاقە شوێنێکی ناهێڵن، کلێسایە و، ئەویش زۆر ناچنە کلێسا.

مەسەلەی خنکانی کوڕەکەی کلەشێ بۆ باوکم و دایکم دەگێڕمەوە.

ـ هەتیوە، خۆ ئێوە ناسرەون. دیسان شوکرانەبژێرم تۆ نەخنکاوی.

ئەی لەو ڕۆژە ڕەشە.

*

*

*

زەنگوڵەی کلێسا دڵی شەو دەدڕێ.

وا زەنگوڵەکان دەزرینگێننەوە، دەڵێی شێت بوون.

لەوانەیە یەکێك زۆر سەرخۆش بووبێ و بەبێ ئەوەی بزانێ چ دەکا، بەو نیوەشەوە زەنگەکان لێ دەدا.

نا، کەس مەست نەبووە. چونکە دەنگی کەڕەنای جارچییش دێ و، ئەوەش دەهۆڵەکەی ژێئانتای پاسەوانی ئاوایی، کە دەڵێی لەگەڵ چەرمی دەهۆڵەکەی شەڕێتی.

خەواڵوو و بەخەبەر، وەك کوللە لە تەختی خەوەکانمان دەردەپەڕینە دەرێ و بۆ ئەوەیە بزانین چ باسە، بەرەو لای ناحیە ڕادەکەین. ژنان بەبێ ئەوەی بزانن بەراستی چ قەوماوە، لە بەردەرگایەك کۆ بوونەتەوە و کردوویانەتە شین و شەپۆڕ.

دەنگی زەنگوڵە و کەڕەنا و دەهۆڵ و، هەموو ئەوانەش بەو نیوەشەوە... باشە ئەگەر شەڕێك هەڵنایسابێ، دەبێ چ قەومابێ؟

ئەوە دوو هاوینە، جەنگ لەوبەری دانوب گەرمە.

هەتا پار، بێستانچییە بولگارەکان، بەشی هەرە زۆری مێرگەکەی دەم چۆمییان داگیر کردبوو.

کە بەهار دادەهات، بولگارەکان تۆربێن بە کۆڵ لە ماڵەکانیانەوە دەهاتن. تۆربێنیام پڕ بوو لە تۆوی جۆراوجۆر و پیاز. کوخەکانیان چاك دەکردەوە، چەرخی ئاوهەڵێنجانیان کە ولاخ دەیسووڕاند و، لە رووبارێوە ئاو هەڵدەهێنجیێ، چاك دەکردەوە و، کەردووەکانیان ئاوپڕژێن دەکرد.

من هەموو بولگارەکانم دەناسی: ئیڤان و ستۆیان و پانتێلیێ و... و پازدەکەسێك دەبوون. هەر پێکەوە بە زمانی بولگاری قسەیان دەکرد، بەلام لەگەڵ ئێمەدا زیاتر بە رۆمانی قسەیان دەکرد.

ئیڤان بلێی و نەلێی دەمڕاستیان بوو. دیارە هەر ئەویش بوو کە سەر لە پاییزێ و هەر لە مەزرا بەرهەمەکەی دەکردە چەك(دراو) و پارەکەی وەردەگرت و لە سندووقەکەی دەنا، چونکە هەر خۆیشی خەزێنەدار بوو. ستۆییان و پانتێلییێ، گوندەکانی دەوروبەریان لە خشتە دەبرد. عارەبانەیان پڕ بوو لە تەڕە و شووتی. ئەگەر خەڵك ئاهێکیان لە گیرفانیدا نەبایە، شتەکانیان بە ئارد و گەنمەشامی و گەنم دەگۆڕییەوە. بولگارەکانی دیکە شەوانە بە تێلایەکەوە کێشکیان دەکێشا و ئاگایان لە مەزراکان دەبوو. دیارە ئەو ئێشککگرییە لە کاری رۆژانەی نەدەکردن و لەمپەر نەبوو. ئەگەر پەلەیان بوایە و ویستبایان زووتر بێستانەکانیان پیێ بگەیەنن، گوندییەکانیان لیێ دەنگ دەدا. ئیتر هەرچی منداڵە دەچوون و بە هەرەوەزی لە کۆڵیان دەکردنەوە. کەردووی سیر و پیازەکانمان بۆ بژار دەکردن، کەلەم و باینجان و تەماتە و توور و شێلم و نۆکەفەریکەمان بۆ دەچاندن و، هەتا ئەژنۆیان خۆمان لە قوڕ دەنا. لە بەیانییەوە کە تا ئێوارە کارمان بۆ بولگارەکان دەکرد، سەروچاومان وا پیس دەبوو، بێزت نەدەهات سەیرمان بکەی. ئەوجار لەبەردەم بێستانچییەکە ریز دەبووین هەق و مزەکەمان وەرگرین. کوخەکانیان لە بن شۆڕەبییەکاندا بوو. بۆ کاری رۆژێك هەتا ئێواریێ، بۆ ئەوەی بەشی مەمرە و مەژییەکمان لەگەڵ خۆمان بردبێتەوە، "دوو شایی"یان بە کچۆڵەکان و سیێ شاییان بە کوڕەکان دەدا. خۆ ئەگەر خەتمان لیێ دابایە، دەمانتوانی دە شاییش وەرگرین. دراوێکی جوانی پەنجا سەنتیمی.

هاوینی پار، ئیتر بولگارەکان نەهاتنەوە. ئەمسالێش هەروەتر. ئەوانەی لە دەم چۆمەکە پارچە عەرزێکیان هەبوو بە ئیجارە دەیاندا بە بولگارەکان، لەبری تەڕە و میوەی سالان، گەنم و جۆیان چاند.
زەوییەکە بەڕێژە و و بەپیت بوو و، گەنمەکەش پڕ و بە بەرەکەت.
هەواڵی تازەی بولگارەکانمان پێ گەیوە:
ـ ئیڤان کوژراوە.
ـ ستۆییان کوژراوە.
ـ ڤێلۆ کوژراوە.
ـ ئانتۆن کوژراوە.
ـ بێستانچییەکانمان هەموو کوژراون. لە شەڕی تورکاندا کوژراون.
ـ دیسان شوکرانەبژێرین، کە وڵاتەکەی ئێمە شەڕی تێدا نییە.
پیاو و ژن و منداڵ، شەلاڵی ئارەقە، لە مەزراکاندا خەریکە دەپسێن و کار دەکەن.
دیسان شوکرانەبژێرین کە وڵاتەکەی ئێمە شەڕی تێدا نییە.
زەنگوڵەکان، کەڕەنا، دەهۆڵ، زەنگوڵەکان، کەڕەنا، دەهۆڵ...
سەگوەڕ. سەگ وەك گورگ دەلوورێنن.
میرزا ستانسکۆ زۆر شڵەژاو و تووڕەیە: لە ئێوارەوە دەیزانی چ باسە. قایمقامیش دەیزانی. لە ناحیە چراکانیان داگیرساندووە فانووسەکەی بەردەم ناحیەیش. هەموو ئاوایی لەوێ کۆ بوونەتەوە.
خوشکە لێنکا، قاوەخانەکەی کردووەتەوە. خۆی بە سەروقژی ئالۆزەوە هاتووەتە گۆڕەپانەکە. هەر نەیگوتووە با لەچکێك بە سەرمدا بدەم. لاقە رووتەکان لەو تۆز و خۆڵەدا، شەقە لە قاپقاپەکانی پێی دێنێ.
نیکۆلای میلەچلۆچل، پاکەتێکی زەرد دەردێنێ و کاغەزەکەی نێو دەردەکیشێ و لێکی دەکاتەوە و - دەیخوێنێتەوە: هەرەوەزی.
ئیبدی دیارە دنیا بە کەیفی ئەو سووڕاوە. بۆیە نوتقی دەکرێتەوە:

ـ خەڵکینە، لەگەڵ ئێوەمە.بەیانی پرێسکە و کەلوپەلتان کۆ دەکەنەوە و دێن. هەر کەسە و دەبێ بچێ خۆی بە بەشەکەی بناسێنێ. لەگەڵ بولگاران لێمان بووەتە شەڕ. ئاگاتان لە خۆتان بێ. ئەگەر نەڕۆن، خۆم وەك سەگ، گوللەبارانتان دەکەم.

جا بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ گاڵتە ناکا، چەند تەقەیەك بەهەوادا دەکا.

خەڵکەکە دەست دەکەن بە هەرا و بۆڵە.

ـ شەڕی بولگاران؟ بۆ؟ جا ئێمە چ دوژمنایەتیەکمان لەگەڵ ئەوانە؟ خۆ دۆستمانن، ئەویش چ دۆستێك؟ خوایە هەزار و هەزار بار شوکر، کە ئیڤان و ستۆییان و بولگارەکانی دیکە کوژراون. خۆ لە شەڕگەی تووشیان بوایەین، چۆن سەرمان هەڵدەهات چاو لە چاوی یەك بکەین؟ هەر دەبووینە تنۆکێك ئاو... ئای، خوایە بە نەسیبی کەسی نەکەی. بنیادەم بەبێ هیچ رق و قینێك تێك بەربن و تەقە لە یەك بکەن.

ئیتر کەس خەو ناچێتە چاوی. لە هەموو ماڵەکان ئاگر کراوەتەوە و، لە بەر دەرگا کۆ بوونەتەوە و جنێو دەدەن و تووك دەکەن و ئاخ هەڵدەکێشن. لە هەموو ماڵێك ماماليگای زل زلیان دروست کردوە، بۆ ئەوەی هەتا دەگەنە ناوەندەکەی خۆیان بەشیان بکا. دەگەڕێن کامە کراس لە ماڵێ شڕ و تیسکن بووە، دەیدزۆنەوە بۆ ئەوەی هەتا دەگەنە بنکەی بەشەکەیان لەبەریاندا بێ و بەش بکا. چونکە هەر بگەنە ئەوێ، چەك و فیشەك و قایش و جلوبەرگیان دەدەنێ. لەو جلوبەرگە سەربازییانەی کە لەشی بنیادەم وەك توێکڵەدار لە خۆیدا دەگوشێ و مەچەك بەندی توند، کە دایکی جومگە و ماسولکە و گوێزینگ دەگێ.

جمکەکەی ئیتزائۆییێ بە مەلۆتکەکراوی لە نێو کۆلێکی داریندا کە بۆیان کردوونەتە لانکە، لە تەنیشت یەکترەوە نوستوون. سەریان دەڵێی شووتییە. زەرد و خەت خەت.

ـ زۆرت ئاگا لە کچەکان بێ ها فلۆریا.

ـ خەمت نەبێ نا تیتزا.

سەگەل دەوەڕن. سەگەل وەك گورگ دەلوورێنن. زەنازەنا و ژاوەژاوێکی شووم ئاوەدانیی تەنیوەتەوە.

ئەو گەنجانەی دەبێ بکەونە رێ و بچنە شەڕێ، لە بەر دەرگای ماڵێ، گراوی خۆیان ماچ دەکەن.

ـ من دەبێ بڕۆم ئیۆئانا....

ـ سەعاتێکی دیکە وەرێ دەکەوم ماریۆئارا...

ـ ئی لیکا...

ـ ستانا...

ـ گیورگینا....

ـ کاترینا...

دیشی شەپپوورچی لەسەر کۆتەرە دارێك دانیشتووە و پاڵی بە دیوارەکەی ناحیەوە داوە و شەپپوورەکەی لەسەر رانی داناوە بحەسێتەوە. خۆشی کۆنەیە، رێك وەك شەپپوورەکەی، کە کەسکێکی خۆڵەمشییە و لەکەلك و کار کەوتووە.

لە جەنگەکانی ئازادیی ١٨٧٧یشدا کە ئەو کەڵەپیاوە کوژرا و پیاوی وەك سەردار شۆتزۆ و ڤالتێر ماراچینێئانۆی بە زیندوویی لێ دەرچوون و دواتر بوونە ئەفسانە، هەر دوێ شەوێ بوو کەڕەنای هێرش بۆسەر تورکەکانی لێ دابوو.

ـ ساڵی حەفتاوحەوتیش ئێمە چووین شەڕمان کرد، چیها خوێنمان رشت. لە هەر جێیەکی ئەو بۆلگاریایە نووکە شەقێك لە عەرزی بکوتی، ئێسکوپرووسکی سەربازی ئێمە دێتە دەرێ. پاش هەر جەنگێکی تەن بە تەندا کە لەگەڵ تورکان بەگژ یەکتردا دەهاتین، پاش پشوودان لەبەرخۆمانەوە دەمانگوت: "ئەوانەی لەو جەنگە بەزیندوویی دەرچن، پاش جەنگ کەمتر کوێرەوەری دەکێشن. هەر نەبێ لەو ویلایەتە ئازادکراوانەدا کە ئیتر ناچار نین باج و پیتاك بدەنە تۆرەمەی عوسمانییەکان، رەنگە زەوی و زارمان بدەنێ." تەنانەت باسیشی نەکرا. هەر هاتینەوە سەر تاس و حەمامەکەی جاران. خراپتریش لە جاران. ئاغا زاڵمتر و سەگوسەگبابتر لە جاران، خۆ پاشاش تەنیا ئەو دەمە ئێمەی بیر دەکەوێتەوە کە لەگەڵ دراوسێکانی کلاویان تێك دەئاڵقێ و پێویستی بە گۆشتی بەدەم گوللەی تۆپ دەبێ.

ـ ئەوە چ کاوێژ دەکەی لەبەرخۆتەوە؟

ـ ئای ی ی ... هەندێ فکر و خەیاڵ بەو مێشکە کەنفتەمدا دێ.

ـ ئەوێ ساڵێ، ساڵی حەفتاوحەوت، هیچ نەبێ لەگەڵ تورکان بەشەڕ دەهاتین. لەگەڵ کافران و لەدین وەرگەڕاوان. بەڵام ئێستا دەبێ لەگەڵ بولگارەکان بەشەڕ بێین. ئاخر خۆ بولگارەکان مەسیحین. ڕێك کەسوکاری خۆمانن... ئای ڕۆژگاری نارەسەن.

کلێشێیش دەبێ بڕوا.

کوڕەکەشی، ئەوانەی لە ئاوەدانیدا دەمێننەوە دەینێژن. پیرەپیاو و پیرەژن. هەللۆیا ـ قەشە بەسەر تابووتەکەیەوە بە منگەمنگ دەڵێ: ـ هەللۆیا.

تا تاو هەڵدێ، نیوەی دێ چۆڵ بووە.

وێستگەی شەمەندەفەر ڕۆژی حەشرە. ڕێك وەك بازاڕی مەکارە. پیاو شان بە شانی یەکتر دێنە وێستگە. هەندێکیان ژنەکانیشیان لەگەڵیان هاتووە و کەلوپەلی سەفەرەکەیان بۆ هەڵگرتوون.

ژن هێندەیان فرمێسك هەڵوەراندووە چاویان بووەتە گۆمی خوێن. بستێکیش لە مێردەکانیان دوور ناکەونەوە.

هەر شەمەندەفەرە و بەدوای شەمەندەفەردا، لە شاری ڕۆشییەوە دێ و دەڕوا بەرەو لای دانوب. ئەو شەمەندەفەرانەی ڤارگۆنی حەیوانهەڵگریان لێ بەستوون. لۆکۆمۆتیڤ هۆڕن لێدەدا و وەك مار دەفیشکێنێ. ورياکردنەوەیەکی دوورودرێژی دڵتەزێنە. شەمەندەفەر دەکەوێتە ڕێ. بە دەنگەدەنگ و تەقوتۆق دوور دەکەوێتەوە. بە بەتاڵی دێ و بە پڕی دەڕوا. هەتا خنخناگەی پڕە. دەچێتە دانوب.

ئەوبەری دانوب بۆلگاریایە.

ئەو بەری دانوب، بۆلگارەکانی لێیە.

لەوبەری دانوب، جەنگی مەغلووبەیە.

لە سەروو و خوارووی کالمات زۆیێ، پۆلیس و سەرباز سەر  بە هەموو کونێکدا دەکەن. دەگرن و دەکێشنە دەرێ و بە پێخواسی دەیانهێننە وێستگە.

ـ تۆ خەڵکی کوێی براله؟

ـ خەڵکی باکالشتی.

ـ ئەی تۆ؟

ـ خەڵکی سێکارا.

جەندرمە لە مەیخانەکەی رووبەڕووی وێستگەدا راکی دەخۆنەوە. کە سەرخۆش بوون، دێنە حەوشە و تەقە لە قەلەباسکەی سەر درەختەکان دەکەن و دەیانکوژن. لێگەڕێ ئێستا کە شەڕە، با هەر نەبێ گوێمان لە تەقەی تفەنگ بێ.

لە پشت وێستگەوە، "دایرەیەکی خزمەتگوزاریی پشت بەرە"یان دامەزراندووە. کەلوپەلی چێشتخانە و تەندووری نانکردن بە شەمەندەفەر دێنن. ئەوان لە تەنیشت عەمبارەکانەوە ریز دەکەن.

باوکم ئیتر گەنج نییە. ئەو بۆ خزمەتی سەربازیەکەی دەبەنە پشتەوەی شەڕگە. کارەکەی ئەوەیە بەیانی تا شەوێ هەویر بشێلێ و بە تەندوورەوەی بدا. تەندوورەکە لە ئاسنی سپی دروست کراوە. کە نانەکەی لێ دێننە دەرێ، هاڵاوی لێ هەڵدەستێ. سەرەوەی سووتاوە بەڵام ناوکەکەی کاڵ و تاڵە.

ئێستا ئەو شەمەندەفەرانەی بەرەو دانووب دادەگەڕێن، لەشکری مۆلداڤی دەبەن. کە شەمەندەفەر لە وێستگەدا رادەوەستێ، نان و قوتووی ئاو بەسەر خەڵکەکەدا بەش دەکەن.

ـ ئەی وڵاتی ئێوە سێوی لێ رەعەمەل نایە؟

ـ نا، لەوێ سێو رەعەمەل نایە.

ـ ئەی هەڵووژە؟

ـ ئەویش.

ـ دەی باشە... ئەرخەوان؟

ـ ئەرخەوان خۆ بەری نییە.

سوعبەتیان خۆش بووە. گاڵتەمان پێ دەکەن کە بۆچی ئاواییەکەی ئێمە میوەی لێ رەعەمەل نایە. جا باشە، ئێمە چ بکەین داری بەری لە وڵاتی ئێمە هەڵ نادا و رەعەمەل نایە؟

میەلۆچلی پۆلیس گوێچکەم با دەدا:

ـ ئەوە لێرە چ گوویەك دەخۆی، تووتکە سەگ؟

ـ سەیر دەکەم.

ـ جارێکی دیکه وا سەیر نەکەیەوە. چاوە جوانەکانت کوێر دەبن.

نێوچاوانی تێك دەنێ و نقورچکێکم تێ دەسرەوێنێ.

منیش هەموو رۆژێ لەگەڵ بابم دەچمە وێستگە. حەز دەکەم سەیری هاتن و رۆیشتنی شەمەندەفەرە پڕ لە سەربازەکان بکەم. شەمەندەفەری پڕ لە ئەسپ. شەمەندەفەری سەرئاوەڵا کە تۆپەکان دەبەن.

تاقمێك لە سەربازەکانی پشتیوانی(یەدەك)، لە بەشی خزمەتگوزارییەکانی پشتی شەڕگە سەربازییەکەیان دەکەن. جلوبەرگی سەربازییان تەنیا بە ئەفسەرەکانی ئەوانە داوە. باوکم سەربازێکی سادەیە.

ـ بابە، تۆ سەربازییەکەتت تەواو کرد، وایە؟ ئەی بۆچی پلەی عەریفیان نەداویەی؟

ـ چونکە خوێنەواریم نیە. ئەفسەرەکان دەبێ خوێنەوار بن رۆڵە.

مەنجەڵێکی گەورە پڕ دەکەن لە نۆك: ئاوێکی بە قوڵتەقوڵت کە چەند لەتە پەتاتەیەك هەر وا بە توێکڵەوە تێیدا مەلە دەکەن. هەر قوونی ئەوەندەیان نەبووە لانیکەم پاکیان بکەن. کە نیوەڕۆ دادێ، سەربازە یەدەکەکان، نۆکاوەکەیان لە قاپەکانیاندا هەڵدەقوڕێنن. نانەکە، کە هەر لە تەندوور دێتە دەرێ، کەڕوو دێنێ، سەگ نایخوا. ئاواش هەندێکیان هەر هەوڵ دەدەن هەرچۆنێکی بێ پاروویەکی لێ بخۆن، بەڵام هێشتا لە زاریان نەخستووە تف دەکەنەوە. منیش چەند کەوچك نۆکاو لە قاپەکەی باوکم دەخۆم. ئەو نانانەی سەربازەکان فڕێیان داون، کە شەوداهات، لە کۆشمیان دەکەم و دەیانبەمەوە ماڵێ بۆ بەرازەکان. بەرازەکان لمۆزێکی لێ دەدەن و بۆنێکی پێوە دەکەن و رووی لێ وەردەگێڕن. وایان پێ باشترە گیا بخۆن نەك ئەو نانانە.

نانی ئەفسەرەکان لە شارییەوە دێنن و خواردنیشیان بە جوێ و تایبەت بۆ دروست دەکەن.

ـ ئەوە خێر و بەرەکەتی خوای بۆ دەڕێژن، هەی هیچوپووچینە؟

ـ تاڵە جەنابی ملازم.

ـ هیچ وا نییە. زۆریش خۆشە.

ـ لەوانەیە، بەڵام لە زاری ئێمەدا تاڵە.

ـ پارەی دەوڵەت لەسەر ئەو خۆڵە رۆ دەکەن.

تەندوورەکان کە شەشن، شەو و ڕۆژ دەڵێی دەندووکی کەون. نانەکان لە تەلیس دەکەن و دەیانخەنە نێو ڤارگۆنەکانەوە و ڤارگۆنەکانیش بە کەڵەك لە دانوب دەپەڕێننەوە. جار نە جارێك شەپۆل خۆ بە تەلیسە نانی نێو ڤارگۆنە بێ سەر و دەرگاکاندا دەکێشن، بەڵام کەس مێشێکی لێ میوان نییە. شەپۆل کە نیشتەوە، هەتاوە توندەکەی هاوین لە پێشەوە لە تەلیسەکان دەدا و نانە تەڕەکان وشك دەکاتەوە.

ـ بابە، تۆ قەت لە دانوب پەڕیویتەوە؟

ـ ئەی چۆن. ساڵی حەفتاوحەوت بوو. هێشتا منداڵ بووم. باوکمیان بە ئارەبانەکەیەوە بردبووە جەنگ. منیش سواری ئارەبانەکەی بووم و چووم سەیری جەنگ بکەم.

ـ سەیرت کرد؟

ـ ئەی چۆن. سەیرم کرد. قۆزاقەکانیشم دی. تورکەکانیشم دی. مەندیلیان لەسەر بوو و نێوفەکیان فشوفۆڵ بوو. بە دیلیان گرتبوون. زستانێکی تووش بوو. ئەو کافرانە چونکە لە گەرمێنەوە هاتبوون، جلوبەرگەکەیان وا نەبوو خۆ لەبەر سەرما وەیشوومەکەی کوێستانێ بگرن. وەك مێش بەلادا دەهاتن و دەکەوتن و دەمردن و، هاوینان بە کەلاکە بۆگەکەیان زەوییان ژەهراوی دەکرد. باوکم وەك بەری دەستی شارەزای هەموو وڵاتەکە بوو. کە گەنج بووە لەوێ هاوڕێیەکی تورکی هەبووە. برادەرەکەی، یەکێك بووە لە ئاغاکان، یان خۆیان واتەنی: "بای". باوکم هەموو ساڵێ بە ئارەبانەکی خوێ و هەنگوین و خوریی بۆ دەبرد... بای،

کابرایەکی دەوڵەمەندی ملهوڕ بووە، پێنج ژنی هەبووە کە لە حەرەمسەرادا رایگرتبوون. جارێکیان هەر بۆ خۆپەرستی و خۆنواندن، دەچێ ژنەکانی پێشانی باوکم دەدا. لەچکی پێ لەسەریان داماڵیبوون، بۆ ئەوەی بابم جوان و زەریف دەموچاویان ببینێ. جا رووی کردبۆ باوکم و پێی گوتبوو:

ـ جوان سەیریان بکە دۆستی بەڕێزم.

دەی، باوکیشم تێر سەیری کردبوون.

جا پێی گوتبوو:

ـ دەی بڵێ بزانم کامیانت بەکەیفە؟

باوکم گوتبووی: جا وەڵا بڵێم چی، هەموویان جوانن، گەورەم.

ئاخر، ئەودەم ئێمە کرێکاری تورکان بووین و ئەوان ناچاریان کردبووین پێیان بڵێین گەورەم.

"بای: گوتبووی: دەزانم، راست دەکەی، بەڵام بڵێی و نەڵێی یەکیانت هەر لە هەمووان زیاتر بەدڵە. وا نییە! وا نییە؟

باوکم کە زانیبووی وایە، ئیتر هەر وا رەمەکی یەکێك لە ژنەکانی کە چاوی بادامی و پێستێکی زەیتوونی هەبووە، دەسنیشان دەکا. ژنە لە خۆشیان پێدەکەنێ. تورکەی سەگباب لە داخان نێوچاوان تێك دەنێ و فیشەکێکی بە تەختی نێوچاوانەوە دەنێ کە "چونکە تۆ بەدڵت بووە، من لێی بێزارم."

باوکم گایەکان لە ئارەبانە دەکا و ملی رێگا دەگرێ و دەگەرێتەوە و ئیدی خوێ و هەنگوین و خوری بۆ ئەو دڕندەیە ناباتەوە. ئەو زەمان، وەزعەکەی جۆرێکی دیکە بووە. تورکان خۆیان بە ئاغای بێ ئەملاوئەولا و خاوەن دەسەڵاتی هەمووان دەزانی.

ـ بەڵام ساڵی حەفتاوحەوت کە من دیتمن، ئیتر گووی وایان نەدەخوارد. هەڕوگیڤیان نەمابوو و فس ببوونەوە. قۆزاقەکان سەریان لە دوو نابوون و بە زەبری شمشێر وەك ئاروو سەریان دەپەڕاندن.

❊

❊

❊

ژنەکان و پیرەپیاوان و منداڵەکان کاروباری دروێنەیان تەواو کردووە. خەرمانکوت لە نێوەڕاستی جێخوونەکەی نێوان ئاوایی و رووبارەکەدا دەنگی دێ. مەکینەی هەڵم کە خەرمانکوتەکە دەگێڕن، دووکەڵیان لێ هەڵدەستێ. گەنمی ناوچەکە دەهاڕین. هەڵمێکی خەست خەست لە خەرمانکوتەکە هەڵدەستێ، کە لەم گردەوە وەك پەڵەی هەور تا دوور دووری داگرتەوە. لە برجی زەنگی کلێساش تێپەڕیوە و وەسەری کەوتووە. میرزا و کوێخا دەفتەر و قەڵەم بەدەستەوە لە هەموو شوێنێکن.

ئەو جووتیارانەی ناچارن لەسەر زەویی ئاغا بێگاری بەن، چاوەڕێن نۆرەی خەرمانکوتیان بگاتێ. هەر گەنمەکەیان هاڕدرا، سەروسەکتی میرزا و کوێخا پەیدا دەبن:

ـ ئیشتراتێ Ishtrate. بەرەبەری جەژن ی نۆییێل سێ توورەکەت گەنم قەرز کردبوو، لەبیرتە؟

ـ پێم وایە دووە.

ـ لێرە نووسراوە سێ.

ـ دەی باشە، مادام نووسراوە، ئیتر سێیە بڵێین چی.

ـ سەروبەندی نۆئێل گەنم گران بوو.

ـ ڕاست دەکەی.

ـ ئێستا چونکە زۆرە، هەرزانە.

ـ ڕاست دەکەی.

ـ لەبری سێ توورەکە، دەبێ نۆ توورەکە بدەی.

ـ ئاخر...

ـ سەروبەندی نۆئێلی ئەمساڵیش هەر دێیەوە قەرز بکەی ئیشتراتێ...

گەنمەکەیان دەدەینێ و شەڕی قەرزەکانمان لەکۆڵ دەبێتەوە. بۆ ئەوەی وا بنوێنین کە سەرمان لە حیساب و کیتاب دەردەچێ، بەڵێنی مریشکێك و قەلێك و دوازدە هێلە مریشکیش بە میرزائاغا دەدەین. هەر ئەوەندەشمان لە ماڵی هەڵدەوەرێ. بە توورەکەیەك گەنمەوە دێینەوە ماڵێ. توورەکەکە لە گۆشەیەکی ڕاڕەوەکەی ماڵێ هەڵدەڕێژین. ئەگەر زۆر وریا نەبین، تا سەری مانگ تاقە دەنکێکی نامێنێ. قرتکی لێ دەبڕێ. دەبێ دەست پێوە بگرین و چەندی دەکرێ پێخۆری پێوە بکەین.

گەنم زۆرە و نان کەم.

❊

❊

❊

لە بۆلگاریاوە هەواڵی دڵنیاکەرەوە و خۆش دێن. بۆلگارەکان پاشەکشەیان کردووە. چەکەکانیان دادەنێن. دەستیان لە شەڕ هەڵگرتووە. گەیشتووەتە ئێسقانیان و ئیدی نایانەوێ شەڕێ بکەن. سەربازەکانی ئێمە لە چیاکانی بەلکان نزیك دەبنەوە. بەبێ ئەوەش کوشتارێك بووبێ، ئاشتی رادەگەیەنن. دەنگی ژن و کیژۆڵان کە لە گوند و لە دەشتێ گۆرانی دەڵێن، دیسان دەبیسرێتەوە.

ـ ئەسماراندا، نامەی مێردەکەتت بۆ هاتووە؟

ـ لەگەڵ کوڕەکەی پێرشۆ پەیامیان ناردووە، کە ساغ و سلامەتن. پێم وایە بۆ رنینی گەنمەشامی دەگەنەوە. بەخوای چووزانم وا دەڵێن.

هەر بەراستی ماوەیەك دەمگۆ بوو.

ئاخرییەکانی هاوینێ وردە وردە دەمگۆکان پێچەوانە دەبنەوە: شەوێك کۆلێرا وەك لەعنەتی خوای بە دەشتەکانی بۆلگاریا وەردەبێ. بۆلگارەکان وەك مێشی سەرمابردوو هەڵدەوەرن. رووبار و کانی هەموو پیس دەبن. ئاو مەرگ لەگەڵ خۆی دێنێ. وەك بڵێی خۆرەتاو لە زەوییە لمێن و قسڵەکە نزیکتر بۆتەوە و، وەك دەستەچیلە دەسووتێ. پەتا هەموو وڵاتی داگرتووە. ئەو لیوایانەی دەگەڕێنەوە وڵات، پێ و بەلەکی خوێناوی پڕ زام و بلۆقیان بەسەر خاك و خۆڵەکەدا دەکێشن. سەربازەکان لەدەم رێگەکان دەکەون. هەرچی بکەوێ هەر لەوێ بەئەمانی خوا بەجێی دێڵنـ بۆ ئەوەی بە لێوی بەبار و وشکهەڵاتوو و ناخێکی پڕژان و توێ توێوە، لە بەر دۆزەخی هەتاوەکە ببررژێ و بمرێ.

ـ دادە پێترا، خەبەر و باسی مێردەکەت؟

ـ لە قەرەنتینەی کۆرابییایە.

ـ ئەی تۆ مارگرێت؟

ـ مێردەکەی من لە قەرەنتینەی زیمنیچیایە.

ـ میتاکێ مردووە. لە تۆرنۆ مرد. قسڵیان بە تەرمەکەیدا کرد. لە بن گڵیان نا. بە قوونی رووتی ناشتیان.

ژنەکان خەریکی شەن و کەوی خەرمانن. خەرمان لۆدە لۆدە هەڵدراونەوە بۆ ئەوەی باران تێی نەچێ. ئێستا ئیتر دەبێ پاییز بەسەردا هاتبێ، بەڵام تۆزێك وەدرەنگی کەوتووە. زەوی بڵێسەی دێ. دارەکان توێ توێ بوون و گەنمەشامی زەرد بووە. با، خشە لە خەزەڵەکەیان دێنێ. هێشووەکان لە نێو ریشە وشکبووەکەیانەوە، ددانە زەرد و سوور و سپییە بەرازییەکەیان دەردەخەن.

دوێ شەوێ لیوایەکی پیادەی مۆلداڤیا کە لە بۆلگاریاوە گەڕاوەتەوە، لەسەر ئەو گردە باری خستووە. هەموو ئاوەدانی بە راکردن چوونەتە ئەوێ.

ـ ئێوە نەخۆش نین؟

ـ گومان نەخۆشە، نەخۆشی چی؟

ـ لیوایەکی دیکەش لە دواتان دێ؟

ـ بەڵێ.

ـ دڵنیان هیچ پەتا و نەخۆشیتان نەهێناوە؟

ـ نەمانهێناوە، دڵنیا بن.

بەڵام ئەو شەوە هەتا بەیانی، نەخۆشی وەك دۆڵپا چۆك لەسەر سینگی هۆردووەکەدا دەنێ. ڕێوشوێنە تەندروستییەکان دەگرنە بەر.

دکتۆر گانچۆ بە جنێودان و هات و هەرا، ناحیەکە وەسەرخۆی دەگێڕێ. ستانسکۆی سکرتێریش کە لە ترسان ڕەنگی بە ڕووەوە نەماوە، یەکپشوو جنێو دەدا. بەڵام ئەگەر دەتەوێ جنێوی تەڕوبڕ ببیستی، گوێبدە میلۆچێلی جەندرمە، کە قەمچییەکەی لە ملی جزمەکانی دەدا و چاوی نوقاندووە و زاری کردووەتەوە. بەڵام نەخۆشیی لێگرەوە، هەر گونیشی بەو جنێو و قسە سارد و سووکانە نابزوێ. سەری بەرداوەتەوە و بە گوندەکەدا دەگەڕێ و هەر دەرگەیەکی حەزی لێ بێ، لێی دەدا. دەرگاکان بۆی دەکەونە سەرپشت و وەژوور دەکەوێ و بەربینگی خەڵکی خوای دەگرێ و، دەیباتە دەرەوە و دەیباتەوە.

بەپەلەپەل، فارگۆنێکیان قسڵ هێناوە. لەوێستگەکەوە دەیبەنە ناحیە و بەسەر خەڵکەکەیدا دابەش دەکەن.

ـ دەبێ لە دار و دیواری ماڵێی هەڵسوون.

دار و دیواری ماڵەکانیان قسڵاو دەکەن. لە ژوور و دەرەوەڕا. کەس ئەوەندەی قسڵ بەر ناکەوێ هەموو ماڵەکەی پێ پاکژ بکاتەوە.

دایکم پێمان دەڵێ: لە ماڵێ وەدەرنەکەون ها.

باوکم دەڵێ: ئاو نەکوڵێبێ نەیخۆنەوە ها.

مامۆستا پۆپسکۆ پێمان دەڵێ: قەیسی مەخۆن.

هەموو ئەوانە راستن، بەڵام چۆن دەبێ لە ماڵێ نەچیە دەرێ و سەیری ئەو ئارەبانانە نەکەی کە پەیتاپەیتا مردوو دەبنە گۆڕستان؟ مردووی رووت و قووت، بەو پێستە تاوەسووتەوە کە بەسەر ئێسقانەکانیاندا کشاوە، چاوی دەرپۆقیو، لێوی بەبار و رەشهەڵگەڕاو، زاری داپچڕاو، زمانی مۆری بەلالغاودا دەرهاتوو.

قسلێ بەسەر مردووەکاندا دەکەن.

چۆن دەکرێ هەر ئاوی کولاّو بخۆیەوە؟ خۆ بۆ ئەوە پیاو دەبێ گۆزەیەکی بەدەستەوە بێ و بۆ هەر کوێ چوو داینەنێ. بێ لەوەش، خۆ گۆزە دەشکێ و تێدادەچێ، کە ئەویش زۆر حەیفە. بەڵام جگە لە هەموو ئەوانە، ئاوی کانی فێنکە و قوڕگی بنیادەم کە خۆڵ و خاك و گەرما وشك هەڵاتووە و شەقارشەقار بووە، تەڕ و خۆش دەکاتەوە.

وەرزی قەیسی و تووش هێشتا ماوە. چۆن دەکرێ توو نەخۆی؟ چۆن دەکرێ دەم لە قەیسی نەدەی؟

لە سەر سفرە، باس باسی ئەوانەیە کە مردوون. باسی ژمارەی ئەو سەربازانەیە کە ئارەبانە بردوویاننەتە گۆڕستان.

باوکم بیرەوەرییەکانی بارەوبار دەکاو دەیاندۆزێ و دەست دەکا بە گێڕانەوە:

ـ خۆ هەمووتان مامە میهاییت بۆبێلێکتان لەبیرە کە پار مرد؟ خۆ هێشتا گەنج بوو، کە بەلادا هات و مرد. خەڵك وەك یۆنجە دەدرووانەوە. شەوێکیان کە لە سەر پوورەهەنگەکانییەوە دێتەوە، لە بەر ماڵان کە ئەو دەم هەر چەند کووخێکی بە قەرسیل داپۆشراوی لێ بوو، پیرەژنێکی رەشپۆش رێی پێ دەگرێ و لەبەری دەپارێتەوە: "میهاییت زا، رۆڵە گیان، دەمەوێ خۆم بگەینمە ماڵی رادۆی، بەڵام ناوێرم بچمە پێشێ. سێ چوار سەی رەش هۆلەوێن، بە بابەوەت لەبەر مرم لە کۆڵم بکە و بمبە بەردەم کەپرەکەی." ئیتر میهاییت زا چیی کردبا؟ پیرەژنە لەکۆڵ دەکا و لەبەردەم کەپرەکەی رادۆیی دایدەنێ. پیرەژنە وەك پەڕە کایەك سووك دەبێ. وەك هەر هیچ نەبێ. بۆبێلێك ترسی لێ دەنشێ و شەق شەق ددانی وێك دەکەون. کلکی لە نەڕەی پشتی دەنێ و دوو قاچی دیکەش قەرز دەکا و تێی دەقووچێنێ. بەیانی دەبینێ هەموو ماڵی رادۆیی مردوون و هەر ساواکەیان کە تازە حەوتە و چلەی چووە ماوە و ئەویش لە لانکەکەیدا دەمەوڕوو کەوتووە و نقەنقێتی... ساوای بەستەزمان، دایك بە

کۆلێرا مردبوو، خەڵك بۆ ئەوەی زەحمەتی بردنیان بۆ قەبرانیان لەکۆڵ بێتەوە، کۆڵەکەی کووخەکەیان بڕینەوە و، بەسەریاندا رووخاندن و لەوێدا ناشتیانن...

ـ دارائیلای زاوای دیشێی زورناژەنیش مردووە.
ـ ژنەکەی دیشێش مرد.
ـ دیشێ خۆی لە هەموون زلتر و زەق و زیندووترە.
بەپەلە هەر لە تەختی خەوەکە تابووتێك دروست دەکەن. تابووتێکی دووکەسی، دارائیلای تێدا درێژ دەکەن و خەسووشی بەسەریدا. سەری تابووتەکە داناخرێ. بۆزۆلیکا دەچێتە سەر تابووتەکە و سەما دەکا و پاژنەی تەق لە تابووتەکە دەدا. تەرمەکان وەك هیزەیەکی بای لێ دەرچێ، فسەفسیان دێ و بچووك دەبنەوە. خوێن و کێم و زووخاویان لێ دێتە دەرێ و دەموچاویان چرچ دەبێ. دەی باشە، خۆ ئێستا سەری تابووتەکە دادەخرێ. ئوانتزای ئاسنگەری ئاوایی، مێردەکەی گرادینا، بزمارڕێژی دەکا.
ـ لەسەر تابووتەکانی دیکەی دانێن.
پێنج تابووتی دیکەش لە سەر ئارەبانەکەن.
خەڵکەکە لە بەر قوتابخانەوە سەیری تەرمەکان دەکەن، کە بەرەو گۆڕستانیان دەبەن. چونکە قوتابخانەکە کراوەتە نەخۆشخانە. قەشە بۆلبۆك و فلۆکای شینگێڕ، زۆر لە پێش ئارەبانەکەوە دەڕۆن. قەشە بخوردانەکەی رادەتەکێنێ و لە بن لێوانەوە دووعا دەکا. شینگێڕەکەش هەروەتر.
ئەلێلۆیا
بۆزۆلیکا و ئوانتزا ـ دۆمەکانی ئاوەدانی ـ وەشوێن ئارەبانەکە کەوتوون. وەك ئەندامی دایرەی مردووەکان حوکمیان بۆ دەرچووە و، ئیتر، ئێستا هەردووکیان ئەندامی دایرەی مردووەکانن.
گۆڕستانەکە بچووك بوو. ناچار بوون بەرینتری بکەنەوە. ئێستا سێ هێندەی جارانە.
قەشە رۆژێ چەند جاران دەچێتە گۆڕستانەکە. ئاخر بۆیە بەردەوام دەنگیمان گوێ لێ دەبێ.....
ئەلێلویا....
ئەلێلویا....

## ١٠

## کاکۆڵ

❊

❊

❊

دایکم چەند زگی کردووە؟

تا ئێستا دە زگ.

خۆ من، یانی داریە، نۆیەم منداڵیم. ساڵێك پاش من، ئەلیزابێتی خوشکم لەدایك بووە. دایکم شەممە و شەممە ئێواران کۆمان دەکاتەوە لە راڕەوەکەدا جلوبەرگمان لەبەر دادەکەنێ و بە سابوون دەمانشوا. سابوونێکی کەوەی رەق و پیس کە هەر دەڵێی خڕکەبەردە، بەڵام کەفێکی سپی سپیی هەیە. سەرمان دەدۆزێ* و ئەگەر هەشیبێ، کراسێکی خاوێنمان دەکاتە بەر.

ـ دەبێ خاوێنتان بکەمەوە، دەنا رشك دەتانخوا.

زوو لە شوشتنی ئێمە کوڕەکان دەبێتەوە. بەڵام بە کچەکانەوە شەکەت دەبێ. ئەوان قژیان پڕ و درێژە. دەبێ کەزیەکانیان بکاتەوە و، جوان بۆیان دابێنێ و سەرلەنوێ بۆیان بهۆنێتەوە، ئەوەش زۆری دەوێ. کە لە شوشتنمان دەبێتەوە، دایکم هەموومان دەبا و لەسەر ئەو تەختە گەورەیەی ژوورەکە دەمانخەوێنێ کە لەم دیوارەوە تا دیوارەکەی دیکەی گرتووە. تەختەخەوێك، کە حەسیرێکی لەسەر راخراوە. لەسەر تەختەکە و لە تەنیشت دیوارەوەکەوە، بالیفەکان ریز کراون، کە جاوێکی ئەستووره و کاوکلۆشی تێ ئاخنراوە. دەخەوین و چەرچەفەکە بەسەرخۆماندا دەکێشین. چراکە، کە بەدیوارەکەوە بە بزمارێك داکراوە، کزەتیشکێکمان بەسەردا دەپژێنێ. لە ژوور سەرمانەوە کۆتەڵیان بەدیواردا کردووە: سەن ژێرژ بە سواری ئەسپێکی سپی خەریکە هەژدیهایەك دەکوژێ. رمی پیاوچاکەکە هەر سێ سەری هەژدیهاکەی سمیوە و سێ رێچکەی خوێن لە سێ برینی رمەکەوە شۆلاوگەیان بەستووە.

---

* پشکنینی سەر و جلوبەرگ بە شوێن دۆزینەوەی کێچ و ئەسپێدا پێی دەگوترێ دۆزین. دەیدۆزم. بیدۆزە. لەگەڵ دۆزینەوە یەك خێزانن.

سمی ئەسپە سپییەکە خوێناوییە. تیشك لە روخساری پیاوچاکەکەوە تیرێژ دەهاوێ. لە گۆشەیەکی کۆتەڵەکەوە خەریکە تاو هەڵدێ. هەتاوەکە وەك روخساری بنیادەم چاو و برۆ و لێو و زاری هەیە.

لە تەنیشت کۆتەڵەکەوە، قومقومەی ئاوی پیرۆز و چەپکە ریحانەیەك هەڵواسراوە.

کراسەکان و قوماش و لەچکەکان و جلوبەرگی شایی و بەروانکەکانی زیتزای خوشکم و جزمەکانی باوکم کە ئەودەمی سەرباز بووە لە لەشکردا کرپیوێتی، پسوولەکانی ماڵیات و میزەڵانی بەراز کە دایکم داوی ناوکی هەردووکمانی تێدا هەڵگرتووە لە سندووقەکەدان و ئەویش هەر لە ژوور ئەم تەختەوە و لە تەنیشت دیوارەوە دانراوە و پەنجەرەکەیان پێ راگرتووە.

دایکم تا ئێستا دە زگی کردووە. کەوابوو دەبێ دە میزەڵانی بەراز لە بنی سندووقەکەدا بن، کە پەتی ناوکی هەر کامانی لە یەکێکیان ناوە. پێش حەفتەی پیرۆز ـ ئەودەمەی کابانەکان جوان و زەریف ماڵەکانیان خاوێن دەکەنەوە، دیوارەکان بە قسلاو سپی دەکەنەوە و، هەرچی سیپاڵە ورد و درشتی دەبەنە دەرێ و لە بن دار تووەکە دایدەنێنن. دایکم سندووقەکە دەکاتەوە، میزەڵانەکان دەردێنێ، ناوکەپەتکەکان کە تێپەڕینی زەمان رەشی داگێڕاون دێنێتە دەر و نیشانمانی دەدا و دەڵێ:

ـ ئەوە ناوکەپەتکی ئێڤانگلینە. ئەمەیان هیی ئەلێکسیە، کە مرد. ئەمەیان ئی تۆیە ئیۆن. ئەمەیان هیی گیۆرکێیە، کە زۆر دەمێکە ناوکەپەتکی نەدیتووە، رێك لەودەمەوە کە رۆیشتووە. ئەمەشیان هیی  تۆدۆسێیە. تۆدۆسێی بەستەزمانیش خۆ دنیای روونی نەدی. سیساندراش هەر وا. ئەوانمان لە گۆڕستانەکە ناشت. ئەمەشیان کە داوێکی شینمان لێ بەستووە هیی تۆیە ریزا. ئیی داریەش ئەوەیە کە داوە پەڕمان لێ بەستووە. تۆزێك لە هیی ریتزا گەورەترە. ئەی کوا ئیی ئەلیزابێت؟

دیسان میزەڵانەکان دەگەڕێ و دەیدۆزێتەوە. هەمووان لەسەر لەپی دەستی ریز دەکا و لێیان رادەمێنێ. هەموو چرچ و لۆچ بوون.

دایکم دە منداڵی بووە. دە زگ. دە جار لە گیانی خۆیەوە گیانی بەخشیوە. لەو دەیە، سێیان بە سەروپێچکەیی ئیزراییل بردوونی.

هەر پەتە ناوکە و دەیخاتەوە میزەڵانی خۆی، چەند لاسك و پەلکە ریحانەشیان بەسەردا دەکا و، زارکەکەیان بە داوێك دەبەستێ و لە بنی سندووقەکەی دەنێتەوە.

❊

❊

❊

ریتزا بەسەرخۆیدا دەدا. لە من دەبێتەوە. هاوار دەکەم:

ـ ئای، مەیکێشە، رەق بوومەوە.

لێفەکە زۆر بچووکە. بۆ ئەوەی بەشی هەموومان بکا، خۆمان بەیەکەوە دەنووسێنین. ئاوا گەرمیش دەبینەوە.

چراکە پتەپتێتی. تیشکە لەرزۆکەکەی تارماییەکان دەبزوێنێ.

هەرجارێکی دایکم بانگمان دەکا بمانشوا، ئەلیزابێت دەیکاتە گریان و هاوار و دایکم هەقایەتی بۆ دەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی بێدەنگ بێ. جا هەموو جارێکیش هەقایەتەکەی : هەبوو، نەبوو، جگە لە خوا هیچ کەس نەبوو. کچێك هەبوو، هەر تۆزێکی ئەقڵ چییە نەیبوو و نەیدەهێشت دایە بیشوا. هەموو گیانی ببووە رشك. رشك بوونە ئەسپێ و دەستیان دایە دەستی یەك و کچەیان برد و بەدەم رووباریاندا دا و خنکاندیان.

ـ جا ئێستا بەڵێ یان نەخێر؟ خۆت دەچیە نێو تەشتەکەوە یان نا؟

ئەلیزابێت هەر وا دەگرێ، بەڵام لێدەگەڕێ دایکم بیشوا. هەرچۆنێکی لێکی دەداتەوە سەیر دەکا ترسی نێو تەشتەکە لە خنکانی نێو رووبارەکە کەمترە.

کە دایکم سەروگیانی خۆیشی شوشت، بەدەم داهێنانی قژییەوە دێتەوە ژووری. قژی زەردن وەك گوڵە جۆ و درێژدرێژن، زۆر درێژ، دەگەنە نێوقەدی. ئەودەم دایکم گەنج و زۆریش جوان بوو.

ئەلیزابێتی هەڵدەگرت و لە قەڵاندۆشی دەکرد. پێستی نێوشانی وەك چەرمی چێڵ رەق بووە. چەرمی چێڵ کە نیر رەقی دەکا. ناچار بوو لە کوێ کار بکا ئێمەش بەرێ. منداڵەکانی دیکەش تەشك و داوێنیان دەگرت و وەك جووچکەی مریشك وەشوێنی دەکەوتن.

دایکم نەشکاوەتەوە، بەڵام ئیدی وەك جاران گورجوگۆڵ نییە. قەڵافەتی دووهێندەی جارانە. دیسان دووگیانە. دێ لە تەنیشت ئەلیزابێت رادەکشێ. دوایی منداڵەکانی دیکەش دێن. باوکم زۆربەی جاران لە دەشتێ دەنوێ بۆ ئەوەی ئێمە لەسەر تەختەکەی جێمان خۆشتر بێ.

ـ چراکە نەکوژێنمەوە دایە؟

ـ نا، مەیکوژێنەوە.

لە تاریکی دەترسێ. ئەمشەو لە هەموو شەوەکانی دیکە پتر زراوی چووە. راکشاوە بەڵام بۆ یەك چرکەش حەجمینی نییە. هەر جینگڵ دەدا. دەڵێی شتێك پێوەی دەدا. هەر بەراستیش شتێك هەیە پێوەی دەدا: ژان، ژان... جا نەکا ئێمەش بترسێنێ، لە بن لێوەوە دەناڵێنێ.

ـ ئیۆن، بچۆ بە شوێن پوور ستانادا، سەرێکیش لە پێتریا بدە، ئیڤانگلینیش ئاگادار بکەوە.

ئین لە جێوبانەکە دەردەپەڕێ و وەك بروسکە جلوبەرگەکانی لەبەر دەکا. باوکم لە ماڵ نییە. لە نیوەڕۆوە رۆیشتووە بۆ ئەوەی بە ئارەبانەکەی بازرگانانی یۆنانی بگەیەنێتە ئۆلۆژی و، دڵنیاین تا سبەی ئێوارێ نایەتەوە. لە جێوبانەکە دێینە دەرێ و لێرە و لەوێ خۆمان مات دەکەین. کەم و زۆر دەزانین خەریکە چ دەقەومێ. رێك ئەو شتەی حەفتەی رابردوو بەسەر ئێڤانگلینی خوشکم هات، کە پارەکە بەر لەوەی ببێتە شانزەساڵان مێردی کرد.

دایکم خۆی لە جێوبانەکەدا گرمۆڵە کردووە و دەستی لێك هەڵدەپێکێ. جواناو لە نێوچاوانی دەتکێ و دەموچاوی تەڕ کردووە.

ئەوەش پوورە ستانا، ژنی مامە جان پایۆنێڤاکا، ئەوان رێك لەوسەری ئاوەدان و لە دەم ئاسنەرێییەکە دەژین.

ـ وەی ی ی ماریا، ئێستا نا تاوێکی دیکە دەتبێ. لە چاوترووکانێکدا لێ دەبیەوە.

پوورە ستانا ژنێکی رەقەڵە و بەلەباریکە. تۆزێك شلەپەتە بەرێدا دەڕوا. چونکە خۆی وەجاغی کوێرە و منداڵی نابێ، بۆ ئەوەی تەنیا نەبێ، ئەو منداڵەی بەساوایی لەدەم کانییەکە فڕێیاندابوو، هەڵگرتەوە و گەورەی کرد. ناوی شتفانێیە و تازەی ژن بۆ هێناوە.

دایکم پێی خۆش نییە پوورە ستانا زۆر هاتوچۆمان بکا. بە چەنەوەڕییەکانی مێشکی سەری دایکم دەبا. ئەوەشی بە جەحەندەم:: هەر جارێکی دێتە ماڵمان، کێردێك هەڵدەگرێ و دەچێتە زگ تەندوورەکە و، توێژاڵەکەی کە بە ئاگر هەڵگڕاوە هەڵدەکەنێ و دەیخاتە زاری و دەیجوێ و قووتی دەدا.

پوورە ستانا تا گڵەبرژاوەکە نەخوا دڵی داناکەوێ. بچێتە هەر جێیەکی، بێ ئەوەی پێی شەرم بێ هەر وا دەکا. ئەگەر تەندووریش نەبوو، کوانووـ هەرچۆنێك بێ بەشوێن گلێکدا دەگەڕێ کە ئاگری وێکەوتبێ و برژا بێ.

ـ تاقەت بێنە ماریا، تاوێکی دی لێ دەبیەوە.

دایکم هەر دەڵێی ئەو نابینێ. جواناو بەسەر تەوێڵ و رووومەتیدا لووزەوی بەستووە. تەنانەت بەسەر کوڵمەکانیشیدا.

سەن ژێرژ لەسەر ئەسپە سپییەکەی، هەر وا خەریکی ئەنجنینی هەژدیها کەسکەکەیە. هەر سێ سەلکەکەی هەژدیهای کون کردووە. چرا نەوتییەکەش هاوکارە و، تیشکە کزە دووکەڵاوییەکەی دەنێرێتە یارمەتی. سێبەرە خۆڵەمێشی و رەشەکانی سەر دیوارەکە سەما دەکەن. سێبەرەکانی خۆمان.

پێتریا تانەیەکی لەسەر چاوەکانیەتی. دەموچاویشی بە خروێلکە کون کون بووە. یارمەتیدەری مامانەکەیە.

بۆ وێنە ژنێك یان منداڵێکی ئاوەدانی عومری خۆی دەدا بەتۆ؟ ـ دەی باشە: پێتریا دەچێ بە جلوبەرگی مردووەکە رادەگا. بۆ ئەو کارەش بەپێی نەریت ربەیەك ئاردی گەنمەشامیی دەدەنێ بۆ ئارامیی رۆحی مردووەکە. ژانی منداڵبوونەکەش وا باوە شووشەیەك ئارەق و نانێك بێ.

ئەمر و فەرمانەکان دەکا: ئاوی زۆر لەسەر کوانووەکە دانێن.

ئەوەش ئێڤانگلینی خوشکم، کە منداڵێك بە باوەشەوە را دەکا ئاو وەسەر ئاگرەکە بنێ. لە خۆی و منداڵەکەی ورد دەبێتەوە. رێك دەڵێی بووکەڵەیەکی گەورەیە و بووکەباغەیەکی بچووکتری لە باوەش کردووە.

پێتریا و ستانا دەستمان دەگرن و لە ژووری دەرماندەکەنە دەرێ بۆ ئەوەی لینگەفرتە و پەلەقاژەی دایکمان نەبینین و گوێمان لە ناڵین و نووزەی نەبێ. راستە، ئیتر نایبینین، بەڵام هەر وا لە گوێماندا دەزرینگێتەوە. هاوار و ناڵینەکەی جار بە جار توندتر دەبێ. زریکاندنی مووی لەشمان دەکاتە نەشتەر. پێستمان قەڵچغ دەکا، وەك پێستی مریشکێکی تووك و پەڕ داڕنراو. لە سەرمان کروشمە دەکەین. دەچین سەبەتەیەکی گەورەی پڕ لە کا و کلۆش دێنین و لە راڕەوەکەدا رایدەخەین و هەوڵ دەدەین لەسەری بنووین.

ـ تۆ پێت وایە دایکم چیی دەبێ؟

ـ کوڕ.

ـ چووزانی؟

ـ دەی دەزانم ئیدی. هەموو جارێك پاش کچ کوڕێکی بووە. پاش ریتزا من لەدایك بوومە، پاش منیش ئەلیزابێت.. ئەلیزابێت کچە، وا نییە؟ دەی باشە ئێستا نۆرەی کوڕە.

ئەم پاییزە کە باران دایکرد و نەخۆشی و مەرگی لە ئاواییەکە دەرکرد، خاڵە تۆنیێ ـ براگەورەکەی دایکمان ـ لە شارییەوە هات و داوای پارەی لە دایکم کرد. دەیزانی دایکم ئێستاش کە ئێستایە ئەو دوو زێڕەی کە دایەگەورە لە تاسکڵاوە قەدیمییەکەی بۆی لێ کردبۆوە بۆ ئەوەی لەکاتی زەماوەندا وەك دیاری بیداتە دایکم، هەر ماوە و لە بنی سندووقەکەدا رایگرتووە. زۆری پێ چەقاند بەشکم بە قەرز و قۆڵەش بێ ئەو دوو زێڕە لە چنگ دایکم دەربێنێ.

خاڵەگیانم لە شاری رستورانتی هەیە و کە هاتبووش پارە قەرز بکا، دەیویست وا بنوێنێ وەزعی شپرزە و کاروباری بێ بازاڕە.

دایکم پێی گوت: من ئەوە نیم پارەت بدەمێ. ئەو دوو زێڕە دار و نەداری منە. بێ لەوە، خۆ تۆ پارەی گایەکانیشت لێ خواردووم.

خاڵم بە دەمولیچی شۆڕەوە دەست لەگونان درێژتر گەڕاوە شاری.

کە لەگەڵ دایکم لەسەر پارە چەنەی لێ دەدا، من لەگەڵ میشۆی خاڵۆزام کە وەدووی باوکی کەوتبوو، قسەم دابەست. پرسیم:

ـ ئێوە چەند خوشك و بران؟

گوتی: پێنج. دایکمان دەڵێ، ئەمڕۆ سبەی حاجی لەگلەگ یەکی دیکەشمان بۆ دێنێ.

لەسەر ئەم قسەیە زۆرم گاڵتە پێ کرد. لەبەر پێکەنین مردم. هەتیو ئەو کوڕە خاڵەم زۆر گێلە. ئاخەر چۆن بڕوای کردووە کە حاجی لەگلەگ لە ئاسمانەوە منداڵ دێنێ.

هەموو بەهاران هاتنەوەی لەگلەگەکان دەبینین و پاییزانیش گەڕانەوەیان. لەگلەگ کە دێنەوە، ئێمە کالە لەپێمان دادەکەنین و بە پێخواسی بەڕێدا دەڕۆین. هاتنەوەی لەگلەگەکان واتە ئیتر بەهارە و بەهاران ئیتر کالەمان ناوێ. کە لەگلەگ دەگەڕێنەوە دیسان کالە لەپێ دەکەینەوە، چونکە دەزانین ئیدی چەند رۆژێکی دیکە دیسان بەفر دایدەکاتەوە.

کە لەگەلەگ دێنەوە، هیچ منداڵێکیان بە دندووکەوە نییە. هەمووان دەچنەوە سەر هێلانەی خۆیان. جووتێکیش لەسەربانی عەمبارەکەی ئێمە هێلانەیان کردووە. مێیەکە لەوێ هێلکە دەکا و لەسەر کورك دەبێ. تا ئەودەمەی مێیەکە لەسەر هێلکەکە کڕ کەوتبێ، نێرەکە لە زۆنگاوەکاندا بۆقیلە دەگرێ و بۆی دێنێتەوە هێلانە.جا هەر لەسەر ئەوە، گۆرانییەکمان هۆندووەتەوە، کە پێکەوە بۆ میشۆی دەڵێینەوە:

هوو هوو هوویە

لە دەم کالیماتزوویە*

لەگلەگ دەکا هێلانە

مێردەکەشی دەردەکا

لەو ماڵ و دیوەخانە

لەگلەگە لینگ درێژە

زۆر بەدەم و راوێژە

لەگەڵمان رێك کەوتووە

---

*لقێکە لە دانوب....

دەندووکی دێنێتە پێش
پڕی دەکەین لە خۆڵەمێش

جوچکە لەگلەگیش وەك جووچکەی مریشك و مراوی و قاز لە هێلکە دێنە دەرێ.

ـ گوێرەکە لە مانگا دەبێ و کاریلە لە بزن و بەرخۆڵە لە مەڕ. منداڵی بنیادەمیش لە دایکی. هەر بۆیەشە دایکەکان کە منداڵیان دەبێ، دەرزیکێنن و هاوار دەکەن و دەگرین.

کوڕەپوورەکەم چاوی بەمۆڵەق وەستاوە و سەیرم دەکا. سەرەدەر لە یەك قسەشم دەرناکا. ئەی وایە ئیدی: "منداڵی شارییە."

لێی دەخەوین. خەومان لێ دەکەوێ. بەخەبەر دێین. سێ شەو و رۆژی رەبەقە دایکم یەکپشوو جینگڵی داوە و لە نووزە و ناڵە نەکەوتووە. سێ شەووڕۆژی رەبەقە. باوکم کڵاوە پێستەبەرخەکەی لە دەستیدا گرمۆڵە دەکا.

نیوەڕۆ و شەو و بەیانی، خواردن هەر ئەوەیە: نۆکاو.

خەڵکی بەقسەوباس هاتوون و رۆیشتوون و هاتوونەوە و دیسان رۆیشتوونەوە... تەنانەت ژنی وایان لەگەڵە کە لە گوندەکانی دەوروپشتەوە هاتوون.

ئێستا ئیدی ئەوە رۆژی چوارەمە.

ـ دایکم خەریکە دەمرێ.

ـ نا، نامرێ.

لە پشت دەرگاوە، لە پشت پەنجەرەکانەوە گوێ هەڵدەخەین.

ئاخری دایکم لێ دەبێتەوە. کوڕێك.

هەموومان خۆ بە ژووریدا دەکەینەوە تا منداڵەکە ببینین. منداڵێکی گووپن و پڕ و نێوچاوان دەرپەڕیو. پوورە ستانا لە باوەشی دەکا و نێوچاوانی ماچ دەکا و، هەروا تەڕ و خووساو، بۆیە لێوی پیس دەبن.

ـ خۆم دەبمە دایکی تەعمیدی. ناویشی دەنێین شتفانیێ. وەك کوڕەکەی خۆم.
کەس نالێ نا.

پووره ستانا لەوەتەی پێی بە ماڵی ئێمەدا کراوەتەوە، هەر وا بە کێردێکەوە گڵی سوورەوەبووی تەندوور و کوانووەکەی داتاشیوە و وازی نەهێناوە. کەرپووچی کوانووەکەی هەموو خواردووە و نیوەی هیی تەندوورەکەشی بەژەهری مار کردووە. وەختێك ئەوەندەی گڵی برژاو پێخۆشە چیی لەگەڵ دەکەی؟ ناچاری خشتی دیکە بۆ کوانووەکە بدۆزییەوە. دەبێ تەندوورێکی دیکە لە عەمباریێ بێنینە دەرێ و لە جێی ئەو تەندوورەی دابنێین وا پووره ستانا نیوەی خواردووە. باشە چەند تەندوورێکی دیکەشمان هەیە.

دایکم هەروا نەخۆش و زەیستان کەوتووە. ناتوانیێ لە تەختەکەی بێتەخواریێ. تەنانەت ئەوەندەی تین لەبەردا نەماوە قاپە ئاوەکەش بۆ دەمی بەرێ. ئەگەر پێویست بێ لە تەختەکەی هەر بێتە خوارێ، ئەوە بەچەند کەسان دەچینە بن پیلی.

ـ کوێت دێشێ دایە؟

ـ هیچ کوێم. هەر دەڵێی جەرگ و دڵم دەردێنن.

زگیمان کە بەزەحمەت چەند کەوچك نۆکاوی تێدا رادەوەستێ، بە دەست پێشانمان دەدا. کونێك کەوتووەتە نێوان ناوکی و گەدەی، کە رۆژ بە رۆژ قوولتر دەبێتەوە. کۆنەپەرۆیەك لوول دەدا و تێی دەئاخنیێ. چاوی ترووسکاییان تێدا نەماوە و دەڵێی کوژاونەوە. چاوی تەواو بەقووڵدا چوون. مەمکی شل شل شۆڕ بوونەتەوە. دوو کانیاو کە وشك بوون. پەراسووی دەرپەڕیون.

باوکم دکتۆر گانچۆ دێنێتە ژوور سەری، بەڵام دکتۆر هەر نایەتە ژوورێش. هەر لەبەر دەرگاوە بە حاستەم چاوێك لە دایکم دەکا و بە فیکەفیك دەگەڕێتەوە بەرەو لای راڕەوەکە. کە دەیەوێ لە حەوشە بچێتە دەرێ، فیکەکەی رادەگرێ و بە باوکم دەڵێ:

ـ وا باشترە بگەڕێی و تەختە پەیدا بکەی. بۆ تابووت پێویستت دەبێ. نەخۆشەکەت ناگاتە نۆئێل.

پاییز بەسەردا هاتووە و نۆئێل وا نزیك دەبێتەوە. نۆئێلیش دێ و رادەبرێ. ساڵی تازەش دێ و تێدەپەڕێ و، ئێستاش ئەوە جەژنی ئێپیفانی.

❊

❊

❊

نۆئێل کە داهات، من و ئاواڵەکانم کەوتینە ڕێ و ماڵەوماڵ گەڕاین و سروودی ئایینیمان دەچڕی و وەك باوە، هەر ماڵە و نانێکمان لێ ئەستاندن.

بەیانییەکەی ساڵی تازەش بووکەبارانەمان گێڕا. بەو پارەیەی کۆم کردەوە، لە دووکانەکە نوقڵم کڕی.

لە جەژنی ئێپیفانیدا، لە دەم کانییەکە ڕێوڕەسمی پیرۆزکردنی ئاو بەڕێوە چوو. ئیۆنی براشم بە ئەسپەکانەوە هاتبوو.

پاش متفەڕککردنی ئاوەکان، جەندەرمە بە تفەنگەکانیان، چەند فیشەکێکیان بەحەواوە نا. جا تەقڵە و جلیتان و کێبڕکێی سوارچاکی دەستی پێ کرد کە هەموو ئەو کوڕانەی ئەسپیان هەبوو، تێیدا بەشدار بوونز ئیۆنی براشم لە کێبڕکێکەدا بەشدار بوو. یاڵ و کلکی ئەسپەکەیان جوان و زەریف بۆ هۆندبۆوە و، لاسکەی ڕیحانەشیان لێ دابوو.

خەڵك پۆل پۆل چەپکە ڕیحانەیان لە کانییەکە خست و دەفرەکانیان لە ئاوە متفەڕکەکە پڕ کرد کە چڵە ڕیحانە تێیدا مەلەی دەکرد. ڕۆژی ئێپیفایی هەموو وڵات بۆنی ڕیحانەی لێوە دێ. ئاوایی و مەزرا و دارستان، تەنانەت بەفریش بۆنی ڕیحانەی لێ دێ.

کێبڕکێی سوارچاکی تا وێستگەی شەمەندەفەرەکەیە. لە گەڕانەوەشدا کوڕەکان وێکڕا گۆرانییەك دەڵێنەوە. ئەسپ شەلاڵی ئارەقەن و کەف دەچڕێنن.

بەوجۆرە ئێپیفانییش تەواو بوو، ئەویش رابرد و بەفریش دەستی کرد بە توانەوە.

جا ئەوجار ڕۆژەکانی پاك نزیك دەبنەوە.

ڕۆژانی پاکیش بەسەردا هاتن.جا ئێستا ئاوایی بۆنی تووڕکی لێ دێ. بۆنی شۆڕەبی و داری بووز و بۆنی ئەقاقیا و بۆنی گیای تازە.

دایکمان نەمردووە، بەڵام لە جێی خۆشی نابزوێ. هەر بۆیە ئیدی کەس نییە پشتەملمان بگرێ و بمانبا لە سەر شۆرکە بمانشوا. باوکمان ناپەرژێ ردێنی خۆشی بتاشێ چ بگا بە شوشتنی ئێمە. روخساری رەش هەڵگەڕاوە و دەوری چاوی مۆر بووەتەوە.

گردۆلکە هەموو پێدەشتەکەی کووڕ کردووەتەوە. هەر گردە و ناوی خۆی هەیە. پاییزان، بەر لەوەی بەفر دابکا، وەختێك ئەسپەکان دەبەینە چۆمی ئاویان بدەین یان بۆ بەدفەڕی دەچینە سەر گردەکان، لە داوێنی هەندێ گردەکاندا شوێنی هەڵکەندراو و خاکی تازەی ژێروژوورکراو دەبینین. هەر لە قەدیمەوە خەڵك باوەڕیان وابووە ئەم گردانە گەنجینەیان لەبن دایە.

بەشی زۆری ئەو گردانەیان بە لەسەرخۆیی و تاقەتەوە وەرد داوەتەوە، کەچی هیچ ئاسەوارێکیان نەدۆزیوەتەوە. بەڵام تا دڵ دەخوازێ نێزە و خودە و مامزە و ئێسك و پرووسکی ئەسپ و بنیادەم و شتی وایان دۆزیوەتەوە. بەو حاڵەشەوە خەڵکی خوای هەر بێهیوا نەبوونە و بێ راوەستان خەریکی کۆڵین و گەڕانن. ئاخری لەوانەیە رۆژێك لە رۆژان یەکێك خوا بیخوێنێتەوە و گەنجینەکە بدۆزێتەوە.

لای تۆرنۆ گردێکی لێیە لە هەموو گردەکان بەرزترە. دەڵێن سەردەمانێك ئەم گردە کە پێی دەڵێن گردی مێرووڵەکان، هیزە و پێستەی وایان دۆزیوەتەوە پڕ بوون لە زێڕ و سکەی پۆڵۆنی و عوسمانی.

پاش شۆڕشەکەی ساڵی ١٩٠٧ زۆری پێ نەچووبوو، کە رۆژێکیان پیاوێك بە گالیسکەیەکی کرێ کە ئەسپەکانی تەنگە و قایشی رەشیان پێوە بوو و زنگوڵەکانیشیان دەنگی زیویان لێ دەهات دێتە ئاوایی، دادەبەزێ و بە دەنگی تەپڵ هەموو خەڵکی ئاوایی لە بەردەم ناحیەکە کۆ دەکاتەوە. جا چونکە یەکشەممە دەبێ و خەڵکی خوای کارێکی دیکەیان نیە، هەموو لەوێ کۆ دەبنەوە. ئەو کابرایە، یەکی خەپەتۆڵەی قەڵەوە بووە و بە گۆچانیش بەڕێدا رۆیشوە. جا بۆ خەڵکەکەی روون دەکاتەوە کە لە شاری تۆرنۆ بانکێکی تازە کراوەتەوە بەناوی "بانکی مێرووڵە." هەرکەس پارەی بوێ، هەر ئەوەندە بەسەر کاغەزێك ئیمزا بکا و بیدا پشتەکەی مۆر بکەن و بڵێ چەندەی پارە دەوێ. ئەوەندەی توانیویانە "گردە مێرووڵە"یان هەڵداوەتەوە و سەیریان کردووە پوولێکی رەشیشی تێدا نییە. بەڵام لە "بانکی مێرووڵە"دا هەر کەس چیی بوێ هەیە و هەر کاتیش بیەوێ... ئیدی کابرا خەپەتۆڵە سواری

گالیسکەکەی دەبێ. عارەبانەچی ئەسپان دەداتە بەر قەمچی و گالیسکە بەرەو ژوور کالمات زوویی وەڕێ دەکەوێ بۆ ئەوەی هەواڵە خۆشەکە بگەیەنێتە شوێنی دیکەش.

لە پڕ تایەك لە دێیەکە دەگەڕێ. دەست لەسەر هەر کەس دانێی، حەوجێی پارەیە. قسەی لەسەر نییە. تاقە کێشەیەك هەیە. ئەوەی کە لە نێو گوندییەکاندا دەگمەنن ئەوانەی دەزانن ناوی خۆیان بنووسن. خۆ کابرای گۆچانبەدەستیش قسەکەی بێ پێچوپەنا بوو. گوتبووی: تەنیا ئەوانەی دەزانن ئیمزا بکەن، دەتوانن لە بانك پارە وەرگرن.

بەڵام سەرلێشێواوییەکە زۆری نەخایاند: ستانسکۆ، میرزای ناحیە ـــ وەپێشیان بکەوێ بۆ ئەوەی کێ حەزی لێیە فێری ئیمزاکردنی بکا.

لە ناحیە مێزێکی گەورەی لێیە. دەستەدەستە کاغەزیان دانا و مرەکەبێکیان لە تەنیشت دانان و چەند قەڵەمێکیش لە تەنیشت مرەکەبەکە. چەند کورسییەکیشیان بۆ ئەو قوتابیە تازەکارانە لە پشت مێزەکان دانا. دایاننیشاندن و کاغەزیان لەپێش دانان. سکرتێر ناوی یەك بە کیانی لە سەر کاغەزەکە نووسی و گوتی:

ـ هیچ پێویست نییە حەتمەن فێری ئەوە بن یەك بە یەك ئەو پیتانە بنووسن. خۆ ئەو داماوەش ئەوەندەتان لێ توند ناکا. هەر ئەوەندەی شتێکی شەقل و پەقلی و خەتێکی خواروخێچ بکێشن و لە ئیمزا بچێ، لێتان وەردەگرێ.

خەڵکی خوای دەستیان دایە قەڵەم و لە مرەکەبیان هەڵکێشا و دەستیان کرد بە کێشانەوەی خەتی خواروخێچ. کاغەز دەدڕان و پڕ دەکران لە پەڵەی مرەکەب.

وەختێك بنیادەم کڵاوی پێستە بەرخی لەسەر بێ، زەحمەتە بتوانێ بنووسێ. هەر بۆیە کڵاوەکانیان لە عەرزی دانا.

کە بنیادەم یەخەی توند داخستبێ، نووسین بۆی زەحمەتە. هەر بۆیە قۆپچەی یەخەیان کردەوە. رێك وەك ئەودەمەی لە مەزرایە خەریکی ئیشن و رێك وەك کارکردنی مەزرایە قۆڵی کراسیان هەتا پشت ئانیشکان لێ هەڵکرد.

که بنیادەم پەستەکی لە سەر شان یان چاکەتی لەبەردا بێ، ئەستەمە بتوانێ شت بنووسێ بۆیە وردە وردە شەلاڵی ئارەقە بوون و ئاخرییەکەی پەستەك و کورتەك و ژێرکراسیشیان داکەند و لە تەنیشت کلاوە پێستەکانیان دانان...

سکرتێر لەسەرخۆ بێ ئەوەی تاقەتی بچێ، چەند حەفتەیەك راوەستا تا هەر کامەیانی فێر کرد بەبێ ئەوەی سەری قەڵەمەکە بشکێنن یان کاغەزەکە بدڕێ هیچ نەبێ یەك لەسەر چواری ناوەکەیان بنووسن.

هەر کەس فێری نووسینی ناوی خۆی دەبوو، ئەوجار دەکەوتە گەڕان بەشوێن یەکێکدا پشتی سفتەکەی بۆ ئیمزا و زەمانەت بکا، جا لە مەیخانەچی بوایە یان لە قەشە یان لە سکرتێرەکەی ناحیە، پارەیەکی قەرز دەکرد و بە غاردان خۆی دەگەیاندە وێستگە و بلیتێکی دەکڕی و خۆی دەخزاندە شەمەندەفەرەکەوە و دەچووە شاری.

لەبەردەم بانك، ریز بەسترابوون ئەوسەری دیار نەبوو، خەڵکەکەش دوو دوو چاوەڕوانی نۆرە بوون.

لە بانك، ئەو پیاوەی هاتبووە ئاوایی، جووت جووت کارەکانیانی رادەپەڕاند. یەکیان ئیمزای دەکرد و ئەوی دیکە پشتی زەمانەت دەکرد. هەموو کارەکەیان ئەوەندە بوو: دیسان ئیمزاکردنەوەی خوارێی دوو سفتە. سفتەکان دەچوونە پێش سندووقدار. سندووقدار سەیری ئیمزاکانی دەکرد و دەیپرسی:

ـ چەند؟ هەندێکیان سەد لیyان قەرز دەکرد و هەندێ دووسەد لی. تەنانەت هیی وابوو پێنسەد لییشی وەردەگرت.

که لە بانك دەهاتنە دەرێ، بە توورەکەی پڕ لە سکەی زیووە دەچوونە کافتریاکان و دەیانخوارد و دەیانخواردەوە و گۆرانییان دەگوت. لە شەقامە گەورەکە، دووکاندار پیلیان دەگرتن و دەکرێ بلێی بە زۆری دەیانکێشانە ژووری:

ـ وەرە کوێخا گیان، دەمەوێ تۆپێك قوماشی باشت بدەمێ با ژنەکەت بیکاتە ئاوەڵکراس.

ـ تەح، کوڕە پیاوی چاك ئەو کالەیە چییە لەپێتدایە؟ وەرە نیوجزمەیەکی دەرەجە یەکت بدەمێ بنەکەی وەك زەردەزیڕە دەنگی بێ.

ـ هۆ مامە، ئەو کلاوەت بووەتە سوزمە. وەرە کلاوێکی باشت بدەمێ وەرە.

ـ وەرە لەچکی جوان بۆ کچەکانت بەرەوە.

ـ جووتێك "ئۆرۆسی[*]"ی باشت ناوێ؟

گوندی بە دووکانان وەر دەبوون و لای ئێوارێ دەهاتنەوە ماڵێ و لە خۆشییان گۆرانییان دەگوت و هاواریان دەکرد. دەتگوت لەسەر شایی هاتوونەوە و، تووررەکەیان پڕ بوو لە دیاری و شتی جوان.

ـ کوڕە ئەو مێرووولەیە چ شانسێکی بۆ هێناین.

ـ خودا چاکە بۆ ئەو پیاوە بکا.

ـ ئەوجار چەندی دەڵێی پارەمان هەیە. وەك ئاغاکان.

گایەکانی ئێمە پیر و کەلەلا ببوون. بە زەحمەت گاسنەکەیان پێ دەکێشرا. بەو گا بنێسانە و ئەو گاسنەی کە هەموو دم و نووکی خواروخێچ بووە و سواوە و رێك ئەودەمەی لە هەموو وەختێك پتر کارت پێیەتی پەکی دەکەوێ و دەستت لە خەنە دەگرێ، زەحمەتە بتوانی سێ هۆگان بێگارییەکەت تەواو بکەی.

باوکیشم دەستی پێ کرد بۆ ئەوەی فێری نووسینی ناوی خۆی بێ. ئەوددەم من هێشتا نەدەچوومە قوتابخانە. ماڵی ئێمە نە قەڵەمی تێدا دەست دەکەوت و نە مەرەکەب. رۆژێکیان سۆریان میلیتارۆی ئامۆزام لە ستانکۆتزەوە هەموو ئەو شتانەی لەگەڵ خۆی هێنا. ئامۆزا سۆریان دەیزانی بخوێنێتەوە و بنووسێ. زۆری پێ زەحمەت نەبوو باوکم فێرە ئیمزا بکا. حەفتەیەکی نەبرد باوکم تەنانەت بە چاوی قووچاویشەوە دەیتوانی ناوی خۆی بنووسێ. ناوی خۆی بە پەنجە لەسەر بەفرەکە دەنووسی. دیارە هاوینێ بە دەسکی قەمچییەکەی بە سەر خۆڵ و لمەکەش دەینووسێ.

جا لەگەڵ سۆریانی ئامۆزام چووە شاری و پارەی لە بانکی "مێرووولە" قەرز کرد. بەو پارەیە جووتێ پارێنی پەروارمان کڕی، کە شاخیان زۆر جوان بوو. عارەبانە کۆنەکەمان هێنا و لە عەمبارێمان خست و لە شارییەوە عارەبانەیەکی تازەی ماقووڵ و جوانمان کڕی و دامان ئوانتزای ئاسنگەری ئاوایی بازنەیەکی ئاسنی لە دەوری تایەکانی کرد. بەو بڕە پارەیەی مابۆوە، باوکم نیوە فەردەیەکیشی ئاردی

[*] ئۆرۆسی: پێڵاوی پاژنەداری ژنان و پیاوان.

گەنم کڕی. هەر لە ئاشەوانەکەی ئاغای کڕی، ئەویش بە پارەی نەقد، کە هاوینێ میرزاکەی ئاغا سێ چوار هێندەمان لەسەر زیاد نەکا.

دوای ماوەیەك هەر"کیابۆر"ەکان واتە وەرزێرە دەوڵەمەندەکان بوون کە لە بانکی "مێرووله"ەوە پۆست کارتیان بۆ نەدەهات. کارتۆنی بچووك بچووکی چاپکراو، کە پۆستچییەکە بەیانی تا شەوێ لە دەرگای ئەم و ئەوی دەدا. بانك داوای لە هەموو قەرزبارە بەڕێزەکان کردبوو، سوودی قەرزەکەیان و بەشێك لە پارەکە بدەنەوە بانك.

وەڵاهی سەیرە، لەو بەهارەدا کە وەرزی قوونهەڵکڕێنەیە، بنیادەم چیی بەدەستەوەیە بیفرۆشێ؟ باشە پارە لە کوێ بێنێ؟

ئەوانەی مەڕ و ماڵاتێکیان هەبوو، چەند سەرێکیان فرۆشت و پارەی داواکراویان داوە بە بانك. بۆ دانەوەی بەشێك لە پارە وەرگیراوەکەش هەر نەبێ دەبوو جوانووەکی دووساڵان ببەیە بازاڕ و بیکەیە پارە. بانکیش لە پڕ هەموو سفتەکانی راگرتبوو. خەڵك کەوتبوونە حەلوەلا و باڵەپڕژە، لەم دەرك و ئەو دەرکیان دەدا و هەوڵیان دەدا چیی هەیانە بیفرۆشن و هەر نەشیاندەتوانی پارەکەی بانك دابین بکەنەوە.

کابرای بانکدار کە ناوی ساڤسکۆیە، دیسان بە گالیسکە کرێیەکەیەوە دێتەوە ئاوایی و دیسان تەپڵ لێ دەداتەوە و خەڵك لەبەردەم ناحیە کۆ دەکاتەوە. ئەمجارە زایەڵەی دەنگی زۆر لە جاری پێشووی جیاوازە:

ـ کاتان لە پێستی سەری دەئاخنم. وەختێك پارەتان پێویست بوو قەرزتان کرد... زۆر باشە، دەی وەرن ئێستاش بیدەنەوە.

جەندرمە و قەشە و سکرتێرەکەی ناحیە... هەموو لە تەنیشتی راوەستاون.

ـ دەی ئەگەر پارەتان وەرگرتووە دەبێ بیدەنەوە ئیدی.

بەڕێز ساڤسکۆ لەگەڵ مەئموورەکەی جێبەجێکردن دێتەوە ئاوایی. کابرای مەئموور، نیکۆلای میەلۆچلی وەدوای خۆی داوە و ماڵەو ماڵ دەگەڕێ.

عارەبانە لەبەر کارگەکەی ئوانتزای ئاسنگەر ریز بوون. ئەوان ئیتر هیی خاوەنەکانیان نین، هیی بانکن کە لە خەڵکی ئاواییی زەوت کردوون و هەر کەس پارەی نەختینەیان بداتێ، بەویان دەفرۆشێتەوە.
کاربەدەستەکەی حوکمەت کە جەندەرمەش کۆمەگی دەکەن، پاتاڵەکان کۆ دەکەنەوە. مێگەلێکی باش و تەواو، وەپێش ئەو پاسەوانانە دەدرێن بەرەو شاری، هەر بۆیەش کۆیان کردوونەوە.
عارەبانە تازە و جوانەکەی ئێمەش کە تەقوکوتێکی دڵڕفێنی هەبوو، لەبەر دەرگاکەی ئوانتزا کەوتووە. گایەکانیشمان کە شاخیان ئەو هەمووە جوان و خواروخێچ بوون، لەگەڵ گای خەڵکی بەرەو شار لێخوڕدراون.
دایکم هەر وا نەخۆش و کەنفت لەجێدا کەوتووە. ترووسکاییەکی ژیانی چیە لە چاوی باوکمدا بەدی ناکەی و ردێنیشی هەموو دەموچاوی داگرتووە. "با" بە گڤەیەکی شوومەوە بە نێو تەختەکانی سەربانەکەدا دەلوورێنێ. لە داری دنیایە ئەسپێکمان ماوە و ئاو بێنە و دەستان بشۆ. باوکم سواری دەبێ و دەچێتە لای جادووگەر و جنۆکەگرەکانی وڵات. ئیتر کون نەماوە سەری پێدا نەکا. لە دەربەندی ئۆڵت، لە تزیبیچەنی، تۆزێك دوورتر لە رۆشی، قەشەیەکی لێیە کە بە کتێبێکی پەرجۆئاسا کتێبت بۆ دەگرێتەوە. جارێکی دیکەش بە دەم رووباری کاتمازوویێدا چووبووە پیتزا. لە گەڕانەوەدا شووشەیەکی ئاوی شاردبۆوە و پشکۆیەکی گەشی تێهاویشتبوو. باوە چڵێکی لە گەسکەکە هەڵکێشابوو، ئەوەندەی ئاوە سیحرلێکراوەکە تێك دابوو، تا پشکۆکە توابۆوە.
دایکم ئاوە رەشەکەی خواردبۆوە و هەزار جۆرە گیای ناودار و بێناوی خواردبوو کە هەندێکیان شیرین بوونە و هەندێکیشیان تاڵ یان ترش، بەڵام ئیستاش کە ئێستایە هەر چاك نەبووەتەوە.
ئیتر بەهار داهاتووە. دایکمان لە ژووریٚ هێناوەتە دەرێ و لە بن دار تووەکە لەسەر حەسیرێك درێژمان کردووە. زیاتر لە سێبەرێك دەچێ تا بنیادەم. مێش و مەگەز لە دەوری وزەوزیانە. دایکم بە دەسکێك پەڕی مریشك کە لێکی بەستوون لەخۆیان دەردەکا. شتفانێی براشم لە تەنیشتیەتی. لە دۆشەگێکی دارینذا کە بۆیان کردووەتە لانکە، خەوتووە و رەشئەسمەر دیارە.
ئێمە لەگەڵ منداڵەکانی دیکە گەمە دەکەین. لە حەوشە و کۆڵانێ و لە چیمەنەکاندا و لە دەم چۆمی، لە هەر جێیەك بگەینێ. لە چڵك و چەپەڵدا نوقم بووین. جلوبەرگمان شڕ و پیسە. زستانێ هەر نەبێ

ئیڤانگلینی خوشکم دەهات و کەپەنك و پەستەکی دەشوشتین و دەیدروونەوە، ئێستا ئەویش لەگەڵ مێردەکەی لە مەزرایە گرفتاری کاروباری خۆیانن و دەرفەتی سەرخوراندنیشی نییە. داپیرەم دوو سێ جاران لە کارلۆمانەوە هات بەڵام هەر بە زەینیشیدا نەهات ئاوێکمان پێدا بکا و بمانشوا. هەر بە زەینیشیدا نەهات نێفەکی پانتۆڵەکانمان بۆ بدوورێتەوە. وەك کچۆڵەیەکی چواردەساڵانە خۆی تاسولووس کردبوو، گۆچانێکی هەڵگرتبوو. لەسەر چوارپێچکەکەی دایکم دانیشت و لێی پرسیی:

ـ چۆنی ماریا؟

ـ ئاوام کە دەمبینی دایە.

داپیرم گۆچانەکەی هەڵگرت و بە گردەکە هەڵگەڕا و گەڕاوە کارلۆمان و چۆوە ماڵ و حاڵەکەی خۆی. ماڵەکەی داپیرەم زۆر بچووکە، بەڵام ئەوەندە خاوێنە ماستی لێ ڕۆ بکەی پیس نابێ. باخچەکەی دەڵێی دەروازەی بەهەشتە. پڕە لە گوڵ و داری بەر. بنەبانی باخەکەی پڕە لە شۆڕەی بی و دار بی. جۆگەیەکی روونی وەك چاوی قرژاڵیش لە گردەکەوە دێتە خوارێ و یەکەوڕێ بە نێوەندی باخچەکەدا تێدەپەڕێ.

دایکم هەروا لە سێبەری دار تووەکە و لەسەر حەسیرەکە کەوتووە و برا بچووکەکەم لە تەنیشتی و لە کۆڵەکەدا هەر نووزەنووزێتی.

دەستەیەك دۆم بە کۆڵانەکاندا رادەبرن.

ـ بێژینگمان هەیە، هێڵەگمان هەیە، میلی چینینمان هەیە.

ـ خوشکێ گیان هێڵەگت ناوێ؟

دایکم بە ئاماژە دەڵێ بێنە ژوورێ. دۆمەژنەکان راناوەستن خولقیان بکەی. فاڵ بۆ دایکم دەگرنەوە و لەپی دەستی دەخوێننەوە. لەپی دەستی دایکم پڕە لە چرچولۆچ.

ـ تۆ نامری خوشکێ.

ـ قومێکم شیر بۆ بدەن بەو منداڵە.

دۆمەژنەکان هەر کامە و منداڵێکی بەرمەمکانیان بە باوەشەوەیە و مەمکی زلی وەك دۆدانەیان رەش رەش و گۆی مەمکیان کە سوور دەچێتەوە، لە درزی یەخەیانەوە دێننە دەرێ. برا بچووکەکەم

کە برسیەتی، وەك نەدی و بدی ئەو مەمکانە دەمژێ. ئاگام لە جوولەی شەویلکەیەتی. تێر دەبێ و دەمی لێ دەکاتەوە و ژنە دۆمەکە دەیخاتەوە نێو کۆلەکەی.

ـ ئەو منداڵە بەستەزمانە چەندەی برسی بوو.

ژنەدۆمەکان سبەینێش دێنەوە. دووسبەیش. ماڵەکەمان ئیتر جووچکەشی تێدا نەماوە. ئیدی مریشك و کەڵەباب لە تەویلەش نەماون. تەنیا لە عەمبارەکە چەند کۆترێك ماون. کۆترەکان لە شەقەی باڵ دەدەن و لە تەشقی ئاسمان تەقڵە لێ دەدەن. جاروبار حەزیان لێیە باڵیان جووت بکەن و لەنگەر بگرن و وەك خڕکەبەردێك بەرەو زەوی لوور بن و رێك ئەودەمەی وەختە وەعەرزەکە بکەون، باڵیان لێك دەدەنەوە و دیسان بەرەو تەشقی ئاسمانێ دەفڕن و دیسان لە شەقەی باڵدان و تەقڵەلێدان. باشە دۆمەکان چۆن دەتوانن بیانگرن؟

ـ رۆژێك بابم هەڵدەداتێ و دەڵێ:

ـ ئەرێ ژنەکە، بەو منداڵەوە خۆڵی کوێ بەسەر خۆماندا بکەین؟ ئاخرییەکەی هەر لێرە لەبەر چاوی خۆت لەبرسان پێڕادێ. من دەڵێم وا باشترە یەکێك بدۆزینەوە بیکاتە منداڵی خۆی.

دایکە لە بن لێوانەوە بە حاستەمێك دەڵێ:

ـ باشە... بگەڕێ یەکێك بدۆزەوە.

قسەکەی بە بنی مەلاشوویەوە دەنووسێ، گریان ناهێڵێ نووزەی بێ.

دەنگۆ داکەوتووە کە ئێمە دەمانەوێ شتفانێ لەکۆڵ خۆمان بکەینەوە.

ژنێکی زۆر دێن منداڵەکە ببینن. دایکم ماوەیەکی زۆر سوعبەتیان لەگەڵ دەکا و ئاخرییەکەشی دڵی نایە منداڵەکە بداتە دەستی هیچ کامیان. ئەگەر تینی ئەوەندە تێدابایە لە جێوبانەکەی بێتە دەرێ، دەستی دەدا قوڵە دارێك و هەمووانی لە ماڵێ وەدەر دەنا:

ـ حەزت لە کوڕە؟ وەرە با بتدەمێ، ئەه ها، ئەوەش کوڕێك... باشە کە تۆ بە ئاواتی کوڕی، ئەی بۆچی خۆت نازێی؟

بەڵام ئاخرییەکەی رۆژێکیان تۆدۆریتزای ژنەکەی مارین فوامیێتێی بەرپرسی دایرەی رێگەوبانی ناحیە دێتە ماڵەکەمان. ژنێکی وردیلانەیە، ددانی سپی و زلن و زمانێکی درێژی هەیە بەردەوام لەسەر لێوێتی.

ـ دە ساڵە مێردم کردووە و وەختە سویّم بێتەوە بۆ منداڵێك. تۆخوا کوڕەکەت بدە بە من. وەك پارچەیەکی جەرگی خۆم ئاگام لێی دەبێ. جاروبارەش بۆتی دێنمەوە بیبینە.

دایکم بە پرزەلێبڕاوی چاوی هەڵدێنێ. بڕیاری خۆی داوە. منداڵەکە بەحاڵ گیانی لەبەردا ماوە، هەر ئێسك و پێستە. بنیادەم کە چاوی پێی دەکەوێ، ئاگری بۆی تێبەردەبێ.

دایکم هەمووومان لە دەوری خۆی کۆ دەکاتەوە. باوکیشم لەوێیە. تۆدۆریتزا، برا بچکۆلانەکەم لە باوەش دەکا و دەیباتەوە ماڵەکەی خۆی. بەڵام هەر دەیبا، ئیدی لەبیری دەچێتەوە بەڵێنی بەدایکم داوە منداڵەکەی بۆ بێنێ چاوی پێی بکەوێتەوە. هەر ئەوەندە باوکم جاروبارە لێی سواری ئەسپەکەی دەبێ و دەچێ چاوێکی پێی دەکەوێ و لە گەڕانەوەشدا بە لەبزێکی نادڵنیاوە دەڵێ:

ـ کوڕەکە باشە.

*

*

*

حەوشەکەمان دەڵێی بیابانێکی وشکەڕۆ و قاقڕە و دراوەتە دەست خودا.

پاییز بەسەر گونددا هاتووە. ئای لەو بارانە.

هەتا چاو هەتەر دەکا، ئەوە لاسکە گەنمەشامییە و خشەی دێ. ئەمڕۆ نا سبەی لێکردنەوەی گەنمەشامی دەست پێ دەکا. بەڵام ئێمە خەمی هیچمان نییە. هیچ شتێکمان نییە بیدوورینەوە.

باوکم، ئیۆنی برامی بە نۆکەری داوەتە کابرایەك بەناوی شواڤا، کە وەرزێرێکی دەوڵەمەندی ئاوەدانییە. ئیۆن لە کەڕەی بەیانییەوە تا نیوەشەوێ کار دەکا و جاروبارە لە هاتوچۆکانیدا سەرێکیش لە ئێمە هەڵدێنێ:

ـ ئای، نازانی نۆکەری چەندە شتێکی قێزەونە.

به نانەزگی کار بۆ کابرا دەکا. بەهارە و بەهار کلاوێك و جووتێك کالەشی وەك بەرات دەداتێ. ئەگەر زۆر باش کاری بۆ بکا، شواڤا جووتێکیشی پێتاو بۆ دەکڕێ.

تۆدوریتزا لێی راسپاردووین: ـ شەوی شەممە وەرنە لامان. باوك و دایکی تەعمیدیی منداڵەکە و خوشك و براکانیشی بێنن. شتفانێ پێی ناوەتە دوو ساڵان، دەمانەوێ کاکۆڵی هەڵپاچین و جێژنی بۆ بگرین.

دایکم کە لە جێوبانەکەیدا کەوتووە، شاگەشکە دەبێ. خوا کوڕەکەی خوێندووەتەوە، جا بۆ دڵی خۆش نەبێ.

ـ دەبێ بچن. منداڵینە دەبێ بچن.

روو لە باوکیشم دەکا:

ـ تۆ دەبێ هەر بچی.

ـ دەچم، دەچم.

شەممە لای ئێوارێ سێ عارەبانە لەبەر دەرگای ماڵەکەمان رادەوەستن. خاڵ و پوور و مام و کچە پوور و میمکەزا و خاڵۆزا و ئامۆزا، هەر هەموویان لە ماڵەکەی ئێمە کۆ بوونەتەوە. دایك و باوکی تەعمیدیی شتفانێیان بانگ نەکردووە، ئەوان بێت و بزانن هیچ خەرجێکیان ناکەوێتە ئەستۆ، بۆ شایی و بەزمەکە سەریان پێوە نییە.

لە یەکێك لە عارەبانەکاندا چاوم بە پوورە ستانا دەکەوێ. بەشی خۆی گڵی سوورەوەکراو هەڵگرتووە، کە هەتا دەگەینێ، پەیتا پەیتا وەك پشقەڵ دەیهاوێتە زاری و دەیجاوێ و قووتی دەدا. من و باوکم لە یەکێك لە عارەبانەکاندا دادەنیشین. ئەسپەکان سم دەکوتن و کوڕژن دەکەن و کاروانەکە بە دەنگ و قرچوهۆڕی تۆپەی عارەبانە و ویزەوزی قەمچی دەکەوێتە رێ.

سێ دۆمیان سواری عارەبانەکەی پێشەوە کردووە، کە بەخێر شایەرەکانی کاروانەکەن.

ئاسمانی پاییزان ئەوەندە نزم بووەتەوە، هەر دەڵێی بە عەرزەوە نووساوە. بارانێکی بەلێزمە ورد ورد دەبارێ. چاکەتمان داکەندووە و بەراوەژوو لەبەرمان کردوون. ئاوا ئیدی گونیشمان بە باران ناچێ.

ئاخری دەگەینە ئیدارەی ئاسنەڕێی ناحیە کە سەربانەکەی بە سواڵەتی سوور دروست کراوە. لە تەنیشت بیناکەوە، ئاسنەپەرژین و بیری ئاوی لێیە و بیناکەش دوو ژووری گەورەی هەیە، کە ڕاڕەوێکی پان و بەرین لێکیان دادەبڕێ. کوانووەکەشیان هەر لەم ڕاڕەوەدا داناوە. مەنجەڵی زل زلی خڕیان لەسەر داناوە. مەنجەڵ کەلەم و گۆشتی بەرخیان تێدا دەکوڵێ.

ئیتر شەو داهاتووە. باران دەمێکە شووشەکانی پەنجەرە دەکوتێ و تاوێك دواتر خۆشی دەکاتەوە. بایەك هەڵدەکا و هەورەکان شیتاڵ شیتاڵ دەکا. زوڕنا و دووزەلە لێ دەدرێن. لە نێوان ئەو دووانەدا کەمانچەکە دەڵێی بە زمانێکی دیکە قسە دەکا. قومقومەی ئارەق دەستاودەست دەگەڕێ. بەزم و ڕەزمەکە گەرمە.

دەچینە سەر مێز. خەڵکەکە لە قاپی گڵینەدا خواردنەکە لە دەست دەخۆن. خواردن کەلەمە و گۆشت، پڕە لە دونگی بەرخ. مارین فوامێتێ، مودیری دایرەکەی ناحیە، دوو بەرخی پەرواری سەربڕیوە. گەورەکان هەتا ورگیان دەڵێ بەسە، دەخۆن. ئێمەش منداڵەکان لاسایی ئەوان دەکەینەوە. هەر کامەمان لەتە گۆشتێکی گەورەی برژاویان داوەتە دەستمان و لەتێکیش نان. هەر بەسەر پێوە خواردنەکەمان دەخۆین. لە دەم دیوارەکە. چونکە سەر مێزەکە جێی هەموو میوانەکانی نابێتەوە.

سەیری دەوروبەرمان دەکەین و ئەو هەمووە شتەمان پێ سەیرە کە لەو ماڵە جوانەدا بەرچاومان دەکەون.

لە گۆشەیەکی ڕاڕەوەکە، لەسەر کۆگایەك لاسکی گەنمەشامین شتفانێی برامیان لەسەر دۆشەگێك خەواندووە. کراسێکی سووری تازەی لەبەردایە و کڵاوێکی پەڕداریان لەسەر ناوە.ڕێك وەك ئەو ڕۆژەی تۆدۆ ریتزا لێی وەرگرتین و بردی، زەردەڵە و لاوازە. کەس ئاوڕیشی لێ ناداتەوە. هەر منم سەیری دەکەم، هەر دەشبێ سەیری بکەم. برای پاشەبەرەمە.

دوو ددان لە پووکی سەرەوەی سەریان دەرهێناوە. دەچمە پێشێ. زاری دەکاتەوە و پووکی خوارەوەی دەمژێ.    لەوێش سێ ددانی هاتووە. بەو پێنج ددانەی نانیشی پێ دەخورێ. یانی ئەگەر نان بخوا نەخۆش دەکەوێ؟

لەتێکی نان بەدەستەوەیە بەڵام نایخوا. چڵمی شۆڕ بووەتەوە و لە سەروودەموچاوی خۆی هەڵسویوە. بە چاوە دەرپۆقیوەکانی سەیرم دەکا، بەڵام نامناسێ. ئاوا سەیری هەموو ئەو شتانە دەکا کە لەوێن. سەیری بلێسەی کوانووەکە دەکا. بلێسە سەما دەکەن و ڕووناکاییەکەیان تێکەڵی تیشکی ئەو فانۆسە دەبێ کە بە میچەکەوە هەڵواسراوە.

لە پێش هەیوانی ئیدارەکە سێ زەنگی لێیە. چەکوچەکە سێ جار زەنگەکان دەزرینگێنێتەوە: دەنگ، دەنگ، دەنگ... مارین فوامێتێ فانۆسەکە لێ دەکاتەوە و دەچێتە دەرێ. منیش لەگەڵی دەچم. مارین پەرژینەکە دێنێتە خوارێ و ڕێیەکە دەگرێ. شەمەندەفەر بە پەنجەرە ڕووناکەکانییەوە شەوەکە دڕ دەدا و وەك هەورەتریشقە بە بەردەمماندا تێدەپەڕێ.

وڵات ڕووناکی کردووەتەوە. ئەستێرەی پاییز زۆر درشتتر و قورستر، هەر دەڵێی زەردە بەهێن و بە لکی دارەوە شۆڕ بوونەتەوە. با، گژ و گیای کردووەتە پووش.

لە گەڕانەوەدا مارین هەست دەکا شتێك لەسەر گیشە یۆنجەکە دەجووڵێ.

فانۆسەکە هەڵدێنێ و بانگ دەکا:

ـ کێیە؟

شتێکی ڕەش لەسەر گیشەکەوە خۆی فڕێ دەداتە خوارێ و وەك گیانلەبەرێکی سرك خۆی بە جاڕە گەنمەشامییەکەدا دەکا و ڕا دەکا.

تۆدۆریتزاش لەوێ لەسەر یۆنجەکە کەوتووە.

ـ ئەوە تۆی؟

ـ بەڵێ، منم.

ـ ئەو فانۆسە بگرە.

فانۆسەکەی لێ وەردەگرم و ڕادەوەستم بزانم چ دەکا و چ دەقەومێ.

مارین خۆی داوێتە سەر گیشەکە و دەست لە تیتکی تۆدۆریتزا دەنێ.

ـ وەرەوە ماڵێ.

ـ زۆر باشە، دێمەوە.

ڕێدار، که پرچی ژنەکەی گرتووه، وەك ئەسپێکی هەوساریان گرتبێ و بیبەنە سەر ئاخوڕەکەی، ئاوا دەیهێنێتەوە ماڵێ.

من فانۆسەکەیان بۆ رادەدێرم بەرچاویان ببینن.

لە ماڵەوە بەزم و هەڵپەڕکێیە. خەڵکەکە خەریکی سەماکردنن. هۆرایەکە باب ئاگای لە کوڕ نییە مۆسیقاکەش هەروەتر. خۆڵی تەختی ژوورەکە وەك هەورێکی خەست تا بەر میچەکەی گرتووە. لەو جەنگەی بەزم و سەمایەدا کێ چووزانێ چ قەوماوە.

مارین یەك بەخۆی دەنەڕێنێ و دەڵێ:

ـ بیبڕێننەوە. شایەر بێدەنگ بن. بەسەر ئەو هۆرا و سەما نەفرەتییە. گوێتان لێیە؟ لەبەر دیوارەکەوە راوەستن و دەمتان مەهێننە پێش. ئێرە ماڵی منە و چیی دڵم دەخوازێ دەیکەم و کەسیش بۆی نییە قسان بکا. دەسەڵاتی ژنەکەی خۆشم هەیە. هەر خۆشم سەگوسەگبابییەکەی دەزانم. هەر ئێستا پێم گوت: "تۆدۆریتزا، لەسەر خۆ بە، هەر نەبێ ئەمشەو خۆت راگرە و خۆشییەکەم لێ مەکە ژەهری مار. ئەمشەو دەمانەوێ کاکۆڵی بچکۆلانەکەمان هەڵپاچین." هەر وەك چۆن لەبەر خوای گەورە دەپاڕێنەوە و داوای لێ دەکەن، ئاوا لەبەری پاڕامەوە و تکام لێ کرد. لەبەری پاڕامەوە هەر نەبێ ئەمشەو دان بەخۆیدا بگرێ... خۆ ئەو قەحپەیە بەڵێنیشی دامێ و بەو حاڵەشەوە ئێستا لەسەر گیشەگیایەکە بەرەڵایەکی هەرچی پەرچیم لەسەر گرت... دەی باشە، من ئێستا دەمەوێ تۆزێك تەمبێی بکەم.

میوان لە دەم دیوارەکەوە ریز دەبن. کەیفخۆشییەکی زۆڵانەیان پێوە دیارە و لە خۆشیی ئەو شتە چاوەڕواننەکراوە خەریکە شاگەشکە دەبن.

ـ دەی تۆدۆریتزا، ئێستا تێتهەڵدەم و ئێسك و پەراسووت تێك بکەمەوە؟ وەبەر شەقانت بدەم تا دەمری تێت هەڵدەم؟

مارین فوامێتێ ئەو دەسرۆکە جوانە هەوریشمینەی ژنەکەی لە دەوری سەری ئاڵاندووە، لێ دەکاتەوە و دەیداتە دەست ئێڤانگلینی خوشکم. دوایی کراسەکەشی لەبەر دادەکەنێ. ناچاری دەکا خۆی پێڵاو

و گۆرەوییەکانیشی داکەنێ. ئەگەر پێشی عەیب نەبوایە بنکراسەکەشی لەبەر دادەکەند. بێ ئەملاوئەولا دەیەوێ هەتا دەبزوێ لێی بدا، بەڵام دڵی نایە جلوبەرگەکەی خەسار بن.

ئەوجار دەست لە قژی ژنەکەی دەنێ و چەندی قەوەی پێی دەشکێ هەڵیدێنێ و بەهەموو تینی خۆی بەعەرزی دادەدا. گرمەیەك دێ بەڵام ژنە نقەی لێوە نایە و هەروا خۆی گرمۆڵە کردووە.

مێردەکەی خۆی پێدا دەدا و دەیداتە بەر شەق و مست و پێلەقە و تێی هەڵدەدا.

ژنە هەروا بێدەنگە.

مێردەکەی وەك دەست بداتە کۆتەرە دارێك، هەڵیدەگرێ و دیسان بەهەموو تینی خۆی بەعەرزەکەیدا دەداتەوە و دیسان هەڵدەکوتێتەوە سەری. دەموچاوی تۆدۆریتزا ئاوساوە و پڕ بووە لە پەڵە و شین و مۆر بووەتەوە. دەمولووتی پڕ بووە لە خوێن. مارین بە مست و پێلەقە تێی بەردەبێ و ورد ورد دەیئەنجنێ، بەڵام ژنە دەڵێی زمانی قووت داوە.

ـ هیچ نالێی، ها؟

ژنە بە سەری زمانە ئەستووربووەکەی وەڵام دەداتەوە؟

ـ چ بڵێم سەی هار!

مێردەکەی هەر بەراستی دەتگوت هار بووە، چاوی دەرپەڕیون و دیسان تێی بەردەبێتەوە. ئەمجارە توندتر لێی دەدا. ژنە کەلەلا دەکەوێ. کە بەپێوە بوو، بچکۆلانە دیار بوو، ئێستا کە کەوتووە، گەورەتر دیارە. بنکراسەکەی تیتۆڵ تیتۆڵ بووە و ئەوەی لەبەریدا ماوەتەوە شەڵاڵی خوێنە. لەسەر دەم کەوتووە و مستە بچکۆلانەکانی بە سمتی خۆیدا دەکێشێ و هاوار دەکا:

ـ لێرەشم بدە هەی گەندوگوو، هێشتا لێرەمت نەداوە.

مێردەکەی پێی بەرز دەکاتەوە و بە قۆندەرەکانی بەردەبێتە ئەو سمتوسۆڵانەی تا ئێستا تێهەڵدانیان بەر نەکەوتوە.

ژنە شانی پێشان دەدا و دەڵێ:

ئێرەش، ئێرەش.

پیاوەکەش وەك فەرمانێك لەگوێ بگرێ.

ئیتر وای لیّ دیّ ژنە نووزەی لیّ دەبڕیّ. مارین فوامیّتیّ بۆ ئەوەی فیّنکیّکی بیّتەوە، دەچیّتە حەوشە. ژنەکان تۆدۆریتزا هەڵدەگرن و لەسەر دەستان دەیبەنە ژوورەکەی تەنیشتەوە.

لە ڕاڕەوەکە، شتیّفانیّی برا چکۆڵەم کە هیّشتا لەتە نانەکەی لە مستیدایە، بەبیّ جووڵە و بە سەرسووڕمانەوە سەیری هاتوچۆیەکان دەکا و سەری لیّ دەرناکا.

دووزەلە و زوڕنا دەست پیّدەکەنەوە. کەمانچەش دەنگی لیّ هەڵدەستیّ. هۆرا، لە جاران گەرمتر دەگەڕیّ. وەك بلّیّی هەر سەماکەرەی هەزار شەیتانی لە بن پستیدا دەجووڵیّ. پیاڵەی شەراب دەستاودەست دەگەڕیّن.

ڕیّك لە نیّوەڕاستی ئاڵقەی سەماکە، ژنیّك کە بلووزیّکی سپیی لەبەر و لەچکیّکی هەوریشمینی زەردی لەسەر کردووە، بە جۆشوخرۆشیّکی جەهەننەمییەوە سەما دەکا و خول دەخوا و پیّ دەکوتیّ. تۆدۆریتزایە کە سەما دەکا و دەمولچە شین و مۆرهەڵگەڕاوەکەی هەرا دەکا:

ـ کوڕەکەم ساڵەوەختیّتی. خوایە پیّمی بیّڵی. دەمانەویّ کاکۆڵی هەڵپاچین. یاڵا دەی دۆمەکان، لیّ دەن، توندتر توندتر، لەوەش توندتر.

باوکم دەستم دەگریّ:

ـ وەرە داریە.

لەبەر دەرگا پیّم دەڵیّ تۆزیّك سەبر بگرم. کە دیّتەوە، برا بچکۆلەکەمی لەباوەشدایە. لە ماڵیّ دیّینە دەریّ و چاکەتەکەی دادەکەنیّ و منداڵەکەی تیّوەردەپیّچیّ.

ـ وەرە بەدووومدا.

بەدووی دەکەوم. هەوسار و ڕەشمەی ئەسپی یەکیّك لە ئارەبانەکان هەڵدەگریّ و پیلم دەگریّ تا سوار بم.

ـ توند یاڵی بگرە.

بەهەموو تینی خۆم یاڵی ئەسپەکە دەگرم.

باوکم لە پشتەوەم سوار دەبیّ. شتفانیّ بچکۆلانەی بە سینگییەوە نووساندووە. توندتوند بەخۆیەوە نووساندووە.

ـ هەی هاااا,

ـ سێ کوڕی بە نێو مەزرای پانوبەرینی گەنمەشامییەکەدا وەڕێ دەکەوین.

تیشکی ئاسمان ڕێگەمان ڕووناك دەکاتەوە. ئەسپەکە بە نەرمەغار دەڕوا. سمی لە خاکە نەرم و شێدارەکە ڕۆدەچن.

شتفانێ خەوی لێ کەوتووە. ئەو کڵاوە پەڕ کەڵەشێرییەی لەسەریان ناوە لەگەڵ جووڵەی ئەسپەکەدا بەلایەکدا دەکەوێ و بەردەبێتەوە عەرزی.

کاکۆڵی شۆڕ بووەتەوە.

بۆ بەیانی وەبەر مقەستانی دەدەن.

## ١١

## تووی پاییزە

❊

❊

❊

ماڵی ڕێدارمان* زۆر بەجێ هێشتووە. ئاوڕێك دەدەمەوە و سەیرێکی دەکەم. پەنجەرە ڕووناکەکانی ڕێك وەك چاوێکی زەرد کە بەزەحمەت بترووکێن، ئیتر زۆر بچووك بوونەتەوە.

ئەسپەکە هەروا بە نەرمی لە گردەکە دادەگەڕێ. بە دەوری گوندەکەی ئەوبەری چۆمەکەدا دەسووڕێینەوە و لە پردەکە دەپەڕینەوە. هەر ئەو پردەی ماوەیەك لەمەوبەر تاوانێکی لەسەر کراوە. حەیوانەکە گوێی لە مووچەوە دەبا و ملی قیت ڕادەگرێ. لەوانەیە هێشتا بۆنی خوێن بکا.

باوکم دەڵێ:

ـ وریا بە داریە، لەوانەیە حەیوانەکە بسڵەمێتەوە.

توندتر خۆم بە یاڵی ئەسپەکەوە دەنووسێنم. چۆمەکە، کە مەست و لەخۆبایی بارانی پەڵەیە، بەبێ هیچ پەلەیەك بە بن پردەکەدا ڕادەبرێ. ئەستێرەکانی نیوەشەو کەوتوونە نێو ئاوەکەوە، وەك سێبەری دار بیبیە کڕووز و هەڵپڕووزاوەکانی دەم چۆمەکە.

ناتوانم بەسەرخۆمدا زاڵ بم و بەدەنگی بەرز بیر نەکەمەوە. هەر بۆیە دەڵێم:

ـ خوایە ئێمە وەك ئەوان لە ئاوەکە نەکەوین.

باوکم دەڵێ: مەشڵەژێ داریە.

ئەسپەکە هێور بووەتەوە. لە پردەکە پەڕیوینەوە. ئەوەش سەیەکەی ئیڤان نگۆیێ، کە لە سەر ڕێگەمان دەست دەکا بە وەڕین. براکەم لەخەو هەڵدەستێ و دەست دەکا بە نقەنق، بەڵام زۆر نا. جووڵەی لانکەئاسای ئەسپەکە دیسان دەیخەوێنێتەوە.

❊

---

* ڕێدار: ئەو کەسەی چاوی بەسەر ڕێگەوبانەوەیە. ڕێگەپارێز. چاودێری ڕێگە.

*

*

بنەماڵەی ئەو نگۆئاییێیەش پەکوو گاڵتەجاڕن. بۆخۆی کابرایەکی ورگنی قەڵەوەی ئەسمەر و سمێڵ فشە. لێوی سوورێکی جەرگین، وەك برینێکی خوێناوی.

ژنەکەی زۆر لە خۆی دەچێ. چ چرچ و لۆچ و خاڵێکی بە دەموچاوی ئەمیانەوەیە، بەوی دیکەشەوەیە. تەنانەت جمکیش بوایەن ئەوەندە وەك یەك نەدەچوون. منداڵەکانیشیان ـ کوڕ و کچێك ـــ رێك لەو وێنانە دەچن، کە دایك و باوکیان گرتوویانە.

ماڵێکی بچکۆلانەیان هەیە. هەر ژوورێکە و هیچی دی. دەروژووری سپی کراوەتەوە، دەڵێی سپێنەی هێلکەیە. کەس بە سۆل و کلاشەوە ناچێتە ژووری. هەموواں لەبەر دەرگا کەوشەکانیان دادەکەنن.

هەندێ کەس پێیان وایە بنەماڵەی نگۆئاییێ لە تۆرەمەی تورکانن. هەندێکی دی دەڵێن نا، ئەوان ئۆلمازن، کە باپیرەی تورکانە.

ئۆلمازەکان نەوە و نەتیجەی پیاوێکی پینەچین. داوودسکۆکانی سێکاراش بنەچەیان تورکە. بەلام دیارە بنەچە و ئەژدادی نگۆئاییێکان قولەڕەش بوونە.

دەوروبەری ماڵەکەیان باخێکی پان و بەرین بووە، کە ئێستا کەردوو کەردوو کراوە بۆ تەڕە و بێستان.

ـ باشە ئەوە چۆنە بنەماڵەی نگۆئاییێ بێستان و تەڕە دەکەن؟ چما هەر بۆلگارەکان شارەزای ئەو کارە نین؟

نگۆئاییێ لە نێوەڕاستی زەوییەکەی بیرێکی لێ داوە کە بەردەوام ئاوی لێ هەڵدەهێنجێ و لە بن کەلەم و تەماتە و بیبەرەکانی دەکا. عەسرانە لە ماڵێ وەدەر دەکەوێ و بەرهەمەکەی پێدەگەیەنێ. نە گایەکی هەیە و نە ئارەبانەیەك. لە ژیانیشیدا یەك بێگاریی بۆ ئاغاکان نەکردووە. دەڵێ: من لە ماڵەکەی خۆم نەبێ و بۆخۆم نەبێ، مەحاڵە کار بکەم. حەز ناکەم نۆکەری کەس بم. جا هەر کەسێك بێ.

بنەماڵەی نگۆئاییێ، رۆژانی یەکشەممە، جلوبەرگەکەیان، کە لە خاوێنیان دەڵێی بەفرە، لەبەر دەکەن و لەبەر دەمی ماڵەکەیان لەسەر کورسییەك دادەنیشن. هاموشۆی هیچ کەس ناکەن. تەنانەت خەڵکیش

زۆر نادوێنن. لە کڕین و فرۆشتنیشدا هەر ئەوەندەی پێویستە، قسە دەکەن. مەسەلەش ئەوەیە، هەر خۆیان خەڵکێکی کەمدوون. هەر سەیرێکی یەکتری دەکەن، لێك تێدەگەن. وەك بڵێی قسەکانیان پاشەکەوت دەکەن.

لە ئاوایی خەڵك بەردەوام باسیان دەکەن و لێی نابڕنەوە. جاری وایە چاکەیان دەڵێن و جاریش هەیە خراپەیان.

بەدەم بیرکردنەوە لە بنەماڵەی نگۆئاییێ، گەیشتینەوە ماڵێ.

باوکم کە برا بچکۆلانەکەمی لەباوەشدایە، لە ئەسپەکە دادەبەزێ. منیش دادەبەزم. دەچینە ژوورێ. دوو بەتڵی شەو راشکاوە. ئاسمان وردە وردە روون دەبێتەوە. هەر دەڵێی رەنگی پێوە نەماوە. بایەکە، خشەخش لە خەزەڵ و وشکەگەڵاکان هەڵدەستێنێ و ئەو لکانەی کە خەریکن وشك دەبن، رادەوەشێنێ.

لە ژوورێ چرا داییسێ. دایکم خزیوەتە گۆشەیەکی تەختی خەوەکە و، لەگەڵ شەودا کە نە خەوی بەدیاری بۆ دێنێ و نە حەسانەوە ململانێیەتی. قایشێکی پانی کە ئێسقانی لەشی توند دەگوشێ، لە خۆی ئاڵاندووە وەك هەمیشە باڵنجێکی بچکۆلانەی خستووەتە بەر زگی. پێی وایە لەوێوە لە نێو زگیدا کونێکی گەورەی تێ بووە و بەهیچ پڕ نابێتەوە و پەیتاپەیتا خەریکە لە ناوەوە دەیخوا.

باوکم منداڵەکەی بە باوەشیەوەیە و دەچێتە ژوورێ. من پشتم بە دەرگاکەوە دەنێم و پاڵی پێوە دەنێم.

ـ چراکە هەڵدە داریە.

سووکێك پلێتەهەڵکێشی چراکە دەسووڕێنم. ژوورەکە رووناکتر دەبێتەوە و دایکم چاوی هەڵدێنێ.

ـ رۆڵەکەم.

دەیەوێ بگری، بەڵام چاوە وشکەڵاتووەکانی ئیدی فرمێسکیان تێ نازێتەوە. قورگی تینی ئەوەی لەبەردانییە وێك بێتەوە. ئەوەندە بە حاستەم قسە دەکا کە هیچی لێ تێناگەی. کوڵمەی داکەوتوون و شۆڕ بوونەتەوە و نێوچاوانی پڕە لە چرچولۆچ. رەنگی وەك ئەو مێوەی مۆمی لێ دروست دەکەن زەرد هەڵگەڕاوە.

*

*

*

که ورده ورده چاو و گوێم دەکرانەوە و، رۆژ لە رۆژ پتر خەریك بوو لەو شتانەی لە دەوروبەرم روویان دەدا باشتر تێدەگەیشتم، ئیدی سەرم لە زۆر شتان سوورِ دەما:

پێم سەیر بوو کە دەمدی خەڵك قسە دەکەن و بە قسەکردن لێك تێدەگەن، لە حاڵێکدا ئاژەڵ تەنیا دەنگیان دێ و باڵندە جیك و فیکیانە.

پێم سەیر بوو کە دارو دەوەن وا بێدەنگن، گژ و گیا وا بێزمانن و گوڵە کێوی رەنگەکەیان ئەوەندە جوانە.

پێم سەیر بوو کە دەمدی خەڵکی ئاوایی دوو جۆرن: جۆرێکیان جلوبەرگیان شڕ و تیتۆڵ تیتۆڵە و لەو دەمەوە کە بەفر دەچێتەوە هەتا پاییزێ، تا قوڕ و لیتە دەیبەستێ، بەپێخواسی دەگەڕێن و، هەندێکی دیکەشیان جلوبەرگێکی جوان و کەشخەیان لەبەرە و تەنانەت ئاگریش لە عەرز هەستێ، پێڵاو و پۆتینی بۆیاغکراویان لەپێیە... ئێمە خۆمان یان بنکراسێکی شڕی کونکون لەبەر و کڵاوێکی گرمۆڵە و تیسکنمان لەسەرە یان هەر بێ کڵاو و بنکراسیش دەگەڕێین، کەچی دەسترۆیشتووەکان و ئەوانەی لەپڕێك بوونەتە کوڕێك کڵاوی رەنگاورەنگ لەسەر دەنێن و جلوبەرگی وایان لەبەرە قۆپچەیان هەر دەبریسکێتەوە.

رۆژێ چەند جاران شەمەندەفەر بە نزیك ماڵەکانماندا رادەبرد. ئەی ئەو شەمەندەفەرە تیژڕەوە خەڵکهەڵگرە و وەی لەو شەمەندەفەرە باربەرەی لەسەرخۆ تێدەپەڕی. من بە دنیایەك پرسیارەوە لەو بنیادەمانە رادەمام کە بە دانوبدا بەرەو رەوشیدەودێ یان لە رەوشیدەودێوە بەرەو دانوب لە هاموشۆدا بوون، ئەویش لەو شەمەندەفەرانەدا کە ئەوەندە تیژ تێدەپەڕین برووسکەش تۆزی نەدەشکاندن.

جارێکیان یەکێك لەو کابرایانە سەری لە ڤارگۆنەکە هێنادەرێ و کڵاوەکەی با بردی. کڵاوەکەی کەوتە نێو قووڵکەکەی دەم ئاسنەڕێیەکەوە. ئێمە بە راکەڕاك خۆمان گەیاندێ و لە نێو گژ و گیاکاندا

هەڵمانگرتەوە. ئەی لەو کڵاوەی کە دەتگوت ڕەژووە و وەك مەنجەڵی مس توند و پتەو بوو. جا بە نۆرە یەك بە یەك لە سەرمان دەنا. ئاخرییەکەی دامانناو چووینە سەری. کە زانیمان هەر بای خەیاڵیشی نییە، بە داران تێی بەربووین و جا وەرە لێی دە. لە بن زرمەی داراندا وەك تەپڵ دەنگی دەهات، نە دەتەقی و نە هیچی لێ دەهات. ئاخرییەکەی "ڤیکۆ"ی پۆستەچی گەیشتێ و لێی ئەستاندین و بە سەری قۆڵی تەکاندی و لەسەری خۆی نا. ئێستاشی لەگەڵدا بێ هەر لە سەریەتی. ئەوەندەیە ئێستا تۆزێك لێوارەکانی کەسك دەچێتەوە. هەر ئەوەندە. نە بەفر توانیویێتی زەفەری پێ بەرێ و نە باران.

جا ئەو کڵاوە لبادییەی بە ڕێکەوت کەوتە دەستی ئێمە، یەکەم کڵاوێك بوو کە ئێمە توانیمان دەستی لێ بدەین، بەڵام پێنجەمین کڵاو بوو کە ڕێی کەوتە گوندەکەمانەوە. ئاخر لە گوندەکەی ئێمەدا پێنج کەس لەو کڵاوانەیان لەسەر دەکرد: یەکیان نیکۆلای دیمۆزلی پوورزای خۆم کە وەرگری ئیدارەی پۆستە و گەیاندنە، یەکێکی دیکەیان ئاغا میلیارەسیی گێڕ و ئیفلیجە کە جاروبارە بە عارەبانە تەك ئەسپەکەیەوە بە شەقامە گەورەکەدا ڕادەبرێ، ئەوی دیکەش بۆنێئائیزپێسکۆی ئاشەوانە و جاروبارەش مامۆستا پۆپسکۆ کە فێری خوێندن و نووسینمان دەکا.

میرزا ستانسکۆ و تۆنێ و لیساندەرۆ ـ خاڵوانی من ـــ وەك گەنجەکانی ئاوایی و ئەو دێهاتیانەی پارووە نانێکیان هەیە، کڵاوی نەرم و ڕەشیان لەسەر دەنا. هەر کەس کڵاوی ڕەنگاوڕەنگی لەسەر نابایە، دەیانگوت تازەپێگەیشتووە. ئەو نازناوە "تازەپێگەیشتوو"ەیان لەو هاونیشتمانیانەی دیکەش نابوو کە پارە و دراوێکیان دەست کەوتبوو و لە گوندێ وەك خەڵکی شاری دەژیان. بۆ وێنە کارمەند و مەیخانەچییەکان. سەردەستەی هەموو ئەو تازەپێگەیشتووانە گراسیم شێربۆ بوو کە بە مۆم فرۆشی دەستی پێ کرد، بەڵام ئاخرییەکەی وا گران و ماقووڵ ببوو کە بە قەڵانگ گووی نەدەگەیشتە لووتی.

شێربۆش وەك ماریێشی مەیخانەچی کە لەگەڵ خاڵەکانی من سێبەری یەکتریان بە تیر دەنگاوت، ڕۆژێك لە کێوپارەوە دادەگەڕێتە خوارێ و ڕوو دەکاتە گوندەکەی ئێمە بەشکم ئەو عارەبانە سێوەی پێیەتی بەسەر خەڵکەکەیدا ساغ بکاتەوە، بەڵام کە دەبینێ گوندەکە گەورەیە و شارەدێیەکە بۆخۆی، تەماح دەیگرێ و دەمێنێتەوە. ئیدی ماڵێکی بەکرێ گرت و نامەیەکی نووسی بۆ کەسوکارەکەی، کە

سیپالّی بۆ کۆ بکەنەوە و بۆی بنێرن. زۆری نەبرد خەڵکی ئاوایی سەیریان کرد ئەوە پۆلێك منداڵی ناتەرزی وەك دێوەزمە کە رێك وەکوو باوباپیرانی ئێمە قژە کاڵ و پڕەکەیان هاتبووە سەر شانیان، دێنە ئاوایی. سواری چەند عارەبانەیەکی درێژ ببوون کە پڕ بوون لە مەنجەڵی گەورەگەورە و سندووق و هەزار جۆرە کەلوپەلی دیکە. وەك برووسکە لە نێو ئاوایی گەڕا کە بەڵێ چیاییەکان خەریکن کارخانەی مۆم دروستکردن دادەمەزرێنن.

کارخانەکە زۆر خێرا کەوتە گەڕ. تا درەنگانی شەوێ تێیدا کاریان دەکرد. ئێمە لەبەر پەنجەرەکان کۆ دەبووینەوە بۆ ئەوەی بزانین ئاخۆ ئەو کوڕە کاڵە زرتەزەلامانە چۆن مێوەکە دەتاوێننەوە و ئەو مۆمە نەرم و ناسك و هەرزانباییانەی مردووناشتن و مۆمی سپی و گەورە گەورەی رێورەسمی ئاومۆرکردن و زەماوەند لەو کارخانەیە یان باشتر بلێم لەبن دەستی ئەواندا دێنە دەرێ.

کاروباری گراسیم شێربۆ پەرەی گرت. ساڵێکی نەبردوو ئەو ماڵەی بۆ پاییزێك بەکرێی گرتبوو، کڕییەوە و سەربانی هەڵوەشاندەوە و دەرگا و پەنجەرەشی لێ گۆڕی. ئێستا رەنگی دەرگا و چەنجەرەکەی شینە. لە حەوشەش عەمباری گەورە گەورە دروست کرا.

ژنەکەی کە هاتە ئاواییەکەمان، یەکێکی ریوەڵەی رەقەڵەی قژکاڵ بوو، رێوی کلکی لێ دابا دەکەوت. تنۆکەیەکی هەڵبزڕکاوی پیس و تیسکن و تەنوورەیەکی پڕ چرچولۆچ و سەدپینەی لەپێدا بوو. پێخواسیش بوو، کەچی ساڵێکی نەبرد، پێڵاوی پاژنەبەرزی لە پێ و جلی گوڵداری لەبەر دەکرد و گووی زل زلی دەخوارد، کە بەڵێ مێردەکەی دەچێتە شاری کلاوی بۆ دەکڕێ.

ژنێکی بەخۆوە بەلام رەقەڵە بوو و وای سەیری وەرزێران دەکرد، وەك خۆی لە لووتی فیلەوە بەربووبێتەوە. یەکشەمووان لەگەڵ ژنە شارییەکانی دیکەدا کۆ دەبۆوە: ژنی میرازی ناحییە و پۆلینی ژنەکەی دیمۆزلی پوورزام.

کە یەکێك بە رەحمەتی خوای دەکەوت، گراسیم شێربۆ مۆمە تایبەتییەکانی مردووناشتنی دروست دەکرد. کە یەکێك منداڵێکی دەبوو، گراسیم مۆمی تایبەتی رێورەسمی لەئاوهەڵکێشانی دروست دەکرد. کە کچ و کوڕێك دەیانەویست زەماوەندێ بکەن، ئەوا گراسیم شێربۆ مۆمی جوان و سپیی تایبەتی زەماوەندی دروست دەکرد... هەموو ئەوشتانە لەگەڵ ئەو مۆمانەی بۆ جێژن و ئاهەنگی

جۆراوجۆری ساڵ و بۆ ڕێوڕەسمی کلێسا دروست دەکرد و بەسەریدا دەسەپاندن... و جا هەر گوندەکەی خۆشمان نەبوو کە گراسیم مۆمی بەسەردا ساغ دەکردەوە، بگرە هەموو ئاواییەکانی دەوروبەری پاوان کردبوو.

سەرتان نەیەشێنم، بە وەسەریەکنان و لەچەری(رەزیلی)، زۆری نەبرد گراسیم پارە و پۆستی زۆری دەستەبەر کرد. کارخانەکەی راگوێستە بیناکەی بنەبانی حەوشە و لە بینا سەرەکییەکەدا کە دەرگاکەی بەسەر شەقامدا دەکراوە، فرۆشگەیەکی گەورەی کردەوە. عارەبانەکانی، بوخچە و بەستە زلەکانی ژووری بازرگانییان لە شارییەوە هێنایە فرۆشگەکە و رێك لە رۆژی جەژنی پاکدا، ئەوددەمەی بەهەموو ناوچەکەیدا بلاو کردەوە کە فرۆشگەکەمان سەری مار و مێروو ی تێدا دەست دەکەوێ و لە هەموو جێیەکیشی هەرزانتر دەفرۆشێ، ئینجا دەرگاکەی کردەوە. خەڵکی خوای وا هرووژمیان هێنا و روویان تێ کرد وەك بڵێی لەوێ ماڵی بێخاوەن دەبەشنەوە. جا لە جێژنی پاکدا بنیادەم ئەگەر نانی شەوێشی نەبێ هەر ناچارە منداڵەکانی پۆشتە بکاتەوە، ئیدی نەریتێکە هەر لەکۆنەوە ماوەتەوە...

لە جێژنی نۆئێلدا بخۆ و بخۆوە
لە جێژنی پاکدا بکڕە و لەبەر بکە

باوکم ئێمەشی لەگەڵ خۆی بردە فرۆشگە. هەمووەمان وێکڕا. بۆ خوشکەکانم پێڵاو و قوماشی کوڵکەداری کڕی و بۆ ئێمە کوڕەکانیش پۆتین و کراس و کلاو. کلاوەکەی من زۆر جوان بوو. لای راستەی دەمانچەیەکی تەنەکەی بە قردێلە لێ درابوو.

گراسیم شێربۆ پارەیەکی زۆر و زەبەندی کۆ کردەوە و رۆژێك لە رۆژان رێك وەك خاڵەکانی خۆم کە چۆن لێیاندا و رۆیشتن چوونە شاری، ئاوا گوندەکەی بەجێ هێشت و رۆیشت. گراسیم و ژنەکەی ئیدی بێزیان نەدەهات لە دێ بژین. رێك وەك خاڵ و خاڵۆژنەکانی خۆم.

لە ئاواییەکەمان تەنیا ژنێك هەبوو کە جێی بەتاڵی گراسیم شێربۆ و ژنەکەی پڕ کردبۆوە: ئەویش، ژنەکەی پاسکۆتزوو بوو.

ژنەکەی پاسکۆتزوو، خەڵکی شاری رەوشیدەودێیە، کە هاتووە و لە گوندەکەی ئێمە گیرساوەتەوە. ژنێکی قژکاڵی وردیلە و ناسکۆڵەیە. ئەوەندە سپییە، دەڵێی ماستی لەسەرودەموچاوی هەڵسویوە. پاسکۆتزوو خۆی پیاوێکی تەواو پێگەیشتووە، بەڵام پاپێلکای ژنی منداڵکارە. پیرەپیاو نایباتە دەشتێ بۆ کارکردن و هەر باوکە پیر و زورهانەکەی دەبا.

ـ ئەی بۆ ژنەکەت نابەی کاری پێ بکەی؟

ـ دڵم نایە تاو رەشی بکا. حەزناکەم تاو بیبا و دەستی بقەڵشن و زبر بن. حەز دەکەم بە دەستە سپی و ناسکەکانی خواردنم بۆ لێ بنێ.

جا دەستی پاپێلکا هەر بەراستی سپی و ناسکن و نینۆکی خڕیلە و رێك و جوانن.

سێ منداڵی بۆ مێردەکەی خستووەتەوە، یەکێکیان لە کاك گۆگۆی کۆیلە دەچێ و یەکێکی دیکەیان لە دۆمتیراکێ ڤاتۆیی دەچێ و دینای کچیشی لەگەڵ ئاڤێندرێیای ئەسپ دز کە هاورێی ئیۆنی برامە، دەڵێی سێوێکن و لەتت کردوون.

جاروبارە کە ژنێك حەزی دەچێتە ئەوەی سەری قسەی لەگەڵ بکاتەوە پێی دەڵێ:

ـ ئەرێ پاپیلکا، خۆت بەکێ بەگان داوە؟

ـ حەزم لە کێ بووبێ بەو... تێگەیشتی؟ حەزم لە کێ بووە...

پاسکۆتزوو دوو ماڵی هەیە: یەکێکیان ماڵە بچکۆلانەکەی ئەوسەری باخچەکە و ماڵە گەورە تازە دروستکراوەکەی ئەوبەری کۆڵانیش. خۆی و ژنەکەی و سێ منداڵەکەی لە ماڵە چکۆلەکەیدا دەژین. باوکە پیر و زورهانەکەشی لە ڕاڕەوەکەدا لەسەر حەسیرێك دەنوێ و ماڵە تازەکەشی داوە بەو ئەفسەرانەی تازە هاتوون مەزراکانی ئاوایی رووپێو بکەن و نەخشەی لێ هەڵگرنەوە. لە گەورەکەدا کە دەمێکە ئەسپ و مانگای تێدا نەماوە، سەرباز و بەکرێگیراوەکان حەواونەوە و تێیدا دەنوون.

ئەو ئەفسەرانەی لە ماڵە تازە دروستکراوەکەدا باروبنەیان بەعەرزیدا داوە، دوو کەسن. هەردووکیان گەنج و سمێڵە قەیتانی و باریکەکەیان زیاتر لە سێبەرێکی باریك دەچێ. یەکێکیان ژنی هەیە و ئەوی دیکەیان رەبەنە. ژن و مێردە گەنجەکە کارەکەرێکیشیان لەگەڵ خۆیان هێناوە: کچۆڵەیەکی چیاییە، کە قسە دەکا هەر دەڵێی گۆرانی دەڵێ. ناوی زینکایە.

ڕۆژێکیان بەنوێژی نیوەڕۆیە، زریکەیەك لە باخچەکەی پاسکۆزوو هەڵدەستیٚ. دەست لە گەمە هەڵدەگرین و بە تاڵووکە خۆمان دەگەیەنینە ئەویٚ، چ ببینین، ئەوە زینکا خۆی لە خۆڵ دەگەوزێنیٚ و لێی دەدریٚ. زی زی، ژنی ئەفسەرەکە تێی بەربووە و بە پاژنەی قۆندەرەکەی داوێتە بەر پێلەقە. جا زگی وەبەر دیٚ یان دەموچاوی... بەر لەوەی بەعەرزیدا بدا، مستێکی توندی لە دەمی داوە و قژو تیتکی دەرهێناوە. ئەو قژە رەشە جوانەی وەك چرا بریسکەی دیٚ. هەم لێی دەدا و هەمیش یەکپشوو جنێوی دەداتیٚ.

پۆلینی ژنی نیکۆلای دیمۆزلی پوورزام کە لە ماڵەکەی بەرەوڕوودایە، لە سەرەوە خۆی داهێناوەتەوە و دەپرسی:

ـ خاتوون، ئەوە چیی کردووە؟

ـ ئەو بەرەڵایە، قاوەکەی رشتووم.

هەمووومان کۆ بووینەتەوە و سەیر دەکەین. خاتووئەفسەر دەست لە بەرۆکی زینکا دەکاتەوە و دەست دەداتە وردکە بەردان و تێمانی دەگریٚ. ئێمەش کلکمان لە گەلۆزمان دەنێین و تێی دەقووچێنین و ژنە ئەفسەرەش راومان دەنیٚ. زینکا، کە لە تێهەڵدان قوتار بووە، هەڵدەستیٚ و دەچێتە سەر ئەو کانییەی لەوبەری ماڵەکەیە، خۆڵ و خاکی سەر و گیانی دەتەکێنیٚ و دەست و دەموچاو و قاچ و قولی دەشواتەوە. دەمی پڕ بووە لە خوێن. ریتزای خوشکم دەیباتەوە ماڵی خۆمان بۆ ئەوەی تیماری بکا و بە مەلھەمێك شتێك پێشی خوێنەکەی بگریٚ.

ـ بۆ ئەو هیچوپووچە بەجیٚ ناهێڵی؟

ـ بچمە کویٚ؟ لەم دنیایە کەس شك نابەم. لەوانەیە لە جێیەکی دیکە لەوەش ماڵوێرانتر بم.

دەچێتەوە لای خانمەکەی. چەد خولەك دواتر دەیبینین ئەوە بەلەمێکی سپیی پێی و دیٚ.

ـ خاتوونم ناردوومی تووی بۆ بەرم.

ـ بڕۆ لیٚ بکەوە.

زینکا یەکێك لە دار تووەکان هەڵدەنیٚ و دەچتە سەری. دەنك دەنك توو لیٚ دەکاتەوە و گۆرانی دەڵیٚ. کە بەلەمەکەی پڕ کرد، لەسەر خۆ دێتە خواریٚ بۆ ئەوەی بیباتەوە بۆ خانمەکەی.

لای ئێوارێ ئەفسەر لە مەزرایە دێنەوە. بەکرێگیراوانیش بە دووی قوونیانەوەن. یەکێك لە ئەفسەرەکان ڤیۆلین لێ دەدا. ئەوی رەبەنەکە. لە حەوشە لەبەر دەرگای ماڵەکەی پاسکۆتزوو دەست دەکا بە ژەنین. ئێمەش لە دوورەوە گوێی لێ دەگرین. لێی بچینە پێشێ، بەردمان تێ دەگرێ. پێی خۆش نییە بمانبینێ لە دەوروبەری دێین و دەچین.

شەوی وایە بەکرێگیراوەکان دێنە لای مە. ریتزای خوشکم چەرچەفێکی خاوێن دێنێ و لە بن دار تووەکان رایدەخا و یەکێك لە سەربازەکان دەچتە سەر دارەکە و رایدەوەشێنێ. توو وەك تەرزە دەبارێ. سەرباز کۆی دەکەنەوە و لە قاپێکی دەکەن و لە دەم بیرەکە دادەنیشن و مل لە خواردنی دەنێن. لەگەڵ باوکمان و لەگەڵ هەمووماں نێوانیان خۆشە و قسە دەکەن. دیارە ئەفسەرەکان هەردووکیان کوڕی دوو ئاغای ملهوڕی لای براتیلان.

گەنچۆمارین پیاوی ئەو ئەفسەرە رەبەنەی ڤیۆلین لێ دەدا و تازە لە قوتابخانەی ئەفسەری دەرچووە ـــ یەکێکە لە منداڵەکانی ئۆدۆپ، ئاواییەکەی دراوسێمان. هەر دوو سێ ددانی لە زاریدا ماوە.

هەر بۆ ئەوەی قسەیەکی کردبێ دەڵێ: ـ باقی ددانەکانم، لەوەتەی بوومەتە پیاوی ئەم ئاغایە، هەڵوەریون. هەر لە هیچ و خۆڕایی هەڵدەچێ و دەمداتە بەر قەمچی. شەوانە کە جزمەکانی لە پێی دەردێنم، مەحاڵە لەبیری بچێ کە نووکە جزمەیەکم لە قەپۆزی بکوتێ. پێم دەڵێ: "گامێش، لەسەرخۆ رایکێشە، لاقم مێخەکەی لێهاتووە." ئەگەر هێواشیش دەیکێشم، جزمە لە پێی نایەتە دەر. هەر بۆ لووسکەیی خۆی، جزمەی پەنجەباریك لەپێ دەکا.

چیۆریۆ، بەردەستی ئەفسەرەکەی دیکە، کە پلەی ملازمیی هەیە، خەڵکی مۆلداڤیە. قژی زەرد و چاوی کاڵن. کە پێدەکەنێ، مەلاشووی دەردەکەوێ. پێی ناخۆش نییە ئێمەش لەو شادی و خۆشییەی خۆیدا بەشدار بکا:

ـ هەر نەبێ لێرە هەر تێهەڵدانی جەنابی ملازم و ژنەکەیم وێ دەکەوێ. لە بۆخارێست خەسووشی تێی هەڵدەدام. ئەو کافرە رۆژ نەبوو بە داری فەرش تەکاندن پەراسووم تێك نەکاتەوە. ئاخر، جەنابی ملازم لە ماڵی خەسوویدا دەژی. خانوویەکی گەورەیان لە نزیك باخی نیشتمانی هەیە کە بە ناوی ژنەکەیەتی. خوا دەزانێ خەسووی جەنابی ملازم چ دێڵەسەیەکی بێ حەیایە. ژوورەکان یەك بە یەك

بەکرێ دەدا. لەگەڵ کرێچییەکانی وا دەجووڵێتەوە، هەر سەد خۆزگە بە هەڵسوکەوتی عەریف لەگەڵ سەربازی بندەستی. ئەو داماوانە هەر ناوێرن ببزوون. یەك دوو حەفتە ددان بە جەرگیاندا دەگرن و دوایی کلکیان لە گەڵۆزیان دەنێن و دەڕۆن. بەڵام چونکە خانووەکە رواڵەتێکی جوانی هەیە، هێشتا یەکێك نەڕۆیوە، یەکی دی جێی دەگرێتەوە، کە ئەویش هەر میوانی چەند رۆژێك دەبێ. ئەویش دوو قڕانییەکەی دەکەوێ و یەکی دیکە دێتە جێی. چەرخوخولە. منی داماویش دەبێ تووڵە سەیەکانی خەسووری جەنابی ملازم بەرمە باخی نیشتمانی بیانگێڕم.

هەروا دەگێڕێتەوە و وردە وردەش زەردەخەنەی دێتێ، قەڵافەتی رەش دادەگەڕێ و وێك دێ:

ـ خوایە گیان، بۆچی ئەقڵمان پێی نەشکا ساڵی ١٩٠٧ گۆڕی ئەو ئاغایانە بگێین... خۆ ئەگەر وامان کردبایە، ئێستا ئەم ملك و زەویە سەرپاکی گۆڕابوو.

باوکم لەبەرخۆیەوە دەڵێ:

ـ ساڵی ١٩٠٧ ئێرە بۆ ئێمە زۆر شوێنێکی سامناك بوو. سێ مانگی رەبەق ئێمەیان لە بەلەمێکی بارهەڵگردا لە نێوەڕاستی دانوب زیندانی کرد. مێش و تەپۆ و ئەسپێ گۆشت و خوێنیان خواردین. چیی نەمابوو مشك هەر بە زیندوویی کەوڵمان بکەن. ئەی لەو نەهامەتییە. بنیادەمی وامان لەگەڵ بوون زۆر بەتاقەت نەبوون، گۆشتی لەشیان، ئەو شوێنانەی بە قەمچی شووخاڵی بەستبوو، وردە وردە رزین. برینەکانیان کرمی تێکەوت. دوایی لەوێوە رایانگوێستین بۆ زیندانەکان. رایاندەکێشاینە دەرێ و دەیانبردینە دادگا. لە راستیدا هەر بۆ ئەوەی گاڵتەمان پێ بکەن و پێمان پێ بکەنن. هەر بۆ ئەوەی ئاخرییەکەی بڵێن، گەورەییان فەرمووە و لە ئێمەی حوکمدراوی چارەڕەش خۆش بوون...

ئاخ، بەڵێ، زاواکەی ملیارەسی ـ یانی دراکۆلێی والی، هەموو هەوڵەکەی ئەوە بوو ئەوەمان بۆ روون بکاتەوە. بەڵام لە چ شتێك خۆش بن؟ ئێمە خۆ تاوانمان نەکردبوو: هەر ویستمان دادپەروەری جێبەجێ بکرێ. هەر ویستمان مافی خۆمان وەرگرین... من خۆم بە دراکۆلێم گوت: "ئەگەر لەو نێوە تاوانبارێکیش هەبێ، ئێمە نین، بەڵکو ئێوەن: ئێوە ئاغاکان کە قەمچی و دەسەڵاتتان هەیە. دەسەڵات و حوکمەت دەستی ئاوەڵا کردوون کە ئێمە بکەنە کۆیلەی خۆتان، ئەرێ بەوەندەش تێر ناخۆن: بە قەمچی پێست و گۆشتمان دەئەنجنن و بەرهەمی زەحمەتەکانمان رادەماڵن و تالانی دەکەن و

لێ دەگەڕێن ژن و منداڵمان لەبەر چاومان پەلەقاژەی مردنیان بێ و لە برسان بمرن و، جا دێن باسی لێخۆشبوونیشمان بۆ دەکەن. قسەکەی منی زۆر پێناخۆش بوو و دەستی کرد بە بۆڵەبۆڵ: "پێم وایە بە گوێرەی پێویست بە عەمباری کەشتییەکەدا نەماویتەوە. بڵێم بتبەنەوە ئەوێ؟" پێم گوت: "دەی ئاخری؟" لەمەودوا ماڵێ و عەمباری کەشتی بۆ ئێمە چ جیاوازییەکی هەیە؟ هەردووکیان هەر وەك یەكن."

باوکم خەریکە سەروقژی سپی دەبێ. ردێن و سمێڵی ماش و برنجی بوون. دووکەڵی جگەرە تووتن و پەڕەکەی بە تاسەبارییەوە هەڵدەمژێ. سەربازەکانیش جگەرە دادەگیرسێنن. دووکەڵ مێشەکان دەتارێنێ. باوکم لە نێو گژوگیای رەزەکەدا تووتنی چاندووە. تووتن شین بووە و گوڵی داوە. گەڵاکانی سەوزن. پانن و دەڵێی مەخمەرن. باوکم هەموو رۆژێ چەند گەڵایەکیان لێ دەکاتەوە و دایدەنێ وشك بێتەوە. هەتاو دەیسووتێنێ و زەردی هەڵدەگێڕێ. باوکم لە فوودانەبەرازێکی دەکا، کە کردوویەتە توورەکەی تووتنەکەی و لە نێوقەدی دەبەستێ.

گەنجۆی کارەکەر دیسان دەچێتەوە سەر بەسەرهاتەکەی:

ـ ساڵی ۱۹۰۷ من بیستێك منداڵ بووم. تۆپێکیان راکێشا و هێنایانە گوندەکەی ئێمە. شۆڕشەکە لە پڕدا بەرپا ببوو. دیوەخانی ئاغایان ئاگر دابوو. ئاغاکەی ئێمە کابرایەك بوو بەناوی دۆمبا، کە لە نەمسا دەژیا و برادەری ئیمپراتۆری نەمساییەکان بوو. هێشتا دووکەڵ و بڵێسە لە کۆشکەکەی هەڵدەستا، کە سەروسەکتی لەشکر پەیدا بوو. خەڵك کەم و زۆر دەیانزانی چییان بەسەر دێ. هەموو لە دەوری یەکتری کۆ بوونەوە. هەندێ بە کۆنەتفەنگێك و هەندێ بە شەنە و تێڵا لە پشت ئاوایی چاوەڕێ بوون لەشکرەکە بگاتێ. پیرەپیاوێکی ریزەکەی ئێمە چووە پێشێ و بە ئەفسەرەکانی گوت: "دەستمان لێ هەڵگرن، ئێمە شەڕمان لەگەڵ لەشکری ئێوە نییە. خەڵکی ئاوایی لە ئاغا راپەڕیون و ئێستا کە ماڵە تووکلێکراوەکەیان ئاگر داوە، دەچن خەریکی کاروباری زەوی و زارەکە دەبن، کە گەیشتووەتە دەست خاوەنی راستەقینەیان."

ئەفسەرەکان  هەڵیانکێشایە شمشێر و پەلاماری پیرەیان دا. ئیتر گۆرادۆڵ چێ کە پێشتر لە لەشکردا عەریف بوو، بوو بە فەرماندەی گوندییەکان. خەڵك لە پشت پەرژین و قوڵکەکاندا سەنگەریان لێ

گرتن و ئەفسەر و سەربازە خۆبەخشەکانیان دایە بەر ڕەهێڵەی ئاگر. یەکێك لە ئەفسەرەکان گەوزی. چەند دەرەجەدارێکی دیکەش کەوتن. سەرباز کە زانییان دەرەقەت نایەن، تێیان قووچاند و رایان کرد... جەنگێکی پیاوانە بوو. تەنانەت رامانسپارد کەرەناش لێ بدەن... بۆ سبەی بەیانی سەربازی دیکە هاتن کە چەند تۆپێکیشیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو. سێ رۆژی تەواو تۆپ لە گرمە نەکەوتن. ماڵ لە دوای ماڵ خاپوور دەبوو. گوللەی تۆپ هەموو شتێکی کاول دەکرد. خەڵك وەك مێش دەکەوتنە عەرزی. دار ئەرخەوان لە بنێڕا دەپەڕین. هەر من و باوکم و خێزانەکەمان توانیمان خۆمان قوتار بکەین. بەڵام ساڵی ١٩١٣ باوکم لەوبەری دانوب بە کۆلێرا مرد.

سەرباز پێخواسن. کا و کلۆشی ئەو ماڵانەی بە فەرمانی ئەفسەرەکان گێرە دەکرێ، پێ و قولە رووتەکەیان بریندار دەکا و شەڵاڵی خوێن دەبن و بۆ راگرتنی خوێنەکەیان خۆڵی پێدا دەکەن.

باوکم جلوبەرگی برا بچووکەکەم دادەکەنێ و لە تەنیشت دایکم دەیخەوێنێ. منداڵی داماو لە خەو هەڵدەستێ و دەنگێکی دێ، کەس نازانێ چییە.

ـ ئەوە دەڵێ چی بابە؟

ـ ئاوی بدەیە.

ئاوی بۆ دێنم، چەند دڵۆپەیەك دەخواتەوە و سەری بەلادا دێتەوە. دایکم دەستی بە سەروقژیدا دێنێ. بە قامکە درێژ و لاوازەکانی لەسەرخۆ سەری قژی دادێنێ.

ـ رۆڵە گیان، بەرخۆڵەکەم...

دەترسێ لەخەوی هەستێنێ.

من خۆم دەخزێنمە نوێنەکەمەوە. لە لای ماڵی پاسکۆتزۆوە دەنگەدەنگێکی زۆر دێ. خوا دەزانێ داخوا زینکا لەو نیوەشەوەدا دیسان چیی شکاندووە.

هاوین کە دادێ، من دەچمە سەر دار تووەکە و لکەکانی رادەوەشێنم و توو دەتەکێنم. تا ئەو دەم ئیدی برا چکۆڵەکەم پێی گرتووە. هیچ نەبێ چەند هەنگاوێك بەرێدا دەڕوا. دێ تووەکان هەڵدەگرێتەوە و لە زاری دەنێ و دەموچاوی بە شیرەی توو سواخ دەدا....

تووی نۆبەرەی بەهارێ...

**تووی پاییزێ**

**ـ تووەکان شیرینن؟**

**ـ ئەدی، وەك شەکر...**

## ١٢

## گورپه*

❊

❊

❊

له بن داره گەورەکەی نێوەڕاستی خەوشە، هاواڵەکانی من له دەم زارکە دارینەکەی بیرەکە راوەستاون. ئەسپەکان لەبەر کۆلەکە دارینەکە ریز بوون. سەتڵەکە هەڵدەکێشین و له کۆلەکەی دەکەین. ئەسپ ئاو دەخۆنەوە و ورگیان هەڵدەستێ.

ئەگەر پێمان هەڵخلیسکێ، سەروبن له بیرەکە دەکەوین. ئەوەندە قووڵە بە حاستەم بریقەکەی تەختی بنی دەبینی. ئەو هێچکانەی داری ئاوهەڵکێشەکەیان راگرتووە زۆر بەرزن. بە درێژایی داری ئاوهەڵکێشانەکە دەزانی بیرەکە چەندە قووڵە. له چلەی هاوینیشدا هەر بەو دارە دەزانی چاوی بیرەکە تازە و فێنکە یان ماوەتەوە و گەرم بووە.

ئەو ئاوەی له تەرکی بیرەکەی ماڵەوەماندا بریسکەی دێ، هەمیشە فێنك و تازەیە. ژنان نیوەڕۆ و شەوان گۆزەکانیان هەڵدەگرن و دێن له ماڵی ئێمە ئاو دەبەن، تەنانەت ئەو ژنانەی ماڵەکەشیان زۆر دوورە.

پیاوان یان وەختی کارکردن پێکەوە سوعبەت دەکەن، یان له مەیخانە یان له ماڵەوە، ژنان لەبەر دەرگا و زیاتریش له سەر ئاو.

منداڵ، ئەسپ دەبەن دوور دوور له مێرگەکە دەیانلەوەڕێنن.

هێشتا گەنمەشامی هەڵنەگیراوەتەوە. هێشتا یەك دوو حەفتەی ماوە.

ئەمساڵ هەموو زەوی و زارەکەیان دانەچاندووە.

ـ داریە، ئەسپەکان بەرینە دەرێ؟

---

*گورپە: نێرەپشیلەی زل

ـ ئا، با بیانبەین.

لە ماڵێ لە تەپلەیەك دەگەڕێم. كۆنە تەپلەیەكی شڕیش بێ بەسمە، هەر تۆزێك سەرم بگرێ. چاكەتێك كە هیی خوشكەكەمە بە شانمیدا دەدەم. ئەویش وا شڕ بووە پینە هەڵناگرێ.

پاییزە و شەوانی ساردە. دەزانم چۆن خۆم گەرمدا بێنم. كە حەیوانەكەم پاراو كرد، خۆم داوێمە سەر پشتی. منداڵ لەسەر من رانەوەستاون، رۆیشتوون. شووڵكەكە لە پاشەڵی بارگینەكە دەدەم، دەردەپەڕێ. توند یاڵی دەگرم و خۆم دەنوشتێنمەوە و خۆ بە ملییەوە دەنووسێنم. حەیوانەكە دەڵێی دەیەوێ بفڕێ. ئەگەر جادەكە بەردچن بوایە و بارگینەكەم ناڵی بوایە، پزیسكی لە بن سمی دەردەچوو. بەڵام ناڵ نەكراوە و رێگەكەش خۆڵە. تۆزێكی نەرم ڕێیەكەی داگرتووە.

دەیانگەمێ و هەمووان بە ریز و شان بە شانی یەكتر دەڕۆین.

ـ ئەمشەو لە كوێیان بلەوەڕێنین؟

ئاڤێندرێ دەڵێ: لە دڕوەڵانەكەی ئادانكاتا.

كە لە پچەپچ و قسەوباسی گەڵ منداڵەكان وەڕەز ببم و ئاواڵە بزۆزەكانم خەویان لێ نەكەوێ و نەشهێڵن منی برس لێبڕاو بخەوم، ملی ئەو رێیە دەگرم كە بەرەو وێستگەی شەمەندەفەرەكە دەڕوا و یەكەورێ دەچمە ماڵی مامە بۆردۆلێ گیان.

❊

❊

❊

مامەگیان بۆردۆلێ ریش چەرمووی بنەماڵەكەمانە. تەمەنی رێك سەد ساڵە. پیرەژنەكەی مردووە. لە حەوت كوڕەكەی، هەر دووی بۆ ماوەتەوە: ماری نیكا و دانیكا. پێنج كچیشی هەبووە هەر یەكێكی ماوە. بەڵام لەشكرێكی نەوە هەیە. ئەگەر رۆژی یەكشەممە هەمووان بیانەوێ پێكەوە بێنە سەردانی، ماڵەكەی مامەگیانم وەك شارە مێروولەی لێ دێ. هەر بۆیە تەنیا جێژنان دێنە لای، ئەویش هەموویان پێكەوە نایەن.

پیرەپیاو، کابرایەکی سامناکە. هەر دەقەیەکیش چییە تاقەتیت نیە. بەردوام باسی ئەو سەردەمە دەکا کە گەنجێکی لەبەردڵان بووە.

کەس گومانی نییە لەوەی مامە گیان برۆدۆڵێش سەردەمانێك جوان و لەبەردڵان بووە. هەر نەبێ ئێستا ئەوەندەم لێ روونە و دەزانم هەموو پیرەپیاوێك رۆژێك لە رۆژان گەنج بووە. بەڵام ئەو مامە پیرەیە، کە لە سەردەمی گەنجێتییەکەیدا جوان و ژیکەڵانە بووە، زۆر ناچێتە ئەقڵەوە. ئاخر، بنیادەم چاوی هەیە و دەبینێ، ئەم قەڵافەتە قەڵافەتی بنیادەم نییە، قەڵافەتی عەنتەرە عەنتەر. کە قیت راوەستێ، بە زەحمەت هێندەی باوکمە. پشتی چەمیوەتەوە. ئیتر نە ردێنی ماوە و نە سمێڵ. دەموچاوی لە هیی خەسیوەکان دەچێ. بەیانییەك کە لەخەو هەڵدەستێ سەیر دەکا نە مژۆڵی ماوە و نە برۆ. هەرچی تووك و موویەتی بە باڵنجەکەوە نووساوە.

منیش هەر بۆیە دەچمە ماڵی مامە بۆردۆلێ، چونکە ئەوانی دیکە خۆی لێ دەبوێرن: ئاخر بەردەوام باسی خەڵکێك دەکا کە ئێسك و پرووسکیشیان نەماوە.

لەبەر شتێکی دیکەش دەچمە ماڵی: مامەگیان گۆرانی دەڵێ. نەماوم بۆ ئەوانەی دەتوانن گۆرانی بڵێن. وای دانێ مام بۆردۆلێ ئیدی بێتامی دەکا. ئەوەندەی دەڵێ مێشکی سەری پیاوی دەبا و لە گووخواردن پەشیمانی دەکاتەوە. جا بڵێ چ گۆرانییەکیش دەڵێ؟ دەنگی گڕ دەکا و گۆرانیی وا دەڵێ تەنانەت شایەرە دۆمەکانیش شەرم دەکەن بیڵێنەوە. ئەگەر بشیڵێنەوە لەبەرخۆیانەوە یان بە سرتە بۆتی دەڵێن. ئەویش بەو مەرجەی بە کەیف بێ.

وەختێك کچی گەنج و کچۆڵەی عازەب بە پۆل لە دروێنە و زەوی کێڵانەوە دێنەوە، مامە گیان غار دەداتە بەر دەرگا و دەستی لە بن گوێی دەنێ و تێی دەچریکێنێ:

شەوێ کە مار و مێروو نوستبوون
گرتمە ئامێز بەژنی باریکی
بەپەنجە گیانیم پشکنی و گرتم
قولێ گەندە موو لە جێی تاریکی

ژنان دەتریقێنەوە و قاقا پێدەکەنن. کچەکانیش هەروەتر. یەکێکیان کە لەوانی دیکە بێشەرمترە، زمان لە مامە گیانم دەردێنیٚ و ددانی لیٚ چیڕ دەکاتەوە و دەڵیٚ:

ـ ئۆی، بەقوربانی ئەو پەنجەیەت بم، پیرە...

پیرەپیاو بەخۆیدا دەشکێتەوە و تەریق دەبێتەوە و جنێوی وایان دەداتیٚ لە هیچ هەنبانەیەکدا نەبیٚ.

خوا دەزانیٚ من چیها شت لە مامەگیان بۆردۆلیٚ فێر بوومە.

وەك بلێی جاری جاران، لێرەوە تا ئەوپەڕی دنیا هەموو ولاٚت هەر لێڕ و دارستان بووە. کە خەڵك زۆر بوون، ناچار دارەکانیان بڕیوە و ڕەگەکەیان هەڵکێشاون. شوێنە چۆل یان تەنکەکانی دارستانەکەیان بەرینتر کردووەتەوە و دانەوێڵەیان لیٚ چاوندووە. هەرزن و جۆ و گەنمەشامی و شتی دیکە. بنیادەم بە پاچ و پێمەڕە و قولێنگ دارستانەکانیان کشاندووەتەوە و بە قەستی کوشت لێیان داون و دارستانیش مردوون و ڕۆیشتوون و مردوون و لەناو چوون. هەر لێرەو لەویٚ بە درێژایی چۆمی ئۆلت و لە درێژایی دانوب ـت هەندیٚ پاشماوەی لێڕ و جەنگەڵەکان وەك کۆمەڵێك وردە دووڕگەی پەرش و بلاٚو ماونەتەوە. لەتێك دارستان لە کرانجێنی ماوە، پشکێکیش لە ڕەوشیدەودیٚ، بەلاٚم وەك ئادان کاتا، لە پارچەیەك دڕووەلاٚن پتر چیی لیٚ نەماوەتەوە.

مامە گیان بۆردۆلیٚ دەڵیٚ:

ـ مەزراکان پان و بەرین کرانەوە. لێڕ و دارستان لەناو چوون. پاڵە و جووتیار چێژیان لە بەرهەمی زەحمەت و ماندووبوونی خۆیان وەرگرت... رێك ئەودەمە بوو کە سەروسەکتی ئاغاکان پەیدا بوو. ئەو سەگبابانە هرووژمیان کردە گوندەکان، سواری کەری دێهاتییان بوون و نەهاتنە خوار و گوتیان ئەو زەوی و زارە هیی ئێمەیە.... دەی باشە ئەی پاڵە و سەپان چییان لیٚ هات؟ بوونە نۆکەر و کارەکەر و کۆیلەی ئاغاکان و لەوەودوا ئیتر هەر وا مانەوە و نەگۆڕان. دیارە جاروبارە گوندی راپەڕیون و هەرایەکیان ناوەتەوە، بەلاٚم سەرکوتیان کردووە و دایانپلۆسیون. جا ئاغاکان یان نۆکەرەکانیان هەر جارێکی یەکێکیان رۆیبیٚ، یەکی دی جێی پڕ کردوونەوە.

ئێستا ئیتر پیرەپیاو ئەو گۆرانییە بێ ئەدەبییانە نالێ کە ژن و کچ لێی دەسڵەمینەوە. ئێستا ئیتر گۆرانیی وا دەڵێ، کە عەرز و ئاسمان لەوانی جاران جیاوازن. ئێستا لە نێوان لێوە باریك و بارلێنیشتووەکانی ناوی کۆنەی ئەو "هائی دووك"ـانە دەبیسی، کە سەردەمانێك شمشێرە قورسەکانی خۆیان راوەشاندووە و ملی دەستدرێژکەرانیان پەڕاندووە. ئەو ناوانە زایەڵەیەکی روونیان هەیە و وەك دڵۆپی باران پاك و بێگەردن، وەبیرخەرەوەی ناوی ئەو ئاغایانەشە کە وەرزێرەکان ئێستاشی لەگەڵدا بێ بە تف و لەعنەتەوە ناویان دێنن.

*

*

*

لە ئادان کاتا، نێوەڕاستی مەزراکانیان دەکەنە کاڵەك و شووتی.

ئێستا ئیتر وەرزی کاڵەك بەسەر چووە بەڵام هێشتا چارداغی بێستانەکان بەپێوەن و هێشتا بڕکە قۆڵهاوێژەکانیان هەڵنەکەندووە. هێشتا شووتیی درێژ و خەت خەت کە لەسەر لاتەنیشت کەوتوون، لە شێدارەکە دەدڕن و هێشتاش خرچە و گندۆرەی ناوەخت لە بن گەڵا نیوە وشکەکانەوە چاو دادەگرن. ئەوانە لەسەر خۆ لێدەکەنەوە و لە فەردەی گەنمیان دەئاخنن بۆ ئەوەی لە جێژنی نۆیلدا کە دەیانهێننە دەرێ، تەواو گەیشتبێن. دیارە "گەیو" دەستەواژەیەکە، واباشترە بڵێ "بڵ شیرین بووبێن."

ئەمشەو ئاڤندرێ، هاوڕێ گیانی گیانییەکەی ئیۆنی برام، سەرۆکی دارودەستەکەمانە.

ئیۆنی برام زۆربەی جار ئەسپەکەمان دەبا بیلەوەڕێنێ، بەڵام ئیتر ئێستا ئیۆن لەگەڵمان نییە. لە مەزراکەی شۆئاڤا بووەتە پاڵە، بەڵام ئەمشەو ئیۆن لە مەزراکەی شۆئاڤاش نییە، چونکە ئەگەر لەوێ بوایە ئەسپەکانی ئاغاکەی دێنا بۆ لەوەڕ. باپیرەمان لە کارلۆمان زۆر نەخۆشە، ئیۆن چووە ئاگای لێی بێ. دوو رۆژە چاوەڕێن گیانی دەرچێ. پێم وایە باوەگەورە نایەوێ بمرێ. وەك داپیرەکەی خۆشمان نەمرد.

باپیرە ئاوا پێیەکی لەسەر لێواری گۆڕەکە داناوە و نایەوێ پێیەکەی دیکەی بەرز بکاتەوە. داپیرەم وا لەو شتە بەخۆیدا شکاوەتەوە و تووڕە بووە هەر مەپرسە.

داپیرەم کە زۆر لەخۆی رازییە و وەك کچۆڵەیەکی تازە خۆی ناسیبێ لووتبەرزە و دەست دەبا بۆ کەلوپەلی ئارایشتکردنەکەی و خۆی جوان دەکا و، بێزی لە هەموو نەخۆشێك هەڵدەستێ.

یەکشەممەی پێشوو منیش چووبووم سەرێکی باپیرەم بدەم. کە گەیشتمە ئەوێ، دیتم داپیرەم کردوویەتە رۆژی حەشر. بنیادەم وەی دەزانی هەر ئێستا نا تاوێکی دی ئامبازی پیرەپیاوە دەبێ و بۆخۆی گیانی لێ دەستێنێ. دەیقیژاند:

ـ ئەرێ وەك منداڵی بنیادەمان بێدەنگ دەبی یان نا؟ هەر ناڵە و نووزە و نووزە و ناڵە، وەك منداڵۆچکەیەکی دایی دایی و ناسك و نازدار دەنووزێتەوە.

پیرەپیاو کە لە جێوبانەکەیدا کەوتبوو، پەنجە وشکەڵاتووەکانی بردە نێو ردێنە زەردەکەی و بەدەم ناڵینەوە دەیگوت:

ـ خۆ لەبەر ژان و ئازار ناناڵێنم. هەموو ئازای ئەندامم دەزیرێ. هەموو گیانم ژان دەکا. گۆشت و ئێسقانم زریکەی دێ... لەکوێی، ئەی مردن لەکوێی؟

داپیرە ئیدی تاقەتی وەی نەبوو ببینێ پیرەپیاو مەرگ بە ئاوات دەخوازێ.

داپیرە ئەو مریشکەی خاڵە دۆمیتراکێ سەری بڕیبوو، خستبوویە نێو ئاوە کوڵیوەکەوە و دانیشتبوو لە تەنیشت کوانووی ئاگرەکە و خەریك بوو تووك و پەڕی دادەماڵی و، ئەو کێردەی دەیەویست زگی مریشکەکەی پێ هەڵدرێ و چنجرووك و قامکەکانی پێ هەڵپاچێ لە تەنیشتی کەوتبوو. کە بیستی پیرەپیاو ئاوات بۆ مەرگ دەخوازێ، ئیدی دەهری بوو. زۆر باشە، بەڵام بۆچی ئاوا دەستی دا کێردەکە و بۆی چوو؟ دەیەویست ورگی پیرەپیاوەی پێ هەڵدرێ؟

هەرای کرد: بانگی مەرگ دەکەی، بۆچی؟ حەز دەکەی بمری؟ ها وەرە، ئەوە کێرد، ها بیگرە و لە سەر دڵتی بدە. دەمری، شەرت بێ دەسبەجێ دەمری. ئیدی نە دەناڵێنی و نە دەنووزێیەوە... مەرگ ئەوەتا لەبەر دەستتە، یارمەتیی بدە با گیانت بکێشێ.

زۆر سامناك و دڕندە ببوو. بە گاڵتەشی نەبوو. هەر بەراستی حەزی لێ بوو پیرە کێردەکەی لێ وەرگرێ و لە سینگی خۆی رۆبکا. من ئەوەندە لە چەقۆکەی دەستی نەترسام، هێندەی لە نیگای ترسام.

زەردەخەنەیەکی گەرم و نەجیم چاو و لێوی باپیرەمی گەش کردەوە. گوتی:
ـ بڕۆ، بڕۆ نەجیبە خاتوون. تۆش لە تۆرەمە باوکە تورکەکەتی... مەترسە داریە گیان. ئەوە وا دەزانی گوێ دەدەمە ئەو ژنەتیوە بەرەڵایە؟ پیاو نابێ قەت چۆك بۆ مەرگ دابدا، یان ئاوات بۆ مەرگ بخوازێ. بیادەم لەو دەمەوە کە لەدایك دەبێ مەرگ لە دەماری ملی لێی نزیکترە... بنیادەم، داریە گیان، هەر دەبێ ئاوات بۆ تۆزە بەخت و شانسێك بخوازێ، جا دەستەبەر بێ یان نا. دیارە ئەگەر بنیادەم مێشکی نەبێ، ئەوە قسەیەکی دیکەیە، ئەودەم دەکرێ ئارەزووی مەرگیش بکا. ئەوجار بە ئاواتییەوە بی یان نەبی، ئەو هەر ئەو کاتە دێ کە لە نێوچاوانت نووسراوە. تەنیا ئەودەمەیە کە بینەقاقات دەگرێ و دەتبا.
داپیرە دیسان کێردەکەی راوەشاندەوە و گوتی:
ـ دەمت داخە. نایەوێ مێشکی ئەو مندالە تێك بدەی. ئەگەر حەزت لە مردنە ها ئەوە کێرد، ئەگەر حەزیشت لێی نییە بێدەنگ بەو دەمت گرێ بدە و ئەوەندە مەنووزێوە.
پشتی تێهەڵکردین و رۆیشتەوە لای مریشکەکەی. بە تووڕەییەوە پەنجە و دەنووکی مریشکەکەی لێ کردەوە. وەك بڵێی هەر بەراستی خەریکە دەست و لاقە رەقەڵەکانی باپیرە دەبڕێ. هەناوی مریشکەکەی دەرهێنا و فڕێی دایە بەردەم ئەو سەگانەی لە بەردەرگا زمانیان دەرکێشابوو و کلکەسووتەیان دەکرد. جەرگ و دڵ و سیکەتۆرەکەی برژاند و خوێی کرد و لە قاپێکی چێویدا بۆ ئێمەی هێنا و ئەگەرچی پێشییەوە دیار بوو هێشتا تووڕەیە، گوتی:
ـ بیخۆن، زۆر خۆش و بەتامە.
بۆنێکی خۆشی لێ دەهات. باپیرە لەتێکی لە جەرگەکە هەڵگرت و لە زاری نا و دەمی بە پووکە بێ ددانەکانییەوە کەوتە جووڵە و جاوین. باقییەکەی من خواردم و دەم و فلچمم لستەوە. ئەوەندە خۆش بوو، جا چۆن نەملستباوە؟
ئەگەر ئەمشەویس داپیرەم مریشکێك بکوژێتەوە، دڵ و جگەرەکەی دەداتە ئیۆنی برام. خۆزگەم بەخۆی، بەڵام بەشەکەی منیش زۆر کەم نەبوو.

❋

*

*

ئاڤێندرێ لەو توخمەسەگانەیە کە لە هەرجێیەك بێ، بەرەی خۆی لە قورِ دەردەکێشێ. لەوەدا کەس تای ناکا. جا ئێمەی منالّ و پالّ کە لای وی هەر هیچ نین، ناچارمان دەکا بچین دار و چرپی و چلّوچێوی بۆ بێنین. دوایی دیسان دەماننێرێتە نێو مەزراکان، گەنمەشامیی بۆ بێنین. گەنمەشامییەکی باش گەیشتبێ. دواییش دەبێ گەنمەشامییەکانی لەسەر ئاگر بۆ ببرژێنین. رەعیەتداری و فەرمان دەرکردن هەر لەخۆی جوانە. هەتا نیوەی شەوێ ئێمە هەر گەنمەشامیی بۆ دەبرژێنین. ئەگەر تینووشمان بێ، ئەوە کانییەکەی نێو دەربەندێ کە دەلّێی چاوی قرژالّە پێشکەشمان.

ئەو گانگۆ لالّەپەتە گێژ و وێژە لە ئاڤێندرێ دەپرسێ:

ـ کاك ئاااڤێندرێ، ئەم م م شەو شووەو تت ت تی دە ەە دەخۆین یان ن ن نن نا؟

ـ لەوانەیە بخۆین.

ئاڤێندرێ هەر خەریکی دزی و فزییە. ئیۆنی برام تا ئێستا چەند جاران لە سۆنگەی کارەکانی ئەوەوە تێهەلّدانی باشی خواردووە.

زستانان هەر شەوەی لە مالّێك کۆ دەبنەوە بۆ گەنمەشامی هەلّوەراندن. ئەو شەونشینیانە جاروبارە تا بەیانییان دەخایاند، چونکە بە دەم هەلّوەراندنی گەنمەشامییەوە چەنەیان گەرمدا دێ و نەقلّ دەگێرنەوە و شەوچەرە دەخۆن و لەگەلّ کچان رایدەبوێرن. چونکە ئەو شەوانە بێ ئەملاوئەولا کچانی دەرودراوسێش بانگ دەکەن.

ئاڤێندرێ لەو شەوانەدا مریشکێك، قازێك قەلێکیش لەگەلّ خۆی دێنێ، بە کورتی هەرشتێکی لەسەر رێی ئاوەدانی بەردەست بکەوێ. ئێستا ئیدی خەلّك هەموو لێیان سوورە ئاڤێندرێ دەست پیسە. باوکیشم لەوە تۆقیوە کە نەکا ئیۆنیش رێوشوێنی وی رەچاو بکا و لارێ بێ. خۆ بێت و ئاڤێندرێ یەکێك شك بەری دەست و بالّی بگرێ، ئەسپیش دەدزێ. پار، جوانووەکی لە مالّی خۆمان دزی، شەوێ خۆی بە یەسترمەخانێدا کرد و جا چونکە سەگەکان دەیانناسی پێی نەوەرِیبوون. جوانووەکەی لە ئاخورِ کردبۆوە و بردبوویە کۆلّان و غاری دا. لە حەفتەبازارِ بە قەرەجە رەوەندەکانی فرۆشتبۆوە.

ئێمە وەختێك زانیمان و شوێنمان هەڵگرت، تازە حەیوانەکەیان بردبوو و، ئیتر دەستمان پێی ڕانەدەگەیشت. دزەی بێ ئینساف مانگێکیش بەلای ماڵەکەماندا نەهاتەوە. ڕۆژێك هاتە سەردانی ئیۆن. هەر وەك نە بای دیتبێ و نە بۆران.

ـ سڵاو خوشکە ماریا.

ـ بەخێر بێی ئاڤێندرێ، یانی ئاوا، جوانووە نازەنینەکەمانت دزی و بردت.

ـ من؟

ـ ئەی بابم؟

ـ خوشکە ماریا، یاخوا ئەوەی جوانووەکەتانی دزیوە، سەری لە ئاسمان و پێی لەسەر زەوی ببێتە کەباب.

دایکم دایە قاقای پێکەنین و ئاڤێندرێ خۆیشی پێکەنی.

ـ هەر نەبێ لەمەوپاش کارت بە حەیوانەکانی ئێمەوە نەبێ.

ـ خەمت نەبێ نا خوشکە ماریا، گوندەکە گەورەیە.

جا هەر بەراستی بەلای ماڵەکەی ئێمەدا هەر نەهاتەوە.

بانك گایەکانمانی داگیر کردبوو. باوکم بە ناچاری یەکێك لە ئەسپەکانیشمانی فرۆشتبوو بۆ ئەوەی چەند قاپێك ئاردی گەنمەشامیی پێ بکڕێ و زستانەکەی پێ بەرینە سەر و لە برسان سەگتۆپ نەبین. لە ماڵی دنیا، تاقە بارگینێکمان بۆ مایەوە و ئاو بێنە و دەستان بشۆ.

زۆر باشم لەبیرە، من بستە منداڵێك بووم و هەر ئەو دڕووەڵانەی ئێستا لەگەڵ منداڵەکانی دیکە ئەسپی لێ دەلەوڕێنین هێشتا دارستانێکی چڕ بوو. ئەودەم ئەو جادەیەی دەچێتەوە ڕەوشیدەودێ، هەر وەك ئێستا ڕێك بە نێوەڕاستی لێڕەکەدا دەڕۆیشت و لێڕەکەی دەکردە دووبەش. هەموو ساڵێك پاییزێ، باوکم وەڕێ دەکەوت و دەچووە بازاڕی ڕەش و منیشی وەدووی قوونی خۆی دەدا. سواری عارەبانەکە دەبووین و خۆمم توند توند پێوە دەنووساند و هەر وەختێکی کارەکەی باوکم تەواو دەبوو دەگەڕامەوە، جا نوێژی نیوەڕۆیە بوایە یان تەنگەی نوێژی شێوان. بەڵام هەمیشە بەر لەوەی بگەینە

نێو جەنگەڵەکە، لە ئەسپەکان دەگەراین پشوویەکیان بێتەوە بەر و بحەسێنەوە، چونکە پیاو نەیدەزانی کەی و چ خەونێکیان بۆ دیتووە. لە پڕ دەتدی ئەوە چەتە و ڕێگر بە تفەنگ یان بە تێلاوە لە فلانە قوولکە یان لە پشت درەختەکانەوە دەهاتنە پێشت و هەرایان دەکرد: "ڕاوەستە."

دەی باشە. لەو وەختانەدا تەنیا ئازایەتی و غیرەتی بنیادەم فریای دەکەوێ. ئەگەر تووشی وەها دۆخێك بووبای و بۆت لوابایە، دەبوو ئەسپەکەت بدەیتە بەر قەمچی و ئاوڕیش لە دواوە نەدەیەوە و لە پشتەوەش لە نێو بارانی جنێواندا، گوێت لە تەقەی تفەنگ دەهات کە پێیانەوە دەنای.

ئیتر مەرگ و ژیانت بەسترابۆوە بەوەی بەخت و شانست چۆن بێ. چونکە هیچ دوور نەبوو گوللەیەك بتپێکێ و لەوسەرەوە سەرەنگرێت بکا یان ئەگەر بەخت و شانست بوایە و توانیبات بە ساغی و سلامەتی لەوبەری دارستانەکەوە بۆی دەربچی. دیارە لەوانەش بوو بە زیندوویی دەربچی بەڵام هەموو سەروگوێلاکت خوێناوی بێ و ئێسك و پرووسکیان هاڕیبێ. ئەوە ئیتر بەسترابۆوە بە بەخت و شانسی بنیادەمەوە، بەوە کە ڕێگرەکان چەندە ئەنگێوە و دەستڕاست بوون یان چەندە ناشی و لێنەزان...

ئەوان زۆربەی جار پەتێکیان بە نێوەڕاستی جادەکەدا دەکێشا و هەردوو سەریان لە دارەکانی ئەمبەروئەوبەر دەبەست. لە پێشدا هیچ دیار نەدەبوو. پیاو وەیدەزانی دەتوانێ لە چنگی چەتەکان قوتار بێ و بەو خەیاڵە ئەسپی دەدایە بەر قەمچی، بەڵام بەستەزمانانە پێیان دەکەوتە داوەکەوە و سەرموقلاتیان دەدا و لمۆزیان لە عەرزی هەڵدەچەقی. جا وەرە، ڕێگرەکان کە زۆریشیان لەدڵ گران هاتبوو بۆچی کابرا ویستبووی ڕا بکا، تێی بەردەبوون و ئێسك و پرووسکیان دەهاڕی و بە نیوەزیندوویی فڕێیان دەدایە نێوەڕاستی جادەکەوە و خۆیان لە دارستانەکەدا بزر دەکرد.

جا ئەودەم کابرای ماڵوێران دەبوایە ئەوەندە ڕاوەستێ تا ڕۆژ دەبۆوە و خەڵکی دیکە دەگەیشتنێ و بە نیوەزیندوویی لە چنگی ئیزراییل ڕزگاریان دەکرد. ئەو دەمیش ئیتر خۆ دیارە: چەتەکان هەرچۆنێکی بێ خۆیان بە کون و کاژێراندا کردبوو و دەستی گەردوونیش نەیاندەگەیشتێ...

زۆر کەس بەڵای ئاوایان بەسەر هات. ئێمە، نەخێر.

سەرت نەیەشێنم، دارستانەکە فەوتا. دارەکانیان بڕی و لکوپۆیان لێ پەڕاند و کەڵەکەیان کردن و خستیاننە سەر عارەبانەی گەورەگەورە و بردیاننە شاری. ئەو دڕووەڵانەشی لە جێی شین بۆوە کە

لەوانەیە ئاخری ببێتەوە دارستانێکی وەك ئەوی جاران. کە دارستانەکە نەما، چەتە و ڕێگریش خۆبەخۆ نەمان. ناتوانن خۆیان لە کێڵگەی گەنمەشامی و گەنمەجاڕاندا بشارنەوە، یان شوێن پێی خۆیان بسڕنەوە.

گیایەکی زۆر دڕنینەوە و لەسەر یەك کەڵەکەی دەکەین و شوێنێکی خۆش بۆ حەسانەوە و پشوودانی خۆمان دروست دەکەین، ڕێك وەکوو دۆشەگ.

ئەمشەو ئاڤێندرێ سەردەستەمانە. بە لەبزێکی فەرماندەرانەوە دەڵێ:

ـ بنەماڵەی بانێئاسا دوای هەموو کەس گەنمەشامیی خۆیانیان چاندووە، دیارە زۆر ڕەق نەبووە. دەی بڕۆن بزانن چۆنە، جا کە گەڕانەوە دەبێ کۆش و باغەڵتان پڕ بێ لە گەنمەشامی.

دەچین و خۆ بە نێو گەنمەشامیدا دەکەین. گەڵاکەیان خشەخشی دێ. خشەخشی دێ چونکە ئێمە خۆیان لێ دەخشێنین و خشەیان دێ چونکە با لێیان دەدا.

بە نینۆك گەنمەشامییەکان ڕێك دەگوشین و دەنکەکانیان تاقی دەکەینەوە و لێ دەکەینەوە. ئەگەر دەنکیان ڕەق بووبێ ئەوا وازیان لێ دێنین و دەچینە دەستەی یەکی دی.

تەڕەساڵ بووە و گەنمەشامی زۆر و باشە. خوا بەزیادی بکا و بەرەکەت بخاتە بەربوومی ئەمساڵەوە فەرمانی سەرۆك جێبەجێ کراوە: کۆشمان دەکەینەوە و گەنمەشامی لەبەردەم ئاڤێندرێ هەڵدەڕێژین. مانگ، وەکوو کەوانێك لە لای بلیتۆرییەوە هەڵاتووە و جار بە جار بەرزتر دەبێتەوە. لایەکەی دیکەی مانگ هەر پەڵەپەڵەیە، دەڵێی یەکێك بە پێڵاوی پیسەوە چووەتە سەر دەموچاوی. تریفەکەی کز و تارە. ئاسمانی پاییزان ساماڵە. ئەوەندە ساوە، دەڵێی شووشەیە. کەشکەڵان سپپیە و ئەستێرەکان رادەخوشن.

ئاڤێندرێ دیسان ئەمر دەکاتەوە:

ـ جا ئەمجار بڕۆن وشکەڵ و کۆتەرەدار بێنن.

لەو زەوی و زارەی دوێنێ و پێرێ ئەسپەکانمان تێدا لەوەڕاندوون، بڵاو دەبینەوە. لە هەر جێیەك دوەنێکی وشکمان بەرچاو دەکەوێ، دادێینەوە و هەڵیدەگرینەوە، لە تەنیشت گەنمەشامییەکانەوە تەمبارێکی دیکەی دڕوو و وشتراڵوو و دەستەچیلە هەڵدەچنین.

ئاڤێندرێ دەسرەکەی لە بەرپشتوێنی دەردێنێ. بەردوئەستێکەی لە لۆیەکی دەسرەکە پێچاوە.
چەخماخ لێ دەدا. پزیسکەباران. پزیسکەکان فتیلەکە دەگرن. لە پێشدا دووکەڵ هەڵدەستێ و دوایی دەبێتە گڕ و بڵێسە. ئێستا ئیتر دەڵێی ئاگرەکە باڵی گرتووە. هەموو لە دەوری کۆ دەبینەوە. لە لای بلیتۆری ئاگری دیکەش دەکرێنەوە. دوو، سێ ، چوار... لەلای کاراڤێنێتزیش هەر وا. دەستە و پۆلی دیکەش کوڕی هاوتەمەنی ئێمە ئەسپەکانیان بردووەتە لەوەڕگە. رێك وەك منداڵەکانی گوندەکەی مە. بە دڕووەڵانەکەدا دەگەڕێین و شووڵکی شووش دەبینینەوە و وەك سیخی لێ دەکەین. لە قوونی گەنمەشامییەکانی رۆدەکەین و لەسەر ئاگرەکە رایدەگرین و بەردەوام وشکەڵێش دەخەینە سەر ئاگرەکە.
هەشت کەسین. چل گەنمەشامیمان برژاندووە و جوان و زەریف لەسەر یەکمان داناون. دەست دەکەین بە خواردن. ئاڤێندرێ دابەشیان دەکا. پانزەیان بۆ خۆی گل دەداتەوە. هیچ شتێك هێندەی گەنمەشامیی داغ کە زار بسووتێنێ، خۆش نییە. دەنکەکانی شیردار و شیرنن. زگت پێی با دەکا. تینوێتی هرووژمت بۆ دێنێ. بۆ ئاوخواردنەوە دەبێ بچینە کانییەکەی ئەوسەر ئەوسەر. کانییەکە لە خوارەوەیە، لە تەختی شیوەکەدایە. دار بووزێك لەسەر کانییەکەیە. چەند ساڵان لەمەوبەر یەکێك کۆتەڵێکی پێوە هەڵواسیوە. لە پێشدا بریقەدار و جوان بووە، دواتر باران کاڵی کردووەتەوە و خۆڵەمێشیی هەڵگێڕاوە و جرِوجانەوەر هێڵی کەسك کەسکیان پێدا هێناوە. مەسیحی داماوی رەقەڵەیان لەو بانە نەك لە خاچ داوە بگرە هەر چۆڵەپێچیشیان کردووە.
ئەوەندە ئاو دەخۆینەوە تا زگمان وەك مەشکەی لێ دێ.
تۆتانۆ و گانگۆ لەبەر ئاڤێندرێ دەپاڕێنەوە:
کاك ئاڤێندرێ، ئە ئە ئەی ئەم م م شەو ش ش شووت تی نا خ خ خۆین؟
ـ ئەگەر بێن، بۆ ناخۆین.
دەبێ بە بارگینەوە خۆمان بە بێستانەکاندا بکەین و ئەگەر ئەو سەگبابانەش خۆیان لێ مات دابووین، ئەوا بتوانین بۆی دەربچین.

ئاڤێندرێ خۆی تێلایەکی زلی بەدەستەوەیە. ئێمەش هەر کامە و شوولکێکمان پێیە بۆ لێخوڕینی بارگینەکەمان. بۆ شووتی دزین دەبێ تێلای باشت پێ بێ. ئاڤێندرێ چەقۆشی پێیە. بەو چەقۆیە داردەست دەبڕین و ئێمەش دارمان پێ دەبێ. خۆ دەخەینە سەر پشتی بارگینان و بەرەو بێستانەکان غاریان دەدەین. من و ئیتزیۆکۆ ئاگامان لە بارگینەکانە و هەردووکمان رەشمەیان دەگرین. چواریان بە دەست منەوە و چواریشیان بەون. بارگین هێمنن. ناحیلێنن. کوڕژن ناکەن. هەلمی کونە تفنیان وەدەموچاوم دەکەوێ. کوڕەکانی دی بە دوای ئاڤێندرێ دا خۆی بە نێو دەوەن و بڕکەکاندا دەکەن. بە زەحمەت دەیانبینی جوولەیان دێ. سەرەدەرزییەکیش چییە لە هیچ ناترسین. نە دەنگی بنیادەممان گوێ لێ دەبێ و نە حەپەی سەگێك. وەك کەس لەسەر بێستان نەبێ. دەتوانین بە کەیفی دلمان تا زگمان دەلێ بەسە شووتی و کالەك بخۆین. خولەکێك نابێ ئەو هەمووە گەنمەشامییەمان خواردووە، کەچی ئێستا زگمان قووڕەیەتی.

شەوێکی ئەنگوستەچاوە. کەوانەی مانگەکە پتر هەلکشاوەتە نێوەندی ئاسمان، هەر وا تاریك و پڕ پەلەیە. زیکە و جیکەی مێروو و جڕوجانەوەر دنیای داگرتووە. دەستەیەك دوڕنا بەرز بەرز لە حەوێقی ئاسمانەوە دەنگیان دێ. هەر دەلێی بنیادەمن دەنالێنن.

لە پڕ دوو برووسکە هەلدەبن و دوو گرمەی تەقینەوە جەرگی شەو دەدڕێ. کالەك دز دوو قاچی دیکەش قەرز دەکەن و جا وەرە هەلێ. هەلێتی لاقە قوونە نەجات بدە.

پێنج تارمایی بۆمان دێن.

ـ بۆ لێم دەدەی سەگباب؟

ـ ئەی بۆ لێت نەدەم بێناموس، ئەی بەتەما نەبووی بمکوژی؟

دەنگی نووزەیەك دێ. وەك چۆن بە تێلایەك لە جەوالە کا بدەی و ئیدی ئەو نووزەیەش نەما.

ئاڤێندرێش دەگاتێ. هیچ پەلەی نییە. باوەشێکی شووتی و کالەك پێیە.

ـ هۆ کوڕینە، ئەی کوا شووتی و کالەکتان؟

ـ حەی، خۆ هەموومان فڕێ دان بۆ ئەوەی بتوانین قوتار بین.

ـ جا بە گونمەوە. ئەگەر لەبەرم مایەوە جا بە قوزەلقورتی بکەن.

لێی سواری بارگینان دەبینەوە و دەچینەوە لای ئاگرەکەمان. هێشتا تەواو نەکوژاوەتەوە. دیسان دەوەنی بەسەردا دەکەینەوە و دەیگەشێنینەوە. بڵێسە هەڵدەستێ و تاریکییەکە دەڕەوێنێتەوە. ئەوەی ئاڤێندرێ دزیوێتی، قەرەخرچەیە. سەوز و تاڵ. بە چەقۆ لەتیان دەکا و قەپاڵێکیان لێ دەدا و بەسەر شانیدا تفی دەکاتەوە. شووتییەکانیش هەموو بڕکەمردوو و بێکەڵکن. هیچ کامیان لە شەمامەیەك گەورەتر نین. ئەوانیش بۆ خواردنێ نابن. فڕێیان دەدا.

بارگین دەڵێی دەست و پێت بەستوون بە دەورماندا هەڵدەخولێن.

لەسەر نوێنە گیایەکەمان رادەکشێین و کڵاوەکەمان دێنینە سەر چاومان.

ئاڤێندرێ پرخەی رۆژەڕێیەك دەڕوا.

*

*

*

گوندەکەی ئێمە دادگای لێ نییە. خۆ ئەگەر راستیت دەوێ لە دایرەی پۆستەو گەیاندن و وێستگەی شەمەندەفەر بترازێ هەر هیچی لێ نییە.

دادگای ئاشتی، دوو گوند لەولاوەتر لە کارلیگاتزییە. لە سەرووی چۆمی کالماتزۆیی. پێم وایە قازییەکەشی حەفتەی جارێك دێتە گوندەکەی ئێمە بۆ دادوەری. لە نێو قایمقامی.

قازی بە گالیسکە دێ. سکرتێرەکەی ناحیە پەروەندەکان لەسەر مێزەکە هەڵدەچنێ. لێرە تەنیا کێشە ئاساییە سووکەکان چارەسەر دەکرێن: مریشکدزین و مەڕدزین و تێهەڵدان و شەڕی نێوان بنەماڵەکان و هەندێ جاریش وردەکێشەی مڵك و ماڵ... سکاڵا گرینگەکان دەنێردرێنە شاری تۆرنۆ.

قازییەکە گەنجێکی کەم تەمەنە و قژێکی خورمایی جوانی هەیە. ژنەکەی ناوی ئاگریپپینایە، کە ژنەکانی ئاوایی پێی دەڵێن پیپپینا.

کاری قازی هەر ئەوەندەیە. دەڵێن سندووق سندووق کتێبی بۆ دێ و وەختێك سەری سووك دەبێ، وەك شێتان هەر سەری لە کتێباندایە. رۆژ تا ئێوارێ ئەوە کارێتی. دەڵێن سندووق سندووق کتێبی بۆ دێ

و کاتێك دادگایی و شتی نییە، بەردەوام وەك شێتان سەری لە کتێباندایە و رۆژ هەتا ئێوارێ کاتەکانی ئاوا دەڕۆن.

لە بری دادگاییکردنی تاوانبار و کەتنکەران، سەرکۆنەیان دەکا. بەو دەنگە ناسك و میهرەبانەی لێیان دەپرسێ:

ـ دەی باشە، کێ سکاڵای هەیە.

میرزای قایمقامی، کە لەو دەمەدا بووەتە سکرتێری دادگا، وەڵام دەداتەوە:

ـ گۆگۆلینکا.

ـ سکاڵای لە کێیە؟

ـ ستوێنێسکۆن.

ستوێنێسکۆن ناوی راستەقینەی ئاڤێندرێیە. دیارە شۆرەتەکەیەتی. ناوی خۆی نیکۆیە.

ـ چیی کردووە؟

ـ مریشکی دزیوە.

لینکا و ئاڤێندرێ دەچنە پێشێ. خەڵکێکی زۆر لە دەوری قایمقامی کۆ بوونەتەوە.

ـ کوڕی باش، بۆچی مریشکی ئەم کابرایەت دزیوە؟

ـ عەرزم بە حزوورت... جەنابی قازی...

ئەو هەتیوە، ئەو ئاڤێندرێ تووتکەسەگە قەت کلکی بە تەڵەوە نابێ. لەولاشەوە، سکاڵاکەرەکانی هیچ بەڵگەیەکیان نییە. سکاڵاکە هەر بە گومان و گریمانە دەکرێ و دیارە بەبێ بەڵگەش ناکرێ مەحکوومی بکەی. ئاڤێندرێ کەسێك نییە وا بە ئاسانی تێ بکەوێ. تەنیا مەترسیی ئەوەی لەسەرە، مێلۆچێلی پۆلیس لە کاتی سکاڵانووسینەکەدا، دوو مستەکۆڵەی لەسەری بدا.

چیۆکۆاشا دێننە پێشێ. ئۆنتۆریکای دایکیشی بە دوویەوەیە.

چیۆکۆاشا پیرەژنێکی پشتکووڕە، کە حەفتا ساڵی رەبەق ژیاوە. منداڵەکانی بە کچ و کوڕەوە سەرلەبەر مردوون و هەر یەکی ماوە. هەر هەمووشیان بە سیل. مێردەکەشی مردووە. ئەویش هەر بە سیل مردووە. هێندەش لە مێژە، کە چیۆکواشا هەر لەبیریشی نەماوە.

چیۆکواشا خانوویەکی جوانی هەیە بەرامبەر قایمقامی، مەڕ و ماڵاتێکی زۆریشی هەیە، زۆریشی کلْفەت و نۆکەر هەیە، چەند رەز و باخی هەیە، زەوی و زاری هەیە، بەڵام دایکەکەی، کە وەك مامەگیان بۆردۆلیٚ سەد ساڵێکی تەمەنە، لەو سەری حەوشەکە، لە کەلاوەیەکدا دەژی.

چیۆکواشا دایکی داوەتە دادگا. شکایەتی لیٚ کردووە. پیرەژنەی سەدساڵان سامانێکی باشی هەیە، بەڵام میراتگرەکەی ئەو تاقە کچەیەتی. بەڵێنی داوەتیٚ کە مرد هەموو زەوی و زارەکەی بەو ببڕیٚ، بەڵام کچەکەی ئەو گفت و بەڵێنانەی بەگوێدا ناچیٚ. دەڵیٚ هەر ئێستا دەبیٚ زەوی و زارەکەم بەناو بکەی، ئەویش بە سەنەد و تاپۆ و دەبیٚ قازیش بنی مۆر بکا.

پارێزەری دادگا کچەی فێر کردووە دایکی بێنێتە دادگا. ئاخر، هەر دادگایەك پارێزەرێکی لەبەر دەرگەیە، کە بەردەوام لەویٚ دەخولێتەوە.

وەك چۆن پەپوولە بەدەوری مۆمدا دەخولێتەوە.

پارێزەرەکەی دادگای کارلیگاتزی ناوی ڤیکاگیورکێگەسکۆیە. بەردەوام داو دەنێتەوە و، تەپکە دادەخا و پاشقولی خەڵکی دەدا و خەڵك تێك بەردەدا و کێشەیان بۆ دەنێتەوە و شەڕ هەڵدایسێنیٚ و فیتنە دەگێڕیٚ بۆ ئەوەی شکایەت لە یەکتری بکەن... دیارە هەندیٚ کەس گاڵتەی پیٚ دەکەن و دەڵێن:

ـ تێکمان بەردەدەی بۆ ئەوەی پووڵمان لیٚ بخۆی.

بەڵام زۆر جاریش فێڵەکەی سەر دەگریٚ. خەڵك پێی دەخەڵەتێن. سکاڵا بەدوای سکاڵادا دەدەنە دادگا.

پارێزەرەکەی ڤیکاگیورکێگەسکۆش بەردەوام هەر کابرایەکە بەناوی ئۆڤیدئۆرسۆ. خەڵکی رەوشیدەودێیە. دوو پارێزەرەکەی دادگا وەك دوو نەناس لێك چەپ و چیڕ دەبن و وەك دوو سەی هار تێك رۆ دێن و جنێوان بە یەکتری دەدەن و هەڕەشە لە یەکتری دەکەن. هەر لە خۆڕا لێك رادەسێن و یەکێکی نەیانناسیٚ، پێی وا دەبیٚ هەر ئێستا لە سەروگوێی یەکتر دەدەن و بابی یەکتر دەگێن، بەڵام

هەر دادگاییەکە تەواو کرا و قازی خۆی خزاندەوە ماڵەکەی، وەك دوو برادەری لەمێژینە دەست لە نێو دەستی یەك دەنێن و دەچنە کافتریاکەی ئەوبەری دادگا و بە بۆکۆرەی کافتریاچی دەڵێن دوو سێ فرووجیان بۆ ببرژێنێ و قازێکیان بۆ بکاتە کەباب و جا تا زگیان هەڵدەگرێ دەلەوەڕێن.

دەڵێن چییان دەست بکەوێ بەشی یەکتر دەدەن. زۆریش ڕێی تێدەچێ. هەر خوا دەزانێ چییان لەبن سەریدایە و چەندە بەدەهۆن. هەر شتێك بێ، ئەو دۆیە هەر قابیل بەو دۆدانەیەیە.

ڤیکاگیۆرکیێگەسکۆ و ئۆڤیدئۆرسۆ، زۆڵ و تۆرەمەی جووتە قەشەیەکن. هەر هەموو پارێزەرەکانی دادگای کوڕە قەشەن.

ـ ژیانیان تێر و تەسەلە.

ـ ئەی قەشەکان؟ بۆ ژیانی قەشەکان خراپە؟

ـ ئەوە قسەی تێدا نییە. بەڵام پارێزەرەکان پاروویان چەورترە. ئەم خەڵکی خوایە تێك بەردەدەن و جا ورە عەریزەیان بۆ دەنووسن و بە ڕۆژی ڕووناك و لەبەر چاوی عالەم و ئادەم گیرفانیان دەبڕن. قانوونیان تایبەت بۆ ئەوانە داناوە. قازانجەکەی قانوون لەوەدایە کە گیرفانی پارێزەرەکانی دادگا پڕ بکا و سفرە و خوانیان برازێتەوە... ئەگینا قانوون چ دڕکێکمان لە قەلبی دەردێنێ؟ خۆ هیچ دەسەڵاتیشمان نییە.

ڤیکاگیۆرکیێگەسکۆ کوڕی قەشەکەی باڵتاساراتایە. دادگای کارلیگاتزی شەشدانگ هیی ئەوە. لە بەردەرگا بۆسە بۆ خەڵکەکە دادەنێتەوە و لە داویان دەخا و دەپرسێ:

ـ مامەگیان شکایەت لە کێ دەکەی؟

ـ لەگەڵ براکەم قسەمان لێك هەڵبەزیوەتەوە، بەشەڕ هاتووین و سەری شکاندووم. ئەوەتا بڕوانە... منیش ئەوە هاتووم شکایەتی لێ دەکەم.

ـ زۆر باشە. خۆم یارمەتیت دەدەم. ئەگەر حەز دەکەی هەر ئێستا لە تەویلەی دەکەم با بینێرنە بێگاری و ئەوەندە ئارەقە بکا، تا پەراسووی نەرم دەبن.

ـ ئەوە دەڵێی چی؟ چما دڵم دێ برام پەراسووی نەرم بێ؟ خوا نەکا، کۆشێك منداڵی هەیە.

ـ تەح، جا خۆ دیارە. چما بنیادەم وا سووك و ئاسان پەراسووی نەرم دەبن؟ قسەیەك بوو كردم. مەبەستم ئەوەیە، دەتوانم وای لێ بكەم، چارەگێك ناخۆشی ببینێ، تا جارێكی دیكە نەخەڵەتێ و بێ ئەدەبیی وا نەكاتەوە. یانی لەبیری نەچێتەوە.

ـ بۆ لە بیری نەچێتەوە؟ بۆ چارەگێكی ناخۆش لێ بگوزەرێ؟ چما تۆ دوژمنایەتیت لەگەڵی هەیە؟ ئێمە دوو براین و تۆزێك قسەمان لێك هەڵبەزیوەتەوە و وەك دوو براش ئاشت دەبینەوە... هەڵبەت بەو مەرجەی بۆم تێ هەڵبێنێتەوە...

ـ ئەی لەوە، یانی زیانیشی لێ داوی؟

ـ ئەی سەرمی نەشكاندووە؟ شكاندوویەتی دەی. بۆیە منیش ناچار بووم بچمە لای دكتۆر كە كاغەزم بداتێ بەڵێ سەرم شكاوە. دكتۆریش خۆ قەرز و مەرز نازانێ. جگە لەوە، پارەی كاغەز و پوولیشی هاتووەتە سەر.

كورتی ببڕینەوە، گوندیی ماڵوێران خۆ لە ئاسمانیش بدا، ڤیگا بەرۆكی هەر بەرنادا تا بۆی نەبێتە پارێزەر. رۆژی دادگاییەكەیان بۆ دیاری دەكەن و واش باوە كە هەموو جارێك دوای دەخەن و دەیخەنەوە جارێكی دی.

كابراش لە ترسی ئەوەی نەكا لە نەكاو چەند مانگێك زیندانیی بۆ ببڕنەوە و لەسەر شتێكی خۆڕایی چەند ساڵێك لە زیندانێی توند بكەن، بلێی و نەلێی ئەویش دەكەوێتە داوی پارێزەرێكی دیكەوە.

كێشەكەی برایانی دریمبا كە تێكیان هەڵدابوو، ئەو دوو پارێزەرەی پێ خەنی بوو. پاش ئەوەش بوو كە ئیتر خەڵك بەجارێ رووی تێ كردن.

ڤیكاگیۆركێگەسكۆ بۆ ئەوەی لای بریگرتەكانی بیسەلمێنێ پیاوێكی گرینگە، پێش هەموو شتێك لە ئاوەدانییەكەدا خانوویەكی باشی كڕی و بەدوای ئەوەشدا پەیتوونێكی دوو ئەسپەی كڕی.

دادگاییە قورسەكان دەبەنە دادگەی كارلیگاتزی، بەڵام لە درێژایی حەفتەدا قازی بە ئاواییەكانی ناحیەكەدا دەگەڕێ. ناحیەكەی ئەویش دە گوندی لەسەرە. دەگەڕێ بۆ ئەوەی شەڕ و دەمەقاڵە بچووكەكان هەر لەوێ ببڕێنێتەوە.

ڤیکاگیۆرکیٚگەسکۆ، دادگایی هەبیٚ یان نا، هەر وا بەدووی قوونی قازییەوەیە و لەم گوندەوە بۆ ئەو ئاوایی بۆ ئەوەی خۆی نیشانی خەڵکی بدا و بە خەڵکی بڵیٚ ئەگەر پیٚویستیان بوو، خۆ بە کلکی کیٚوە بگرن.

بە هەر جیٚیەکدا رادەبریٚ، خەڵکەکە سرتوخورتیان تیٚدەکەویٚ و دەڵیٚن: ئەها، ئەوەیە، پاریٚزەرەکەی باسی دەکەن.

ئیٚستا ئیتر منداڵەوردکەش دەیناسن.

سەگی سەگباب کڵاوەکەی هەڵدەگریٚ و راست و چەپ چاکوخۆشی لەگەڵ ئەو خەڵکە دەکا.

کە دەگاتە ژنیٚکی تۆزیٚك لەخۆگەڕاوە، دەڵیٚ: دەستەکانت ماچ دەکەم دایەخاتوون، دەستی مبارەکت ماچ دەکەم.

جاریٚکیان دایکە دیۆئاییکا، مامانەکەی ئاوەدانی لیٚی مۆڕ بۆوە و گوتی: "تۆ"؟ دەستی من ماچ بکەی؟ تۆ ئاغایەکی وا گران و گەورە؟ چما لە سەرت بدەن کاری وا دەکەی؟ کەواتە بۆ قسەی وا دەکەی؟ نا رۆڵە گیان، دەستی من هیی ئەوە نین تۆ ماچیان بکەی، من ئەوانەم بە کوزی هەزاران ژنی ژانگرتوودا کردووە.

هەرچۆنیٚك بیٚ زۆری نەبرد، دەخیلەکەی جەنابی پاریٚزەر پڕ بوو و لیٚورِیٚژ بوو. بە هەموو لادا دەنگۆ داکەوت کە دەیەویٚ هەندیٚ زەوی و زار بکڕیٚ. لە هەر جیٚیەك بستۆکە زەوییەك پەیدا بوایە، جا کیٚڵگە بوایە یان بەیار، نزیك یان دوور، دەستی لەسەر دادەنا و دەبووە خاوەنی. جا ئەوانەی عەریزەیان پیٚ دەنووسی و ئەوانەی عەریزەشی لەسەر دەنووسین، بە خۆڕایی و هەرەوەزی لە زەوی و زارەکەیدا ملیان لە کار نا.

ـ خەڵکی کویٚی باوکەکەم؟

ـ خەڵکی باکالشتیم رۆڵە.

ـ دەتەویٚ بەرگریت لیٚ بکەم؟

ـ ئەی چۆن نامەویٚ رۆڵە گیان.

ـ دەبیٚ دوو سکەی بیست "لیٚ"یم بدەیەی بۆ عەریزەیەك.

ـ باشە رۆڵە، بەو مەرجەی لەو بەڵایەم رزگار بکەی.

ـ خەمت نەبێ نا... دەی باشە، چیت کردووە؟

ـ من هیچم نەکردووە. نەگبەتییە و شانی بنیادەم دەگرێ. من ئیدی لەو تەمەنەدا نیم، بە چاك و خراپ شتێکم لەدەست بێ. من ئیتر پیر و کەنفتم.

ـ ئەی چی؟

ـ ئەمە کچمە.

کچۆڵەیەکی ئەسمەری وردیلە لە تەنیشت پیرەوە راوەستاوە و نانەبەرەیەکی بەدەستەوەیە و پەیتاپەیتا لێوی دەگەزێ.

ـ کچەکەت چیی کردووە؟

ـ لێت نەشارمەوە، ئیدی کچ نییە، ژنە، مێردی کردووە.

ـ ئەی تەڵاقی دەوێ؟

ـ نا، مەسەلەی تەڵاق لەگۆڕێ نییە. کە بۆت باس بکەم دەزانی چییە. کە بەمێردمان دا، قەباڵەمان وەرنەگرت. یانی دەرفەت نەبوو وەشوێن قەباڵەکەی بکەوین. ئێستاش مێردەکەی ماڵ و حاڵی جێ هێشتووە و رای کردووە.

ـ ئەها، دەی ئەوە چ نییە نا.

ـ هەر ئەوەندە نییە... ئاخر دەزانی چییە؟ کچەکەم دەڵێ مێردەکەی پیاوەتیی نییە و حەز ناکا لەگەڵ مێردێکی وا بژی. بەجێی هێشتووە و سیپاڵەکەشی لەگەڵ خۆیدا هێناوەتەوە.

ـ شتومەکی خۆی؟

ـ ئا ئا، ئی خۆی، ئەی چی؟ بەڵام، ئیدی، کابرای مێردی ئاگری گرتووە و کە دەبینێ لەوانەیە ببێتە گەپجاڕی خەڵکی ئاوایی، بوختانێکی بۆ هەڵبەستووە. گوتوویەتی کچەکەم شتومەکی ئەوی دزیوە... وایە رۆڵە؟

ـ بەڵێ بابە.

ڤیکا تۆزێك رادەمێنێ و ئاخری دەڵێ:

ـ زۆر لەوە خراپترە کە بیرم لێ کردبۆوە.

ـ یانی ناتەوێ لەسەرمان بکەیەوە؟

ـ دیارە دەمەوێ بەرگریت لێ بکەم. مەبەستم بەرگری لە کچەکەتە.

ـ "کچ"ـی چی ئاغا کیان، کام کچ؟ خۆ عەرزم کردی ژنە و ئیدی کچ نییە. چونکە شووی کردووە. راستە مێردەکەی پیاو نەبووە و نەیتوانیوە هیچی لێ بکا و هەر وا بە کچێتی باروبوخچەی هەڵگرتووە و هاتووەتەوە، بەڵام هەرچۆنێکی لێکی بدەیەوە بەمێردە.

ـ تێگەیشتم، ئیدی لەبیرم ناچێتەوە. دەی باشە من دەبمە بریکار و پارێزەری ئەو ژنە. بەڵام پارەی زیاتری تێدەچێ.

ـ پارە؟

ـ پارە.

ـ دەی وەڵا لەوە پترم نییە.

ـ ئەی گات هەیە یان نا؟

ـ هەمە.

بەڵام لە ناکاو رادەچڵەکێ و هەنگاوێك دەکشێتەوە:

ـ باشە ئەوت بۆ پرسی؟ خۆ ئیشەڵا بەتەما نی گایەکانمت بدەمێ؟ گایەکانم بە دەماری گیانمەوە گرێدراون. دەی من بەبێ ئەوان خۆڵی کوێ وەسەر خۆم بکەم؟ جا خۆ گوندی گاجووتی نەبێ، پشت و پەنای نییە. ئیدی کاری بۆ ناکرێ. رێك وەك ئەوە وایە گۆد و ئیفلیج بێ. رێك وەك ئەوەیە نقوستان بێ. ئەگەر قەرار بێ گایەکان دانێم، هەر وا باشترە کچەکەم بنێرمەوە لای مێردە بێ گونەکەی.

ـ باوکم بەخوای بەلای تۆدا هەر نایەمەوە. ئەگەر دەتەوێ بمکوژی دەی بمکوژە و تەواو، بەڵام بەولایەدا نایەمەوە.

ـ ئەی هاوار، لە خۆوە دڵی خۆت توند مەکە مامە گیان. کێ ویستوویەتی گایەکانت لە چنگی دەربێنێ؟ هەر بەراستی پێت وایە من دڵ و دەروونم نییە؟ ئەگەر وا بوایە بۆ لە ئاوایی دەمامەوە؟ ملی رێگەم دەگرت و دەچووم لە شاری دەژیام مامە گیان. جا بۆچی عومری خۆمم بەفیڕۆ دەدا؟

ئیدی بۆ لەم گوندە تووکلێکراوەدا دەمامەوە و ژینی خۆمم دەسووتاند؟ کە لێرە ماومەتەوە، هەر بۆ ئەوەیە بتوانم بە ئێوە رابگەم، بارێکتان لەسەر شانی سووك بکەم، یارمەتیدەرێکتان بم وەختێك رێتان دەکەوێتە دادگا. من دڵم نایە بەچاوی خۆم ببینم ئەو قازییە گەوادە لەسەر هیچی خۆڕایی لە زیندانتان بکا... دەی باشە، گوتت خەڵکی کوێی؟

ـ باکالشتی.

ـ گاسنێکی وات هەیە بەکار بیّ؟

ـ ئەو جار لە گاسنەکەمت هەڵکێلاّ؟

من لە باکالشتی بستە زەوییەکم هەیە. لە سترۆی ماڵفرۆشم کڕیوە.

ـ بەڵێ بەڵێ بیستوومە، هەر ئەو مڵکە ماڵفرۆشەی لە لای گردەکەیە. ئەوەی کوێی بستە زەوییەکە؟ مڵکێکی تەواوە.

ـ جا ئەگەر حەز دەکەی ناوی بنێ مڵکێکی تەواو، بەڵام لە بستۆکەیەك پتر نییە.

ـ یاخوا تا هەی خێری لێ ببینی رۆڵە. خاکەکەی زۆر بەڕێژەوە: چەور و نەرمە وەك رۆنی کەرە. زەویی منی ماڵوێران هەر هەمووی چەقەنە. گەنمی لێ دەچێنین، زیزانەی لێ شین دەبێ. میراتی خەسوومە بۆمان ماوەتەوە، یاخوا ببێتە عەزابی گۆڕەکەی.

پارێزەرەکە دێتەوە سەر قسەکەی خۆی:

ـ بەڵێ، باسی زەوییەکەمم دەکرد. لە باکالشتی. دەی باشە، من بە ئەمری خوای گەورە کێشەکەی ئەو کچۆڵەیە...

ـ کچ نییە کاکە، ژنە، چونکە ...

ـ بەڵێ، بەڵێ دەزانم، دەزانم مێردی کردووە.

ـ بە قوونڕووتێکی ماڵبەکۆڵ.

ـ دەی باشە. من لەو زەلکاوەی رزگار دەکەم. لە بری ئەوە تۆیش دوو دراوی بیستیم دەدەیتێ.

ـ دەی خۆ من گوتم دەتدەمێ.

ـ دەی هێشتا ماوە. کارێکی دیکەشم دەبێ بۆ بکەی. ئەوە پارەی پوول و شتەکانە. من بۆ نووسینی ئەو عەریزەیە ئارەق دەڕێژم و پێیەوە ماندوو دەبم، تۆش مامە گیان لەسەر ئەو بستۆکە زەوییە ئارەقەی نێوچاوان دەڕێژی. دەیکێڵی و، ئینجا من خۆم تۆوەکەی بۆ دێنم و دەتدەمێ و دواییش دەیدووریبیەوە و بەرهەمەکەیم بۆ دێنی. کایەکەشی بۆخۆت. یانی مەبەستم ئەوەیە، لە بری کایەکەشی دوو کوودەڵەم بدەیە.

ـ جا خۆ بشمکوژی، لە دوو کوودەڵە زیاترم نییە.

ـ دەی جارێ ئەوە باشە. تا هاوینێ خوا لەسوڵتان مەحموود گەورەترە. خوا گەورەیە، بەرازەکەت جارێکی دیکەش دەترەکێ.

ـ ناوەڵا، تۆوی براوەتەوە.

ـ بۆ پیر بووە؟

ـ نەخێر، نەماوە.

ـ کوشتووتە؟

ـ نا، لە گڵم ناوە. لاڕەشەی بەرازی گرت و پێی مرد. بەخوا نووشتەشم بۆ نووسی. گوێچکەیشیم کون کرد و فتیلەم کێشا. لە خۆوە. هەر زەحمەتی خۆڕایی بوو، ئاواش هەر مرد.

ـ دەی بەڵاگێڕەوە بێ.

ـ چیت فەرموو؟

ـ گوتم بەڵاگێڕ بێ، خەفەتم لێ خوارد.

ـ جا خەفەتی بۆ لێدەخۆی رۆڵە؟ ئەگەر نەشمردبایە، چ تەوفیرێکی بۆ ئێوە هەبوو؟ چونکە وەختێك مرد، مالینا هێشتا هەر قولانجێك دەبوو و نەدەبوو.

ـ مالینا کێیە؟

کچە هەڵدەداتێ و دەڵێ: مالینا منم.

ـ یانی گاڵتەمان پێ دەکەی مامە؟ دوو دراو و دوو کوودەڵەمان دەدەیتێ و من مالینات بۆ رزگار دەکەم. کارەکەی زۆر زەحمەتە. تۆمەتی دزێتیی بۆ هەڵبەستراوە. چیم لەدەست بێ دەیکەم بۆ ئەوەی

به قازانجی تۆ بشکێتەوە. لەبری ئەوە، تۆش کاری ئەو بستە زەوییەی من دەکەی. کایەکەشی هەڵدەگری بۆخۆت.

ـ جا خۆ زەوییەکە چوار دۆنمە.

ـ دەی خۆ دادگاییش وا سووك و ئاسان نییە، مەسەلەی دزێتییە.

ـ باشە رۆڵە، زەوییەکەت لە ئەستۆی خۆم.

لەو دەوروبەرانە گوندێك نییە، کە مەحامی لەوێ بستە زەوییەکی نەبێ. تەنانەت لە دەم ئۆلتیش دارستانێکی کڕیوە. پارەی بە ریباش دەدا. سوودێکی زۆر لەو داماوانە وەردەگرێ کە حەوجێیان بە پارە دەبێ. ئەو مەیخانەیەش کە رووبەڕووی دادگای کارلیگاتزییە و ئاوا رمێنی هەیە و بەرناکەوێ، هەموو دەزانن هیی ڤیکارگیۆرکێسکۆیە. ئەوەی کە لە تابلۆکەی نووسراوە:

| مەیخانەی گشتی<br>تەرازووی دادپەروەری<br>بە سەرپەرشتیی باربۆکایۆشێ |
|---|

هەموو عالەم، چ ئەوانەی لە "تەرازووی داد"دا پێکیان لێك دەدا و چ ئەوانەی پێیان تێ نەدەنا، سوور دەیانزانی باربۆکایۆشێ هەر بەردەستی پارێزەرە و هیچی دی.

ـ مەشرووبەکەی باشە؟

هەر هیچ نییە. جگە لەوە گرانیشە.

ـ خۆ ئەگەر لە بری باربۆکایۆشێ ناوی خۆی واتە ڤیکاگیۆرکێسکۆی لە تابلۆکە نووسیبایە، مەشرووبەکەی باشتر یان هەر نەبێ هەرزانتر دەبوو؟

ـ نەخێر.

ـ دەی باشە، کەواتە بە ئێمە چی ناوی ئەوی لەسەر نووسرابێ یان ئەم؟

ڤیکا چەناگەی کچە هەڵدێنێ و بە راوێژێکی نەرمونیان دەیدوێنێ:

ـ سەعاتێکی دیکە وەرەوە ماڵێ بۆ لای خۆم، مالینا. دەبێ بۆم لە بنی کوولەکە بدەی. ئاخر دەبێ بزانم دەبێ چۆن بەرگریت لێ بکەم. دەزانی؟ خۆ ئەگەر بزانم هەر بەراستی مەسەلەکە چۆن بووە، ئاسانتر دەتوانم لە دادگادا وای بێنمە گۆڕێ، زوو یەکلا بێتەوە و ئەستۆپاك دەرچی.

ـ دەی باشە، مەسەلەکە هەر ئەوە بوو کە باوکم باسی کرد. بەس سیپاڵەکەی خۆمم هەڵگرتووە و هیچی دی. ئەوەی هیی خۆم نەبووە دەستیشم لێ نەداون.

لەگەڵ ئەو قسەیەدا چڵکی بن نینۆکانی دەردەخا.

ـ هەڵتگرتبێ یان نا، دەبێ بێیە ماڵێ و هەمووم بۆ بگێڕییەوە.

ـ لەگەڵ باوکم؟

ـ نا، بەتەنێ.

ـ دەی باشە با باوکم لەبەر دەرگا راوەستێ. دەزانی... ئاخر دەترسم...

پیرە کەنفت و شەکەت، چووە لە سێبەرەکە هەڵتووتەکاوە و سەبیلەی لێ داگیرساندووە و کڵاوە کەوڵە بەرخەکەی لەسەر ئەژنۆی داناوە. قژە چاکنەکراو و ئاڵۆزەکەی لەگەڵ ردێنە چرەکەی تێکەڵ بووە.

ـ لە چی دەترسی؟

ـ ئەگەر راستیت دەوێ... دەمەوێ وەختێك مێردی دەکەمەوە، هەر کچ بم.

ـ جا بۆچیتە؟ خۆ تۆ مێردێکت کردووە.

ـ راستە. بەڵام وەك نەمکردبێ وایە.

ـ زۆر کەری.

ـ لەوانەیە، بەڵام دەمەوێ هەر وا کەر بم.

ـ دەی باشە، وەرە. هەر باسی ئەو مەسەلەیە دەکەین.

ـ لەگەڵ باوکم دێین. ئەو لەبەر دەرگا رادەوەستێ.

پیرە پرێسکەکەی دەکاتەوە و لەتێك مامالیگای زەرد دەردێنێ و خوێی پێوە دەکا و قەپاڵی لێ دەدا و وردە وردە دەیجاوێ.

ـ ئەی تۆ برسیت نییە مالینا؟

ـ نا بابە گیان برسیم نییە.

عەریزەنووسەکەی دادگا لە بەر دەرگای دادگاوە بانگی سکاڵاکەرەکان دەکا.

پیرە دیسان وەدەنگ دێتەوە ودەڵێ:

ـ ئەمڕۆ ئێمە نۆرەمان نایە، پارێزەر وەختەکەی وەدوا دەدا، بۆ ئەوەی لە پێشدا پووڵەکەیمان لێ وەرگرێ.

گەنجێکی لۆق درێژیش کە سەروبیچمێکی بڵحی هەیە، بە رەنگێکی بزرکاو و ملێکی باریك و درێژ لەبەر دەرکی دادگا چاوەڕێیە نۆرەی بێ. وڕ و کاس دیارە، دەڵێی بە دار لە سەریان داوە. مالینا تاوێك هەر وا چاوی تێ دەبڕێ و لێی ورد دەبێتەوە:

ـ سەیرە، کوڕە تۆ خوا وەرە بزانە من ببوومە ژنی ئەو مردەلۆخەیە، هەر لەبەر ئەوەی ملْك و ئاوێکی هەیە و دەتوانێ تێر زگی خۆم نانم بداتێ. وەیش ئەو دانیلا نازدارەم بە خاتری ئەو گووە بەجێ هێشت. ئێستا ئیتر وام پێ باشترە بەردەخوێ بلێسمەوە و ئاوی بەسەردا بکەم، بەڵام ببمە هاوسەرینی پیاوێك، کە خۆشم بوێ.

ـ تۆزێك بخۆ.

مالینا لە تەنیشت باوکی دادەنیشێ و قەپاڵ لە مامالیگاکە دەدا. بەر لەوەی بۆ دەمی بەرێ، لە لۆی دەسماڵەکە تۆزێك خوێ دەردێنێ و پێی وەردەکا.

ـ دانیلا هەر دەمخوازێ. لەوانەیە هەندێکم تێ هەڵبدا، بەڵام بێ ئەملاوئەولا لێم خۆش دەبێ و دەمخوازێ. دوێ شەوێ دیسان قسەمان کردەوە باوکە، هاتبووە بەر دەرگاکەمان.

ـ مەرجەکەی ئەوەیە، لە پێشدا ئەو کێشەیەمان لەکۆڵ بێتەوە.

گەنجەکە بەگێژ و وێژی بەرەولایان دێ و زاری دادەپچڕێ.

ـ دەی باشە، یانی ئاوا ڤالکۆ... دەمدەیە دادگا...

ـ دەی باشە کراس و شمەکی منت نەدزیبایە.

ـ یاخوا ئەوی داوە دەزووەکی لە ماڵت دزیوە دەستی وەك بەرد رەق بێ. بۆخۆت باش دەزانی من هیچم لە ماڵی تۆ هەڵنەگرتووە. تەنانەت بە مێشکیشمدا نەهاتووە دەست لە شتی تۆ بدەم. ئەوە قسەی گێرفانتە و دەتەوێ گەڕێکم پێ بکەی... ئەی یاخوا ئەو زمانە درۆزنەت مووی لێ بێ ڤالکۆ.

ـ چەندی پێت خۆشە تووك و دوعایەم لێ بکە. من سکاڵاکەم هەر وەرناگرمەوە. ئەوە دەمەوێ لە دادگای بەرزتریش شکایەتتان لێ بکەم... باشە جلوبەرگەکانمت بۆ دزیوە هیچوپووچ؟

ـ جلوبەرگی تۆ؟ کوڕە یاخوا بۆ خاتری ئەولیا و ئەمبیا* ئەو جلوبەرگانە کفنی بەرت بن و ئەوەندە نەڵێی جلەکانم جلەکانم....

ـ ئاخر...

عەریزەنووسەکە بانگیان دەکا. هەر سێکیان دەچنە ژوورەوە بەڵام زۆری پێناچێ دێنەوە دەرێ. گیۆرکێسکۆی پارێزەریش بەدوویاندا.

ـ بۆ پێم نەگوتبوون دادگاییەکە وەدوا دەخەم؟ نەمگوتبوو؟ دیتتان؟ دەی وەرن جارێ با بچینە مەیخانەکەی تەرازووی داد، با پێکی ئارەق بخۆینەوە تۆزێك وەکەیف بێینەوە.

جا لەگەڵ مشتەرییەکانی خۆی دەچێتە نێو مەیخانەکەوە. هەروا خەریکی چەنەوەڕییە:

ـ خوا دەزانێ بۆ ئەوەی لێیان بەرینەوە، هێندەی سەیەك ماندوو دەبم.

ـ ماندووبوونی چی، خۆ هەر دوو سێ قسان دەکەی و ئیدی...

ئاخ کوڕی باش، بە ئاواتەوەم تۆم دیتبایە دروێنە دەکەی.

پارێزەر خۆشی سوعبەتچییە. قاقایەك دەکێشێ و دەڵێ:

ـ دەی باشە، ئەدی. کاری من هەر ئەوەیە کە چەند قسەیەك بکەین. وای دانێ زێڕم لە زاری دێتە دەر: زێڕی بێخەوش... هۆی باریۆ، سێ پێك ئارەقمان بۆ بێنە. بریگرتەکەم پارەکەی دەدا.

لە مەیخانەدا دەرزی هەڵاوێی ناکەوێتە عەرزی. ئەوانەی لە دادگا براوە بوون، لە خۆشیان دەخۆنەوە و ئەوانەی دۆڕاندووشیانە لە داخان.

---

* بە ئانقەست نووسیومە ئەمبیا و نەمنووسیوە ئەنبیا، چونکە کچە نەخوێندەوارە

ـ وا باشتر نەبوو پێك هاتباین؟ ها؟ خۆ ئەگەر هەر لە ئەوەڵەوە خەسارەتەکەی منت دابایە، سەروقوونی کارەکەمان وێك دێناوە.

ـ دامانە باری لاساری و کەللەڕەقی.

ـ شەیتان چووە کلێشەمانەوە و تێکی بەرداین. خۆ ئەگەر راستیەکەیت دەوێ هەر وایە.

پارێزەر دیسان چەناگەی مالینا دەگرێ.

ـ دێی؟

ـ وەك پێم گوتی، لەگەڵ بابم.

پیرە بە سەرسووڕمانەوە دەپرسێ: ئەرێ هەر بەراست تۆ بۆچی ژن ناهێنی؟ خۆ ماشەڵا خانوویەکت هەیە دەڵێی ماڵی شایە، داهاتیشت زۆر باشە و گەنجیشی.

ـ ژن بێنم؟ چما خوا کەری کردووم؟ ژن خەرجی زۆرە مامە گیان. دوای زەماوەندیش تا چاو دەتروو کێنی، سەیر دەکەی ئەوە منداڵ سەرودڵیان گرتووی و... جا وەرە مەمرە لە داخان.

ـ ئەو قەشەیەش، باوکە بەرێزەکەی خۆت . خۆ ئەگەر ئەویش ئاوای لێك دابایەوە، ئێستا چاوە رەشەکانی جەنابت رووناکایی دنیایان نەدەدی.

ـ ئەو زەمان بەسەرچوو مامە گیان. ئەوزەمان بەسەرچوو. ئیتر ئەمڕۆ خەرج و موخاریج پشتی پیاو دەشکێنێ.

دێهاتییەکانی هەموو ئەو ئاوەدانیانەی بەسەر دادگای ناحیەی کارلیگاتزییەوەن، بەرەبەری کۆتایی هاوینێ بە عارەبانەی گەنمەوە و پاییزانەش بە عارەبانەی گەنمەشامییەوە دێن عەمبارەکانی پارێزەر پڕ دەکەن و، وادیارە پارێزەر تەنیا ئەوەڵەکانی بەهارێ دەست دەکا بە فرۆشتنیان، یانی رێك ئەو دەمە نرخەکەیان دەگاتە ئەوپەڕی خۆی و گوندیی داماو بۆ فەردەیەك ئاردی گەنمەشامی یان ربەیەك ئاردی گەنم، ئامادەن گیانیشیان بدەن.

*

*

*

چیوکواشا، کە گیۆرگەسکۆیی پارێزەر وەك شەیتان چووەتە کەلەشییەوە، عەریزەیەك دەداتە دادگا و سکاڵا لە دایکی دەکا.

ئۆڤیدئۆرسۆیش بووەتە وەکیلی پیرەژنە سەدساڵانەکە.

دادوەرە لاوەکە داوای دۆسیەکەیان دەکا و دەیخوێنێتەوە. دۆسییەیەکی گەورە و ئەستوور و چڵکن و شڕ. عەریزەنووسی هەر دوو لایەن بانگ دەکا. ئۆنتۆریکای گرۆمەڵەبووی سیرمە، چاوی بە حاستەم دەبینن. ئەویش وەك کچەکەی خۆی داوەتە سەر دارەکەی دەستی. هەردووکیان دەستی یەکتریان گرتووە و دێنە نێو ناحیە. پارێزەر لێکیان دادەبڕن. هەر دوو پیرەژنە ـ دایك و کچ ـــ بە پێوە رادەوەستن و دەست بەو ئاسنەپەرژینە دەگرن وا بیناکەی کردووەتە دووبەش.

دادوەر بە جیا لە هەرکامەیان دەپرسێ:

ـ ئەی بەتەما نین ئاشت ببنەوە؟

چیوکواشا بە رق و قینەوە لە دایکی مۆڕ دەبێتەوە و دەڵێ: نەخێر.

لە دەستی هاتبایە هەر لەوێ دایکی ونجڕونجڕ دەکرد.

ئۆنتۆریکاش بە دەنگێك کە دەتگوت لە بنەبانی ئەشکەوتەوە دێ، وەڵام دەداتەوە:

ـ نەخێر.

وەك دڕندان سەیرێکی کچەکەی دەکا و لەسەر قسەکەی دەڕوا:

ـ دەیەوێ زەوییەکەم لە چنگی دەربێنێ جەنابی دادوەر. دەیەوێ لە برسان بمکوژێ و وەسواڵم بخا. بەڵێ، دەیەوێ زەوییەکەم لە چنگی دەربێنێ. راناوەستێ سەر بنێمەوە و بمرم دوایی پێی ببڕدرێ.

دادوەر دەپرسی: ئەو زەویوزارە ئێستا کێ رەعەمەلی دێنێ؟

چیوکواشا دەڵێ: من.

ـ ئەی کێ داهاتەکەی وەردەگرێ؟

چیوکواشا دەڵێ: هەر خۆم وەریدەگرم.

ـ ئەی چ دەدەی بە دایکت؟

ـ خواردن و خەوی لەسەر منە جەنابی دادوەر.

ـ دەی هەر ناڕازیشی؟

ـ بەڵێ.

ـ بۆ؟

ـ چونکە قەباڵەی زەوییەکەم نییە جەنابی دادوەر. دایکم بەتەما نییە بمرێ. دەترسم لە پڕێکدا دەماری کەرێتییەکەی ببزوێ و بە بایدا بدا. ئاخر ماوەیەکە زۆر کەس دەبینم بە دەوریدا دێن و لە هەلێك دەگەڕێن رووتی بکەن. یەکێکیان هەر ئەو ماڵی ریچکایە، کە بە ملی شکاویان خزمانن... دوێنێ پێرێ سەیر دەکەم کوڕەکەیان پرێسکەیەکی کشمیش هێناوە... ئاخر کەس نییە بڵێ هەی بێ چاوڕووانە، ئەگەر هیچتان لەبن سەریدا نییە و خۆتان لە میراتەکەی خۆش نەکردوە و چاوتان لە بستە زەوییەی نییە، ئەوە چۆنە وا جەوری دەکێشن؟

دادگاکە هەڵدەگیرێ بۆ دانیشتنێکی دی. تا ئێستا چەوە چەند جاران لەسەری دانیشتوون. پارێزەر دەهری بوون:

ـ قوربان، حوکمەکەی چییە وا دیسان وەدوای دەخەیەوە؟

ـ دەرفەتێکی دیکەیە بۆ ئەوەی لە کەری شەیتان بێنە خوارێ و پێك بێن.

ئینجا بۆ سکرتێرەکەی کە خەریکی نووسینە، دەخوێنێتەوە:

ـ دادگا بە پێشنیاری پێکهاتن، کاتی دادگاییەکەی دیسان خستەوە کاتێکی دیکە، بۆ ئەوەی هەر سکاڵاکەر و سکاڵالێکراو بۆ ئەم پێشنیارە و تاوتوێکردنی بڕیاری خۆیان هەل و دەرفەتی باشیان هەبێ.

چیوکواشا دەستی دایکی دەگرێ و دەچنە دەرێ. لە حەوشەکەش دەچنە دەرێ و ورد سەیرێکی راست و چەپی خۆیان دەکەن بۆ ئەوەی نەکەونە بەر عارەبانە و ئەسپان. ئینجا لە جادەکە دەپەڕنەوە و دەچنەوە حەوشەکەی خۆیان و لەسەر پلیکانەکان دادەنیشن بۆ ئەوەی بحەسێنەوە.

ـ دایە گیان حەزت لە چییە بۆت لێ بنێم؟

ـ قاپێك شیر کچم. بەڵام کە مامالیگای تێ دەکەی جوان وردی بکە.

*

*

*

ئاڤێندریا پرخەی ڕۆژەڕێیەك دەڕوا.

ئیتزیکۆ لەخەو هەڵدەستێ و سێ چوار وردکە دار داوێتە سەر ئاگرەکە. سەرمای بەیانی لە خەومان هەڵدەستێنێ.

ئاڤێندریا لەخەو هەڵدەستێنین، ئەسپەکان جل دەکەین و سوار دەبین، بەرەو ئاوایی تاویان دەدەین، ئاڤێندریا فیتوو لێ دەدا.

بەرەبەری نیوەڕۆ لە ئاوایی دەنگۆ دادەکەوێ کە کوڕە گەورەکەی پاپۆشۆیان بە سەرشکاوی لە بێستانی ئادانکاتادا دۆزیوەتەوە. دەمانچەیەکی بەدەستەوە بووە و کەوتووە و لە تڕێ سەی چووە.

هەواڵەکە لە زارێك دەکەوێتە شارێك.

ـ بیستووتانە؟ ئەو نامەردە بێشەرەفانە دوێشەوێ کۆتیکایان کوشتووە.

ـ ئەو بەستەزمانەی کوڕی پاپۆشۆیان کوشتووە.

نیکۆلای مێلۆچلی پۆلیس بە میرزای ناحییەوە و لەگەڵ قایمقام و دکتۆر گانچۆ سواری عارەبانە دەبن و بەرەو ئادانکاتا دەکەونە رێ. نوێژی نیوەڕۆیە تەرمەکە دێننەوە قایمقامی. لە حەوشەکە درێژی دەکەن و پەڕۆیەکی بەسەردا دەدەن و یەکێکی لە ژوورسەری دادەنێن. خەڵکی خوا هەموو لە پشت ئاسنەپەرژینەکانەوە کۆ بوونەتەوە و مل دەکێشن، وەك ئەودەمانەی دێن بۆ سەیری سەمای ورچ.

بەرپرسان خۆیان گەیاندووەتە تەلەفۆنخانە و لەگەڵ شاری قسەیان کردووە. دکتۆر گانچۆ بە دەست لێکخشاندنەوە لە قایمقامی هاتووەتە دەرێ و ئەمری کردووە ـ بە سیرەش بڵێن بێ.

سیرەش زەبەلاحترین پیاوی ئاوەدانییە. سەرو گەردنێك لە کەڵەگەتەکان بەرزترە. لێپرسراوی ئیدارەی لەشساغییە.

دکتۆر پێی دەڵێ: ـ جانتاکەم بۆ بێنە.

سیرەش بە غاردان دەچێتە ماڵی دکتۆر و دێتەوە. سندووقێکی گەورەی چەرمپۆشی لە بن هەنگڵیدایە. مێزێکی شەق و شەوێق کە سکرتێر لە پشتی دادەنیشێ و ئەو رۆژانە قازی دێتە ئاوایی

وەك "سەكۆی پیرۆزی دادگا" دەیخەنە بەردەمی خەڵك، دەیهێننە دەرێ و لە حەوشە لە بن دار ئەقاقییەكانی دادەنێن. مێلۆچل كە تفەنگە لوولەكورتەكەی حەمایل كردووە(بەملیدا كردووە)، لەبەر دەرگا پاسەوانە بۆ ئەوەی كەس نەیەتە ژوورێ. لە ژوورەوە جگە لە دكتۆر و سیڕەش و قایمقام و سكرتێر و دوو پاسەوان، كەسی دیكەی لێ نییە.

دەچنە لای تەرمەكە، كە لەسەر مێزەكە درێژیان كردووە و رووتیان كردووەتەوە. دەڵێی پەڕۆی مەنجەڵسڕینەوەیە، رەش رەش هەڵگەڕاوە. وەك بڵێی غوسڵی تەعمید، یەكەم ئاو و ئاخرین ئاو بووە كە وەگیانی كەوتووە.

من چوومەتە سەر ئاسنەپەرژینەكە و چاوێكم كردووەتە چوار چاو و سەیری دەكەم. دڵم لە ژێڵڵا دێ. دكتۆرگانچۆ دەمبینێ و پێم دەڵێ:

ـ وەرە ئێرە. حەز دەكەی بزانی چۆن توێكاریی دەكەن؟

ـ ئەی چۆن حەز ناكەم؟

ـ دەی باشە، كەوابوو لێرە لە تەنیشتم راوەستە و جانتاكەم بۆ بگرە.

لە تەنیشت دكتۆرەوە راوەستاوم و سندووقەكەم لە باوەشمدا بۆ گرتووە. سندووقە چەرمپۆشكراوەكە. سندووقەكە پڕە لە چەقۆ و مقەست و نەشتەر. مشارێكی بچووكیشی تێدایە. سیڕەش وەك بینی ئاو دەلەرزێ. وەك سپیدارێكی رەشەبا لە رەگەوە تا چڵووك رایوەشێنێ.

دكتۆر گانچۆ سەیری دەكا و قاقا دەكێشێ.

ـ ئەوە دەترسی سیڕەش؟

ـ من دكتۆر؟ بەتەما بە...

زەرد زەرد هەڵگەڕاوە. وەك گەڵا ئەقاقیای پاییزان.

دكتۆر چەقۆیەك هەڵدەگرێ و نێوچاوانی مردووەكە، كە بە پاچ هاڕیویانە، هەڵدەدڕێ. چاوی مردووەكە دەڵێی شووشەن. زاری خواروخێچ بووە و ردێنی هاتووە. دكتۆر چەرمی لە نێوان پەنجەی دەئالێنێ و توند رایدەكێشێ. سەلكی، دەڵێی گوێزێكە و پاكت كردووە، ئێسكی سەری دەردەكەوێ.

ـ مشارەكەم بدەیە.

مشارەکە هەڵدەگرم و دەیدەمە دەستی. دکتۆر دەست دەکا بە لەتکردنی. ئێسکی سەری قرچەقرچی دێ.

ـ دك ت ۆر...

ـ دەڵێی چی جەنابی سیرەش؟

ـ بەڵام جەنابی سیرەش ئیتر پێ ڕاناگا وەڵام بداتەوە: ئەژنۆی لە بن قەڵافەتە زەبەلاحەکەیدتا دەنوشتێنەوە و وەك تەپاڵەیەك پانەوپان دەکەوێ.

ـ هەڵیگرن لایبەن.

پاسەوان سەروقوونی دەگرن و دەیبەنە بن سێبەری بیناکە و درێژی دەکەن بۆ ئەوەی بێتەوە هۆش خۆی. ژنەکان لەوبەرەوە سرتوخورتیانە:

ـ وەی گیان سیرەش، ئای لەمنت کەوێ، بەوەی دەڵێن ئازایەتی.

دکتۆر وەك هونەرمەندێکی راستینە کار دەکا. ئێسکی کاژەڵاك و شەویلکە و پشتەسەری دەبڕێتەوە. کاسەی سەری مردووەکە هەڵدەگرێ و مێشکی دەردەکەوێ. لەبەر تیشکی تاوەکە کەوەیەکی مەیلەوشینە.

ـ قاپێك بێنن.

سکرتێر دەردەپەڕێ و بە تەشتۆکەیەکی تەنەکەوە لە لای ماڵێوە دەگەڕێتەوە. دکتۆر ئەو شتەنەرمەی دەڵێی هەویرە کردوویەتە بابۆڵە لە کاسەی سەری مردووەکە دەردێنێ و لە تەشتۆکەکەی دەخا و توێ توێ دەیبڕێ و، هەندێ شت لەسەر کاغەزێك دەنووسێ. نووسینەکانیم پێ ناخوێنرێتەوە. خەتەکەی دەڵێی مێشێك وەنێو مەرەکەب کەوتووە و بەسەر کاغەزدا رۆیوە.

دیسان دەست دەداتەوە چەقۆکە. پێستی مردووەکە لە بن چەنەیەوە تا سەر ناوکی و لەوێشەوە تا کەلەموستی پێی دادەماڵێ. سینگی بە شتێك وەك تەورێکی بچووك لێك دەکاتەوە. جگەری دەردێنێ و لەت لەتی دەکا. دڵی دێنێتە دەرێ و دەیکاتە هەشت بەش. هەناویشی هەموو دەردێنێ و ئینجا دەست دەباتە نێو زگی و دەستی تێدەگێڕێ. دیسان چەند هێمای سەیر و سەمەرە لە سەر یادداشتەکانی دادەنێ. کە لێ دەبێتەوە، مێشك و دڵ و جگەر و ورگ و ریخۆڵەکە بە تێکەڵاوی

دەخاتەوە نێو زگی مردووەکە و داوێك بە دەرزییەوە دەکا و وەك کیسەیەکی دڕاو، هەتا چەناگەی هەڵیدەدوورێ. پێستی سەریشی دەوراندەوری دەدوورێتەوە. ئینجا دەستی دەشوا و بە پاسەوانەکان دەڵێ، تەرمەکە هەڵگرن و بیبەن بیدەنەوە کەسوکارەکەی.

ماڵی پاپۆشۆی لەوبەری ئاسنەپەرژینەکەوە راوەستاون و چاوەڕێن. تەرمە ئەنجنکراوەکە لە عارەبانەیەك دەخەن و دەیبەنەوە ماڵێ کە لە گوندەکەی ئەوبەری چۆمییە.

من تاوێکی دیکەش لای دکتۆر دەمێنمەوە و سندووقەکەی بۆ دەگێڕم. دوایی دەچمەوە لای ئاوەڵەکانم و دەست دەکەینەوە بە گەمە. حیندرحۆ...

پۆلیس لەبارەی قەتڵەکەوە دەست دەکا لە لێکۆڵینەوە.

ـ کوڕەکەی پاپۆشۆی لەسەر کچ و مچ کێشەی لەگەڵ کەس هەبووە؟

قایمقام وەڵامی دەداتەوە:

ـ هیچ کەس لەسەر کچ کێشەی لەگەڵی نەبووە. کچەکان کەیفیان زۆر بە کۆتیکا نەدەهات. قەت شاییەکی لە گیرفانیدا نەبوو.

ماڵەکەشیان لە ماڵە رەشووڕووتەکانە. کۆتیکای چارەڕەش نەمردبایە، ناچار بوو لە گوندێکی دیکە ژنێك بۆخۆی بدۆزێتەوە.

ـ دوێ شەو کێ لەلای ئەسپەکان بووە؟

ـ باشتر بوو پرسیبات "کێ لەوێ نەبووە." ... هەموو کوڕانی گوند لەوێ بوونە.

ـ دا بڵێ هەموو ئەوانەی دوێ شەو ئەسپ و بارگینەکانیان بردووەتە دەشتێ بێنە ئێرە.

پاسەوان مل دەنێن لە گەڕان و هەمووومان دێننە قایمقامی و کۆمان دەکەنەوە. هەموو تەمەنێکمان لەگەڵە. لە منداڵی زۆر ریوەڵەوە تا کێ لە هەمووان زەبەلاحترە. هەمووومان لە ژوورێ دەکەن. ئاڤێندریا و رۆشۆی ئامۆزاشی لەوێن. کوڕەکەی ترێشکاش لەوێیە.

ـ کێهەتان پۆپۆشیتان کوشتووە؟

لە بری وەڵام، شانێك هەڵدەتەکێنین.

ـ بۆ ئێمە کوشتوومانە؟

ـ ئەی کێ کوشتوویەتی؟ باپیرەی من؟

هەیتوەکەی ترێشکا لە بن لێوەوە دەڵێ: لەوانەیە ئەو هەتیوانەی ستانی کۆتس کوشتبێتیان.

ئاڤێندرێیش لەسەر قسەکەی وی دەڕوا و دەڵێ: لەوانەشە کوڕانی کارڤانێتز.

گۆتزارۆشۆش دەڵێ: ـ خوا دەزانێ.

مێلۆچل وەك قوزەڵقورتی لێ هاتووە. پەلامارمان دەدا و بۆ ئەوەی چاوترسێنمان بکا، قەمچییە چەرمەگایەکەی رادەوەشێنێ:

ـ هەرچی دەزانن بیڵێن، ئەگینا پشتتان لە زگتان نەرمتر دەکەم.

ـ ئێمە ئاگامان لە مەحموودی بێزەواد نییە.

ـ یانی ئاگاتان لێ نییە، ها؟

ـ یەکدەنگ دەڵێین ـ ئاگامان لێ نییە.

قەمچی ویزەی دێ و دادێتەوە. بگاتە کوێ دێتە خوار و زیاتر وەدەستمان دەکەوێ کە هەوڵ دەدەین شان و دەموچاومیان لە پشت سەرمانەوە بشارینەوە. هەموومان شەلاڵی خوێن دەبین. خەڵك خۆ بە حەوشەی قایمقامیدا دەکەن و دەیکەنە هەرا:

ـ جەنابی قایمقام فریا کەوە، مێلۆچل خەریکە منداڵەکانمان دەکوژێ.

مێلۆچل گوێی لە زەنازەناکەیە. دەچێتە بەردەرگا و تفەنگەکەی راست دەکاتەوە و دەنەڕێنێ:

ـ ئەوە دەتانەوێ رێگە لە ئەرکی لێکۆڵینەوەی رەسمیی لێپرسراوی دەوڵەت بگرن؟ ئەوە سەربزێوی و یاخیگەرییە. بڕۆن ملتان بشکێنن دەنا تەقەتان لێ دەکەم.

هەمووان دەزانن چ سەگوسەگبابێکە. هیچ دوور نییە لە ناکاو تەقە لە خەڵکەکە بکا. ئەو چەقەڵە کلك بڕاوە، هەموو شتێکی لە دەست دێ. حەوشەکە چۆل دەکەن، بەڵام هەر وا بە هەڕەشەوە لە پشت پەرژینەکە رادەوەستن.

مێلۆچل دێتەوە سەر کارەکەی. قەمچیی چەرمەگا ویزەی دێ، دەسووڕێ و دێتەوە خوارێ و گۆشت و پێست ئاگر دەدا. بەڵام ئیتر دەنگ ی نایە:

ئارەقەی لەبەری پێی دەتکێ و شەکەت بووە، بەو حاڵەشەوە بە قەستی کوشتن لێمان دەدا. ئاومان بەسەردا دەکا و وەهۆش خۆمان دێنێتەوە و دیسان دەستدەکاتەوە بە لێدان.

شەوداهاتووە. ڕۆژ بووەتەوە. کازیوە شووشەی پەنجەرەکەی ڕووناك کردووەتەوە.

مێلۆچل چووە لە شووشەی دەرگای قاوەخانەکەی بەرامبەری قایمقامیی داوە، لێئانکای قاوەچیی لەخەو هەستاندووە و ئەمری کردووە بەرچایی بۆ بێنێ.

بەرچاییەکەی دەخوا و قاوەکەی بەسەردا دەکا و دیسان دێتەوە و تێمان بەردەبێ.

ـ هەر ناتانەوێ قسە بکەن؟ ها؟

ـ باشە وەختێك ئاگامان لە هیچ نییە چ بڵێین؟

پاسەوانەکەی ناردووە بۆ لای سکرتێر. سکرتێر کە هێشتا خەواڵوە و لەوەی بەو کەڕەی بەیانییە لەخەویان هەستاندووە، گووی لە نێوچاوانی دەبارێ، دێتە ژوورێ.

ماڵەکەی سکرتێر دیوار بە دیواری قایمقامیەوەیە و، بە پەرژینێك لێی جیا کراوەتەوە. گوریەیەکی قەڵەوەی سمێڵ مەیلەوسوور زۆربەی کات لە حەوشەکەی سکرتێرەوە قەڵەمبازێك دەدا و دێتە ئەمبەرە و جارجارەش دێ و لە ژوورەکانی ئیدارەدا دەگەڕێ. سکرتێر هەڵیدەگرێ و لەسەر ئەژنۆی خۆی دادەنێ و بەدەم نووسینەوە دەست بە پشتی پشیلەکەدا دێنێ. بەڵام کە دەبینێ پشیلە خۆی بە جلەکانییەوە نووساندووە، پشتەملی دەگرێ و بێبەزەییانە فڕێی دەداتە لاوە. پشیلەکەش بەردەوام لەسەر چواردەست و پێ دەکەوێتەوە عەرزی.

ـ کوا پشیلەکەت؟

ـ چووزانم لەکوێیە؟ داخوا لە گۆشەیەکی چێشتخانەکە لێی کەوتووە.

مێلۆچل یەکێك لە پاسەوانەکان دەنێرێ ژنی سکرتێرەکە لە خەو هەستێنێ و دەرزییەکی لێ وەرگرێ و بیهێنێ.

ـ دەتانەوێ هەزار قسەی ساردوو سووکتان پێ بڵێ؟

ـ دەی بە جەهەننەم. لێکۆڵینەوەی ڕەسمی وای دەوێ.

ژنی سکرتێرەکە هەمیشە دەرگا لەسەر خۆی پێوە دەدا و تا قرچەی نیوەڕۆیە دەنوێ. سکرتێری داماو کە ناچارە کەڕەی بەیانی لە خەو هەستێ، هەتا دێتە ئیدارە بەسەر پەنجە دەڕوا نەکا ژنە قەحپە بێحەیایەکەی لەخەو راچڵەکێ و شەڕێکی پێ بفرۆشێ.

پاسەوان بە دەرزی و داوەوە دێتەوە.

نیکۆلای مێلۆچل پشتەملی پشیلەکە دەگرێ و لە کراسەکەی گۆتزارۆشۆی دەخا و پێشەوەی بە دەرزییەکە دەدوورێتەوە. قۆڵی کراسەکەشی لە سەرووی ئانیشکییەوە توند بە شریتێك دەبەستێ و ئەمر بە کوڕە دەکا  قایشی پانتۆڵەکەی توند بکا. جا بەقەمچی وەریدەگەڕێتە پشیلەکە و جا وەرە بکوتە.

ئاژەڵی بەستەزمان دەیەوێ خۆی رزگار بکا، بەڵام رێی دەربازبوونی نییە. چنجڕووك لە گیانی رۆشۆی داماو دەگرێ و تا سەر ئێسقان هەڵیدەدڕێ. رۆسۆ یەك بەخۆی هاوار دەکا و کراسەکەی شەلاڵی خوێن دەبێ و مێلۆچل دیسان پشیلەکە دەداتەوە بەر قەمچی.

ـ قسە ناکەی؟ ها؟

ـ قسە دەکەم جەنابی پۆلیس. قسە دەکەم.

ـ کێ کوڕەکەی پاپۆشۆی کوشت؟

ـ خۆم کوشتم.

ـ کێی دیکەت لەگەڵ بوو؟

ـ هیچ کەس.

ـ درۆ دەکەی.

ـ بە قەمچی بەردەبێتەوە پشیلەکە. حەیوانی بەستەزمان وەك شێتانی لێ هاتووە. گۆتزارۆشۆ لەخۆ دەچێ و بەلادادێ.

مێلۆچل پشیلەکە دەگرێ و لە کراسی کوڕەی ترێشکای دەخا، ئەویش بە نۆرەی خۆی دانی پێدا دەنێ کە پاپۆشۆی کوشتووە.

ـ کێت لەگەڵ بوو؟

ـ رۆشۆ.

ـ کێی دیکە؟

ـ هیچ کەس. هەر ئەو دوانەمان بووین.

ـ قسەی قۆڕ دەکەی.

کوڕەی ترێشکاش لە هۆش دەچێ.

نۆرەی ئاڤێندرێ دێ، سێ جار وەك هەورەتریشقە دەکەوێ و لەخۆ دەچێ و مێلۆچل سێ جار ئاوی بەسەردا دەکا و وەهۆشی دێنێتەوە، بەڵام یەك قسەشی لێ دەرناهێنێ.

ـ هەمووومان لە ترسان وەك مێژۆکە دەلەرزین. وا هەڵدەلەرزین، شەقەی ئێسقانمان دێ.

مێلۆچلی پۆلیس ئاخری گۆتزارۆشۆ و کوڕی ترێشکا بە تاوانی پیاوکوشتن بە قۆڵبەستراو دەنێرێتە شار. ئینجا بە چاوێکی بەزەییانەوە سەیری ئێمە دەکا و دەڵێ:

ـ دیارە لە خۆڕا لە ئێوەم دا.

ئاڤێندرێ دەڵێ: زۆریش لە خۆڕا جەنابی پۆلیس. هەر بەراستی لە خۆڕایی لێت داین.

پشیلەکە لەبەر پێی پۆلیس وەرکەوتووە، قەپۆز و پەنجەی شەلاڵی خوێنە.

نیکۆلای مێلۆچل بە نەفرەتەوە لێوی دەکرۆژێ. لاقی هەڵدێنێ و بەهەمموو کەیفی خۆی شەقێکی وا لە کەلەکەی پشیلەکە دەسرەوێنێ رمبێکی بەرز دەکاتەوە و لەولاوە چوار دەست و پێ دێتەوە عەرزی و بە کەلێنی دەرگاکەدا فیزمالکی دەداتێ.

لە قایمقامی دێینە دەرێ.

کە دەگەینە بەر دەرگا، پشیلەکە دەبینین لەسەر لێواری دیوارەکە خەریکە چنجرووکی دەلێسێتەوە.

## ١٣

## پیاوچاکە بێ چاوەکان

*

*

*

سێ ماڵ لەوبەری ماڵەکەی ئێمەوە، ماڵی دیڤاییکای جادووگەر لە دەم ئاسنەڕێیەکەیە. ئەو نێوکی خوشك و براکانی منی بڕیوە، بەڵام نێوکی خۆم ژنێکی دی بڕیوێتی. بەڵام ئەوەی یەکەم جار شوشتوومی و هەر جارێکی نەخۆش کەوتووم، تەڕ و وشکی کردوومەتەوە و نزای بە گوێمدا خوێندووە، هەر ئەو دیڤییکایە بووە. دیسان هەر ماڵەکەی دیڤاییکاش بووە کە تا سێ ساڵان وەك باوە، سێ زستان، ڕۆژی جەژنی سەنت ڤاسیلیێ، سەریان کاریتەی بنمیچێدا داوم. هەر بۆیە منیش هەمیشە دیڤاییکا بە دایکەی خۆم دەزانم.

دیڤاییکا ژنێکی وردیلەی پشتکووڕە. وەك بڵێی زگماك کۆپانی پێوەبووبێ، بەڵام کووڕ نەبووە، ئەوە باری ئەو هەمووە ساڵە لەژمارنەهاتووەی تەمەنێتی، کە وەك بەرداشێکی قورس کەوتووەتە سەر شانی.

چاوی ورد و خڕن، وەك چاوی کەمتیار، کە دەڵێی ئەڵماسن دەدرەوشێنەوە. ئەم چاوانە لە هەموو گیانی زیندووترن. باوکەڕۆ، بێت و بنیادەم جگە لە چاوی، هیچ کوێی دیکەی نەدیتبایە. چونکە ئەگەر ئەو لووتی وەك دەنووکە هەڵۆکەی شۆڕ نەبوایەتەوە سەر لێوە شۆڕەکانی و ئەگەر دەمە قوپاو و بێ ددانەکانی نەبوایە، بنیادەم بە دیتنی چاوی سوێندی دەخوارد کە لەوانەیە هێشتا تەمەنی نەبووەتە بیست ساڵان. پێدەچێ لە پشت ئەو چاوانەوە بڵێسەی ڕۆحی وی بەرز بەرز هەستێ و بسووتێ، هەر ئەو ڕۆحەی خەڵکی ئاوەدانی باوەڕیان وایە لە سەرەتای هەرزەکاریدا لە لای شەیتان بە گرەو دایناوە.

جا خۆ دیڤاییکا هەر مامانی دایکم نەبووە. سێ لەسەر چواری ژنانی ئاوایی لەبەردەستی ئەودا منداڵیان بووە.

بێوەژنە و تاقانە کوڕێکی هەیە کە ناوی تۆبێیە. ماڵەکەی حەوشە و دیواری نییە و، لە کەپرێکدا دەژی. چوار دیواری خواروخێچ و نالەبار و پەنجەرە و دەرگایەك، کە هەرگیز جوان کیپ نابێ. سەربانەکەی هەر پووش و هەڵاشە و بنیادەم سەری سووڕدەمێنێ کە چۆن تا ئێستا رەشەبا سەری ئەو کەپرەی هەڵنەگرتووە. چۆن خۆی لەبەر ئەو هەمووە باهۆزە راگرتووە.

کەپرەکە لە لێژاییەك دروست کراوە و لافاوگێڕەوەیەکی کە بەوپەڕی لێهاتووییەوە لێیاداوە، لە زەبر و زیانی ئەو لافاوانەی هاوینان پاش هەر لێزمەبارانێکی بەخوڕ دادەکا، دەیپارێزێ.

حەوشەکەی تەنیا دوو ئەقاقیای تێدایە. دوو پیرەدار خواروخێچ و گرێدار. خاکی حەوشەکەی رەقێنە و بە زەحمەت گژ و گیایەکی لێ شین دەبێ. ئەگەر بە نووکە دارێك بیڕووشێنێ، کە توێژێکی زەردت لێ دەردەکەوێ، کە تێکەڵەیەکە لە لم و قسڵ و رەگی هەموو گیایەك دەسووتێنێ.

تۆبێی کوڕی دیڤاییکا، لە ئاسنەڕێ دامەزراوە. کەڕەی بەیانی لە وێستگەی شەمەندەفەرەوە وەڕێ دەکەوێ. توورەکەیەکی کەلوپەل بە کۆڵیدا دەدا و کوتکێکی دەستك درێژیش بە دەستەوە. بەدەم ئاسنەڕێیەکەدا دەڕوا، جۆرێك دەڕوا کە هەمیشە پێیەکی لەمبەرەی ئاسنەڕێیەکەی و ئەویدیکەی لەوبەرەوە. کە دەگاتە ئەو شوێنەی هەردووسەری ئاسنەکە گەیشتوونەوە یەك، کوتکێکی لێ دەدا. ئەو دەنگەی لێی هەڵدەستێ، ئاساییە. دیسان وەڕێ دەکەوێتەوە و دیسان کە گەیشتەوە شوێنێك سەری ئاسنەکان گەیشتوونەوە یەك، دیسان کوتکێکی لێ دەداتەوە و، ئەگەر دەنگەکەی جۆرێك بوو کە پێی وابێ مۆرەیەکی شل بووەتەوە، مۆرە شلەوەبووەکەی دەدۆزێتەوە و، ئامرازێك لە توورەکەکەی دەردێنێ و توندی دەکاتەوە و دیسان دەکەوێتەوە رێ. دیسان کوتك دەوەشێنێتەوە و، چۆك دادەدا، رۆژێ هەزار جار، رۆژێ چەند هەزار جار دەنووشتێتەوە و قیت دەبێتەوە. دەی باشە، ئەوەش کارێکە وەك باقی کارەکانی دنیا. زستانان با و بۆران لێی دەدا و رەقی هەڵدێنێ و سەرمابردووی دەکا، هاوینانەش ئازای ئەندامی شەڵاڵی ئارەقە دەبێ.

لە وێستگەوە بە سەر شانی چەپی ئاسنەڕێیەکەدا دەڕوا. بەرەبەری نیوەڕۆیە دەگاتە یەکەم پۆستی رێگەوبانی ناحیەی رۆشی دێودێ. لەوێ تۆزێك لەگەڵ ژنی رێگەوانەکە قسان دەکا و لە سێبەری ئەقاقیاکاندا دادەنیشێ و نانەڕەقەکەی دەردێنێ: لەتێك ماماڵیگا و سەلکێك پیاز کە بە مست وردی

دەکا و، تۆزێك خوێ کە لە گۆشەی پرێسکەکەیدا گرێی داوە و مامالیگا و پیازەکەی تێ وەردەدا. جاری وایە، سەلکەسیرێکی پێیە لە جێی پیازەکە و، هەندێ جاریش تۆزێك سەوزە لە جێی هەردووکیان. کە بەهارداد‌ێ و ئیتر هیچ پەیدا نابێ بنیادەم بیخاتە بەر ددانی، خەڵك ئەو سەوزە و گەڵا مێوەی بە درێژایی زستان لە بن عەرزیدا بووە، دەریدێنن و لەگەڵ مامالیگاکەیانی دەکەن.

کە بەرەو وێستگەی شەمەندەفەرەکە دێتەوە، تۆبیێی، بەسەر ئاسنەکەی دیکەدا دەگەڕێتەوە. حەزی لێیە. سەری مانگێ یەك دوو قەرەپووڵی لە مستی دەنێن. ئەمەی دەیدەنێ، سێ هێندەی ئەو پارەیەیە کە بە پاڵە و سەپانی یان بە رۆژنامەفرۆشتن لە شاریدا پەیدای دەکرد. تەنانەت یەکشەممانەش پشوویەك نادا.

ئاوایی چۆلە. تۆبیێی بەپەلە کارەکەی تەواو دەکا و بەر لە سەعات چواری عەسرێ کەلوپەلەکان دەداتەوە بە پاسەوانی ئاسنەڕێیەکە و دادەگەڕێ بەرەو مەیخانەی بۆکۆر و چەند پێکێك ئارەق فڕ دەکا. ئینجا دێتەوە ئاوایی و لە گەڕانەوەشدا مەست و سەرخۆش تێی دەچریکێنێ و دەنگی لێ هەڵدێنێ.

هەندێ جار کە دەگاتە بەردەرگای قایمقامی، رادەوەستێ و کڵاوەکەی بەعەرزی دا دەدا و دەست دەکا بە تەپوتۆز:

ـ هۆی کوێخا، دەی با دەنگت بێ، وەك بزانم دەتەویست شتێکم پێ بڵێی... ئاگاداربە ها، من لەوانە نیم جەندەرمەم بنێرییە سەری بێ ممبا بێگاری بۆ ئاغا ملهوڕەکەت بکەم. خۆم رۆڵەی حوکمەتم، تێگەیشتی؟

ئەگەر پێکێکی زیاتر فڕ کردبێ، چەند جنێوی تەڕوبڕیش حەواڵەی قایمقام دەکا. سەیر ئەوەیە، ئەویش دەرەفەتی نایە، چونکە ئیتر جڵەوی تۆبیێی لەدەست دەرچووە.

تۆبیێی کە ئیتر تەواو لە ژیان لەگەڵ دایکی بێزار بوو، بیری لە ژنهێنان کردەوە.

ئەویش چووەتەوە سەر دایکی و وەك ئەو وردیلەیە، بەڵام تۆکمە و بەهێز. دەستی بەزەبر و گورجن و چاوە کاڵەکانیشی هەر دەڵێی هەتا پشتەستۆی دەکشێن.

پێت وایە کێ مێردی پێ دەکا؟ هەلینگی لە خۆی دا و پێنج ئاوایی ئەولاتر ژنێکی بۆخۆی دۆزییەوە. ژنە ناوی باکایە. رێك وەك خۆی وردیلە. خواردنی بۆ لێ دەنێ و، تۆبیێی چاوەڕێیە منداڵی بۆ بخاتەوە. هەر لەم رۆژانەدا.

ـ تۆبیێی! حەز دەکەی ژنەکەت چەند منداڵت بۆ بخاتەوە؟

ـ چەندی خوا بە قسمەتی بکا.

ـ جا بە چییان گەورە دەکەی؟

ـ بەم دەستانە.

دەستەکانی تۆبیێی قەڵشیو و گرنج گرنجن. لەبەر ئەوەی لە کەڕەی بەیانییەوە تا ئێوارێ کوتك لە ئاسنەڕێیەکە رادەکێشێ. هیچ فاڵگرەوەیەك ناتوانێ چارەنووسی لە ناو لەپیدا بخوێنێتەوە. پێستی دەستی لووس بووە و هەڵمساوە و بەردەوام دەقەڵشێ و توێ توێ دەبێ.

لە ئاوایی، خەڵکی خوای، چەندی قوونڕووتر بن، منداڵ و پاڵیان زیاترە. جا دەڵێن، دەی چییە، ئێمە دوو منداڵ نان بدەین، خۆ دەتوانین سێیش نان بدەین. کە بوونە سێ، جێ و رێ بۆ چواریش دەبێ، چیی لەویان زیاد بوو، بە دەمی ئەمیانەوەی دەکەین، دەکرێ چیی لەبەر ئەویان مایەوە، بیکەینە بەر ئەمەیان. بە هەزار وردکەنان و کۆنە و پینەوپەڕۆ. هاوینان دەتوانن بە قوونی رووتی بسووڕێنەوە و، زستانانیش دەخزێنە ژوورێ و لە تەنیشت کوانووە نیوەگەرمەکە خۆیان هەر گەرم دەکەنەوە.

ـ چوار منداڵ... چوار چییە، نۆ دانە.

ـ تیەح، یانی نۆ منداڵت پێ زۆرە؟ تۆدۆر دە منداڵی هەیە، بێچکۆ یازدەی هەیە، ماچیۆکا سێزدەی هەیە، تازە چواریشی مردوون.

تیۆرداکێ دیمانی جوو، هەرا دەکا:

ـ جا دێن لە برسانیش هاوارتان لێ هەڵدەستێ... من نەمهێشتووە ژنەکەم لە دوو زگ زیاتر بکا. کچێك و کوڕێك، خلاس و چوو و بڕایەوە.

ـ ئەی ئەگەر مردن؟

ـ جا بۆ دەمرن؟ منداڵی من دەڵێی پۆڵان.

*

*

*

هەموومان ئاهۆ دەگرین و بەجێوبان دەکەوین. سەرمان قورس و بە ژان و دەموچاو بزرکاو، بە ریز دەمانخەوێنن. لەچاویان بردووین.

دەچنە شوێن دیڤاییکا. وەك بای شەماڵ دێ و دەمانگاتێ. سەرمان لەسەر کۆشی دادەنێ و شان و ملمان دادەماڵێ و، جومگەی دەست و شانمان لە نێو پەنجەکانیدا دەگوشێ و، لە ناخی دڵەوە بۆ یەك بە یەکمان دەپاڕێتەوە:

لە رێیە دیم کیژۆڵەیەك

ناسك و لەبار بەرخۆڵەیەك

ناسکۆڵەتر لە پەلکی گوڵ

کەچی دڵی پڕ خەم و کوڵ

گوتم بۆ کوێ؟ گوتی دایە

ئیتر دەڕۆم بۆ ئەو لایە

کە خۆرەتاوی لێ هەڵدێ

لەوێ خەمم هەڵدەڕێژم

دەرد و برك و ژان دەنێژم

ئازار و ژانی منداڵان

هیی ساوایان، کوڕ و کاڵان

تا هەرچی زوو چاك ببنەوە

لە نەخۆشی پاك ببنەوە

بچنەوە بۆ یاری و گەمە

دوور بن لە چیی دەرد و خەمە

وەك شەونمی سەر پەلكی گوڵ

روخسار گەش و شادی لە دڵ

چاویان وەك ئەستێرەی بەیان

لە دوور ڕا بێ ترووسكەیان

لێویان بە خەندە بێ، دیسا

بۆ خاتری حەزرەتی عیسا

دایكم چیی هەیەتی و نیەتی، لە مستی دیڤاییكای دەنێ و بەڕێی دەكاتەوە. ئێمەش هەر وا بەجێوبان دەكەوین. سەعاتێك، دووان، جاری وایە یەك دوو رۆژ و جاریش هەیە حەفتەیەك. ئەوەندە دەكەوین، تا لە نەخۆشییەكە وەڕەز دەبین و، وای لێ دێ چاك دەبینەوە و دەتوانین هەستینە پێ.

"تا" بڕستی لێ بڕیوین. هاوین كە دادێ، منداڵی گوند هەموو گرانەتا و نۆبەتێ دەگرن. نەخۆشییەكە لە زۆنگاوەوە دێ و بەرۆكمان دەگرێ. هیچ شتێكیشمان نییە پێشی بگرین. دكتۆر گانچۆ بە قسەی خۆی دەڵێ، بە جۆرە گەردێك كە پێی دەڵێن گەنێ گەنێ، دەكرێ خۆی لێ رزگار بكەی. پێشم وایە بنكەی لەشساغی ئەو گەردەی نییە. هەڵبەت دوو سێ قوتووی بەتاڵ نەبێ هیچی لێ نییە. ئەوانەش سەردەمانێك مەڵهەم و شتی وا بوون. ئێستا جاڵجاڵۆكە زاركەكەیانی تەنیوە و خۆڵیان لێ نیشتووە و رەش هەڵگەڕاون. دیارە لە شاری چەندی بتهەوێ گەردی گەنێ گەنێ هەیە. بەڵام ئەوەندە گرانە، بۆوەی نابێ بەلایدا بڕۆی. ئەگەر راستیت دەوێ، ساڵێ جارێك چەند قوتووەك دێننە بنكەی لەشساغییەكە و، سیڕەش لێپرسراوەكەی بنكە، بۆ ئەوەی ئەو گەردە بەشی هەمووان بكا، هەندێ گەچ دەكرێ و تێی دەكا و بە مل ئەوماڵانەیدا دەدا، كە منداڵیان نەخۆشە. بە خەڵكی دیكەشی دەدا.

قەشە بۆلبۆك و مەیخانەچییەكان، منداڵیان قەت تووشی نۆبەتێ نابێ. سیڕەش لە بری گەنێ گەنێ، هێلكەمریشكی تازە لە خەڵكەكە دەستێنێ بۆ خۆی و دكتۆر گانچۆ. تێكەڵەی گەنێ گەنێ و گەچەكە

دەبێ لە دەفرێکی گەورەی پڕ ئاودا بگرییەوە و هەڵیقوڕێنی. وەك کلکەمار تاڵە. هەر دەیخۆیەوە دەیهێنیەوە. چما گەدەی بنیادەم پێی رادەگیرێ؟... هیچ، زەحمەتێکی بێ سوود.

- "بی" بکوڵێنی زۆر باشترە.

دیڤاییکا بە چەقۆ چەند توێکڵێك لە بییەکە هەڵدەکەنێ. ئاخر لە دەم بیرەکەی ماڵەوەمان بییەکی زۆر گەورەی لێیە. کرمی قەڵەوقەڵەوی پشت خاڵخاڵی سپی لەسەریان دەتلێنەوە. دیڤاییکا توێکڵی بییەکە ورد دەکا و دەیهاڕێ و لە تەنەکەیەکی دەکا و لەسەر ئاگری دادەنێ بکوڵێ. سێ قوڵت کە کوڵی، دایدەگرێ فێنك بێتەوە.

- بخۆوە داریە.

- چەند قوم؟

- چەندی توانیت.

دەچێ لە باغ و دەشتێ دەگەڕێ و گەڵای مێمووك (مێکووك) کۆ دەکاتەوە. تیەح خوایە چەندە ناخۆشە. مانگاش لمۆزی بۆ نابا. دیڤاییکا دوو گەڵای دێنێ و لەسەر مەچەکمان رێك لەسەر جومگەکەی دادەنێ و بە قوماشێك توند دەیپێچێ. بنیادەم لە پێشدا هەست بە هیچ ناکا. بەڵام سەعاتێك دواتر، ئەو جێیە دەست دەکا بە برژانەوە. ئەو گیا تووکلێکراوە دەست دەکا بە برژاندنی پێستی بنیادەم. تا مۆخی ئێسقانت دەبرژێتەوە.

- چ هەستێکت هەیە داریە؟

- دەبرژێتەوە پووریێ.

- ئەگەر دەبرژێتەوە، نیشانەی ئەوەیە چاك دەبیتەوە.

- ئیدی خۆم راناگرم.

- دەبێ خۆ راگری.

پەڕۆکە کراوەتەوە. گەڵا مێکووکەکەی لەسەر لادەبەین، پێستەکەی سوور هەڵگەڕاوە و هەڵمساوە و قەڵشیوە. جێی گەڵاکە تەواو بووەتە برین. حەفتەیەکی تەواو ئەو برینەشمان پێوەیە. جاری وایە زیاتریش. لەسەر هەستین، مێش لێی نەنیشێ.

ـ من برینەکەم قەتماغەی بەستووە.

نەکەی هەڵیکەنی.

ـ نا هەڵیناکەنم.

قەتماغەکە خۆی بەری دەدا. لە بنەوە پێستێکی سپیی تازە دیارە. جێی برینەکە تا هەتایە میوانتە.

ئەی تایەکە؟ هەر بەراستی تایەکەمان لەکۆڵ بووەتەوە.

هێشتا لە مێژ نییە تایەکەمان لەکۆڵ بووەتەوە، ئەوجار قارچك دەگرین. پووکمان هەو دەکا. ئەوەش زۆر گرینگ نییە. ئەوددەمە قوڕمان بەسەری دەبێ کە پووکمان زیپکەی سەرسپیی هێندەی سەری دەنکە شقارتەیەك دەردەکا. هێشتا ئەوەیان نەتەقیوە، زیپکەی دیکە سەردەردێنێ. زاری بنیادەم هەمووی دەبێتە برین. گۆشتەکە، کە نەخۆشە و ژانیش دەکا، دەڕزێ و لە بنییەوە توێژێکی دیکە دەردەکا، لەوی ئەوەڵی خراپتر. ئەوەی ژان دەکا، هەر گۆشتەکە نییە: ددانەکانیش هەموو ژان دەکەن. رەگی ددانیش چڵ دەدا.

دیڤاییکاش ئەوە لە پەیتا دووعامان بۆ دەکا. پێتریایش هەر وا. بەردەوام لێومان بە زمان تەڕ دەکەین. بەیانی تا شەوێ ئەوە کار و پیشەمانە. تا وای لێ دێ شەکەت دەبین و خەومان لێ دەکەوێ. بەڵام دیسان لەبەر ژان و ئازار لە خەو رادەچڵەکین، لەسەر دۆشەگەکەمان تەنیشتاوتەنیشت دەکەین. دیسان خەومان لێ دەکەوێتەوە، بەڵام چ خەوتنێك.

وردە وردە، قارچك و بۆقژەکەش لێمان دەبێتەوە. تۆوی نەخۆشییەکە، با لەگەڵ خۆی دەیهێنێ و دەیبا بۆ گەڕەکەکانی دیکەی ئاوەدانی.

کچێکمان هەیە، بەسەرماندا ماوەتەوە، جوان نییە، نایخوازن؟

دیڤاییکا ئاگادار دەکەینەوە. پرێسکەی دڵمانی بۆ دەکەینەوە و، خەمی دڵی بۆ هەڵدەڕێژین.

دیڤاییکا دەست دەکا بە زیکر و تەسبیحات. شەربەتێك دەگرێتەوە و دووعای لەسەر دەخوێنێ.

دایکی کچە دڵی تەنگ دەبێ، دیڤاییکا و کچەش هەروا.

دیڤاییکا پێیان دەڵێ: خوازبێنیکەر لە جادەکانی بەری ڕۆژئاواوە دێن.

جاری وایە هەر بەراستی خوازبێنیکەریشیان بۆ پەیدا دەبێ. جاری واش هەیە نەخێر. بەڵام ئەو ژنانەی کچی عازەبیان هەیە و، دواتریش ئەوەندە دەمێننەوە تا دەترشێن، قەت بێهیوا نابن و باوەڕیان بە نوشتە و جادووەکانی پیرەژنە هەر دەمێنێ.

شۆرەتی دیڤاییکا زۆر زۆر دوور ڕۆیوە و گەیشتووەتە دوورترین ئاوەدانییەکان. کچێکی زۆر جوان مێردی کردووە. جگە لە جوانی و ناسکییەکەی، سندووقێك پڕ لە جلوبەرگ و قوماشی جوانیشی لەگەڵ خۆی بردووەتە ماڵی مێرد. سەرجیازی زۆر باشیشی پێیە: زەوی و زار و پاتاڵ و زۆر شتی دیکە. بنیادەم سەری سووڕ دەمێنێ، چونکە چەرخی گەردوون چۆنی کەیفی لێ بێ وا دەسووڕێ. هێشتا جێوبانی زاوایەتییان کۆ نەکردووەتەوە، کە بووکێ لەبەر چاوی زاوا دەکەوێ و، هێشتا زرم و کوتی هەڵپەڕکێ و شایی لە گوێچکەی خەڵکەکەدایە، کە زاوا وەشوێن ژنی دیکە کەوتووە.

لێرەش دەبێ را بکەن بە شوێن دیڤاییکادا، کە بەڵێ بێ و سیحر و جادوو بکا، بەشکم تەلیسمی خەنیمەکانی بووکێ بەتاڵ ببنەوە.

ئیتر دیڤاییکاش ئاوا ژیانی خۆی هەڵدەسووڕێنێ.

❈

❈

❈

بنەماڵەی مەچیۆکا، حەڤدە کەسن لە ژوورێکدان. بابا ماچیۆکا و پیرەژنەکەی و سێ کوڕەکەیان و بووك و نەوەکانیان، جا بە کوڕ و کچەوە و بە تەمەنی جیاجیا، بست و نیوبست. وەك تەرەی کاڵەکە بەسەر یەکدا کەوتوون. خانووەکەیان گەورەیە. بەڵام ژوورەکانی دیکە، زستانان مەڕ و ماڵاتی تێ دەکەن. بۆ ئەوەی لە جێی نەرم و گەرمدا بەرخۆڵەی جوان و قەڵەویان بێ.

ژوورەکانیان تەختی خەویان تێدا نییە. کەوڵی مەڕیان راخستووە. باڵنجیان بە دیوارەوە ناوە. پەنجەرەکانیان بزمارڕێژ کردووە بۆ ئەوەی هەر نەکرێنەوە و، تەزووی سەرمای زستان نەیەتە ژووریٚ. لەسەر کەوڵەکان دەخەن، ئەویش رووت و قووت، بۆ ئەوەی کراسەکانیان درەنگتر خراپ بن. کراسیشیان زۆر نییە. هەر کامە و کراسێك. هەمووشیان بۆنی پەنیریان لیٚ دیٚ. بۆنی کەشك و خوریی تەڕیشیان لیٚ دیٚ.

دڵت چووەتە سەر کچۆڵەیەك، کە هەر سەیرت ناکا؟ ئاخر بنیادەم چەندی کوڕی باشیش بیٚ، دیسانیش ناتوانیٚ بڵیٚ کەس هێندەی ئەو جوان و ئازا نییە... دەی باشە، هەڵدەستی دەچییە ماڵی دیڤاییکا:

ـ قوڕی کویٚ وەسەرخۆم بکەم دیڤاییکا؟ کچەتیوەی ماچیۆکا هەر بە سەیەکیشم دانانیٚ.

ـ کامەیان؟

ـ پاراس کیڤا.

ـ کوڕە خەمت نەبیٚ نا. نەنە دیڤاییکا چیی لەدەستی بیٚ بۆتی دەکا. بەڵام قسەی خۆشمان بیٚ، بڵیٚ بزانم کوێی پاراس کیڤات کەوتووەتە بەر دڵ؟ لەوت جوانتر گیر نەکەوتووە؟

ـ ئەگەر راستیت دەویٚ نەنە دیڤاییکا، نەوەڵا.

❊

❊

❊

دایکم خەریکە دەمریٚ. پاش ئەو نەخۆشییە دوودرودرێژە، هەموومان دڵنیاین ئیتر دوا هەناسەکانی ژیانێتی. ئیتر زمانیشی ناگەڕیٚ. ئەوە چەند رۆژە هەر دەمیشی نەجووڵاندووە. لێوی ئاوساون و قەڵشیون. بە زەحمەت بەحاڵ دەیانبزوێنیٚ، بۆ ئەوەی تیٚمان بگەیەنیٚ قومیٚ ئاوی دەویٚ. سینگی هەر

لرخەی دێ. شەو و ڕۆژ لە ژوور سەری شەونخوونی دەکێشین و ئاگامان لێیەتی. شەوانە تا بەیانی مۆم دەئاییسێنین و خوشکەکانم ئەوەندەیان بێخەوی چێشتووە، وەگیان هاتوون و ئیتر خواخوایانە بمرێ.

باوکم چووەتە لای دارفرۆش و نرخی ئەو تەختەیەی لەگەڵ بڕیوەتەوە کە ئێستا نا سەعاتێکی دی، یان چەند ڕۆژی تر بۆ دروستکردنی خاچ پێویستمان دەبێ.

دایکم دەمرێ. ئیتر ئێستا مردن بۆ وی جۆرێك حەسانەوەیە. ئیدی کە بنیادەم چەندی چەند مانگان لەماڵەوە لەسەر گازەرای پشت بکەوێ و بە دەست ئەمدیوئەودیوی بکەن و بە حاستەم هەناسەی بێتە دەرێ و، هەر لە ئێستاوە دەستی کردبێ بە داڕزین، ژیان بۆ وی نە تامی ماوە و نە ئاسانیشە.

بەڵام بەو حاڵەشەوە دایکم نامرێ.... ئەوەتا وا چاوی هەڵدێنێ. خەریکە دەستی رادەوەشێنێ. وەی باوکە، کوڕە خۆ قسە دەکا:

ـ شتێکم بدەنێ بیخۆم.

خواردنێکی بۆ دروست دەکەین، سەعاتێکی پێ دەچێ و سەعاتێکی دیکەش و، دایکم دیسان داوای خواردن دەکاتەوە.

وردە وردە تەڕاییەك لە بن پێستی دەگەڕێ. دەست بە دیوارانەوە دەگرێ و هەڵدەستێ و بە ژوورێدا دەگەڕێ. دەچێتە بەر دەرگا رادەوەستێ و دەچێ لە بەرهەیوانێ رادەوەستێ و پاڵ وە ئەستوندەکەکان دەدا. ئیتر ئەژنۆی نانوشتێنەوە. موعجیزەیەك بووە.

دایکم پێش نەخۆشکەوتنەکەی قەت پێنەدەکەنی، ئێستا پێکەنین و زەردەخەنەی لە لێوی ناڕەوێ. ڕێك ئەو دەموساتەی دەستمان لێ شوشتبوو، گیانی وەبەر هاتەوە و دیسان ژیایەوە.

دکتۆر گانچۆ چیی نەماوە جووتێ شاخی لوول و جوانی لە نێوچاوانی بڕوێ. دیڤاییکا لە گانچۆ سەرسووڕماوتر و دەروجیران لەو زیاتر...

خەڵکی خوای هەموو سەریان لەوە سوورِ ماوە و دەستە دەستە دێنە سەردانی. دەڵێی دایکم لە دنیایەکی دیکەوە هاتووەتەوە. دایکم وەڵامی ئەو هەمووە پرسیارەی خەڵکی پێ نادرێتەوە. نازانێ چییان جواب بداتەوە. هەر ئەوەندە دەزانێ، ماوەیەکی زۆر زۆر ئاگای لەخۆی نەبووە. بەڵام ئەوەش دەزانێ لە درێژایی ئەو ماوەیەدا، بۆ تاقە ساتێکیش چییە بێهیوایی بە دڵ و مێشکیدا نەهاتووە:

ـ من کۆشێك منداڵم هەیە. هەردەبوو چاك ببمەوە ئاگام لێیان بێ. چما دەمتوانی بیاندەمە دەست یەکێکی دی؟ کێ تەرِ و وشکی کردبانەوە؟ کێ بەسەریان راگەیبایە؟ کێ درووومانی بۆ دەکردن؟ لەو ماوەی نەخۆشییەمدا بیرم لە زۆر شت کردەوە. بیرم لە هەموو شتێك کردەوە مردن نەبێ. ئەوە دەرکەوت کە مەرگیش بیری لە من نەکردبۆوە. بە تەنیشتمدا تێپەرِی و نەیدیتم. خۆ ئەگەر لێم بپرسن، دەڵێم بنیادەمێکی تەمەنی زۆر نەبێ، بێت و لەمەرگ نەترسێ و بەردەوام بیر لە مەرگ نەکاتەوە، مەحاڵە بە نەخۆشی بمرێ... دەی بۆ دەبوو من بیر لە مردن بکەمەوە؟ هەر بیرم لای ژیانم بوو. ژیان لەگەڵ منداڵەکانم. ئاخ، ژیان چەندە خۆش و باشە.

دەموچاوە رەقەڵەکەی زەردهەڵگەرِاوە. زەردێکی مەیلەورِەش.

خەڵکی خوای سەیری دەکەن و گوێیان لە قسەکانی دەبێ و شانێك هەڵدەتەکێنن و، ئیدی دەرِۆن... با برِۆن.

بەڵام دەڵێی چاکبوونەوەی دایکم، نەگبەتیی بۆ من بەدواوە بوو، چونکە رێك چەند رۆژێك دواتر، من نەخۆش کەوتم.

جارێك سەرم ژان دەکا و جارێ قاچەکانم دێشێن. لە جێی خۆم نابزووم و بەو حاڵەشەوە هەست دەکەم وەختە لە شەکەتییان بمرم. وردە وردە ئیشتیام کوێر دەبێتەوە و، بێزم لە هەموو شتێك هەڵدەستێ. حەزم ناچێتە هیچ شتێك. ورگم هەستاوە و بەردەوام با دەکا. ئێستا ئیدی ناتوانم هەر بجووڵێم.

باوکم لە باوەشم دەکا و دەمباتە لای دکتۆر گانچۆ.

ـ چیتە ریوەڵە؟ مێشوولە شەقی تێهەڵداوی؟ نەخۆش کەوتووی؟ کاری باشترت لەدەست نەدەهات؟ هەر دەبێ هاوارت لێ هەستێ؟

کراسەکەم تا بن چەناگەم هەڵدەداتەوە. لەسەر تەختەکە درێژم دەکا و بە پەنجەی زرم زرم لە زگم دەدا. زگم وەك دەهۆڵی لێ هاتووە.

ـ ئەوە لە ئاو بکە و بیدەیە بخواتەوە.

باوکم بە کۆڵ خۆیمدا دەدا و دەمباتەوە ماڵێ. گەردەکە لە ئاو دەکا و ئەوەندەی تێك وەردەدا، تا وەك قسلاو سپی دەبێ.

ـ هەڵێقورێنە داریە.

یەکبین بە سەرمییەوە دەنێم. دەڵێی قوزەڵقورتە. دڵ و ریخۆڵەم تێکەڵ دێ. دەیهێنمەوە.

رۆژەکانی دواتریش، ئەو گەرداوەی دکتۆر گانچۆ رایسپاردووە، هەر دەرخواردم دەدرێ. بەڵام چەندی ئەو ژەهری مارە پتر دەخۆمەوە، لەشساغیم پتر تێك دەچێ.

ئاخرییەکەی پەنا دەبەنە بەر دیڤاییکا. ئەویش بەو پەنجانەی کە دەڵێی چنجرووکی هەڵۆن، لە پشتم بەردەبێ. نێوگەڵ و بن باڵم دادەماڵێ. نازانێ چ دەردێکمە، هەر بۆیە پەنا دەباتەوە بەر شێوازەکانی خۆی:

دەمبەنە نێو ڕاڕەوەکە و لە تەنیشت کوانووەکەوە لەسەر باوەشێك کا و کلۆش درێژم دەکەن. داوا دەکا لەتە تەنەکەیەکی بۆ بێنن. پلێتەکە دەکاتە شتێکی وەك تاوە و، دارێکیشی بۆ دەکاتە دەسك. ئینجا باوکم دەنێرێ لەتێ قورقوشم بکڕێ و بۆی بێنێ. قورقوشمەکە گەیشت و دیڤاییکا چەند لەتێکی لە تاوە دەسکردەکەی دەخا و دایدەنێ لەسەر ئاگرەکە بتوێتەوە. مەنجەڵێکی گەورەی ئاویش لە تەنیشت منەوە دادەنێ بۆ ئەوەی قورقوشمە تواوەکەی تێ بخا. قورقوشمەکە رەق دەبێتەوە و دیڤاییکا

له رووی ئەو سەر و بیچمانەی قورقوشمەکان پاش توانەوە و توندبوونەوە دروستی دەکەن، جۆری نەخۆشییەکە و دەرمانەکەی دەدۆزێتەوە.

ئەوە قورقوشمەکە تواوەتەوە. پیرەی جادووباز لە ئاوەکەی دەخا قورقوشمەکە هەر وێك دێتەوە و لە ئاوەکەدا چزەیەکی دێ و دەتەقێ. لەتێکی بۆ لای من دێ و بە دەموچاومەوە دەنووسێ.

نەخۆشییەکەم، وەك چۆن ئاگرێکی بە ئاویدا بکەن، دامرکاوە و رۆیشت و نەما. رێك وەك نەخۆشییەکەی دایکم...

ئەو دیڤاییکایە دەستی شەیتانی لە پشتەوەڕا بەستووە. عەجەب بیژییەکە. من کە هیچ بڕوام بە نوشتە و جادووان نییە. دایکم کە ئەو قسە پڕوپووچانەی بەگوێدا ناچێ. بەڵام وەختێك ژان و ئازار تەنگ بە بنیادەم هەڵدەچنێ، باوەڕ بە هەموو پڕوپووچێك دەکا.

*

*

*

فلۆریا فلۆکا ـ شینگێڕەکەی کلێسا، دڵی چووەتە سەر یەکێك لە کچەکانی گوندەکەی دراوسێمان. شینگێڕ ، یەکێکی رەقەڵەی ریوەڵەی دەموچاو چرچەیە، نۆبەتێ جگەری دەتوێنێتەوە. لەبەر میحرابی کلێسا گۆرانی دەڵێ و دەنگێکی زۆر خۆشی هەیە. زمانی دەڵێی هەسانی شەیتانە هێندە لووسە و، جگە لەوەش، ئەوەندە گەرموگوڕە لە ئاوەدانیدا هەر مەپرسە. چیی نەمابوو بیکەنە سکرتێری ناوەندەکەی قایمقامی.

بەڵام دوو خەمی گەورەی هەیە، کە خورد و خەویان لێ تاڵ کردووە: یەکەمیان ئەوەیە کە هەموو کچەکان دەزانن فلۆریا خێر لە لاوێتیی خۆی نابینێ و مەرگ بۆسەی بۆ ناوەتەوە، هەر بۆیە هیچیان مێردی پێ ناکەن. خۆشی بکوژێ هەر شینگێڕێکە و هیچی دی. راستە داهاتێکی باشی هەیە، بەڵام

ئەوە بەس نییە. ئەگەر پیاو بوایە و هەر نەبیّ تۆزێك پارەی پاشەکەوت کردبا، دیسان دەیتوانی تەماحی ئەوە بنێتە بەر کچێك، کە ئەوە نەخۆشە و تەمەنێکی وای نەماوە، هەر نەبیّ کچە دەبێتە بێوەژنێکی دەوڵەمەند. یانی ئەگەر توانیبای ببێتە سکرتێری قایمقامی، قیت و قنج دەبۆوە و باری ژیانی دەگۆڕا. بەڵام بۆ نەگبەتی، جێی سکرتێری چۆل نییە: ژیکاستانسکۆ، میرزاکەی ئێستای قایمقامی، راستە کەسێکی لەشساغ نییە، بەڵام هەرچۆنێك بیّ ئەرکە ئیدارییەکانی باش رادەپەڕێنیّ و هەست بە بەرپرسیارەتی دەکا. دیارە هیچ دوور نییە ئەمڕۆ و سبەی شینگێڕەکەی کلێسا سکرتێرەکە بنێژیّ. ژیان و رێکەوتە ئیتر. بەڵام لەوانەشە پێچەوانە بێتەوە. یانی دوور نییە ئەمڕۆ نا سبەی، ستانسکۆ ناوی شینگێڕەکە لە دەفتەری ئاماری مردوواندا بنووسیّ و تەسکەرەکەی بەتاڵ بکاتەوە.

ئەوە قسەی خەڵکی ئاوایین و هەر کەسە و جۆرێك دەیکا.

فکرێکی سەیر و سەمەرە کەوتووەتە مێشکی شینگێڕەکەوە و، بەرۆکی بەرنادا. ئەویش ئەوەیە، بە نوشتە و جادووان میرزاکەی قایمقامی زووتر بمرێنیّ.

زۆر جاران نیوەی شەویّ هەستاوە چووەتە لای دیڤاییکا و، بە تێر و تەسەلی قسەی بۆ کردووە.

دیڤاییکا پێی گوتووە:

ـ ئەوە گاڵتە نییە. تا ئێستا جادووم لەکەس نەکردووە بمریّ. ئەوە نەگبەتییەکی گەورەیە بنیادەم بە تەلیسم و جادوو یەکێك بکوژیّ. بەڵام لەبەر خاتری تۆ، ئەگەر پارەیەکی باشیش بدەی، لەبەر خاتری تۆ چ دەبیّ با ببیّ، چش.

شینگێڕ دەکەوێتە ریّ و دەچیّ پارە لە یەکێك لە بانکەکانی شاری قەرز دەکا و دێتەوە دەیداتە دیڤاییکا.

دیڤاییکا دەست بەکار دەبیّ. بەڵام هەر خۆی و شینگێڕ ئاگادارن. جا ئیدی چۆن بوو کە هەموو ئاوایی پێیان زانییەوە، هەر خوا دەزانیّ. لەوانەیە شینگێڕ خۆی قسەی تێدا رانەوەستابیّ و زمان

بەهاوار بێ. چونکە دیڤاییکا خۆی لەو شتانەدا هەر دەڵێی زاریت دادووریوە. خۆ ئەگەر پێی خۆش نەبێ، ئیزراییلیش ناتوانێ قسەیەکی لە بن زاری دەرکێشێ و، قورقوشمیشی لە گەرووی بکەن لە سەر جادووەکانی، قسەیەکی لە زاری دەرناپەڕێ.

لە لای وێستگەی شەمەندەفەرەکەوە، لە داوێنی گردەکە، گۆڕستانەکەی ئاوایی هەڵکەوتووە، کە لە ساڵی کۆلێراکەدا دوو ئەوەندە گەورە بۆوە. رێك چەند هەنگاوێك لەوبەری ئاسنەڕێیەکەوە، پێنج یان شەش شەقاو ئەولاتری، کۆنە کلێساکەی گۆڕستانی لێیە، کە بە دار دروست کراوە. دەڵێن ئەم کلێسایە زۆر پێش ئەوەی تورکەکان بەسەر ئەوبەری دانوبدا زاڵ بن، بە دەستی یەکێك لە دەستڕەنگینەکانی پالێڤێنا، تەنیا لە چلۆچێو و داری یەك درەخت دروست کراوە. ئیمانداران لە چلەی زستانێدا دوو جاران بە خێشکەکانیان بەسەر بەستەڵەکەکەی دانوبدا پەڕیونەتەوە و لەتکەدارەکانیان هێناوەتە ئێرە، ئینجا کابرای دەستڕەنگین هاتووە و لێکی بەستوون و، ئینجا دەستڕەنگینێکی دیکە هاتووە و ئەو شەمایلانەی بە دیوارەکانەوەن، پێوەی هەڵواسیون.

کلێساکە زۆر بچووکە. ئەوپەڕەکەی بیست کەسێك تێیدا جێیان دەبێتەوە. وەك بڵێی ئەودەم ئاواییەکە هەر ئەوەندە بوون. ئەو گڵەی لەگەڵ تێپەڕینی ساڵەکاندا لە پشت دیوارەکانی کەڵەکە بووە، وای لێ کردووە پێت وابێ کلێساکە رۆچووە. ئێستاش هەر لەو سۆنگەیەوە لە یەکەم رۆژەکانی دانرانی جوانتر دیارە... ئەو کوندەپەپووانەی هەموو شەوێ لەسەر دیرەکی تەلی تەلەفۆنخانەی دەم ئاسنەڕێیەکە هەڵدەنیشن و، لە چەقی تاریکەسەلاتەکەدا بە دەنگە شوومەکەیان دەخوێنن، لە نێو برجی کلێساکەدا هێلانەیان کردووە... ئەو کلێسایە تەنیا پرسەی تێدا دادەنرێ... منداڵێك دەچێتە سەر برجەکە و زەنگی کلێساکە رادەوەشێنێ. کوندەکان هەترەکچوو دەردەپەڕنە دەرێ و، رووناکایی رۆژەکە گێژ و وێژیان دەکا و، چاویان بە شەوارە دەخا.

کۆتەڵەکان مۆرکە خواردوونی و دایڕزاندوون.

لە ئاوایی، کوڕێژگەیەك مردووە.

بەستەزمانە دوو حەفتە بوو زاری هەڵنەدەپچڕا. دەتگوت دووعاگیر بووە.

دایك و باوك و خزم و کەس و کار  و ئاشنا و ڕۆشنا بەدوای قەشەدا، هەتا گۆڕستان لەگەڵ تەرمەکە هاتوونەتە گۆڕستان. کە دەچنە نێو کلێسا، مۆمەکان دادەگیرسێنن و لە پڕ هەموو سەریان سووڕ دەمێنێ: ئەو پیاوچاکانەی کۆتەڵەکانیان بە دیواری کلێساکەوە هەڵواسراوە، هیچ کام چاویان نییە. یەکێك هاتووە و بە نووکی چەقۆ چاوی هەمووانی دەرهێناوە.

قەشە بیر دەکاتەوە: پەنا بە خوا. تۆ بڵێی کێ وای کردبێ؟

پیاوچاك و حەوارییەکان هەموو کوێر کراون. هیچ کامیان چاویان نییە. هەموو فکریان بۆ دیڤاییکا دەچێ.

کار کاری دیڤاییکایە. ئەو چاوی پیاوچاکەکانی دەرهێناوە.

نیکۆلای مێلۆچل، پیرەقۆڵتڕ ڕاکێش ڕاکێش دێنێتە پۆلیسخانە و تێهەڵدانێکی باشی تێهەڵدەدا و بە مست و پێلەقە پشتی لە زگی نەرمتر دەکا. هەڕەشەی لێ دەکا، کە ئەگەر حاشای لێ بکا، بە مستان دەیکوژێ.

دیڤاییکا شتی وا ناڵێ:

ـ من چاوی پیاوچاکانم دەرنەهێناوە. خۆ پێم گوتی من وام نەکردووە. بمکوژە و گوناحێکی دیکە بخەرە سەر تاوانەکانی دیکەتان، بەڵام هەر ئەوەیە گوتم... دەی بۆ ڕاوەستاون و دەستەوستانن؟ یاڵا دەی، بمکوژن و ناچار بن ڕۆژی قیامەتێ تاهەتایە لە قەڵاندۆشم بکەن. وەك قابیل کە هابیل بە کۆڵ دەگێڕێ.

مێلۆچل دڵی بەوەندە خۆشە کە شانی پیرەژنە بگرێ و، فڕێی بداتە نێو خاك و خۆڵەکەی دەرێ.

دیڤاییکا به لۆژەلۆژ خۆی دەگەیەنێتەوە ماڵێ و چەند رۆژێك دەکەوێ و چاك دەبێتەوە، بەڵام ئەو پیاوچاکانەی له کۆتەڵەکاندا چاویان شین بوو، پاش ئەوەی به نووکه چەقۆ دەرهێنران، بەو هەمووە پیرۆزی و هەرِوگیڤەیانەوە، هەر وا سەکەت مانەوەوە و مانەوە.

به دەردی جەنابی دۆمیترسکۆ، ئەگەر ئەوانە پیروپیاوچاکن و با بەرەی خۆیان له قورِێ بێننه دەرێ. ئەوان بەبێ چاویش دەتوانن ببینن. ئەوە ئێمەی داماوین، بۆ دیتن هەر دەبێ چاومان هەبێ.

*

*

*

پاش ئەو ئاژاوەیەی کەوتە گوندان، وەختێك، که ئیتر گوللەبارانکراوەکان دەبوایە له گۆرِەبەکۆمەڵە بێ کێل و خاچەکاندا تەواو پوابێن* و، دیسان گژوگیا لەسەر ئەو گۆرِانە روابێ و سیس بووبێتەوە و بووبێتەوە خۆڵ، وەختێك که رزگاربووەکان به ئێسك و پرووسکی هارِدراوەوە له زیندان و سیاچاڵەکانەوە گەرِانەوە ماڵێ، شەوێکیان کابرایەکی چوارشانەی سوورهول، که سمێڵی دەتگوت کلکە دووپشکە، به جانتایەکی بچووکەوە له شەمەندەفەر دابەزی.

شەمەندەفەر، به پەنجەرە رووناکەکانییەوە به دەم دانووبدا کەوتە رێ و کابرا قژسوورەکە له وێستگەکە بەجێ ما. وێستگەکە لەبەر تیشکی چرا لالەیەکی بچووك، رووناك بوو. دەوربەر تاریکی بوو و شەو.

رۆتزۆی پاسەوان پرسیی:

ـ به کام لادا دەرِۆی؟

ـ من سبەی لەو گوندە کارێکم هەیە. دەمەوێ جێیەك بدۆزمەوە ئەمشەو لێی وەحەسێم.

---

* دەپوێ: شتێك که به وشکی دادەرِزێ و دەبێتەوە خۆڵ.

ـ تۆزێك ئەستەمە. لێرە میوانخانە و شتی وا دەست ناکەوێ. تەنیا چەند مەیخانەیەکی لێیە. ڕێبوار لەم گوندە نامێننەوە. ئێرە سەرەڕێیە.

ـ ئەی ئەگەر یەکێك ڕێی کەوتە ئێرە، تەختێکی خەوی دەست ناکەوێ شەوێ لەسەری بنوێ؟ کاکە پارە دەدەم بۆ ئەو تەخت و ژوورە، تێدەگەی؟ تەنانەت بۆ ئەو زەحمەتەی جەنابیشت، پارە دەدەم.

ـ دەی باشە. دەرۆینەوە. با بچم لە بەرپرسی وێستگەکە ئیزن وەرگرم کە لەگەڵتان بێمەوە ئاوەدانی. لە دەرگای چەند ماڵێك دەدەین، با بزانین چ دەبێ. لەوانەیە یەکێك لێمان بکاتەوە.

هەردووکیان پێکەوە بەدەم چۆمەکەدا وەڕێ دەکەون و لە پردەکە دەپەڕنەوە و دەچنە گوندەکەی ئەوبەری چۆمەکە.

پاسەوانەکەی ئاسنەڕێ هەر وا لە خۆوە دەڵێ:

ـ ئەم ماڵە پیرەکچێکی تێدایە، بەتاقی تەنێ دەژی. دوو ژووری هەیە. لەوانەیە بکرێ یەکیان لێ وەرگرین تا بەیانی تێیدا بنووی.

لە دەرگای پاندێلێ چیۆشکای قەیرەکچ دەدەن. پیرەکچە لێیان دەکاتەوە و ڕازی دەبێ تاقە شەوێك چەند پیاوێکی نامۆ لە ماڵەکەی ڕاگرێ.

کابرا لەوێ مایەوە و... ئێستاشی لەگەڵدا بێ هەر لەوێیە. خەڵکی خوای، بۆیان دەرکەوت ناوی دۆمیترسکۆیە. ماوەیەك هەر لە ژوورێ نەهاتە دەرێ. دوایی وردە وردە هاتە حەوشە و ئاخری پێی نایە کۆڵان و وردە وردە لەگەڵ خەڵکەکەش تێکەڵ بوو.

ـ شتفانێ زۆر ڕاوەستا. بەڵام هەقی بوو سەبر بگرێ. چاوەڕێی بەختی خۆی بوو.

ـ ئەویش چ بەختێك. مێردی بە کابرایەکی شاری کرد.

ـ ئەوەی باشە، مێردەکەی نایبنێرێتە دەشتێ کار بکا.

دۆمتیرۆ دۆمیترسکۆ، ماوەیەك بەملاوئەولادا خولایەوە، بە شوێن شتێکەوە بوو خۆی پێوە بخافڵێنێ، کارێك کە خۆی پێوە خەریك بکا.

خەڵك پێیان دەگوت: کاك دۆمیترسکۆ، تۆ دەبوایە لێپرسراوی ماڵیاتوەرگرتن بوایەی، چونکە بە دەستوپلت را دیارە پیاوێکی جوامێری. ئەگەر وشکەساڵی و رسقبڕنیش بەسەردا هاتبایە و نەمانتوانیبا لە کاتی خۆیدا ماڵیاتەکانمان بدەین، هەر زۆرت لێ نەدەکردین.

ـ دنیایەك ئەمەگدارتانم کە وا متمانەتان پێمە. بەڵام من پیاوی ئەو کارانە نیم.

ـ بۆ نی؟ خۆ کاری دەوڵەتی زۆریش ئەستەم نین. چ بیکەی و نەیکەی وەك یەك وایە. سەری مانگ مووچەی خۆت وەردەگری.

ـ مەسەلە هەر ئەو مووچەیەیە. لە قوڕگی من ناچێتە خوارێ.

ـ دەی خۆ ئەوە هەر ئەو پارەیەیە، کە پۆلیسیش دەیخوا.

ـ چاودێرەکانیش هەروەتر.

ـ قایمقامش هەروا.

ـ بۆ پێت وایە ئەو پارەیەی قەشە دەیخوا، زۆر لەوان حەڵاڵترە؟

ـ بە حەڵاڵی بێ، بەس مووچەی مامۆستا حەڵاڵە. لە رێیەکی شەرافەتمەندانەوە پەیدای دەکا. چونکە مامۆستا لە بری ئەو پارەیە، مێشکی خۆی ماندوو دەکا. چونکە لە جێی ئەو تۆزە پارەیە، بۆ بابی خۆی ئاقڵ دەبێ بەشکم منداڵەکانی ئێمە فێری خوێندنەوە و نووسین بن.

ـ دیارە ئەگەر بۆ بابی خۆیان ئاقڵ بن.

ـ وەك بیستوومە ئەودەمەی هەرا و پشێوییەکە ساز بوو، هەندێ لە پۆلیسەکان لای خەڵکیان گرت.

ـ زۆر زۆر کەم. زۆربەیان خەڵکیان دایە بەر دەسرێژ.

ـ جا چەم بێ چەقەڵ دەبێ؟

ـ بەڵام چەمەکەی ئێمە پڕ پڕە لە چەقەڵ.

ـ ئاغاکان...

ـ مخابن نەمانتوانی لە کۆڵ خۆمانیان بکەینەوە.

ـ ئەستەم بوو. ئەوان چەکیان هەیە، تۆپ و تفەنگیان هەیە، ئێمە هەر دار و تێلاّمان بەدەستەوەیە.

ـ خۆ هەر نەبێ داخی دڵمان پێ رشتن. هەر هیچ نەبێ هەناسەیەکمان کێشا.

ـ جا دواییش ئاغا تۆڵەی خۆیانیان کردەوە.

ـ لە شۆڕشەکەدا، لە هەموو وڵات چەند ئاغا تۆپین؟

دیارە جەنابی دۆمتیرسکۆ زۆر تێ دەگا. دەڵێ: هەر دوو سێیەك. دەکرێ بە پەنجەی دەست بیانژمێری.

ـ ئەی کوێخاکان؟

ـ لەوانیش چەند کەسێك. ئەوپەڕی دەکرێ بە پەنجەی هەردوو دەست بیانژمێری. ئەوپەڕەکەی یەك دوو پەنجە ناژمێری و تەواو.

ـ ئەی لە قوونڕووت و پێخواسەکان چەند کوژران؟ شۆڕشەکە کە دامرکایەوە، بە ئەمری ئاغا چەند کەسێکیان شوێنبزر کردن.

جەنابیی دۆمیترسکۆ دەڵێ:

ـ هەندێ دەڵێن یازدەهەزار کەس، هەندێ دەڵێن پانزەهەزار کەس. بەڵام کەسانێکش دەڵێن، دڵنیان حەڤدەهەزار کەس بوون بە ژن و پیاو و منداڵەوە کە بە ئەشکەنجە کوژراون یان گوللەباران کراون. ئەوانیان کوشتووە بەبێ ئەوەی زەحمەتی نووسینی ناوەکانیشیان بکێشن. دەزانی بۆ؟ لەبەر ئەوەی قەت روون نەبێتەوە چەند کەس بوون.

ـ ئەی لەو بێشەرەف و بێناموسانە. خەڵکی بێتاوانیان کۆمەڵکوژ کرد و، دیسان هەر وەختێك بمانەوێ سەر هەڵێنین، دیسان ئاوامان لێ دەکەەوە. کوڕە هەی بێناموسینە.

ـ ئەوە پێوەندیی بەخۆمانەوە هەیە.

ـ ئاخر چۆن؟

ـ ئەگەر دیسان وەك پێرار، بەبێ ئەوەی کەس ئاگای لەکەس بێ و هیچ گوندێك ئاگای لە گوندەکەی دیکە بێ و بەبێ بەرنامە و رێوشوێنێك خەڵك بیانەوێ راپەڕن و کەسیش سەرکردەیان نەبێ، دیسان هەر ئەو تاس و حەمامە دەبێتەوە. یانی ئاغاکان، جەندرمە و سەربازمان تێ بەردەدەن و، هەموو قەڵتوبڕ دەکەن.

ـ یانی کێ دەبێ رێوشوێنەکان بکێشێ؟

ـ جەنابی دۆمیترسکۆ دیسان دەڵێ:

ـ کەنگر و ماست بەوەختی خۆی، ئەودەم پیاوی خۆی پەیدا دەبن.

ـ ئەی ئەوان ئێستا لە کوێن؟

ـ دەبێ لە شوێنێك هەر هەبن. ئەگەر نەشبن، ئاخرییەکەی دروست دەبن. لە دایك دەبن.

ستۆیانگانچۆی پیر، کە وەك دیشی کەرِەناژەن، یەکێکە لە جەنگاوەرەکانی ساڵی ١٨٧٧، لە حاڵێکدا چاخی لە سەر سینەی دەکێشێ، هاوار دەکا:

ـ ئەی خوای گەورە، تا زووە بیاننێرە.

ـ مامە گیان، تۆ هەرچۆنێك بێ، ناگەیەی بیانبینی. مەبەستم ئەوەیە، ئەو منداڵانەن کە وا ئێستا لەو خۆڵ و خاکی کۆڵانەکاندا گەمە دەکەن.

ئەو منداڵانەی لە کۆڵان و خۆڵ و خاك دەگەوزێن، ئێمەین. لەگەڵ ئیتزیکۆ و تۆتانۆ و تۆرتۆریکا و گانگۆ، قەڵاندۆشکانێ دەکەین. ئیتزیکۆ من لە قەڵاندۆشکی دەکا و تۆتانۆیش تۆرتۆریکا و گانگۆ بەتەنێ ماوەتەوە. نە کەس لە کۆڵی دەکا و نە ئەویش کەس لە قەڵاندۆشی خۆی. وەك جوانوو، لە نێوماندا دێ و دەچێ.

که نۆرەی ئەو ئیتزیکۆیە دێ من لە کۆڵ بکا، خۆم فڕێ دەدەمە سەر پشتی و دەیدەمە بەر شووڵکان. وەك بارگینێکی راستینە بێ، ئاوا لێی دەدەم. ئەویش دەست دەکا بە جووتەخستن و غاردان و خیلاندن. کە لە غاردانێ ماندوو بوو، نۆرەی من دێ لە کۆڵمی بکەم. جا ئەمجارە نۆرەی منە غار بدەم و کوڕژن بکەم. ئای دەبمە چ ئەسپێکی تۆڕ. جووتە داوێم و دەحیلێنم و، لووشکەی وا داوێم، خۆشم دەترسم. چونکە ئیتزیکۆ فڕێ دەدرێ و بەردەبێتەوە و لە خۆڵەکە دەگەوزێ و دەتۆرێ:

ـ ئیدی من لەگەڵ تۆ گەمە ناکەم.

ـ کارێکی باش دەکەی.

دیسان ئاغای دۆمیترۆ دۆمیترۆسکۆ ـ زاواکەی پاندلێ چیوشکا ـ کە خەڵکی ئاواییەکەیە، مەزەندەی جۆراوجۆر دەکا.

دەڵێن: ـ لەوانەیە سیخوڕ بێ و ئاغا بە ئانقەست ناردبێتیان، بزانن دەراوی زارمان چۆنە.

ـ لەوانەشە بەرەڵایەك بێ و بیەوێ جێ قوونی خۆی لێرە خۆش بکا.

ـ لەوانەشە یەکێك بێ لە شۆڕشگێڕە گەورەکان و، بۆ شوێنەونکە هاتووەتە ئەم لایە.

ـ خوا باشتر دەزانێ. چما نەتانبیستووە دەڵێن: دز گوناحێکی لە ئەستۆیە و بوختانکەر هەزار؟

ئاخرییەکەی دۆمیترسکۆ توانیی کارێك بۆ خۆی بدۆزێتەوە. بوو بە نوێنەری بازرگانیی یۆنانییەکان. دەهات بە پارەی یۆنانییەکان دانەوێڵە و خەلەی ئەو جووتیارانەی دەکڕییەوە، کە هەیانبوو. دیارە دەگمەن وا هەیە جووتیارێك بەرهەمی لێ زیاد بێ و بیەوێ بیکاتە پارەی وشك، بەڵام کەسانێك هەر هەبوون کە زەوی و زاری باشتریان هەبوو.

شتفانێ چیوشکا، لەوەتەی مێردی کردووە، تەڕوبڕتر بووە. زیت و زیرەکتر بووە و، گورجوگۆڵتر دێ و دەچێ و لە حەوشە و باخچەکەدا گۆرانیی ئاشقانە دەڵێتەوە. جاری وایە داڵغە لێ دەدا و خەم لە دڵی دەنیشێ:

ـ ئەوە چیت بەسەرهاتووە شتفانیێ؟

ـ خەیاڵم لای مێردەکەم بوو. بنیادەمێکی سەیرە. دەترسم لە کیسم بچێ. دەترسم رۆژێك ئەو سەرەی بردوویەتی نەیهێنێتەوە. ئێستا ئیدی تاقەتی وەم نییە بەتەنێ بم. نیوەی شەوێ، لەو ئاسمانەوە کەوتە نێو باوەشمەوە. هێشتا نازانم لە کوێوە هاتووە. قەت باسی دایك و باوکیم بۆ ناکا. باسی خوشکێك برایەك، هەر هیچ. ئاگام لە هیچ نییە. هیچ کاتێك هیچی پێ نەگوتووم.

ـ دەی باشە، ئێستا کە ئەو هیچ ناڵێ، تۆش هیچی لێ مەپرسە، بەشکم ئاخرییەکەی رۆژێك خۆی وەدەنگ بێ. داخوا لەبەر چی قسە ناکا. وەك خۆ لاڵکردنی هەموو پیاوێك.

*

*

*

ـ بەرەبەری پاییزێ بوو.

ئیتر پاییز بەسەردا هات.

گەنمەشامی هەڵگیرایەوە. رەزەکە، پاش ئەو پەتایەی لێی دا، دیسان چەقێنراونەتەوە و، بۆ ئەوەی شەختە نەیبا، لە بن کایان ناون.

قوتابخاە دیسان کراونەتەوە. دار گەڵا زەردەکانیان هەڵوەراندوون.

ـ با و بۆران.

باهۆز.

خوناوکە، رێژنە. بارانی پەڵە.

فلۆریافلواکای شینگێڕ خوێن دەڕشێتەوە. ئیتر ناتوانێ وایلۆك بچرێ. تەنانەت ناتوانێ لە ژوورێش بێتە دەرێ. بانگی قەشە بۆلیۆك دەکا، بۆ ئەوەی دان بە تاوانەکانیدا بنێ.

ـ باوکە، من دیڤاییکام ناچار کرد چاوی پیروپیاوچاکەکان دەربێنێ. جادووی بۆ کردم بۆ ئەوەی ستانسکۆ زووتر بمرێ. دەمەویست جێیەکەی بگرمەوە. دەمەویست ببمە سکرتێری قایمقامی. بەڵام ئیتر دەبمەوە خاك و خۆڵەمێش باوکە بۆلبۆك.

قالاو، ڕێورەسمی ئایینیی بۆ ڕێك دەخا. بەڵام کە لە مەیخانە یەك دوو پێك شەرابی سوور فڕ دەکا، ئەویش بەرە لەسەر هەتیوان هەڵدەداتەوە.

ئینجا هەواڵەکە بە هەموو ئاوایی وەردەبێ.

شینگێڕەکە مردووە.

منداڵۆکەیەك ناقووسەکەی کلێسا دەزرینگێنێتەوە.

من منداڵەکانی دەستەکەمان دەچینە سەیری ناشتنەکەی.

شینگێڕ، کە لە تابووتەکەیدا خەوتووە، زەرد هەڵگەڕاوە و تێك چرژاوە.

پیاوچاکەکان، لە نێو چوارچێوەکانیانەوە کە بە دیوارە دارینەکانەوە هەڵواسراون، چاوەکونکراوەکانیان کە سەردەمانێك ــ زۆر زۆر لەوەپێش، خوا دەزانێ کەی ــ بە ڕەنگی شین کێشرابوون، تێ بڕیوە.

ژیکاستانسکۆی سکرتێری قایمقامیش چاوی لێ هەڵناگرێ. بە چاوی زیندوو، چاوی ڕاستینە، بە چاوی بنیادەم.

# ١٤
# تۆزێك نان

*

*

*

قوتابخانەی ئاوایی کراوەتەوە.

من دوایین سالّمە. لە رادەبەدەر خۆشحالّین، ئاخر مامۆستا پۆپسکۆ براگادیرۆ هاتووەتەوە لامان. من هەر لە سەرەتاوە لای وی دەستم بە دەرسخوێندن کرد. پیاوێکی چوارشانەیە، چاوی جوان و سمێلّی رێك و دەنگێکی خۆشی هەیە. جارێکیان ئێمەی بەجێ هێشتبوو و چوو بوو لە شاری ببووە مامۆستای مۆسیقای دواناوەندی. پار سەرەتای پاییزێ دیتمان پاکێ ئیلیسکۆ هاتووەتە جێی. ئەویش پیاوێکی لەخۆگەڕاوە بوو، جلوبەرگێکی لەبەردابوو، لە بەرکۆنی دەبریسکاوە و کلاّوێکی حەسیری لەسەر دەنا. هەر لە یەکەم دیداردا بێزاری کردین. زەردەلّەیەکی چرچەی سیرمە، کە خەمی دنیا لە چاویدا بوو. بە حاستەم وەلاّمێکی بەخێرهاتنکردنەکەی ئێمەی داوە و، دەستەوستان چوو لە پشت مێزەکەی دانیشت و، ناومانی خوێندەوە. وەك باکا ـ ژنەکەی تۆبێیی ـ بە گنەگن قسەی دەکرد و ئێمە ناچار بووین گوێقولاّخ بین بەشکم لێی حالّی بین. لە جێی خۆمان دەستمان دەکردە جوولّەجوولّ و سیخورمە لەیەکتردان و قسەکردن بە دەنگی بەرز. ئینجا بۆمان دەرکەوت، بەرێزیان، کەڕیشە.

دەستی کرد بە پرسیاران. کلاّوەکەشی تیسکن ببوو. هەر هات زانیمان و، دووقڕانییەکەمان کەوت.

لێمانی پرسی: ئەمڕۆ چ وانەیەك فێر بوون؟

پێمان گوت.

گوتی: زۆر باشە. هەر ئەو لە دەفتەرەکەتاندا بنووسنەوە.

نووسیمانەوە. هەر ئەو دەرسەمان لە دەفتەرەکەماندا نووسییەوە و، زەنگی پشوو چووینە حەوشە.

دیسان هاتینەوە پۆل. مامۆستا خەریکی رۆژنامەخوێندنەوە بوو. رۆژ تا ئێواریٚ هەر رۆژنامەی دەخوێندەوە. منداڵ هەر کەسە و چیی پیٚ خۆش بوایە دەیکرد. کیٚ حەزی لە کار بوایە کاری دەکرد و پێی خۆش نەبوایە نەیدەکرد. لە کەسیان نەدەپرسییەوە. دەرست زانیبایە یان نا، هەر لە بیست پێنجی دەدایەی. پێنج. بەڵام کۆتایی ساڵ بەوپەڕی سەرسوورمانەوە سەیرمان کرد هیچ کاممان نەکەوتووین. هەموومان دەرچووین. چ ئەوانەی دەرسیان خوێندبوو، چ ئەوانەی لەو ماوەیەدا تەنانەت خوێندنەوە و نووسینیشان لەبیر چووبۆوە.

زۆری نەبرد لێمان روون بۆوە، کە جەنابی ئیلیسکۆی مامۆستامان، بۆخۆی لەسەر یەك تا ساڵی یەکەمی دواناوەندیی خوێندووە. کە لە مێزەکەی نزیك دەبووینەوە، بۆگەنی خۆی و جلوبەرگەکانی بە لووتماندا دەهات و، پشووی رادەگرتین.

هاوپۆلەکانم دەیانگوت:

ـ ئەو کابرایە، لەو رۆژەوە کە قەشە سیٚ جارانی لە ئاوی پیرۆز هەڵکێشاوە، تا ئێستا ئاوی بەخۆیدا نەکردووە، بۆنی تەرسی لیٚ دیٚ.

ـ کورە ئەوە دەڵێی چی. من دەڵێم ئەودەمیش ئاوی وێنەکەوتووە. لەوانەیە نەیهێشتبیٚ ئاوی وێکەویٚ. دیارە ئەوەندەی نەڕاندووە و زریکاندوویەتی، کە قەشە لە گووخواردنەکەی خۆی پەژیوان بووەتەوە و، دەستی لە ئاوی نزاکە هەڵکێشاوە و، لە دوورەوە پێیدا پرژاندووە.

ـ وا قسە دەکا، وەك بڵێی خۆی زۆر لەو زیاتر دەشوا. پێی وایە نازانین کە دایکت بانگت دەکا لە کۆلەکەدا بتشوا، دەردەپەڕی دەچییە کۆلانیٚ... مەسەلەی بزنەکەیە، بە مەڕەکەی دەگوت، ئەوێت وەدەر کەوت...

ـ ئەدی، قەل بە قەل دەڵێ رووت رەش بێ.

ـ من بۆچی خۆم بشۆم؟ جا بۆ من مامۆستام؟ ئەگەر مامۆستا بوایەم شتێك، خۆمم دەشوشت. ئێستا کە مامۆستا نیم، بۆچی خۆم زەحمەت بدەم. هێشتا تەواو خاوێن نەبوومەتەوە، دیسان پیس دەبمەوە. کەواتە هەر وا باشترە خۆم تەڕ نەکەم. تەنانەت دەموچاویشم نەشۆم.

ـ بەڵێ، دیارە.

ـ جا بۆ خۆم گوتوومە دیار نییە؟

بە باوکم دەڵێم:

ـ مامۆستای تازەمان بۆ هاتووە.

ـ لە شەقامێ دیتم.

ـ هیچمان فێر ناکا. پێم وایە هەر ناشزانێ دەبێ چیمان پێ بڵێ. تەنانەت نازانێ وەك مامۆستاش خۆی بنوێنێ.

ـ وا دیارە پستنی هەیە...

تا ئێستا پێم وابوو هەر مەکینە هەڵمییەکان پستنیان هەیە... کاکوت(خەرمانکوت) لە ناکاوێك رادەوەستێ. قایشە قورسەکەی هەڵسوڕاندن دەردەپەڕێ و بەردەبێتەوە سەر عەرزی. لە کار دەکەوێ. خەڵکەکە سەیری یەکتر دەکەن. میکانیك دەهری دەبێ و جنێوان دەدا. پستن، پستنی شکاندووە. تەعمیرکردنەکەی زۆری دەوێ.

بەڵێ، ئەوەم دەزانی. بەڵام ئەی بنیادەمەکان چۆن دەتوانن پستنیان هەبێ؟

ـ باوکە، پستنی هەیە، یانی چی؟

ـ یانی خزم و کەسوکاری لە ئۆرشەلیم هەیە کوڕم.

ـ ئەها تێگەیشتم.

ـ ئەدی، هەبوونی کەسوکار لەو سەرسەرووانە. ئەگەر بەرپرسێك کەسێکی پلەبالاّ بناسیّ، یان خزمیان بیّ، ئیدی نەك هۆشوگۆش و تێگەیشتنی دەویّ، نە خوێندەواری و زانیاری. دەچی لەبەردەم ئەوان دەنوشتێیەوە  و کرنۆش دەبەی و، دەستودیارییان بۆ دەبەی، ئەوانیش وەك پیاوێکی بەتوانا بە سەرووی خۆیانت دەناسێنن و راتدەسپێرن. ئەودەم تۆ دەبیتە کارمەندی دەوڵەت و مانگە و مانگیش لە بەیتولمالّی خەڵك مووچەی خۆت وەردەگری.

ـ یانی بەو پێیە ئیلییسکۆش پستنی هەیە؟ لە ئۆرشەلیم خزم و کەسی هەیە؟

ـ ناچار دەبیّ بڵێین وایە. ئەگەرنا، کابرایەکی بێکارە و هیچوپووچی ئاوا دەبوو لە برسان سەکەت بیّ. وا دیارە ئێسقانێکیان هاویشتووەتە بەردەمی کەڵبەی لیّ بدا... ئەدی رۆڵە گیان. لەوانەیە تۆ هەرچی زانست و زانیاریی دنیایە، بخزێنیتە نێو مێشکتەوە، بەڵام ئەگەر خزمایەتیت لەگەڵ یەکێك لە مەزنانی ئۆرشەلیم نەبیّ، حیسابت چووە. دەبیّ دەست و پێت درێژ بکەی و بەرەو قیبلە درێژ بی. چونکە کەس پێت نالّیّ کەرت بەچەندی، تەنانەت سلاّویشت ناستێننەوە. لە برسان، گیانت بە قوونتدا دەردەچیّ. تازە بێت و نەشمری، رێی پاش و پێشت گیراوە و لە هیچ لاوە بەهیچ کویّ ناگەی.

❊

❊

❊

ئەستەمترین رۆژانی خوێندنم ئەو رۆژە بوو کە چوومە قوتابخانە. یەکێك لە پاسەوانەکان کە بە بەردەم ماڵی ئێمەدا رادەبرد، سەری لەسەر پەرژینەکەوە هێنا ژووریّ و بەسەر باوکمدا نەڕاندی:

ـ هۆی تۆدۆر، دەبیّ ئەم پاییزە داریە بنێرییە قوتابخانە.

باوکم گوتی: بەو مەرجەی خۆیشی حەزی لیّ بیّ.

ئەوجار رووی لە من کرد و گوتی: چۆنت پیّ خۆشە با وابیّ.

نە گوتی بچم، نە گوتی نەچم.

قوتابخانە کە کرایەوە، منیش چاوم لە منداڵەکانی دی کرد. یانی چووم.

لە ماڵی ئێمە، هەر گیۆرکێی برام وەشوێن خوێندن کەوتووە، ئەویش خوێندنێکی زۆر باش.

ئەودەم ژنەمامۆستایەك لە گوندەکەی ئێمە هەبوو، کە قژێکی زەرد و بەژن و باڵایەکی تۆکمە و پڕی هەبوو. لەوبەری چیاکانی کارپات واتە لە ترانسیلڤانی، لە ویلایەتی مۆتزییەکانەوە هاتبوو. ناوی بێرتا بوو. کوڕێکی هاوتەمەنی گیۆرکێی برام هەبوو کە لای خزم و کەسەکانی خۆی لە بۆخارێست بەجێی هێشتبوو و لەوێ دەیخوێند. گیۆرکێ منداڵێکی زیرەك بوو و زۆری حەز لە خوێندنێ بوو. مامۆستا وەبن باڵی خۆی دا و هەر کتێب و متێبانی دایە بیخوێنێتەوە. بەڵام گیۆرکێ سەرەڕای ئەوەی زۆریشی حەز لە خوێند بوو، زۆربەی جاران ناچار بوو نەچێتەوە قوتابخانە و، بۆ وێنە بەهاران ناچار بوو چەند حەفتە لەسەر یەك نەچێتەوە قوتابخانە. باوکم لەگەڵ خۆی دەیبردە دەشتێ بۆ کاروباری کشتوکاڵ. کوڕی نۆبەرەی بوو. یانی تاقە کەسێك کە دەیتوانی لە کاروبارەکانی مەزرایەدا یارمەتیی باوکم بدا و دەستێك بە بن باڵیەوە بگرێ. پاییزانیش بۆ رنینەوەی گەنمەشامی دەیبردە کێڵگەی ئاغاکان بۆ بێگاری. گیۆرکێی بەستەزمان وەختێك دەیتوانی بچێتەوە قوتابخانە، کە بەفر کەوتبوو. پرێسکەی کتێبەکانی وەبن باڵی دەدا و دەچۆوە قوتابخانە. هەر وەك یەك رۆژیش غیاب نەبووبێ.

زۆر خێرا قۆناغی سەرەتایی بڕی و پاییزی ساڵەکەی دواتر مامۆستا لەگەڵ خۆی بردییە بۆخارێست و لەوێ بە کەسوکارەکەی خۆی سپارد. براکەم  ئیمتیحانی دا بۆ پەیمانگەی شەووڕۆژانەی یەزدانناسی و، بۆ درێژەدانی خوێندنەکەی لەوێ مایەوە. خواردن و جلوبەرگەکانی قوتابخانە دابینی دەکرد. بەڵام گیۆرکێ بەر لە تاقیکردنەوەکان هەڵەیەکی سەیری کرد:

خزم و کەسەکەی بێرتا خۆشیان کوڕێکیان هەبوو. هەتیوێکی نالەباری بیژوو، کە دایك و باوکەکەی گیانیان بۆ دەردەچوو.

کوڕەش هاوتەمەنی گیۆرکیێ بوو. پێکەوە ناردبوویاننە دەرێ گەمە بکەن. لە جەنگەی یاریدا بەسەروگوێی یەکدا نووسان و بوو بەشەڕ و، هەتیوە لووسکەی شاری کە وەك بووکەڵان رازاندبوویانەوە، جنێوێکی ناخۆشی بە کوڕە دێهاتییەکە دا.

بۆ ئەوەی گیۆرکیێ ئاگر بگرێ، هەر ئەو سیخورمەیە بەس بوو و، بۆ ئەوەی دایك و باوکەش بزانن چ بووە و چ نەبووە، تا گوێ قوڵاخ بوون و دەرپەڕینە دەرێ بۆ ئەوەی بووکەڵە ناسك و نازدار و گرانبابییەکەیان لە چنگی ئەو وەحشییە بێ دایك و باوکە رزگار بکەن، براکەم گەوزاندبووی و حەوشەکەی پێ ماڵیبوو.

ـ خوا کەی ماڵت ئاوەدان بکا بێرتا گیان بۆ ئەو دەستودیارییەی بۆت هێناوین... ئەو هەتیوە وەحشییە چیی نەمابوو کوڕە نازدارەکەمان بکوژێ.

ـ گیۆرکیێ کوڕێکی زۆر تایبەتە. دیارە تۆزێك تووڕەوتۆسن و بەغیرەتە. پێم وایە شاندۆ تووڕەی کردووە. لێیان بپرسن بزانن مەسەلە چ بووە.

بانگیان کردن:

ـ گیۆرکیێ، بۆ لە شاندۆت دا؟

ـ جنێوی بە دایکم دا. من دایکم مردووە. بۆ دەبێ گۆڕ هەڵتەکێنێ؟

ـ بۆ جنێوت داوەتێ شاندۆ؟

ـ من هەر حەزم لێبوو هەندێ جنێوی بدەمێ. بەڵام ئەو تووڕە بوو و لێی دام.

زۆرزۆر دەگریا و ژیر نەدەبۆوە.

ـ ئەو هەتیوە حەیوانە. لە شاخ و کێوەوە هاتووە ئیدی، ئەوە سوعبەت و شت نازانێ. لێرە لای ئێمە جنێودان جۆرێك سوعبەتە.

ـ لەوانەیە وا بێ، بەڵام با پێتان بڵێم، ئەگەر دیسان جنێو بدا، پشتی لە زگی نەرمتر دەکەم.

چەند ڕۆژ دواتر، گیۆرکێی برامیان لە کۆڵ خۆیان کردبۆوە. گیۆرکێ توانیبووی بە خەرجی ئەوقاف لە قوتابخانەیەکی ئایینیدا بخوێنێ. هەر خولەکەی تەواو بوو (کە ئێستا شتێکی وای نەماوە) ریش دادەنێ و دەبێتە جەنابی قەشە و هەر لە بن لێوەوە دەڵێ:

ـ سوبحانەڵا، سوبحانەڵا، ئەستەغفیروڵا.

یان دەڵێ:

ـ خوایە، ئەو بەندە گوناهبارەت هیدایەت بدە.

بێرتا، مامۆستاژنەکە، ـ ئیۆنی براشمی کە زڕبرامە ـ وەبن باڵی خۆی دابوو. بەڵام بێ سوود بوو. چوار ساڵی رەبەق خۆی پێوە ماندوو کرد، ئاخرییەکەشی هەر لە جێی خۆی چەقی. مامۆستا داماوە کەڕەی بەیانی دەهاتە ماڵمان، لە جێوبانەکەی دەریدێنا و بە تێهەڵدان دەیبردە مەدرەسە. ئیۆن چەند دەقەیەك لە پۆل بەند نەدەبوو، هەر چاوی بە پەنجەرەی کراوە کەوتبا، بەقەڵەمبازێك خۆی فڕێ دەدایە دەرێ... ئەی ماشەڵا.

بێرتا کە رۆیشت، پیرەپیاوێکی ردێن سوور هاتە جێی. ناوی رایمۆنت کۆکۆ بوو. ئەوەیان بۆ ئەوەی خەڵك ناچار بکا منداڵەکانیان بنێنە بەر خوێندن، غەرامەی لێ دەستاندن و، هەڵیدەچوزاندن. باوکم ئەوەندەی پێی کرا غەرامەی دا و، ئەسکوێی لە بنی دیزەی گیڕا و هیچی بەدەستەوە نەما، ناچار هەموو بەیانیان ئیۆنی برامی لە قەڵاندۆشان دەکرد و بە شەپلاخە و شەق دەیبردە قوتابخانە و دەیدایە دەست مامۆستا.

نیوەڕۆ و نیوەڕۆ ئیۆنی داماو، بە بەری دەستی شوخاڵ شووخاڵەوە کە بە شووڵ لێی درابوو و ، بە دەموچاوی شین و مۆرهەڵگەڕاو و لاکەلەی بەئازارەوە دەهاتەوە ماڵێ و هێندەی تێهەڵدان خواردبوو کەلەلا لێی دەکەوت و، وات دەزانی ئێستا نا تاوێکی دی گیانی دەردەچێ. ردێن سوور تەنانەت جارێکیان قژی بەسەرییەوە نەهێشتبوو هەمووی دەرهێنابوو.

ئاخرییەکەی، وەختێك ئاغای رایمۆنت زانیی بە جنێو و تێهەڵدان و تەمبێکردن هیچی بۆ ناچێتە سەر، پڕی دایە براکەم و هێنایە بەر دەرگای قوتابخانە و شەقێکی تێهەڵدا و دەری کرد و گوتی:

ـ جارێکی دیکە پێت بەو مەدرەسەیەدا بێتەوە، قولەپێت دەشکێنم.

براکەم، کە لە نێوەڕاستی کۆڵانێ لە خۆڵ و خاکدا نوقم ببوو، گوتی:

ـ هەزار جاران ماڵت ئاوەدان بێ.

ئینجا خڕکەبەردێکی هەڵگرت و لە نێوەڕاستی پەنجەرەکەی دا و ورد و خاشی کرد.

شووشەکەیان بە باوکم بژارد.

ئیۆنی برام کە ئێستاش نە دەزانێ بخوێنێتەوە و نە بنووسێ، ئێستا بۆ خۆی بووەتە لاپرەسەنێکی قوونڕووت و بەکەیف، ئاو ناپیاڵێوێ.

دەڵێ:

ـ خوێندەواریم بۆ چییە تێی ریم. لە هەر چوار کوڕی ئاوایی سێیان مەلا نین و ئاسمانیش بەسەر عەرزیدا نەڕووخاوە. کچەکانیش لە سەدیان یەکێکیان دەتوانێ بە حاڵ ناوی خۆی بنووسێ.

ڕۆژی یەکەمی مەدرەسە کە تێدەپەڕێ، بە شاگەشەکەیی بەرەو ماڵێ هەڵدێمەوە بۆ ئەوەی ورد ورد ئەو شتانەی ئەو ڕۆژە دیتوومن بۆ دایکمیان بگێڕمەوە.

دایکم گوێم لێ دەگرێ و سەیرم دەکا. دەبینم لە خۆشیان گەش دەبێتەوە و، کولمەی وەك هەڵاڵە دەپشکوێن.

ـ داریە، تۆ چوویەتەوە سەر گیۆرکێی برات، نەك ئیۆن. تۆ حەز دەکەی ببیتە میرزا.

ـ پێت خۆشە؟

ـ ئەرێوەڵا پێم خۆشە. ئیۆنی برات زۆری عەزاب دام، خۆزگە لانیکەم تۆ کوڕێکی دەرسخوێن بی.

ـ لەوانەیە من بتوانم مل بدەمە خوێندن. بەڵام "لۆی"یەك و دە سەنتیم پارەی دەوێ. دەبێ بەیانی لەگەڵ خۆم بیبەم بۆ قوتابخانە. مامۆستا داوای کردووە بۆمان دەدا بە قەڵەم و کتێبی ئەلف و بێ.

ـ ئێستا بابت دێتەوە و دەتداتێ.

ئێوارێ کە باوکم لە مەزرا دێتەوە، پێی دەڵێم یەك "لۆ" پارەم دەوێ.

ـ جا ئەوەندەت لە کوێ بۆ بێنم؟ هەر هیچ کوێیش شك نابەم. لانیکەم دەبێ تۆزێك راوەستی بزانم چ دەبێ.

هەر ناوی پارە دێ، وەك بڵێی ماڵەکە دەسووتێنن، تا نەشبێتە هەرا و فەرتەنە، نابڕێتەوە. دایکم بێدەنگ دەبێ، بێدەنگ دەبێ تا چەقۆ دەگاتە ئێسقانی. جا ئیدی دەهری دەبێ و لە پڕ وەك بزووت دەردەپەڕێ:

ـ کوڕە ئیدی من دیقم کرد. باشە دەبێ تا هەم ئەو نەگبەتی و چارەڕەشییە تۆقی گەردنم بێ؟ قەت قەت فلسێکمان لە ماڵێدا نییە. قەت پاروە نانێکمان نییە.

باوکم دێتە دەنگ:

ـ من ئەوەندەم کار کردووە خەریکە پشتم دەشکێ. بەهەمووسان کوێرەوەری دەکێشین و بەهیچیش ناگەین. ئەگەر راستیتان دەوێ، خۆشمان بدڕێنین هەر بێ فایدەیە، خۆ دزییشم پێ ناکرێ.

پێرێ مامۆستا چووبووە شاری، ئەوە هاتەوە. لە وێستگە بە پیرییەوە دەچین. منداڵ بەستەی کتێب و قەڵەم بە کۆڵیاندا دەدەن و دەهێنن. منیش یەکێکیان بەکۆڵی خۆم دا دەدەم. تەنیا دوو کەس بێ کتێب و قەڵەم دەمێننەوە: من و کوڕەکەی ئۆنۆفرەیکۆشی مریشك دز.

کوڕەکەی کۆش، سوورەکوانی لێ هاتوون و گیانیشی کولکنە. هەر گونیشی پێ نابزوێ کە کتێبی بەر نەکەوتووە.

ـ هەتبێ و نەبتێ وەك یەکە.(بە دەنگی بەرز بیر دەکاتەوە.)

ئۆنۆفرەیکۆش لە نێو هەموو کاروباری دنیادا مریشکدزینی هەڵبژاردووە. شەوانە لە پەرژینی خەڵك وەسەر دەکەوێ و، سەگەل بێدەنگ دەکا و، بە پێدزە خۆی دەخزێنێتە کۆلیتی مریشکانەوە، یان دەچتە سەر ئەو دارانەی مریشکیان لێ هەڵنیشتوون و، مریشك و کەڵەشێری خەڵك دەدزێ.

ـ باشە بۆ مریشك دەدزی ئۆنۆفرەی؟

ـ بۆ ئەوەی لەگەڵ منداڵەکانم بیخۆم. ئەگەر نەدزم چ بخۆم؟

ـ دەی کار بکە.

ـ لە کوێ؟

ـ لای ئاغاکان. شەق لە قوونی سەگ بدەی، ئاغا دەڕی.

ـ رەنگە وابێ، بەڵام ئەوان دەیانەوێ خەڵك بە خۆڕایی و مفتێ کاریان بۆ بکەن.

ئاڤێندریا قەت باسی دزی و فزییەکانی ناکا، بەڵام ئۆنۆفرەی بەردەوام باسی دزییەکانی خۆی دەکا. هەر دەیگرن و لە زیندانی دەکەن و ماوەیەك لەوێدا دەبێ و دیسان دێتەوە ماڵێ و دەست دەکاتەوە بە دزی و دەخرێتەوە زیندان.

ـ دیارە لە زیندان ئەوەندە خواردن نادەنە بنیادەم کە تێر زگی خۆی نان بخوا، بەڵام لە نەبوونی هەر باشتر. بەس خراپەکەی ئەوەیە، کە من دەکەومە زیندانەوە، خێزانم و کوڕەکەم لێیان دەقەومێ. ئەو داماوانە لە ژوورێدا قەتیس دەبن و قوزەڵقورتیشیان چنگ ناکەوێ بیخۆن. ئەوە دەمەوێ رێوشوێنەکانی دزیکردن فێری کوڕەکەم بکەم. دیارە نامەوێ ئەو ببێتە مریشکدز. دەمەوێ ئەسپ دز دەربچێ. ئەدی، ئەسبدز. ئەسبدزێکی بیژوو، کە لەم مەڵبەندەدا هەر کەس گوێی لە ناوەکەی بوو، لە خۆی بڕی[*].

ـ ئەی چاوەڕێی چیی؟

[*] لەخۆ بڕی: واتە گوو بەخۆیدا بکا. لەخۆڕیان/ بەخۆداڕیان: گووبەخۆداکردن.

ـ چاوەڕێم تۆزێك گەورەتر بێ.

لە سەر پۆل، من و کوڕەکەی ئۆنۆفرەیکۆش لەسەر کورسیەکی درێژ دادەنیشین. دوێنێ یەکێك لە لووەکانی تەقی، ئەمڕۆش، هەر ئێستا یەکی دیکەی.

مامۆستا لێی دەپرسێ:

ـ هارالامبکۆش، ئەوە کەی ئیشەڵا پارەی کتێب و قەڵەمەکانت دێنی؟

ـ هیچ کاتێك مامۆستا.

ـ بۆچی؟

ـ چونکە پێویستم بە کتێب نییە. ئاخر من بەتەما نیم کاریش بکەم، جا فێری خوێندنەوە و نووسین ببم یان نەبم، وك یەك وایە.

ـ ئەی داریە، تۆ ئیشەڵا کەی دەتوانی پارە بێنی کتێبت بۆ بکڕم؟

ـ نازانم مامۆستا.

پێیان گوتم لەسەر یەکێك لە کورسییەکانی پشتەوە دانیشم. منیش ڕێك لەوێ دانیشتم. کە کاروباری کڕینی کتێب و بەردی لەوحە و قەڵەم تەواو بوو، دەستمان کرد بە خوێندن.

لە پێشدا فێری نووسینیان کردین. نووسینی پیتەکان، هێڵە ڕاست و خوار و کەوانی و خڕەکان و خاڵ و فاریزە. دوایی قوتابییەکان کتێبیان لێك کردەوە و دەستیان کرد بە حینجەکردن:

ئ ا، ئا

ئ ا، ئا

ئا

من لەسەر شانی منداڵەکانەوە سەیری کتێبەکانیانم دەکرد. چەندەم حەز لێ بوو منیش بتوانم بنووسم. بەڵام بەچی و لەسەر چی؟

له پۆلیٚ که هاتینه دەریٚ، چووینه ماڵی کوڕەکەی بۆکۆری خاوەن مەیخانەکەی پشت وێستگەی شەمەندەفەر.

بۆکۆر چوار کوڕی هەبوو. یەکێکیان له من گەورەتره و سیانەکەی دی له من بچووکتر. بەزەییان پێمدا هاتەوه، یەکێك له لەوحەکانیان دامیٚ، بەڵام قەڵەمیان نەدامیٚ. منیش رووم لیٚ نەنان. خۆ به بزمارێکیش دەکریٚ لەسەر بەردەلەوحه شت بنووسی.

سەربانی ماڵەکەمان تەختەبەندە. چوومه سەربان و بزمارێکم بۆخۆم هێنا. لەوحەکەم لەسەر لێواری تەختی خەوەکه دانا. له تەنیشت تەختەکه ئەژنۆم دادا و دەستم کرد به نووسینی ئەلف و بیٚ، وەك له قوتابخانه دیتبووم که دەیاننووسی ئاوا. زۆر زوو توانیم فێر بم. بیرکارییش هەر وەتر. زۆر زوو فێر بووم.

ئاخرییەکەی پاش جەژنی نۆئێل بوو که توانیم ببمه خاوەنی کتێبێکی ئەلفوبیٚ و بەردەلەوحه و قەڵەمێك. بۆ جەژنەپیرۆزه زۆر دەرکاودەرکم کرد تا چەند قەرەپوولێکم کۆ کردەوه و ئەو شتانەم پیٚ کڕی. ئەوەندەی دەرسم خوێند، هەر به ئاواتەوه بووم بەر له جەژنی نۆئێل کتێب و قەڵەمی خۆمم هەبیٚ.

خوا دەزانیٚ قوتابخانه لەبەر چاوم چەندە گەورە دیار بوو.

چواردیوار له بن میچێکی زۆر بەرزدا. لای چەپی نزیك دەرگاکەوه تەختەڕەشەیەکی چوارگۆشەیان لەسەر چوارپێچکەیەك دانابوو. بەلای راستدا لەسەر سەکۆیەك، مێزەکەی مامۆستا و دەفتەر و قەڵەم و مەرەکەبی مامۆستاش لەسەر مێزەکه بوو.

پۆلەکه سیٚ پەنجەرەی هەیه. سیٚ پەنجەرەیان له چاو ئەو کەپرانەی خەڵکی ئاوایی تێیاندا دەژین، زۆر گەورە دیارن. دیوارەکان نەخشەی جیهانیان بەسەرەوەیه، به هەموو چۆم و دەریاکانەوه.

سەر مێزەکەی مامۆستا شتێکی دیکەشی لێیە. گۆیەکی جوگرافی. ئۆقیانووس و دەریاکان، کە بە ڕەنگی شین دیاری کراون. شینێکی ئاسمانی. پێدەشتەکان بە ڕەنگی زەرد و چیاکانیش بە ڕەنگی ڕەش.

ئەو شتانە کە سەرلەبەر، لە پێش چاوی من شتێکی تازە و تایبەتن، منداڵێکی ئەوبەری چۆمی کە چوار ساڵە دەخوێنێ، بۆمیان شی دەکاتەوە. یانی ئێلێفتێریەبابۆی.

کوڕێکی باریکەڵەی درێژە. دەڵێی خەڵفی چنارە. ڕەقەڵە و مردەلۆخە، ڕەنگهەڵبزڕکاو. کە دەکۆخێ، تف دەکاتە نێو دەستەسرەکەیەوە. منداڵ بەردەوام گاڵتەی پێدەکەن:

ـ کوڕە سەیری لێفتێریە بکەن، تفەکەی دەکاتە نێو دەستەسرەوە نەکا زەوی پیس بێ. بەخوای کەرە، تفەکەت فرێدە عەرزی. بەبێ تفی تۆش خوا زەوییەکەی هەر پیس کردووە.

ئەلێفتێریە پێیان دەڵێ:

ـ نا، زەوی پیس نییە. ئەوە هەندێ کەسن پیسی دەکەن.

ـ مردەلۆخەی ڕیوەڵە. سەگبابی بۆگەن دەڵێی لە ڕووی کتێبانەوە قسە دەکا.

ـ بابی زەحمەتەکەی نابێ ڕۆڵە ئەوەندە سەر بەو کتێبەدا دەگری. دوو ڕۆژی دیکە تۆش دەچیتە ژێر گڵ، لە تەنیشت بابت.

ـ کوڕە لەکۆڵی بنەوە با کتێبەکەی بخوێنێتەوە. کێ دەڵێ دەمرێ؟ هیی وایە خۆی سەکەت دەکا، خۆشی دەکوژێ هەر نامرێ... لێی گەڕێن با کارەکەی بکا. بەشکم ڕۆژێك لە ڕۆژان بوو بە میرزا یان تەلەفۆنچیی تەلەفۆنخانە.

ـ چاوت لێیە تۆتانۆ؟ تۆ خۆشت یەکێکی لەو گەندوگووانەی، هەر سێبەرەکەت بەسەر بۆ ئەوەیە دنیای پێ گلاو بێ.

ـ بە من دەڵێی؟ زارت خوار دەبێ.

تۆتانۆ کە لە فیز و خۆپەرستی دەڵێی قەلە و پەڕوباڵی فش کردوونەتەوە، ساڵدانەساڵدانە بەرەو لای ئێلێفتێریە بابۆیی و، دەڵێ:

ـ جوان گوێ بگرە لێفتێریە. شانست هەیە کە بەزەییم پێتدا دێتەوە. ئەگینا مستێکت لە تەختی سینگی بدەم، ئیدی نانی زیندووان ناخۆی و دەبێ بەیانی بێم حەلوای پرسەت بخۆم. بەو مەرجەی نەنە رۆزیکای دایکت، گەنمی هەبێ هەڵوای خێراتت بۆ بکا.

ـ نا، نیەتی.

ـ خەمی گەنمەکەیت نەبێ، کە گیانت بە قوونتدا دەرپەڕی، هەموومان بە توورەکەوە دەکەوینە رێ لە دەوری ئاوایی گەنمت بۆ کۆ دەکەینەوە. هەرچۆنێك بێ ناهێڵێن بێ هەڵوا بی.

باوکی بابۆیی زۆر لەمێژە مردووە. بەو دواییانە شێت ببوو. بردیانە شێتخانە لە شاری و هەر لەوێش مرد. پارچە زەوییەکی هەبوو دایدەچاند. کاری بۆ پێنارۆ ئاغاش دەکرد. چووبوو لە شاری ژنی خواستبوو. ژنە خەیاتیی دەکرد. تەنوورە و بلووز و کراسی بۆ ژنانی ئاوایی دەدووری. باوکی ئێلێفتێریە کتێبخانەیەکی لە ماڵەوە هەبوو. بەردەوام سەری لە کتێباندا بوو. بەتایبەتی زستانان کە بەفرێکی قورس دەکەوت و بنیادەم هیچ کارێکی نییە.

کابرای داماو کە شێت بوو، قەشە بە خەڵکی ئاوایی گوت:

ـ رادۆبابۆیتان دی؟ ئەوەندەی کتێب خوێندەوە، مێشکی شڵەقا. هەر کەس کتێب بخوێنێتەوە، ئەقڵی تێك دەچێ. رۆڵەکانم، کتێبخوێندنەوە بابی پووشێکە. بەس مێشك و بیری خەڵك تێك دەدا. منتان دیتووە؟ تەنیا لە کلێسا کە ناچارم، چاو لە کتێب دەکەم.

ئیۆن ـ کوڕەکەی ئۆدۆدۆی ـ هەڵیدایە:

ـ قسەی خۆمان بێ باوکە، لە کلێساش خۆتی پێوە ماندوو ناکەی.

ـ راست دەکەی ڕۆڵە، ڕاستە. زۆربەی جاران لاپەڕەیەك نا لاپەڕەیەك دەخوێنمەوە... بابەتی عیشای ڕەببانی زۆر دووروودرێژە، ئەگەر ڕاستیت دەوێ پیاو تاقەتی دەچێ.

لیفتێریە کە گەورە بوو، لە باوکییەوە خۆشەویستیی کتێبی بۆ مایەوە.

ـ ئەگەر پارەم دەبوو داریە، هەر هەموویم بە کتێب دەدا. لە کتێبخوێندنەوە تێر نابم.

جاری وایە لە باقی کوڕەکان زووتر دەگەینە قوتابخانە. دەچمە لای مێزەکەی مامۆستا و گۆیەکە دەخولێنمەوە. دەیسووڕێنم و دەریا و وشکانی بە چاو دەبڕم. ئەودەم وا هەست دەکەم، ئەوە گۆ بچووکە کارتۆنییەکە نییە کە لەبەرچاوم دەخولێتەوە، بەڵکو خۆمم کە خەریکم بە دەوری دنیادا دەگەڕێم. لام وایە چوومەتە ئەو وڵاتە پانوبەرینەی بە پیتی درشت لێی نووسراوە چین و لەوێ دەگەڕێم. سواری عارەبانەیەکی بچووکی گوندی بووم، کە دوو ئەسپی خۆشبەزی سم پان ڕایدەکێشن. ئەو ئەسپانەی چەند مزڵ دەبڕن وا دەزانی مزڵێك ڕۆیون.

ئێلێفتێریەبابۆیی زۆر جاران تاریفی ئەو وڵاتەی بۆ کردووم. خەڵکەکەی کڵاوی تایبەتی نووکتیژ لەسەر دەنێن و، عەبای درێژ لەبەر دەکەن و چاویان درێژ و بادامییە.

بە جادەکانیدا دەڕۆم. شار و گوندەکانی دەگەڕێم. سەیری کاروباری خەڵکەکەی دەکەم. ژیانی خەڵکەکەی. گوێم لە دەنگی خەڵکەکەی دەبێ و، وردە وردە لە زمانیان تێدەگەم.

ئەم بەشەی گۆیەکە، بن بازنەکەی جەمسەر کە سپی کراوە، دەزانم بیابانێکی بەستەڵەکە. بەڵام بیابانێك کە سەرەڕای ئەوەش، خەڵکی هەر لێ دەژی. خەڵکێك کە جلوبەرگی چەرمینی گەرمیان پۆشیوە. لە وڵاتی ئەوان دەبێ بە خێشك سەفەر بکەی. خێشکەکان لە کەڵەکێوی دەبەستن، چونکە بدەون و شاخیان گەورەیە. هەر دەڵێی کۆڵەکەیان وەبەر ئاسمانێ داوە.

جادە پڕ پێچ و گەوەکانی کوێستان دەبڕم. بە گەمی لە دەریاکان دەپەڕمەوە، یان خۆم لە کەشتییە زەبەلاحەکاندا حەشار دەدەم و ئۆقیانووسەکان دەبڕم.

ئاخ، چەندەم داخ و کەسەر لەسەر دڵە کە ناتوانم بە راستی سەیری ئەو ئاوانە بکەم، کە هەتا چاو هەتەر دەکا، راکشاون.

ـ ئەوە لێرە چ دەکەی داریە؟

ـ سەیری ئەم گۆی جوگرافییە دەکەم.

ـ حەزت لێیە سەیری بکەی؟

ـ زۆر زۆر.

ـ کەوابوو ئەمڕۆ پاش نیوەڕۆ وەرەماڵەکەی من.

مامۆستا لە ژوورێکی خنجیلانەدا دەژی، کە لە ماڵی ڤۆیکۆبۆکۆری بەکرێ گرتووە. ژوورەکەی چەند رەفەیەکی تێدایە، کە هەر کامە و دنیایەك کتێبیان لەسەر هەڵچنراوە.

ـ حەز دەکەی بخوێنییەوە؟ حەز دەکەی زیاتر لەوەی لە کتێبەکانی قوتابخانەدا بۆتان نووسراوە، شت زیاتر بزانی؟

ـ لە خوام دەوێ.

دوو کتێبم دەداتێ. دەیانبەمەوە ماڵێ و تا ئێوارە دەیانخوێنمەوە. هەر هەڵیاندەلووشم، وەك چۆن بنیادەمێکی برسی لەتێك نان قووت دەدا. ئینجا بۆی دەبەمەوە.

ـ خوێندتنەوە؟

ـ بەڵێ.

ـ دا بۆم باس بکە بزانم باسی چ دەکەن.

بۆی دەگێڕمەوە، بەبێ ئەوەی وشەیەك لەبیر بکەم.

ئەوجار کتێبێکی ئەستووری بەرگ چەرمینم دەداتێ. کتێبێکی پڕ وێنەیە. هەر ئەوەی کە لێی دەگەڕام: کتێبێك باسی وڵاتان و شوێنەکانی دنیا.

کوڕەکەی بابۆیی پێم دەڵێ:

ـ ئەوە جوگرافیای دواناوەندییە.

ـ بەشکم قسمەت وابێ بتوانین بچینە دواناوەندی.

ـ تۆ لەوانەیە، بەڵام من نا. من ئەوە دەمرم داریە. ئەمڕۆ نا سبەی تڕی ئاخری دەکەنم. بەرۆکم بەرنادا.

رۆژ بە رۆژ زیاتر تینووی خوێندنەوە دەبم.

کە لە پۆلی یەکەمەوە دەچمە دووەم، پێشتر زۆر شت فێر بووم. ئاد و بەڵێنم بەخۆم دابوو، وردە وردە هەموو ئەو کتێبانەی لە رەفەکەی مامۆستادا دانراون، بخوێنمەوە. بەڵام سەرەتای پاییزێ مامۆستا قفڵێکی زلی لە دەرگای ژوورەکەی دا و چۆوە شاری. ئیلیسکۆی جێنشینی لە رۆژنامە زیاتر هیچ ناخوێنێتەوە.

ساڵ تەواو بووە و من دیسان چوومەتە پۆلێکی ژوورتر.

ئیلیسکۆش رۆیشتووە و، مامۆستایەکی تازەیان ناردووەتە جێی.

ئەوەیان جۆرێکی دیکەیە: لە ئێوارەوە تا بەیانی بەشوێن قوونی ژن و کچی ئاواییەوەیە. گەنجەکان بەسەریدا دەکەون و تێهەڵدانێکی خەستی لێ دەدەن. مێردی ژنانیش هەروەتر.

فۆسۆلان، مامۆستا تازەکە، بۆ سبەینێ بە سەروگوێلاکی شکاو و چاوی رەشوشین هەڵگەڕاوەوە دێتەوە قوتابخانە و حازر و غیاب دەکا و، نووسینەوەیەکمان دەداتێ و دەڕوا. یەکێك لە قوتابییە زرت و زەلامەکانمان لەسەر دادەنێ، بۆ ئەوەی ناوی ئەو کەسانەی لە دوای ئەو بزۆزییان کردووە، بنووسێ و، جا تێیان هەڵبدا.

دەی باشە. پێتان وایە مامۆستاکەمان هەموو بەیانیان دەچێتە کوێ؟ دەچێتە مەیخانەکەی دادالێنکا. رووبەڕووی قوتابخانە لەوێ لەگەڵ ئالڤیتزای زاوام و لێپرسراوەکەی ماڵیاتوەرگرتن و سکرتێرەکەی

قایمقامی و قەشە و کارمەندی دارایی کۆنکەن دەکا. ئەگەر بردییەوە، هەمووی دەدا بە مەشرووب و بە قوزەلقورتی دەکا، بەڵام زۆربەی جاران دەیدۆڕێنێ و، گرژ و مۆن وتووڕە دێتەوە قوتابخانە:

ـ خۆ کەس بزۆزیی نەکردووە؟

ـ بۆچی مامۆستا، ئەوانە...

مامۆستا دەست دەداتە شوولکێك، بانگی بزۆزەکان دەکا و لەبەردەم تەختەرەشەکە ریزیان دەکا و دارکارییان دەکا. ئەوجار بەرمان دەدا بڕۆینەوە کاولبووەکانمان و خۆشی دەچێتەوە مەیخانە.

هەر کات بەفیڕۆ دەدەین. من تینووی خوێندنەوەم، بەڵام لەو کاولبووە هەر ئێلێفتێریە چەند کتێبێکی هەیە کە هەمووم خوێندوونەوە.

لە نێو کتێبەکانیدا نامیلکەیەك دەدۆزمەوە، لێی نووسراوە، ئاسیا. لەوانەیە شەرحی ئەو وشکارۆ پانوبەرینە بێ کە تۆزە زانیارییەکم لەسەری هەیە.

ـ لێفتێریە ئەوەم بە ئەمانەت دەدەیتێ؟

ـ بیبە.

هەڵیدەگرم و دەست دەکەم بە خوێندنەوەی. چیرۆکێکی هەژێنەری ئاشقانەیە.

ئاسییە: نووسینی تۆرگینێف

ـ داریە ئەوە بۆ ئاخ هەڵدەکێشی؟

ـ چووزانم دایە.

ـ ئەو کتێبە وەگریانی خستووی؟

ـ بەڵێ دایە.

ـ دەی رۆڵە کتێبی وا بدۆزەوە وەپێکەنینت بخا. خۆ لەم دنیایەدا ئەگەر بنیادەمێکی لاواز و دەستەوستان بی، رۆژ تا ئێوارێ دەبێ بگریێ. قەت پێم وانەبوو وا ترسنۆك بی.

ـ دایە من لەکەس ناترسم.

ـ ئەی ئەگەر لە خەڵك ناترسی، لە چی دەترسی؟

ـ ئەودەمانەی باران دەباریێ، لە هەورەتریشقە دەترسم... دەزانی دایکە؟ ئێستا ئیدی دەزانم هەورەتریشقە چییە: پار لە قوتابخانە فێر بووم.

ـ دەزانی هەورەگرمە چییە؟ وەختێك ئاسمان هەوروهەڵایە، بەڵام بارانەکە نایەوێ بباریێ، حەزرەتی ئەلیاس بە عارەبانەکەیەوە بە نێو هەورەکاندا دەگەڕێ. عارەبانەکەی تۆپەی ئاگرینیان هەیە. ئەسپەکانیشی لە ئاگرن. سمی ئەسپەکانی و تۆپەی عارەبانەکەی هەورەکان دەلەرزێنن و دەیانتەکێنن بۆ ئەوەی ئەو دەنکە بارانانەی شۆڕ بوونەتەوە بەر ببنەوە. شەیتان رادەکا و خۆی دەشارێتەوە، بەڵام ئەلیاسی نەبی دەیبینێ و رمبە ئاگرینەکەی تێ هەڵدەکا. هەورەتریشقە ئەوەیە. کە رمبەکە وەشەیتان دەکەوێ، دەیبرژێنێ. هەر بۆیە هەورەتریشقە هەمیشە سوور دەچێتەوە. ئەگەر یەکشەممۆیان جل پینە بکەی، یان بزمار لە دیوار بدەی، شەیتان لە پشتەوەی خۆ دەشارێتەوە. بەڵام حەزرەتی ئەلیاس چاوی لێ هەڵناگرێ. هەر بۆیە ئەگەر کراسەکەت لەبەرتا بێ، ئەوەی یەکشەممە پینەت کردووە، هەورەتریشقە لێت دەدا. تێگەیشتی؟ ئەو ماڵەی هەورەتریشقە لێی بدا، ئاگر دەگرێ. درەختی برووسکەلێدراویش هەروەتر.

ـ ئەرێ بەراست دایە، بۆچی کە باران دادەکا، خوێ بە بەردەرگاوە دەکەی؟

ـ رۆڵە هەر ئەودەمەی رێژنەیە و بەنداوی ئاسمان شکاون وا دەکەم. خوێ بارانەکە هێور دەکاتەوە.

ـ هەر بەراستی باوەڕیشت بەو شتانە هەیە؟

ـ هەموو خەڵك بڕوایان پێی هەیە. دایکم و نەنکیشم بڕوایان پێی هەبوو. قەدیمییەکان زۆر شتیان زانیوە. ئەگەر تۆش هەندێ شت دەزانی، فێرم بکە با منیش بزانم. خۆ ئێستا ئیدی لە هەورەتریشقە ناترسی؟

ـ نا.

ـ که تۆفان هەڵدەستیٚ، قەت نەکەی بچی لە بن داران خۆت بشارییەوە ها، چونکە جاری وایە هەورەتریشقە لە درەختە گەورەکان دەدا.

ـ دیسان لەبەر شەیتان؟ نەکا لە ترسی حەزرەتی ئەلیاس لە بن درەختەکان خۆی حەشار دەدا؟

ـ برۆ هەتیوە. خۆ بۆوەی نابی دوو قسەت لەگەڵ بکەن.

جگە لە کتێبەکانی ئێلفتێربیٚ، هەندیٚ کتێبی دیکەش لە ئاوەدانییەکەماندا دەست دەکەون. بۆ وێنە ئەو کتێبانەی قەشە لە روویانەوە نزا دەکا. دیارە من هیچ حەزم لیٚ نییە ئەوانە بخوێنمەوە و قەتیش لێکیان ناکەمەوە.

چلەی زستانیٚ لە پڕ مامۆستاکەمان وەك بەردی بن گۆمی لیٚ هات و بوو بە دڵۆپێك ئاو و زەوی قووتی دا.

هەندیٚ دەڵێن دەچووە ئەوبەری چۆمی بۆ ژوانی کچۆڵەیەك، سەهۆڵی چۆمەکە ناسك بووە و شکاوە و تێکەوتووە و خنکاوە. هەندێکی دیکە زۆر سادە دەڵێن، گووکارییەکی کردووە و لە ترسی قوونی خۆی فیزماڵکی داوەتیٚ و رای کردووە.

مامۆستایەکی تازەمان بۆ دەنێرن. پیرەپیاوێکە کە دەبیٚ شەست ساڵێکی تەمەن بیٚ. بە زەحمەت بە رێیەدا دەڕوا. ردێنی هێشتووەتەوە و چاویلکەکانی دەڵێی بنە ئیستیکانن. لووتە درێژەکەی گەیشتووەتە سەر لێوی. هێشتا گوێچکەی تیژن، هەر چاوی کەمحوکم بوون. جلوبەرگەکانی کۆنەن و پێڵاوەکانیشی پینە کراون و کڵاوە چەرمینەکەشی مۆرکە لێی داوە. دار و نەداری مامۆستا ئینۆچێتزیۆکۆکۆز هەر ئەوەندەیە.

ـ داریە، تۆ حەزت لێیە دەرس بخوێنی، نا؟

ـ بەڵیٚ مامۆستا.

تۆرتۆریکاش حەزی لێیە خوێنەوار بێ. ئێپۆرێمارینیش پێی خۆشە بچێتە شاری و فێری کارێك بێ. لازارفیلۆڤتێیاش، ئەو کچە قژدرێژە برۆ کەوانییەی هیچ کام لە منداڵەکان تۆزی پێی ناشکێنن و، بەبێ کاغەز و قەڵەم مەسەلەکانی بیرکاری حەل دەکا.

فیلۆفتێیا دەڵێ:

ـ حەز دەکەم ببمە دکتۆر و نەخۆشەکان چارەسەر بکەم. بەڵێ زۆرم پێ خۆشە. خەریکە سوێم دەبێتەوە. بەڵام بۆ ئەو کارە ناچارم بچمە شاری. ئەی بەو گیرفانە بەتاڵەی باوکم چۆن دەتوانم بچم؟ ماڵەکەیان لە تەنیشت ئاسنەڕێیەکەیە. ماڵی چی، دەڵێی کۆلیتی مریشکانە. هەر نۆ کەسیان تێی دەخزێن. دایکی هێشتا گەنجە. بەو حیسابەی کە لێرەن، زیاتریش دەبن.

دەیڤید باچیر، کە ئەویش مەسەلەکانی بیرکاری بەبێ کتێب و قەڵەم حەل دەکا، هەڵدەداتێ:

ـ من حەز دەکەم فێری پردلێدان بم.

ئێپووریێ مارین بە بەزەییەوە سەیرێکی دەکا و دەڵێ:

ـ کوڕە رۆڵە ئێوە هەر قسان دەکەن بۆ ئەوەی بێدەنگ نەبن. چما نازانن خوێندن بەبێ پارە ناکرێ؟ ئاخر، ئەو پارەیەی دەبێ پێی بچنە شاری و بیدەن بە کرێی خانوو و خواردن و خەو و جلوبەرگ و کتێب و قەڵەم و دەفتەر لە کام جەحەندەمەوە دەیهێنن؟ من دەمەوێ بچمە شاری و فێری پیشەیەك بم. ببمە میکانیك. ئاسنگەری بکەم، یان کار بە ماشێن و ترۆمبێلان بکەم. ئەوە شتێکی دیکەیە. دەمەوێ سەرەدەر لە هەموو مەکینە و ماشێنی ئەم دنیایە دەربکەم. باسی ئەوەم لەگەڵ میکانیکەکەی وێستگەش کردووە.

ـ چاکەتەکەی ئێپۆرێ ئەوەندە پینە کراوە، کەس نازانێ قوماشەکەی خۆی چ بووە و هیی کوێیە وا ئەو هەمووە رەنگەی دنیای تێدایە. رۆژ تا ئێوارێش ئەوە چڵمی هاتووە و بە سەری قۆڵەکانی دەیسڕێتەوە: هەموومان هەر وا دەکەین.

مامۆستا دەنەڕێنیٚ:

ـ بێدەنگ.

ئینجا: ئەمڕۆ دەمەویٚ باسی شازادە ئیڤانی سامناکتان بۆ بکەم.

ئەنیوچێنتزیۆکۆکۆز خێزانداره. ژنێکی گەنجی هەیە کە پێی دەڵێن، مادام دۆکسی. سی ساڵانەیە. چوارشانەیەکی بەخۆوەیە و سووروسپییە. سمتی خڕن وەك مەڕمەڕ و دوو هێندەی مێردەکەیەتی. سیٚ منداڵیان هەیە، هەر سێکیان کوڕن.

ـ منداڵەکانیان گەورەن؟

ـ نا، سەروپێچکەن.

ـ مادام دۆکسی ئەو منداڵانەی لە کێیە؟

ـ دەی دیارە. لە کۆکۆزن.

ـ تڕحێو.

ـ هەر بەراست؟

ئینوپێنتزیۆکۆکۆز بە خێشك دێتە کۆڵانیٚ. سیٚ کوڕەکەشی خێشکیان لە بن پێیە. ئەوی هەرە گەورەکەی پێنج ساڵانە و نێونجییەکەی سیٚ ساڵان. گچکەکەشی هێشتا نەبووەتە ساڵێك. هەر سێکیان دەڵێی مامۆستا تڕیوە و ئەوان دەرپەڕیون.

ـ قوربان، ئاغازادەزان ناویان چییە؟

ـ ئەوی گەورەیان ناوی ئینۆچێنتزیوکۆکۆزی یەکەمە و ئەوی دیکەیش ئینوچێنتزیوکۆکۆزی دووەم و ئەوی هەرە گچکەشیان ئینوچێنتزیوکۆکۆزی چوارەم.

ـ سەیرە. باشە خۆ ئەو ناوانە مەسیحی نین.. بتپەرستەکان ناوی ئاوا لە منداڵیان دەنێن.

ـ سەیر نییە. بۆ چما بتپەرستەکانیش خەڵکێکی وەك ئێمە نەبوون؟

ـ با، با. راسته... بەڵام ئاخر...

ئینوچێنتزیوکۆکۆزیش زۆری خۆ نەگرت.

وانەی شازادە ئیڤانی ترسناکی پێوە نەهات. لە ئاوەدانیدا ئەوەندەیان باسی ئەو وانەیە کردەوە، کە ئاخری قالاوەکەی بیستییەوە و هەواڵەکەی بردە شاری.

ڕۆژێکی خۆشی تاو و ساو، کابرایەکی قژخورمایی هاتە پۆلەکەمان، کە سمێڵە جەنگییەکانی دەتگوت باڵی چۆلەکەن لەملاولایەوە شەق ڕاوەستاون.

ئینوچێنتزیوکۆکۆز خەریك بوو حزوور و غیابی دەکرد، کە کابرای غەوارە هاتە ژووریٚ و یەکپێ لەبەری هەستاین.

کابرای سمێل باڵەچۆلەکە لەسەرخۆ ناوی خۆی و پیشەکەی پیٚ گوتین:

ـ من چاودێری خوێندنگەکانم. ناوم پاراس کیفییە.

ـ چۆنی دەفەرمووی لەسەر سەر و سەر چاو، بەڵام بەو حیسابە دەکرا پاپای مەزن بی. یان هەر نەبیٚ برا گەورەکەی بەرێزیان. دەی جا فەرمووە من چ خۆڵێکت بۆ بکەم بەسەرما؟

پاراس کیفی. پاراس کیفیی، چاودێر ئەوەندە تووڕە بوو وەك مێژۆکە دەلەرزی، بەڵام دانی بە خۆیدا گرت و گوتی:

ـ هاتووم لە بارەی ئیڤانی سامناکەوە ڕاپۆرتێك بنووسم.

ـ مەبەستت ئیڤان کۆزایە؟ چونکە من باسی ئەویشم کردووە.

واز لەو گاڵتەجاڕییە بێنە. بە ئانقەست ئیڤانی سامناکت کردووەتە قەشمەر.

ئینۆچێنتزیوکۆکۆز بە پێکەنینەوە گوتی:

ـ جاخۆ یەك و دووان نین، زۆرن: ئیڤانی سامناك، ئیۆن کۆزا، تۆدۆر ولادیمیرسکۆ... هەموو ئەوانەی ویستوویانە خەڵکەکە ببزوێنن.

هەموومان بەسەر پێوە راوەستابووین. سەرسووڕماو گوێمان راگرتبوو و، بە چاوی بەمۆڵەق وەستاوەوە سەیری ئەو دوو پیاوەمان دەکرد کە لێك رادەسان.

کۆکۆز رووی تێکردین و پێی گوتین:

ـ دانیشن منداڵینە.

پاراس کیفی. پاراس کیفی، جانتاکەی تووڕ هەڵدا. مڕەکەبەکە وەرگەڕا و تەختی ژوورەکەی مۆر هەڵگێڕا.

چاودێر نەڕاندی:

ـ ئەوە بێئەدەبییە.

کۆکۆز لەسەرخۆ گوتی:

ـ من بێئەدەبیم نەکردووە... هاتووی بۆ لێکۆڵینەوە، فەرموو ئەوە گەز و ئەوە جاو. لێکۆڵینەوەی خۆت بکە. من لەگەڵ ئەو شتانە راهاتووم، وەك چۆن تەوورەکە لەگەڵ پینە رادێ.

چاودێر دەستەیەك کاغەزی دەرهێنا و دەستی کرد بە نووسین.

ـ راستە دەڵێن تۆ باسی ئیڤانی سامناکت بۆ قوتابییەکان کردووە؟

ـ راست راستە. من ئەرکی سەرشانی خۆمم بەجێ هێناوە، چونکە بەشێکە لە بەرنامەکەیان.

ـ راستە دەڵێن پێت گوتوون ئیڤانی سامناك لە رۆژی جەژنی باکدا ئەمری کردووە سەری سەرجەم ئاغاکان و تەنانەت سەرئۆسقۆفی مۆلداڤیاش بپەڕێنن؟

ـ هەر راست وایە و درۆی تێدا نییە. لە کتێبەکانیشیاندا وا نووسراوە.

ـ گۆیا بە قوتابییەکانت گوتووە، ئاغاکان شازادەیان بە تورکان فرۆشتووە، وایە؟

ـ دەی وایە. ئەوەش لە کتێبەکەیاندا نووسراوە.

ـ دەڵێن گوتووتە ئیڤانی سامناك خەڵکخۆشەویست بووە و رقی لە ئاغاوات بووە؟

ـ راستە. ئەوەش لە کتێبەکەیاندا...

ـ بەڵێ بەڵێ نووسراوە، دەزانم. لە کتێبەکەیاندا نووسراوە.

ـ ئەی دەڵێی چی؟

ـ راستە دەڵێن گرینگیی تایبەتیت بەو وانەیە داوە؟ ترشوخوێت کردووە و، تێروتەسەلتر باست کردووە؟ یانی بە شێوەیەك کە تەواو نائاسایی دیار بووە؟

ـ چۆنی دەفەرمووی رێك وا بووە.

ـ باشە بۆ وات کردووە؟

ـ حەزم لێ بووە. حەزی خۆمە، تێگەیشتی؟

ـ جەناااااب ب

ـ تۆ راست دەکەی جەنابی چاودێر. ئەو مەسەلەی بۆ گاڵتە نابێ. بەڵێ دەرسی وایە زۆرم حەز لێیانە و زۆر بە کەفوکوڵێکی تایبەتەوە دەیانڵێمەوە. تەنانەت دەتوانم بڵێم بە جۆشوخرۆشەوە.

ـ وەك بیستوومە قوتابییەکانیشت گریاون.

ـ هەموویان نا... بەڵێ، راستە چەند کەسێکیان دەگریان. زۆر هەژابوون. دەی دەرسی واش هەیە هیچ حەزم لێی نییە. ئەوان وەك "نانی رەق و دۆی ترش، دەخۆی ناخۆی چش" ئاوا دەیڵێمەوە. هەر بە سەری زمان. بۆ وێنە ئەو دەرسەی باسی میشل پاڵەوان دەکا، کە گوتی، جووتیار بە زەوییەوە بەندە. یان بۆ وێنە وانەی بوانکۆڤان، شازادەی قوستەنتینیە، کە میللەتیان کەوڵ کرد و کەوڵی میللەتیان کردە هەگبەی زێڕ و زیوی خۆیان... ئەویشم هیچ خۆش ناوێ.

ـ جا هەموو ئەو بۆچوونانەشت بەو دەمودووەی خۆت، بەسەر منداڵەکاندا دەسەپێنی؟

ـ بەڵێ، بەدڵنیاییەوە.

ـ بەڵام لە کتێبەکانیاندا بێلایەنانە باسی ئەو شتانە کراوە.

راست وایه. پێم وایه شێوازێکی تەواو هەڵەیە. بەڵێ، هەڵەیە. کتێبەکانی قوتابخانە مێژوو بە درۆ دەگێڕنەوە و بەداخەوە یەك و دووانیش نییە. حەقیقەتی مەسەلەکان لەو بەڵگە و دیکۆمێنتانەدایە کە من خۆم کۆم کردوونەتەوە.

ـ ئێمە کارمان بەو بەڵگە و شتانە و ئەم جۆرە مامۆستایانەوە نییە... جەنابت خانەنشینی؟

ـ بەڵێ، بەڵام ڕێگەم پێدراوە مۆڵەتی خزمەتەکەم نوێ بکەمەوە.

ـ مۆڵەتەکەشت هەڵدەوەشێتەوە. کەواتە قوتابخانە بەجێ بهێڵە.

ـ بەجێی دەهێڵم.

ـ هەر ئێستا...

ئینۆچێنتزیوکۆکۆز بەرەو لای ئێمە وەرسووڕا.

روخساری تێك چرژابوو و، گنج و لۆچ ببوو. لووتە زلە هەڵۆییەکەی دەتگوت ئەوەندەی دیکە شۆڕ بووەتەوە ، چاویشی لە پشت چاویلکەکانییەوە دەتگوت پتر بە قووڵدا چوون.

ماڵاوایی لێ کردین و هیوای لەشساغیی بۆ خواستین.

ـ جا لەبیرتان نەچێ، کە دەبێ بەو جۆرەی "کە نەنووسراوە" فێری کتێبە دەرسییەکانتان بن. یانی بەو شێوەیە کە من بۆم باس کردن.

پاراس کیفی چاودێر بە دەنگێکی گڕ و ناخۆش پێی گوتین:

ـ هەستن بڕۆنەوە. مامۆستایەکی دیکەتان بۆ دەنێرین. لەوانەشە جەنابی براگادیرۆ بێ.

لە قوتابخانە هاتینە دەر. ئینوچێنتزیوکۆکۆز بەلاماندا تێپەڕی. لە حورمەتی ئەو هەموومان کڵاوەکانمان لەسەرمان هەڵگرت. ئەویش کڵاوەکەی خۆی هەڵگرت. سەبرێ پێی گوتین:

ـ حەقیقەت. لە کتێبەکاندا هەر دەبێ وەشوێن حەقیقەت بکەون. چونکە کتێبی دۆرزنیش هەیە. تەنانەت دەبێ بڵێم، کتێبی درۆزن چەندی بڵێی هەیە بەداخەوە. دەبێ رابێین کە چۆن کتێبی باش و خراپ لێك بکەنەوە.

*

*

*

لەوەتەی بیستوومانە براگادیرۆ دێتەوە، شاگەشکە بووین. بە قریوە و چەپڵەلێدان بە پێشوازییەوە دەچین. ئەویش لە خۆشیان وەختە باڵ بگرێ.

یەك بە یەك سەیرمان دەکا. سەیری منیش. رێك لەوسەری پۆلەکە دانیشتووم.

ـ دا بڵێ بزانم داریە، لەوەتەی من لێرە نیم، هەر وا خەریکی کتێبخوێندنەوە بووی یان نا؟

ـ زۆرم کتێب دەست نەکەوت مامۆستا.

ـ وەرە ماڵەکەی من.

هەموو رۆژێ دەچمە ماڵەکەی و هەموو رۆژێکیش کتێبێکی دیکەم دەداتێ. دەیخوێنمەوە و بۆی دەبەمەوە و یەکێکی دیکەی لێ وەردەگرمەوە.

بانگم دەکاو وانەم لێ دەپرسێتەوە. وردە وردە بیرکارییەکەشم باش بووە. ژمارەیەکم پێ دەڵێ و دەینووسم، زیادکردن و کەمکردنەوە و لێکدان و دابەشین. وەڵامی هەمووان راستە.

لە پڕێکدا لە ریزەکانی پێشەوە قاقا هەڵدەستێ.

مامۆستا دەڵێ: میتیکا، بۆ بووراویتەوە؟

ـ بە جزمەکانی داریە.

دەمنێرێتەوە سەر جێیەکەم. ئەوانی دیکەش بە دوای میتیکادا لە قاقای پێکەنین دەدەن.

مامۆستا میتیکا بانگ دەکاتە لای تەختەڕەش.

ـ دەی، بزانم چ شتێك وەپێکەنینی هێنای؟

ـ جزمەکانی دارییە مامۆستا. جزمەی باوکیی لە پێ کردووە و پێی هاتووەتە قوتابخانە.

لێتان ناشارمەوە، هەر لەوەتەی زستان بەسەردا هاتووە، جزمەکانی باوکم لە پێ دەکەم بۆ قوتابخانە. ئەو جزمانە، هیی ئەو کاتەیەتی کە سەرباز بووە. لە پێی مندا زۆر گەورەن. هەتا سەر ئەژنۆم دێن. لە قوڕوچڵپاوی ئاواییدا بۆ بابم ئاقڵ دەبم، وەختە چاوم بێتە دەرێ هێندە قورسن. ملیوانە گەورە و رەقەکانیان هەموو لاقمیان بریندار کردووە.

بۆ ئەوەی بتوانم خۆم بگەیەنمە قوتابخانە، چیم وەبەر دەست بێ لە بەر، یان لە پێمی دەکەم. ئانیشکی چاکەتەکەم کون بوون و کەس خەمێکیان لێ ناخوا پینەیەکم بۆ لێ بدەن. کڵاوەکەم، کڵاوێکی چەرمینی خۆرکەخواردووە، کە لە نێو شڕوشاڵاتەکەی بنەبانی عەمباریدا دۆزیومەتەوە. ئەوەندە گوشاد و زلە، دێتە سەر چاو و گوێم.

میتیکا ئۆکەی، گاڵتە بە جزمەکانی من دەکا. مامۆستاکە بەوە دەهری دەبێ. تا ئێستا نەمدیوە ئاوا دەهری بێ. کوڕەی مەیخانەچی دێنێتە دەرێ و دەیداتە بەر پرسیاران.

یەك پرسیاریشی پێ وەڵام نادرێتەوە.

میتیکا، هەتیوێکی جوانکیلەیە. لووسکەڵە. نینۆکی خشت و جوان کراون. پێڵاوی پڕ بە پێیەتی و جلوبەرگەکەشی خەیاتی شاری دووریویەتی.

مامۆستا شووڵکێك هەڵدەگرێ و، چەند شووڵێکی لە دەستی رادەکێشێ و، میتیکاش هەروا پێدەکەنێ. ئەوەندە پێدەکەنێ تا نزگەرە دەگرێ. شووڵکەکە لە لەپی دەستە سوورهەڵگەڕاو و ماسیوەکانیدا ورد دەبێ.

زۆر کەم وا هەیە براگادیرۆ لێمان بدا. تۆ بڵێ دەبێ چەندەمان دەهری کردبێ، کە وا ئیمانی نامێنێ و شتەکە وای لێ دێ. بەڵام ئیدی کە تووڕە بوو، کەس پێی ناوەستێ. ئەوکات ئیتر قوڕ بەسەر ئەو کەسەی وا تووڕەی کردووە.

دیارە ئێمە خوومان بە تێهەڵدانەکەوە گرتووە. لە ماڵێ هەر هیچ، بەردەوام سیخورمە و نووکەشەق دەخۆین. جار هەیە باوکم یان دایکم یان خوشك و برای لەخۆمان گەورەتر. خۆ تەمبێی مامۆستاکەشمان هەر هەقمانە. خۆ پێش ئەوەی مامۆستا بێتە سەر پۆل، هەر خوا دەزانێ چ زەنازەنا و ژاوەژاوێکە و چ شەڕە شەق و مستەکۆڵەیەکە. ئەوەندە یەکتر بە دار و دیواردا دەدەین، هەموو گیانمان گەچاوی دەبێ. هەر تێهەڵدانیش دەخۆین و دەستمان بگاتە هەر جێیەکی یەکتر، تێی دەسرینوێنین: کەپۆ بێ، دەموودان بێ. سەروگوێی یەکتر دەشکێنین. خوا هەڵناگرێ براگادیرۆ هەقێتی جاروبارە چەند شەپلاخەیەکمان تێ دەسریوێنێ. رێك بە پێچەوانەی دۆدۆفۆسۆلان، یەکێك لەوانی پێش خۆی، کە هەر بە ناهەق لێی دەداین.

فۆسۆلانیش مامۆستامان بوو.

لە نیوەی دەرزەکە دەیگوت:

ـ میتاکێ، بە خوشکت بڵێ ئەمشەو لەبەر دەرگا چاوەڕێم بێ.

یان بۆ وێنە:

ـ ئیلیۆش، دایکت چۆنە؟ هێشتا بێوەژنە؟ زۆرم حەز لێیە شەوێك باوکت بم.

لایەك ئەو بوو ـ واتە مامۆستا فۆسۆلان، کە ناردبوویان تۆزێك مێشکمان روون بکاتەوە و لایەکیش ئێمە منداڵەوردکە. ، چون توانیبامان جوابێکی گورچوبڕی لە مستی بنێین؟

کوڕەکەی بۆکۆری خاوەن مەیخانەکەی وێستگە، جلوبەرگ و سەروپۆشاکی رێك وەك میتیکا ئۆکەیە. مامۆستا جاری وایە لەگەڵ دکتۆر گانچۆ و بەرپرسە خۆجێیەکانی دیکە لە کافتریاکەی ئەوان نان

دەخوا. هەتیوەکەی یۆکۆر زۆر لە دەرز باش نییە. مامۆستاکەمان منی لەتەنیشت ئەو داناوە و، ڕێگەی داوم وەختێك لەو دەپرسێتەوە، لە بنەوە جوابەکانی پێ بڵێم، بۆ ئەوەی ورەی زۆر دانەبەزێ. لە بری ئەو خزمەتە، حەفتەی یەك "برێت زل"ـم دەداتێ. ئەوەش بۆخۆی غەنیمەتێکە. تەنانەت دەکرێ بڵێین، غەنیمەتێکی زۆر باشیش. حەفتەی نانێکی برێت زل.

زەنگی پشوو لێ دەدرێ. چلەی زستانە. دەچینە حەوشە گەمە و یاری بکەین. بەیانی کە لە ماڵێ وەدەرکەوتووین، هیچمان نەخستووەتە بەردڵمان. هەر کامەمان، لەو توورەکەیەدا کە کردوومانەتە جانتا، پارووەك دەردێنین. ئیی وایە لەتێك مامالیگای برژاوی پێیە، هەندێکیان مستێك هەرزن. پۆلەکەی ئێمە کە ئێستا زۆریش گەورە نایەتە بەر چاوم، زیاتر لە هەشتا قوتابیی تێدا دەخوێنن. بۆ ئەوەی هەر هەشتاکەسەکەمان جێمان بێتەوە، ناچارین دە دوازدە کەس لەسەر کورسییەك دانیشین. لەو هەشتا کەسە، تەنیا دوو منداڵ هەموو ڕۆژێ نانی گەنم لە جانتاکەیان دێننە دەرێ. ئەو دوانەش، یەکێکیان کوڕەکەی کاراباشێیە. بنەماڵەکەیان دەسترۆیشتوون. زەویوزار و مەڕ و مانگا و گامێشیان هەیە. نیکۆلای هەموو ڕۆژێ نان دێنێ. هەموو ڕۆژێك نانی پێیە.

نیتزای میکانیکیکیش کە ژنەکەی بیانییە و خەرمانکوت و مەکینەیەکی هەڵمی هەیە، کچەکەی هەموو ڕۆژێ نان دێنێ. ناوی مارگارتا ئۆرزۆیە. لە نێوماندا تاقە کەسێکە، کە قەت قەت پێخواس نییە. هەمیشە پێڵاوی لە پێدایە و کراسی وا لەبەر دەکا کە لە شاری دەیکڕن و قژیشی بەردەوام داهاتووە و لەچکێکی شین لەسەر دەکا و جانتایەکی چەرمییش بەدەستەوە دەگرێ. چاوی کاڵن و لێوی سوور. دایکی ئەڵمانییە و ئەو نانەی دەیهێنێ لە قوتابخانە دەیخوا، وەك بەفر سپییە.

ئێمە لە دەوریان کۆزیلکە دەکەین و چاو دەبڕینە نانخواردنەکەیان. هەموو لیکاومان لە زاری دەتکێ. لەم پاییزەوە، ئیتر هەویرشێلان لە ماڵمان نییە و، چیتر بۆنی خۆشی تەندوور لە ماڵەکەمان ناگەڕێ. لەپڕ کالینە چکۆل، کوڕە جیقنەکە، یەك بەخۆی دەپاڕێتەوە:

ـ کاراباش، تۆزێك لەو نانەتم بدەیە با تامی بکەم. تەنیا تۆزێك، هێندەی نیسکێك.

ـ بۆ بتدەمێ؟

گوێم لە دەنگی پیتریچکای کچە پاسەوان دەبێ کە دەڵێ:

ـ مارگارتا، نان بدە بە من.

ـ بۆ خۆت دایك و بابت نییە؟ بۆچی نانی خۆمت بدەمێ؟ نیسکێك لەو نانە... هەر هێندەی نیسکێك.

*

*

*

باوکم زۆری پێ چووە. چووە تووتن بۆخۆی بکڕێ و زۆری پێ چووە.

بەبێ ئەو شیوەکەمان دەخۆین و دەچینە سەر جێیەکەمان بۆ ئەوەی خەو بمانباتەوە.

چرا نەوتییەکە داییسێ. تۆزە رووناکاییەکی هەیە.

گوێم لە دەنگی هاتنەوەی باوکمە. دەبینم دایکم هەڵدەستێ شتێکی بداتێ بیخاتە بەر دڵی.

پێکەوە قسان دەکەن.

ـ مامۆستا حەزی لێیە داریە بۆ خوێندنەکەی بچێتە شاری. دەڵێ پارەی بلیتەکەی لەسەر خۆم. دەیبا ببێتە ئەفسەر.

ـ سەرم لە بن لێفەکە دەردێنم، دەپرسم:

ـ جا باشە بۆچی ئەفسەر؟

ـ چونکە ئەو قوتابخانە ئەفسەرییەی مامۆستا دەیەوێ لەوێ بخوێنی، خۆیان خەرجت دەکێشن. ئیمتیحانێکت دەکەن بۆ وەرگرتن، ئەگەر دەرچووی، تا ئەو رۆژەی دەبی بە ئەفسەر، لەسەر خەرجی

دەوڵەت لە قوتابخانەکە دەبی و، مانگانەشت دەدەنێ. خۆ من دەستم نارِوا بتنێرمە قوتابخانەی دی. خەرج و موخاریجەکەت لە کوێ بێنم رۆڵە؟

تا ئێستا هیچ منداڵێکی ئاواییەکەی ئێمە نەبووەتە ئەفسەر. یەك لە کورِەکانی ئەوبەری چۆمی نەبێ بە ناوی کارلیگ کە چووەتە نێو قۆشەنەوە. لە پێشدا نایب عەریف بوو، دواتر بوو وەکیل باشی و ئێستا دەرەجەیەك چووەتە سەرتر. بەڵێنی داوە هەتا زیندووە لە سوپادا بمێنێ. جار و بارە دێتەوە سەر لە کەسوکارەکەی دەدا. خوا دەزانێ کارلیگەکان چۆن بەخۆیان دەنازن و چ هەرِ وگیڤێك لێ دەدەن.

جەنابی عەریف قەمەیەکی درێژ بە قەدییەوە هەڵدەواسێ، سەڵتەیەکی رێك و بێ گنج لەبەر دەکا، کە دەڵێی لە بنەوە ورگبەندی لە زگی بەستووە. جزمەی بریقەدار لە پێ دەکا و حاستەم و دووبەڵا پێ لەسەر عەرزی دادەنێ و بە کۆڵانەکانی ئاواییدا دەسوورِێتەوە. قەمەکەی خرمە خرمی دێ و جزمەکانی کژەکژیان دێ و، قەمچییەکەی ویزەوزی دێ. خەڵکی خوای واقورِماو سەیری دەکەن و، ژنان بۆی شێت و شەیدا بوون.

خوشکە زواکا پەتەیان دەخاتە سەر ئاوێ و بەخۆیاندا دەشکێنێتەوە:

ـ ئەرێ ئەوە لیکاوتان بۆ کوێی هاتووەتە خوارێ؟ دڵتان چووەتە گەردنی، کە لەبن بەرخەبەیەوە دیار نییە؟ یان ئەو دەم و لێوەی کە دەڵێی ئێستا نا تاوێکی دی دەتەقێ؟ پەنابەخوا، بێکارەی بەرِەڵا. روو وەردەگێرِێ و لە داخان تفێك دەکاتەوە.

ـ هەتیوە، سەربازی ئیجباری دەرِووتێنێتەوە، چییە! دوو رۆژ پشوویان دەداتێ.

هیچ دوور نییە ئەمنیش کە بوومە ئەفسەر، خوشکە زواکا هەر ئەو قسانەم پێ بڵێ.

سەرم دەخەمەوە بن لێفەکەم.

کەواتە دەتوانم بخوێنم. ئەوەی کە ئاخری ڕۆژێك دەبمە ئەفسەر یان نا، قسەیەکی دیکەیە. ئەوەی شاگەشکەم دەکا، ئەوەیە کە دڵنیام دەتوانم بچمە قوتابخانەیەکی دیکە لە شارێکی دوور، دەتوانم مل بنێمە دەرسخوێندن.

لەم شەوەوە، تەنیا بیر لە یەك شت دەکەمەوە: ئەم پاییزە دەچمە قوتابخانەیەکی گەورەتر، بەڵێ، قوتابخانەیەکی گەورەتر.

بەیانی، لەفتریە بابۆیی دەبینم. پێش هەمووان هاتووینە قوتابخانە. حەزم لێیە دان بە جەرگمدا بگرم و، ئەو خۆشی خۆشییە بشارمەوە کە خەریکە پێی بفڕم. بەڵام چما دەتوانم؟ دەڵێی دێوزمەیەك پاڵم پێوە دەنێ و ناچارم دەکا قسە بکەم.

لەفتریە دەستی برا چکۆڵەکەی گرتووە.

ـ ئەم پاییزە دەچمە قوتابخانەی سەربازی، لەفتریە. باوکم خۆی وای گوت.

ـ خۆزگەم بە خۆت. زۆرم پێ خۆشە. من تازە لە تەمەنم لای داوە. ئەگەر دایکم پارەی هەبوا و ناردبامی، ئێستا ساڵی چوار بووم. داماو نەیتوانی.

لەفتریە، زۆر نارێك هەڵی داوە. هەر واش لەڕ و لاواز بووە. لە جاران زیاتر دەکۆخێ. تف دەکاتەوە نێو دەسرەکەی و دەسرۆکەکەی خوێناوی دەبێ.

ـ زۆر دەکۆخی.

ـ چ بکەم؟ نەمتوانی خۆم لە چنگی ئەو نەخۆشییە رزگار بکەم. وردە وردە هەر دەمخوا و دەمهاڕێ. لەوانەیە هەر ئەم بەهارە یان ئەم پاییزەی دادێ، ئیتر لینگ درێژ دەکەم.

وا دەنوێنێ دڵی خۆشە. بەڵام قریوەی خۆشییەکەی، زایەڵەیەکی دەسکردی تێدایە.

ـ بۆ قسەی وا دەکەی؟

ـ ئەی قسەی چۆن بکەم؟ کە بیری لێ دەکەمەوە، دەڵێی تووڕەیی لە ناخمەوە هەڵدەقوڵێ و چنگ لە مێشکم دادەگرێ. دەی بیری لێ بکەوە: بنیادەم نەتوانێ گیانی خۆی رزگار بکا. بمرێ. جەستەی گرمۆڵە بێ و رەق هەڵێ. گۆڕهەڵکەن تۆنێکی گڵ وەسەر بکەن. ئیتر چاوی هیچ نەبینێ، هیچ نەبیستێ. دنیا چۆن بووە هەر وابێ و شەو رۆژ بێتەوە. دەشت و دەر وەك جاری جاران پڕ بێ لە گوڵ و

گەلا، بە رۆژ تاو لێی بدا و شەوانەش ئەستێرە بۆی بجریوێنن و، من ئیتر ئاگام لە هیچ کام لەوشتانە نەبێ. ئیتر هەست بە هیچ کامەیان نەکەم.

بە تەتەڵەوە دەڵێم:

ـ هەمووومان گیای مردنین.

ـ دەی خۆ منیش هەر وا دەڵێم. بەڵام هەمووان پاش ئەوەی بەدڵی خۆیان ژیان، جا دەمرن. من هێشتا نەژیاوم. تازە خەریکە دەزانم ژیان چییە. تێدەگەی؟... مردن، سەرەڕای هەموو ئەو کتێبانەی هێشتا نەمخوێندوونەتەوە. ئەو هەمووە شتە لەم دنیایەدا هاتووەتە گۆڕێ و هەر وا دێ و شتی دیکەش دەقەومێ بەبێ ئەوەی من دەرفەتی ئەوەم بێ بیانبینم و تێیان بگەم... ئاخ، کە حەزم لێیە یەك بەخۆم هاوار بکەم. هاوار بکەم و، بەو حاڵەشەوە دەبێ پێشی خۆم بگرم کە نەکا شێت بم... دەبێ بەهێز بم. من دەبێ تا دوا هەناسەی ژیان چێژ لە ژیان وەرگرم.

ماتیێ چکۆڵ لە تەنیشت لەتفریەی برایەوە راوەستاوە. لەسەرمان هەڵدەلەرزێ و تەزووی پێدا دێ. پشووی سوار دەبێ. کۆخە سواری سەری دەبێ و، سینگی لرخەی دێ.

ـ تۆش دەکۆخی ماتیێ؟

ـ ئەدی، ئەمنیش.

لەفتریە هەڵدەداتێ:

ـ هەموومان لە ژوورێکدا دەنووین. هیچی دیکەمان لەدەست نایە... باشە ئیتر، هەمووان لە یەکتری دەگرنەوە.

دیسان لەسەری دەڕوا:

ـ دەزانی داریە؟ کتێبی زۆر باشم لە لای کوڕەکەی ئیزۆپسکۆ دەست کەوتووە. بانگی کردم و کتێبەکانی دامێ و گوتی: "هانێ لەفتریە، ئەو کتێبانە بۆخۆت. بەردەستیان گرتووم. ئیتر پێویستم پێیان نییە." منیش هەمووم هێنا. جا وەرە بە کەیفی خۆت لێیان هەڵگرە.

ـ باشە دێم. جارێ چاوەڕێم ئەو قوڕوچڵپاوە تۆزێك کەمتر بێتەوە.

قوڕ و چڵپاوی کۆلان و لاکۆڵانەکانی ئاوەدانییەکەی ئەو بەری چۆمی کەڵ لێی دەرناچێ.

ـ هەر بەراست بەو قوڕ و چلپاوەدا چۆن ماتەیێ چکۆلٚ لەگەلٚ خۆت دێنییە قوتابخانە؟

ـ هەتا سەر جادە گەورەکە لە قەلاندۆشمی دەکەم.

کە لەفتریە دوور دەکەوێتەوە، ئەوجار کوڕەکەی بۆکۆر دێتە لام و بە لەبزێکی دلسۆزانەوە دەلێ:

ـ کتێب لە مالێ لەفتریە وەرمەگرە. خۆی خوێندوونیەتەوە و هەناسەی بەسەریاندا هاتووە، تۆش نۆبەتێ دەگری... گوو بە کتێبیش. بنیادەم لەشی ساغ بێ هەزار جار باشترە لەوەی زانایەکی نۆبەتێداری لێ دەربچێ.

زەنگی پشوو لێ دەدرێ.

شووشەی پۆلەکە هەلٚم گرتوویەتی. رەنگی سپیی دیوارە زەردەکان توێ توێ بوون.

سۆپاکە دووکەلٚ دەکا. پێم وایە دووکەلٚەکەی هەر ئەوەندەیە تا گەرم دادێ. دوایی گڕەکەی خۆش دەبێ و دەست دەکا بە گرپەگرپ و کۆتەرەکان وردە وردە دەسووتێن.

لەوبەری شووشەی پەنجەرەکانەوە، دارەکان رووت و قووتن و ئاسمان تار.

ئاسمانی شڕ و دڕ.

ئاسمانی شڕ و پینەپینە.

١٥

ئەفسوون

*

*

*

پێش هەمووان شۆڕەبییە گەورەکەی حەوشە چرۆی دەرکرد. دواییش توو و ئەقاقیا و هەڵووژەکان. ئێستا دەشت و دەر نوقمی گوڵە.

لەگلەگ و کەناری هاتوونەوە. هێشتا تەزووی هەواکە ساردە، بەڵام زۆر گرینگ نییە.

هەر ئەوەی کە لەگلەگ هاتونەوە، ئیتر بنیادەم دەتوانێ بە پێخواسی بگەڕێ. جزمە و چەکمە و کالە دادەنێین و بەلاوەیان دەنێین و بە پێخواسی رادەکەینە دەرێ. یەك دوو رۆژان بنیادەم لاقی سڕ دەبن. شێ، لە بەلەکی پێیەوە هەڵدەکشێ و دەگاتە مۆخی ئێسقانی. بەڵام هێشتا هیچ نەبووە و لەگەڵی رادێ و دوایی هەر گوێشی ناداتێ.

ـ دایە ئیدی من هیچ لە پێ ناکەم. ئەمڕۆ دەمەوێ بە پێخواسی بچمە قوتابخانە.

ـ کەیفی خۆتە.

دەبێ قاچوقولمان بشۆین. باران باریوە و کۆڵان قوڕو چڵپاون. هەر لە ماڵێ بێە دەرێ هەتا گوێزینگان لە قوڕ دەچەقی. کەواتە بۆچی دیسان قاچوقولم بشۆمەوە؟

هەر دەچمە حەوشەی قوتابخانەوە، هەڵدەنگووم و نینۆکەکانی قاچی چەپەم شەلاڵی خوێن دەبن. لەچی هەڵەنگووتم؟ بنیادەم دەبێ تۆزێك لەسەر هەست بڕوا

دەگەمە قوتابخانە. دەچمە سەر جێیەکەم دادەنیشم. تەکلیف(واجب)ـەکانم دەنووسمەوە و گوێ لە مامۆستا دەگرم.

زەنگی پشوو...

هەر تەواو نابێ.

ـ وەرن چاوشارکێ و دایە مەمدە بە گورگەی بکەین.

سەر لە دووی یەك دەنێین. جا وەرە رابکە. دیسان پەنجەکانی قاچی چەپەم چڵ ددەن. لە سەعاتێك لەوەپێش پتر دێشن.

دادەنیشم و لە سەری پەنجە خوێناوییەکانم ورد دەبمەوە و دەیانپشکنم. خوێنیان لێ دێ و دەبرژێنەوە. نازانم چیم بەسەر هاتووە. هەر ئەوەندەیە لەبەرخۆمەوە دەڵێم: "ئەمڕۆ دەبوایە تۆزێك وریا بوایەم. لەوانەیە ماندوو بووبێم."

ئەو زستانە تەندروستیم هەر باش نەبوو. ئەوەندەش خراپ نەبووم بڵێم نەخۆش کەوتووم.

ڕۆژێکیان بە دایکمم گوت: سەرم دێشێ.

گوتی: دڵنیای هەر سەرت دێشێ؟

ـ گوتم دڵنیام.

گوتی: کەواتە هەڕۆ بچۆ گەمەکەت بکە. هەڕۆ دەرێ با تۆزێ با لێت بدا.

ئیدی پاش ئەوە زۆربەی جاران سەرم هەر دێشا، بەڵام لای کەس دەنگم نەکرد. دایك و باوکمان ئێستا کاتی وەیان نییە خەریکی ئێمە بن. ئەگەر نەخۆش بکەوین، هەر ئەوەندەمان پێ دەڵێن لە جێ بخزین و سەرودڵی ئەوانی دیکە نەگرین. ئەوەندەش لە جێدا دەکەوین، تا چاك دەبینەوە و، هەڵدەستینەوە دەچینەوە دەرێ بۆ شەیتانی و بەدفەڕی.

باك و دایکمان نازمان ناکێشن و دەستمان بەسەردا ناهێنن. نازی چی، خۆ قاچ خوار دانێین، باری کەرێکمان تێهەڵدەدەن. ئەوە بەڵایەکە بەسەر من دێ و ئەوە بەڵایەکە زۆربەی جاران بەسەر ئیۆنی برام و ریتزای خوشکیشم دێ.

ئاڤێندریا ملۆمۆیەتی ئێنوی برام وەدووی خۆی بدا و وەك خۆی فێره دزێی بكا. پێكەوه مریشك و كەڵەباب و مەڕ و جوانووه ئەسپ دەدزن و دەیدەنه مەیخانەچییەكان و لەبری ئەوه مەشرووبی لێ دەستێنن.

ـ وا دیاره دیسان نیوەشەوێ هاتوویەوه. شوئاوای ئاغات شكایەتی لێ كردووی.

ـ لەگەڵ ئاڤێندریا بووم.

ـ له كوێ؟

ـ له چاوبڕكێی كچان بووین.

ـ بۆگەنی ئارەقیشت لێ دەهات.

ـ شۆئاوای ئاغای وای پێ گوتم، باوكه.

ئەو كافره یەكپشوو درۆیانیش دەكا.

ـ ئاخری رۆژێكیان پاسەوانەكان به كلك دەتگرن.

ـ تۆ دێی رزگارم دەكەی، باوكه.

ـ بەڵێ بەڵێ دێم. بەڵێ دێمه قایمقامی، نەك بۆ بەردانت، دێم ئەوەندەت تێ هەڵدەدەم ئیدی له رووت هەڵنەیه له نێو خەڵك سەر هەڵێنی.

ئیۆن بەڵێن دەدا لەمەودوا كوڕێكی باش و بەگوێ بێ.

دایكم له باوكم دەپرسێ:

ـ ئەرێ قوڕی كوێ وەسەر خۆمان بكەین بۆ ئەو كچەتیوه؟ رۆژتائێوارێ بیر له مێردكردن دەكاتەوه. خۆ هێشتا نەبووەته چواردەساڵان، بەڵام كه چاوی به كوڕێك دەكەوێ، وەختە ملی خۆی بشكێنێ. دەترسم نەكا خۆی بدۆڕێنێ. وا دیاره لەگەڵ ئەو هەتیوەی كرێچیۆن، لەگەڵ براتیلا شتێكیان له مابەیندایه. وای بۆ دەچم..

ئەمجارە روو لە خوشكم دەكا و دەڵێ:

ـ وانییە دێڵە بەرەڵا؟

ـ ئەوە دەڵێی چی دایە.

سوور هەڵدەگەڕێ. سوور سوور. چەناگەی دەست دەكا بە لەرینەوە، وەك بڵێی بیەوێ بگری.

باوكم هەڵدەداتێ: ـ وەڵا خۆ كوڕێكی خراپیش نییە. بەڵام نابێ جارێ پەلەی بكەی ریتزا. دەبێ بڕێك باوخۆشتر بی و گەورە بی.

ـ بۆچی پەلە نەكەم؟ دایكم خۆیشی چواردەساڵان بوو كە مێردی كرد. وەك ئێستای من بوو و مێردیشی كرد. دەی، چیی لێ هات؟ خۆ نەمرد... دوای ئەوەش كێ پێی مردووە؟

خۆ دایكم و باوكم بەسەر ریتزا و هەتیوەی كرێچیۆندا بكەون، ئەوەدەمەی لەبەر دەرگای ماڵێ لە ژوانن، خوا بزانێ چەندی تێهەڵدەدەن. شەق بە شەق دەڵێ جێم بكە.

لە قوتابخانە دێمەوە. دیسان هەڵدەنگووم. وەی خوایە، ئەوە بۆ وام لێ هاتووە؟

پاش نانخواردنێ دەچم خۆم دەدەمە بەر ئەو هەتاوەی قوڕ و چڵپاوەكە هەڵدەبرینگێنێ و وشكی دەكاتەوە. لەبەر بەرۆژچكە خۆم گەرم دەكەوەوە.

لاقم لە نێو حەوزەكەدا دەشۆم. هەتا ئەژنۆم. پەنجەكانی قاچی چەپەم شەقار شەقار بوون.

نێوان حەوز و بیناكە وشكە. لاقم پیس نابنەوە. ئیۆنی برام كە لە گوندەوە هاتووەتەوە، لە تەنیشت من لەسەر حەسیرەكە دادەنیشێ. لە گیرفانی سەڵتەكەی تووتن و پەڕ دەردێنێ و جگەرەیەك هەڵدەپێچێ و چەند مژێكی لێ دەدا و سەیرێكی قاچی من دەكا:

ـ ئەوە قامكت چیی لێ هاتووە؟

ـ لە بەرد هەڵەنگووتووم.

زیاتر لە قاچم ورد دەبێتەوە. دادێتەوە و دەیانپشكنێ.

ـ دا تۆزێك بیجوولێنه بزانم.

هەوڵ دەدەم پێم بجوولێنم. پێکەنینم دێ.

ـ ناتوانم بیجوولێنم کاکە.

ـ قسەی قۆڕ. چۆن ناتوانی قاچت بجوولێنی؟

ـ ئەوەتا ناتوانم. هەوڵ دەدەم بیجوولێنم، بەڵام ناجوولێ. چەندە سەیرە.

ئیۆنی برام بانگی دایکم دەکا. ـ دایە وەرە چاو لێکە. ئەو هەتیوە گۆج بووە، ناتوانێ قاچی بجوولێنێ.

هەر وا دەتریقێمەوە و قاچم پێشانی دایکم دەدەم. ئەویش بڕوا ناکا کە هەر بەراستی ناتوانم قاچم بجوولێنم.

ـ بە قەستی وا دەکەی داریە؟

ـ بەقەستی چیی دایە؟

باوکیشم دەبیستێتەوە. دەڵێ:

ـ هەر ئەوەمان کەم بوو. جا وەرە ئەو کەرەی لەو قوڕە دەربێنەوە. هەر ئیفلیجێکمان کەم بوو، ئەوەش ئەو.

من ئیدی گەورە بووم، بەڵام زۆر ریوەڵە و لاوازم. دەموچاوم زەردەڵە و قژم کاڵە. پێستم شڵەیە. ئەگەر لەگەڵ هاوەڵەکانم زۆرانبازی بکەم، دەرەقەت زۆریان نایەم. بەو حاڵەشەوە مەچەکێکی بەهێزم هەیە. کە لەگەڵ یەکێك لە هاوەڵەکانم تووشی شەڕ دەبم، خۆم لا دەدەم و هەوڵ دەدەم یەکەم مست من بیوەشێنم. ئەگەر یەکێکیش لاق بداتە بەر لاقم، لە کەوتنێدا وەك قوڕنوو پێوەی دەنووسێم و لەگەڵ خۆم لەعەرزی دەدەم، جا ئەوجار سواری سەری دەبم و بەهەموو هێزی خۆم قەپاڵی لێ دەدەم. ددانیشم تیژن، کەس ددانی وا تیژی نییە. هەر بۆیە ناویان ناوم "گەزگەز"

باوکم دیسان دەڵێ:

ـ ئەدی ڕۆڵە، هەر ئەوەت کەم بوو گۆجیش بی.

دایکم بە دڵی پڕەوە دەڵێ:

ـ تازە ناشتوانی ببی بە ئەفسەر.

مامۆستا باسی منی بۆ دکتۆر گانچۆ و قازی کارلیگاتزی کردبوو. هەر سێکیان ڕێککەوتبوون ئەو پارەیەی پێویستە من پێی بچمە شاری و ناوی خۆم لە پەیمانگەی ئەفسەری بنووسم، لە نێو خۆیاندا کۆی بکەنەوە. جارێ ئەوە ریسەکان بوونەتەوە خوری. من ئیفلیج بووم و پەیمانگەی سەربازییش ئەو قوتابییانە وەردەگرێ کە هیچ نقوستانییەکیان نەبێ.

دایکم و بابم تەگبیر دەکەن.

دایکم دەڵێ:

ـ بێ و نەبێ جنۆکەخراپەکان دەستیان لێ وەشاندووە. دەبێ نوشتووی بۆ بکەین.

بابم بڕوای بە نووشتە و جادوو نییە، بەڵام ناتوانێ بە دایکم بڵێ نا. بەبێ ئەوەی هیچ بەکەیفی بێ، لەبن لێوانەوە دەڵێ:

ـ دەی باشە، بەشکم نوشتە و نزا دەردێکی دەوا بکا.

دەستم دەگرن و دەمبەنە لای ئانگل نابادانێ. ژنێکە، قژە کاڵەکەی مەیلەوشین بووە. بنیادەم دەخاتەوە بیر ئەو دۆمە ڕەشماڵنشینانەی لە داوێنی چیاکانی ئارگەش دەژین و دادەگەڕێن بەرەو دەشتایی بۆ ئەوەی کەوچکە دارینە و تەشی و بلوێر و بێژینگ بفرۆشن. دەڵێن زۆر کوێریان بینا کردوەتەوە و هەتیوێکی لاڵیان لە ئاوایی پۆتزینێییەوە هێناوەتە لای چاکی کردوەتەوە و زمانی پژاوە. دەڵێن شەوێکیان پەیکەرەی مێو، سێحریان لە قەشە کردبوو، خۆ ئەگەر سیحرەکەی بەتاڵ نەکردبانەوە، رزگار نەدەبوو.

ئەنگل نابادابییە لە قەراغ ئاوایی لە تەنیشت گۆلەکە لە کۆخێکی وەك گەوڕدا دەژی. نە ژنی هەیە نە منداڵیش. بەتاقی تەنێیە. لە بەهارێوە هەتا پاییزێ لە گۆلەکاندا هەر ماسی دەگرێ. گەنم و گەنمەشامییەکەشی بە سەرقەڵەمانەی نوشتە و دوعاکانی دابین دەکا.

لەسەر تەختەخەوە رەقوتەقەکەی درێژم دەکا و بە پەنجەکانی قاچم دادەماڵێ. هۆکاری نەخۆشییەکەم دەدۆزێتەوە و دەڵێ:

ـ بەڵێ بەڵێ راستە. لەمەچێژتر لەو منداڵۆچکەیە کەوتوونە سەرپشت. دەبێ بە ئاواییەکاندا بگەڕێن و هەرچی کۆتان کردەوە بیبەنە شاری بیدەنە زێڕینگەرێك، قاچێکی زیوی بەناوەوە ببڕێ و بیهێننەوە کلێسا لە بن کۆتەڵەکەی مەریەمی پاکیزە هەڵیواسن، بۆ ئەوەی قاچی کوڕەکەتان چاك بێتەوە و بکەوێتەوە سەرپێ.

ـ باوکم ناعیلاج بە ئاواییەکاندا دەگەڕێ. هەندێ ربەیەك جۆی دەدەنێ و هەندێ ربەیەك گەنمەشامی. هەمووی لە توورەکەکەی دەکا و دەچێ بە بارزگانە یۆنانییەکانی دەفرۆشێ و دراوێکی زیو و دوو لی وردە پووڵیان لێ وەردەگرێ و دێتەوە ماڵێ. بەشی کڕینی پێیەکی زیوین دەکا. سواری بارگینەکەی دەبێ و دەچێتە شاری. دوو رۆژان لەوێ دەمێنێتەوە و بە قاچە زیوەکەوە کە لە توورەکەی دراوەکەی پێچاوە دێتەوە ماڵێ. قاچە زیوەکە پێشانی من و دایکم دەدا.

ئەوە قاچی منە باوکە؟

ـ ئەدی رۆڵە، قاچی تۆیە.

جا چونکە بۆلبۆکی پێشنوێژ سێبەرمان بە تیر دەنگێوێ، ناچار قاچە زیوینەکە دەبەینە کلێسای ستانی کۆتز، لە بن کۆتەڵەکەی مەریەمی پاکیزە هەڵدەواسین.

قاچە زیوەکە ئێستاش هەر بەوێوەیە، بەڵام قاچی من چۆن بووە هەر وەك خۆیەتی. ئیتر زۆر بەهێواشی پێ لە عەرزی دادەنێم و هەر سێ چوار هەنگاو جارێك سەرەنگرێ دەبم. بێت و تۆزێك

ئاگام لەخۆم نەبێ بەدڵنیایی ملم دەشکێ. ئێستا هەر پەنجەکانی قاچی چەپەم نییە کە پێستیان بەرداوە و بریندارن، سەر ئەژنۆ و ئانیشك و رەفیچکەشم وەك پەنجەکانی لاقمیان لێ هاتووە. هەموو گیانم بووەتە برین و کێم.

هاوپۆل و هاوەڵەکانم هەر لەبیریشیان نەماوە کە هەتا دوێنێ ناویان نابووم "گەز گەز". ئێستا ئەو نازناوە گەپجارەیان گۆڕیوە و کردوویانەتە "شەلەی نەگبەتی".

خەریکن تۆپێن دەکەن و من لە دواوە رادەوەستم و سەیریان دەکەم.

ئێستا ئەوە چاوشارکێ دەکەن. ئای چەندەم حەز لێیە منیش پێك بکەن. هەر وا لە پشتەوە رادەوەستم و سەیری گەمەکەیان دەکەم. بە حەژمەت و ئیرەییەوە سەیریان دەکەم.

تۆتانۆ لێم دەپرسێ: حەز دەکەی پێکت بکەین داریە؟

ـ ئەرێوەڵا، چۆن حەز ناکەم!

ـ ئای فچ چ، بە خەونیش نایبینی پێکت بکەین، تۆ نقوستانی.

ـ ڤێ ڤێ، هەتیوەکەی پاپێل لێم دەپرسێ:

ـ حەز دەکەی چاوشارکێت لەگەڵ بکەین؟

ـ نەخێر، پێم خۆش نییە گەمەتان لەگەڵ بکەم.

ـ بۆ دڵت باشە. زۆریشت حەز لێیە. وەختە شێت بی. پێم وایە نقوستانی، هەر بۆیە پرسیم، گوتم تۆزێکت پێ رابوێرم.

هەتیوەکەی پاپێل کە ئەو قسەیە دەکا و را دەکا بەدوای تۆپەکەیدا و بەدەم راکردنەوە لاسایی شەلەکان دەکاتەوە. تۆپەکە هەڵدەگرێتەوە و دەیهاوێ و دەست دەکاتەوە بە شەلەشەل. تۆتانۆ قاقا پێدەکەنێ و گانگۆش دەتریقێتەوە. تۆدۆراکێش قاقا دەکێشێ. هەمووان پێدەکەنن و بەشەلە شەل دەڕۆن. هەر کامە و حەز دەکا نێوقەدی پتر بشکێنێتەوە، زیاتر بشەلێ و خۆی گەپجارتر بنوێنێ.

ـ ئاوایە، ئەوەتا داریە ئاوا دەڕوا.

قوونیان بە دووی خۆیاندا رادەکێشن و وەك ئیفلیجان دەڕۆن.

*

*

*

عارەبانەی شڕ و شەوێق، کە هەر کامە و ئێسترێکی زاماریان تێکراوە و دنیایەك مێش و مەگەز لە برینی ئێسترەکان نیشتووە، لە دەم کالماتزۆیی لە گردەکانەوە دادەگەڕێن، یان لە دەم دانووبەوە بەرەو سەر هەڵدەکشێن. ئەو عارەبانانە قەتاریان بەستووە و بەشوێن یەکدا بە ئاواییەکاندا رادەبرن و ئەو نەخۆش و نقوستانانەی دەردی بێدەرمانیان گرتووە، لەگەڵ خۆیان دەبەن: شەل و گۆج و ئەو کوێرانەی چاویان وەك لوویەکی کێمداری لێهاتووە و خەریکە بتەقێ، ئەو پشتکووڕانەی هەر دەڵێی سەرمایانە خۆیان گرمۆڵە کردووە. یەك لە پێشەوە، یەك لە دواوە. ئیفلیج بە دەست و پێی مردووی رەشهەڵگەڕاوەوە...

داماوانە لە عارەبانەکاندا دەنگیان هەڵێناوە و گۆرانییەك دەڵێن ئاگر لەدڵ بەردەدا. لە سەر چواررێیانەکان، کە رادەوەستن، لە گۆرانیگوتن دەکەون و بۆ سواڵکردن دەنووزێنەوە:

ـ خێرتان دەگاتێ، ئەی خەڵکە باشەکە، رەحمێکمان پێ بکەن. خێری گۆڕی مردووتان سەدەقەیەك بکەن.

هەر کەسە و بە پێی گیرفانی خۆی شتێکیان لە مستی دەنێ. ئینجا قەتارەی عارەبانە دەکەونەوە رێ و بە ئاواییەکاندا تێدەپەڕن و رێگە پڕ دەکەن لە هاوار و ناڵە و نیوەنووزە. تەنیا ژنە دووگیانەکان روو وەردەگێڕن بۆ ئەوەی چاویان پێیان نەکەوێ. ئەگەر وا نەکەن، منداڵەکەی خۆشیان ئاوا لەدایك دەبێ.

زۆر لەو ژنە دووگیانانە وەدووی قوونی مێردەکانیان دەکەون و، دەچنە بازاڕی مەکارەی تۆرنۆ، کە پاییزان دەکرێتەوە. خۆ بازاڕی مەکارەش دیارە ئیتر: هەرچی سواڵکەر و قرِهاتوو و نەخۆش و نقوستانی وڵاتە لەخۆی کۆ دەکاتەوە... لە خاك و خۆڵەکەدا دەگەوزن و دەنووزێنەوە و دەپاڕێنەوە. دەست و لاقە نقوستانە زامار و کێمکردووەکانیان پێشانی خەڵکی خوای دەدەن بەشکم بەزەییەکیان پێیاندا بێتەوە و دەستێك لە گیرفانیان رۆبکەن. زۆر لەو ژنە دووگیانانەی لە بازاڕی مەکارە ئەو نووزانەوە و لاڵانەوانەیان دیتووە، منداڵەکەیان لەبەر چووە. زۆربەشیان منداڵەکەیان کە بووە دەموچاویان لە بۆقیلە چووە یان دەستیان وەك باڵی ماسی وابووە یان پێیان پێکەوە نووساوە.

ـ هۆی ئیلینکا، بگەڕێوە، بگەڕێوە. عارەبانە کوێر و کەچەڵەکان وا دەگەنێ. چما لەسەر مانگ و رۆژی خۆت نی؟

ژنە، کلکی لە گەلۆزی ناوە و خۆی لە ماڵەوە پەستاوتووە.

گانگۆ پێم دەڵێ:

س س س سواڵ ك کەر... س سو سواڵ کەری نقوستان، ئەوجار لێت روون بۆوە چیت بەسەر دێ کاك داریە؟ سواڵکەرێك دەبی وەك ئەمانە.

کوڕە سەیری دنیا بکە، ئێستا ئەو گانگۆ لاڵەپەتەیەش لێم بووەتە پیاو و گاڵتەم پێ دەکا. خوا بزانێ لەوەودوا کێی دیکە دەوێرن لاسایی ئەو بکەنەوە.

ـ سواڵکەر.. سواڵکەر... سواڵکەرێکی ئیفلیج. خۆ تێگەیشتی دەبی بە چی داریە؟ سواڵکەرێکی وەك ئەمانە.

وەك بڵێی هەزار کوتك وێکڕا هەڵێنن و بە تەپڵی سەرمی دا بدەن.

ـ سواڵکەرێکی نقوستان.

ریتزای خوشکم پێم دەڵێ:

ـ تۆ کە نقوستان بووی، ئیدی نابێ لەگەڵم بێی بۆ "هوڕا" شەرم دەکەم و دەبمە تنۆکێك ئاو. کە دەمەوێ بچمە جێیەك، ئاوا بە شەلەشەل وەدووم بکەوی، دەتگرم قژت بەسەرەوە ناهێڵم ها.

گانگۆش هەر وا لالەپەتە دەڵێ:

ـ س س سواڵ ڵ کەر... سوسواڵکەر... سو س سواڵکەرێکی نقوستان. خۆ دەزانی چیت بەسەر دێ کا داریە؟ س س سوا ڵ ڵ کە کەرێکی وەك ئە ئە ئەووانە.

دەچمە دەم حەوزەکە. کام خڕکەبەرد لە دەستان خۆشن، هەڵیاندەگرم و لە کۆشمیان دەکەم و دێمەوە لای منداڵەکان کە سەرقاڵی گەمەن و وەبەر بەردیان دەدەم. وەك باران. بەو هیوایەی سەری یەك دووانێکیان بشکێنم.

منداڵ دەست لە گەمەکەیان هەڵدەگرن.

تۆتانۆ دەڵێ: ئەی، کوڕە سەیری ئەو شەلە گۆجە بکەن، بێشەرمیش بووە. کوڕینە دەی، یاڵا...

بە تووڕەییەوە بەردبارانیان دەکەم. ئاخری یەکێکیان وەبنگوێی تۆتانۆ دەکەوێ. بەلادا دێ و دەکەوێتە عەرز. دەمەوێ را بکەم، کەچی سەرەنگرێ دەبم و دەکەوم. سێ منداڵیان خۆم پێدا دەدەن. دەمدەنە بەر مست و پێلەقە و سەروگوێلاکم تێك دەکەنەوە. خۆ ئەگەر نەتوانم خۆم بخەمەوە سەر پشت، هەر دەمکوژن. هەموو تینم دەدەمە خۆم. تلێك دەخۆم، تۆزێك هەڵدەستمەوە و توند ملی ڤیێ ڤیێ دەگرم. بەرەو خۆم دەیکێشم و جا ئەو ددانانەم کە بەردیش دەشکێنن، لە نێوشانی توند دەکەم. قەپی لێ دەگرم و هەست دەکەم ئاوێکی سوێر دێتە نێو زارمەوە. خوێن.

هەتیوەکەی پاپێلکا وەك مارانگازێك دەزریکێنێ. دیلەکەی خۆی بەردەدا. پاڵێکی پێوە دەنێم لە نێو خاکوخۆڵەکەدا دەگەوزێ. دوانەکەی دی دەکشێنەوە و را دەکەن. چەند بەردی دیکەشیان تێ دەگرم. وا هەڵدێن قاچیان نابینرێ. تۆتانۆ هەڵدەستێتەوە. ڤیێ ڤیێش. دوور دوور لە من دیسان کۆ دەبنەوە و یەکێکیان دەڵێ:

ـ هار بووه. ئەمڕۆ و نا سبەی دەبێ بیبەنە شێتخانە و سندمی بکەن.

دەچمەوە ماڵێ. دەموچاوم ئاوساوە و دەمولێوم خوێناوین و پێستی دەستم داماڵکاوە.

دایکم دەڵێ: لەگەڵ کێ بەشەڕهاتووی؟

ـ لەگەڵ کەس دایە.

بەتەنیا مانەوە. بەردەوام بەتەنێبوون، زۆر ترسناکە. نەك هەر ئێستا، دواتریش، تا مردن.

شەوێ، عارەبانەی ئیفلیجان دێتە خەوم. لە خەوما، منیش سواری یەکێکیانم. خۆم دەبینم ئەوا دەستم پان دەکەمەوە و دەپاڕێمەوە و دەنووزێمەوە و سواڵ دەکەم:

ـ لە ڕێی خوادا، خێرێکم پێ بکەن.

لە خەودا دەگریم و دەنووزێمەوە.

دایکم بەخەبەرم دێنێ و دەڵێ: داریە، ئەوە چتە؟ چاوت هەڵێنە.

چاوم هەڵدێنم. شەلاڵی ئارەقەم.

ـ دیسان؟ بەربینگی پێ گرتبووی و لەتۆ وابوو...

ـ بەڵێ دایە دیسان بەربینگی پێ گرتبوومەوە.

ـ بنوو، بنوو.

بەڵام ئیدی خەوم زڕاوە. چاکەتەکەم بەسەر شانمدا دەدەم و دەچمە حەوشە. لك و پۆی دارەکان خشەخشێکی خۆشیان لێ دێ. لك و پۆی دار بییەکە خشەخشیەکەی خۆشترە.

ئاسنەڕێ بە پشت ماڵەکەماندا تێدەپەڕێ. ئەوبەری ئاسنەڕێیەکە گردێکە و ئەوبەری گردەکەش دەشتاییە. لە گردەکە وەسەر دەکەوم. کێڵگەکانیش خشەیان دێ. ئاسمان ساوە. وەك شووشە. شەوێکە لە شەوانی بەهار. مارمێلکەیەك دەخوشێتە نێوان قاچە رووتەکانم. کلکی سارد ساردە. مارمێلکە فێنکن. وەك مار. ئەودەم کە ئەسپەکانم دەبردە لەوەڕ، مارم دەگرتن. پەڕۆیەکم لە زاریان دەخست بۆ

ئەوەی قەپی لێ بگرن. مار ددانیان لە قوماشەکە گیر دەکرد و ئەودەم لەپڕ پەڕۆکەم رادەکێشا و ددانیانم دەردەکێشا. لە پێشدا پشتەملیانم دەگرت بۆ ئەوەی نەتوانن پێمەوە بدەن، بەڵام کە ددانم دەکێشان، چۆنی حەزمان لێ بوایە گەمەمان پێ دەکردن. ئاخرییەکەشی دەمانکوشتن. سەرمان پان دەکردنەوە. ماری درێژی بەڵەك کە بن زگیان خۆڵەمێشی بوو، هەتا ئێواری هەر جینگڵیان دەدا و پەپکەیان دەکرد. جاروبار لەبەر ئازار هەڵدەبەزینەوە و، دەلەرزینەوە. خۆ کە ئاوا دەبوو، ئەوانیش جووڵەیان لێ دەبڕا و هێور دەبوونەوە.

زۆرم حەز لێ بوو گەمە بە ماران بکەم. لە ملمم دەئالآندن و هەستم بە فێنکایەتییەکەیان دەکرد.

ـ مار خوێنی سارده داریە.

ـ مارمێلکەش.

ـ ئا، بۆقیش.

دەستم لەسەر پێی راستەم دادەنێم. گەرمە. لەسەر پێی چەپەمی دادەنێم ، لاقە نەخۆشەکەم، ساردە. وەك مار ساردە.

چەند هەنگاو لەولاترەوە ئەسپێك دەحیلێنیّ. لە تاریکییەکەدا لە لاتەنیشتەوە دەبینیم بەرز و تار. سەری هەڵێناوە، وەك بڵێی بیەویّ هەواکەی شەویّ وێکڕا هەڵمژێتە نێو سینگی. حەیلاندنەکەی درێژ و رێکە.

ـ کێ لەوێیە؟

ـ منم کاکە تاراش.

پاسەوان لە بەر پێی ئەسپەکە لەسەر گژ و گیایەکە درێژ ببوو و وەنەوزی دەدا.

ـ بەو نیوەشەوە لەو دەشتە لەچی دەگەڕێی کوڕی باش؟

ـ سەرم دێشا، هاتمە دەریّ پیاسەیەکی بکەم.

تاراش شقارتەکەی دەردێنێ و جگەرەیەك دادەگیرسێنێ. جگەرەکەی لە تاریکییەکەدا سوور دەچێتەوە.

ـ بە ڕێدا برۆ کوڕی باش، چەندی حەزت لێیە برۆ.

دیسان لە گردەکەوە دادەگەڕێم و لە تەنیشت ئاسنەڕێیەکە دادەنیشم.

شاندۆ گێلەی دراوسێشمان ئەمشەو خەوی زڕاوە. لە باغەکەی خۆیاندا دێ و دەچێ و لەبەر خۆیەوە قسە دەکا، کەس نازانێ دەڵێ چی. لەگەڵ شەیتان قسان دەکا.

ـ چیم بەسەر دێ؟ ژیانم چۆناوچۆن دەبێ؟ ئەرێ ژیان خۆی چییە؟

جا وەرە بنیادەم کە ساغ و سلامەتە، بە حاڵی سەگ دەژی و دەتوانێ بەڕەی خۆی لە ئاوێ دەربکێشێ. ئەی یەکی نقوستان و گۆج دەبێ قوڕی کوێ وەسەر خۆی بکا؟

لە دوورەوە، لە نێوان ئەو دەربەندەوە کە گردەکەی کردووەتە دووبەش، گوێم لە هۆڕنی شەمەندەفەرەکە دەبێ. شەمەندەفەرێکە، کە نیوەشەوێ بەرەو دانووب دەچێ. گوێم لە دەنگەکەیەتی کە نزیك دەبێتەوە. دەنگی بەهەمبوو ئەو شیو و دۆڵانەدا دەگەڕێ کە پێیاندا تێپەڕێ و چراکانی زۆر رووناك و بەشۆقن. لە دڵی خۆمدا دەڵێم: ئەگەر لە سەر هێڵەکە راکشێم، لەتوپەتم دەکا، ورد دەمئەنجنێ. هەتا ئێوارێ کەس ئاگادار نابێتەوە. تەواو دەبم و لەکۆڵ دەبمەوە."

دوێنێ تووشی کچە چکۆڵەکەی ئیۆرداکێ دیمان بووم. هەر ئەوەی دەموچاوی کەمرەی گرتووە. ورد ورد سەیری کردم و دوایی لێی پرسیم:

ـ ئەوە بۆ دەشەلی؟ هێشتا چاك نەبوویەتەوە؟

ـ نا.

ـ قەتیش چاك نابیتەوە. باوکم گوتوویەتی بە شوانت دەگرێ، مەڕەکانمان بە نانەزگی بۆ بلەوەڕێنی. لەوانەیە ئەگەر دڵی هێنای، چەند جلەکۆنێکی براکەشمت بداتێ.

ئەدی. ئەگەر لەسەر هێڵەکە راکشێم، چەند ساتی دیکە ئیتر نەماوم. ئیتر هیچم لێ نامێنێ.

من خۆم جارێکیان ژنێکم بەچاوی خۆم دی کە وەبەر شەمەندەفەر کەوتبوو و ئەنجنیبووی. خەڵکی ستانی کۆتز بوو. ژنێکی لاوی لاواز و ریوەڵە بوو. مێردەکەی دەری کردبوو، ئاخر لەبەرچاوی کەوتبوو. ئاشقی ژنێکی دیکە ببوو. لێی دەدا و بۆ ئەوەی ناچاری بکا بڕوا. داماوە رۆیشت و لە رووبارەکە و لە بن شۆڕەبییەکان خۆی شوشت و کراسێکی جوانی لەبەر کرد و ئینجا هاتە تەنیشت ئاسنەڕێیەکە و وای نواند ئەوە خەریکی کارە و، ئیتر هەر شەمەندەفەرەکە هات، خۆی هاویشتە بەری. لکۆمۆتیڤەکە هۆڕنی لێ دا و ستۆپی کرد، بەڵام ئیتر ژنەی وەبەردابوو. لەتوپەتەکەیان لە سەوەتەیەك کرد.

ـ لە کوێی داریە؟

ـ لێرەم دایە.

ـ وەرە بخەوە.

ـ ئەوە دێم دایە.

شەمەندەفەرەکەی نیوەشەوێ بە زرم و کوت بە بەردەممدا تێدەپەڕێ.

ـ ئەوە بۆ وا هەڵدەلەرزی؟

ـ سەرمامە.

ـ دیارە سەرمات دەبێ کوڕم، تۆ ئەو نیوەشەوە ئاوا بە رووتی دەچی پیاسە دەکەی...

کچەکانیش دەهاتن و لەگەڵ ئێمە گەمەیان دەکرد. ئێستاش هەر دێن. من دەچمە لاوە. تەنانەت ئەگەر هاوەڵەکانم بێدەنگیش بن، ئەگەر متەقیشیان نەیە و هەر هیچ هیچیش نەڵێن، دیسان لە چاویاندا گەپجاڕییەك بەدی دەکەم. سەیر نییە. بنیادەمی شڕوشەوێق و ئیفلیج لە گوندەکاندا بایی پووشێکە. زۆر زوو ئەوەم لێ روون بۆوە. زۆر زوو و لەسەر خۆم.

ئیتر ورده ورده و جار به جار تەنیاتر دەبم. زۆر سەیر نییە کە بنیادەم ببینێ ئەوە منداڵان پۆل پۆل دەچنە گوڵە نێرگزان لە سەر گردەکان و، خۆشی ناچار بێ وەك مریشکێك لەسەر کۆپەنك هەڵنیشێ و سەیری دوورکەوتنەوەیان بکا و نەشتوانێ وەدوویان بکەوێ و بیانگاتێ. ئەوەش پێکەنیناوی نییە کە بنیادەم بەچاوی خۆی ببینێ ئەوە خوشك و براکانی بە دڵسۆزییەوە وتەنانەت جاری وایشە بە نەفرەت و بێزارییەوە سەیری دەکەن... نا، هیچ پێکەنیناوی نییە...

ناویان نابووم "گەز، گەز". بەو ناوە بەخۆم دەنازیم. ئێستا منداڵ بانگم دەکەن "شەلەی نەگبەتی". ئەوەش راستییەکە و نابێ پێم ناخۆش بێ، بەڵام لەدڵم گران بێ. دەمشکێنێ و ئاخری وام لێ دەکا خۆم لە هەمووان بدزمەوە.

تۆرتۆریکا تەواو بڕوای کردووە کە من ئیدی کوڕەکەی جاری جاران نیم.

لێم دەپرسێ: قاچت دێشێ داریە؟

ـ قاچم نایەشێ. هیچ جێیەکی دیکەشم هیچ بەڵای لێ نییە.

ـ بێهیوا دیاری.

ـ نا، وا نییە.

ـ با، با. رێك وایە. جا دری بۆ چییە؟ زۆر باش دەزانم چۆنی. پێت وایە شەل و گۆجی خراپترین بەڵایە... دەی خۆ دیارە. بۆ گاڵتە نابێ... دیارە خۆشە بنیادەم شەل و ئیفلیج نەبێ. بەڵام کە وای لێ هات چار چییە؟ چارەی چییە، پەنا بە خوای گەورە، دەبێ هیوات بە رەحمەتی خوا بێ. تازە، بۆ لەم دنیایە هەر تۆ شەل و نقوستانی و ئەم بەڵایەت بەسەر هاتووە؟ خوا دەزانێ لەم دنیایە چەندی وەك تۆ هەن. بەڵام ئەوانی دیکە زیندوون و بیر لە ژیان دەکەنەوە.

ـ وایە، لاتولووتەکان، نقوستانەکان، سواڵکەرەکان...

ـ با ملیان بشکێنن و جەحەننەمیان لێ پڕ بێ. مەبەستم ئەوان نەبوو. لە بادۆلیاسا پشتکوورێکم دی. دەزانی چ کارەیە؟ میرزای قایمقامی... گونیشی پێی ناچێ کە وایە. نامەکانی قایمقامی دەنووسێ و مواجبی خۆی لە دەوڵەت وەردەگرێ و بۆخۆی دەژی. بە لاقێکی ساغیشەوە دەکرێ وەك خەڵك بژیی ها.

ـ یان دەڵێی منیش دەبێ بچم ببمە سکرتێر؟

ـ "دەبێ"ی ناوێ.

زۆر لە جاران زیاتر بۆ وەرگرتنی کتێب دەچمە ماڵی مامۆستاکەمان.

لە بن ئەقاقیاکانی باغەکەمان رادەکشێم و کتێب دەخوێنمەوە. رۆژ تا ئێوارێ سەرم لە کتێباندایە. وردە وردە شادیی تازە لە کتێبەکاندا دەدۆزمەوە. بێهیواییەکەم لەپڕ دەڕەوێتەوە. چاویان دەرێ، لێگەڕێ چ ناوێکیان پێخۆشە ئەو ناوەم لێ بنێن و چەندی حەزیان لێیە گاڵتەم پێ بکەن. ئێستا ئیتر دەرگای ژیانێکی دیکەم بەسەردا کراوەتەوە. مامۆستا پێی گوتم، ئیتر ناتوانم بچمە پەیمانگەی ئەفسەری. یەکێکی نقوستان بێ، ناتوانێ ببێتە بەرپرس. بەڵێ. بەڵام بۆ ئەم دنیایە هەر یەك پەیمانگەی ئەفسەریی تێدایە؟

لێی دەپرسم:

ـ مامۆستا، ناتوانم بچمە قوتابخانەی ئایینیش؟

ـ نا، لە قوتابخانەی ئایینیش وەرتناگرن داریە.

ـ کەوابوو دەچمە پەیمانگەی مامۆستایان. حەز دەکەم وەك تۆ ببمە مامۆستا.

ـ لەوێش وەرتناگرن. کارمەندی دەوڵەت نابێ نقوستان بن. دەکرێ بچیتە دواناوەندی. بەڵام دەبێ پارەت هەبێ. ئەویش نەك شایی و دەرهەمێك.. دەی کێ دەتوانێ ئەوەندەت پارە بداتێ کە پێداویستییەکانت دابین بکەی؟

ـ بۆخۆم دەچم پارەی بۆ پەیدا دەکەم.

ـ ئەوەش زۆر سانا نییە.

ـ من لە کوێرەوەری ناترسم.

مامۆستا دێتە پێشێ و سەرم دەخاتە نێوان دەستی و دەملاوێنێتەوە:

ـ حەیف، داریە گیان. حەیف دنیایان ئاوا ئەستەم کردووە... بەڵام خۆ دەبێ ئەو وەزعە رۆژێك هەر بگۆڕێ. تۆ هێشتا زۆر منداڵی، بەشکم ئەو رۆژەش بەچاوی خۆت ببینی.

خۆم لە باوەشی دێنمە دەرێ و دەردپەڕم.

*

*

*

سەرەتاییم تەواو کردووە. بڕوانامەکەشم وەرگرتووە و لە سندوقەکەم ناوە. تۆرتۆریکای برادەریشم وەریگرتووە. لە ئیمتیحانێ وەڵامی هەموو پرسیارەکانمان دایەوە.

مامۆستاکەی خۆمان و مامۆستای گوندەکەی ئەوبەریش کە هاتبوون ئیمتیحانمان بکەن، ئافەرینیان پێ گوتین. تاجەگوڵێشیان لەسەر نابن. من کە چوومە مەلە، تاجەگوڵەکەی خۆمم بەدەم رووبارەکەدادا بۆ ئەوەی بیبا بەرەو دانووب.

مامۆستا تاجەگوڵێکی لەسەر فیلۆفتیای کچە قژڕەشە برۆکەوانەکەش نا. تاجەگوڵەکەی بەدەستی خۆی لەسەری نا. تاکەکەی کە لە گوڵی دەشتێ دروست کرابوو، لەسەر قژە پڕ و رەشەکەی کچە دانا و فیلۆفتیا لە خۆشیان وەك گوڵ پشکووت.

مامۆستا سەیرێکی ئێمەی کرد. چاوی پڕ بوون لە ئاو. بۆ ئەوەی نەزانین دڵی پڕ بووە، دەسرەکەی دەرهێنا و بە فڕمەفڕم لووتی خاوێن کردەوە و، ئەوجار چاویشی پێ وشك کردەوە.

ـ دەی باشە، رۆڵە ئازیزەکانم، ئێستا دەبێ ماڵاوایی بکەین. ئاژەڵ بن و هەوڵ بدەن ئەو تۆزە شتەی لێرە فێرم کردوون، لەبیرتان بمێنێ.

رۆیشتین و... دەرگای قوتابخانە داخران.

میکۆی کوڕەکەی بۆکۆری مەیخانەچی دەستی کرد بە هەڕوگیڤلێدان.

ـ من پاییزێ بۆ دواناوەندی دەچمە شاری.

میتیکائۆکییش دەسبەجێ بۆی ئەستاندەوە:

ـ منیش دەچمە شاری، دەچمە قوتابخانەیەکی زۆر گەورە.

ئەوجار هاتە لام و گوتی:

ـ ناتەوێ بێی و لە مەیخانەکەی ئێمەدا ببیە کرێکار و دەفرەکان بشۆیەوە و گسك لە وڵات بدەی؟ یان دیسان هەر دەتەوێ ئەدا و ئەتواران دەربێنی؟ جلەکانت خەریکن بە بەرتەوە دادەڕزێن و دیسان هەر خۆت بە حەوت مانگای زاو ناگۆڕییەوە.

گاڵتەی پێ دەکردم. بە مستێك توانیم ددانی لە زاریدا نەهێڵم. حەیف ئیەپۆرێمارین رفاندی.

ـ واز لەو نێرەمووکە بێنە داریە. با بڕوا ملی خۆی بشکێنێ.. حەیف نییە مل لە بەر ملی ئەوە دەنێی؟

ئاخەر بۆیە خۆم تێنەگەیاند.

ئەو رۆژە هاوینییە زۆر خۆش بوو. ئەو رۆژەی قوتابخانەم تەواو کرد. گەنم گەیبوو. گەنمی خەڵك.

تۆرتۆریکاش تاجەگوڵی وەرگرتبوو. قەدەر وا بوو باوکی رێك ئەو رۆژە بمرێ. تۆرتۆریکا تاجەگوڵەکەی لە تابووتەکە خست. لە نێوان دەستی مردووەکەدا، کە خرابوونە سەر سینگی.

خوالێخۆشبوو حەوت هەتیوی لەپاش خۆی بەجێ هێشتبوو. تۆرتۆریکا لە پڕێکدا بوو بە گەورەی ماڵەکەیان. دایکی ریوەڵە و لاوازە. تارماییەی سەرگەردانە، کە بەملاوئەولادا دەسووڕێتەوە.

تۆرتۆریکا نەگریا. راستەوڕێ هات بە شوێن مندا و گوتی:

ـ داریە، وەرە با بچین لەبەرخاتری باوکم زەنگی کلێساکە بزرینگێنینەوە.

پێکەوە لە برجی ناقووسی کلێساکە وەسەر کەوتین و، ئەو رۆژە تا ئێوارە و سبەینێکەشی لەبەر خاتری باوکی، زەنگولەکەی کلێسای گۆڕستان، کلێسای پیاوچاکە یەکچاوەکانمان زرینگاندەوە.

شتێکی سەخت و زبر لە چاوانی تۆرتۆریکادا بەدی دەکرا. شتێکی وەك بڕیارێکی تاڵ.

گوتم: ئەی تۆ چیت بەسەر دێ تۆرتۆریکا؟

گوتی: دەبێ کارێك بدۆزمەوە. بۆ ئەوەی دەستی دایکم بگرم.

ـ ئاخر چۆن؟

ـ با جارێ بزانم چۆن دەبێ.

تۆرتۆریکا خەپۆکە و بەخۆوەیە. دەموچاوی چوارگۆشە و دەستی زل و بەهێزن.

پێم دەڵێ: تۆ خوا دیوتە داریە؟ من و تۆ هەردووکمان باشترین قوتابی بووین. زۆر لەوانی دیکە پتر شتمان خوێندووەتەوە. هەر بە کتێبی وانەوە رانەوەستاین. بەو حاڵەش نە تۆ دەتوانی بچیتە دواناوەندی و نە منیش. هەر ئەو پرێ گەمژەیەی بە هەزار زەحمەت لە سەرەتاییەکەی دەرچوو. هەر کوڕەکانی قەشە توانیویانە بچنە بۆخارێست و لە قوتابخانەی گەورە و باشدا جێی خۆیان بکەنەوە. ئەو دوو تەمبەڵە دەستەوستانەی پۆلەکەمان... راستە گیۆرکێی براشت توانیوێتی خۆی بگەیەنێتە ئەوێ، بەڵام ئەی ئەویش هەر شانس و بەختەکەی نەبوو و ئەو خاتووماماۆستایە یارمەتیی نەدا؟ دەی بڵێ بزانم: وایە؟ هەقێتی وابێ؟

ـ نا پێم وانییە راست بێ.

ـ داریە نابێ ئێمە دەست لە دەرس و دەورەکەمان هەڵگرین. دەبێ پێش بکەوین. دەزانی؟

ـ ئاخر بۆ ئەوەیە بتوانین بچینە شاری و لە دواناوەندی بخوێنین، پارەمان پێویستە. بۆ ئەوەیە بتوانین لە خوێندنەکەمان بەردەوام بین، دنیایەکمان پارە پێویستە.

ـ نا، نابێ دەست هەڵگرین. پێکەوە هەرچۆنێکی بێ، دەبێ پارە پەیدا بکەین و کۆی بکەینەوە...

دیسان لەبەرخاتری بابم زەنگەکە لێ بدە. ئەو داماوە چ ژیانێکی تاڵی هەبوو...

خۆم بە پەتی زەنگەکەوە هەڵدەواسم و جۆلانەی پێ دەکەم. پەتەکە دەمهێنێ و دەمبا. زەنگەکە دەزرینگێتەوە. گردەکانی دەوراندەوری ئاوایی لەسەر خۆ زرینگەی بەشکۆی زەنگەکە دەدەنەوە. ئەو گردانەی باوکی تۆرتۆریکا هەتا مابوو لەو ژیانە پڕ لە کوێرەوەرییەیدا رۆژ نەبوو پێیان هەڵنەگەڕێ و لێیانەوە دانەگەڕێ.

یەکەم جار نییە من زەنگەکە دەزرینگێنمەوە. زۆربەی کاتەکان، بەتایبەتی وەختێك خزم و کەسێکی خۆمان ئەمری خوای بەجێ بێنێ، دێن و پێم دەڵێن:

ـ داریە، ئۆنچیکای ئامۆزات بەر رەحمەتی خوا کەوتووە.

یان: میمکە جۆنکیڤا ئەمری خوای بەجێ هێنا.

یان: خالۆ پارڤۆ عومری درێژی بۆ تۆ بەجێ هێشت... بچۆ زەنگەکە بزرینگێنەوە.

کلێسا ئەوەتا لەبەر دەرگای خۆمانە. برجی زەنگەکەش هەنگاوێك لەولای دەرگای کلێساکەوەیە. بە غاردان دەچم و لە برجەکە وەسەر دەکەوم و خۆم بە پەتەکەوە هەڵدەواسم. ئای، لە زرینگەی پڕ زایەڵەی ئەو زەنگە گەورەیە. گردەکان پێشی فڕینەکەی دەگرن و نەرم و لەسەرخۆ و گڕ دەیگێڕنەوە.

زەنگە بچووکەکە دەنگەکەی ناسکە. وەك دەنگی منداڵێك.

زرررن گ زررررن گ زررررنگ

زەنگەکە دەبێ لەسەرخۆ لێ بدرێ. لە بێدەنگییەدا کە هەمیشە بەدوای زرینگەی زەنگەکەدا دێ، هەوڵ دەدەم ئەو ئاوازە زۆر زۆر خەمبارە وەبیر خۆم بێنمەوە کە دەکرێ لەگەڵ زەنگەکە بیلێیەوە.

هەر مردووەی بە جۆرێك زەنگەکەی بۆ دەزرینگێنمەوە:

چەندی توانیم زەنگی پرسەی باوە ئەلکساندرناشتا، براگەورەکەی باوکمم لەسەرخۆ لێ دا. ئاخر مامە گیانم یەکپارچە نەرمونیانی و میهرەبانی بوو. هەر هەمووی خۆشەویستی بوو... زەنگەکەم کە لێ دەدا، دەتگوت ئەوە خۆی دەبینم پێڵاوی لە پێ کردووە و خەریکە بەرەو ئاسمان دەڕوا. لە پلیکانی هەورەکان ئەوەندە هێور و لەسەرخۆ سەر دەکەوت، کە دەتگوت دەزانێ ئەو دەروازانەی خوا بۆی کردووەتەوە و دەبێ پێیاندا رابرێ یەك و دووان نین، دەتگوت دەزانێ ئەو رێیەی گرتوویەتییە بەر، بێبڕانەوەیە.

لە پرسەی دینۆتزادا، تەنیا زەنگە بچووکەکەم زرینگاندەوە. ورد ورد و خێرا و گورج، رێك وەك هەنگاوەکانی خۆی کە بە رێیەدا دەڕۆیی. دەنگی زەنگەکە لە تریقانەوەیەکی کورت دەچوو، کە لە پڕ فرمێسك خنکاندبێتی.

بازارکاش مرد. بازارکا ژنی یەکێك لە مامە گەورەکانم بوو، کە جیرانمان بوو. چاوی بە دایکم هەڵنەدەهات و هەر لە یەکەم رۆژەوە کە دایکم پێی نابووە ماڵی باوکمەوە، بەردەوام لە بیانووەك گەڕاوە بۆ ئەوەی بەربینگی پێ بگرێ. پاش ئەوەی ژەهری خۆی هەڵڕشت، پاش ئەوەی و تا مرد رق و قینی خۆی بە دایکم رشت، ئیدی هیچی تێدا نەهێشتەوە ئینجا شەوی پێش مردنەکەی لەگەڵی ئاشت بۆوە... زۆر لەمێژ بوو بەجێوبان کەوتبوو. وا لەڕ و بنێس ببوو، رێوی کلکی لێدابایە دەکەوت. مەرگی بە ئاوات دەخواست و دەستی نەدەگەیشتە داوێنی ئیزراییل. دیڤاییکای جادووگەر (کە چونکە قەول بوو جلوبەرگەکانی بازارکا بشوا و بۆ نێو تابووت بیڕازێنێتەوە، خواخوای بوو بمرێ)، رۆژێکیان پێی گوتبوو:

ـ تۆ وا سووك و ئاسان گیان نادەی، چونکە لەگەڵ ئەو ژنانە ئاشت نەبوویەتەوە کە لەوەتەی هەی دەیانبوغزێنی و تڕۆیان دەکەی و قەڵسەت لێ گێڕاون.

زستان بوو. شەوانە کە بازارکا نەیدەتوانی بۆ چرکەیەکیش چاوی لێك بنێ، ئیتر پێی وابوو رۆژ نابێتەوە. لەو ژوورەدا کە بازارکا چەندی چەند رۆژان بە گیانەڵاوە بوو و گیانی دەرنەدەچوو، مامە ڤۆیکۆ و ڤاسیلێی کوڕی و ژنومنداڵەکەشی هەر لەوێدا نوستبوون. ئەگەرچی واباشترە بڵێین دەبوو لەوێدا بخەون، بەڵام ئەوانیش نەیاندەتوانی چاو لێك بنێن.

ئامۆژنە بازارکا لە دووی ئەو ژنە دراوسێیانەی نارد کە نێوانی لەگەڵیان خۆش نەبوو. لەگەڵیان ئاشت بۆوە. چونکە چاری نەبوو، ئاخر کەس ناردی دایکیشمیان هێنایە ژوور سەری.

گوتی: گەردنم ئازا کە ماریا.

ـ گەردنت خۆش و ئازا بێ.

دەستیان لە ئەستۆی یەکتر کرد.

دایکم هاتەوە ماڵێ و گوتی:

ـ هەر بەراستی ئێمە چ جۆرە ئاژەڵێکین. لەسەر خت و خۆڕایی یەکتر ترۆ دەکەین، رق لە یەك هەڵدەگرین و ژیان لە یەکتر دەکەینە ژەهری مار. جا رێك وەختێکیش دەزانین سەهوومان کردووە، کە ئیتر زۆر درەنگ بووە.

بەڵام ئامۆژنە بازارکا هەر بە گیانەڵاوە بوو و نەشمرد، هەتا منی بیر کەوتەوە. وەی خوایە ئەو ژنە چەندەی قسەی ساردوسووك بە من گوتبوو و جنێوی بە من دابوو. چەند جاران لە کۆڵانێ سەری لەدوو نابووم. چەند جاران بە شووڵکان پشتمی شین و مۆر کردبۆوە.

ـ داریەم بۆ بێنن. دەبێ ئەویش گەردنم ئازا بکا. هەر ئەو ماوە و هێشتا گەردن ئازاییم لێ نەخواستووە.

ـ ئێستا دەبێ نوستبێ. بەیانی دەیهێنینە لات.

ـ نا، نا، هەر ئێستا دەبێ بانگی بکەن.

هاتن بەخەبەریان هێنام. جلوبەرگیان لەبەر کردم و بردیانمە ماڵی مامە ڤۆنیکۆ. ماڵەکەی ئەگەرچی دیوارمان بەین بوو، بەڵام تا ئەو دەمە پێم تێ نەنابوو.

ئامۆژنە بازارکا، وەك بەهێ زەرد هەڵگەڕابوو، چاوی ترووسکاییان لێ بڕابوو و لەسەر تەختەکە خزیبووە بن لێفەیەکەوە. منداڵەکانی ڤاسیلێی ئامۆزام کە لەسەر عەرزەکە نوستبوون، لە چاویانڕا دیار بوو داپلۆسێنراون و هێندە ماندوو بوون، لووتت گرتبان گیانیان دەردەچوو.

ئەو سەتڵەی بۆ ئامۆژنمیان لە بن تەختەکە دانابوو، بۆنی هار و ماری لێ دەهات.

ـ گەردنم ئازاکە داریە. لێم خۆش بە زۆرم جنێو داوێی. نەفرەتم لێ کردووی و لێم داوی، گەردنم ئازا بکە بە قوربان...

دەستیم ماچ کرد و دامە قوڵپی گریان.

ـ ئامۆژن.. ئامۆژن...

نێوچاوانم بە سینگییەوە نا، کە ئیتر بە زەحمەت خۆی لەبەر هەناسەکێشانەکەی رادەگرت. دەستی بەسەرمدا هێنا. دەستە سڕ و ساردەکەی بە لامل و روومەتیمدا هێنا.

کەڕەی بەیانی، لەگەڵ قووقەی کەڵەشێر هەناسەی وەبەر نەهاتەوە و ئارامی گرت.

ـ ئامۆژنت مرد داریە، بچۆ زەنگەکە بزرینگێنەوە.

رووناکایی رۆژ ئاسەواری شەوی سڕییەوە.

زەنگی پرسەی ئامۆژنم زرم زرم و پەیتاپەیتا لێ دا رێك وەك خۆی کە بەسەر پەرژینەکەی نێوان ماڵی خۆمان و خۆیاندا بارانی تووك و نەفرەت و جنێوی بەسەرمدا دەباراند و دەیگوت: ـ کوڕە یاخوا بەوچاوانەی خۆم بتبینم قاچت وەك دار وشك بن و ئەو دوو چاوە سیسارکەخواردووەت وایان لێ بێ بەرپێیانت نەبینن.

سیسارکەخواردووەکانم ئێستاش هەر دەبینن، ئەوانم ماون. هەر نەبێ هێشتا ماومن. بەڵام یەکێك لە لاقەکانم لەدەست چوو. ئەوەیان ئەوەتا: پێی چەپەم... بێهەست و خوست و بێگیان ئەوە بە ئەژنۆمەوە نووساوە.

زرررین گ گ گ زری ن گ گ ... گردەکانی بن سەرپۆشە سپییەکەی بەفر دەنگی زەنگەکە دەگێڕنەوە.

لەوەتەی نقوستان کەوتوومەوە، هەر یەکێك لەو ئاوەدانییە بمرێ، ئەوە بانگی من دەکەن:

ـ داریە، لە ماڵی؟

ـ بەڵێ....

ـ ماڵی بەلیتۆ کە لەوبەری چۆمەکەن، منداڵێکیان مردووە بچۆ زەنگەکە لێ بدە.

لە خوای بەزیاد بێ مردووە، دەچم زەنگ لێ دەدەم. خۆ کاری دیکەم پێ ناکرێ. ئەوە هەر نەبێ دراوێکی خڕی نێوکونی پێوەیە. سکەیەکی دە سەنتیمی وەردەگرم. دە مردوو دەکاتە یەك "لۆ" و پەنجا سەنتیم. چونکە جگە لە هەقی زەنگلێدانەکە، لە کاتی ناشتنەکەشیدا بە پێی نەریت دەسرۆکەیەکی سپیم دەدەنێ، کە سکەیەکی "یەك شایی"یان لە لکەکەیەوە پێچاوە. بە چوار دەسماڵی ئاوا دایکم بندەرپێیەکی زۆر باشی بۆ دووریوم. جا زۆر زۆر خۆشە کە بنیادەم لەبنەوە لەپێی دەکا. هەم شەلوارەکە کەمتر لاق و لەتەرت دەخورێنێ و هەمیش لە بنەوە گەرمترە.

ـ باشە بۆچی هەمووان بۆ زەنگلێدانەکە دێن لە دووی من؟

ـ بەزەییان پێتدا دێ. تۆ بە مستەحەق دەزانن، چونکە هیچ کارێکت پێ ناکرێ. هەر بۆیە دەیانەوێ یارمەتییەکت بدەن بۆ ئەوەی دینارێکت وەگیر بکەوێ... ئەی چی؟ دەتەوێ بتکەنە پاڵە و دروێنەوان؟ ئەوە شەرح و لێکدانەوەی ریتزای خوشکمە.

گەواڵە هەور سەر ئاواییەکەمانی رەش داگیرٍاوە. شنەیەك هەڵی کردووە بەڵام دەرەقەتیان نایە رایانماڵێ.

ـ داریە. دیسان لەبەر خاتری باوکم زەنگەکە لێ بدە.

زەنگە گەورەکە دەزرینگێنمەوە. تۆرتۆریکا خۆی زەنگە چکۆڵەکە لێ دەدا.

لە سەر برجی زەنگەکەوە کونێك لە زگی هەورەکان دەبێ. هەور وردە وردە لادەچن و هەتاو ئاواییەکە لە تیشك و رووناکییەکەیدا نوقم دەکا.

تۆرتۆریکا دەڵێ:

ـ خۆزگە سبەینێ سامالٚ بێ و بکرێ باوکم بە جوانی بنێژین و هەر نەبێ جارێکی دیکە هەتاوەکە دەموچاوی رووناك و گەرم بکاتەوە... ئاخر باوکە داماوەکەم ئیتر دەبێ لە تاریکیدا بنوێ.

*

*

*

دیتزای پوورزاشم کە لە سێکارا دەژی، ئاقیبەت بەخێر بووە و بۆخۆی مێردێکی باشی دۆزیوەتەوە. پوورە ئۆتزۆپار لێی گێرٍاوینەتەوە کە دەبێ ورد و درشتمان لە شاییەکەیدا بەشدار بین.

ـ داریە، سواری بارگینەکە بە و بچۆ سێکارا و پێیان بڵێ دڵیان نەیەشێ: خەم و پەژارەمان ئەوەندە زۆرە تاقەتی شایی و زەماوەندمان نییە. ئیشەڵا بەخێر و خۆشی تەواو دەبێ و پەشیمانی ناکێشن و خوا لێیان مبارەك بکا.

بنیادەم بۆ ئەوەی بچێتە زەماوەندێك لە سێ ئاوایی ئەولاترەوە، هەر نەبێ دەبێ شتێکی هەبێ لەبەری بکا. خۆ ئەگەر راستیت دەوێ لەو ماڵەی ئێمەدا تیتۆڵێکت دەست ناکەوێ، کەس جلوبەرگێکی وای نییە رووی مەجلیسانی بێ. کە دایکم شڕ و شاڵاتە پینەکراوەکەی بەرمان دەشوا،

تا وشك دەبنەوە ناچارین رووت و قووت لە ژوورێدا بسووڕێینەوە. ئەگەر لەودەمانەدا غەریبەیەك بێتە ماڵمان، دایكم و بابم لە راڕەوەكەی لای كوانووەكەوە لەقسەی دەگرن و ئێمەش هەموو خۆمان لە پشت دەرگا یان ژوورەكەدا دەشارینەوە.

ئیۆنی برام زۆری حەز لێ بوو بچێتە سەر شاییەكە. بەڵام شۆئاڤا، ئەو ئاغایەی ئیۆن بە ناچاری ببووە رەنجبەری، هەر تارماییەكی لێ هێشتووەتەوە: هەر ئێسك و پێستی ماوە. براكەم درێژ درێژ بووەتەوە و چزیلكی پێوە نەماوە. پێستی بە ئێسقانییەوە نووساوە. ئێسكی روومەتی دەرپەڕیوە و ملی وەك داوەدەزووی لێ هاتووەتەوە. قورتمەی چیی نەماوە پێستی سەر گەرووی بدڕێ و بێتە دەر.

دوو سێ حەفتە جارێك، تاوێك دێتەوە و دەڵێ:

ـ ئەو شۆئاڤا سەگبابە كوشتوومی. ئیدی تاقەتم نەماوە و خەریكە دەگاتە ئێسقانم. هەر بینا دیتت ئەم چەقۆیەم لە زگی وەردا.

باوكم دەڵێ:

ـ چەقۆكەت بۆ وەختێكی دیكە هەڵگرە رۆڵە. هێشتا زووە. خەمت نەبێ ئاخری ئەو رۆژە دەگاتێ كە بەراستی بەكارت بێ. بەڵام بۆ ئەوەی لە زگی زۆر كەسانی رۆ بكەی، نەك ئیی یەك كەس.

ریتزای خوشكیشم زۆری پێ خۆشە بچێتە زەماوەندەكە. پێم وایە كراسی نییە و قۆندەرەكانیشی دڕاون. دایكم هەر هیچ باسیشی مەكە. باوكیشم لە هەمووان خراپتر.

ـ بە پوورت بڵێ دڵی لێمان نەیەشێ. زویر نەبێ.

بارگینەكە وەك بێشكە رامدەژێنێ. هیچ پەلەم نییە.

تەپ، تەپ، تەپ... سمی بێ ناڵی بارگینەكە نەرم نەرم عەرزەكە دەگرێ.

جارێكیان باوە بۆردۆلێئا پێی گوتبووم:

ـ ڕۆڵە گیان، لە سەدان ساڵ لەمەوبەرەوە بنیادەم لەسەر ئەم گۆی زەوییە ژیاون. دادێیەوە مستێك خۆڵ هەڵدەگری و لە لەپی دەستتدا وردی دەکەی، ئەوە خۆڵی ئەو کەسانەیە کە پێش ئێمە لەسەر ئەم زەوییە ژیاون... بنیادەم دەڕۆن، ئەوەی دەمێنێتەوە هەر خاکە. هەر خاکە قەت قەت نامرێ.

تەپ... تەپ... تەپ... تەپ...

چارەوێ جاروبارە رادەوەستێ و لە دەم ڕێیەکە قەپاڵێك گیا دەخوا.

ـ هەی ها ا ا ا.

لە ڕووداوەکانی ١٩٠٧ـدا، پوورە ئۆتزۆپاریش، لە عەمبارێکی دانوبدا زیندانی کرا. ئەویش بێبەش نەبوو لەو ئەشکەنجە و ئازارانەی شۆڕشگێڕەکان تووشی بوون و، سمت و رانی لە بن قەمچیدا شین و مۆر بوونەوە. ئازایانە خۆی لەبەر ئەشکەنجەکان ڕاگرت. هێشتا شوێنەواری ئەشکەنجەی بەسەر لەشییەوە ماوە. ئەو شتەی پوورە گیانم هەرگیز لەبیری ناکا.

دیتزای بردووەتە لای دکتۆر و درزەکەی لێویان بۆ دووریوەتەوە. ئێستا ئیتر دیتزا خەندەلێو نییە. تەنیا چەند هێڵێکی سپیی باریکی لێ ماوە. لەگەڵ لاوێکی خەڵکی سێکارا کەهاتووە و لە ماڵی پوورم گیرساوەتەوە، زەماوەندی کردووە.

ـ دەی ڕۆڵە ئێمە پیاوێکمان دەویست سێبەری بەسەرمانەوە بێ. خوای گەورە کوڕێکی پێ ڕەوا نەدیم. کە پەنتیلیەی جوانەمەرگم بیر دێتەوە، ئاگرم لە جەرگی بەر دەبێ.

دیتزا هەڵدەداتێ:

ـ واز بێنە دایە، چییە، وەخت نەماوە ئەمڕۆ نەبێ باسی ئەوە بکەی؟

ـ بریا سەد بریا توانیبام بیر لەو شتانە نەکەمەوە. جاری وایە لەبیرم نییە، بەڵام لە پڕێکدا هەموو شتێکم دێتەوە بەر چاوی. دەی باشە...

ـ پوورە ئۆتزۆپار! باوکم ناردوومی پێتان بڵێم ناتوانین بێینە سەر شاییەکە.

ـ بۆ خۆشم هەر پێم وابوو. گرفتارییەکانتان یەك و دووان نین. بەڵام ئەی رۆڵە تۆ چتە؟ بۆچی وا وشك و رەق هەڵاتووی؟ هیچ لە منداڵ ناچی.

دیتزا دیسان هەڵدەداتێ و دەڵێ:

ـ دەشەلێ دایە. کە لە بارگینەکە دابەزی و بەرەو ژووریّ هات دیتم.

لاقم پێشانی پوورە گیان دەدەم. ماوەیەك هەر وا دەستی پێدا دێنێ و ئاخری دەڵێ:

ـ وەیش رۆڵە گیان، ئەو دەردە بێدەرمانە. ژیانت زۆر تاڵ دەبێ. دەبێ مشووری کارێك بخۆی فێری شتێك بی.

ـ بیرم لێ کردووەتەوە پووریّ گیان.

لە گەڕانەوەدا لا دەدەمە کارلۆمان چاوێکم بە داپیرەم بکەوێ.

ئێستا ئیتر دەمێکە باپیرەم بە ریشە درێژەکەیەوە لە بن بارستایی دنیایەك گڵدا بۆ تا هەتایە خەوتووە. کۆنە کتێبەکانی بە ریز لە بەر پەنجەرەکە ماونەتەوە. ئیتر کەس هەڵیان ناداتەوە. خاڵە دۆمیتراکێ مێشکی ئەوەی نەبوو فێری خوێندنەوە و نووسین بێ.

بە بارگینەوە دەچمە حەوشە. داپیرەم لەبەر دەرگا قوت دەبێتەوە و، لەخۆباییانە خۆی دەداتە سەر گۆچانەکەی. لەچکێکی شینی لەسەر کردووە، کراسە تیفتیفەدراوەکە وەك کلووی بەفر سپییە و، قاپقاپەکانی خاوێن و بۆیاغکراون.

لە ترسی ئەوەی نەکا بارگینەکە گوڵ و گیای باخچەکەی بخوا، یەك بەخۆی هەرا دەکا:

ـ ئەو بارگینە لە حەوشە بەرە دەرێ دەی.

حەیوانەکە دەبەمە دەرێ و دەمەوێ هەوسارەکەی لە پەرژینەکەی پێش حەوشەی دەبەستمەوە. دیسان دەنەڕێنێ:

ـ نا، لە پەرژینەکەی مەبەستەوە. ئەگەر سینگەکەی هەڵکەنێ باوکە پاڵەوانەکەت دێ و بۆم دەچەقێنێتەوە؟ بیبە لە چیمەنەکەدا لە دار ئەقاقیایەکی ببەستەوە.

ناچار بە قسەی دەکەم.

باغەکەی داپیرە دەروازەی بەهەشتە. دار بەریان گرتووە و لکیان داهێشتووەتە عەرزی. قەیسی گیوە. دار ئەوەندەیان پێوە بووە چڵووکیان لە عەرزی دەخشێ. ئەو جۆگەیەی لە گردەکەوە دێتە خوارێ، وەك زیو بە نێو قەوزەکاندا دەخوشێ و باخچەکەی کردووەتە دووبەش.

ـ دەی باشە، فەرموو، شل و شەوێق. ئەوە لەبەر میوە سەر و سەکتت پەیدا بووە، ها؟ حەزت چووەتە میوە وا سواری بارگینت بووی و لە دڵی خۆتدا گوتووتە: "با بچم سەرێکی داپیرەم بدەم و تێر زگی خۆشم بخۆم." بەسەری بابت. خوا ئاگادار چێشکەی ناکەی. بەو بابە بێغیرەتەت بڵێ با چوار داری بەری لە حەوشەکەتاندا بچەقێنێ.

ـ بە چاوان پێی دەڵێم داپیرە.

کوێرەڕێیەکەی نێو ڕەزەکەی بانێسائاغا گۆجە لە گردەکەوە هەتا وێستگەی ئاسنەڕێیەکە دەچێ. دیواری ڕەزەکەی زۆر بەرزە. هەر باڵندە دەتوانێ بەسەریدا بفڕێ.

ڕەزەکەش شەو و ڕۆژ پاسەوانێکی ئەلبانیایی لێیە، کە دەڵێی قەت خەوی ناچێتە چاوی و ڕۆژ تا ئێوارێ بە جووت لوولەکە بەرازکوژەکەی تێیدا دەگەڕێ. کابرای ئەلبانیایی ناوی مێدینە. جەمەدانییەکی سوور لەسەری دەبەستێ، کە ریشۆڵەکانی دێنە بنگوێی. خەڵکی ئاوایی زۆر سادە ناویان ناوە: "کابرا ترکە."

سمایل یەکێکە لە برادەرەکانی بابم. کە تووشی یەکتر دەبن، ئەگەر کاریان نەبێ سەر بە سەری یەکەوە دەنێن.

کابراترکە، ساڵ نا ساڵێك لە چۆمی دانووب دەپەڕێتەوە و دەچێتەوە چیاکانی زێدەکەی خۆی بۆ لای ژنەکەی و کوڕەکانی و چوار کچە تەنوورە لەپێیەکەی. زستانان لەوێ دەبێ و کە بەهار داهات دێتەوە سەر ڕەزەکەی بانێئاسا. چیی پارەی لەو دوو ساڵەدا کۆی کردووەتەوە دەیباتەوە و دەیداتە ژن و منداڵەکەی بۆ ئەوەی سفرەیان ڕەنگین بێ و خۆش بژین.

ـ سلاو کا سمایل.

ـ سلاو رۆڵە... ئەین ئەوە تو کور تۆ دۆ ر*؟

ـ بەڵێ من کوڕی تۆدۆرم.

ـ ئەها نەخۆش کوڕەکە؟

ـ بەڵێ کوڕە نەخۆشەکەی.

ـ راوەستان، راوەستان، شتێك ئەمن بدەم تو.

لەو دەرگا نهێنییەوە کە هەر خۆی دەیزانێ دەچێتە نێو ڕەزەکە و تاوێکی پێ دەچێ و بە باوەشێك ترێوە دێتەوە.

ـ ترێ گەیی زۆر زوو. زۆر شیرین. تۆ وەرگر. بخۆ تۆ. سمایل خۆی منداڵ چوار هەیە. هەموو کچ. کچی سمایل ترێ نەبوو. نەخواردن ترێ. من ماڵ زۆر زۆر فەقیر. بەر هەیە تەنیا.

ـ دەستت خۆش بێ کا سمایل.

ـ تۆ نەخۆش. زۆر سلاو بۆ بابت هەیە ئەمن. تۆ دیسان وەرە سمایل.

جامانەکەی بەرەو پشتەسەری دەبا و لە دەم کوێرە ڕێیەکە رادەوەستێ و چاوی لێمە تا دوور دەکەومەوە.

❊

---

* نیشانەی ئەوەیە کا سمایل نازانێ بە زمانی ئەوان جوان قسە بکا.

*

*

تۆریکا بووەتە گاوانی قەشە بۆلبۆك. لە بەر ماڵماندا رادەبرێ. ئەسپەکەی قەشەی لە بندایە. شوولکێکی پێیە و مانگا و گایەکانی قەشە دەبا بیانلەوەڕێنێ.

قەشەش نانەزگەکی دەداتێ و سێ دراوی بیست "لی"ییشی وەك بەراتی ساڵانە دەداتێ. پێم وایە دایکی تۆرتۆرکیا هەر زوو پارەکەی وەرگرتووە و ئاردی گەنمەشامیی پێ کڕیوە.

ـ ئەی تۆ داریە؟ دەتەوێ لای کێ کار بکەی؟

ـ هێشتا نازانم.

نامەیەکم بۆ گیۆرکێی برام نووسیوە کە لە گوندێك بووەتە پێشنوێژ. زۆر چاوەڕێی وەڵامەکەیم نەکرد:

......................

ژنەکەم تا ئێستا دوو منداڵی بۆ خستوومەوە و سێیەمیش بەڕێوەیە. ژیانم هەموو کوێرەوەرییە. هیچ یارمەتییەکم لێ هەڵناوەرێ. خۆت دەبێ بەڕەت لە قوڕاوێ دەربێنی. نسحەتم لەگوێ بگرە و لای پینەچی یان خەیات یان دەباغێك ببە شاگرد بۆ ئەوەی فێری کارێك بی. دەرسخوێندن لەم سەردەمەدا بایی پووشێکە. من ئەو هەمووە تاسەبارانە خوێندم و خۆم کوشت، ئاخرییەکەی وام لێ هات بە حاڵی سەگ و بە لەقە لەق نانی زگی خۆم پەیدا بکەم. خەڵکی ئەم دەڤەرەی من، هەژاری و نەگبەتییان لێ دەبارێ."

*

نامەکە دەخوێنمەوە و ئامۆژگارییەکەی کاکم دەکەمە ئاڵقەی گوێم.

پرسێك بە بابم دەکەم. دەڵێم تۆ دەڵێی چی؟ لەجێیەك دامەزرێنە با کارێك بکەم.

باوکم لەگەڵم هات و چووینە لای نیتزۆی ئاسنگەر. تکای لێ کرد بمکاتە شاگرد و بەردەستی خۆی و فێرم بکا چەکوچ هەڵگرم و سبەی رۆژێ پارووە نانێك پەیدا بکەم:

ـ خۆ لە کارگەدا منداڵ ئەوەندەی پێویست بە قاچوقولی ساغ نییە. جگە لەوە هیچ کوێی دیکەی نقوستان نییە. بەڵێنت دەدەمێ باش کار دەدا و لێی رازی بی.

ئاسنگەر بۆگەنی ئەلکۆلی لە زاری دەهات. بە تووڕەییەوە تێمان خوڕی:

ـ یانی پێت وایە؟ پێت وایە من دەتوانم ئەو نقوستانەت بۆ بکەمە ئاسنگەر؟ کاری ئاوا پیاوی گورجوگۆڵی دەوێ. کلکی سەگ بۆ هێڵەگ نابێ.

مارگارێتای کچی ئاسنگەرە لە تەنیشت باوکییەوە راوەستابوو. گۆرەوی و پێڵاو لە پێ و سەروقژی رێك و پۆشتەوپەرداخ و قردێلەیەکی لە قژی دابوو. منیش بە جلوبەرگی پینەکراوەوە و زەردهەڵگەڕاو و پێخواس و بن نینۆك پڕ لە چڵك و قاچی کەمرەگرتوو و پەنجەی لاقە سڕەکەم زامار و خوێناوی.

چووینە لای پینەچییەکەی ئاوایی.

پینەچی بەردەوام خەریکی رۆژنامەخوێندنەوە بوو. کۆمەڵێك کتێبیشی لا بوو. نیکۆلای پۆلیس هەر چاوی بەسەرییەوە بوو. دەینارد لەوسەری ئاواییەوە دەیانهێنایە پۆلیسخانە و تێرێکیان قسەی ساردوسووك پێ دەگوت و جنێویان دەدایە و دەیگوت:

ـ ئەوە هەر دەمویست رێك لەودەمەدا کە پیلان دەگێڕی و دەتەوێ خەڵك لە بەرپرسانی بەرزی وڵات هان بدەی، بتگرم و بە مست و شەقان پشتت لە زگت نەرمتر بکەم.

کاکی پۆلیس تەنانەت سەرخۆشیش بوایە، لێی تێك نەدەچوو کە قەمچییەکەی لە سەرودەموچاوی بدا. پینەچییەکە خەڵکی گوندەکەی ئێمە نەبوو لە شارەوە هاتبوو و کۆشکەڵەیەکی کردبۆوە و سەربەرزانە کاری خۆی دەکرد، هەڵبەت ئەگەر کارێك هەبوایە.

به باوکمی دەگوت: زۆرم پێ خۆش بوو کوڕەکەت لای خۆم ڕاگرم و فێرە کاریشی بکەم، بەڵام دڵم نایە. حەیفە. من ئیتر پینەچییەکی باش نیم. سەردەمانێك بووم، بەڵام ئیتر تەواو لە بیرم چووەتەوە. لێرە هەر کارێك هەڵکەوێ دەیکەم. کوڕێژگەکەی تۆ هیچی وام لێ فێر نابێ بەکاری بێ. وا باشترە بیبەیە شاری و لەلای پینەچییەکی دەسڕەنگینی دابنێی.

بابم سواری عارەبانەی کردم و بردمییە شاری. ڕێیەکە شارەزا بووم، چونکە زۆر جاران لەگەڵی پێیدا ڕۆیبووم. بە دەوری گردەکەدا وەردەسووڕێتەوە و دارستانەکەی ئادانکاتا کە ئێستا ئیتر دارستان نەماوە، بەجێ دێڵێ و دوای هەمووانیش بە بن دیواری کۆنەقەڵایەکدا تێدەپەڕێ. لە دەروازەی ڕۆشیدۆدیێوە برج و شوورا کۆنەکانی شار دەبینرێن. هەر جارێکی دەچوومە شاری لەوێ رادەوەستام و دەمڕوانی. لە گڵی خەندەقەکەوە دادەگەڕام و لە خەندەقەکە دەپەڕیمەوە و دەچوومە ژووری. بە نووکی تێلاکەم عەرزەکەم دەپشکنی و هەموو جارێ لەتە نێزەیەك، لەتی چەکی قەدیمی و قۆپچە و شتی جۆراوجۆرم دەدۆزییەوە. ئەو شوێنە شەڕی زۆر گەورەی لێ کرابوو و، دەمە گاسنی وەرزێران ئێستاش ئێسك و پرووسکی شەڕکەرەکانی کۆن دەهاڕێ.

ئەو شەوە دایکم و بابم لەسەر ئەو سندووقەی کە کردبوومانە کوشنی عارەبانەکە، خەونووچکە دەیبردنەوە. لە دواوەش، من کە هەتا بن هەنگڵم لە کا و کلۆش ڕۆچووبووم، لە نێو جلەشڕەکانمدا لە سەرمان هەڵدەلەرزیم. مانگ تریفەیەکی لێڵی دەپژاند. جادەکە قەرەباڵغ بوو. مسافری دیکەش کاروان کاروان بەرەو شار دەڕۆیشتن. قسە و دەنگەدەنگ لێرە و لەوێ، گۆرانی، فیکەلێدان بە هەوای گۆرانی دەبیسران. شەوانە دەنگی خەڵك زۆر روونتر دەبیسرێ. تەنانەت کام دەنگ لە هەمووان دوورترە. لەوانەشە لەبەر ئەوە بێ کە شەوانە هەوا فێنك و ئارامتر و پاکترە.

مانگ دەگەیشتە حەوێقی ئاسمانێ و ئەستێرە کاڵ دەبوونەوە. مانگ تەواو بوو و هیچ پەڵە هەورێك دیار نەبوو. لە پڕ مانگ خەرمانەی دا. پەڵەیەك وردە وردە پەرەی گرت و مانگەشەوەکەی تار کرد.

ـ باوکە، کێ قەپاڵ لە مانگ دەگرێ؟

باوکم ئاوڕی داوە و دەسبەجێ ئەسپەکانی ڕاگرت.

ـ ئەی ماڵی وێرانم، ڤارکۆلاك* خەریکە مانگەکە دەخوا.

دایکم سەیری مانگەکە دەکا و هەردووکیان دەبینم خاچ لە سەر سینگیان دەکێشن. وەها تۆقیون، ناتوانن خاچەکەش بە ڕاستی و جوانی بکێشن. بێدەنگییەك باڵی بەسەر دەشتەکەدا کێشاوە. تاوێك لەمەوبەر جیڕەجیڕی عارەبانە و هەرا و سیڕەی لێکخشانی چێوەکان دەهات. لە چاوترووکانێکدا، یەکدابەدوو...

باوکم خۆی فڕێ دەداتە خوارێ و عارەبانەکە دەکێشێتە دەم جادەکە.

ـ تۆ دابەزە داریە.

ـ دادەبەزم.

باوکم باوەشێك کا لە عارەبانەکە هەڵدەگرێ. بەردئەستێ و پووشوو لێك دەدا و ئاگرەکە بە کایەکەوە دەنێ. لە پڕدا بڵێسەیەکی گەورە نێزەی بڵێسەکانی بە تاریکییەوە دەنێ. لە پێش و دواوە، بە درێژایی جادەکە ئاگری دیکەش دەبینین گڕەیان دێ. ئەسپەکانی ئێمە زەنگوڵەیان بە ملەوە نییە. ئەوەش شتێکی وا نییە. هەر باشە ئەسپی خەڵك پێوەیانە. شەوەکە، لە پڕ لێوڕێژ دەبێ لە دەنگی زەنگ و زەنگوڵە. ڕێبوار ئەسپیان لە عارەبانە کردووەتەوەو ئاگریان کردووەتەوە. ئاوازێکی دۆزەخیی نارێك دەچڕن.

بڵێسە جار بە جار لە تاریکییەکەدا بەرزتر دەبنەوە. دەنگەکانیش. بەڵام ڤارکۆلاك هەر گوێشی بەو شتانە ناچێ. جار بە جار گۆشتە بزرکاوەکەی مانگ پتر دەخاتە دەمییەوە. ئیتر نیوەی قووت داوە.

* ڤارکۆلاك: ناوی دێوەزمەیەکەکە لە ئەفسانەکانی ڕۆمانیادا، کە لەکاتی مانگیراندا مانگەکە دەخوا. ئەو مانگە لە کەلەشی یەکێك لە بنیادەمەکاندا دەژی.

ئێستا لە چارەگێکی پتر لێ نەماوەتەوە و ئەمجارە لە چارەگیش کەمتر. ئێستا تەنیا کەوانێکی وەك داسێکی زەردی لێ ماوەتەوە کە بە ئاسمانەوە هەڵواسراوە.

خەڵك لە تەنیشت عارەبانەکانیان هەڵدەلەرزن. هەڵبەت لەسەرمان نییە. ئاورەکەشیان بۆ خۆگەرمکردنەوە نەکردووەتەوە. ئیتر مانگ بڕستی لێ بڕاوە و خەڵکەکەش پتر دەلەرزن. ئەو شتانەم زۆر پێ سەیرن. بەڵام من تۆزێکیش چییە نالەرزم. ئەو کتێبانەی خوێندوومنەوە تۆزێك نهێنییەکانی گەردوونیان بۆ روون کردوومەوە. دەزانم مەسەلەکە چییە. هەوڵ دەدەم بۆ دایکیشمی بوون بکەمەوە:

ـ کچێ دایە ڤارکۆلاك قسەی قۆڕە.

ـ لەوانەشە داریە.

باوکم زار دەکاتەوە و دەڵێ:

ـ دەی خۆ لەوانەیە. بەڵام ئەی کێیە ئاوا مانگەکە دەخوا؟

دەبینم نیگەرانن. نیگەرانییەکەیان ئەودەمە دەڕەوێتەوە کە داوە بەرماوەکەی مانگ دەست دەکاتەوە بە گەورەبوونەوە.

باوکم دەڵێ:

ـ ئاخرییەکەی ڤارکۆلاك ترسی ڕێنیشت و مانگەکەی بەر دا. چیی نەماوە رۆژ بێتەوە. ڤارکۆلاك ئێستا ترسی هەیە تا زووە خۆی بگەیەنێتەوە ئەو کەلەشەی تێیدا دەژی.

ئەسپەکە لە عارەبانە دەکا و دیسان وەڕێ دەکەوینەوە. باوکم خەوەکەی زڕاوە و، بیرەوەریی یەکێك لە خزمەکانمان، یەکێك لە مامەکانم بۆ دایکم دەگێڕێتەوە کە ڤارکۆلاك بوو و دەمێکە مردووە:

ـ ئەودەم من هێشتا منداڵۆچکەیەك بووم و ئێرە دارستانێکی زۆر گەورە بوو، کە هێندێك داریان لێ بڕیبوو و مەیدانۆکەیەکی لێ دروست ببوو. گیایەکی لێ شین بوو باڵای بنیادەمێك هەڵدەستا. هێشتا گاسنیان لەبەر سینگی گردەکان نەنابوو. من و یەکێك لە ئامۆزاکانی باوکم کە ناوی بادۆیی گابۆنیا

بوو، مەڕەکانی ئێلێمان دەبردە لەوەڕ. بادۆیی ئەو دەمیش پیر بوو. هەموو چێودارەکانی ئائێلێ دەیانزانی بادۆیی ڤارکۆلاکە. خۆیشی دەیزانی... مانگ، لە پازدە بوو، هەڵات و زەویی رووناك داگیرا. ئەودەم شەیتان کە لە جەستەی پیرەپیاوەدا بوو، بەربینگی پێ دەگرت. بۆخۆیشی دەیزانی. هەڵدەستا و دەستی دەدایە تێلاکەی و لە بن دەوەنێك خۆی دەشاردەوە و خەوی لێ دەکەوت. ئەویش چ خەوێك. ئەو دەمە ڤارکۆلاك لە گیانی دەهاتە دەرێ و کۆڵەکەی دەکرد بەرەو ئاسمان بۆ ئەوەی مانگ بخوا... یەك دوو سەعاتی دەبرد تا دەگەڕاوە. شەکەت و ماندوو، دەتگوت لە سەفەرێکی دوورودرێژ هاتووەتەوە، دەهاتەوە نێو کەلەشی بادۆیی. ئینجا ئامۆزا بادۆیی هەڵدەستا و دەهاتەوە لای مەڕەکان. پێم دەگوت:

ـ ئامۆزا گیان. ئاگات لێ بوو ئەمشەو ڤارکۆلاك چوو مانگ بجاوێ؟

دەیگوت: لەوانەیە وابووبێ.

هەر دەیەویست باسەکە بگۆڕێ و بیکاتە قسەیەکی دی. هیچ شتێکی وەبیر نەدەهاتەوە. هەر دەیگوت زۆر ماندووم. دەیگوت ئەوەندە شەکەتم وەك بڵێی ئەوەندەی کە خەوتم هەموو ئاسمانان گەڕابم.

دەیگوت:ـ بەڵێ، لەو سەرە، زۆر زۆر لە ژوور زەوییەوە، زۆرم سەرما بوو. ئەو سەرە زۆر ساردە. سەرمایەکە تف هەڵاوێی دەیبەستێ. هەر ئەوەندەم لە خەونەکە لەبیرماوە.

پاش ئەم قسەیە رادەکشا بۆ ئەوەی جەستە و ئێسکە پواوە پیرەکانی تۆزێك گەرم بکاتەوە.

ئەسپەکان جار بە جار هەنگاو خۆش دەکەن.

پیاو کە لە خەو هەڵدەستا، ئەوا چراکانی شار لە نێو شیوەکەدا ترووسکەیان دەهات.

١٦

گوژاڵك

*

*

*

دەچینە ماڵی خاڵە تۆنیێ، کە لە سەر شەقامەکە دووکانی قەسابیی هەیە. خاڵە تۆنیێ بەیانیان پێش تاوهەڵات لە ماڵێ وەدەر دەکەوێ و وەشوێن کاری خۆی دەکەوێ. دەچێتە دووکان و لە پشت تەرازووەکەی رادەوەستێ. هەر بۆیە خاڵۆژنە فینیکا میوانداریمان دەکا. ژنێکی ریوەڵەی وردیلەی ئەسمەرە، کە چاوە رەشەکانی تۆزێك خێلن. تا ئێستا نۆ زگی کردووە. کوڕە خاڵ و کچە خاڵ لە دەوری عارەبانەکە کۆ دەبنەوە و بە تایە و لاشانی هەڵدەگەڕێن.

ـ لە گوندەوە چیت بۆ هێناوین مامە گیان؟

درۆ نەبێ باوکم هەندێ شتی بۆ هێناون کە دڵیان پێی خۆشە: قەرتاڵەیەك پڕپڕ لە گەنمەشامیی تازە کە هەر زەینەتە بیبرژێنی... گەنمەشامییەکان دەبەن پاکیان دەکەن و لە تاوەیەکی دەکەن و لەسەر ئاگری دادەنێن.

ڤاستێیا، کچە چکۆڵەکەی خاڵم، کاکۆڵی گەنمەشامییەکان جوان و زەریف کۆ دەکاتەوە. یەك داویشی بەجێ ناهێڵێ.

ـ ڤاستێیا ئەوانەت بۆ چییە؟

ـ پێویستمن. بووکەڵەکانم کەچەڵ بوون. ئاخر ئەوەندە بزۆزی دەکەن، ناچارم بەردەوام قژیان برنمەوە. ئێستاش ئەوە بە قژەگەنمەشامی قژیان بۆ دروست دەکەمەوە.

خالّە تۆنیٚ دوو خانووی هەیە بە تەنیشت یەکترەوە. یەکێکیان گەورەترە و دەرگای بەسەر کۆڵاندا دەکرێتەوە و ئەوی بچووکەکەیان دەرگاکەی دێتەوە سەر حەوشە. لە نێوان هەر دوو بیناکەدا حەوزێکی لێیە و دارسێوێك، کە لکوپۆیەکانی کرووز و خواروخێچن. دوو ئاودەستیش کە بۆگەنیان دنیای داگرتووە. بیناکانی دەوروپشتی ئەوەندە بەرزن، کە لە سەعاتێك پتر تاو لە حەوشەی خالّم نادا. ئەویش تەنیا لە نوێژی نیوەڕۆدا.

کچەخاڵ و کوڕەخالّەکانم ئەوەندە زەردەڵە و لاوازن، هەزار خۆزگە بە حالّی من.

چەند منداڵێکی کە گەورەترن، لە زێدەکەی من واتە لە گوندی ئۆمیدا لەدایك بوون. بەڵام پوورە فینیکا پێی خۆش نەبوو لە دێ بژی. هێندەی لە گوێی خالّم خوێند و تێی هەڵپێچا، هەتا ناچاری کرد بێتە شاری. کە لە ئۆمیدا بوون، لە هیچیان کەم نەبوو. لێرە لە شاری هەژاری و دەستکورتی بابی گاون. تەنیا دڵیان بەوەندە خۆشە کە ماڵیان لە شارە. پێیان وایە بەو جۆرە هەر نەبێ هەژاری و نەدارییەکەیان شکۆیەکی پێوە دیارە.

ساڵێك پاش ئەوەی خالۆژنە فینیکا دیسان ئاوس بۆوە و دەیەمین منداڵی کەوتە زگی، لەناکاو بێزار بوو. سەیری کرد بەخێوکردنی منداڵ و تەڕووشککردنەوەی و شەونخوونیی شەوانە بەسەر منداڵی گڕەزۆکەوە کە بەردەوام خۆیان پیس دەکەن، لە گیانی خۆی بێزاری کردووە. هەر بۆیە هەستا چوو لە گەڕەکێکی دوورەدەستی دەرەوەی شار مامانێکی دۆزییەوە کە بە زەبری داماڵین و شێلان و دانانی مەنجەڵی داغ لەسەر زگی توانیی منداڵەکە لەبار بەرێ.

ئەوە ماوەیەکە ژنانی گوندییش بە چاولێکەریی ژنانی شار، فێر بوون کە لە منداڵخستنەوە بێزار بوون، بچنە لای لەبارەبەرێك، منداڵەکەیان لەبار بەرن.

لە کۆڵانە گەورەکەی ئاواییدا تووشی ژنێك دەبی وەك بڵێی شووتیی لە بن کراسەکەیدا شاردبێتەوە. هێور هێور بە رێدا دەڕوا و ئاگای لە خۆیەتی لە پەرژینەکان هەڵنەنگوێ یان کە دادەنیشێ، ورگی وا دێنێتە خوارێ، موویەکی نێوگەڵی نەلەرێتەوە. دەڵێ: پێم ناوەتە سێ مانگانەوە.

لە نۆمانگانەیدا زگ تەواو گەورە دەبێ. بەڵام ژنە هەروا سەرقاڵی کاری خۆیەتی، وەك بڵێی نە بای دیتبێ و نە بۆران و جارێ هیچ باس نییە. هەر بەراستیش ئەگەر بیەوێ دەست لە رەش و سپی نەدا ئەی کاروباری ماڵەکەی؟

زیاتر ئەو جووتبەندە دەوڵەمەندانەی تۆزێ زەویوزاری زیاتریان هەیە و توانیویانە هەندێ پارە پاشەکەوت بکەن، لە سەریان دەدا نەهێڵن منداڵیان زۆر بێ. منداڵ، یان یەك یان دوو. بۆچیتە؟ بنیادەم بۆچی چەند نانخۆرێك زیاد بکا؟ لەسەر ئەم حیسابە، ژنانی تایەفەی کیابۆر منداڵی چوار و پێنجەمیان لەبار دەبەن.

پێتریا و دیڤاییکا، ئیتر لەوەدا بوونەتە وەستا.

مەنجەڵێکی گەورە پڕ دەکەن لە ئاو و لەسەر ئاگری دادەنێن. جلوبەرگی ژنە دووگیانەکە ـ وەك بیانەوێ سەروگوێلاکی بشۆن ـ دادەکەنن و رووت و قووتی دەکەنەوە و لەسەر تەختەکەی درێژی دەکەن. دەستیان لە مەنجەڵەکەدا دەشۆن و بە زگە زلەکەیدا دێنن و دەست دەکەن بە مشتومالْدانی. رێك وەك چۆن هەویر دەشێلن ئاوا.

ـ دان بە جەرگتدا بگرە. لەوانەیە تۆزێك ژانت بگاتێ، بەڵام چار نییە. دەبێ "بکرێتەوە".

ژنەی ماڵوێران وەك مارانگازان جنیگڵ دەدا. دەیەوێ هاوار بکا. وەك بڵێی چەقۆی لە دڵ و هەناوی وەردەن.

دیڤاییکا بەو پەنجە زلە گرنج گرنجانەی توندی بن مەمکانی ژنە دەگرێ و بە هەموو تینی خۆی لەوێوە هەتا نێوگەڵی دایدەماڵێ. جارێك، دوو جار، سەد جار وا دەکاتەوە. ژنە ددانی لە سیڕەوە دەبا.

شەویلاگەی توند دەکا. لێو و زمانی دەگەزێ، بەڵام نازریکێنێ. چونکە کەپرەکەی دیڤاییکا بەسەر کۆڵاندایە. نابێ هیچ کەس گوێی لە نووزە و ناڵەیان بێ. ئەگینا، لە چاوترووکانێکدا هەموو خەڵکی ئاوەدانی دەزاننەوە.

بەو حاڵەشەوە هەمووان دەبیستنەوە. ئاخر هەر دوێنێ پێرێ ئەو ژنەتیوەیان دیتبوو کە زگی وەك مەشکە هەستابوو دەتگوت فوویان داوە، کەچی ئێستا رێك رێك بووەتەوە. رەنگی بزرکاوە و دەموچاوی وشك هەڵگەڕاوە و تا هەنگاوێك دەنێ وەختە گیانی دەربچێ.

مەنجەڵێکی گەورەیان لەسەر کوچکاورەکە داناوە سوور بێتەوە، خۆڵەمێشی گەرمیشیان لە بنی کردووە. کە لە مشتومالْ بوونەوە، ئەو مەنجەڵە سوورەوەبووە وەك مژمژە بە زگی ژنەوە دەنێن و، مەنجەڵ کە بە پێستەکەوە دەنووسێ بە قوماشێکی تەڕ دەیبەستن. مەنجەڵە گەرمەکە، زگی ژنەکە هەڵدەمژێ. ئەو داماوە دەبێ ئاوا رایگرێ. ئینجا دیڤاییکا پەنجەیەکی دەخاتە نێوان پێستی زگی و لێواری مەنجەڵەکەوە بۆ ئەوەی مەنجەڵەکە هەوا هەڵکێشێ و زگی ژنە بەر بدا.

ـ باش شین و مۆر بۆوە. بازنەیەکی کردووە. زگتی چاك هەڵمژی.

ئینجا مشتومالْ دەست پێ دەکاتەوە.

ژنە دەچێتەوە ماڵێ. وەك مێو و رۆن. دەڵێی بە قەستی کوشتن بیراز کراوە و، یەك دوو رۆژ دواتر منداڵەکەی دەخا.

جاروبار پێش دێ دایکەش لەگەڵ منداڵەکە تالاوی مەرگ دەچێژێ. رێك ئەو بەلایەی بەسەر ژنەکەی خاڵە تۆتێ هات: ئاخر فینیکاش ئاوا مرد. ئاوای کرد بۆیە چۆوە باوەشی خاك "لەبەر ئەوەی لە گڵ دروست کراوین، ئاخرییەکەشی هەر دەبینەوە خاك و خۆڵ". ئەوە سێ قەشەی ریشن بە عابای رەشی بریقەدارەوە کە بخووردانەکانیان لەسەر تابووتە رەشپۆشکراوەکە رادەوەشاند، ئەو قسەیان کرد. قشەکان وایان دەنواند زۆر پاکژن و، تەنانەت چاویشیان پڕ دەبوو لە ئاو، چونکە خاڵە قەسابەکەم

پارەیەکی باشی دابوونێ. ئەوانە هەر قەشەکانی کلێسەی سفانتتا ڤینەری بوون کە چەند ساڵێك لەوەوپێش ئەو دەمەی نەخۆش کەوتبووم و چیی نەمابوو بمرم و دایك و بابم بە هیوای چاکبوونەوە بە کلێسە بەناوبانگەکاندا دەیانگێڕام، بە ڕۆنی متفەڕك مشتومالّیان دابووم. باوکم لەو پارەیەی دەبوو بیانداتێ دوو "لەیی"ی کەم بوو. ئەمن بێهۆش و گۆش لە بان ئەو حەسیرەی لەسەر سەکۆ سەهۆڵینەکەی کلّێسە رایانخستبوو کەوتبووم و دایکیشیم کە دەستی لێ شوشتبووم زۆڕ زۆڕ دەگرا. قەشەکان کردبوویانە بەزمی خۆیان کە باوکم دوو "لەیی"ی کەم پێ ببوو. جا وەرە گاڵتەیان پێ کردبوو و پێیان رابواردبوو، کە بەڵێ، کابرا بە گیرفانی بەتاڵ هاتووە ڕۆنی متفەڕك تالان بکا. ئاخرییەکەشی منیان بە بارمتە راگرتبوو هەتا باوکم دەرکا و دەرك گەڕا و هەرچۆنێك بوو پارەیەکی بە قەرز و قۆڵە وەرگرت و هێنای خستییە بەردەمیان.

لە کاتی ناشتنی خالۆژنمدا، قەشەکان دەیانزانی هەموو خەڵك چاویان بەسەریانەوەیە، ئیتر ناچار ببوون خۆیان نارەحەت نیشان بدەن.

منداڵ، هەر نۆیان لە دەوری تابووتەکە کۆزیلکەیان بەستبوو. ئەوانی منداڵتر دەنووزانەوە و چڵمیان هەڵدەلووشی و کچە باوخۆشترەکان کە ئیتر منداڵ نەبوون، شینیان دەگێڕا.

داپیرەشم کە لە کارلۆمانەوە هاتبوو بۆ پرسەکە.

تەرمەکەیان کە ناشت، خالّە تۆنێ لەبەر داپیرەم پاڕابۆوە و گوتبووی:

ـ دایکە، لای من بمێنەوە و یارمەتیم بدە تا منداڵەکان تۆزێك گەورە دەبن. زۆریش نا، هەر ئەوەندەی تا تۆزێك گەورەتر دەبن.

ـ وەڵاهی قورقوشمم لە گەرووی بکەن پێم خۆشترە لەوەی تاوێك لە ماڵی تۆدا وەمێنم. دڵم بە شار تێکەڵ دێ، جا لە ماڵی تۆ هەر مەپرسە. توخوا سەیر کە، بیری ئاودەست هەنگاوێك لەولای بیری ئاو، ئەك بە قوربانی ماڵەکەی خۆم بم دەڵێی بەهەشتی خوایە. ئێرە هەواکەشی بۆگەنە.

خاڵە تۆنیٚ بە سەرپێیەکەوە چوو سەرێك لە دووکانی گۆشتفرۆشییەکەی بدا. داپیرە هەر زانیی دوور کەوتووەتەوە، پڕی دا گۆچانەکەی و بەرەو کارلۆمان کەوتە ریٚ. نەوەد ساڵانە بوو و قیت و گورجوگۆڵ وەك کچێکی عازەب ئەو دوو فەرسەنخ ڕێیەی نێوان شاری و ماڵەکەی خۆی بڕی، بەبیٚ ئەوەی تاقە جارێکیش بۆ پشوودان لە جێیەك دابنیشیٚ.

باوکم دەیگوت:

ـ بە خوا پەتیارەیەکی سەیرە.

*

*

*

ئەو ڕێیەی داپیرەم یەکپشوو بڕیبووی، یانی ڕێی نێوان شاری و گوندی کارلۆمان، منیش پێشتر بڕیومە. هێشتا زۆر مندال بووم، ڕۆژێکیان لەگەڵ دایکم چوومە شاری. دیارە ئەوەندەش منداڵ نەبووم نەتوانم بە لاقە بچکۆلانەکانی خۆم بە شوین دایکم و ئەو ژنانەدا کە لەگەڵی دەچونە شاری، بڕۆم.

ئەلیزابێتای خوشکم هێشتا حەفتەیەك نەدەبوو لە دایك ببوو. دایکم دەسبەجیٚ جێوبانی زەیستانییەکەی کۆ کردبۆوە. ئەودەم دایکم زۆر لە ئێستا گەنجتر و گورجتر و جوانتر بوو... سەرەڕای ئەو هەمووە کارەی بەسەریدا ڕژابوو، دیسانیش ساڵیٚ یەك دوو جاران هەلی بۆ خۆی دەڕەخساند ملی ڕێگەی شاری بگریٚ و بەو چەند وردە دراوەی لە گۆشەی لەچکەکەی پێچابوو، چەند مەترە قوماشێك بۆ خۆی یان بۆ ئێڤانگلینی خوشکم بکڕیٚ و بیکاتە ئاوەڵکراس.

من بەردەوام خۆم پێوە نووساندبوو و هەنگاوێکیش چییە لێی دوور نەدەکەوتمەوە. ئێواریٚ گوێم لیٚ ببوو بە یەك دوو ژنی دراوسێمانی دەگوت:

ـ یانی وامان دانا کەڕەی بەیانی وەڕێ دەکەوین و دەچینە ڕۆشی دێڤدێ.

ـ دایە منیش دەبەی؟

ـ ناوەڵا، قسەی وا هەر مەکە، چونکە ناتبەم... ناچارین بە پێیان بڕۆین. تاقەتی ئەوەم نییە تا ئەوێ لە کۆڵت بکەم یان بە باوەش هەڵتگرم. تازە گەورە بووی و ماشەڵا زۆریش قورس بووی.

ـ دەی باشە بە پێی خۆم دێم.

ـ ناتوانی. ڕێیەکە زۆر دوورە. فەرسەنگێکە.

شەو داهات. لێی خەوتین. ماڵەوەمان هەموو نوستن، جگە لە من. لە تاریکاییەکەدا چاوم هەر لێك نەنا و تا بەیانی بیرم کردەوە. بیر لەو شتانەی منداڵان بیری لێ دەکەنەوە. خۆشی خۆشیی دیتنی شار و ترسی لەخەودامانەوە وای لێکردم خەوم لێ نەکەوێ. ئاخری پەنجەرە وردە وردە ڕووناك داگەڕا. وستەم لەخۆم بڕیبوو نەکا ئەوانی دیکە وەخەبەر بێنم. گوێم لێ بوو یەکێك ئەوە لە پەرژینی پەنجەرەکە دەدا. باوکم بەخەبەر هات و دایکمی هەستاند:

ـ هەستە ماریا، هاتوون لە دووت.

وەك فەنەر لە جێی خۆم دەرپەڕیم: منیش لەگەڵت دێم دایە.

ـ شەیتان بەلەعنەت. ئەوە بەو بەیانییە بۆ بەخەبەری؟

ـ هەر نەخەوتووم.

ـ بۆ؟

ـ لە ترسی ئەوەی نەکا لە خەودا بمێنمەوە و بەجێم بێڵی.

ـ هەی کەرە...

ناچار بوو منیش وەدووی خۆی بدا. لە پێشدا تۆزێك ڕۆیشتم. دوایی دایکم لە باوەشی کردم. ئاخری دیسان داینامەوە و ناچار ڕێیەکی زۆرم بڕی. ئاخرییەکەی دوو لە ژنەکان ناچار بوون بە نۆرە تا ئەوێ لە باوەشم بکەن.

ڕێك لە نیوەڕێی گوندەکەی خۆمان و شار دڕوەڵانێك هەیە. دڕوەڵانێکە، کە ئەودەم هێشتا دارستانێکی چڕ بوو. خۆر ڕمبێك بەرز ببۆوە. جادە، کە بە نێو دارستانەکەدا تێدەپەڕی، پڕ بوو لەو دێهاتییانەی بەرەو بازاڕێ بەڕێوە بوون. دایکم و ژنەکانی دیکە لەوێ دانیشتن تۆزێك بحەسێنەوە و پشوویەکیان بێتەوە بەر. پێم وایە لە دەم دارستانەکە نەبوو، بەڵکو چوونە نێو دارەکان و جێیەکی تەنکیان دیتەوە کە پڕ بوو لە سوورەگوڵ و لەسەر گژ و گیایەکە لێی ڕاکشان. پشوودانەکەیان زۆری نەخایاند. گەلێ گوڵە شلێریان چنی و کەوتینە ڕێ. وەك بڵێی بنیادەم ئەگەر باوەشی پڕ بێ لە گوڵ ڕێیەکە کورتتر دەبێتەوە.

لەوەدەمەوە تا چاوم لە گوڵە شلێر دەکەوێ، ئەو ڕۆژە خۆشەی سەرەتای هاوینێم بیر دەکەوێتەوە و ئەو ئاسمانە شینە پیرۆزەییە و ئەو ڕێگا خۆڵەپۆتەیە و ئەو سێ ژنە گەنجەی بە تاڵووکە دەڕۆن و منداڵۆچکەیەکی دەموچاو شڵە و سەروقژ ئاڵۆزی چڵکنیان پێیە. هەیتوەیەکی چڵمن، کە هەوڵ دەدا پێ بە پێی ژنەکان بڕوا.

خۆڵی جادەکە گەرمە.

❊

❊

❊

میشۆی خاڵۆزام دەڵێ:

ـ وەرە با شارت پێشان بدەم.

جا پێشانیشم دەدا. دووکان و کۆشکەڵە و خواردنگە و گەڕەکی قەسابەکان.

ـ هەها، هۆوە دووکانەکەی خۆمانە.

دەنگی پڕە لە بەخۆنازین.

ئەوەی پێشانمی دەدا، کۆشکێکی دارینە، کە دار و دیوارەکەی هەموو خوێنی پێوە وشك هەڵاتووە. دەڵێ لە بری گەچ، بە خوێن سواغ دراوە. قەنارەیان لێ هەڵواسیوە و کەلەشی مانگا و گوێرەکە و بەرخ بە زگی دڕاو و بێ دڵ و ورگ و ریخۆڵەوە بە قەنارەکاندا کراون.

خاڵە تۆنێ بە کێردەکەی گۆشتەکە لەت دەکا و دەیکێشێ و لە کاغەزێکی وەردەپێچێ و دەیداتە دەست مشتەرییەکە و پارەی خۆی وەردەگرێ و لە دەخیلەکەی دەخا. دەستی شەڵاڵی خوێنن و هەتا ئانیشکی لە بەر چەوری و بەز دەبریسکێنەوە. بەروانکەیەکی چەرمیی پانی بەستووە، کە دیارە زۆر لەوەپێش رەنگەکەی زەرد بووە.

خاڵە تۆنێ سەر و سیمای رێك چووەتەوە سەر باپیرەم و خووخدەشی چووەتەوە سەر داپیرەم. وەك سەی هار مۆڕەیەك لە من دەکا و تیزەبزەیەکی دێتێ، کە ددانە بەرازییەکانی دەردەخا. لە دڵی خۆمدا دەیانژمێرم. هەر گونیشم پێی نابزوێ. بە گۆڕی بابی بابی، خۆ ددانی من لە هیی ئەو کەمتر نین.

ـ دیسان ئەوە تۆی؟ خۆ ئیشەڵا نەهاتووی لە ماڵی من تخێڵ بی و قۆناغ بگری؟

ـ مەترسە خاڵە گیان، هاتووم لە جێیەك ببمە شاگردی وەستایەك.

ـ چاکە چاکە، لەو شارە کاولەدا هەر ئەوەمان کەم بوو... بەڵام چاوی خۆت خورد بکەوە، لەم دەوروبەرانە بتبینمەوە، قولاپەت دەشکێنم.

ـ بەچاوان خاڵە گیان.

ـ کەوابوو دە یاڵا، جەحەنەمت لێ پڕ بێ، چغە بە.

لەو دەمەدا کە من خەریکم لەگەڵ ئەو خەرمانی خۆشەویستی و میهرەبانییە واتە خاڵەگیانم قسان دەکەم، میشۆی خاڵۆزام خۆی دەخزێنێتە نێو دووکانەکەوە و پارچەگۆشتێك لە رانە بەرازێك دەکاتەوە و بە دزییەوە دەیهێنێ. خاڵە تۆنێ کە بە پارچەگۆشتەکەوە دەیبینێ، شەپلاخەیەکی لە بن گوێی دەسرەوێنێ. بەو حاڵەشەوە خاڵۆزاکەم دەتوانێ خۆی لە دەستی راپسکێنێ و گۆشتەکەش دەرباز بکا.

وا رادەکا دەڵێی پێی نایەتەوە سەر عەرزی.

بەبێ تاڵووکە و لەسەر خۆ وەشوێنی دەکەوم.

دەستکەوتەکەیم لەگەڵ بەش دەکا.

*

*

*

باوك و دایکم لەگەڵ خاڵۆژنە فینیکا تەگبیر دەکەن. من بەرنە کوێ باشە؟ لای کامە وەستام دابنێن؟ ئاخرییەکەی رێك دەکەون و خاڵۆژنم خۆی تاسولووس دەکا و هەڵدەستن برۆنە دەرێ.

مەنجەڵی فاسۆلیا لەسەر ئاگرە. ئەمڕۆ جومعەیە. رۆژی بازاڕە و گۆشت دەستناکەوێ.

ئێمە، واتە خاڵۆژنم و من و باوکم بەرەو ئەولای شار دەکەوینە رێ. هەر ئەو جێیەی باخی گشتی و بازاڕی جەڵەبی لێیە. دایکم لە ماڵی بەجێ ماوە. لە تەنیشت عارەبانەکە هەڵتووتەکاوە و نیگای پڕ لە غەمی بڕیونەتە من.

ـ تیەح لەو بۆگەنە.

خزمەکەمان دەڵێ: ئاخر ئێرە گەڕەکی دەباغ و وەستاکانی چەرمەکلاوە.

دەمبەنە نێو دووکانێکی درێژ و تاریکەوە کە لەبەر پێستەی وشك و خاوێن ناتوانێ پێ هەڵێنیەوە. باوکم بەدوومدا دێتە ژوورێ و خاڵۆژنیشم بەدووی بابمدا. ئاغا لە پشت مێزێکەوە دانیشتووە و

دەفتەرەکەی هەڵدەداتەوە و چۆرتکە داوێ. دێهاتی جێی دەرزیهەڵاویشتنێکیان لە دووکانەکەدا نەهێشتووەتەوە. لەو جێیەوە کە راوەستاوم گوێم لە ئاغا هەڵخستووە کە لەگەڵ گوندییەکان چەنە لێ دەدا. چەلەحانێی چی، چەنەلێدان بۆ گەرمکردنی بازاڕەکە.

لەو پشتەوە جموجۆڵ و هەراوهۆریایەکە هەر مەپرسە. کۆمەڵێك منداڵی لە من باوخۆشتر ئەوە بە ریز دێنە ژووریٚ و دەچنە دەرێ. ئاغا پەیتا پەیتا ئەمریان بەسەردا دەکا. کوڕیژگە بە پەلەپەل دێن و دەچنە نێو عەمبارەکانی بن دووکانەکە و بە کۆڵێك پێستەوە دێنەوە دەرێ. جووتیار پارەی خۆیان دەدەن و پێستە هەڵدەگرن و دەڕۆن.

ئاغا هەر چاوی بە خالۆژنم دەکەوێ، دەڵێ:

ـ خاتوو براتیٚسکۆ، چ خزمەتێکم لەدەست دێ؟

خالۆژنم دەچێتە پێشێ و منیش وەپێش خۆی دەدا.

ـ دەمەوێ چاکە و گەورەییەکمان لەگەڵ بکەی ئاغا مۆتزاتۆ.

ـ چیم لە دەست دێ؟

ـ زحمەت نەبێ ئەم خوشکەزایەی مێردەکەم بکە بە شاگردی خۆتان.

باوکم دەڵێی داوێتە باری لاساری بۆیە کڵاوەکەی لەسەری دانەگرتووە و بەبێدەنگی راوەستاوە بزانێ چ دەقەومێ. نێوچاوانی تێك ناوە. ناعیلاج نەبوایە، دەستمی دەگرت و دەیبردمەوە. بەڵام مخابن، دەکرێ بۆ کوێم بەرێ؟

ئاغا بە سیلەی چاوێك هەڵمدەسەنگێنێ:

ـ تۆزێك لەڕ و لاوازە.

خالۆژنم دەپاڕێتەوە: تۆ خوا، تکا دەکەم هەرچۆنێك بێ قبوولی بکەن بەشکم بتوانێ بۆخۆی فێری کەسب و کارێك بێ.

ـ دیاره لەبەر خاتری ئێوە قەبووڵی دەکەم چونکە خزمتانە... من لێرە هەمیشە شاگردم پێویستە.

خاڵۆژنم دەڵێ:

ـ ئیشەڵا نارەحەت نابی کە لە پێشدا پێم نەگوتووی: بەستەزمانە لاقێکی شەلە.

ـ هەر بەراست؟ سەیرە...

روو لە من دەکا و دەڵێ:

ـ دا تۆزێك بجووڵێ بزانم.

چەند هەنگاوێك بە دووکانەکەدا دێم و دەچم. ئاغا چاوێکی کردووەتە چوار چاو و لێم ورد دەبێتەوە و ئاخری دەڵێ:

ـ قەیناکا فینیکا خاتوون، کارێکی وای پێ ناسپێرم راکەراك بکا. تەنیا مەرجەکەی ئەوەیە منداڵێکی کارکەر و ئازا بێ و لە پێشدا بە بۆنی چەرمەکە دڵی تێکەڵ نەیە. لەو کەسب و کارەی ئێمەدا کەس بۆنی عەتر و گوڵاوی لێ نایە.

ـ لەوەیاندا من و تۆنێ زەمانەتی دەکەین. ئەوەش باوکێتی.

ـ دەی باشە، یانی بابیشی هەیە.

ـ بەڵێ.

خاڵۆژنە فینیکا دەڕوا. باوکیشم هەر دەڕوا.

ـ ناوت چییە کاکە چکۆل؟

ـ دارییە.

ـ ناوێکی زۆر باشت هەیە ها، دەی باشە، تۆزێك وەرە پێشەوە بزانم.

دەچمە پێش دەمی ئاغای مۆتزاتۆ.

بە کەیفی خۆی دوو شەپلاخەم لە بناگوێ دەدا وەك دەمانچە تەقەیان دێ و لە گوێمدا دەزرینگێتەوە.

ئەوجار بە یەکێکی دیکەم دەسپێری: پیاوێك کە سمێڵە پڕەکەی لە بناگوێشی دەرچووە:

ـ بە قوربان، دەی سەیری ئەو جووجەڵە شل و شەوێقە بکە، تازە لە هێلکە هاتووەتە دەرێ. دەیەوێ فێری کار و کاسبی بێ... دەی باشە... کەوابوو لە پێشدا تۆزێك خۆی خۆشە بکەن. بۆخۆتان دەزانن چۆناوچۆن. بەڵام ئاگاتان لێی بێ گیانی بە قوونیدا دەرنەچێ.

کابرای سمێڵ بابڕ وەك پووشەکایەك هەڵمدەگرێ و دەمباتە حەوشەکەی پشتەوەی دووکان. بانگی ئەوانی دیکەش دەکا. دە کەسن، بە کوڕەکەی ئاغاوە یازدەن.

لە لای باغی گشتییەوە ئاوازێك دەهات. یەکێك پیانۆی لێ دەدا، ئاوازەکە لە ماڵێکی سپییەوە دەهات کە هەموو پەنجەرەکانی لەسەر گازەرای پشت بوون. ئاوازەکە دەتگوت ئاوێکی ساردە و لەسەرخۆ و روون روون بەسەرمدا دێتە خوارێ. دەیگرتمە خۆی و بە گیانمدا دەخوشی.

سمێڵ بابڕ تێی گەیاندن:

ـ ئاغا گوتی وەك تووتی سەبیلە لە هێلکەی دەین، بەڵام ئاگامان لێی بێ نەتۆپێ.

باوکم زۆر بە ناقایلی لە دووکانەکەی ئاغای مۆتزاتۆ چووبووە دەرێ. دەستە قەڵشیوەکانی وەك بلێی بملاوێنێتەوە بە پشتەملمدا هێنابوو و بە سرتەیەك گوتبووی: رۆڵە، کوڕی خۆم هەوڵ بدە پیاوانە بجووڵێیەوە.

دایکم دڵی بەرایی نەدا بێ و ئەو شوێنە ببینێ کاری لێ دەکەم. لە دڵی خۆمدا گوتم: "ئەگەر هاتبایە، مەحاڵ بوو بێڵێ لێرە بمێنمەوە." لە ماڵی خاڵە تۆنێوە کە وەڕێ کەوتین، هەتا لە چاوی نەدیو بووم هەر چاوی لێم بوو. دوایی لە ناکاو رووی وەرگێڕا. نەمتوانی چاوی ببینم بەڵام هەستم کرد کە دەبێ پڕ بووبێن لە فرمێسك.

ئاغای مۆتزاتۆ بە کرێکارەکانی گوتبوو، وەك تووتنی سەبیلە دامبێژن، بەڵام ئاگایان لێم بێ نەمرم. سمێڵ بابڕ وەك پەڕە کایەك هەڵیگرتبووم و هێنابوومی و لە سەر پلیکانەکانەوە فڕێی دابوومە نێو حەوشەکە. یازدە کوڕیژگە دەوریان دابووم. بازنەیەکی تەسك، تەسك و بەرتەنگ. ڕێی راکردن نەبوو. ئەگەر توانیباشم را بکەم، تازە خۆم دەکردە گاڵتەجاڕ. جا بۆ کوێ دەچووم؟ حەوشەکە لە سێ لاوە دیوارەکانی بەرز بوون و لە لایەکیشەوە بە پەرژینێك لەو ڕێچکەیە جیا کرابۆوە کە دواتر زانیم دەچێتەوە سەر قەحپەخانە و، ئەو پەرژینە بۆ وەبوو شەوانە دووکان و عەمبارەکان لە دزان بپارێزێ.

چاوم لە چاوی یەك بە یەکی ئەو یازدە زرتەزەلامە بڕی بۆ ئەوەی بزانم هەر بەراستی دەیانەوێ چ بکەن؟ سوعبەت دەکەن؟ بەڵام چاوی سەگی یانیگریش ئەوەندە دڕندە نەبووە. سەرم لە نێو قەپێلکی خۆم گرت و بە دەست دەموچاومم داپۆشی بۆ ئەوەی زەبری پێ نەکەوێ.

گوێم لە دەنگی سمێڵ بابڕەکە بوو کە پرسیی:

ـ دەی باشە، کێ لە پێشدا دەست پێ دەکا؟

میناکێی کوڕی ئاغا گوتی:

ـ دەی خۆ دیارە، وەك هەمیشە من.

ـ کەواتە بجووڵێوە.

بارانی مستەکۆڵە و شەپلاخە بەسەر و ملمدا هاتە خوارێ، بارانی سیخورمە بۆ کەلەکەم و پێلەقەی بە پێڵاوەوە بەسەر قاچ و قولە رووتەکەمدا.

دیسان سمێڵ بابڕ هەڵیدایە:

ـ تۆ بەسە ئیتر، تۆ دەستت پێ کرد جا ئێستا نۆرەی ئێمەیە.

ـ گۆگۆ، راوەستە جارێ با چەپۆکێکیشی باشی لێ بدەم.

گۆگۆ ناوی سمێڵ بابڕەکە بوو.

لە خۆڵ و خاکەکەدا دەگەوزیم. سەرم خەریك بوو بتەقێ. هەموو گیانم لە بەر ژان دەیزریکاند.

جا چونکە هەموو جۆرە بیر و خەیاڵێك وەك برووسکە بە مێشکمدا دەهات، پێم وابوو:

ـ ئێستا ئەوە منیش وەك سەگ لە خۆڵ و خاك دەگەوزێم. وەك ئەو پیرەسەگانەی کە ئیتر نە دەتوانن بۆن بکەن و نە ببیستن و بەکاری هیچ نایەن و دەیانبەینە دەرەوەی ئاوەدانی و لەوپەڕی بێبەزەییدا ئەوەندەیان بە دار لێ دەدەین تا دەتۆپن... یانی ئەوانەش دەیانەوێ من ئاوا بکوژن؟ نا، هەر دەیانەوێ خوریشۆرم بکەن.

ددانم لەسەر یەك داگرتن بۆ ئەوەی هاوارم لێ نەیە و نەقیژێنم.

چەند جاران هەڵیسانستاندمەوە سەر پێ و بن پیلیان گرتم و رایانگرتم. بە مشتەکۆڵە لە شەویلاگەیان کوتام و دیسان بەریان دام بۆ ئەوەی بکەوم. کە بەریان دەدام، وەك پەڕۆیەکی خووساو گرمۆڵە دەبووم:

ـ بووراوەتەوە گۆگۆ وازی لێ بێنە. دەستی لێ هەڵگرە با جەحەنەم پڕ بکا. هاکا سەکەت بوو و مرد ها. ئەودەم تووشی سەرئێشە و گێچەڵێك دەبین ها. وا دیارە لە شاری کەسوکاری هەیە.

یەکێکیان سەرمی گرت و ئەویتریان لاقم. بردیانمە ئەو ژوورەی شەوانە هەموویانی تێدا دەنوستن. منیش دەبوایە لەمەودوا شەوانی بێبڕانەوەم لەوێدا بکەمەوە رۆژ.

دوو تەختی زۆر گەورەی تێدا بوو. دوو تەختی دارین کە حەسیرێکی شڕیان لەسەر راخستبوو.

فڕێیاندامە سەر یەکێك لە تەختەکان و رۆیشتن و دەرگاکەشیان لەسەر گاڵە دام.

ئەو پەنجەرەیەی بەسەر حەوشەدا دەکرایەوە، ئەوەندە تۆزاوی ببوو، خۆڵەمێشی دەچۆوە. زۆر لەمێژ بوو نەیانشوشتبوو. هەموو گۆشە و قوژبنەکانی پڕ بوو لە داوی جاڵجاڵۆکە.

جاڵجاڵۆکەیەکی قەڵەوی رەش خۆی لە میچەکەوە شۆڕ کردەوە. بە داوەکەیدا شۆڕ بۆوە و بەرەو لای من هاتە خوارێ و چیی وای نەمابوو بگاتە دەموچاوم راوەستا، تاوێك دواتر بە هەوای هەناسەکانی من لەرییەوە و دیسان بەرەو ژوور هەڵکشایەوە.

که له گوندەکەی خۆمان بووم و هەر دەڵێی دوێنێ شەوێیە، جاری وابوو بەتاقی تەنێ لە دەشتێ گەمەم دەکرد. لە نێو گژ و گیاکاندا بە شوێن جاڵجاڵۆکەدا دەگەڕام. دەگەڕام شووڵکێکم دەدۆزیەوە و داوە دەزووەکم لە داوێنی کراسەکەم دەردەکێشا و لەسەری شووڵکەکەم دەبەست و بە لیکی زارم تەڕم دەکرد و لە کونی جاڵجاڵۆکەکەم رۆدەکرد. دەست و پێی بەستەزمانە لە دەزووەکە گیر دەبوو و کە دەمکێشا دەرێ، جاڵجاڵۆکەی بەستەزمان چاوی لەبەر خۆرەکە بەشەوارەکە دەکەوتن و بەردەبۆوە سەر گژ و گیاکان و بە لاترەلاتر رای دەکرد. سەیریم دەکرد چۆن وەك شێتان را دەکا. قاچەکانیم دەژمارد و لە سەر و جەستە تورت و لاوازەکانی ورد دەبوومەوە. هەندێ جاڵجاڵۆکە هەبوون رەش بوون وەك قەیتەران. هەندێکیان سپی یان کەوە یان سوور بوون. تەنانەت جارێکیان جاڵجاڵۆکەیەکم دۆزییەوە کە شین شین بوو. وەك گوڵی وێنجەمارانە. گوندی پێیان وایە هەر جاڵجاڵۆکەیەك بکوژی، گوناحێك لە کارنامەکەتدا دەنووسرێ.

براگادیرۆی مامۆستامان پێی دەگوتم:

ـ دیوتە داریە، خەڵك لەبەر نەزانیی خۆیان باوەڕیان بە شتی چۆنە؟ بە سیحر و جادوو و نووشتەی پیر و پیرەژن و فاڵگرەوەکان. بە جیهانی سەروو. پێیان وایە دنیایەکی دیکە هەیە کە رۆحی بنیادەم پاش مەرگ دەچێتە ئەوێ... ئەگەر راستیت دەوێ هیچ دەسەڵاتێکی نەبەدی نیە کە بتوانێ چارەنووسی بنیادەمەکان لەسەر گۆی زەوی دەسنیشان بکا. هەر بنیادەمەکان خۆیانن کە دەتوانن چارەنووسی خۆیان دروست بکەن. پاش مەرگیش هیچی دیکە لەگۆڕێ نییە. گوندییەکان لە تاریکەسەلاتێکدا دەژین هەر مەپرسە. تۆ هەندێك کتێب و شتت خوێندووەتەوە، دەبێ وەشوێن ئەو مەسەلەیە بکەوی تا تۆزێ بەرچاوت روون بێ دنیاکە باشتر بناسی.

جاڵجاڵۆکەکە هاتبۆوە نێو داوەکەی و دەست و پێی کۆ کردبوونەوە و وەك خاڵێکی بێجووڵەی لێ هاتبوو.

باشە بۆچی ئاوا لێیان دام؟

ئەو پرسیارە هەر لە مێشکمدا دەزرینگێتەوە. هەرچی دەکەم نازانم بۆچی. ئەو زەبەلاحانە لەسەر هەست بوون نەکا ئێسك و پێسکم تێك بشکێنن. تەنیا خوریشۆریان کردم و جوان و زەریف لە هێلّەگیان داوم. وەك چۆن ئاغاکەیان ئەمری کردبوو.

دەست بە لەشمدا دێنم، ئازای ئەندامم دێشێ. گۆشت و ئێسقانم چڵ دەدەن. گوێم دەزرینگێنەوە.

تاریك داهاتووە. یەکێك دەرگا دەکاتەوە و دێتە ژووری چراکە دادەگیرسێنێ. یەکێك لەو دە کەسەیە. دێتە پێشەوە و لەسەر لێواری تەختی خەوەکە دادەنیشێ. کوڕێکی درێژی شل و شەوێق و زەردەڵەی ڕەق و تەقە.

ـ گیانت دێشێ؟

ئەو پرسیارەم بۆ لێ دەکا؟ ئەو کە خۆی یەکێك بوو لە بیرازکەرەکان. یانی زانیویێتی چیم لە دڵدایە؟ نا. کەس نازانێ پیاو چیی لە دڵدایە. ئەگەر خەڵك توانیبایان فکر و خەیاڵی یەکتر بخوێننەوە، ژیان لەسەر ئەم گۆی زەوییە چەندە تاڵ و ئەستەم دەبوو... نا، بنیادەمەکان هەرگیز لە یەکتر تێناگەن.

دایکم و بابم لەوانەیە بە گەنجێتی یەکتریان خۆش ویستبێ، بەڵام ئیتر ئێستا... ئێستا ئەوان هەر ئەوەندەیە پێکەوە لە بن میچێکدا دەژین. ئێمەش لە نێوانیاندا هەڵدەخولێین، ئێمە، ڕەوەیەك منداڵ.

جارێکیان ئاگام لێ بوو کە دایکم زۆر خراپ مۆڕەی لە بابم دەکرد. گوێم لێ بوو پێی دەگوت:

ـ هەر گوویەکی پێت دەخورێ بیخۆ.

دایکم ژنێکی نەرمونیان دیارە. بەڵام هەژاری و نەداری دڵڕەق و دڕی کردووە.

باوکیشم وەك دایکم، دەستکورتی و هەژاری ئەویشی تووڕە و تۆسن کردووە.

دایکم ئەو فکرەی لە مێشکی دەرناچێ، کە ئەگەر بابم هەر تۆزێك غیرەتی هەبوایە دەیتوانی ژیانی خۆی لەوە باشتر بکا و ئەوەندەی خەم و خەفەت نەدەدایە دایکم. بەو حاڵەشەوە باش دەزانێ باوکم

چەندە پیاوێکی وریا و بە دەستوبردە، چەندە زیرەکە و چەندەش قسە لە رووە و دادپەروەرانە بڕیار دەدا. بەڵام دەسەڵات چییە کە جاروبارە خەم و نیگەرانی و تووڕەیی و ناخۆشی چاوی هەڵسەنگاندن و دادپەروەرییەکەی کوێر دەکا.

جارێکیان دایکم دەهری بوو و بەسەریدا نەڕاندی:

ـ باشە ئەو ئیۆرداکیێ دیامانە چیی لە تۆ زیاترە کە هەموو شتێکی هەیە؟

ـ دەی ئەو، دنیایەك زەوی و زاری بە میرات بۆ بەجێ ما.

ئێ باشە، ئەی خوشك و براکانی من؟ ئەوان چۆن بیر دەکەنەوە؟

هەمووومان لە بن میچێکدا بەسەر و گوێلاکی یەکتر هەڵدەپڕووسکێین و سواری سەری یەکتر دەبین. هەمووومان لە دەوری سفرەیەك کۆ دەبینەوە و چیمان هەبوو دەیخۆین و بەو حاڵەشەوە هیچ پێوەندییەکمان لە نێواندا نییە.

ئێڤانگلینی خوشکمان لەو رۆژەوە کە مێردی کردوووە، لە مێردەکەی بەولاوە کە بەردەوام جنێوی دەداتێ و تێی هەڵدەدا، چاوی بە دیتنی کەس هەڵنایە، لە هەمووومان بووەتە بێگانەیەك. لەوانەشە هەر وابووبێ و ئێمە نەمانزانیوە.

من، شەلی و گێڕییەکەم پێ بڕدراوە. خەڵکیش بۆ گاڵتەپێکردنم بیانوویەکی باش و چەوریان دەست کەوتووە. هەر هەموویان شاگەشکە بوون و بەخۆیان دەنازن و سینگیان دەردەپەڕێنن کە پەتا و نەخۆشی بەم دەرگایەدا هاتووە و لەویتر چووەتە دەرێ و هەر من پێوە بووم و ئەوان قوتار بوون.

نا، کەس ناتوانێ فکر و مێشکی کەس بخوێنێتەوە. هەر بەوەی باشە وەهایە. بەو حاڵەشەوە من داپیرەمم کە لە کارلۆمان دەژی، زۆر خۆش دەوێ. خۆشم دەوێ رێك لەبەر ئەوەی گوێی بە کەس نابزوێ و دڵی کەسی بۆ گرینگ نییە. هەمووان وەك یەك سەیر دەکا. بێ رووبینی قسەی دڵی بە کابرا دەڵێ و هیچ ناشارێتەوە، جا ئەو بنیادەمە هەر کەسێك بێ. ئەگەر رۆژێك کەرێتییەکەم لە

کەللەی dابام و پێم گوتبایە چەندەم خۆش دەوێی، نەك هەر بڕوای نەدەکرد، بگرە چەپۆکێکیشی لێ دەدام و بە ناقایلییەوە پێی دەگوتم:

ـ ئەوە چ فێڵ و گزەیەکت لە بن سەریدایە وام پێ دەڵێی؟ سەگە گێڕەی زۆڵ؟ خوا پێم نەگرێ بەتەمای شتێکم لێ بخۆی... بۆیە باشتر وایە رێك و راست قسەی دڵت بکەی و فرت و فێڵان بەلاوە بنێی.

ـ نا داپیرە، بەخوا هیچم لێت ناوێ.

ـ هەر ئەو قسەیەشت درۆیەکی زلە.

هیچ نابێ ئەگەر ئەوەی پێ بڵێم، بەڵام خۆم وام هەر کەسێکم خۆش بوێ، لێی دوور دەکەومەوە و تخوونی ناکەوم با نەزانێ چیم لە دڵی دایە.

دایکم پێم دەڵێ:

ـ داریە، تۆ وەك ئەوانی دیکە نی. زۆر قووڵ و مەندی. وەك بڵێی قفلێکی زلت لە دڵت دابێ. بنیادەم ئەستەمە بتوانێ بچێتە نێوی...

هەتیوە رەقەڵە و لۆقدرێژەکە لە سەر لێواری تەختەکە دانیشتووە و بێ بڕانەوە خەریکە قسان دەکا:

ـ حەزم لێیە بزانی کە من لێم نەدای. هەر وام نواند کە لێت دەدەم. لەبەر ئەوانی دی. ئەگەر ملم بادابایە، خۆشم وەبەر دەکەوتم و منیشیان وەبەر شەق و پێلەقان دەدا. پێرار کە هاتمە ئێرە کار بکەم، منیشیان خۆیان واتەنی وەك تووتنی سەبیلە لە هێڵەگ دا. جا ئەویش چۆن؟ ئەوەی لە تۆیان دا نان و رۆن بوو لە چاوی تێهەڵدانەکەی من. ئاخر تۆ باوکت هێناوتی و، ئەگەر بە سەهوو نەچووبێم لە شاریش خزم و کەستان هەیە. منی لێقەوماو هیچ کەسم نییە. خۆم و گوێچکەم هاتوومە ئێرە. بەتاقی تەنێ...

دەنگی پڕە لە سۆز و چاویشی پڕن لە خەم. ئەویش چ خەمێك.

ـ خەڵکی بالاچیم. گوندەکەمان لە لای کۆتێش تییە. ناوم دۆبریکا تۆنسوویە. ئەی تۆ چەند خوشك و بران؟

ـ دە.

ـ ئێمە دوازدەین. من لە هەمووان گەورەترم. بەجێم هێشتوون. ئیدی نەمدەتوانی لەو ماڵەدا بژیم. تەنانەت بە بابیشمم نەگوت دەچمە کوێ. زۆری پێ چوو کە ئاخری زانیی لە کوێم. جارێکیان ڕێی کەوتە شاری و هاتە سەردانم. تۆزێك پارەی ویست بەشکم بتوانێ زگی منداڵ و پاڵەکەی تێر بکا. چیم کۆ کردبۆوە لە مستیم کرد.

ئەو پرسیارەی هەمە ئاگری لە دەم و لێوم بەرداوە. خۆم پێ ناگیرێ.

ـ باشە بۆ ئاوا لێیان دام؟

ـ نەریتی ئێرە وایە. ڕۆژی یەکەم مارکوژت دەکەن، بۆ ئەوەی ئەو مست و پێلەقەی لەمەودوا وێت دەکەون زۆرت لێ گران نەیەن. جا هەر بەراستی دوایی پیاو هەر مێشێکیشی میوان نییە.

ـ بۆ ئەو کارە بەبێ تێهەڵدان ناکرێ؟

ـ بۆچی لەوانەشە، پێم بڵێ دەتەوێ چ بڵێی؟ خوو، خووە. خۆ بنیادەم ناتوانێ هەر وا سووك و ئاسان دەست لە خوو و خدەکانی خۆی هەڵگرێ. جگە لەوەش، هەندێك لەبەر ئەوەی هیچ شتێکیان بۆ ڕابواردن نییە، بە تێککردنەوەی دەموفلچی خەڵکی دیکە شاگەشکە دەبن و وەکەیف دێن. چەندی لێرە بمێنیتەوە شتی سەمەرەتر دەبینی. بەو مەرجەی بتوانی بمێنییەوە.

ـ دەمێنمەوە. لە تێهەڵدانیش ناترسم.

بەڵام لە دڵی خۆمدا گوتم: دەبێ فێر بم باشتریان بناسم. هەموویان. بێت و ئەمجارەیان یەکێکیان بوێرێ دەستم لێ بەرز بکاتەوە، بە چەقۆیان وەریدەگەڕێمێ.

پێستە خۆشەکراوەکە بە کێرد خاوێن دەبێتەوە. کێردی درێژی دەمپان، کە دەڵێی مووسی دەلاکن.

دۆبریکا دەستی لێك دەخشێنێ. دەستی سووتاون و نینۆکیان هەڵوەریون و ئاوساون.

بیر و خەیاڵ هەڵێدەگرێ و بێدەنگ دەبێ.

خوریشۆر کراوم. دان بە جەرگمدا دەنێم نەکا نووزە و ناڵەم بێ. چی دەبێ با ببێ. فێری ئەو پیشەیە دەبم. بۆ خۆم دەبمە کرێکارێکی باش. ئیتر ئەودەم کەس ناوێرێ دەستم لێ بەرز بکاتەوە. هیچ بەشەری خوای. دیارە جگە لە خاوەنکارەکە، ئەویش ئەگەر فێر نەبم چۆن رقەکەی دامرکێنمەوە.

لە بنەبانی ژێرزەمینەکەوە و لەو حەوشەیەوە کە سەدان کەوڵ و پێستەیان تێدا هەڵواسیوە، بۆ ئەوەی لەبەر تاو وشك ببنەوە، بۆگەنێك دێ مێشکی سەر دەبات. رێك لەو کاتەدا ئەو بایەی لە گوندەکەی خۆمان هەڵدەکا و دێتە ماڵەکەمان، دەبێ بۆن و بەرامەی تاڵی ئەو "ئەفسەنتینانە" بێنێ کە تیشکی بەتینی خۆر وردەوردە سیسیان دەکا...

لەو چوار کەسەمان، تۆرتۆریکا و فیلۆف و ئیەپۆرێ مارین و من ـ تەنیا تۆرتۆریکا بە بۆن و بەرامەی تاڵی "ئەفسەنتین" مەست دەبێ. تۆرتۆریکا گووپنەی حەوت گیان، چووە بووەتە نۆکەری قەشە بۆلبۆك.

ئەو کچە بەستەزمانەی فیلۆفتیا، هەر لە سەرەتایی دەرچوو، دایك و باوکەکەی بردیانە شاری تۆرنۆ و کردیانە کارەکەر.

ئیەپوورێ، کە لە هەمووومان بە جەرگتر بوو، شەوێك بەبێ بلیت خۆی خزاندە نێو ڤارگۆنێکی شەمەندەفەرەکەوە و خۆی بە میچەکەیەوە مەلاس دا هەتا گەیشتە بۆخارێست. شێلگیرانە ساغ ببۆوە فێری کار بێ، ببێتە ئاسنگەرێکی دەسترەنگین و شۆفێرێکی کارامە. کەس بە سەروسۆراغی نەزانی و بەوزووانەش کەس سۆراغی نازانێ. هەر نایەتەوە سەرێك لە کەسوکارەکەشی بداتەوە، مەگەر بۆ خۆی ببێتە پیاو و گیرفانێك پووڵ بۆ دایك و باوکی بێنێتەوە. بە منی گوت: "ئیتر کەس بەو سەروسەکتەی ئێستامەوە لەو گوندەم نابینێتەوە ئاوا قوونرووت و پێخواس بم. دەوڵەمەندەکانی لای ئێمە زەوی و

ئاویان هەیە. من لەو دەستانەی خۆم زیاتر هیچ شك نابەم. دەمەویٚ بۆیان سوور بکەمەوە بەو حاڵەشەوە زۆر لەوان پیاوترم. دەمەویٚ بۆ هەموانی روون بکەمەوە چیم و چم پیٚ دەکریٚ.

درەنگانیٚك، پاش ئەوەی تاریك داهات، دۆبریکا تۆنسۆ قاپیٚکی سووپ بۆ هیٚنام بە کەوچکیٚکی دارین و لەتیٚك ماماڵیگاوە.

ـ ها بخۆ.

هەڵدەستم دادەنیشم و مل دەنیٚم لە خواردن.

زرت و زلەکان یەك یەك دیٚنەوە و بە ملی شکاویان دەخەون.

ـ هۆۆی، تۆزیٚ واوە بچۆ.

پشتم بە دیوارەوە دەنیٚم.

بەیانی بە جەستەیەکی کوتراو و بەژانەوە و بە لەشیٚکی شین و مۆرهەڵگەڕاوەوە دەستم بە کار کرد.

ئاغای مۆتزاتۆ چاویٚکی لە سەرتاپیٚم کرد و ویستی شتیٚکم پیٚ بڵیٚ و بەردیٚکم لەسەر دڵی دابنیٚ:

ـ دەی، لیٚرە حاڵ و باڵت باشە؟

ـ چۆن باشیٚکیش ئاغا. بنیادەم لیٚرە دەڵیٚی لە باوەشی ئیبراهیمدایە.

ـ چیت گوت؟

ـ گوتم پیاو هەست دەکا لە باوەشی ئیبراهیمدایە.

ـ کام ئیبراهیم؟

ـ ئیبراهیمەکەی تەورات ئیتر.

ـ تەوراتەکە دەخەمە کونی قوونتەوە، سیرمەی بیٚ چاوڕوو.

ـ چۆنت پیٚ باشە ئاغا با وابیٚ.

ـ گەندووگووی چڵمن، من لەوانە نیم یەکیٚك جوابەجەنگیم بکا و قسەم لە پارسەنگی بنیٚ ها.

ـ بەسەر چاو ئاغا.

ئاغا چۆوە نێو دووکانێ. دۆبریکا وەك ئامۆژگاری پێی گوتم:

ـ کوڕە با بڕوا جەهەنەمی لێ پڕ بێ. بابی ئەوە نییە سەری خۆتی پێوە بێشێنی. هاکا دیتت هەمووماٖنی تێ بەردای. کابرایەکی بەدفەڕ نییە، هەر ئەوەندەیە تاقەتی تەوس و توانج و شتی وای نیە.

ـ کەسێکی بەدفەڕ نییە؟ چما کەس گوتوویە بەدفەڕە؟ لە پیاوچاکیان دەڵێی بەرانە. ئەوەندەیە دوو شاخی نییە، ئەگینا کەس هێندە پیاوی چاك نیە.

دۆبریکا سەرە کاڵ و خڕەکەی راوەشاند و بە بەزەییەوە سەیرێکی کردم. وا دیارە شتێك دەزانێ.

ـ ئیدی دوایی نەڵێی کەس پێی نەگوتم.

کووپە لە بنەبانی ژێرزەمینەکە ریز کرابوون. ئەویش چ ژێرزەمینێك، هێندەتاریك بوو کە پیاو دەبوایە بە دەستەکوتە بەرەی خۆی لە قوڕێ دەربێنێ.

پێستەکانم لە کووپان دەکێشایە دەرێ. یەك یەك و دوو دوو و سێ سێ و چوار چوار دەمخستنە سەر شانم. ئەو شیلەیەی لێیانەوە دەچۆڕایەوە، کراسەکەمی دەسووتاند و پێستی جەستەمی دادەماڵی. لە سەر پلیکانەکان کە دەبوو بە قەڵەمبازێ تێپەڕین، میناکێکی کوڕی ئاغا کێشکی دەکێشا، بە چەرمێکی خووساو کە لوولی دابوو لە سەرمی رادەکێشا. ژانێکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام ئەو شتەی چەقۆی دەگەیاندە ئێسکت، شیلە تاڵ و چەسپۆکەکە بوو، کە بە شەویلاگە و روومەتی بنیادەمەوە دەنووسا و تا سەر ئێسك دەچووە خوارێ.

ـ دەی ببزوو حەیوان دەی.

زۆر بە دەگمەن ئەو پرسیارەم بە مێشکیدا دێ، کە ئاخۆ لەوەتەی لێرەم لە ماڵەوەمان چ قەوماوە.

شار زۆر لە گوندەکەمانەوە دوور نییە. بەو حاڵەشەوە کەس نایەتە سەردانم. تەنانەت خزم و کەسەکانی شاریشمان و بگرە میشۆی ئامۆزاشم کە لە قوتابخانەی هونەر دەیخوێند و دەیەویست ببێتە دارتاش.

قوتابخانە لەوبەری باخی گشتییەوەیە. ئەو منداڵانەی دەچنە ئەوێ، ئێمە هەر بە تەرسیش دانانێین. ئەوان جگە لەو پیشەیەی لە مامۆستاکانیانەوە فێری دەبن، دەرسی ئاساییش دەخوێنن.

یەکشەممە لای ئێوارێ ئیجازەم وەرگرتبوو دوو سەعاتێك بۆخۆم لە شاریدا بسووڕێمەوە. بەو کۆڵانانەدا کە چەوی درشتی نووك تیژیان لێ ڕۆ کردبوون و قاچە پێخواسەکانمیان شەلاڵی خوێن دەکرد، بە هەزار زەحمەت بەڕێدا دەڕۆیشتم. جا چونکە جلی زیادیشم نەبوو، هەر لە دوورەوە بۆگەنی مرداری دەباغخانەم لێ دەهات. سەیر تاسەباری ئەوەی بووم زیندەوەرێکم دەست بکەوێ و پریسکەی دڵمی بۆ بکەمەوە و متمانەی پێ بکەم. لە دەباغخانەکەی مۆتزاتۆ هیچ کەسێکی وای لێ نەبوو بتوانم لێی نزیك ببمەوە.

دیارە دۆبریکا تۆنسۆ دڵێکی باش و میهرەبانی هەبوو، بەڵام هەر ئەوەندە و بڕایەوە. لە داری ئەم دنیایە فکر و خەیاڵی هەر ئەوە بوو چەندی پێی دەکرێ زوو ببێ بە کرێکارێکی کارامە و چەندی بۆی دەلوێ گیرفانی بئاخنێ و خەونی بەوەوە دەدی دواتر خۆیشی ببێتە ئاغا و خاوەنکار:

ـ پاشەکەوت دەکەم. فلس فلس کۆی دەکەمەوە بۆ ئەوەی لە گوندەکەمان ماڵێك بکڕم. خانووەك و چەند بستێکی زەوی. تۆ نازانی دەباغخانەیەك لەو گوندەی ئێمە بکەیەوە چەندەت پارە گیر دەکەوێ... دەزانی؟ من تەنیا چەند شاگردێك دەگرم. لە گوند، دابینکردنی خواردن و شوێنی خەوی چەند کوڕیژگەیەك شتێکی وا نییە. لەبری ئەوە لە کاروباری مەزراشدا یارمەتیم دەدەن.

ـ جاروبارە تێشیان هەڵدەدەی؟

ـ ئێستا دەبینی لە چ دۆزەخێکدای؟ بنیادەم متمانەت پێ دەکا و ئینجا تۆ پێی دەوەڕی.

پاییز داهاتبوو، بە خوناوکە بارانی بێ پسانەوە.

شار، کە بە خانووە داپلۆساوە لێك دوورەکانییەوە گەیشتبووە بناری گردەکان و دەتگوت بووراوەتەوە.

ڕۆژ کورت بوون، خەفەتبار و شێدار.

کورتبوونی ڕۆژەکان بۆ ئێمە بایی پوولێك بوو، چونکە لەبەر چرای نەوتییش کاری خۆمان هەر دەکرد و ئاغاکەمان کە لە قڕنیسیدا هیچ لەچەرێکی ئەم دنیایە دەسکی لەدوو نەدەکرد، رایسپاردبوو پڵێتەی ئەوەندە خراپیان بۆ خستبووە سەر چراکان، کە تیشکە گوماناوی و دڕدۆنگەکانیان لە بوولێڵی بەیانیان دەچوو. چاوی بنیادەمی شەکەت دەکرد و تووشی ژانەسەری دەکردی.

ـ دۆبریکا چراکە بکووژێنەوە.

ـ دووکەڵ دەکا.

ـ ئەو هەمووە رووناکاییەت بۆ چییە؟ خۆ تۆ شت ناخوێنییەوە.

ـ نا، بەڵام چاوم ژان دەکا.

ـ نابێ چاوت بێشێ. چما ئێمە نابینی؟ راهاتووین و ئیدی چاومان نایەشێ.

ـ دیارە لە ماڵی خۆیان کارەبایان هەیە.

ـ ئێمە کارەبامان نییە هۆی.

لە پشت پارکەکەی نزیك وێستگەوە، کە زۆریش لە باخچەی ماڵەکەی گوندمان گەورەتر نییە و هەر هەمووی سێ داربەڕووی کرووزی تێدایە، چەند ساڵێك لەمەوبەر دەستیان کردبوو بە دروستکردنی گەڕەکێك، کە قەول وابوو ڕۆژگارێك ژەنراتۆری کارەبای تێدا دابنێن.

ـ ماتۆڕکارەباکان کە هێنران و دانران، شار بە تیشکی کارەبا رووناك دەبێتەوە.

ـ ئەی تا ئەودەم؟

ـ تا ئەودەمیش لەبەر فانۆس و مانگەشەو خوا گەورەیە.

فانۆس خۆ هەر دەست ناکەوێ و پتەپتێتی، بەڵام مانگەشەو... لە شاری بنیادەم نە کاتی وەی هەیە سەیری مانگەشەو بکا و نە تاقەتیشی هەیە. تا نیوەشەوێ لە کارگەین و بە کێردی دەمدرێژی تیژ پێست و کەوڵی مەڕ دادەماڵین، دواییش ماندوو و شەکەت و نیوەزیندوو پێڕا دێین. ئەگەر جارێکیش خوانەخواستە هەڵکەوێ ئێوارەیەك یان شەوێك بچینە گەڕان، لە بری سەیری ئاسمان دەبێ ئاگامان لە قاچ و قولمان بێ نەکەوینە نێو قووڵکە و جۆگەلە.

کە لە گۆڕەپانێکی بچووك و شەقامێك تێپەڕین و ناوەندی شار بەجێ بێڵین، رواڵەت و بیچمی شار بە گشتی دەگۆڕدرێ: دوای ئەوە باشتر وایە بڵێین چووینەتە نێو گوندێکی گەورەوە. حەوشەکانی بەرین و هەراون و خانووەکانی نەوین و لە نێوەڕاستی حەوشە یان لەوسەری حەوشەکەیان درەخت چەقێنراون. بەر دەرگای هەر ماڵێك کورسییەکی درێژووکەی لێیە.

ـ شارت پێ خۆشە داریە؟

ـ ئەرێوەڵا تۆنسۆ.

ـ من پێم خۆش نییە. دەڵێی لەسەر ئاگر دانیشتووم و هەر چاوم لەوەیە کە بگەڕێمەوە بالاچی و دووکانێك دابنێم.

ـ ئەوە باشییەکەی لەکوێیدایە بنیادەم خوا خوای بێ تەمەنی زوو تێپەڕێ؟

میناکێی کوڕی ئاغا کە لەگەڵ گۆگۆشۆریك لە گۆشەیەکی دیکەی کارگەکە کار دەکا، پێمان دەزانێ:

ـ ئەوە لەوێ چ ترەترێکتانە؟

ـ بۆخۆمان قسان دەکەین؟

ـ قسەی خۆتان دەکەن؟ ئەوە لە کەیەوە جرەجانەوەریش پێکەوە قسان دەکەن؟

زرته زەلام هەوساری قاقای ریاییکەرانەیان بەر دەدەن. دۆبریکاش پێدەکەنێ. کوڕەکەی ئاغا کە توانیویێتی سوعبەتێکی ئاوا قۆشمانە بکا، لە خۆشیان خەنی بووە.

دەمێکە خەریکین پێستەکان لە ژێرزەمینەوە دەبەینە عەمبار. ئێستا پلیکانێکی دیکەشە دەبێ پێیدا بچینە سەرێ. من جاری وایە هەڵدەنگووم و سەرەنگرێ دەبم، ناچار هەڵدەستمەوە کە دیسان وەسەر بکەومەوە. گۆگۆشۆریکی سمێڵ بابڕ جار نە جارێك جنێوێکی تەڕ و پاراوم لە پارسەنگی دەنێ.

ـ کوڕە هۆی شەلی گۆج، ئەوە تڕ و تۆپی تۆ کەی تەواو دەبێ؟

هەموو حەفتانە شەوانی یەکشەممە، گۆگۆ هەتیومەتیوەکان کۆ دەکاتەوە و دەڵێ: دەچینە لای سۆزانییەکان.

ئینجا هەمووان بەدوویدا دانگەڕێزە دەکەن.

کە دێنەوە، تا نیوەشەوێ لە باس و گێڕانەوە و لێکدانەوەی سەرکەوتنەکانیان نابنەوە:

ـ ئەو می مییە پارووەکی چەورە ها.

ـ بێدەنگ بە کەرە، تۆ چووزانی. ژیکا ئاوا لە دووریشەوە تاڵەموویەکی بۆگەنبووی سەدانی وا دێنێ. ژنی ئەفسەرێك بووە. لە کارەکەی خۆیدا وەستا و کارامەیە. جگە لەوانەش، بۆ هەموو کەسێکی شل ناکا.

ـ ئەی سافتا؟ دەتوانی چ عەیبێکی لێ بدۆزییەوە؟

ـ ئەو تەنگە زلەی خەرەوارێك دونگی پێوەیە؟

ـ راست بۆخۆیەتی. کە لە بوخارێست بووە، لە گەورەماڵێك کاری کردووە.

لە پشت ئەو ماڵانەوە کە وەك پشتوێنێك دەوری حەوشەکەی دەباغخانەیان داوە، کۆڵانێکی باریکی لێیە، هیچ پیادەڕێی نییە و بەردەچنیش نەکراوە، هەر دەڵێی کۆڵانەکانی لادێیە. خانووەکانی ئەمبەروئەوبەری نەوین. حەوشەکانی باریك و درێژن و تەنانەت یەك تاقە درەختیشیان تێدا نییە کە

هاوینانە تۆزە سێبەرێك بخەنە سەر خاك بریقەدارەکەی و پاییزانیش کە بارانی بێ پسانەوە دادەکا، باڵێك بەسەر گۆل و هەسێڵە پڕ قەوزەکاندا بکێشن. ئەوە راستەڕێی پێستەدرووەکانە.

لە هەر کام لەو خانووانەدا، کە هێندە نەوی و بچووکن بنیادەم هەر بە گاگۆلکێ دەتوانێ تێیاندا بێ و بچێ ـ لە ژوورە قوتووە شەمچەییەکاندا، پێستدرووەکان لەسەر تەختی چێوین خەریکی کارن. ئاغا لەو نێوەڕاستەوە لەسەر ئەژنۆی دانیشتووە و کرێکار لە دەوری لەسەر عەرزەکە دانیشتوون. تەنانەت تەختەیەکیشیان لەبن نییە. تەنیا گڵە هاڕدراوەکە هەیە و هیچی دی. گڵەسوورە. لە سەرووشییەوە، لەسەر لەتکەحەسیرێك، شاگردەکان سەرقاڵی ئیشن.

هاوینان بارودۆخەکە زۆریش خراپ نییە. زەوی کە فێنکە، تۆزێك لە گەرمای تەمووز کەم دەکاتەوە. بەڵام زستانان وەزعەکە تاقەتبڕە: دیوارەکان باریکن و سەرما ناگێڕنەوە. سەرما لە بن دارەکانەوە دەخزێتە ژوورەوە و دەست و پێ و نێوقەدی بنیادەم دەیبەستێ. بنیادەم سەرتاپێی سڕ دەبێ، بەڵام دەبێ کار بکەی، دەبێ کار بکەی و کرێکاریش کار دەکەن.

منداڵە پێستدروو، کەمتر لە ئێمەی دەباغ بۆگەنیان لێ دێ. ئەو پێستەی دێتە بەردەستی ئەوان، ئیتر وشکە و هەر ئەوەندەی بە تۆزێك توێکڵی دانەوێڵە و گەنمەشامی مشتوماڵی بدەن، بۆنی دەباغییەکەی نامێنێ. ئەوجار، ئەو پێستەی ئاوا دامالدرێ، ئیتر سپییش دەبێتەوە و نەرمیی هەوریشمەکەی بنیادەم باش باش گەرم دەکاتەوە. سەرەڕای ئەوەش ئەم منداڵە پێستدرووانەش وەك ئێمەی شاگرد دەباغ زەردەڵە و ریوەڵەن. لە سەرەتای پاییزەوە پەنجەرە بزمارکوت دەکرێن و تا بەهاری ساڵی دادێ نایانکەنەوە. جا خۆ بشکرێنەوە هەوای تازە هەر نایەتە ژوورێ، بگرە لەو داڵانەدا هەوای تازە هەر نییە. خانووەکان وەك بڵێی هەمووی بەسەر یەکەوەن. ئەو خانووانەی هەموو لێك دەچن. تەپ و نەوی و داپڵۆسراو. ئەو خانووانەی کە دەڵێی خێزانەکان تێیاندا بەسەر یەکدا کەوتوون.

خەڵكێك كە بەردەوام پێستەیەكیان لەسەر رانە. پێستی مەڕێك كە، چاكەت و سەڵتە و كڵاوی پاپاغی لێ دەدروون.

هاوین و زستان بۆنی هەڕنەهووت و ترشاوێكی خەست لەم لایەوە هەڵدەستێ و، رەوە رەوە مێشوولە لەسەر گۆلاو و زۆنگەكان دەخولێنەوە. لە هەموو شوێنێك وەك ماڵەكەی خاڵەگیان تۆنێ، بیری ئاودەستەكە لە بن پەنجەرەی ژوورەكانەوەیە و بیری ئاوەكەش هەنگاوێك لەولاترییەوە.

بنیادەم نازانێ بۆگەنی كامەیان پترە. كەپرە دارینەی ئەو ئاودەستەی ئاغا و كرێكار و شاگرد چەرمدروو دەچنە ژوورێ و لێی دێنەوە دەرێ، یان ئەو ئاوەی دەخورێتەوە. ئەو كۆڵانە، هەموو ئەو گەڕەكە بۆنی شێ و بۆگەنی هەڕنەهووتی لێ دێ. ئێمە خۆشمان لەگەڵ ئەو بۆگەنەی بە جلوبەرگ و سەڵتە و سی و گیانمانەوە نووساوە، راهاتووین. یەكشەممۆیان كە دەچین پیاسەیەكی بكەین، شاگردی دووكانانن خۆمان لێ لادەدەن و دەڵێن:

ـ پف پف، بۆگەنی دەباغیتان لێ دێ.

شاگردی دووكانان زۆر كەیفیان بە شاگردی چەرمدروو نایە. پێیان دەڵێن:

ـ تیەح، چ بۆن پەزێكتان لێ دێ، بڕۆن ملتان ورد بێ.

هەینیان كە رۆژی بازاڕی حەفتانەیە، گوندی پۆل پۆل بە كۆڵانەكاندا دەگەڕێن. ئەو شتە چەرمییانەیان لەبەردایە كە لە دووكانەكەی ئێمە لە كۆڵانی دەباغان كڕیویانە. چەرمی كەوا و سەڵتەیان دەوێ و لەسەر فلسێك سەعاتێك چەنە لێ دەدەن، سەد رەحمەت بەو كاتەی دەیانەوێ جووتێك گا بكڕن یان بفرۆشن.

چەرم جۆری جیاوازی هەیە. جۆرێكیان زۆر سادەیە و تەنیا سەر قۆڵەكانی بە قەیتانێكی رەش دووراوە. جۆرێكیان زۆر درێژە و نێوقەدی تەسك و تەشك و داوێنی فشوفۆڵە و لە عەرزی دەكشێ. ئەو جۆرەیان، دروومانی سوور و كەسك و شینی هەیە. تەنیا ئەو گوندییانەی زەوی و زاریان زۆرە،

دەستیان دەڕوا و دەتوانن سەری توورەکەی بۆ بکەنەوە و پێنج "لەی"یی لە مستی وەستای چەرمدروو بنێن، بۆ ئەوەی چەرمینەیەکی ئاوایان بۆ بدوورێ و بە دەزووی رەنگاوڕەنگ ئەو نەخشونیگارانەیان بۆ بچنێ.

دۆبریکا تۆنسو رۆژ لەگەڵ رۆژ ئاگری تاسەی بۆ دەوڵەمەندبوون بلێسە دەستێنێ. پێم دەڵێ:

ـ کە جوان و زەریف فێری دەباغی بووم، ماوەیەکیش دەچمە لای چەرمدرووەکان و دەبمە شاگردیان. خۆ دەزانی دەمەوێ چ بکەم؟ بەو فێڵە لە بالاچی دەتوانم کارگەیەکی چەرمدوورینیش لە تەنیشت دووکانی دەباغییەکەم بکەمەوە. یەك دوو وەستاکاریش لە شار وەدووی خۆم دەدەم و دەیانبەم با کارم بۆ بکەن. ئەو کات جا وەرە و بزانە چ پارە و پووڵێك کۆ دەکەمەوە.

ـ دەی باشە، کە پارە و پووڵت کۆ کردەوە، چ دەکەی؟

ـ چ دەکەم؟ حەی... ئەوجار ژن دێنم. ئەویش کچۆڵەیەك کە دنیایەکی زەوی و زار هەبێ.

ـ ئەی دوای ئەوە؟

ـ دوای ئەوە حەز دەکەم تۆ ملت بشکێ و تەپوتۆزیشت نەمێنێ.

زۆرجاران درەنگانی شەو و تەنانەت جاری وایە نیوەڕۆیانیش فیلۆف تێیام بیر دەکەوێتەوە کە دایك و باوکی بردوویانەتە تۆرنۆ و بە کارەکەر داویانەتە قازییەك.

فیلۆفی بەستەزمان لە پێشدا قایل نەببوو، بەڵام کە باوکی چەند چەپۆکی پێدادابوو، ئاقڵ ببوو و ئێستا ئەوە کارەکەرە. نازانم چۆنە و چ هەستێکی هەیە. تەنانەت نازانم ئاغاکەی ئاخۆ بنیادەمێکی باشە یان کەسێکی خراپ و خەمسارد. ئەوەی تا ئێستا لە ژیان بۆم روون بۆتەوە، ئەوەیە کە لەم دنیایەدا ئاغای چاك و خراپ هەر نییە. ئاغا ئاغایە. هەر ئەوەندە و تەواو. بنیادەم وەك کۆیلە کاری

بۆ دەکا و لە بری ئەوە وەك سەگ تێهەڵدانی لێ وەردەگرێ. قەتیش نابێ بپرسی بۆچی، چونکە هەر پرسیار بکەی، دیسان وەبەر شەقان دەدرێی.

نازانم فیلۆف وەزعی چۆنە، بەڵام لەوەتەی کەوتوومەتە ئێرە، بەچاوی خۆم دەبینم وەزعی قەرەواش و کارەکەری مۆتزاتۆ ئاغا و باقی ئاغاکانی گەڕەکیش چۆنە.

قەرەواشەکەی ئاغای ئێمە ناوی ماریت زایە. کچە شارییە و تەمەنی ئەوپەڕەکەی چل ساڵانە.

جلشۆری دەکا. هەم بۆ ئاغاکەی ئێمە و هەمیش جلەکانی ئێمە. پینەکردنەوەش هەر لە ئەستۆی ئەوە. کەڕەی بەیانی بۆ کڕینی حەوجێیی ماڵێ وەدووی قوونی ئاغا دەکەوێ بۆ بازاڕ. ئاغا شت دەکڕێ و پووڵەکەی دەدا و ماریتزاش دەبێ بیانهێنێتەوە ماڵێ. لەگەڵ چەند سەلکە پیاز و لوێچێ فاسۆلیا و تۆزێك دونگ یان تۆسقاڵێك رۆن، کە دەبێ هەمووانی پێ بەرێ بکا. ئاخر لەم دنیایە کەس نییە هێندەی مۆتزاتۆ ئاغا لەچەر و گووخۆر بێ.

تاماوی فاسۆلیا برسێتی ناشکێنێ و بەری دڵ ناگرێ و زرتە زەلام دەیکەنە هەرا. دەی باشە، شانەکە لەسەری ماریتزای داماودا دەشکێ: ئەو دەستە بەبڕین چووانەی هەر بەرەکەتیان پێوە نییە هیچ، دەستاوەکەی ناخۆشە هیچ، جا وەرە تا ورگیشی هەڵدەگرێ دەخوا.

ماریتزا بەردەوام هەر جارە و لەسەر شتێك تاوانبار دەکرێ.

جگە لە چێشتلێنەری و حەوشەماڵین و شووشتنەوەی دووکانەکەش کە گوندی قوڕ و لیتەی ئەو دەشتە بە کالەکانیانەوە دێنن، هەمووی لە ئەستۆی ماریتزایە.

ژوورەکەی ماریتزا بە تەنیشت ژووری ئێمەوەیە، ژوورەکەی ئاغا بەسەر هەردووکیانەوەیە و بەرزترە، کە دەبێ بە پلیکانێکی دەرەوەدا بۆی بچی.

تەختی خەوەکەی میناکێی کوڕی ئاغا لە بنەبانی دووکانێیە.

مۆتزاتۆ ئاغا ژنەکەی مردووە و ئیدی ژنی نەهێناوەتەوە. کە بیر ڕۆژانی لاوێتیی دەکەوێتەوە، بانگی ماریت زا دەکا، بەڵام زۆری مەحتەل ناکا. ماریتزا لە پلیکانەکان دێتە خوارێ و دەچێتەوە ژوورەکەی و پرخەپرخی ڕۆژە ڕێیەك دەڕوا. ئەوجار بەیانی پێش هەموان لەحەو هەڵدەستێ و چەقەنە لێ دەدا و ورینگەی دێ. ئەو گۆرانییەی دەیڵێ، بەستەیەکی لای خۆمانە:

وامەکە وامەکە میشۆ گیان

هێور بەرەوە بە قوربان

دەستت لابەرە ئازیزم

مەمقورینجێنە بە پەنجان

ـ چییە ماریتزا، تێی دەچریکێنی.

ـ ئەی دەتەویست شین بگێڕم و دوژمن بەخۆم خۆش بکەم؟ زۆرم حەز لە گۆرانیگوتنە. بنیادەم دەبێ هەر ورینگەی بێ.

کاتێ کەیفی نییە، رقی لە دار و بەردە. هەر جارێکی ئاغا لێی تووڕە دەبێ، وەبیری دێتەوە کە بێکەس و بێدەرە و لەم دنیایە کەسی نییە. جا وەرە تێی دەچریکێنێ و یەکێك لەو لاوکە پڕ لەخەمانە دەڵێتەوە.

لە دالآنەکە، کە دیوارەکەی لە شێداری زگی داوە و توێ توێ بووە، لە نێو کۆلێکی گەورەی دارین کە هێندەیان جل تێدا شوشتووە دیوارەکانی سواون، جلوبەرگی کرێکارەکان هەڵدەپشێوێ و لەبەر خۆیەوە گۆرانی دەڵێ:

کچۆڵەی بەختەوەر بەو کیژە ئێژن
کە تا دەمرێ کچێنییەکەی بمێنێ
کوڕیش ئەویانە خۆشبەختە لە دنیا
بە ساوایی بڕوات و لێی نەمێنێ

یانی تەنیا کوڕێك بەختەوەرە کە بە منداڵی بمرێ. هەی سڵاو لەو بەخت و شانسە.
ئالکسیی برام کە مرد هەر وا چەند حەفتەیەك بوو لەوانەشە چەند مانگێك بوو کە لەدایك ببوو. جوان لەبیرم نییە. تەنیا دایکم لە بیرێتی لە سەعات و رۆژ و مانگێکدا مرد. کە ئالکسی لەدایك دەبێ، ئازار تا مۆخی ئێسقانی دەکشێ. کە دیتی سارد بۆتەوە و هەناسەی لێ بڕاوە و مۆمێك لەسەر بێشکەکەی دەگرێ، ژان هەموو گیان و دڵی تەنی.
دایکم قەت دەستێکی بە رەحمەتمان بەسەردا ناهێنێ، تەنانەت کە نەخۆشیشین. تەنیا نێوچاوانی تێك دەنێ و رەش هەڵدەگەڕێ. هەر ئەوەندە. بەڵام بێت و یەکێك پێمان بڵێ پشتی چاوتان برۆیە، یان یەکێك دەستمان لێ هەڵێنێتەوە، وەك شێری مێ دەردەپەڕێ و ئامبازی دەبێ بۆ ئەوەی لەتوپەتی بکا. ئەگەر "با" هەواڵی ئەوەی بۆ دایك و باوکم

بردیایە کە ئاغا و گۆگۆ شۆریك ئاوا بە مست و شەق و پێلەقان خوریشۆریان کردووم، بابم دەستی دەدایە شەنەکە و دایکیشم تێلاکەی کەرسەکشکاندنی هەڵدەگرت و ئەو زرتە زەلامانەیان بۆ بابیان ئاقڵ دەکرد. هەر هەموویان دەکوشتن. ئاخر بۆیە من بێدەنگەی لێ دەکەم و لە هیچ کوێ باسی ئەو مەسەلەیە ناکەم.

ئالکسێی برام چ لە ژیان تێگەیی؟ بەر لەوەی فام بکاتەوە و بزانێ خۆرەتاو چەندە جوانە و پێش ئەوەی گڕوگاڵ بکا و وەك کۆترێك گمەگم بکا، چاوی لێك نان.

ـ پووره ماریتزا، ئەوە کوێی بەخت و شانسە پیاو بە منداڵی بمرێ؟

ـ کوا من وام گوتووه؟ گۆرانییەکە وا دەڵێ. دەی دیاره گۆرانییەکەش کابرایەك لە خۆیەوە هۆنیوێتەوە کە بلێی و نەلێی چەقۆی گەیشتووەتە ئێسقانی. ئاخر خەم و پەژاره و نەداری جاری وایە بنیادەم لە ژیان بێزار دەکا. وا لە بنیادەم دەکا خواخوایەتی ئیزراییلی لەسەر بکا و گیانی بکێشێ. حەز دەکا دەست لەو ژیانە بشوا، بەڵام ژیان دەستی لێ بەرنادا. هەرچۆنێك بێ، بنیادەم باشترە لە سەر زەوی بێ نەك لە بن گڵ. هەر کەسە و عومرێکی پێ براوە. بنیادەم کە مرد، ئیدی تێر دڵی خۆی دەخەوێ.

ئاغا لە پڕ نەخۆش کەوتووه و لە جێ کەوتووه. لە نهۆمی سەرەوەیە و بەردەوام بەدەم ئازارەوە خۆی گرمۆڵە دەکا. یەکپشوو هاواری دێ و دەناڵێنێ و جنێو دەدا. بەوە نارەحەت نییە کە نەخۆشە و کەوتووه، لەوە تووڕەیە کە ناتوانێ خۆی لە پشت دەخیلەی دووکانەکەی دانیشێ. ئاخر متمانەی بە بەشەری خوای نییە، تەنانەت بە میناکێی براشی. دەترسێ حیسابەکانی لێ تێك بدا و پاشقولی بدا.

گوندی دێن و داوای پێستەکانیان دەکەنەوە کە دایانناوە بۆیان دەباغی بکەین. دەچنە باڵەخانەکە بۆ لای ئاغا. ئاغا پاڵتۆیەکی ئەستووری ـ کە تەنیا رۆژانی کرێوە و بارِن لەبەری دەکا ـ بەسەری شانی دا دەدا و لەسەر جێوبانەکەی دادەنیشێ و پاڵ بە دیوارەکەوە دەدا و گوندییەکان بەخێرهاتن دەکا. ئینجا دەیاندوێنێ. دەناڵێنێ. جنێو بە نامووسی عەرش و قورش دەدا. پووڵەکانیان لێ دەستێنێ و لە گیرفانی دەئاخنێ و بە گۆگۆ دەڵێ:

ـ چەرم و پێستەکانیان بدەیە.

لەوەتەی نەخۆش کەوتووە و ناتوانێ بێتە خوارێ، دنیا بە کەیفی گونی ئێمەیە و چۆنی پێمان خۆشە وا دەکەین. کەمتر کار دەکەین و زیاتر خەریکی کیرەخۆڵەین. ئەو هەتیوانە ئێوارانە هەر ئارخەیان دەبن کە ئیتر کەس ئاگای لێیان نییە، کلکیان لە نەرِەی پشتیان دەنێن و دەچنە نێوشاری بۆ رابواردن.

دۆبریکا تۆنسو دێتە بن پیلم:

ـ ئەمرِۆ شتێکی زۆر خۆشم کرد.

ـ چیت کرد؟

ـ پێت ناڵێم.

ـ دەی خۆ خەریك بوو باسی بکەی.

ـ هەر گوتم کارێکی خۆشم کردووە، خۆ نەمگوت چ بووە.

ـ دەی ئاخری؟

ـ چوار "لەی"ییم پاشقول داوە.

ـ رایانگرە، خێریان لێ ببینی.

ـ کوڕە ئەوە دەڵێی چی، هیچ بەتەمای راگرتنیان نیم. ئەمڕۆ سبەینێیە هاکا دیت ئاغا قوت بۆوە و هاتە خوارێ و، ئینجا یەکێك لەو هەتیوانە لە زاری دەربچێ و پێی بڵێ من پووڵم هەیە، ئەودەم کونی قوونیشم دەگەڕێ و دەیدۆزێتەوە. جا وەرە ئەمجارە بەرۆکم دەگرێ و تێم هەڵدەپێچێ کە ئەوەم لە کوێ پەیدا کردووە. ئینجا ئەوەندەم عەزیەت دەدا تا دەیدرکێنم. کە وەقسەش هاتم، ئیتر خوا بزانێ چیم بەسەر دێنێ. ئەوەندەم تێهەڵدەدا ئەوەی خواردوومە بیهێنمەوە... دەی باشە. کەواتە باشترین کار ئەوەیە ئەمشەو پێکەوە فیزماڵکێکی بدەینێ و بڕۆین خەرجی بکەین.

قسەی تێدا نییە: ئەگەر دۆبریکا ئەو پارەیەی لە کەس نەدزیبێ، دیارە لە کۆڵانێ دۆزیویێتەوە. ئاخر ئەگەر بە ئارەقەی نێوچەوانی پەیدای کردبایە، چۆن وا سووك و ئاسان لە ورگی دەکرد؟

ـ چوار لەیی پارەیە ها. چۆن خەرجی دەکەی؟ خۆ من مەشروبخۆرەوە نیم.

ـ منیش نیم. ئەوپەڕەکەی پەرداخی ئارەق پێدا بکەم... ئەرێ بۆ تێناگەی. چوار لەییم پارە هەیە و دەمەوێ پێکەوە بیخۆین.

ـ یانی هەر ئێستا؟ بە شەو؟

ـ هەر ئەم شەو.

ـ چ دەکا؟

ـ جا دەبینی. لەگەڵم وەرە و کارت نەبێ.

ـ بۆ کویّ؟

ـ وەدووم کەوە تێدەگەی.

دەست و دەموچاوم دەشۆم. وەدووی قوونی دۆبریکاکەوتن هیچ خێرێکی بۆ من پێوە نییە، بەڵام نەمویست قسەی بشکێنم. ئەوە چەند حەفتەیە یەك لاپەڕەشم کتێب نەخوێندووەتەوە. دڵم هێند توندە خەریکە دەمرم. هەمیشە وایە بنیادەم کە بەردەوام کارێك دووبارە دەکاتەوە، ئەویش کارێك کە هیچ خۆشییەکی تێدا نییە و بە ناقایلییەوە دەیکا، تەنیا بۆ ئەوەی پارووە نانێکی بدەنیّ و زگی تێر بیّ، وەزعەکە هەر وایە. ئێستا لێم روون بۆتەوە دەبیّ چ بکەم: زۆر لەم دەباغخانەیە نامێنمەوە. ئەوپەڕەکەی تا بەهاریّ. لەگەڵ ئاغا قەول و گرێبەستێکی چوار ساڵەم بەستبوو، کە ناچاری دەکردم وەك شاگرد کاری بۆ بکەم و ئەویش جگە لە نانەزگی و شوێنی حەوانەوەم، کاریشم فێر بکا. ئێستا ئیدی فێری کارەکەم بووم. شتێکی زۆر زەحمەت نەبوو. ئێستا دەباغیکردن و خۆشەکردنی پێستەی مەڕم پیّ ئاوخواردنەوەیە. تەنانەت پێستی مانگاش. کەوابوو لێرە دەڕۆم و دەچمە شوێنێکی دی کار دەدۆزمەوە. بەڵام کارێکی وا نا، کە لە کەڕەی بەیانییەوە تا بانگی شێوان خەریکی پێستی بۆگەن بم. پاییز کە داهات هەوڵ دەدەم لە قوتابخانەیەك ناوی خۆم بنووسم و وەشوێن خوێندنیّ بکەوم. لەوەتەی لێرە دەستم کردووە بە کار هەست دەکەم مێشك و زەینم کوێر دەبنەوە. هەست دەکەم گێژ و وڕ بوومە. نابیّ وام بەسەر بیّ، بەهیچ نرخێك.

دەست و دەموچاوم دەشۆم، زۆرم حەز لیّ بوو توانیبام جلەکانم بگۆڕم، بەڵام هیچی دیکەم نییە لەبەرمی بکەم. سەیرێکی سەرتاپێی خۆم دەکەم و پەژارەیەکی قورس دامدەگریّ.

دۆبریکا دڵم دەداتەوە:

ـ ئەوە چییە بۆ ئاوا سەیری خۆت دەکەی؟ خۆ ناچیتە ژن مارەکردن. ئەم دنیایە لە تۆ قوونڕووتری زۆر تێدایە.

بە پێدزە دەچینە دەرێ.

دۆبریکا دەڵێ : وەدووم کەوە.

بەرەو ئەوسەری بنبەستەکە دەڕوا. بەفرێکی زۆر کەوتووە، بەڵام هێشتا نەبووەتە بەستەڵەك. بەفرەکە لە بن پێی بنیادەمدا دەتوێتەوە. فانۆس لێرە و لەوێ کۆڵانەکەیان تۆزێك رووناك کردووەتەوە. لەو سەری بنبەستەکەو، لەسەر دەرگایەکی شڕ و شەوێق کۆنە فانۆسێك داگیرساوە.

دەبێ دەوروبەری سەعات حەوت بێ. سبەی شەو نۆئێلە. ئێستا لە ناوەنی شار کۆڵان دەبێ پڕ بێ لە حەشامات و جووڵە و هاتوچۆ. ئێرە سریوەیەکیشی لێ نایە، کپ و بێدەنگە.

وا دیارە دۆبریکا رێیەکە باش شارەزایە:

دەرگا داتەپیوەکە وا بە جیڕ و تەقەتەق دەخاتە سەر پشت، وەك بڵێی ماڵی پوورێتی. راستەوڕێ دەچێتە ئەوسەری حەوشەکە. ئێستا ئیتر وردە وردە لێم روون دەبێتەوە مەسەلە چییە. دڵم وەك باڵی چۆلەکە فڕەی دێ. دەڵێی یەکێك گرتوویەتی و دەیگوشێ. دەستم تۆزێك دەلەرزن. بەو حاڵەشەوە وەدووی دۆبریکا دەکەوم.

*

*



له خانووه‌که‌ی ئه‌وسه‌ری حه‌وشه‌که‌دا، که‌ هه‌ر وه‌ك خانووه‌كانی ئه‌مبه‌روئه‌وبه‌ری کۆڵانی چه‌رمدرووه‌کانه‌، ده‌ڵێی به‌زم و ره‌زمێکی گه‌رمه‌. که‌س گۆرانی ناچڕێ به‌ڵام زه‌نازه‌نا و قریوه‌یه‌ و تریقه‌ی قاقا و پێکه‌نین.

دۆبریکا ده‌رگاکه‌ ده‌خاته‌ سه‌ر پشت. چونکه‌ منیش به‌دوویه‌وه‌م، پێکه‌وه‌ وه‌ژوور ده‌که‌وین و ده‌رگاکه‌ به‌دواماندا پێوه‌ ده‌درێ.

باشه‌ ئه‌و خانووه‌ بۆچی له‌به‌ر چاوم وا بچووك دیار بوو؟ خۆ ئه‌وه‌نده‌ش بچووك نییه‌.

له‌ به‌ر ده‌رگا راده‌وه‌ستین.

ژووره‌که‌ پان و به‌رینه‌. عه‌رزه‌که‌ی به‌ ته‌خته‌دار داپۆشراوه‌. له‌ گۆشه‌یه‌که‌وه‌ پیانۆیه‌کیان داناوه‌ و له‌ گۆشه‌که‌ی دیکه‌وه‌ مێزێك. دواییش مێزێکی له‌ویان گه‌وره‌تر. له‌ ده‌م دیواره‌کانه‌وه‌ جێیان بۆ دانیشتن دروست کردووه‌. له‌ پشت مێزه‌ بچووکه‌که‌وه‌ کوڕێژگه‌یه‌ك دانیشتووه‌ که‌ له‌ ته‌مه‌نی مندایه‌ و سه‌ری له‌ کتێبێکدایه‌. جاروبار واز له‌ خوێندنه‌وه‌ دێنێ و له‌ ده‌فته‌رێکدا شتێك ده‌نووسێ و دیسان ده‌چێته‌وه‌ سه‌ر خوێندنه‌وه‌که‌ی. دواتر سه‌ری هه‌ڵدێنێ و له‌ حاڵێکدا لێوی ده‌جووڵێنێ، تۆزێك بیر ده‌کاته‌وه‌. له‌وانه‌یه‌ ده‌رسه‌که‌ی ده‌ور بکاته‌وه‌. له‌وانه‌یه‌ خۆی بۆ ئیمتیحانێك شتێك ئاماده‌ بکا.

کچۆڵه‌یه‌ك خه‌ریکی پیانۆژه‌نینه‌. قژی درێژ و کاڵن، رێك وه‌ك قژی دایکم. چاویشی شین شینن هه‌ر وه‌ك چاوه‌كانی دایکم. په‌نجه‌ی به‌سه‌ر کلیلی پیانۆکه‌دا ده‌خزن. پیاوێکی سمێڵ بابڕ، که‌ کڵاوه‌ ره‌نگاوڕه‌نگه‌که‌ی به‌ ته‌پڵی سه‌ریه‌وه‌ ناوه‌، له‌ سه‌ر کورسییه‌کی خڕی بێ

پالْپشت لە بن پیلی کچە دانیشتووە و کورسیەکانی دیکەی دەوری مێزە گەورەکە و دەم دیوارەکانیش کچی دیکەیان لەسەر دانیشتوون.

چەند پیاوێکیش لە تەلارەکەدا چاوەڕوانن. هەندێکیان بەتەمەنترن و هەندێکیشیان کەمتەمەنتر.

بەردەستەکەی خاتوونی سەرۆك دێتە لامان:

ـ سڵاو سالۆمیا.

ـ سڵاو تۆسۆن، ئەی ئەوە کێیە؟

ـ یەکێکە لە کوڕەکانی خۆمان.

ـ لەوانەی ژنیان نەدیتووە؟

ـ بەڵێ ڕێك لەو ژن نەدیتووانەیە.

ـ دەی باشە دانیشن.

سالۆمیا وەك ئاغا میوانداریمان دەکا. دادەنیشین. خۆم کۆ دەکەمەوە. لەسەر کورسییەکەم چەندی پێم دەکرێ خۆم ڕێك دەخەم. ئەگەر واز لەو جووڵەجووڵە نەهێنم، سەڵتە پینەکراوەکەم هەموو سپی دەبێ، چونکە قسڵاویان لە دیوارەکان هەڵسویوە. شەوی بەر لە نۆئێلە ئیتر. خەڵك هەموو ماڵەکانیان بۆ جێژن ڕەنگ دەکەنەوە، دەی ئەم ماڵەش قسڵاویان تێ هەڵسویوە. بەڵام بەس لە ناوەوە.

سالۆمیا ژنێکی قەڵەوەی تەنگەزلی قژ خورماییە و کراسێکی درێژی لەبەرە، کە تەشك و داوێنەکەی عەرزی ژوورەکە دەماڵێ.

تۆنسۆ دەڵێ:

ـ جارێ تا کاتت هەیە شتێکمان بدەیە بیخەینە بەر دڵمان پوورە سالۆمیا.

ـ ئێستا قاوەتان دەدەمێ رۆڵەکانم.

چراتۆرێك لەسەر یەکێك لە مێزەکان داگرساوە. سالۆمیان خەریکی قاوە دروستکردنە. من تا ئێستا قاوەم وەلێوی نەکەوتووە. کەواتە ئێستا دەتوانم چێشکەی بکەم.

دەرگای حەوشە دەکرێتەوە. دەرگای ژوورەکە دەکرێتەوە. ژوورەکە لە ئاستی حەوشەکە نزمترە.

قەشەیەك، قەشەیەکی پیر کە ئیزراییل لەم قوژبن و کاژێرانەدا لەبیری چووە، بە شەلەشەل و لەقەلەق بە دوو پلیکانەکەدا دێتە خوارێ. دەڵێی خۆرکە لە ردێنی داوە. ردێنی دەبێ سەردەمانێك رەش بووبێ، دوایی سپی بووە و ئێستاش زەرد هەڵگەڕاوە وەك زەرداوێك کە نیشانەی بۆگەنبوونە. عاباکەی کە هەموو قوڕاوی بووە، بەر پێیانی دەماڵێ. دەستی دەلەرزن. هەر ئەو دەستانەی کە بە یەکێکیان خاچەکەی راگرتووە و بە یەکێکیشیان گولاوەکە. شەوانی نۆئێل وا باوە کە قەشە وەرێ دەکەوێ و ماڵەو ماڵ دەگەڕێن و ئاوی نزا بە ئیمانداراندا دەپرژێنن. وایلۆکبێژەکەی کلێسا نیو هەنگاوێك لە دواوەی قەشەوە دێ و سەتڵی ئاوی نزاکە لەگەڵ خۆی دێنێ. قەشە بەو دەنگە گن و منگنەی خوا دایناوە تەڵقینی پێ دابدەی، دەست دەکا بە پاڕانەوە و نزا. پیانۆکە بێدەنگ دەبێ. کچەکان وەك چۆنن، هەر وا دەوری قەشەکە دەدەن تا ئاوی نزایان پێ هەڵپرژێنێ و، لە پێشدا دەستی و دواییش خاچەکەی ماچ دەکەن. دوای هەموو ئەو شتانە، قەشە ئاوی نزاکە بەسەر چوار گۆشەکەی

تەلارەکە و ئەو کوڕێژگەیەشدا دەپڕیشکێنێ کە لە پشت مێزەکە دانیشتووە و خەریکی دەورەکردنەوەیە. منیش بڵێی و نەڵێی لەو پریشکانەی بێبەش نابم. دواییش دەست و خاچەکەی دێنێتە پێشێ کە ماچی بکەم. دەی، کەس بە جارێك ماچکردنی نەمردووە. پێم وابێ دۆبریکا منی بۆ ئەو شتە نەهێنابووە ئێرە.

سالۆمیا جزدانێکی بچووك لە ملیوانی گۆرەوییەکەی دەردێنێ و دەستی تێ دەگێڕێ و دە لەیی وردەپووڵ دەردێنێ و لەسەر لەپی دەستی دەیژمێرێ و، ئاخرییەکە وەك چۆن باوە، باوا لە سەتڵی نزاکەیان دەکا.

چاوی قەشە نزیکبینن. دادێتەوە و سەیری نێو سەتڵەکە دەکا. وایلۆکبێژ سەتڵەکەی بۆ هەڵدێنێ و لە بەر دەم و قەپۆزی رایدەگرێ. قەشە بە دەنگێکەوە کە وەك لە گۆڕیچەوە بێتە دەرێ، بە دەنگێك کە دەڵێی خەم و پەژارە خواردوویانە، کوێرەمشکان جویویانە، بە دەنگێك کە لە دەنگی رۆح و تارماییان دەچێ، دەپرسێ:

ـ چەند لەییت خستە سەتڵەکەوە سالۆمیا؟

ـ دە لەیی باوکە گیان، زیاترم نەبوو.

ـ هەر ئەوەندە سالۆمیا؟ پێم وابوو هەر نەبێ سکەیەکی بیست لەییی تێ دەخەی.

ـ بمبوورە باوکە، خاتوون چووەتە دەرێ. چووەتە شتکڕین و خۆت دەبینی هێشتا نەهاتووەتەوە. هەرچی کچەکان لە ئێوارەوە تا ئێستا پەیدایان کردبوو، ئەوە دام بە ئێوە ئیتر.

ردێنی قەشە دەست دەکا بە لەرینەوە. دەموچاویشی هەروەتر. لێوێشی. دەهری بووە:

ـ ئەی بە قوربانی خوای بم. بە قوربانی خوای هەمووتان بم. من قەشەیەکی پیر و کەنفت، بەو درەنگانی شەوە هەڵدەستم دێم بۆتان دەپاڕێمەوە و متفەڕکتان دەکەم، ئینجا ئێوە وەك سەدەقە و خێرم پێ بکەن، دە لەییم بۆ لە باولەکە داوێن ها؟ شەرم ناتانگرێ؟ شەرم ناکەن؟ گۆرەوییەکانت بگەڕێ گەندوگوو. گۆرەوییەکانت بگەڕێ و بیکە بیست لەیی، ئەگینا شەیتان دێ و مشووری هەمووتان دەخوا. تێگەیشتی یان نا؟

ـ ئاخر باوکە گیان، ئیتر تەنانەت یەك فلسیشم پێ نییە. خوا رووم رەش بکا ئەگەر درۆم کردبێ. خۆ گوتم: هەموو داهاتی کچەکان لە ئێوارەوە تا ئێستا هەر ئەوەندە بوو. ئەگەر تۆزێك درەنگتر هاتبای، دیسان شتێك دەکرا، چونکە جارێ ئەوە چەند کڕیارێك لەگەڵ کچەکان رۆیشتوون. ئەگەر حەز دەکەی تۆزێك دانیشە و راوەستە تا دێنە دەرێ.

ـ زۆر باشە کچی باش. زۆر باشە، رادەوەستم.

قەشە لە سەر یەکێك لە کورسیە درێژەکانی دەم دیوارەکە دادەنیشێ. وایلۆکبێژەکەش دادەنیشێ. سالۆمیا قاوەیەك بۆ من و یەکی بۆ دۆبریکا دروست کردبوو. لەسەر دڵمان دەبێ بە گرێ، لەبەر ئەوەی کە قاوەکە دێنێ، لە پێش قەشە و وایلۆکبێژەکەی دادەنێ و ئەوجار دێتە بن گوێمان:

ـ راوەستن. ئەو پیرە کەرە بڕوا و جەهەننەم پڕ بکا، قاوەتان بۆ دروست دەکەمەوە.

قەشە قاوەکە هەڵدەقوڕێنێ. وایلۆکبێژەکەش هەر وا. ئینجا سەری قەشە بەسەر سینگیدا شۆڕ دەبێتەوە. وەنەوز دەدا و خەونووچکە دەیباتەوە، بەڵام بەردەوام ئاگای لەخۆیەتی خەوی لێ نەکەوێ.

که دەڕوا بەدەم ڕێگاوە نزا دەکا و متفەرك دەکا و دەڕوا.

ـ ئەمە قەشەی کامە کلێسایە؟

ـ دۆبریکا وەڵامم دەداتەوە: هیی کلێسای شەیتانی ڕەجیم. چووزانم. هیی کلێسای نیکۆلای پیرۆز، ئەوەی لە تەنیشت کارگەکەمانەوەیە.

ـ یاڵا دەی دۆبریکا بچۆ ژووریٚ. هەتیوەکەی کۆتەلیچی ڕۆیشت.

کچەکان هەموو روخسار و رواڵەتێکی ژاکاو و خەمباریان هەیە. کە پێدەکەنن، دەڵێی بە بنیادەم پێدەکەنن. پێکەنینەکەیان لە قوڕگیانەوە دیٚ نەك لە دڵیانەوە. دڵیان پڕە لە خەم و فرمێسك، خەمی هەموو دنیا لە چاویاندا شەپۆل دەدا.

سالۆمیا لە هەموو کچەکان خەفەتبارترە. کوڕیژگەکەش هەر وا. هەر ئەو کوڕیژگەیەی وا کتێب دەخوێنێتەوە و وا دەنوێنیٚ هیچ نابینیٚ و، سەری لە کتێبەکەیدایە و هەندیٚ شت دەنووسێتەوە و شتگەلیٚ لە بن لێوانەوە دەڵێتەوە، کە هەر خۆی گوێی لیٚ دەبیٚ.

من لە تەلارەکەدا ماومەتەوە. پیاوەکانی دی ڕۆیشتوون. بۆگەنی سەگی هار لە جلوبەرگەکانمەوە دیٚ. سۆزانییەکان لەگەڵ ئەو بۆگەنە ڕاهاتوون.

قاوەکەی خۆمم خواردووەتەوە. قاوەکەی دۆبریکاش.

سالۆمیا کە دەمبینیٚ خەفەتبارم، دێتە تەنیشتم دادەنیشیٚ و دەست وەبەر چەناگەم دەدا. پەنجەکانی گەورە و گۆشتنن. لەوانەیە چەندی چەند ساڵان کارەکەرێتیی کردبیٚ. لەوانەیە چەند ساڵان کارەکەی هەر شوشتنی دەفر و ئامان و ڕاڕە و ژووران بووبیٚ.

لە پڕ قولّپی گریانم دەپژێ. ئو گریانەی دەمێك بوو لە ئەوكمدا قەتیس مابوو، چاوەڕوانی ئەم ساتە بوو.

*

*

*

تاقە شتێكی قەت بیریشی لێ ناكەمەوە، ئەوەیە بچمە سەردانی خاڵە تۆنیێ و ئەو خزم و كەسانەی لە شاری هەمن. تەنانەت بیریشی لێ ناكەمەوە. وەك رۆژی روون لێم دیارە كە ئەگەر وا بكەم چیم بەسەر دێ: هەموو بە لالووتەوە سەیرم دەكەن و خاڵە تۆنیێش یەك دوو چەپۆكم پێدا دەدا و دەڵێ:

ـ خۆ دیار بوو... چما پێم نەگوتبووی پێت بەولایەدا نەیە؟ دەی باشە، ئەی كوا؟ یالاّ دەی لەبەر چاوم ون بە و نەتبینمەوە.

جار و بارە بە رێكەوت، تووشی كچەكانی خاڵە تۆنیێم دەبم كە لەگەڵ كوڕان لە شەقامێ دێن و دەچن. رووی خۆم وەردەگێڕم و وا دەنوێنم كە ئاگام لە جێیەكی دیكەیە و ئەوانم نەدیتووە. خۆم لە میشۆی خاڵۆزام دەپارێزم و توخنی ناكەوم.

جارێكیان تووشی بووم و لێم پرسی:

ـ چۆنی میشۆ؟

وەها سەیری كردم وەك بڵێی قەتی نەناسیوم.

میشۆ سەر و روخساری رێك و جوانە. پێی شەرمە لەگەڵ کوڕیژگەیەکی بەرەڵا ببینن. چونکە، راستە من ئێستا من بۆ خۆم کارێکم هەیە و گۆشەی تەختێکم هەیە لەسەری بنووم (کە دیارە خەوتن لەسەر ئەو گۆشە تەختە دەبێ بە وشەیەکی دیکە نیشان بدرێ) و، نیوەڕۆیان و شەوانەش قاپێکم شلەی فاسۆلیا بەش هەیە، بەڵام قەت ئەوەندە لە بەرەڵایەکی بێ خانومان نەچووم. لە یەکێك لەو کوڕیژگانەی بە هەزار چارەڕەشی شەو دەکەنەوە رۆژ و لە دەم پەرژینەکان دەنوون و بەردەوام بۆ دزی یان سواڵ دەستیان پان دەکەنەوە. ئەو جلەی لەبەرمدایە، هەر سیپاڵێکی ترسناکە و هیچی تر.

شەوێ هەوڵ دەدەم کەپەنکەکەم جۆرێك رێك بخەم. ناچار بووم خۆم فێرە درووماں بکەم. لە پێشدا زۆر ئەستەم بوو. سەرەتاکان بەردەوام دەرزیم لە پەنجەی رۆدەچوو. ئێستا ئیتر بوومەتە وەستایەك. پێموایە ئەوەندە بەس نییە. ئێستا ئیتر کارامەبوون لە هونەری درووماں و پینەلێنانەوەشدا دادی جلوبەرگەکەی من نادا. دەستێك جلی دیکەم پێویستە. چەندەش کۆن و شڕ بن قەیناکا. هەر شتێك هەبێ لەبەرمی بکەم بۆ ئەوەی بتوانم جاروبارە ئەوانەی لەبەرمن و لە دەباغخانەکە کاریان پێوە دەکەم، داکەنم و لە بەربەرۆچکەیەك هەڵیانخەم، بۆ ئەوەی با، ئەو بۆگەنەی چووەتە نێو تانوپۆیەکەیانەوە، ببا. من لەگەڵ ئەو بۆگەنە راهاتووم. خەڵکی دیکە نا. ئەگەر تاوێك لای یەکێك راوەستم، بێ ئەملا و ئەولا هەنگاوێکم لێ دەکشێتەوە. چۆن دەکرێ ئاوا بژیم؟

جارێکیان لە گوندەکەی خۆمان لە یەکێکم بیست کە دەیگوت:

ـ خۆزگە خوا بە قەدرایی تاقەتی بنیادەم چارەڕەشیی نەداتێ.

هەر بەراستی ئەوەندەی من تاقەتی دێنم، هێندەش ترسناك نییە. زۆر کەس حاڵیان لە من شڕترە.

شار وەك مار و مێروو بەرەڵای تێدایە. بەرەڵا و هەرچی و پەرچیی وا کە نە جێیەکیان هەیە و نە کارێك. هەرچۆنی بۆیان دەڕەخسێ دەژین و چیی دەستیان دەکەوێ دەیخۆن. هەڵبەت ئەگەر شتێکیان دەست بکەوێ. لە نێو ئەوانەدا خەڵکێك یەك دەگرن، کە ملهوڕ و کەڵەگان و خەڵکێکیش کە ریوەڵە و نەخۆشن. هەر هەموویان هاتوون لە شاری کار بکەن، بەڵام لە کوێ؟ تەنانەت کە کاریش دەدۆزنەوە، ئەو مزەی پێیان دەدرێ ئەوەندە کەمە کە نازانن بیدەنە نانێك و بیخەنە بەر دڵیان، یان حەوانگەیەك بۆ حەسانەوەی لەشە کفت و ماندووەکەیانی پێ بگرن. جا چونکە ئەو چەند فلسەی پەیدای دەکەن، نازانن روو لە کوێ بکەن، ئاخری روو دەکەنە مەیخانان. شەرابێك پێدا دەکەن، یان پێکە ئارەقێك دەخۆنەوە. ئەوەی دڵیان تاسەی دەکا بەڵام لە قوڕگیان خوارتر ناچێ.

من، هەم خۆ لە خزم و کەسان دەبوێرم و هەمیش لەو هاوولاتییانەم کە رۆژانی جومعە بۆ کڕین و فرۆشتنی شت دێنە شاری. حەز ناکەم کەس ببینێ. چاویان کە پێم دەکەوێ هەموو گاڵتەم پێ دەکەن.

ـ دە وەرە تۆ خوا سەیری کەن ئەو شەل و شەوێقەی بنەماڵەی تۆدۆر چیی بەسەر هاتووە؟

بەڵام خۆ بنیادەم ناتوانێ پێشی رووداوەکانی رۆژگار بگرێ.

لە ماڵێمان زۆر جار باسی براکانی دایکم، واتە خاڵە تۆنێ و خاڵە لیساندەر دەهاتە گۆڕێ. خاڵە تۆنێ ئیتر ئێستا باشی دەناسم. خۆزگە خوا رەحمی پێ کردبام و ئیتر تا لە سەر ئەم

دنیایەم چاوم بە چاوی نەکەوتبایەتەوە. بەڵام خاڵە لیساندەرم هەر نەدیت. خاڵە لیساندەر هەر ئەو پاییزە مرد کە دایکم دوور لە ئاوایی و لە کەناری بێلی تۆری، لە نێو زەوییەکانی گۆگۆ کریستۆفۆر، لە بەرەبەیانییەکی ساردی یەکێك لە رۆژانی مانگی ئۆکتۆبەردا رێك لەسەروبەندی هەڵگرتنەوەی گەنمەشامیدا، لە بن عارەبانەکەمان ژانی هاتێ و منی بوو، کە باوکیشم بە داسەکەی ناوکمی بڕی. بەڵێ. دواییش باوکم قەتی ناوکمی لە کلۆ قەندێك گرێ دا. هەر بۆیە ناوکی من ئەوەندە زەق بووەتەوە و، هەر جارێکی دەچمە دەم چۆمی مەلەی بکەم، هەتیومەتیوان گاڵتەم پێ دەکەن و دەیکەنە هەرا:

ـ تۆ خوا سەیری گەزگەز بکەن، دەڵێی دووی پێوەیە... هەتیو هۆی گەزگەز، دەبێ دوو ژنت بۆ بێنن.

هەر بۆیەشە وردە وردە راهاتووم کە بەر لەوەی خۆم بە ئاوێدا بدەم، دەستم بە بەر ورگمەوە دەگرم.

پاش مردنی خاڵە لیساندەر، زۆری نەبرد ژنەکەشی مرد. من بڵێی و نەڵێی دەمزانی کوڕێکیان لە پاش بەجێ ماوە. کوڕێك بە ناوی ئیانکۆ و ماڵێك کە منداڵیان نەبووە و بە حەژمەتی منداڵێکەوە بوون، کردوویانەتە کوڕی خۆیان.

زۆری پێ چوو کە بیستم ئیانکۆی خاڵم چووەتە قوتابخانەی هونەر و پیشە و، گەورە بووە و بووەتە کەسێکی زۆر زیرەك و وەك کچۆڵەیەك ژیکەڵانە و گرانوسەنگینە. هەر ئەوەندەم ئاگا لێیەتی و تا ئێستاش بە بیرمدا نەهاتووەتەوە. جگە لەوانە، ئەگەر قەرار وا بێ بنیادەم بەردەوام بیر لە خزم و کەسە دوور و نزیکەکانی بکاتەوە، ئیتر دەرفەتی

هەناسەکێشانی هەر نامێنیٚ. کەوابوو ئیدی زۆر سەیرە، وەختێك کە دەبینم گۆگۆشۆریکی سمێڵ بابرِ چوار پلیکان لە ریزە پلیکانێکی ژێر زەمینە تاریکەکە دێتە خواریٚ بە دوومدا، کە خەریکم پێست و چەرمەکان قەد دەکەم بۆ ئەوەی بیانبەمە عەمبار و لەسەر یەکیان دادەنێم. تۆزێك نارِەحەت و بە دڵەرِاوکێوە بانگم دەکا:

ـ هۆی شەلە، یەکێك بانگت دەکا. یالاّ بچۆ سەریٚ لە دووکانیٚ چاوەرِێتە. بەڵام لە پێشدا دەستێك بە سەروگوێلاکتدا بێنە. ئاوێك بە سەرودەموچاوتدا بکەی باشترە. ئاوا پیاو بێزی لێت هەڵدەستیٚ و حەیای ئاغاش دەبەی و تەریقی دەکەیەوە.

دەی باشە. بەو وەزعەمەوە ئاوی چی بەسەرودەموچاومدا بکەم؟

لەبەر خۆمەوە دەڵێم بڵێی لە ماڵەوەمان چ قەومابیٚ.. نەکا باوکم، یان دایکم یەکێکیان هاتبێن لێرە لامبەرن و بمبەنە لای ئاغایەکی دیکە؟

ـ کاکەگۆگۆ، کابرا دێهاتییە؟

ـ نا، شارستانییە. گەنجێکە.

لە پلیکانەکان وەسەر دەکەوم و دێمە نێو دووکانەکە. ئاغا کە تازە بە زەحمەت لە چنگی ئیزراییل قوتار بووە، زەرد و زەعیف تێکچرِژاو لە پشت دەخیلەکە دانیشتووە و خەونووچکە دەیباتەوە. ئەوەدەمانە مشتەری و شتی وا نایەن. بەرەبەری رۆژئاوایە و تاریکایی دووکانەکە لە رووناکییەکەی خەستترە.

پیاوێکی سەروگوێلاك خاوێن دەبینم لە بەر دەرگاکەوە راوەستاوە. جوان و ناسکە. زۆر گەنجە.

هەر بەو شرۆشاڵاتە بۆگەنەوە کە لەبەرمدایە، دەچمە بەردەمی. دەستی دێنێ. منیش دەست دەبەم بۆ لای. دەستە سوور و ئاوساوەکانم، قامکە سووتاوە بێ نینۆکەکانم. گەنجەکە برینەکانی دەستم دەبینێ و بلێی و نەلێی دەستوموشتاقەکە هەر دەکا. ئەوجار بەرەو لای دەرگام دەبا، لەبەر رووناکاییەکەم رادەگرێ، ورد لێم دەڕوانێ و ئاوڕ لە ئاغا دەداتەوە و دەڵێ:

ـ دەمەویست سەعاتێك ئیجازەی بۆ وەرگرم. دەمەوێ تۆزێك لەگەڵ کوڕە پوورەکەم قسان بکەم.

کوڕە پووری؟ یانی ئەو پیاوە کوڕە خاڵمە؟ شتی وا چۆن دەبێ؟ فکری مردنم بوایە، فکری ئەوەم نەدەکرد ئەوە ئیانکۆی خاڵم بێ، کوڕەکەی خاڵە لیساندەر، ئاوا چاوەڕواننەکراو بێتە لای من.

لە دووکان دەچینە دەرێ.

ـ با بچین تۆزێك بگەڕێین. تۆ نامناسی، وایە؟

ـ نا، ناتناسم.

سەیری دەکەم. ئەوە یەکەم جارمە لە ژیانمدا پیاوێکی وا جوان دەبینم. لانیکەم وام دێتە بەر چاو. پێستی روون روونە، برۆی پڕ و رەش و چاوی چەندی بڵێ درشت و گەورەن. تا ئێستا چاوی وا درشت و رەش و قووڵم نەدیتووە.

ـ من کوڕە خاڵتم. ئیانکۆ براتسکۆ.

زۆر هێور هەنگاو دەنێ، بەو حاڵەشەوە بە زەحمەت شان بە شانی دەڕۆم.

ـ پێت چییەتی؟ بۆ ئاوا بەڕێدا دەڕۆی؟

ـ لە بەهارێوە ئاوا شەل بوومە.

ـ بە زەحمەت بە ڕێیەدا دەڕۆی؟

ـ ئەگەر ناچار نەبم را بکەم، نا.

پاییز خەریکە تەواو دەبێ. شار جلە کەسکەکەی داکەندووە و ئێستا هەموو دزێوییەکانی بەرچاون و دەبینرێن. دیواری مۆرەی داڕماو، پەرژینی رزیو، کەپری داتەپیو و دیواری زگداو. بارانی بە لێزمەش بێ بڕانەوە بەسەر ئەو دزێوییانەدا باریوە.

لە کۆڵانەکاندا، ئەو گەڵا زەردانەی بارانی بێ پسانەوە لە قوڕ و لیتەی وەرداون، وا خەریکن تەواو دەڕزێن و نامێنن. هەر ئەو گەڵایانەی بەهارانە شارەکەیان سەوز دەکرد و دەیانڕازاندەوە، ئێستا ناشیرین و زەرد و بێ ئابڕوویان کردووە. داری رووت لە بنیادەم دەچن: لەرزۆك، دەستی بەرەو ئاسمان بەرزکراوە و پێستی پڕ لە گرێ و لوو، رەش و بەستوو.

شەو کە باڵ بەسەر شاردا دەکێشێ، جوانی و دزێوی لە تاریکییە یەکدەستەکەیدا دەشارێتەوە. ئێستا ئیتر بە زەحمەت دەتوانم کوڕە خاڵەکەم ببینم.

ـ بچینە کافتریایەکی هەرزانجان دانیشین؟

ـ چۆنت پێ باشە.

لە شارەکە تاقە شتێکی زۆر زۆرە، کافتریای هەرزانە. چاو بۆ هەر لایەك بگێڕی، کافتریایەك دەبینی.

لە یەکەم کافتریای سەر رێمان وەژوور دەکەوین.

ـ دوو پەرداخ بیرە.

خالۆزا ئیانکۆ بیرەکەی خۆی یەك بین دەخواتەوە، کەچی من هێشتا لێویشمم تەڕ نەکردووە.

ـ تۆ حەزت لە بیرە نییە؟

ـ نا، تامەکەی تفتە.

ـ تفت؟ هەر نەبێ تۆزێکی بخۆوە، پێت خۆش دەبێ.

دیسان پەرداخەکە بۆ لێوم دەبەمەوە. ئاگام لێیە خالۆزام چاوێکی لێ کردوومەتە چوار چاو و سەیری ئەو دەستەم دەکا وا پەرداخەکەم پێ گرتووە. قومێکم کە خواردەوە دەستم دەبەمە بن مێزەکە بۆ ئەوەی نەیانبینێ.

ـ وەزعت زۆر باش نییە پوورزا، ڕەنگت هەڵبزرکاوە.

قاقا دەکێشم و دەڵێم: لەوەتەی هەم ئاوا بوومە.

ـ کێ تۆی هێنا دەباغخانە؟

ـ خالۆژنە فینیکا و باوکم.

ـ یانی کاری لەوە پیستریان پێ شك نەدەهات؟

ـ پیس بێ و نەبێ ناچارم ملی لێ بنێم.

ـ ئاخر دەکرا کارێکی باشتر بدۆزیتەوە.

ـ چووزانم.

ـ جا ئێستا هەر بەڕاستی لێبڕاوی فێری ئەمە بی؟

ـ وام بڕیار دابوو.

ـ یانی ئێستا بڕیارەکەت وا نییە.

ـ ئەگەر راستیت دەوێ فێری کارەکەم بووم. ئەوە دامنا حەزیشم لێی نییە. خۆم پێم خۆش بوو کارێکی دیکە بکەم: حەزم لێ بوو بخوێنم، لێرە تەنانەت ناتوانم کتێبێکیش هەڵدەمەوە. هەست دەکەم رۆژ بە رۆژ کەرتر دەبم.

ـ ئەی باقی شاگردەکانی دەباغخانەکە چۆنن؟

ـ ئەوانیش لە من خراپترن. پۆلێك منداڵە دێهاتین کە تەنیا بیر لە یەك شت دەکەنەوە: سالآنی شاگردایەتییەکەیان تێپەڕێنن و بگەڕێنەوە دێ و بۆخۆیان ببنە وەستا و ئاغا.

ـ ئەی کرێکارەکان؟

ـ ئەوانیش پۆلێك بارگینن و، ئیدی هیچ شتێکیان لە بنیادەمان ناچێ. کار دەکەن و دەخۆن و دەخۆنەوە و مەست دەبن. شەوانی شەممە یەکشەممەش دەچنە رابواردن... هەر ئەوەندە.

ـ تۆش دەبەن؟

ـ تاقە جارێك، هەتیوێکی لێیە ناوی دۆبریکایە. دۆبریکا تۆنسۆ، ئەو بردمی.

ـ لەوانەبوو تووشی نەخۆشییەك شتێك بی.

ـ ئیدی ناچمەوە شوێنی وا.

ـ کەڵکەڵە شتێکی خراپە. هەوڵ بدە جڵەوی خۆتی نەدەیە دەستی. شار بنیادەم قووت دەدا. دەبێ زۆرت ئاگا لە خۆت بێ داریە. نەهێڵی شار تۆش هەڵلووشێ.

ـ شار من هەڵناڵووشێ. ناهێڵم هەڵملووشێ.

ـ من هەر وا چەند ڕۆژێکە لێرەم. بە تایبەتیش لە بۆخارێستەوە بۆیە هەستاوم هاتوومەوە ئێرە، بۆ ئەوەی بزانم لە خزم و کەس کێ ماوە و کێ مردووە. مامە تۆنیێ و ئامۆژنە فینیکا و ئەوانم دیت. پێیان گوتم پوورە ماریا یەکێك لە کوڕەکانی ناوەتە بەر دەباغی. لێم پرسین بەو دواییانە تۆیان دیتووە یان نا، گوتیان خۆتیان لێ دەشارییەوە و توخنیان ناکەوی... باشە بۆ؟ عەیبە ڕۆژانی یەکشەممە جار و بارە بچیە ماڵیان؟ خۆ هەر نەبێ جەمە نانێك بەدڵی خۆت دەخۆی، ها؟

دیسان قاقایەك دەکێشم.

گوتم: ئەوە دەڵێی چی خاڵۆزا. هەر دەڵێی خاڵە تۆنیێ ناناسی.

ـ ئەگەر ڕاستیت دەوێ زۆر باشیش نایناسم. باشم لە بیر نەماوە، لەوانەیە لە ژیانمدا یەك دوو جار لەبزم لە لەبزی گەڕابێ و هیچی دی.

لە ژیانیدا... ئاخر سەر لەبەر ئەگەر بیستویەك ساڵان یان بیستودووساڵان بێ، جا هاتووە بە من دەڵێ "لە هەموو ژیانمدا". هەر دەڵێی خاڵۆزا ئیانکۆم زۆر ناژی. عومری کورت دەبێ و تەنانەت دەکرێ بڵێم زۆر زۆریش کورت، هەر زۆر.

ـ منیش لە بوخارێست توانیم خۆم فێرە کارێك بکەم. من ئێستا لە خوای بەزیاد بێ بوومەتە میکانیسیەنێکی تەواو. هەر ئەوەی لە لای خۆمان پێی دەڵێن ئاسنگەر... هەر زانیم تۆ لێرەی، وەڕێ کەوتم هاتم چاوێکم پێت بکەوێ و یەکتر بناسینەوە. دەزانی خۆ، دایك و باوکی من بە هەسپەك مردن. لە قوتابخانەی "پیشە و هونەر" ژیانم زۆر خۆش نەبوو. دکتۆرەکان پێیان گوتم، چۆنی بۆت دەلوێ لە شار مەژی. ئامۆژگارییان کردم

بچمەوە دێهات. باری سینگ و سییەکانم باش نین و پێویستیان بە هەوای خاوێنە. هەر بۆیە سبەی هەڵدەستم دەچمەوە ئۆمیدا. بەشکم شانس و بەختم هەبێ و بتوانم لەوێ کارگەیەك بکەمەوە.

ـ ئەی دەتەوێ هەر وا زگورتی بژی؟

ـ لە پێشدا کار، بەڵێ. دوایی ژن دێنم. ژنێکی لەشساغ و تۆکمە و بەهێزم دەوێ. هەر بۆیە دەمەوێ کچە دێهاتییەك بێنم. حەزم لێیە منداڵی تۆکمە و لەشساغم بۆ بخاتەوە.

دەڵێی چاوی خاڵۆزاکەم تیشکێکیان تێگەڕاوە و زیاتر دەدرەوشێنەوە.

دوو دۆمە ژەنیار کە جلوبەرگی پەڕپەڕیان لەبەردایە و لەسەرمان هەڵدەلەرزن، وەژوور دەکەون. یەکێکیان ڤیۆلۆنێکی لە بن هەنگڵی دایە و یەکێکیشیان گیتارێك. دەستیان لێك دەخشێنن بۆ ئەوەیە پەنجەیان گەرم بێتەوە و ئینجا دەست دەکەن بە لێدان.

خاڵۆزا ئیانکۆ بە دەست پێیان دەڵێ:

ـ زەحمەت مەکێشن و دوو فلسیان لە مستی دەنێ.

ـ ها.

هەردووکیان وێکڕا دەڵێن: دەستت ماچ دەکەین قوربان.

دوو فلسەکە دەدەنە مەیخانەچی و کابرا وەك هەورەتریشقە دەسبەجێ دوو پێك ئارەقیان لەبەردەم دادەنێ.

یەکێکیان دەڵێ: وا زستان بەسەردا دێ بەو سەرما تووکلێکراوەیەوە. هێشتا هیچ نەبووە مۆخی ئێسقانمان بەستوویەتی.

ـ حەز دەکەی تۆزێك بجوولێین کاکە ئیانکۆ؟

ـ دەی باشە.

ـ لە خۆوە مل لە کۆڵانەکان دەنێین.

ـ ئەوەی لە بوخارێست فێریان بوومە خراپ نین. هەر خۆم بە میکانیکییەوە خەریك نەکرد. جگە لەوە، قوتابخانەیەکی شەوانەشم تەواو کردووە. فێری نیگارکێشان و شێوەکارییش بوومە. لەدێ ئەگەر دەرفەت بوو تابلۆش دەکێشمەوە. دیمەنی دارەکان و کۆڵانەکانی ئاوایی و ئەو رووبارەی بە حاستەم هەندێ شتیم لەبیر ماوە. خەڵکەکەی، هەر هەمووی دەکەمە تابلۆ.

بێدەنگ و کڕ شان بە شانی دەڕۆم. تاسەبارانە قسەکانی وەردەگرم.

دەپرسێ:

ـ هیچت خوێندووەتەوە؟

ـ بەڵێ، بەڵام لێرە دەرفەتی سەرخوراندنم نییە. لەوەتەی پێم ناوەتە ئەو شارە کاولبووەوە، کتێبێکیشم هەڵنەداوەتەوە.

زۆر حەیفە. کتێب بنیادەم روون دەکاتەوە. زەینی بنیادەم دەکاتەوە. هەوڵ بدە هەرچۆنێك بێ، دەرفەتی خوێندنەوە بۆخۆت بڕەخسێنی.

ـ بە زمان ئاسانە.

ـ هیچ شتێك ئاسان نییە. هەرچۆنێك بووە، بۆ خوێندنەوە دەرفەت بڕەخسێنە. ئەی دەتەوێ هەر ئاوا لە دەباغخانە بمێنیەوە؟

ـ نەخێر، دەمەوێ بچمە لای ئاغایەکی دیکە کار بکەم. هەر ئەم زستانە تا هاوینەکەشی تەواو دەبێ لای دەمێنمەوە بۆ ئەوەی بتوانم یەك دوو فلس کۆ بکەمەوە. دەمەوێ پاییزی دادێی بچمە قوتابخانە. دیارە لە تۆرنۆ. سالێکم لە کیس چووە، بەڵام قەرەبووی دەکەمەوە.

ـ بەو مەرجەی تا ئەودەم شەڕ هەڵنایسێ.

ـ شەڕ؟

ـ بەڵێ، شەڕ. دوو ساڵە خەڵك وەك دڕندان تێك بەربوون و یەکتر دەکوژن. تەنیا چەند وڵاتێك ماوە کە هێشتا لە شەڕەکەوە نەگلاون. یەکێکیان هەر ئەم وڵاتەی خۆمان. پێم وایە زۆر ناتوانین خۆمان راگرین و خۆی لێ ببوێرین. هەندێ دەیانەوێ بمانکە دژی هاوپەیمانان و لە داومان بخەن، هەندێکیشیان لە رێگەیەك دەگەڕێن بە گژ ئەڵمانییەکاندا بکەن.

ـ یانی ئێمە... ئێمە دەبێ خۆ لە جەنگەکە وەردەین هەر لەبەر ئەوەی خەڵکەکە وایان پێ خۆشە؟

ـ دیارە من و تۆ نا.

قاقایەك دەکێشێ.

ـ ئەی چی؟ بۆ چما خەڵکی دیکە، خەڵکی ئەم شارە و هەموو شار و گوندەکانی وڵات حەزیان لێیە بچنە شەڕێ؟

ـ نا، زۆرینەی خەڵك هەر حەزیان لێ نییە بچنە شەڕ. زیاتر ئەوانەی حەزیان لێیە بۆخۆیان هەر توخنی شەڕەکە ناکەون. یانی ئاغاکان. یانی ئەوانەی بەناو سەرکردەی وڵاتن.

ـ ئەگەر ببێتە جەنگ تۆش دەچی؟

ـ نا، پێم وا نییە. پار کە من چوومە ئەنجومەنی پێداچوونەوە، گوتیان بۆ سەربازی نابم. ئەنجومەن رای خۆ وا دەربڕی کە من ناتوانم سەربازی بکەم.. ئەمسالێش لە پار باشتر نیم و بە دڵنیاییەوە سالی دادێش لەوە باشتر نابم.

تۆ نەخۆشی؟

ـ نا، نەخۆش نیم. بەڵام بەرگەی شەڕ و تفەنگهەڵگرتن و رۆیشتن بە نێو قوڕ و لیتەدا ناگرم.

لە بەردەم دەباغخانەکە، وەختێك خالۆزا ئیانکۆ ماڵاواییم لێ دەکا، نیوە شەو داهاتووە. دەڵێ:

ـ دەی باشە. من سبەی بەرەو ئۆمیدا دەکەومە رێ. ئیشەڵا دیسان یەکتر دەبینینەوە.

دەستی بە دەستە ئاوساوەکەی مندا دێنێ و لە تاریکییەکەی شەودا لە دەم دیوارەکانەوە لە چاو ون دەبێ.

لەبەر دەرگا رادەوەستم و گوێ لە دەنگی دوورکەوتنەوەی هەنگاوەکانی هەڵدەخەم. دەنگی هەنگاویشی دەبڕێتەوە.

لەسەر پەنجەی پێ خۆم دەخزێنمەوە ماڵێ. زرتە زەلام لێی نوستوون و پرخەیان رۆژەڕێیەك دەڕوا.

دەخزێمە نوێنەکەمەوە.

*

*



خاڵۆزا ئیانکۆ براتسکۆ وەك بە منی گوت، چووەتە ئۆمیدا و لەویٚ باروبنەی خستووە. لە قەراغ ئاواییەوە، لە دەم ئەو جادەیەی دەچێتە ئستانی کۆتز، خانووەکی دۆزیوەتەوە کە دەوراندەوری بیناکەی، حەوشەیەکی پانوبەرینە. باخچەکەی، کە خاکێکی سوور و لمینی هەیە، لێژاییە تا دەگاتە بەستنە پەرژینکراوەکەی چۆمی. ئەگەر خاڵۆزا شەوانە بچێتە بەرهەیوانیٚ راوەستیٚ، مێشوولە و بۆنە ناخۆشەکەی گۆل و زۆنگاوەکان کە لەبەر تیشکی تاوەکە کەسك دەچنەوە، لەگەڵ بۆنی تاڵی شۆڕەبییەکان بە دەم شنەیەکەوە دیٚ و وەدەموچاوی دەکەویٚ. لە بەر پەنجەرەکانی ماڵەوە، هەر لە تەنگی ئێوارەوە تا کەڕەی بەیانی بۆق سەریان لە ئاویٚ هێناوەتە دەریٚ و لە خۆشیی مانگ دەقرێنن.

خاڵۆزام خانووەکە نۆژەن دەکاتەوە، قسلاو لە دیوارەکانی هەڵدەسویٚ، لە دەم دەرگا و پەنجەرەکان گوڵ دەچەقێنیٚ و دەچێنیٚ، پەرژینیان بۆ دروست دەکا و عەمبارەکە دەکاتە کارگەی ئاسنگەری.

شەوانە دەچێتە نێو دیٚ و لەگەڵ خەڵکەکەی دەبیٚ. خوا دەزانیٚ چەندە نەرمونیان و بە خۆشەویستییەوە دەیاندوێنیٚ.

زۆر نابا خەڵك رووی تیٚ دەکەن: یەکێك دەمە گاسنی دەباتە لای بۆیان تیژ بکاتەوە، ئەوی تر شتێکی بۆ دەبا بۆ چاك بکاتەوە.

کوڕە چکۆڵەکەی تزانتزۆش لای خۆی بە شاگرد دەگریٚ. کوڕە هەر حەوت ساڵانەیە و بە هەموو تینی خۆیەوە زنجیرەکەی بەردەم کارگەکەی پیٚ رادەکێشریٚ. خاڵۆزا ئیانکۆ، کە

دەستی ناسك و پەنجەی نازدارن، بەڵام شانوباهۆیەكی بەهێز و تۆكمەی هەیە و بەیانی تا ئێوارێ هەر خەریكی كوتك وەشاندنە.

زگورتییەكەی زۆر ناخایەنێ. قۆڵێ هەڵدەماڵێ بۆ ژنهێنان و ئاخری لە گوندەكەی ئەوبەرەوە، لە ئەستانی كۆتز ئەوەی لێی دەگەڕێ دەدۆزێتەوە:

ژنەكەی خاڵۆزا ئیانكۆ ژنێكی رووگەشی تۆكمە و لەشساغە. ناوی سیتزایە و منیش وەك هەموو خوشك و براكانم پێی دەڵێم "خوشكە سیتزا".

دەڵێی بووەتە شا، كە بووەتە ژنی ئاسنگەرێك.

ئێواران بۆ سوعبەت و چەنەلێدان لەگەڵ ژنانی دەر و دراوسێ دێتە بەر دەرگا.

پێیان دەڵێ:

ـ ئیانكۆ ناهێڵێ بچمە بەر تاو و لە دەشتێ كار بكەم. خۆشی دەوێم و دەملاوێنێتەوە. كار و پیشەم ئەوەیە چێشت لێ بنێم و جلی بۆ بشۆم. بەڵام هەر ئەمڕۆ و نا سبەی كارێكی دیكەشم لێ زیاد دەبێ: منداڵم دەبیچ. ئەدی. حەزی لێیە هەرچۆنێكی بێ كۆشێك منداڵی بۆ بخەمەوە. لێی گەڕێ، با جارێ ترش و چەوەندەر بخوا. منی پێ چییە؟ بە كەرم دەزانێ؟ بە سەری بابی لە یەك منداڵ زیاتر ناهێڵم ببێ. جا ددانە سپییەكانی كە دەڵێی ددانی حەیوانی دڕندەن لەگەڵ ئەو قسەیەدا دەردەخا.

ـ من دەمەوێ بۆ خۆم بژیم، نەك بە منداڵگەورەكردن قوونی خۆم بدڕێنم.

خاڵۆزا ئیانكۆ كە عازەب بوو، هەر تۆزێك سەری سووك بوایە دەچوو خەریكی نیگاركێشان دەبوو. لە شارییەوە رەنگ و كاغەز و پەڕەمووچ و قەڵەمی جۆراوجۆری كڕیبوو. دیمەنی

ماڵەکەی خۆیان و خانووی دەرودراوسێکان و تەنانەت کارگەکەیشی کێشابۆوە. تەنانەت کوڕەکەی تزانتزۆشی کێشابۆوە کە خەریکبوو بای لە توونی کوورەکە دەدا. هەوڵی داوە شێوەی خوشکە سیتزاش بکێشێتەوە، بەڵام ژنەتیوە گوتوویەتی تاقەتی شتی وای نییە و، بەرەنگاری خالۆزا بۆتەوە و قسەی شکاندووە و گوتوویەتی:

ـ ئەرێ تۆ خوا تۆ شێت نی؟ یانی خۆتت پێ ئاقڵە؟ کاری دیکەت نییە بیکەی؟ بە خوا ئەگەر زانیبام تۆش مێشك وەك مێشکی ئەو خەڵکەیە و کار ناکا، ببڕای ببڕ مێردم پێ نەدەکردی. بەڵام ئاخر چۆنم زانیبا؟ هەرچی خەڵکی ئەم دنیایەیە کە لە کار دەبنەوە شتێك دەخەنە بەر دڵیان و سەر دەنێنەوە و دەخەون یان ئەوپەڕەکەی دەچنە کۆڵانێ و لەگەڵ دەر و دراوسێ دادەنیشن بۆ قسەکردن. ئەوە هەر تۆی کە لە قوژبنی ماڵێ دەخزێی و سەرت لە کتێبان دەنێی. ئاخرییەکەی لەسەر ئەو کتێبانە ئەقڵ و هۆشت لەدەست دەدەی و شێت دەبی. ئاخر باشە چیت لەو کتێبانە دەست دەکەوێ؟ من نازانم. دەتەوێ پشتت کووڕ بێتەوە؟ تازە بەوەندەش قایل نییە دەچێتە سەر گێلەگێلەکەی دیکە: ئەو نیگارکێشانەی... ئاخر تۆخوا پێم بڵێن ئەو کارانە بۆچی دەبن و چ دەردێکت لێ دەرمان دەکەن؟ پیاوی باش، حەز دەکەی سەیری خانووەکەت بکەی، بچۆ لەبەر دەرگا راوەستە و ئەوەندەی سەیر بکە تا لاقت وشك دەبن. حەزت لە سەیری گۆل و شۆڕەبییەکانە، هەستە بچۆ سەر ئەو گردە و جێیەکی باش بدۆزەوە، تا هەناسەت لەبەر دەبڕێ سەیری گۆل و زۆنگ و شۆڕەبییەکان بکە... ئەی خوایە، ئەی خوایە، تۆ سەیری ئەو هەتیوە ئەسپێونەی تزانتزۆ، بەیانی تا

تەنگەی نوێژی شێوان ئەو جاشکەکەرەت لەو کارگەیەدا لەپێش چاوە، تێر ناخۆی، هاتووی ئەو قەدوقەلافەتە ناشیرنەی لەسەر کاغەزیش دەکێشییەوە؟ باشە ئاشقی کوێی بووی پیاو؟ ژنانی ئاوەدانی ماوەیەکی زۆر لەو نیگارانە ورد دەبنەوە کە خالۆزام کێشاونیەوە. زیاتر سەیری وێنەی تزانتزۆ دەکەن، کە لەبەر کوورەی ئاسنگەرییەکەی سوور سوور هەڵگەڕاوە و شەلاڵی ئارەقە بووە و دەڵێن:

ـ سوبحانەلا، هەر دەڵێی گیانی لەبەردایە... تۆ سەیری ئەو ئاگرە. بنیادەم پێی وایە دەستی بۆ بەرێ دەیسووتێنێ.

دراوسێکان لۆمەی خوشکە سیت زا دەکەن و دەڵێن:

ـ شەق لە بەختی خۆت هەڵمەدە سیت زا. مێردی ئاوا بۆ هەموو کەس هەڵناکەوێ. ئەو توانایەکی هەیە لەو ئاسمانانەوە پێی دراوە.

ـ دەی دەڵێن لەسەر سەرمی دانێم و هەڵوا هەڵوای پێ بکەم؟ ئاخر چیی گیر دەکەوێ دانیشێ ئەو کاغەزانە خەت خەت بکا؟ دیسان خۆ توانیبای بیانفرۆشێ و بە پارەکەیان کلاوێکی لەو کلاوانە بۆ من کڕیبایە کە خانمەکان لەسەریانی دەنێن، دەمگوت باشە.

خالۆزا گاڵتەی پێ دەکا و دەڵێ:

ـ خۆ هەر ئەوەت کەمە: کلاوێك، بەلام من بۆیەم تۆ هێنا چونکە ئەهلی کلاولەسەرکردن نەبووی. کچە شاری نەبووی.

ـ من دەمەوێ وەك کچە شارییەکان بم. وەك خانمەکان. باشە بۆ نەبم؟ حەزم لێیە کلاو لەسەر بکەم. بۆ نەیکەم؟

ـ ئەویشت دەبیٚ.

ـ کەی؟ تۆ هەر دەڵیٚ: "ئەویشت دەبیٚ، ئەویشت دەبیٚ." ئەی باشە کەی؟

❊

❊

❊

حەفتەی پێنج جەم مامالیگامان دەدەنیٚ و ئەو شۆرباوەی پێی دەڵێن سووپی فاسۆلیا و نیسك. پێنج شەممە و یەك شەممۆیان نانمان دەدەنیٚ بە گۆشت و کەلەم و راگۆوە.

مۆتزاتۆ ئاغا بە هەڕوگیڤەوە دەڵیٚ:

ـ ئێوە لەو دامودەزگایەی مندا وەك شا دەژین. هەقتان نییە بۆڵەبۆڵ بکەن و پێتان وابیٚ بیر لە خۆشبژێویتان ناکەمەوە. هەموو شتێکتان باش و رێکە. خانووەکەتان، خواردن و سووتەمەنیتان هەمووی دابینە.

بۆ ئەوەی قاچە رووتەکانم سڕ نەبن، لە کۆڵێك پەڕۆوپاڵیانەوە دەپێچم. وەك منداڵێك کە مەلۆتکەی دەکەن. کە دەمەویٚ بچمە کۆڵان، ئەو جووتە کالەیە لە پیٚ دەکەم کە لە ئاواییەوە لە گەڵ خۆمم هێناون.

ئەوەندە رۆژانی یەکشەممە لە خۆڕاوە بە شاردا گەڕاوم، بەو دواییانە توانیومە یەکێك لەوانە بناسم کە هەر لە خۆوە خۆش رادەبوێرن و دڵخۆشن.

لێی پرسیم:

ـ خەڵکی دێی؟

ـ نا، خەڵکی ناوەڕاستی پاریسم.

قاقایەکی کێشا. خۆشم قاقام کێشا. ئیدی تەواو ببووینە دۆست.

ـ لای کێ کار دەکەی؟

ـ لای مۆتزاتۆ.

ـ ئەوە لەو گووخۆرە سەگوسەگبابترت وەگیر نەکەوت لای بمێنییەوە؟

ـ جا خۆ من نەمدەناسی، خاڵۆژنم منی بردە لای.

لە دەوری شار و لای گۆڕستانەکە گەڕاین. هەر ئاوا یەکڕیز پرسیاری لێ دەکردم بەڵام جگە لەوەی حەزم لێ بوو، هیچی دیکەم بۆ نەدرکاند.

لە نێوەندی شار، ئەو جێیەی دوو شەقامە گەورە بەردچنکراوەکان بە پیادەڕێیەکانیانەوە یەکتر دەبڕن، مۆنۆمێنتی ژەنەراڵێکی لێیە کە لە هیچ کام لە مەیدانەکانی شەڕدا گۆڕ بە گۆڕ نەبووە.

ئەو مۆنۆمێنتە بە یادی جەنابی ژەنەراڵ مانتۆ لەوێ دانراوە.

لە ئاواییەکەی خۆشمان بینایەکی وا هەیە. پێم وایە نە لەسەر چوارڕێیان و نە لە پێش قوتابخانە و نە لە پێش قایمقامی یان کلێسا، بەڵکو رێك لەبەر دەرگای ئیشپاش کاپرایە.

ئیشپاش کاپرا زۆر بەتەمەنە. ژنەکەشی هەر زیندووە. بەڵام هەر گەنج بووە کە منداڵەکانی مردوون. تۆزە سامانێکیشی هەبێ، بەڵام پاش مەرگی منداڵەکانی ئیدی تاقەتی ئەوەی نەما فلسێکی بکاتە دینارێك. هەر ئەوەندەی کار دەکرد لە برسان نەمرێ. خزم و کەسەکە هەنگەڵەکەی کە خەڵکی تۆرنۆن، چەندی چەند ساڵان داویان بۆ نایەوە و هەر رۆژە و

گێچەڵێکیان پێ کرد، تا ئەوەی لەسەر چەند بستۆکە زەوییەك تووشی دادگایان کرد، کە پاش ئەو هەمووە بێنە و بەردە و خەفەتخواردنە نە بە نەسیبی کاپرا بوو و نە لە قوڕگی خزم و کەسەکەی چووە خوارێ، بەڵکو ئاخرییەکەی وەك هەقی پارێزەر دایان بە ریکا ژێرژسکۆ، کە بە گیانی ناخێری پارێزەری ئیشپاش کاپرا بوو و لە هەمبەر دەستدرێژیی خزم و کەسە هیچوپووچەکەی بەرگریی لە بەرژەوەندییە رەواکانی بەرگریتەکەی خۆی دەکرد.

لە تۆرنۆ لەو شوێنەی جادە گەورەکە دەبڕێتەوە و باخی گشتی دەست پێ دەکا، خەڵك بە یادی ئەو سەربازانەی لە دانووب پەڕینەوە و لە پالڤێنا شان بە شانی رووسەکان بە گژ قۆشەنی رووسەکاندا چووبوونەوە، مۆنۆمێنتێك و شتێکی وەك گۆڕ دروست کراوە.

ئیشپاش کاپرا، کە چاوی بە بیناکە کەوت، شاگەشکە بوو و پرسیی: ئەوە چییە؟

ئەو کرێکارەی خەریك بوو خەزەڵ و گەڵای دەوروبەری بیناکەی گەسك دەدا، گوتی: مۆنۆمێنتی رێزگرتنە.

ـ مۆنۆمێنت؟ دەی باشە، ئەوە بۆ چی دەبێ؟

ـ بۆ ئەوەیە خەڵك ئەو سەربازانەیان هەر لە بیر بمێنێ کە ساڵی ١٨٧٧ لە جەنگی تورکەکاندا کوژراون.

قسەی سپوورەکە، کاری لە ئیشپاش کاپرا کرد و گوتی:

ـ دەی باشە، کەواتە خەڵك ئەو بینا و پەیکەرەیان بۆیە لێرە دروست کردووە، بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی سەردەمانێك زیندوو بوون و دەمێکە مردوون، لەبیر نەکرێن...

ژنەکەی لێی دەپرسێ:

ـ ئەوە دیسان چ سەگوسەگبابێتییەکت لە بن سەریدایە؟

ـ ئەی ی ی... هەندێ شتم بە زەیندا دێ ئیتر.

بەرهەمەکەی فرۆشت. بەشێك لە زەوی و زارەکەشی کردە پارە. بەبێ ئەوەی قسە لەگەڵ یەك کەسیش بکا، بلیتێکی کڕی و سواری شەمەندەفەر بوو و چووە شاری، چووە تۆرنتۆ و یەکێك لەو کێلنووس و بەردتاشانەی کارگەیان لە لای گۆڕستانەوەیە و کێل و مۆنۆمێنت و خاچ و شتی وا دروست دەەن، دۆزییەوە و گوتی:

ـ دەتوانی مۆنۆمێنتێك بۆ من دروست بکەی؟

ـ کێتان مردووە؟

ـ کەسم نەمردووە. بۆخۆمم دەوێ.

ـ لە گۆڕستانی دادەنێی؟

ـ نا، لە بەر دەرگای ماڵێ.

بەردتاشەکە واقی وڕ ما:

ـ لەبەردەم ماڵێ؟

ـ بەڵێ. لەبەردەرگای خۆم. بەرەوڕووی جادە گەورەکە.

ـ باشە. مۆنۆمێنتت بۆچییە؟

ـ دەمەوێ کە مردم، خەڵك لەبیریان بێ من واتە ئیشپاش کاپرا لەو خانووەدا ژیاوم.

زۆری لەگەڵ بەردتاشەکە گوت و چەنەی لێ دا هەتا لەسەر نرخەکەی ڕێك کەوتن. کاپرا پیرە، هەقدەستی بەردتاشەکەی دا و لەگەڵ دوو کرێکاری خۆی چوونە ئاوایی.

کاپرا پرسیی: ـ کوا پەیکەرە؟

ـ بە شەمەندەفەر دەیهێنن. دەبیٚ چەند عارەبانەیەك پەیدا بکەن بۆ ئەوەیە بیهێنینە ئێرە.

کاپرا دوو عارەبانەی بەکریٚ گرت و بردنیە وێستگە. بەردە تاشراوەکانی پەیکەرەکەی کە لە سندووقی نابوون، گەیشتن و، کرێکار بە پێی گرێبەست لەبەر دەرگای ماڵەکەی و رووبەڕووی جادە گەورەکە خستیانە سەر یەك. کۆڵەکەیەکی بەردینی بەرز، کە هەڵۆیەکی مەفرەقی لەسەر نیشتووە و باڵی لێك کردوونەوە و ئەم نووسراوەی خوارەوەشی بە پیتی ئاڵتوون لەسەر هەڵکۆڵراوە:

ئەم یادگارە، من واتە

ئیشپاش کاپرا

دامناوە.

بۆ ئەوەی خەڵك لەبیرم نەکەن.

ژنەکەی لەسەر ئەم مەسەلەیە کردییە هەرا و قەرەچی ئۆینێك هەر مەپرسە. بەڵام ئاخری هاتە سەر ئەوەی کە پیرە پیاو تۆزێك ئەقڵسووکە و ئەقڵی پارسەنگی دەویٚ و ئیتر لێی بڕییەوە.

ئێستا ئیشپاش کاپرا زۆر نەخۆشە. لە قوژبنی ماڵیٚ بە جیٚ و بان کەوتووە و نانی شەوێی نییە. ژنەکەی زستانان فاسۆلیای کولاّ و بەهارانیش گیای زەردکراوی دەداتیٚ. ئیتر پێیەکی

لەسەر لێوی گۆڕە. حەژمەتی چۆڕێك شیری لەسەر دڵی بووەتە گرێ و دەستەوداوێنی ژنەکەی دەبێ، کە:

ـ بۆ خاتری خوا چۆڕێك شیرم بۆ بکڕە.

ژنەکەی هەڵدەداتێ:

ـ سەردەمانێك شەش و بێش پێتدا دەدا و بیرت لە تەنگانە نەدەکردەوە. ئەوددەمەی تین وگوڕێکت لەبەردا بوو، لە بری ئەوەی مانگایەك بۆخۆت بکڕی، ئەو کۆڵەکەیەت لەبەر دەرگای ماڵەکەت چەقاند. دەی باشە، ئێستا هەستە بڕۆ ئەو قشقەڕەی لەسەر گۆڕەکەتت داناوە، بیدۆشە. دەی یالاّ، ئەگەر حەزت لە شیرە، هەستە بچۆ قشقەڕەکەت بدۆشە دەی.

ئیشپاش ئاخێك هەڵدەکێشێ و دەڵێ:

ـ هیچ تێ ناگا. ئەو ژنە هەر تێ ناگا... من بە ملی شکاوم ئەوە دەمرم، بەڵام تا هەتایە خەڵك یادم دەکەن. تێگەیشتی؟ دەی باشە، ئێستا هەستە بڕۆ قومە شیرێکم بۆ پەیدا بکە.

ـ قشقەڕەکە... دەبێ هەستی بچی قشقەڕەکە بدۆشی.

هەرچۆنێك بێ، لە نێوەندی گۆڕەپانەکەی شار، پەیکەرێك بۆ ژەنەراڵ مانتۆ دانراوە. ئەم بەرێزە، هەر لە ژیانیدا رەنگی مەیدانی جەنگی بە خەونیش نەدیتووە، لە بری ئەوە تا دڵ دەخوازێ لە ناوچەکەدا زەوی و زار و مڵك و دارستانی گەورەی پێ بڕا کە ئێستا بە تۆرەمەکەی بڕاوە. چەند جاریش کراوەتە پەرلەمانتار و سەناتۆر.

بنەماڵەکەی، پەیکەرەکەیان لە گۆڕەپانی شار داناوە، بۆ ئەوەی خەڵك لەبیری نەکەن. رێبواران بە زەحمەت سەرێك بەرز دەکەنەوە تا سەیرێکی قەڵافەتە برۆنزی و ردێنە برۆنزی و

سمێڵە جەنگییەکەی بکەن. قشقەڕەکان کە ماندوو بوون هێندەی لەم بەرەوە بفڕن بۆ ئەوبەر، لەسەر سەلکی سەربازەکەی نیشتمان دەنیشنەوە و، بە جیقنەکەیان، قژە لوولەکەی سپی دەکەن.

لەبەر دەم پەیکەرەکە دوو دووکان بە تەنیشت یەکەوەن، میچەکەیان ئەوەندە نەوییە بنیادەم هەست دەکا کرنۆشیان بۆ خاوەنشکۆ بردووە.

یەکێکیان کتێبفرۆشیی "تووتییە زێڕینەکە"ـیە و فرۆشەرەکەی، کوڕێکی قژخورمایی درێژە دەڵێی دەیلاغە، کە بەو دواییانە لە سایەی گەڕۆکییەکەمەوە لەگەڵی بوومەتە دۆست. ناوی هورمز نیسکۆلسکۆیە. قەڵەم و تەباشیر و کاغەزی بەستەکراو و جاری واشە کە پاییزان قوتابخانە دەکرێنەوە، کتێبیش دەفرۆشێ.

دووکانەکەی دیکە "چێشتی مجێورفرۆشیی" مێلوگۆشێیە. ئاغا تازەکەی من کە لە شارەکەدا بە پۆم نێئاتا بەناوبانگەو لەسەر پەنجەرەکانی و سەردەرانەی دەرگاکەی بە خەتێکی گەورە نووسراوە:

دووکانی فریشتە

کڕێوە دەکا. شەو و رۆژ لێی ناکاتەوە و دەڵێی هەورەکان دادەبێژن. لە باغە کپ و بێدەنگەکاندا، لە کۆڵان و لاکۆڵانان، لە دەشتودەر، بێ پسانەوە بەفر دەبارێ و وەك فەرشێکی جار بە جار ئەستوورتر بێ، ئاوا هەموو وڵات دادەپۆشێ.

پەیتوونچی، درۆشکەیان لە درۆشکەخانەکاندا راگرتووە و زەنگوڵەکانیان دەرهێناوە و لە ملی بارگینەکانیان خستوون و، یاڵ و کلکی بارگینەکانیان بە قەیتانی رەنگاوڕەنگ لە

خێشکەکان بەستووە. خێشك لە دەوری پەیکەرەکەی خاوەنشکۆ چاوەڕوانی مشتەرین. بارگین زەنگوڵەیان دەزرینگێننەوە و، پەیتوونچی کە جلوبەرگی پەڕداریان لەبەردایە بۆ ئەوەی لە سەرمان رەق نەبنەوە، دەستیان لێك دەخشێنن و پێیان لە عەرزی دەکوتن. بە دەگمەن یەکێك لە مەیدانەکەدا رادەبرێ. خێشك و "تووتی" و "فریشتە" مشتەرییان نییە. دووکاندار لێوی خۆیان دەکرۆژن و دەڵێن:

ـ ئەی لە دەست ئەو گوندییە سەگبابانە. خۆیان لە کەپرەکانیان خزاندووە. لەوێدا دەڕزێن و روو لە شار ناکەن. لە کۆڵانەکاندا چۆلەکەکوژ دیار نییە.

بەڵام مێلۆ بێخەمە و بەو قسانە بێهیوا نابێ:

ـ کێ چووزانێ هەر ئێستا لەو شارە گەورەیەدا یەکێك لە گیانەڵادا نییە؟ هەر بەراستی ئەوپەڕی نەگبەتییە کە لە هەوایەکی ئاوا ناخۆشدا یەکێکیش لە سەرمان رەق هەڵنەیە. ئاخری کڕیارێك پەیدا هەر دەبێ کە مۆمێك بکڕێ. لەوانەیە لە شوێنێك منداڵێك شتێك نەخۆش بێ. ئەگەر وابێ، خۆ هەر دەمرێ و قسەی لەسەر نییە. جا کە مردیش، خۆ دایکوباوکەکەی هەر هیچ نەبێ مۆمێکی بۆ دادەگیرسێنن.

ـ دوێ شەوێ لە جەنگەڵەکانی باکوور شەمەندەفەر لە بەفر چەقیوە.

گورگەکانی جەنگەڵ و دارستانی دەوری ڤێدێ لە برسان هرووژمیان هێناوەتە شار. هەموو رێییەکان گیراون.

ـ بچۆ بڵێ قاوەیەکم بۆ بێنن.

رێك رووبەڕووی فرۆشگای "فریشتە" میل تیادەی قاوەچی دووکانی هەڵگرتووە.

به نێوەڕاستی گۆڕەپانەکەدا دەڕۆم و سەرم لە قاوەخانەکە دەنێم.

ـ کووپێك قاوە بۆ جەنابی گۆشێ.

یەکێك لە شاگرد قاوەچییەکان دەڵێ:

ـ کوڕە وەی بە چاوان، هەر ئێستا.

جا لە سەر ئەو پەردەیەوە کە بە پێش شتەکانیاندا داوە، بانگ دەکا:

ـ قاوەیەکی جوان بۆ مامە پۆم نێئاتا.

جەنابی میل تیادە وەها بە سەرسووڕمانەوە سەیرم دەکا، دەڵێی یەکەم جارێتی دەمبینێ. وەك بڵێی دوێنێیش دیتوومی.

ـ راوەستە بزانم کوڕی باش. تۆ لە دووکانی فریشتە کار دەکەی؟

ـ بەڵێ کاکە.

ـ بوویەتە شاگردی پۆن نێئاتا؟

ـ بەڵێ.

ـ ئەو موعجزەیە کەی رووی داوە؟

ـ دوێنێ بەیانی.

ـ عەج جایب!!

ـ دەی باشە. قاوەی ئاغاکەتت لەبیر نەچێ.

ـ دڵنیا بە.

میل تیادە هەتا دەڕۆم و دەچمەوە نێو دووکانی فریشتە، هەر وا بە سەرسووڕمانەوە سەیرم دەکا و چاوی بە دوومەوەیە.

ئاغا دیسان پێم دەڵێ:

ـ چیی نەماوە بۆ نیوەڕۆ. هەست دەکەم لەو بەرپشتوێنەمەوە جێی شتێك بەتاڵە. کوڕی چاك بە و بە قەڵەمبازێك خۆت بگەیەنە بەر ماڵی زەنبیل و نانی نیوەڕۆکەمم بۆ بێنە. بەڵام ئاگادار بە، خۆ دڵۆپێکی بڕژێ، کات لە پێستی سەری دەئاخنم.

ماڵی ئاغا رێك لەوبەری شارییە و لای سکریۆشتێ. چوون و گەڕانەوە رێگەبڕینێکە، بەڵام چار چییە؟

بەفر لە بن کالەکانمدا کرتەی دێ.با و بۆران وەك پەڕی باڵندە دەمخولێنێتەوە و خۆم بە دار و پەرژینانەوە دەگرم بۆ ئەوەی با نەمبا. کە دەگەمە چوارڕێیانەکان، سەرم لە قەپێلکم دەنێم و پشت لە بایەکە دەکەم و پاشەوپاش دەڕۆم.

ـ دەستتان ماچ دەکەم خاتوون، ئاغا ناردوومی بۆ نانی نیوەڕۆی.

ـ نانی نیوەڕۆ؟ گووی چۆنیش دەخوا. بۆ بەیانی کە ملی خۆی دەشکاند، دەستی لە گیرفانی نا بڵێ ئەوە دوو فلس و بچۆ ژەهری مارێکی بۆ نیوەڕۆ پێ بکڕە؟ دوێ شەوێش بە ملی شکاوی کەڕەی بەیانی بوو کە لە مەیخانە و قومارخانە هاتەوە. خۆ بە ملی شکا و گردەڕانی وردی دەزانێ چڵەپووشکەیەکیش بۆ ئاوردوو لەو ماڵەدا نییە؟ نا. هەر رۆحیشی ئاگادار نییە. نە ئاگای لێیە و نەدەیەوێ ئاگاشی لێی بێ. بۆرەپیاوی هیچوپووچی

هەرچیوپەرچی. جا وەرە سەگباب دەنێرێ و داوای بەخشش و دەستودیاریشم لێ دەکا. ئەی یاخوا دارزێی هەی پیاو.

ئاغاژن هێندە گریاوە چاوی دەڵێی گۆمی خوێنە. دوو کچۆڵەی بە نووکەنووکی زەنگبزرکاوی بە باوەشەوەیە و دەمولەوسیان شیراوییە و لچیان داچەقیوە.

ـ یاڵا دەی تۆزێك ئەو جووتەم بۆ راژێنە بەشکم خەوی خێریان بێ و تاوێك بنوون. یاخوا تا قیامەتێ سەر هەڵنەهێننەوە. خوا بیانکوژێ هەر ناهێڵن تاوێك بسرەوم و پشوویەك بدەم.

کچەکان لە باوەش دەکەم. جا هەر دەڵێی لەوە پێش قەراریان لەگەڵ داناوم، هەر دێنە باوەشم، هەموو گیانم گواوی دەکەن.

ـ ئەی شەیتانینە، دەی باشە، ئێستا تەواو خاوێن بوویتەوە. زوو بچۆ بە بەفر خۆت بسرەوە. پێت ناخۆش نەبێ ها، ئەوە شانس و بەختە رووی تێ کردووی. ئەی خۆزگە یەکەم جار کە دایکم لە لەگەنی دەخستم، گووی بەسەردا کردبام، شانس و بەختم دەبوو و نەدەبوومە ژنی ئەو مێلۆگۆشە سەگبابە هیچوپووچە.

هەر سەعاتەکە زەنگی نیوەرۆ لێ دەدا، ئاغا زەنبیلەکەی دەکاتەوە و، قاپ و قاچاغ لەسەر پێشخانەکە ریز دەکا و دەست دەکا بە خواردن. شەوێ کە بە تەنێ دێمەوە، زەنبیلە بەتاڵەکە لەگەڵ خۆم دێنمەوە.

ئاغا خۆی زۆر درەنگ دێتەوە ماڵێ. جاری وایە پاش نیوەی شەوێ، یان بەرەربەی بەیانی. من لە ژوورەکەی زینای کارەکەریان دەنووم. کچێکی قەڵەوەی تەروبری گۆشتنە و دەستی زل و خەپەن. زیاتر خەریکی گامێشەکانە تا کاری ماڵێ. گەورەکە چوار گامێشی تێدایە.

سێیان ڕەشن وەك قەیتەران و یەكێكیان سپی سپییە وەك كولووی بەفر. لە سایەی سەری ئەو گامێشانەوەیە كە ئاغەژن هەرچۆنێك بێ بەڕەیماڵەكە لە ئاو دەردێنێ: شیرەكەیان بە دەر و دراوسێ دەفرۆشێ.

نیوە شەوە، ئاغا بە ئەسپایی گۆشەی دەرگاكە دەكاتەوە. زینا كە وەك پشیلە خەوی سووكە، دەردەپەڕێ و دەرگای لێ هەڵدەگرێ. من ئەوەندەی بۆم دەكرێ هەوڵ دەدەم خەوم لێ بكەوێ و هیچ نەجووڵێم.

ـ ئەو هەتیوە چ دەكا؟ نوستووە؟

ـ وا خەوتووە، تۆپی پێوە نێی هەڵناستێ.

ئاغا بە سەری پەنجەی پێ دەچێتە دەرێ. لە پڕ دەرگا تەق و شەق وێك دەكەون و دەبێتە قیامەت. ژنی ئاغا هەرا دەكا و دەقیژێنێ:

ـ كوڕە هەی گەماری بێغیرەت، ئەوە دیسان چووبوویە زگ زینا؟ ئەوە ساڵێكە، لەوەتەی ئەو دوو جاشكەم بووە، كار و پیشەی هەموو شەوت بووە. نازانم چۆن دەتوانی ئەو قەڵافەتە زەبەلاحەت راگری.

حەوشەكەی ماڵی ئاغا زۆر پانوبەرینە و خانووەكە لە نێوەندی دروست كراوە. كۆڵانی چۆل كە بەفر رێگەی هاتوچۆی خەڵكی گرتووە، هەتا مەزراكانی دەرەوەی شار دەكشێ.

زینا لە تاریكیەكەدا لێم دەپرسێ:

ـ گوێت لێیە؟

ـ گوێم لێیە.

ـ ئێرە ماڵ نییە، شێتخانەیە.

ـ لە کەیەوە کار بۆ پۆن نێئاتا دەکەی؟

ـ دوو ساڵە.

ـ وەڕەز نەبووی؟

ـ بووم. بەڵام خۆڵی کوێ وەسەرخۆم بکەم؟ بچمە هەر جێیەکی دیکە هەر وایە. لەوانەیە لەوەش خراپتر بێ.

ـ ئاغەژن لێشت دەدا؟

ـ نا.

ـ بێت و دەستت لێ هەڵێنێتەوە چ دەکەی؟

ـ چاوی دەردێنم.

تلێك دەدا و خۆی گرمۆڵە دەکا و لێفەکە هەتا بن چەناگەی هەڵدەکێشێ.

دەڵێ: ئیدی دەبێ بنووین. چیی نەماوە رۆژ بێتەوە.

خەوتن. تیەح... هەوڵ دەدەم، بەڵام ناتوانم. خەو، لە تاریکایی ژوورەکەدا وەك مار دەخوشێ، دێتە پێش و دەچتەوە پاش. تەختی خەوەکە پان و بەرینە. لەم دیوارەوە تا دیوارەکەی دیکەیە. لە گۆشەیەکەوە من خۆم گرمۆڵە کردووە و لەویتریش زینا.

ـ دەپرسێ: خەوتووی؟

ـ نا.

ـ منیش نەخەوتووم.

هەڵدەستم پەردەکە لادەدەم. تاریکیی ژوورەکە تۆزێك دەشکێ.

ـ لە دەرەوە هەوا ساردە. ژوورەکە بووەتە زەمهەریر.

کۆڵان دوورە. بەو حاڵەشەوە کرتەکرتی بەفرەکە لە بن پێی ئەو رێبوارەدا کە درەنگانێك دەچتەوە ماڵێ، دەبیستین. سەگەل لە حەوشەکەدا دەخولێنەوە و بە تووڕەییەوە پەلاماری ئەوبەری پەرژینەکە دەدەن.

کۆڵانەکە لە بەفر داپۆشراوە. بەفرەکە کە دادەکا، کۆڵانەکە زۆر جوان دەبێ. سپی سپی. هەموو ماڵێك کڵاوێك ریشۆڵەدار دەکاتە سەری. هەموو سەردەرانە و پەرژینێك کڵاوێکی سپییان بەر دەکەوێ. درەخت لە بن باری ئەو سپیاییەدا دادێنەوە. بەڵام بەفرەکە لێی ناکاتەوە خەڵك بە کۆڵانەکاندا دەست دەکەن بە هاتوچۆ و لە بن پێیاندا بەفرەکە پاکی و بێگەردییەکەی نامێنێ.

ـ بە قوربان، ئازیزم، من چارەڕەشت دەکەم.

کە رووناك دەبێتەوە جلوبەرگم لەبەر دەکەم و دەچمە گەوڕ.

جاری جاران بۆگەنی دەباغخانە و پێستە و چەرمی نێو تێژاوم لێ دەهات، ئێستا بۆگەنی گەوڕ و کەمرە.

لە فرۆشگای فریشتە، لە نێو ئەو شتە جۆراوجۆرانەدا کە دەیانفرۆشین، تەنیا بخوورەکە بۆنێکی خۆشی هەیە. تابووت و جاو کە هەر بۆنیان نییە.

گەوڕەکە دەماڵم. مانگاکان رنەك دەکەم. ئاخوڕەکەیان پڕ دەکەم لە یۆنجە. گادۆشی شیرەکان دەبەمە بەر دەستی زینا بۆ ئەوەی بێ و بیاندۆشێ.

لە گەڕەکی خواپێداوانی شار، شەو نییە ماڵێك نەبڕن. چیان وەبەردەست بکەوێ دەیبەن. تالاّنکراوان هیچیان بۆ نامێنێتەوە کە لەبەری بکەن. شار لەبەر دز، دەڵێی هاتوهەراکەی رۆمایە.

زینا وەك ئامۆژگاری پێم دەڵێ:

ـ داریە، نەچی ببیتە دەسکیسی دزان. دەتگرن دارت لە قوونێ دەبڕن ها. ئەودەم تا دەمری دەبێ لە زینداندا بی.

ـ من نەهاتوومەتە شاری بۆ دزیکردن. هاتووم کار بکەم و یەك دوو قەرەپووڵ کۆ بکەمەوە.

ـ پووڵ کۆ بکەیەوە؟ حەی حەی... یانی بۆیە هاتوویە لای مێلۆگۆشێ؟ هەی خوا خێرت بنووسێ.

ـ یانی بەراتەکەم دەخوا و نامداتێ؟

زینا شانێك هەڵدەتەکێنێ و هیچی دی. هەست دەکەم مارێکی سارد بە سەر سینەمدا دەخوشێ.

ـ دەبێ لێم روون بێتەوە. ئاخر من نەهاتووم بێ هەق و بەرات کاری خۆڕایی بکەم.

لە فرۆشگەی فریشتە هەرچی کەرستەی کفن و دفنی مردوانە هەیە: مۆم، جاو، ئەو جلوبەرگانەی بە هەزار زەحمەت لە جلوبەرگی رزیو دووراون و تاوێکیش چییە بە بەری بنیادەمەوە خۆ ناگرن، کەوشی تێککراوە بە ژمارەی جیاواز کە تەختی بنی و پاشنەکەی لە هەویری کاغەز دروست کراوە.

تابووتەکان لە بنەبانی دووکانێ لەسەر یەك کەڵەکە کراون. تۆپە جاوە سپییەکان و جاوی ڕەش هەر شەقڵیان نەشکاوە و لە قەفەزەکاندان. تابووتی ئەو کچەی بە عازەبی بمرێ، جاوی ڕەشی تێوەدەپێچن.

ـ مشتەریی داماو خەمی دنیای لەسەر دڵە. تاقە شتێکی بیری لێ ناکاتەوە چەنەلێدانە. هەرچی پێی بڵێن دەیدا و دەڕوا بەدوای نەگبەتییەکەیدا. پەلەیەتی خێرا تەرمەکە لە ماڵێ بەرنە دەرێ. چەندی ئازیزیشت بێ، کە مرد، دەبێ لە چاوترووکاندنێکدا بیشۆی و بینێژی. تەرمی مردوو نابێ مەحتەل بکرێ، بەتایبەتی هاوینان کە سەعاتێك نابا بۆگەن دەبێ.

ـ کاك هورمز، ئەو ڕۆژە بۆ هاتیە کەلەشمەوە کە بێم کار بۆ گۆشێ بکەم؟

ـ یەکەم ئەو هورمز و کا هورمزە بەلاوە بنێ و وەك هەموو خەڵك بانگم بکە تووتی یان کاك تووتی.

ـ ئاخر تووتی ناوی دووکانەکەتە.

ـ زۆر باشە. من هەر ناوی خۆمم لەسەر دووکانەکەم داناوە و بڕیومەتەوە. هەمووان پێم دەڵێن تووتی، تۆش بانگم بکە تووتی.

ـ بۆچی ختوورەت خستە دڵم کاك تووتی! بێمە ببمە شاگردی گۆشێ؟

ـ چونکە شاگردێتیی ئەو لە هیی دەباغی باشترە.

ـ دەی جا ئێستا دەبێ گامێش تاقەت بکەم. زینام لێ بووەتە خانمەخان.

ـ دەی چییە، گامێش تاقەت بکە. هەتا بەهارێ کە ڕێگەکان گیراون لە فرۆشگا هیچ کارێکت نییە و دەبێ لەبەردەم تابووتاندا دانیشی و دەست لەسەر دەست دابنێی. لێرە

خەڵك هیچ پەلەیان نییە بۆ مردن. ئەگەر پۆن نێئاتا چووبایە لە ئەسكەندەرییە دووكانی كردباوە بازاڕی گەرمتر دەبوو.

ـ بۆ؟ یانی شاری ئەسكەندەرییە لێرە گەورەترە؟

نا. بەڵام لە ئەسكەندەرییە دەست لەسەر هەركەس دانێی، گرانەتایەتی. زۆربەیان بەهاران و پاییزان دەمرن، بەڵام لە درێژایی ساڵ رۆژ نییە یەك دووانێكیان نەمرن.

ـ لێرەش گرانەتا كەم نییە.

ـ راستە. بەڵام نەك بە قەد ئەسكەندەرییە. یەكەم، دەوراندەوری خانووەكانی ئێرە باخ و باخچەیە، دووەم: خواردنی خەڵك تۆزێك باشترە. جگە لەوەش، خەڵكەكەشی كاریان بە كتێب و خوێندنەوە نییە و ساڵەو ساڵ چاویان بە دێڕێك كتێب ناكەوێ. هەر دەڵێی دەترسن نەكا كتێبەكە ببێتە چقڵ و لە چاویان رۆ بچێ و بیتەقێنێ.

تاوێك خەیاڵ هەڵیدەگرێ و لە پڕ تووڕەییەكەی دەتەقێتەوە:

ـ تەح لەو كاولاشە، لەو كاژێرە پیسە، ئێرە شار نییە، گەمژەخانەیە. ئەوە ساڵێكە تا ئێستا كتێبێكم پێ نەفرۆشراوە. ئەی لەو كاولاشە، لەو كاولاشە پیس و پۆخڵە...

زۆرم حەز لێ بوو كتێبی لێ وەرگرم، بەڵام كەی توانیبام بیخوێنمەوە؟ ئەگەر مێلۆگۆشێ بمبینێ كتێب دەخوێنمەوە، بیرازم دەكا.

ئاخری فریشتەش هیچی بۆ نامێنێتەوە. وەختێك داوای بەراتەكەمی لێ دەكەم، دەخیلەكەی دەردەكێشێ و دەڵێ:

ـ وەرە سەیری بكە، ئەگەر پاپاسیەكی تێدابوو... وەختایەك كەس نایەوێ بمرێ....

حەوت پۆلیPoli، حەوت دراوی شین کە گۆشەکانیان بە پەڕی کاغەز پێکەوە نووسێنراونەوە و جوان و زەریف نوشتاونەتەوە، لە توورەکەیەکم گرێ داون و لە بن کراسەکەم لەسەر سینگمم قایم کردوون. ئەو پارەیە بەرهەمی ئەو هەمووە رۆژە گیانکەنشتەیە. بۆ ئەم پارەیە، سالێکی رەبەق بۆ بابی خۆم ئاقلێ بووم. لە دەباغخانە کە نینۆکەکانمی هەلوەراند و پێستی دەستمی سووتاند و پەنجەکانمی وەك سیرمە چرچولۆچ کرد و پاش چوار مانگ گیانکەنشتی، هەر ئەو دوو پۆلییە دەستی ماچ کردم. هەر باش بوو. بابی پێنج پۆلیی دیکەش کارم بۆ جەنابی بانیکا ڤۆرتەیان کرد.

شتومەکفرۆشەکەی بانیکا لە تەنیشت دەباغخانەکەوە بوو. بانیکا کابرایەکی مل ئەستووری ریشنی ئەسمەر بوو، کە تەنیا عەیبێکی هەبوو، لە کەس نەدەچوو. نا خوایە، عەیبێکی دیکەشی هەبوو: زمانی پسك بوو. بەروانکەیەکی سەوزی دەبەست و بەو لاق و لەتەرە گێڕەوە بەردەوام لەبەر دووکانەکە دەهات  و دەچوو. هەر دەتگوت بە چێوشەق دەڕوا. خوێ و بەردەخوێ و مۆم و گوریس و پەت و جاری واش بوو قیری بە دێهاتییەکان دەفرۆشت. قیرەکە، لە چەلەنگێکی گەورەدا و لەدەم دەرگاوە لە بەر تاوەکە دەبریسکاوە.

چونکە شاگردی نەبوو، فکری کردەوە من راگرێ. لە چاو راکەڕاکی دەباغخانە، ئەو وردکە کارەی بۆ بانیکام دەکرد، هەر لە رابواردن دەچوو. لە بری ئەوەی پێستەی خاو لەسەر کۆلم دابنێم و بیبەمە ژێرزەمینەکە و لە کۆلی تیژاوەکەی بخەم و دوو حەفتە دواتر دەریبێنمەوە و بیبەمە بەر تاو و لەسەر تەنافەکە هەلێخەم، لە بری ئەوەی پێستی لە تیژاودا خووساو بە کاردەك خاوێن بکەمەوە و بەردەوام تا مۆخی ئێسقانم تەڕ بم، لەبری ئەوەی بۆگەنە

خنکێنەرەکە تێکەڵاوی گۆشت و خوێنم بێ، لەبری هەموو ئەو شتانە، دەبوو تا تاریکان دادەهات، لەبەر دووکانەکە راوەستم و تەشك و داوێنی گوندییەکان بگرم و جا پێیان خۆش بێ یان ناخۆش، بیانبەمە دووکانەکەوە.

ـ لە ئێمە بکڕن هاووڵاتی. ئێمە لە دووکانەکانی ئەوبەر هەرزانبابیترین.

دووکانەکانی ئەوبەریش کە هەر وایان دەکرد، دڵیان لێمان نەدێشا.

ئەگەر راستیت دەوێ، ئەوە هەر کار نەبوو. پێم وابوو جۆرێك رابواردنە و درۆنەبێ هەر بە گاڵتەو پێکەنینیشەوە رامدەپەڕاند.

ناخۆشترین بەشەکەی، ئەو بەردەخوێ گەورانە بوون کە دەبوو هەموو رۆژێ لە دووکانێ بیانهێنمە دەرێ و لە پیادەڕێیەکە بە دیواریانەوە هەڵپەسێرم و شەوێ یەك یەك بیانبەمەوە ژوورێ و لە گۆشەیەك هەڵیانچنمەوە. ناخۆشییەکی دیکەش، چەلەنگە قیرەکە بوو. من لایەکیم دەگرت و ئاغاکەم لایەکەی دیکەی. کە هەڵماندەگرت، قرچە لە ئێسقانمەوە دەهات، ئیتر کارە و دەبوو بکرێ و... بە هەر نەگبەتییەك بوایە رامدەپەڕاند.

ئاغا کوڕیژگەیەکی هەبوو، کە ئەویش ناوی بانیکا بوو. لەگەڵ باوکی دەتگوت سێوێکە و لەتت کردووە. سەرزلێکی رەقەڵە و ئەسمەر بوو، لە بەشەری خوای نەدەچوو و پسکیش بوو. جنێوی وای لە پارسەنگم دەنا، لە قووتووی هیچ عەتارێکدا نەبوو. باوکەش لە خۆشیی ئەو زمانپاراوییەی شاگەشکە دەبوو. منی لێقەوماویش دەبوو ئێوارێ تا ماڵێ لە قەڵاندۆشمی بکەم و ئەو جادە گەورەیەی دەکرێ بڵێم رێك نیوەی شاری گرتبوو، ببڕم و فەرخەئاغا بەرمەوە نێو کۆشك و سەرا.

ئاخ، بریا ڕۆژێك ئاوا بردبامە گۆڕستان، جا چەند بەکەیف دەبووم.

*

*

*

گوتم گۆڕستان...

گۆڕستانەکە لە لای ڕۆژئاوای شارەوە لەسەر گردێکە. هەرچی گۆڕستانی لە ژیانمدا دیتوومە لە سەر گردان بووە. ئەگەر چاوی مردووەکان زیندوو بوایە ئەوا لە کەلێنێکی گۆڕ و تابووت و ئەو گڵەوە کە وەسەریان کردوون و ئەو گیایەڕا کە لەسەریان شین بووەتەوە، دەیانتوانی سەیری شار و خانوو و کۆڵان و خەڵك و باغ و باخچەکان بکەن.

ـ چاوی مردوو زیندوو نابێ. کەواتە هەوڵ بدە چەندی دەتوانی چێژ لە چاو و بینابیت وەرگرە.

ـ ئەدی بە گیانی دایکت، خەریکم هەوڵ دەدەم.

ڕۆژێك دوانیوەڕۆ من و کاك تووتی بەدەم پیاسەیەکەوە بە هەموو گۆڕستانەکەدا گەڕاین.

ئەو کاك تووتییەی ئێمە کە تابلۆ و قەڵەم دەفرۆشێ و چاوەڕێیە قەساب و کاسبکار کە لەم شارەدا هیچی بەلای کتێبدا ناچن، خەڵك کتێب بکڕن، یەکێك لە سەیروسەمەرەترین کەسەکانی دنیا.

پێی گوتم: تۆخوا وەرە سەیر، ئەو دەوڵەمەندانە پاش مردنیش بە زەبری پارە و پێگەکەیان، دەیانەوێ خۆیان بەسەر خەڵکدا بسپەێنن. لە گۆڕستانەکەشدا، گۆڕەکەی خۆیان وەك کۆشك

و بارەگا بە کەرپووچ و مەڕمەڕ دەڕازێننەوە. ئەوانەی لە بن ئەو گڵەدا نوستوون، لە تابووتی ئاسنیندا دەڕزێن و دەپوێن و دەبنەوە گڵ، بەڵام خاچەکان بە پیتە زیڕینەکانیانەوە هەروا ناوەکانیان بە چاوی خەڵکدا دەکەن. رادەسپێرن تاجە گوڵینەی قورقوشمینی وا بە کێلەکانیانەوە هەڵواسن، کە هیچ کات نەژاکێن و هەڵنەوەرن. تف، من هیچ کەیفم بە گۆڕستان نایە.

ـ کەواتە وا باشتر بوو چووباینە کەناری ڤیدێئا کاك تووتی، یان دارستانەکە.

ـ جارێکی دی دەچینە ئەوێ.

لەبەر گۆڕێکی زۆر گەورە راوەستاین. لە راستیدا کۆشکێکی گەورە بوو کە چەند بنیادەمی زیندوو دەیانتوانی تێیدا بژین. لەبەردەم ئەو کۆشکەی لە مەڕمەڕی سپی دروست کرابوو، فریشتەیەکیان دانابوو کە سەری بەردابۆوە و دەگریا. سەری باڵەکانی شکابوون. لەسەر کۆڵەکەیەکی گەورە دایاننابوو، کە یانی ئەوە لە ئاسمانەوە دێ بنیشێ. چاوە مەڕمەڕییەکانی لە سەری نیوەپەیکەرەکە بڕیبوو کە سەر پایەیەکی کورت دانرابوو. پەیکەرەکە لە مەڕ مەڕ دروست کرابوو. تەختی عەرزەکەش. پەیکەرە نیوقەدەکە لە مەفرەق بوو و پیاوێك بوو کە قەڵافەتێکی شێلگیر بەڵام ژاکا و بزڕکاو و سمێڵی باریك و ردێنێکی کورتی هەبوو.

ـ ئەمە پەیکەری ئامێدێیۆ کاراکە. لە مریگۆلای لای خۆمان هەموو مڵکەکانی دەم زێ هیی ئەو بوو. لە ١٩٠٧ـدا خەڵکێکی زۆری بەدەستی خۆی کوشت... شۆڕشەکەی ١٩٠٧ـت لەبیرە؟

ـ لەبیرمە. ئەودەم ئیدی گەورە ببووم و دەمفامی.

ـ هەر هەموو مەملەکەت راپەڕیبوو. لە مریگوالا، گوندەکەی ئێمە، خەڵك ئەوەندە لە ئاغا و نۆکەر و جەندرمەکان دەترسان، پێیان وابوو وا باشترە تۆزێك سەبر بگرن. لە هەموو ناوچەیەك عەمبارەکانی ئاغاواتیان سووتاندبوو لە مرێگوالا نەبێ. خەڵکەکە دەیانویست لە دەرفەتێکدا بیری خۆیان بکەنەوە. ئیدی وابوو نەگبەتی بەرۆکی گرتن: ئاغا دەستی خۆی رەپێش خست و زووتر قۆڵی لێ هەڵماڵی و گورزی خۆی وەشاند. هەر ئەو جانەوەرەی لێرە لە بەردەمتە و کۆتەڵە چەپەڵەکەیان لە برۆنز بۆ دروست کردووە. لەشکری هەڵگرت و هێنایە سەریان. پارێزگار زۆر شتی بە قسە دەکرد. سەربازەکانی دەستە دەستە کرد و فەرمانی پێ کردن ماڵ و ژیان و عەمبارەکانی بپارێزن. فەرماندەی سەربازەکان ملازمێك بوو، کە دەبووە خوشکەزای ئاغا. دەی باشە، ئێستا خۆت دەتوانی بیهێنییە پێش چاوت چ رووی دا: خاڵ و خوشکەزا بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە دەستیان پێ کرد و بە کەیفی دڵی خۆیان تێ کەوتن و دەستیان کرد بە تۆقاندنی گوندییەکان. گوایە گوندییەك بەرازێکی لە ئاغا دزیبوو، ئاغا ئەوەی کردە کراسەکەی عوسمان. لەوانەیە کوودەڵەکەی تێکەڵی رەوە بەراز سێسەد سەرییەکەی گوند بووبێ یان هەر سەربازەکان خۆیان خواردبێتیان. چونکە نە کەس تەماحی خواردنی ئەوانی هەبوو، نە لە لای عەمبارەکانیش. خۆ ئەو داماوانەی نێو سەربازخانەکانیش، ئەوەندەی بەرپرسەکانیان بیر لە تفەنگ و فیشەکیان دەکەنەوە، بیر لە خواردنیان ناکەنەوە. ئاغا دەستی هەڵنەدەگرت. گوندی راپەڕیبوون و زیانیان لێ دابوو. فەرمانی دا چەکدار یەك بە یەك ماڵەکانیان بپشکنن و چیی بێچووە بەرازیان دی، هەی

دێی لێ بکەن و بیهێننە حەوشەی ماڵی ئاغا. وەك قەرەبووی خەسار، بێچووە بەرازی هەموو ئاواییەکەیان کۆ کردەوە دەستیان بەسەردا گرتن. تازە بەوەندەش دانەکەوت. گوتی گوندییەکان دەرگای عەمبارەکانیان شکاندووە و چیی دانەوێڵە و خەڵەیە بردوویانە. ئەگەر لە بیرت بێ ساڵی راپەڕینەکە وشکەساڵی بەروبووی هەمووی سووتاندبوو. گوندیی داماوی نەدار بۆ پەیداکردنی لوێچێ دانەوێڵە گا و زەوییەکەیانیان فرۆشت بەشکم زگی ژن و منداڵەکەیانی پێ تێر بکەن. سەگباب فەرمانی دا لە هەرجێیەك خەڵە دانەوێڵەیان دیت زەوتی بکەن. تەنانەت لەو یەك دوو توورەکە ئاردە گەنمەشامییەش خۆش نەبوو کە چەند گوندییەك توانیبوویان تا ئەودەم وەك چاوی خۆیان بیپارێزن. چەکدار شەو و رۆژ بە تفەنگی پڕ و لەسەرپێ بە ئاواییدا دەگەڕان. ئیتر نە دەکرا بجوولێ و نە هەنگاوێك بنێی.

شۆڕشەکە تەواو سەرکوت کرا، لە گوندەکانی دەوروبەردا دەستیان کرد بە بێسەروشوێنکردنی راپەڕیوەکان. ئامێدێیۆ کاراك دەستی لە کەلەکەی نابوو و سەیری دەکرد. سەیری بکە ئێستاش ئەوە لە بن خەروارێك گڵدا سەری ناوەتەوە. بەڵام ئەودەم لێی سوار دەبوو و بە ئاواییدا دەگەڕا و سەرباز و خوشکەزا ملازمەکەشی وەدووی خۆی دەدا. بە حەوت تیرێکەوە دەچووە نێو حەوشەی خەڵك. لە خەڵکی وەژوور دەکەوت و هەر وا هەڕەمەکی هەرکەسی وەبەردەست کەوتبایە تەقەی لێ دەکرد. لە حەفتەیەکدا خوا بزانێ خوێنی چەند کەسی رشت. کە لە پیاوکوشتن وەڕەز بوو و پێی وابوو خەڵکەکەی وا تۆقاندووە ئیدی پەندی لێ وەرگرن و لەمەودوا یەکسەر بچنە ژێر رکێفییەوە، وازی لە

کوشتار هێنا و بە تێهەڵدان و فەلاقەکردن و جەڕەبابەدان و ناردنی خەڵك بۆ قایمقامی بەدەستبەستراوی قایل بوو.

تووتی هەناسەیەکی هێنایەوە بەرخۆی و گوتی:

ـ هەر ئەو خوێڕییەش تەقەی لە دایکە داماوەکەی من کرد و کوشتی... جار و بارە دێمە ئێمە بۆ ئەوەی تفێك لە گۆڕەکەی بکەم، بەڵام هەر جارێکی دێم، دڵم توند دەبێ. جا فایدەی چی؟ تفەکەم دەکەوێتە سەر ئەو شیناوەردەی کە هیچ تاوانێکیان نییە.

گۆڕستانەکە زۆر گەورە بوو.

لە سەر لووتکەی گردەکە بینایەکی شینی وەك شووشەی لێ بوو، کە لەبەر تیشکی تاوەکەدا دەدرەوشاوە. ئەو بینایە لە شارییشەوە لە نێو درەختە ئەقاقیا و بووزەکاندا دیارە.

لە گردەکە بەرەو بینا شینەکە وەسەر دەکەوین.

بە پەرژینێك دەوری بیناکەیان گرتبوو. بزنەرێیەکیشیان بە نێوان پەرژینەکان و دەرگای گۆڕەکەدا کردبۆوە، کە وردەبەردی سپی دایانڕشتبوو. ئەمبەروئەوبەری جادەکە هەموو گوڵ بوو. زستانان ژاکاو و خەمبار و بەهاران گەش و لێوبەپێکەنین.

لە پشت دیوارە شووشەییەکەوە سەیری نێو گۆڕەکەمان کرد. دیواری بنەبانی هەر هەموو بە وێنەیەك داپۆشرابوو کە لە چوارچێوەیەکی گرانبایی گیرابوو. وێنەکەی هیی ئەو خوالێخۆشبووە بوو. زۆر گەنج بوو. گەنجێکی جوان و ژیکەڵە. بیست ساڵان دەبوو. برۆی باریکو کەوانی بوو و تازە خەتی لێ دابوو. لەسەر وێنەکەوە نووسیبوویان:

کالین کاتالین بازاك

بەردئەستێرەیەکی تیژتێپەڕ

دەرکەوت

درەوشاوە و

نەبەدی بوو

ڕۆح، جەستەی کوشت...

کاك تووتی بۆی روون کردمەوە:

ـ کوڕی ئەو دەرمانفرۆشە بوو کە رووبەڕووی دووکانەکەمانە. هەر ئەو دەرمانخانەیەی تەنیشت دووکانی "بووك". پێرارەکە لە بانیژەی ماڵەکەیانەوە خۆی هەڵداشتە نێو کۆڵانێ. ڕێك رووبەڕووی "تووتییە زێڕینەکە" و فرۆشگەی "فرشتە" جووتێك بینای دوو نهۆمی هەن. شتێك کە لە شارەدا زۆر بە دەگمەن بەدی دەکرێ. یەکێك لەو بینایانە درەمانخانەی کاتالین بازاکە، یەکێکیشیان فرۆشگای "بووك" کە هەر لە کەڕەی بەیانییەوە تا نیوەشەوێ کراوەیە.

فرۆشگاکە هیی ئاتانازێ گۆشێیە: برای مێلۆگۆشێی ئاغای من. ئەو دوو برایە لە هیچ شتێکدا وەك یەك ناچن و چاو لێك ناکەن. مێلۆ تابووت و مۆم و جاو و کفن دەفرۆشێ، ئاتانازێ ئەو شتانەی بۆ بووك پێویستن: تۆڕ و تارا و پێڵاوی سپی و جلوبەرگی دووراوی بووك، کە لە کاتی فرۆشتنێدا تەنگی و فشیەکەیان دەستکاری دەکرێ، ئەویش هەر لەوێ

له پشت دووکانەکەوە لە قوژبنێکەوە کە بەردەوام دوو کچ تێیدا دانیشتوون و دەست بە دەرزی و مقەست ئامادەن.

فرۆشگاکە زیاتر لە وەرزی پاییزاندا پارووی لە رۆندایە.

لە گوندان کە گەنمەشامی هەڵگیرایەوە، زەماوەند دەست پێ دەکا.

فرۆشەرەکانی دووکانی "بووك" کە شریتێکی زێڕینیان وەك نیشان لە یەخەی سەڵتەکەیان داوە، بەیانی هەتا شەو لەبەردەم فرۆشگاکە رادەوەستن و فەرمووی گوندییەکان دەکەن شتیان لێ بکڕن. جاری واشە دەکەونە قۆشمەیی و گاڵتەکردن و سەر دەخەنە سەر پیرەژنێك کە لەبەردەم جامخانەکە راوەستاوە و چاوی بڕیوەتە کەلوپەلەکان و بیرەوەرییەکانی دەمی لاوێتیی لێ زیندوو بوونەتەوە. ژنەگەچینەیەك(مانکەن) لە پشت شووشەکەوە دانراوە و وەك بووکان رازێنراوەتەوە. بووکێك، کە هەرگیز ناچێتە ماڵی زاوا. لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا دەموچاوی چرژاوە و هەتاو لێوە رەنگکراوەکانی هەڵبزرکاندووە.

ـ فەرموو وەرە ژووریٚ کچۆڵە گیان. پێڵاوی سپی و تاج و تاراشمان هەیە.

پیرەژن کە بە شەلەشەل دوور دەکەوێتەوە، وەك بارانی بەهاریٚ جنێویان بۆ دەبارێنیٚ: عەمرتان نەمێنیٚ. یاخوا دەنگتان وەبن حەوت بەردان بکەویٚ و خێر نەبینن.

خاوەن فرۆشگای بووك دەبۆڵێنیٚ:

ـ بەخوا بازاڕی مێلۆی برام لە هیی من گەرمترە. من کەلوپەلی بووکان دەفرۆشم و ئەویش شتومەکی مردووان... خۆ ئێستا خەڵك ئەوەندەی دەمرن، ئەوەندە زەماوەند ناکەن.

هەر بەراستی، ماوەیەکە مردن زۆر زۆر بووە. قەشەکانی هەر چوار کلێسای شار بەردەوام لە تەڵقینن و پێیان ناکرێ سەری خۆیان بخورێنن و بە مردوو ناشتنێ راناگەن. زۆربەشیان منداڵن دەمرن. لە خوارووی شار ـــ چونکە رێك نیوەی شار کەوتووەتە شیوەکەوە ـ هەموو ساڵێ بەهاران چۆمەکە هەڵدەستێ و لافاو کۆڵانەکان دەگرێ و ئاوەکەش کە نیشتەوە لە ماڵە چۆلەکان و حەوشە کاولەکاندا دەمێنێتەوە و دەبێتە گۆلاو و بۆگەن دەبێ. ئەو زەلکاوانە هەتا بەفری زستانێیان بەسەردا دەبارێ، رۆژ بە رۆژ بۆگەنتر دەبن. ئەو تایەی لەو گەنداوانەوە هەڵدەستێ، وەك خۆرە منداڵ دەخوا و هەڵیدەوەرێنێ و وەك مێش لە عەرزیان دەدا. لە فریشتەش، تابووتە بچووك و نێونجەکان باش دەفرۆشرێن.

کاتالین بازاك لە هەڕەتی لاوەتییەوە خەریکی فرۆشتنی شاف و کەپسوول و حەبی رەوانکەر بووە. لە دەرمانخانەکەیدا رۆن لە هەموو شتێك پتر دەفرۆشرێ: رۆن بۆ کوشتنی ئەو ئەسپێیانەی لە نێو گنج و لۆچی کراس و نێفەکی پانتۆڵ و بەر پشتوێنان مات بوون و، رۆنی دژە بیرۆ و گولێتییش.

جومعانە، رۆژی بازارِ گوندی هرووژم دێنن و دێنە دەرمانخانەکەی بازاك. شەرمنانە دێنە ژوورێ. پێیان عەیبە پێ بنێنە سەر کاشییەکەی تەختی دووکان. سامی ئەو دوو تەرازووە بچووکە زەرد و بریقەداری سەر پێشخانەکە و ئەو قەفەزە بەرزانەی شووشەکانیان تێدا ریزکراوە، دەیانگرێ.

ـ چیێتان دەوێ؟

ـ بیسکویتم دەوێ رۆڵە گیان. نەوەکەم زگی هەستاوە و لووی دەرکردووە. پێم وایە جرِوجانەوەر لێی داوە.

ـ چیت دەوێ خوشکە؟

ژنە سەری دەباتە بن گوێچکەگرانەکانی دەرمانفرۆش و بە سرتەیەك پێی دەڵێ:

ـ رۆنی دژە گولی.

نۆکەرەکانی ئاغا کە لە عەمبارەکان کار دەکەن، ئەو شوانانەی رانەمەڕ دەلەوەڕێنن، گاوان و بەرازەوان، هەر هەموویان ئەو رۆنی ویشکەبیرۆ و گولییەیان دەوێ. دەرمانفرۆش رۆنەکەی لە قوتووی بچووك بچووکی رەنگ خۆڵەمێشی دەکا و دەیانداتێ و بۆ ئامۆژگاری پێیان دەڵێ:

ـ دەبێ برێك زیاتر خۆتان بشۆن.

ـ شوشتن، ئەی خۆ دیارە خۆمان هەر دەشۆین، ئاخر ئێمەش بنیادەمین. بەڵام کە کراسمان نەبێ بیگۆڕین، رۆژێ سەد جاریش خۆت بشۆی هەر بە پووشێك. ئەگەر پاش خۆشوشتن هەر ناچاری بی دیسان ئەو جوبەرگە چڵکنانە لەبەر بکەیەوە، چۆن دەکرێ بڵێی خاوێنم؟ لۆکە گرانە ئاغا. دکتۆریش هەروەتر. ئەوەی نرخی نییە مردن و گیانکەنشتیی ئێمەیە.

خەڵکەکە لە دەرمانخانەکەدا کڵاوەکانیان دادەنێن و بە دەستیانەوە دەگرن. لە دووکانەکانی دیکە نا. کڵاوە پاپاخییەکانیان بە تیلاگی سەریانەوە دەنێن، دەیبەنە پشتەوەی سەریان و تا چەنەیان شل دەبێ چەنە لێ دەدەن. لە دەرمانخانە چەنە لێ نادەن و دەرمانفرۆش چ نرخێکیان پێ بڵێ، قسەی لی ناکەن.

دەرمانفرۆشەکە کابرایەکی وردیلەی نەخۆشە. زیاتر لە بووکەڵەیەکی گەورە دەچێ. هەر سەری زلە، سەلکێکی زلی رووتاوە و چاویلکەیەکی زلیشی لە چاویدایە. ژنەکەی ساڵێك پاش مەرگی کوڕەکەیان لە خەفەتان دیقی کرد و وەزگی دا.

کاك تووتی هەروا دەگێڕێتەوە:

ـ ئەدی. کوڕە چەترێکی هەڵدابوو و بەدەستییەوە گرتبوو و خۆی لە بانیژەکەوە هەڵداشتە کۆڵانێ.

ـ باشە بۆ بەچەترەوە؟

ـ ویستبووی بزانێ ئاخۆ دەتوانێ بفڕێ یان نا.

ـ ئەی دیارە شێت بووە؟

ـ نا شێت نەبوو، هەر تۆزێك ئەقڵسووك بوو.

ـ تێناگەم، هەندێ کەس بۆچی بەدەستی خۆیان، وا لە خۆیان دەکەن. هەرچۆنێکی لێکی بدەیەوە خۆ ئاخری هەر دەمری، ئەدی بۆچی خۆت دەکوژی؟

ـ لەبەر لاوازیی خۆیانەوە وا دەکەن. لە بێغیرەتییانە. خۆ هەموو کەسێك غیرەتی ئەوەی نییە بەرەنگاری گیروگرفتەکانی ژیان بێتەوە.

ـ جا باشە کوڕی دەرمانفرۆشێك، دەبێ گیروگرفتی چ بن؟

ـ هەتا لە دواناوەندی بوو، هەر یەکەم بوو. کوڕەکەی بازاك دەڵێم. مایەی شانازیی خێزانەکەیان بوو. دەرمانفرۆشە دەیگوت، کوڕەکەم دەبێتە زانایەکی گەورە. خەڵکیش هەر پێیان وابوو. کوڕێکی زیرەك بوو و زۆریش ژیر. کە دواناوەندیی تەواو کرد، باوکی ناردییە

فەرەنسا بخوێنێ. حەزی لێ بوو کوڕەکەی ببێتە ئەندازیار. چونکە هێشتا لەم وڵاتەمان کەس نەببووە ئەندازیار. لە پاریس کوڕە دڵی دەچێتە سەر کچێك. جەنگ کە هەڵاییسا و ناچار بوو بێتەوە، نەیتوانی نازدارحەیرانەکەی لەگەڵ خۆی بێنێتەوە. هەر بۆیە وردە وردە لە کەللەی دا. خۆی لەو سەرەوە هەڵداشتە نێو کۆڵانەکە و هەپروون هەپروون بوو. چەند رۆژێك هەر ناڵاندی و نەڕاندی و ئاخرییەکەی چاوی لێك نا.

کالین کاتالین بازاك وەك لە وێنەی نێو گۆڕەکەیەوە دیارە، کوڕێکی زۆر ژیکەڵانە بووە. چاوی گەورە و گەش بوون. ئەو چاوانەی کە زۆر لە چاوی نێو وێنەیەك زیندووترن.

ـ بە قەبری بابی خێو ئەو گۆڕستانەش. کاك تووتی با بچینەوە نێو شار.

لە گردەکە داگەڕاین. بەهار خەریك بوو بارگەی دەپێچاوە. ئەقاقیا نوقمی گوڵی زەرد بوو. پەرژینی دەوری گۆڕستانەکە کەوتبووە بن گوڵووکی سپیی بۆنخۆشەوە.

خۆر وردە وردە دادەگەڕا. هێورهێور دەڕۆیشتین. لە بەهارێوە بە پێخواسی دێم و دەچم. بە پارێزەوە دەڕۆم نەکا سەرەنگرێ بم. ئەو جلوبەرگە شڕوشاڵاتانەشم لەکۆڵ خۆم کردبوونەوە.

❊

❊

❊

رۆژێکیان دیتزای پوورم لە گوندەکەی خۆیانەوە لە سێکاراوە هاتبووە شاری. لە پێش دووکانەکەی بانیکا ڤۆرتێیان تووشم بوو و هاتە پێشێ و ورد ورد لە سەرتاپێم ورد بۆوە.

چەند جاران بەو چاوانەی لە بن برۆ کوڵکنەکانییەوە دیار نەبوون، سەیری کردم و ئاخری گوتی:

ـ داریە؟ ئەوە لێرە چ دەکەی؟

ـ لێوی درزەکەی نەماوە. تەنیا خەتێکی سپی لە پشت لێوی دیارە کە نیشانەی ئەوەیە سەردەمانێك ئەوێ شتێکی بووە. ئێستا ئیدی بۆ خۆی بووەتە ژنێکی کامڵ. ژنێکی قەڵەوی تنگەزل و دەست خرپن، کە خوا دایناوە لە مەزرایە کاری پێ بکەی.

گوتم:

ـ جا وەڵا ئەوە خەریکی فرۆشتنی قیر و خوێ و گوریس و ئەو شتانەم، تۆ هیچت ناوی؟ ویستم پێ بکەنم.

دیتزا هاتە پێشێ و دەستی بە دەموچاومدا هێنا. جارێکی دیکەش، زۆر لەمێژە، شەوێکیان کە دەتگوت هەرچی تۆفان و باهۆزی سەر زەوییە هەوساریان پچڕاندووە، ئاوای کردبوو. دەستی لەسەر روومەتم دانابوو.

ـ دا بڵێ بزانم کوڕی چاك، چیت دەدەنێ؟

ـ بە نانەزگی کار دەکەم.

سەرم داخست. جلوبەرگەکانم هەر بۆوەی دەبن لە زبڵدانیان بخەی.

ـ جومعەکەی دی دێمەوە، چاوەڕێم بە.

ـ چاوەڕێتم.

چوو لە عارەبانەکەیدا لە شتێك گەڕا. کە هاتەوە، لەتە نانێکی گەورەی بەدەستەوە بوو.

ـ لەوانەیە برسیت بێ. ها ئەم نانە بخۆ.

ڕۆیشت و حەفتەکەی دی هاتەوە دووکان و بوخچەیەکی گەورەی بۆ هێنابووم.

ـ ها، کراس و پانتۆڵێکم بۆ هێناوی. کراسێکی جوانیشم بۆ هێناوی. لە سندووقەکەدا دۆزیمەوە. ئەوانە هەموویان جلی پەنتیلیێ بوون. لەوانەیە تۆزێك فشوفۆڵ بن بۆت، بەڵام لەو شڕوشاڵاتانەی بەرت هەر باشترن. ئەوانە دەبێ بسووتێنی.

قژم کە چەند مانگ بوو کورتم نەکردبۆو، هاتبووە سەر شانم. بە سەری رووتەوە دەگەڕام و قژم چڵکن و بۆز ببوو. با کە هەڵیدەکرد و خاك و خۆڵی شاری هەڵدەگرت و بە ماڵانیدا دەکرد، جار بە جار قژمی ئاڵۆزتر دەکرد. بەبێ ئیجازە و بە دزیی ئاغاوە سابوونێکم لە دووکان پاشقول دا و لە بن کراسەکەم شاردمەوە.

ئاغا ئیجازە بدەی سەعاتێك دەچمە دەرێ.

کارێکی وامان لە دووکانێ نەبوو. رێی دام.

ـ دەچمە ماڵی خزمانم.

ـ بڕۆ.

بوخچەکەی دیتزا لە بن هەنگڵدا، لەم سەرەوە چوومە ئەوسەری شاری. ئاسنەڕێیەکەم بەجێ هێشت و لە دارستانەکەی دەم چۆمەکەش پەڕیمەوە. خۆم خزاندە بن پردەکەوە. جلەکانم داکەند و خۆم بە ئاوەکەدا دا. سەعاتێك زیاتر بە سابوون سەروگیانم شوشت. ئەوجار چوومە نێوەڕاستی چۆمەکەوە کە تۆزێك قووڵتر بوو، تاوێك مەلەم کرد. ئەویش هەر بە قاچێك. ئاوەکە تەزووی هەبوو، بەڵام مەلەکردن گەرمی دادێنام. جلە پەڵاسەکانم بە

چۆمەکەدا دا و ئەوانەی دیتزا بۆی هێنابووم لەبەرم کردن. کراسەکەی زۆر درێژ بوو. تەشکی لە گوێزینگم دەخشکا. پانتۆڵەکەشی زۆر فش و فۆڵ بوو.

یانی هەم درێژ بوو و هەمیش فش. کراسە جوانەکەش هەروەتر. بەڵام هەمووان خاوێن بوون. هەر بۆیە، ئەگەر کۆنیش بوون، بەڵام پێم وابوو لە دنیادا تاکن. کە دەگەڕامەوە شاری، لە سەر ڕێ چوومە دووکانی دەلاکێکی تورك و سەرمم تاشی. قژم سەتڵێکی پڕ پڕ کرد.

ـ سبەی پارەکەیت بۆ دێنم. ئێستا نیمە. دەبێ لە ئاغاکەمی وەرگرم.

تورکە دەناسیم.

ـ باشە.

سبەی دراوێکی یەکشاییی سووری کونکراوی ژەنگهەڵێناوم بۆ برد.

*

*

*

گۆڕستانەکەمان زۆر بەجێ هێشتووە. قەراغ شاریش. گەیشتبووینە نێوەندی شار. شەو باڵی بەسەر شاردا کێشابوو. شەوێکی زۆر هێمن. شەوێکی زۆر شین.

کاك تووتی پێشنیاری کرد: با بچینە سەما، تۆزێك قەشمەری بکەین.

ـ با بچین. سەما لە کوێیە؟

ـ لە کۆڵانەکانی خوارەوە. نزیك دۆدێسکۆ.

زستانان، لە نێوان جەژنی نۆئێل و حەفتەی پاکدا، لە گوندەکەی خۆشمان لە ئۆمیدا کۆڕی سەما دەگرن. لە حەوشەی قوتابخانە. دەیخەنە شەوی شەممە بۆ ئەوەی ئەوانەی تا درەنگانی شەو سەما دەکەن، بتوانن سبەینێکەی درەنگ لە خەو هەستن.

کاریان بە هەمووومان دەکرد، بە منداڵەکان بۆ ئەوەی نیوتەختەکان لە پۆلەکان بێنینە دەرێ و لە حەوشەکەو بە دەم دیوارەکانەوە ریزیان بکەین. دواییش گەسکمان دەدا و تەختی هۆڵەکەمان جوان و زەریف دەشوشتەوە و، گوڵەکاغەزیان لە میچەکانەوە شۆڕ دەکردەوە و درز و دارِماویی دیوارەکانیشیان بە کاغەزی رەنگاورەنگ دادەپۆشی. خۆمان بە قورمی دووکەڵ رەش دەکرد بۆ ئەوەی سۆپە ئاسنەکە ئەوەندە مشتومالْ بدەین تا وەك زیو بدرەوشێتەوە. تەنانەت ئەو چەند پلیکانە بەردینەی پێش قوتابخانەشمان دەشوشتەوە.

سەمای ئۆمیدا هەموو دەوڵەمەند و سەرگەورەکانی دەوروبەریشی راکێش دەکرد و لەوێی کۆ دەکرنەوە. میرزاکانی قایمقامی، ژنەکانیان، کچەکانیان، لێپرسراوانی ماڵیات، قەشەکان و هەموو کاکۆڵ زێڕین و کڵاو رەنگاورەنگەکان. گۆرانیبێژ و ژەنیارە دۆمەکانیان لە شارەوە بانگ دەکرد و دەچوون لە وێستگەی شەمەندەفەرەوە دەیانهێنان. کە بە سواری درۆشکە بە بەردەم ماڵی ئێمەدا تێدەپەڕین، دەماندیتن چۆن دانیشتوون و ڤیۆلینەکانیان لەسەر کۆشیان داناوە.

چرا نەوتییەکانی قایمقامی و ئیدارەی پۆستەیان دێنا و تەلاری قوتابخانەکە وەك رۆژ روون دەبۆوە.

سەما لە ئێوارەوە دەستی پێ دەکرد و هەتا بەرەبەیانی بەردەوام دەبوو. ئێمەش وەك مریشك لەسەر ئاسنەپەرژینەکان هەڵدەنیشتین یان لە پشت پەنجەرەکانەوە سەیرمان دەکرد. ژەنیار لێیان دەدا و خەڵکەکەش جووت جووت لەسەرخۆ دەخولانەوە. هەتا لە پێ دەکەوتن.

ـ جا چ کەیفێك دەکەن.

ـ بۆ نەیکەن؟ خەم و خەفەتیان چییە؟ هەتا ورگیان دەبا دەخۆن و چەندی حەزیان لێیە دەنوون. چ گونیشیان بە دنیا نابزوێ و جگە لەوانەش، هەر کامە و توورەکەیەکیان پووڵ لە باخەڵدایە.

ئێمەش هەرچۆنێك بێ لەو کۆڕ و سەمایە شتێکمان دەست دەکەوت: فێر دەبووین ژیان باشتر بناسین.

بەرەبەری بەیانی، وردە وردە کۆڕەکە بەرەو تەواوبوون دەچوو. سەرگەورەکان خۆیان دەخزاندە مەیخانەکانی گوند و ملیان دەنا لە خواردن و خواردنەوە. ئێمەش سەرمان بەردەداوەو دەچووینەوە لێی دەنوستین و خەونی خۆمان دەدی. دیارە ئەو خەونانەی دەماندیتن، هەمیشەش خۆش نەبوون.

ـ ئەی کوێت دەگوت، تووتی گوتت کوێ سەمای لێیە؟

ـ لای دۆدسکۆ.

تەلارێکی تایبەت نەبوو. کۆڕەکە لە دەرێ و لە پارچە عەردێکدا بوو. خاوەنی ئەو خانووەی جێژنەکەیان لەبەردەرگاکەی گرتووە، جوان عەرزەکەی ئاوپرژێن کردووە و ماڵیوێتی.

من و کاك تووتی له دوا دواوه راوەستاوین. ژەنیارەکان خەریك بوون ئاوازی "دانووبی جوانی شین"ـیان لێ دەدا. زایەڵەی ڤاڵسەکە لە ناخی شەوێدا دوور دوور دەچوو. کوڕ و کچی هەر چوار قوژنەکەی شار لەوێ کۆ ببوونەوە. دۆبریکا تۆنسوو و سێ کچەکەی بانیکاش لەوێ بوون. یەکێك لەکچەکان بە ناوی بائۆکا هاتە لام و گوتی:

ـ تۆ بۆ هاتوویە ئێرە؟

ـ دەمەوێ سەیری سەما بکەم.

ـ یالاّ دەی بڕۆوە ماڵێ، سەما بۆ تۆ نابێ.

ـ یانی سەما بۆ من نابێ.

کۆلاّنە پانەکان لە بەر تریفەی شینی مانگدا دەتلێنەوە.

ماڵی ئاغا تەقریبەن لە دەرەوەی شار بوو. نزیك وێستگەی شەمەندەفەر، خانوویەکی سێ ژوور. ئەوەندە نەوی بوو، دەتگوت ئێستا نا تاوێکی دی سەربانەکەی دیوارەکان دەڕووخێنێ. بەو حاڵەشەوە من زۆرم پێ جوان بوو. جارێکیان چووبوومە ژووره گەورەکەی پشتەوە. تەختەخەوێکی زۆر پانی لێ بوو کە چەرچەفەکانی شین بوون. ئاغا و ژنەکەی لەسەری دەنوستن. لە نێوان پەنجەرە و ئاوێنەکەش دەستشۆرێکی تەنەکەی لێ بوو، کە چرایەکی گەورەی گڕسۆزی لەسەر دانرابوو.

ژووری دووەم ژووری خەوی پێنج کچەکەی ئاغا بوو، کە هەمووان لەسەر تەختێك دەخەوتن. ریّك وەك ماڵەکەی ئێمە لە ئاوایی. ئەوەندە نەبێ، تەختەکەی ئەوانیش وەك تەختەکەی ئێمە چەرچەفی نەبوو، بەڵام دۆشەگی هەبوو.

کچەکان بە پێی تەمەن لە سەری ریز دەبوون. نۆبەرەکەیان لە لایەك و پاشەبەرە لە یەکی دیکەوە و مەودایەکی سی ساڵانیان لە نێوان لە نێوان بوو.

کچەکان هیچ کام مێردیان نەکردبوو. ئاغا سەرەڕای کار و کاسبییەکەشی، زۆر قرچۆك بوو. لەگەڵ ژنەکەی جلوبەرگی وا شڕیان لەبەر دەکرد، پینە بە پینەی دەگوت جێم بکە. خۆ کچان، ئەوانی هەرە گەنجیان جلوبەرگی زۆر هەرزانباییان لەبەر دەکرد. تەنیا کچە گەورەکان ئەوانەی بەتەمای مێرکردنیٚ بوون، شتێکیان بە بەرەوە بوو. شەوانی شەممە کە پێکەوە دەچوونە شەقامەکەی پێش شیرینیخانە و لە گۆڕەپانەکەی ژەنەراڵ مانتۆدا پیاسەیان دەکرد، خۆیان رادەنا و وەك کەو لەنجەو لاریان دەکرد و خۆیان دەنواند.

بانیکا بچکۆل ـ پاشەبەرەی خێزانیش ـ هەر لەو ژوورەی دووەمدا دەنوست. لە سەر تەختەخەوێکی ئاسنی وەك ئەوەی لە ئاوایی دیتبووم لە ماڵی سکرتێرەکەی قایمقامی.

من درەنگ دەگەیشتمەوە ماڵیٚ، لە حاڵێکدا کە بانیکام بە کۆڵەوە بوو.

تاقانەی دایی و بابی پێی وابوو من زۆر خێرا نارۆم هەر بۆیە بەردەوام پاژنەی لە لاکەلەکەم دەکوتا:

ـ هەی ها، ئەسپەکەم، دەی ها، کەرەکەم، دەی، دەڵێی ئێسترە.

قژ و گوێچکەی دەکێشام. نقورچکی لیٚ دەگرتم. تا لە لای بانیکا ڤۆرتەیان کارم دەکرد، بەردەوام دەموچاوم رووشاو و بریندار بوو. دەتگوت شەوانە لە کولانکەی پشیلاندا دەخەوم.

مێزی خواردنەکەیان لە باخچەکەدا دادەنا. لە بەر پەنجەرەکانەوە. مێزێکی درێژی دارین بوو، کە سفرەیەکی مەیلەوزەردیان بەسەردا دەدا. دەوراندەورەکەشی، کورسیی سپیی لەق و شلی هەرزانباییان ریز دەکرد. ئاغا لەو سەری مێزەکە و خاتوونیش لەم سەرەی دادەنیشت. خواردنەکە، کچی نۆبەرەیان تێی دەکرد. سووپ، بەردەوام سووپ، ئاشی سەوزی... قەت هیچی دیکەیان لێ نەدەنا. ئەی هاوار، باشە بۆچی، چەند جار فاسۆلیا.

من لە پشتەوە رادەوەستام. کە تێریان دەخوارد، بەرماوەی نێو قاپەکانیان لە قاپێك دەکرد و دەیاندامێ.

لەوانەبوو هێڵنج بدەم، لەوانەبوو. بەڵام برسێتی موعجیزە دەکا. کە لە ماڵی خۆمان بووم، هەقایەتی تاژییەکیان بۆ گێڕامەوە، کە پاش چەند رۆژ برسێتی، بەو پەڕی حەزەوە سێوێکی کاڵی خواردبوو.

ئاخ، هەر خوا دەزانێ، کە ئەگەر لە ماڵی بانیکا ڤۆرتێیان سێوێکی نەگەیووم دەست کەوتبایە، چەند بە تاسەوە دەمخوارد. هیچ نەبێ بە دیتنی سێوی نەگەیو، هێڵنجم نەدەدا. بەڵام حەیف لەو شارەدا تاقە شتێکی دەست نەدەکەوت سێو بوو.

ئەو خانووە سپییە دوو نهۆمەی تاوێك دواتر زانیم دوانیوەڕۆیان پیانۆی تێدا لێ دەدەن، هیی ماڵی مارتزیان بوو. ژەنیاری پیانۆکەش شمیلا بوو. کچ تاقانەکەی هێراکلێ مارتزیان، کە شەش دانگی چوار گوندی هەبوو و، گرانەتای بوو و بە زمانی سازەکە خەم و ئازارەکەی هەڵدەڕشت. شمیلا هەموو رۆژێ لە پشت پیانۆکە دادەنیشت، بەڵام رۆژ بە رۆژ لاوازتر دەبوو

و بە هێزێکی کەمترەوە لێی دەدا. بەستەزمانە وردە وردە کز دەبوو و بەرەو کوژانەوە دەچوو.

هەر هەموو خەڵکی شارەکە لەسەر هەست بوون هەواڵی مەرگی شمیلا ببیستن و بچن بینێژن. زۆر دەمبیستەوە کە دەیانگوت:

ـ خوا دەزانێ بێت و کچەکەی مارتزیان بمرێ بە چ دامودەستوورێك دەینێژن؟ ڕێوڕەسمێکی وا لە دنیادا کەس نەیدیتبێ.

مارتزیان ملّکدارە گەورەکەی ناوچە، عەمیدی خانەنشینکراوی سوپا بوو. شەوێکیان لە یانە گوتبووی، ئەمر دەکا لیوایەك بە هەموو کەرەستەیەکی سەربازییەوە، بە جلوبەرگی تایبەت و دەستەی موزیکەوە بنێرنە ئەوێ بۆ ڕێوڕەسمی ناشتنی کچەکەی، بۆ ئەوەی هەتا سەر گۆڕەکەی لەگەڵی برۆن.

شارەکە بنکەی سوپای نەبوو. کچەکان لە ناخەوە هەستیان بە بۆشایی باق و بریقی دەرەجەی سەرشان و زرینگە و خرینگەی ناڵ و بزمار و قەمچی دەکرد. هاوینان بە خەفەتبارییەوە ئەو قوتابییانەیان هەڵدەخەڵەتاند کە بۆ تێپەڕاندنی پشوو دەهاتنە ئەوێ، بەڵام زستانان جگە لە فرۆشیاری فرۆشگاکان کەسیان دەست نەدەکەوت.

دەنگی پیانۆکە گێژ و وڕی دەکردم، ئەشکەنجەی دەدام. ئەشکەنجەیەکی پڕ لە لاواندنەوە بوو، کە بە نوێژی نیوەڕۆ منی لە خۆم دادەبڕی و لە زەوییەوە هەڵیدەگرتم و لە بەردەخوێ و قەف و گەوی پەت و گوریس و چەلەنگی قیر دووری دەخستمەوە. لە بیری دەبردمەوە کە دەبێ تەشك و داوێن و قۆڵ و شاقەلی گوندییەکان بگرم و بیانکێشمە دووکانەوە.

ـ کوڕە ئەوە لەوێ چ دەکەی گوێلك؟ خەونووچکە دەتباتەوە؟

ـ نا، نەخێر جەنابی بانیکا.

بەوحالەشەوە شتێکی دیکە بوو کە وای لێکردم بێزم لە کارکردن لای بانیکا هەستێ و ئاخرییەکەی ڕۆژێکیان حیسابی خۆمی لەگەڵ یەکلایی بکەمەوە و ملی ڕێگا بگرم و بڕۆم: لە سێیەمین ژووری ماڵەکەی ئاغامدا، لە ژوورێکی باریك و درێژی وەك کاژێر و ڕەهۆڵدا، لە تەنیشت دیوارەکە و لە دەم دەرگاکەوە تەختەخەوێکی دارینیان دانابوو کە دۆشەگێکی کا و لێفەیەکی پڕ لە پینەیان لەسەر دانابوو. من لەوێ دەنوستم.

من ئەوەندە شەکەت و ماندوو دەبووم، کە بە گرمەی تۆپیش وەخەبەر نەدەهاتم. بەڵام سەتڵێك لە بن تەختەکەوە بوو، ئامان لە دەست ئەو سەتڵە.

دەی، ئاساییە و، پیاو دەڵێ ئاخر سەتڵێك بۆ دەبێ خەو و خواردنت لێ حەرام بکا، ئەویش بنیادەمێکی شەکەت و ماندوو و هیلاکی وەك من؟ بەڵام ئەگەر ڕاستیتان دەوێ ئەو سەتڵە خەوی لێ حەرام کردبووم. ئەو سەتڵەی منی لەو ماڵەو لەو کارە و لەو ئاغایە و لە هەموو ژیانم بێزار کردبوو.

بێدەنگیی شەوانە، شارەکەی نوقم دەکرد. چرا یەك لە دوای یەك دەکوژانەوە. لە دوورەوە دەنگی فیکەی پاسەوانێك دەبیسرا و، گوێت لە گرمەی ئەو شەمەندەفەرە دەبوو کە لە وێستگەکە بوو. خەو، شەکەت و ماندووەکانی هەڵدەگرت و بە باڵە ڕەشەکانی لە زەوییەوە دەیڕفاندن، هەر من بووم کە هێشتا چاوم گەرم دا نەهاتبوون، کە خەوەکەم دەزڕا و بێخەوی بەرۆکی دەگرتمەوە

له ژووری کچەکانەوە دەنگی پێی رووت دەبیسرا. دەنگی نیوەکرانەوەی دەرگایەکم دەبیست و لە رووناکاییە کزەکەی ئەو مانگەشەوەی لە پەنجەرەکانەوە دەهاتە ژووریٚ، تارماییەکم دەدی. قەلافەتێك لە کراسی درێژی خەودا، کە تەشك و داوێنەکەی لە عەرزی دەخشکا.

لە دلّی خۆمدا دەمگوت:

ـ ئەوە مارگرێتە بە ددانە پان و تیژەکانییەوە.

مارگرێت، کچە گەورەکەی ئاغا، لە بن تەختەکە لە سەتلّەکە دەگەڕا و دوایی فش ش ش ش ش ش ش خوش ش ش ش ش ... پالّی بە سەتلّەکەوە دەناوە و دەچۆوە جێیەکەی خۆی. هەولّم دەدا دیسان بخەومەوە، پێم وایە خەویشم لیٚ دەکەوتەوە، کە دەنگی پێیەکی دیکە، تارماییەکی دیکە، ئەوەیان خڕیلانە و کەتە، تارماییەکی خەپە.

ئەوەیان فی فییە. کچە خەپە ئەسمەرەکە، کە هەر دەلّێی سمێلّی هاتووە. ئەو کچەی وا هێندە لە دایکی دەچیٚ، بنیادەم جاروبار لێکیان ناکاتەوە.

دەی، داریە. هەولّ بدە بخەوی و... دەخەوتم. بەلاّم پێنج کچ، تا بەیانی هەر کامە و چەند جاران دەهاتن و لە بن تەختەکەم لە سەتلّەکە دەگەڕان.

وردە وردە راهاتبووم گوێم بە دەنگەدەنگەکە نەبزویٚ و بەخەبەر نەیەم، بەلاّم ئەوەی بەخەبەری دێنام، ئەوەی لووتمی وەخوروو دێنا، ئەو بۆگەنە توند و تیژە بوو، کە لە سەتلّەکەوە دەهات و بەیانیان تووشی ژانەسەرێکی دەکردم، چیی نەمابوو چاوم دەرپەڕن.

ـ ئاغا، تۆ خوا حیسابەکانم یەکلا بکەوە.

ـ لێمان وەڕەز بووی؟

ـ مەسەلە ئەوە نییە. ئاغا، بەڵام هەق و حیسابەکەم بۆ یەکلا بکەوە و بەراتەکەمم بدەیە تۆخوا با بڕۆم.

خۆ دەمزانی دەبێ حەوت "پۆلی"ــم بداتێ، بەڵام ئاخرییەکەی لە پێنج پۆلی و شاییەك بەولاوە هیچی نەدامێ. ناچار بەوەندەیە قایل بووم.

گەنجینەکەم لە مستم نا و بەجێم هێشت. ڕێگەم دەزانی. گەڕەکی دۆدۆسکۆم بەجێ هێشت. تۆزێك ڕاوەستام پشوویەکم بێتوە بەر و دیسان کەوتمەوە ڕێ. کە لە شاری دەچوومە دەرێ، لە ئاخرین دووکانەکەی بەر دەروازەی شار نانێکی گەرم و هەندێ هەڵووژەم کڕی. بە دەم ڕێگەوە دەستم کرد بە خواردن. هەتا بەرەبەری ڕۆژئاوا هەر وا ڕۆیشتم. جاروبار بە دەم ڕێگە گەورەکەدا و هەندێ جاریش قەدبڕ.

دەی باشە. ئێستا وا گەیشتوومەوە ماڵێ. دایکم لە دەم تەنوورەکە هەڵتووتەکاوە و خەریکە شێو لێ دەنێ.

هەر لە نەخۆشییەکەی هەستاوەتەوە، مەکینەی خستووەتەوە کار و منداڵێکی دیکەشی خستووەتەوە. ستێلای خوشکم.

به دەم کارەوە، ستێلاشی لەسەر ڕانی داناوە و مەمکی لە زاری ئاخنیوە.

ـ سڵاو دایە.

ـ ئەوە هاتوویەوە؟

ـ ئا، هاتوومەوە.

ـ بە پێیان؟

ـ بە پێیان.

ـ برسیتە؟

ـ برسیمە.

ـ ڕاوەستە با ئەوانی دیکەش بێنەوە.

رادەوەستم تا هەمووان دێنەوە. کەس پێی سەیر نییە هاتوومەوە. قەت قەت، هیچ کام لە ئەندامانی خێزانمان سەریان سوورِ نامێنێ، نە لە ڕۆیشتن و ونبوونی لەناکاوم و نە لە هاتنەوەی کتوپڕم. قەت هیچیان لێم ناپرسنەوە، نە لەوەی کە لە کوێ بووم و، نە لەوەی چیم دەکرد و نە لەوەی بۆچی دیسان هاتوومەوە کە ببمەوە سەرباری خێزان و زگێکی دیکەش لەسەر سفرە بێ رسق و بەرەکەتەکەیان زیاد بێ.

ئەو کۆنە سەڵتە چەرمینەم کە بە سینگێکەوە کرابوو، لە دیوارەکە لێ کردەوە و لەخۆمم ئالاند و چوومە ئەوسەری حەوشەکە خەوتم. وەك بڵێی لەوەتەی لەدایك بووم تا ئەو ساتە نەخەوتووم. پێم وایە دەسبەجێ خەوم لێ دەکەوێ، بەڵام زۆری برد تا خەو بردمییەوە.

با خشەخش لە گەڵاکان دێنێ. ئەو سپیدارەی لە بنیدا گەورە ببووم، لە نێوەڕاستی حەوشەکە نەمابوو. سەیری جێیەکەیم کرد. چاوەڕوان بووم هەر لە جێی خۆی بێ ـ هەر وا قیت و قنج ـ و ئاسمان بە چڵووکە بەرزەکانی کون بکا. چاوم لەسەر یەك دانان. پێم وابوو دیسان گوێم لە خشەخشی گەڵای دارەکە دەبێتەوە. بەڵام نە خۆیم دەدی و نە گوێم لە لەرینەوەی گەڵاکانی دەبوو، جگە لەو ئەستێرانەی گومبەزەکەی ئاسمانیان دابێژدابێژ دەکرد،

چیی دیکەم نەدەدی. لە دەوری خۆم، لە قەدی پێچ و لوولخواردووی ئەقاقیا زیاتر هیچم نەدەدی.

هەوا تازە و شێدارەکە هەتا مۆخی ئێسقانم رۆ دەچوو. پێم وابوو هەوا خۆشەکەی ئاوایی بیرەوەرییەکانی شاریم دەسڕێتەوە. ئاخ، خەونم دیتبوو.

ئاخرییەکانی مانگی ئۆگۆست بوو. دروێنە تەواو ببوو. خەلە و خەرمانیش هەڵگیرابۆوە. گوند، بەر لە شیو و وەردی پاییزان و هەڵگرتەوەی گەنمەشامی، خەریك بوو پشووی دەدا.

پێم وابوو حەوت دراوم پێیە. پێم وابوو حەوت دراوی بیست لەییم هەیە. دەستم پێدا دێنان. سەیرم دەکردن. نوشتاندبوومنەوە و لە لۆی دەسرۆکەیەکم گرێدابوون و لە بن کراسەکەمم توند کردبوون بۆ ئەوەی کەس لێمیان نەدزێ و، ماڵی خۆمان کەسیان نەزانن پارەیەکم پێیە. ئەگینا هەر کامە و بەرۆکیان دەگرتم و هەندێکیان لێ دەستاندم.

چیی نەمابوو بۆ کرانەوەی قوتابخانەکان. چیی نەمابوو بە ئاواتەکەی دڵم بگەم و لە یەکێك لە قوتابخانەکانی شاریدا ناوی خۆم بنووسم. بەو حەوت "پۆلی"ـیەی هەمبوو دەمتوانی حەوت مانگی تەواو بژیم. بەش دەکا؟ ئەی چۆن بەش ناکا. جگە لەوەش، دیارە دەبێ دەفتەر و جلوبەرگ و شتی دیکەش دابین بکەم. هەرچۆنێك بێ بەرەی خۆم لە ئاوێ دەردێنم.

پێم وابوو: لە تۆرنۆ دەچمە قوتابخانە. لەوێ کێ بانیکای بە کۆڵی منەوە دیتووە؟ دەستم هێشتاش سووتاون، بەڵام نینۆکم خەریکن سەر دەردێننەوە. تا ئاوڕێك دەدەمەوە،

ئاسەواری دەباغخانەم پێوە نامێنێ. دەستم پێستی نوێ دێنێتەوە و، هیچ ئاسەوارێکی سووتاوی پێوە نامێنێ.

بەڵێ، ئە ڕووداوەی دەبێ لێرەدا باسی بکەم، ڕۆژێك پێش نیوەی مانگی ئۆگۆست ڕووی دا. ئەگەر وردەکارییەکانیم ئاوا بە جوانی لەبیر ماوە، لەبەر ئەوەیە کە ڕێك سبەینێکەی جموجۆڵێکی سەیر کەوتە نێو ماڵمانەوە. ئیۆنی برام دەتگوت جیوەیان لە قوونی کردووە.

ـ سبەینێ ڕۆژی سەنت مارییە. ڕۆژی دایکە.

دیارە ئیۆن نە بیری لە دایکی خۆمان دەکردەوە و لە ڕۆژەکەیشی.

ڕۆژی سەنت ماری لە شاری تۆرنۆ، ڕۆژی گەورە بازاڕی مەکارەی پاییزانە. کوڕ و کچی گوندەکانی دەوروبەر ساڵ دوازدەی مانگ جگە لە ڕۆژی سەنت ماری بیر لە هیچ شتێکی دی ناکەنەوە. ئاخر ئەو ڕۆژە هەلێکیان بۆ هەڵدەکەوێ، کە بە کەیفی دڵی خۆیان بکەن. لە شەش مانگ لەوە پێشەوە هەموویین بیر لە هەزاران فێڵ و تەڵەکە دەکەنەوە بۆ ئەوەی ئەو شەوەیان بە کەیفی دڵیان ڕابوێرن و خۆشی بگوزەرێنن. شەش مانگ دواتریش هیچ کارێکیان نییە جگە لەوەی دانیشن و باسی ئەو شەوە بۆ یەکتر بگێڕنەوە کە چییان کردووەو چ بەسەر خۆیان یان کەسانی دیکە هاتووە.

ریتزای خوشکیشم هەر دەڵێی لەسەر پشکۆی ئاگریان داناوە. لە سوێی ئەو بەزم و ئاهەنگە حەجمینی نییە. ئاخر گەورە بووە. لە خوشکەکانم هەر ئەویانە بڕێك گۆشتنە و سمت و سینگی خڕن. دیارە ئەم پاییزە بوو کە توانیی بچێتە نێو سەمای هۆڕاوە. یەکشەممانیش

لەگەڵ هەتیومەتیوان دەچێ لەسەر گردەکە دەسووڕێتەوە. ئیۆنی براشم هەر لە پارەوە توانیبوی بچێتە نێو گەڕی سەمای هۆڕاوە.

خوشکە چکۆڵەکەشم، ئەلیزابێتا بە پاڕانەوە و لالآنەوە لە لای ئەمەوە دەچێتە لای ئەوی دی:

ـ براکەم، لە بازاڕی مەکارە بووکەڵەیەکی مەڕمەڕیم بۆ دەکڕی؟ دەی بڵێ ئا... خوشکە، تۆ بڵێ، لە بازاڕی مەکارە بووکەڵەیەکی بەردینم بۆ دێنی؟

ستفانێی برام بووکەڵەی بەردینی ناوێ. ئەو بۆ خۆی لەیستۆکی خۆی دروست دەکا. ئەو شووڵکەی دەیکاتە ئەسپی خۆی، لەبەر چاوی دەبێتە جوانوویەکی خۆشبەز کە ئاگری لە کونە تفنی دێتە دەرێ. ئەو پەلاسەی لە نێو زبڵوزاڵەکەدا دەیدۆزێتەوە و بەسەری دارێکێوە دەکا، لەبەر چاوی ئەو دەبێتە ئالآی لەشکر... هاوینان لە دەوری ئاوەدانی خۆڕانان و مانۆڕی سەربازی دەکرێ. براکەم سەرباز و ئالآکانیانی دیتووە. لەمەودوا لەگەڵ هاوەڵەکانی خۆی، خۆیان دەکەنە سەرباز. ئەو کەرەستەی یاریی ناوێ. شتێکی دیکەی دەوێ:

ـ کاکە، کاچKachـم بۆ دێنی؟ دەی بڵێ ئا.

کاچ جۆرە شیرینییەکە. باشتر بوو بڵێم حەڵوا. ئاردەکەی بۆ سوور دەکەنەوە و تۆزێکیشی شەکر پێوە دەکەن. شیرینە. لە پێشدا ئەو دێوەرە تورك و بۆلگارییانەی لە شارییەوە دەهاتنە گوندان و شیرینی و شەربەتیان دروست دەکرد، ئەوەیان کردە باو. دوای ئەوەی جەنگ کۆلێرای بە دیاری بۆ هێنایین، تورك و بۆلگاری بزر بوون، بەڵام منداڵ کاچیان هەر

لەبیر نەچۆوە. کاچیان پێ خۆشە و دەیانەوێ و دیارە کەسیش نایانداتێ، چونکە ئیتر دروستی ناکەن. ستفانێی براشم کاچی دەوێ بەبێ ئەوەی بزانێ چییە.

ئیۆنی برام و ریتزای خوشکم لە خۆشیی بازاڕی مەکارە شاگەشکە بوون و پارەشیان پێویستە، بۆیە بە دەوری مندا دێن:

ـ داریە تۆ پارە و مارەت لە شارەوە نەهێناوەتەوە؟

ـ یەك قرۆشیش چییە.

هەوڵ دەدەم خۆ راگرم. بڕیارم داوە شاییەکیش چییە نەیاندەمێ. دەی باشە ئەگەر پارەیان دەوێ با بچن لە جێیەکی دیکە پەیدای بکەن.

ـ خوا کەسی دیکەی وا سەگ دروست نەکردووە.

ریتزای خوشکم دڕترە. سەیرێکی سەرتاپێم دەکا. بەتایبەتی زیاتر لە لاقم ورد دەبێتەوە. لاقی چەپەم. سەیرێکی پەنجە سڕەکانی لاقم و ئەو برینانەش دەکا کە هێشتاش جاروبارە هەر خوێنیان لەبەر دەڕوا و ئاماژەیان بۆ دەکا و تەنیا دوو قسە لە نێوان ددانەکانییەوە دەردەپەڕێنێ و وەك بەردێك پێمیاندا دەدا:

ـ گۆجەی نەگبەت.

ئەو قسەیە جاری جاران وەك قەمچی دەی ئەنگاوتم، بەڵام ئێستا زۆرم کار تێ ناکا. زۆر لەمێژە هەر وام بانگ دەکەن. لەگەڵی راهاتووم.

ـ بێ سوودە. پێت وا نەبێ بەو قسانە پارەی زیاترت دەست دەکەوێ.

ـ کەوابوو هەتە.

درۆیان دەکەم: نیمە. بەڵام هەشم بوایە بە تۆم نەدەدا.

نێوچاوانی گووی لێ دەبارێ. لێ دەدا و دەڕوا.

نازانم چ درۆیەکیان هەڵبەستووە و چ فێڵێکیان کردووە و چۆن شتەکەیان رێك خستووە. ئەوەندەیە شەوێ رقەکەیان نیشتبۆوە: پارەیەکیان بۆ سبەینێ پەیدا کردبوو. دوایی زانیم چووبوونە لای قەشە بۆلبۆك و بەڵێنیان پێ دابوو هاوینێ هەر کامە و دوو حەفتە بۆی بچنە رنینەوەی گەنمەشامی، بەو مەرجەی ئێستا پارەکەیان بداتێ، بەو جۆرە یەکی دوو لەیی‌یان وەرگرتبوو. چوون و هاتنەوە بۆ تۆرنۆ ٩٠ سانتیمی خەرج هەبوو. کەوابوو بەو حیسابە هەر کامە یەك "لێوو" و دوو شاییان پارە بۆ دەماوە. بۆ رابواردن بۆ خۆی گەنجێکی باش بوو.

بەو حاڵەشەوە هەر لێم خۆش نەبوون کە پارەم نەدانێ. لەوەی کە توانیبوویان هەرچۆنێکی بێ پارە پەیدا بکەن، خەنی ببوون و لە خۆشیان هەر قریوەیان دەهات، بەڵام هەر وا لە من تووڕە بوون. کە چاویان پێم دەکەوت، دەتگوت داویانمەتە بەر قەمچی. سەیرکردنەکەیان ئەوەندە ناخۆش و بەژان بوو.

ریتزای خوشکم و ئیۆنی برام و لەگەڵ ئەوانیش نیوەی خەڵکی ئاوایی لە خۆشیان خەنی بوون و حەجمینیان نییە. بەیانی جێژنەکە دەست پێ دەکا و ئەوانیش هەرچۆنێکی بێ خۆیانی دەگەیەننێ.

ئەوەی تاقەتی ئەو شتانەی نییە مادام پۆلینە. ژنی نیکۆلا دیمۆزلی پوورم کە کارمەندی پۆستەیە. مادام پۆلین پار چووە جەژنەکەی بازاڕی مەکارە، بەڵام ئەمساڵ ناتوانێ بچێ: نیکۆلای پوورزام لە نێو جێوبانەکەیدا کەوتووە و رەق هەڵاتووە و قوڕگی ئاوساوە.

دایكم دەڵێ:

نیكۆلای پوورت ئەمڕۆ بەیانی مرد.

ـ بەچی؟

ـ خۆی ژەهرخوارد كرد.

❊

❊

❊

كوڕەكەی پوورم چوو بوو لە شاری ژنی هێنابوو. جلوبەرگی وەك هیی خانمانی بۆ دەكڕی و لەبەری دەكرد. ژنەكەشی ئیدی بێتامی كردبوو و چۆنی دڵی دەیویست، ئەسپی خۆی لینگ دەدا. رایسپارد خانوویەكی جوانیان بۆ دروست كرد. مێردەش دەستی وەبەر نەنا و خانووەكەشی بە ناوی ئەو كرد.

ژنەكەی پێی گوتبوو: دەبێ خانووەكەم بەناو بكەی، ئاخر ئەگەر رۆژێك تۆ بەڵایەكت بەسەر هات، من ماڵوێران و بەلەنگاز نەبم. منت لە شارەوە هەڵگرتووە هێناوتمە ئێرە، ناچارت كردووم لە گوند بژیم. كەواتە پێم رەوا ببینە لە نێو ئەو هەمووە چارەڕەشی و ناخۆشییەدا هیچ نەبێ شتێكیشم پێ بڕابێ.

چما دەكرا پوورزام ئەو تۆزە دڵخۆشییەی لێ ببڕێتەوە؟ دیارە نا. ئیتر خانووەكە بە پارەی كوڕی پوورم كڕدرا و بە ناوی ژنەكەی كرا.

ـ لە چی دەترسی نیکۆلای؟ پێت وایە ڕۆژێك دەستت دەگرم و وەدیوی دەرێت دەنێم؟ شتی وا لە من و تۆ هەر ناوەشێتەوە کە ئەوەندە خۆمانەین.

دیارە ئەو جووتە وەك گوێی کەرێ جووت بوون: مادام پۆلین فەرمانی دەردەکرد و کوڕە پوورەکەشم رایدەپەڕاندن. دەی چۆن دەکرێ بڵێی خۆمانە نەبوون؟

ـ ژیانی خۆش و سفرەی پڕ و جل و پێڵاوی بێوێنە. بەڵام کوڕە پوورەکەم وردە وردە لاڕێ بوو: تووشی شتێك بوو، کە زۆر کەسانی ڕاو کردووە. هۆگرییەك، کە کارمەندانی دەوڵەت و ئەو گوندییانەی تازە بەسەردا کەوتوون، زیاتر تووشی دەبن. خووپێوەگرتنێك کە زیاتر بە "وشکبوونی قوڕگ"ـەوە دەست پێ دەکا:

کوڕە پوورەکەم لە پۆستخانە کاری دەکرد. هەستی دەکرد قوڕگی وشك بووە، چما پیاو ڕۆژ هەتا ئێوارەی هاوینێ بەسەر مێزێکدا کووڕ بێتەوە و خەریکی نووسین بێ و کە قوڕگیشی وشك بوو هیچ نەکا؟ لە حاڵێکدا دەرمانەکەی لەبەر دەستانە؟

هەر هەستی دەکرد قوڕگی وشك بووە، کە هەر دەهات و وشکتریش دەبوو ـ لە پشت مێزەکەیەوە هەڵدەستا و بە ڤۆنیکۆی نامەبەری دەگوت: "ئاگات لە تەلەفۆنەکە بێ، نەکا سەرۆك لە تۆرنۆوە کاری پێم بێ." ئاخر، تێلگرامەکان و نامەکانی گوندەکەی ئێمە و گوندەکانی تەنیشت کالت ماتزۆییان لە تۆرنۆوە دەنارده ئۆمیدا.

پوورزام هەر دەبوو لە کۆڵانەکە بپەڕێتەوە. هەر ئەوەندە، چونکە لە کۆڵانەکەی ئەوبەرەوە، مەیخانەکەی تۆماس ئۆکەی ڕۆژ تا ئێوارە کراوە بوو.

ـ پەرداخێك مارك، تۆماس.

پەرداخەکەی یەکبین هەڵدەقوڕاند، یەکی دیکەش بەدوویدا و هەستی دەکرد باشتر بووە.

ـ یەکی دیکەش تۆماس.

کڵاوە رەنگاوڕەنگەکەی دەبردە پشتەسەری و دەهاتەوە ئیدارە. لیستەکەی پڕ دەکردەوە و، ژمارەکانی ریك دەخست و بەسەر پێیەکەوە دەچووە مەیخانە... لە پێشدا مەودای نێوان سەردانانە زۆر بوو: دوو سێ جار پێش نانی نیوەڕۆ و دوو سێ جاریش دوانیوەڕۆ. جارێکیش شەوانە پێش نوستن. ئەوجار وردە وردە مەوداکانیان کەمتر بۆوە: وای لێ هات هەر سەعاتێك، سەعات و نیویك و دواتر هەر چارەگەسەعاتە و جارێك دەچوو و دەهاتەوە. جا خۆ مووچەی بنیادەم چەندی خێر و بەرەکەتیشی تێدا بێ، کە بێبەزەییانە لەتوکوتت کرد، کە هەموویت کردە نێو دەخیلەی مەیخانەچییەوە، بەرەکەتی نامێنێ و ئیدی هیچی لێ نامێنێتەوە. خووپێوەگرتنیش وایە، کە تووش هاتی، ئیدی بە ئاسانی لە کۆڵت نابێتەوە. دیارە، ئەگەر بنیادەم بیەوێ دەتوانێ، بەڵام دیمۆزلی پوورم پێی وابوو ناتوانێ.

رۆژێکیان پشکنەر لەبەردەمی قوت بۆوە و فەرمانی دا:

ـ خەزێنەکە بکەوە.

پوورزام خەزێنە دەکاتەوە.

ـ بیژمێرە.

ژماردی.

ـ عەمباری تووتنەکە بکەوە.

دەرگای عەمباری خستە سەر پشت. بەستە بەستە ئەو توتن و جگەرەیەی لە عەمبارێدا هەبوو، هەمووی ژمارد.

ـ قەفەزەکان بکەوە.

پشکنین تەواو بوو. پشکنەر ژمارەکانیشی نووسی و کۆی کردەوە. لەو مەودایەدا پوورزام لە دەوری بەرپرسەکەی هەڵدەخولا و، وەك کەسێکی بە دەوری نەخۆشێکی دەمی گیانەڵادا بێ، ئاوا دەستی لێك دەخشاند.

پشکنەر یەکێك بوو لە کۆنەهاورێکانی خۆی.

ـ سەیر بکە برا، من نامەوێ ماڵکاولت بکەم. دووهەزار و بیست و دوو لەبیت کەمە لە خەزێنەکەتدا. من بە ئانقەست یەك دوو رۆژان لە ئۆمیدا خۆم دەخافڵێنم، تا هەر چۆنێك بێ ئەو پارەیە لە جێیەك پەیدا بکەی و بیهێنییەوە لە خەزێنەکەی بخەیەوە، ئەگینا ناچارم سکاڵات لە سەر بنووسم و داوا بکەم وەك دز قۆڵبەستت بکەن.

دیمۆزلی پوورم زۆر خۆمانە سپاسی کرد و بەرەو ماڵەوە تێی قووچاند و مەسەلەی نەگبەتییەکەی بۆ ژنەکەی گێڕاوە.

مادام پۆلین زۆر لەسەر خۆ پێی گوت:

ـ دەی مەبەست؟ بۆچی هاتووی ئەو شتانە بۆ من دەگێڕییەوە؟ چ پێوەندییەکی بە منەوەیە؟ خۆت داوتە بە ئارەق و خواردووتەوە، جا برۆ چاوت دەرێ لە کوێ پارەکەی پەیدا دەکەی، بیکە و خۆت رزگار بکە.

ـ لە کوێی پەیدا بکەم؟ چۆن؟ بۆ کڕینی زەوییەکە پارەم قەرز کرد. بۆ دروستکردنی خانووەکە هەر قەرزم کرد و دوا دیناریشیم خەرج کرد. زەوی و خانوو هەردووکیان بە ناوی تۆوەن. دەی بڵێ وا نییە، بەڵام پارەکەی بەرهەمی ئارەقەڕشتن و ڕاکەڕاکی منە. من ئاوا بە شەو و ڕۆژێك ناتوانم ئەوەندەیە قەرز بکەم. تۆزێك بیر بکەوە. دووهەزارو بیبستودوو لەییە. کێ هەیە دڵی بە ئیمزایەکی وشك و رووتی من خۆش بکا و ئەو هەمووە پارەیەم لە مستی بنێ؟ تاقە یەك ڕێگە هەیە: ڕێیەکەشی ئەوەیە قەرزێك لە بانك وەرگرم و تۆش وەك خاوەنی خانووەکە سفتەکەم بۆ وەرگری و واژۆی بکەی، خانووەکە بارمتە بێ، تێگەیشتی؟

ـ خانووی من؟ خانووی من بە بارمتە دادەنێی؟. ئەرێ پێت وایە مێشکی کەرم خواردووە؟ هەر بیریشی لێ ناکەمەوە. تۆ خۆت بڕۆ و مشووری لێ بخۆ. بزانە چۆن دەتوانی چارەسەری بکەی.

ـ پۆلین گیان، دیسان تۆزێك بیر بکەوە. تا سبەینێش هەر بیری لێ بکەوە.

ئەگەر ڕاستیت دەوێ مادام پۆلین بیری کردەوە، بەڵام نەك لە بارمتەدانانی خانووەکە، بەڵکو ڕێك لە شتێکی دیکە.

کراسەکەی گۆڕی و پێڵاوێکی دیکەی لە پێ کرد و قژی داهێنا و کڵاوەکەی لە سەری نا و جانتاکەی بە دەستەوە گرت، تەنوورەکەی هێندە تەسك بوو، وەك بڵێی نەهێڵێ جوان بڕوا، بۆیە بە لەنجە و خۆبادان خۆی گەیاندە وێستگە و بلیتێکی کڕی و سوار بوو چووە ڕەوشیدەودێ بۆ ماڵی بابی.

پوورزا دیمۆزل لە پێشدا لە دڵی گران نەهات و زۆری پێ تێك نەچوو. چاوەڕێ ما تا پۆلین گیانی بێتەوە. هەر سەعاتە و شەمەندەفەرێك دەهات کە لەوانەبوو پۆلینی تێدابێ، بەڵام هیچ کەس ئاگای لە نەهامەتییەکەی نەبوو. وەك جاری جاران داوای پەرداخێك مارکی کرد. یەکێکی دی و یەکی دیکەش. ئەویش بە شەربەی زۆر گەورە. گەرووی تەڕ بۆوە و چۆوە ئیدارە. پشکنەر رۆیشتبوو. چووبووە مەیخانەکەی ئەوبەری وێستگە نانی نیوەڕۆی بخوا.

پوورزا چێشتخانەکە گەڕا و لە یەکێك لە قەفەزەکاندا کیسەیەکی پڕ لە دەرمان دۆزییەوە. لە ئاوی کرد بۆ ئەوەی جوان تێکەڵ بێ. ئینجا جگەرەیەکی داگیرساند و کێشای. یەکی دیکەش بەدوایدا. جگەرەی بە جگەرە دادەگیرساند و خوا دەزانێ چەند جگەرەی کێشا. تا تاو هەڵات، هەر وا جگەرەی بە جگەرە داگیرساند، پوورزا دیمۆزل.

دیارە کەس هاتوچۆی نەدەکردن. ئاخر پۆلین پشتمێردەی دەخستە پشت دەرگا و تا کابرا جوان و زەریف پێڵاوەکانی خۆی خاوێن نەکردباوە، نەیدەهێشت بچێتە ژووری. ئێستا نیکۆلای ئیتر هیچ شتێکی بۆ گرینگ نەبوو. قوونچکە جگەرەی هەر وا فڕێ دەدایە سەر فەڕشەکە. بەیانی سەر فەڕشەکە پڕ ببوو لە قوونچکە جگەرە. ئەو قوونچکانەی لە مژێك پتریان لێ نەدرابوو. ئەو قوونچکانەی بە جوانی پان نەکرابوونەوە و هێشتا دووکەڵیان لێ هەڵدەستا و لەو جێیەی کەوتبوون مافوورەکەیان دەسووتاند.

کە رۆژ بۆوە، قاپە ژەهرەکەی بەسەرییەوە نا، پوورزا نیکۆلای دیمۆزل.

دەسبەجێ نەمرد. ژەهرەکە تەنیا قوڕگ و زمان و ریخۆڵەی سووتاندبوو.

که پێیان زانی، له سەر تەختی خەوەکەی کەوتبوو و توند قورگی خۆی گرتبوو.

پۆلینیان بانگ کرد بێته سەر خەتی تەلەفۆن بۆ ئەوەی ئاگاداری بکەنەوە.

سکرتێرەکەی قایمقامی له سەر تەلەفۆن پێی گوت: نیکۆلای دوێ شەوێ ژەهرخوارد بووە.

پۆلین لەوبەرەوە پرسیی: چیی لێ هاتووە؟ مردووە؟

ـ بەداخەوە زۆر بەداخەوە. لەوە زیاتر چم له دەست نایە، بەڵێ مردووە.

مادام پۆلین گوتی: دەی باشە.

تەلەفۆنەکەی داناوە.

پوورە دینا، دایکی نیکۆلایان ئاگادار کردەوە. که هات و دیتی ئەوە کوڕەکەی قورگی ئاوساوە و لەسەر تەختەکە رایانکێشاوە، کردییە شین و شەپۆڕ و گریان و لەخۆدانێك هەر خوا بزانێ. دوایی له ناکاو ژیر بۆوە و له درەختەکانی، که له دەوری خانووەکە خشەخشیان دەهات پرسیی:

ـ کوڕەکەم بە چی بنێژم؟ بە چی؟

مادام پۆلین که بەپەلەپەل خۆی گەیاندبۆوە، پێی گوت:

ـ بێدەنگ بە و ئەو شیڕەشیڕەت ببڕێنەوە. بۆ خۆم جێبەجێی دەکەم.

دایکم گوتی: هیچ سەیر نییە، که ئێستا نیکۆلای نەماوە، ئەمڕۆ و نا سبەی ببیستین ئەوە پۆلین دەیەوێ خانووەکە بفرۆشێ.

*

*



بە دەم ئاسنەڕێیەکەدا بەرەو وێستگە دەڕۆم.

شەمەندەفەر ڕێك سەعات چوار بەرەو دانووب وەڕێ دەکەوێ.

بلیتێك دەکڕم، تاوێك دواتر شەمەندەفەرەکە دەگاتێ و سوار دەبم. سکرتێرەکەی قایمقامی و مامۆستای قوتابخانەش لە شەمەندەفەرەکەدان. ئەوانیش دەچنە بازاڕی مەکارە.

ڕۆژانی سەنت ماری شەمەندەفەر هەر جمەیان دێ. هەموو دەیانەوێ بەر لەوەی گوندییەکانی دەوروبەر بە عارەبانەکانیانەوە سەروسەکوتیان دەرکەوێ، سەیری بازاڕی مەکارە بکەن.

سکرتێرەکەی قایمقامی و مامۆستا ڕۆژنامەکانیان لێك دەکەنەوە و دەیانخوێننەوە و پێکەوە دەکەونە قسەکردن.

ـ ئێمەش دەچینە شەڕەکەوە.

لە خۆشیان خەنی بوون. لە بیریان چووەتەوە سێ ساڵ لەوەپێشیش خەڵکیان بۆ جەنگ کۆ کردەوە و ناردیاننە ئەوبەری دانوب، کە لەوێشەوە کۆلێرایان بە دیاری هێناوە.

بۆچی خەڵك وا زوو شتەکانیان لەبیر دەچێتەوە؟

شەمەندەفەر دەفڕێ. هێند پڕە دەرزی هەڵاوێی وەعەرزی ناکەوێ. تەشقی گەرما شکاوە.

زۆر لەمێژە باران نەباریوە. دەشتەکە وشك و زەرد و بزڕکاوە. تا چاو هەتەر دەکا هەر دەشتە و بنی دیار نییە. لێرە و لەوێ مەزرایەکی گەنمەشامی بەدی دەکەی، کە

گەنمەشامییەکان لە بەژنی بنیادەمێك پتر هەستاون. لە دوور دوورەوە پۆل پۆل درەختی ئەقاقیا.

پۆلە دارێکی چڕ، نیشانەی عەمباری سێکارایە. ئەو عەمبارەن ئاغا لە شوێنی عەمبارەکی پێشووی کە گوندییە راپەڕیوەکان لە راپەڕینەکەی ١٩٠٧ـدا سووتاندیان، دروستی کردووەتەوە.

شەمەندەفەر باڵی گرتووە.

خۆر خەریکە ئاوا دەبێ.

من سەیری دانووب دەکەم. زەوییەکانی ئەوبەرییەوە بەردەڵێن و پڕ چەوە. وشکەڕۆ و خۆڵەمێشییە.

ئەوەش شار.

ئێستا خەریکین بە دەوری رەزەکاندا با دەدەینەوە.

من کە لەسەر پلیکانەی شەمەندەفەرەکەوە راوەستاوم، توند دەسگرە مسینەکەی دەگرم. بێت و پێم بترازێن و دەستم لە دەسگرەکە بەربێ، دەکەوم و ملم دەشکێ.

یەك بەخۆم دەسگرەکە دەگرم.

١٧

بازاڕی مەکارە

*

*

*

ئەوە یەکەم جارم نییە بازاڕی مەکارە دەبینم. ئەودەمی باوکم هێشتا گایەکانی مابوون، بازاڕی مەکارەم دیتبوو. ڕۆژی سەنت ماری هەموومانی سواری عارەبانەکەی کرد و هێنامانی بۆ تۆرنۆ. هەڵبەت سەروەت و سامان و نیعمەتی ئەمجارەی بازاڕەکە وەك موعجیزەیەك دێنە بەرچاوم.

سێرکێکی گەورە لێرە دانراوە. بەلای چەپ و ڕاستیشیدا بەندباز سێرکی بچووکتر سیپاڵی خۆیان بە عەرزیدا داوە. ئەوبەریش گەمی و جۆلانێ و حیندرحۆ و چەخوفەلەك و شتی دیکە...

ئەو پارەیەی لە سینگمم توند کردووە، بە هەردوو دەستم گرتوومە. لە بازاڕی مەکارە گیرفانبڕ وەك خیز و خۆڵ زۆرە.

دەچمە سەیری بەندبازی. بەڵام دەبێ لە پێشدا دەستێك بە سەروگوێلاکی خۆمدا بێنم. ئێستا ئیدی دەزانم لە شتکڕیندا چۆن چەنە لێ بدەم و مامەڵەی بکەم. زۆرم زەرەر کردووە تا فێری ئەوە بوومە. تەڵەکەچی و گزیکەر ئیدی ناتوانن کلاوم لەسەر بنێن.

دەچمە دووکانێکەوە و داوای کڵاوێکی چەرمین دەکەم. سی کڵاو بارەوبار دەکەم تا یەکێك پەسند دەکەم. بەلایەوە دەنێم. ئەوجار کراسە کێشییە کۆڵکنەکان تاقی دەکەمەوە. پانتۆڵێکی رەش، کە قوماشەکەی هێندە ئەستوورە تەوریش نایبڕێ. ئاخری داوای جووتێکیش پێڵاو دەکەم. تاوێك هەر وا بە پلتۆك لێی دەدەم. ئەوجار خسکەیەك هەڵدەگرم و بە بنەکەیدا دەکێشم، نەکا کارتۆنی بێ.

دووکاندار بە سەرسووڕمانەوە لێم ورد بۆتەوە:

ـ ئەوە چییە وا لە تەختی بنەکەی نووساوی؟

ـ نامەوێ کڵاوم لەسەر بنێن.

ـ من فێڵباز و شتی وا نیم، داینێ و برۆ.

لێی گەڕێ چ دەڵێ با بڵێ. کێ باوەڕی پێ دەکا.

چەنەبازی دەست پێ دەکا. کابرا لە چلوشەش لەبییەوە دەستی پێ کردووە. رێك چاو لە چاوی دەبڕم و ودەڵێم:

ـ لەسەر یەك، هەر هەمووی بە شانزە لەیی.

دەست بەسەر شتەکانیدا دەگرێ و لە دەستمیان دەردێنێتەوە. دەیەوێ بیانخاتەوە سەرجێی خۆیان.

بە لالێوێکەوە پێی دەڵێم:

ـ کەیفی خۆتە. یەك لەبیشت پتر نادەمێ.

بە تووڕەییەوە بەسەرمدا دەنەڕێنی: کوڕە وەدەر بکەوە تووتکە سەگی خوێڕی.

بەسەریدا دەنەڕێنمەوە: تووتکە سەی خوێڕی خۆتی.

لەسەر پێم، کە ئەگەر وێرای دەستم لێ هەڵێنێتەوە، دەرپەڕم، بەڵام کابرا شتەکانی هەروا بەدەستەوە و واق وڕماو لێم دەڕوانێ.

ـ زۆر باشە. سی "لەیی".

ـ گوتم شازدە. خۆ هەر تۆ دووکانت نییە، ئەو کۆڵانە پڕە لە دووکانی دیکەش.

ـ یانی بیست و شەش لەییشی پێ نادەی؟

ـ گوتم شازدە.

حەز دەکەم وەك مشتەرییان هەڵسوکەوت بکەم.

ـ دەی باشە بیست لەیی بدە و بڕۆ وەدووی قووندانەکەت بکەوە.

بۆ ئەوەی یەکلای بکەمەوە بە هەژدەش رازی دەبم.

ـ نۆزدە بدە.

ـ گوتم هەژدە.

ـ شتی وا نابێ.

ـ دەی باشتر.

دەگەڕێمەوە و دەچمە دەرێ. دەچمە بەردەم سێرکەکە و دەورێك لێ دەدەم.

ژەنیار لەسەر ئەو سەکۆیانەی لەبەردەم دەرگاوە دانراون، خەریکن. یەکێکیان تەپڵ لێدەدا و خۆی رادەنێ. کەپۆی خۆی سوور کردووە و جلێکی چل پارچەی رەنگاوڕەنگیشی لەبەر کردووە. یەکێکی دیکەیان کەڕەنایەك لێ دەدا و سینگی هەر نیخەنیخێتی. کچۆڵەیەك بە

تەنوورەیەکی زۆر کورت و جزمەی سوورەوە دێتە تەنیشتیان. چەند پەڕێکی لە قژی داوە و مەمکۆڵەی خستوونە دەرێ. ئەویش دەموچاوی خۆی تەواو رەنگ کردووە.

یەکێك قۆڵم رادەکێشێ. کە ئاوڕ دەدەمەوە زبانم کێیە، دەڵێ:

ـ دووکاندارەکە تکای کرد بێیەوە.

خۆمی لێ نەبان دەکەم:

ـ کامە دووکاندار؟

ـ ئەوەی دەتویست شتی لێ بکڕی.

ـ جا چیی دەوێ؟

ـ دەڵێ وەرە شتەکان بەرە.

ـ بڵێ سبەی دێم دەیانبەم.

هەست دەکەم یەکێك شانمی گرتووە و نەرم پاڵم پێوە دەنێ. لە دڵی خۆمدا خۆشحاڵم و خۆمم داوەتە دەستی، بەڵام دەمەوێ وا بنوێنم کە ئەو شتانەی هەڵمبژاردبوون، لەبەرچاوم کەوتوون.

دووکاندارەکە داماوانە سەیرم دەکا و دەڵێ:

ـ زۆر باشە، هەژدە لەییم بدەیە و بیانبە.

ـ هەژدە لەیی؟ من گوتم شازدە.

ـ گوتت هەژدە، هەتیوە بێ دایکوباوکە.

ـ شازدەم عەرز کردووی جەناب. جا کێ دەڵێ پاش من ئەوەی هەڵمبژاردبوون نەتگۆڕیون و شتی خراپت لە جێیان دانەناوە؟

ـ ئەی. کوڕە وەرە سەیریان بکە بزانە هەر ئەوانن یان نا.

زۆر لەسەر خۆ، بە هێمنی یەك بە یەك سەیریان دەکەمەوە. پارچە پارچە. راستە. دراوێکی بیست لەیی دەردێنم و نیشانی دەدەم.

ـ جارێ چوار لەییم بدەوە.

هەر سێ لەییم دەداتەوە. دەی قەیناکا.

شتەکان لە بن باڵم دەنێم. بازاڕی مەکارە جێ دەهێڵم و دەچمە دەرێ. لە پشت پەرژینێك خۆم دەگۆڕم. ئێستا قەڵافەتێکی دیکەم هەیە. بەڵام پێڵاوەکانم باش نین. بەبێ گۆرەوی لاقم بریندار دەکەن. کوڕە دەی، قەی چ دەکا، خۆی چاك دەبێتەوە. جلوبەرگە کۆنەکانم لە رۆژنامەیەکەوە پێچاوە.

بلیتی شەمەندەفەر و پێڵاو و جلوبەرگ تا ئێستا هەژدە لەیی و دە سانتیمی خستووەتە ئەستۆم. بەو یەك "لێوو" و نەوەد سەنتیمەی پێم ماوە، دەڵێم بە کەیفی دڵم رایدەبوێرم. سواری چەرخوفەلەك و ئەسپەدارینەش دەبم. حیندرحۆ دەکەم. دەچمە یەکێك لە سێرکەکان و سەیری زۆرانبازیی دوو پاڵەوان دەکەم. ئەوە هەر بەراستی زۆرانبازی دەکەن؟ بەڵام ئەوانە زیاتر لە دێوەزمە و غۆلی چۆل و هەردان دەچن نەك بنیادەم. سەریان پاك پاك بە مووس تاشیوە و پشتە سەریان لۆچ لۆچ بووە، سێ گنج. نێوچاوانیان کورتە و چاویان هەر هێندەی دەنکە نۆکێکە کە لە دەموچاوە گۆشتنەکەیاندا بەقووڵدا چووە. قەڵافەتیان هەر هەمووی

ماسوولکەیە. رانیان پان و قورسە. جەستەیان بە رۆن چەور کردووە. بە دەستە چەورەکانیان دەیانەوێ یەکتر بگرن. وەك ماسی لێك دەتلاسکێن و دەخلیسکێن. ناتوانن مل لەبەر یەکتر بنێن. دەڵێی جمکن. لەوانەیە هەر بەراستی ئاوەڵدوانەش بن. بەچی دیارە؟ یەکێکیان شۆرتێکی سووری لە پێیە و ئەوی دیکە بۆر. دەستیان بگاتە کوێ، لێی دەدەن. بەڵام ئەوەندە گۆشتنن و هێندە کەتە و زلن، چەندی لێکیش بدەن، پێم وانییە بیانئێشێ. کەواتە ئەگەر زەبرەکان قەستینەش بن، هەروەتر. سەیر لێك راساون. وەك دوو کەڵەشێری جەنگی بە دەوری یەکتردا دەخولێنەوە. ئاخری دەتوانن مل لەبەر ملی یەك بنێن و دەست لێك بنگێون. ئارەقە وەك جۆگەلە بە گیانە بریقەدارەکەیاندا لووزەوی بەستووە.

بەهاران کە با زەوییەکانی هەڵبرینگاندووە، بەڵام هێشتا وەختی زەوی کێڵان نییە و، پاییزانیش بەر لەوەی لووزەوی بارانەکان بەربن، کوڕانی ئاوایی کە جگە لە گۆرانیگوتن و پۆل پۆلبوون و گەڕان بە کۆڵانەکاندا کارێکی دیکەیان نییە، لە گژ یەکتر رۆدەچن و لێیان دەبێتە شەڕ و ئەوی لاوازتر و کەمهێزترە دەکەوێ. کوڕەکان زۆریان حەز لە زۆرانبازییە. ئەوان لە نێو هاوەڵەکانیاندا بە شوێن خەنیمێکدا دەگەڕێن و زۆرانبازی دەکەن.

پاڵەوان مەیدان چۆل دەکەن و، سێ بستەباڵای سەیر و سەمەرە، پیاوێك و ژنێك و منداڵێك، کە سەلکیان زۆر زۆر لە سەلکی ئاسایی کورتەباڵاکان زلترە دێنە جێی ئەوان. هونەرەکەیان ئەوەیە لە سەر نووکی داری باریك و درێژ، قاپ بخولێننەوە. هیچ بۆ پێکەنین نابێ. باشە بۆ شیرینکارییەکی ئاوا سادە و ساکار چ پێویستە هەر بستەباڵایەك بێنن؟ چەند ساڵ لەمەوبەر یەکێك لە "کوڕەکانی هۆردوو"ەکە ئەو قۆشمەبازییەی فێری منیش کرد.

لیوایەکی پیادە لەسەر گردەکەی پشت گۆڕستان هۆردوویان خستبوو. لە ئەستانی کۆتز، ئاواییەکەی ئەوبەریش لیوایەکی سوارە باری خستبوو. سەرباز هەتا هاوین تەواو بوو لەوێ خۆیان راهێنا و پاییزێش پێکەوە دەستیان کرد بۆ خۆڕانان و مانۆڕ. شەوانە کە ئەفسەرەکان بە یۆنیفۆرمە باق و بریقەدارە پڕ لە خرینگە و جرینگەکانیانەوە کۆ دەبوونەوە نان بخۆن، لە پشتەوەیانڕا تا شەوگار شەق دەبوو، دەنگی موزیك دەهات. سەرباز لە نێو گژ و گیاکان هەڵدەترووشکان و ئەو برە خواردنەی پێیان دابوون، بەبێ کەوچك هەر وا بە سەریانەوە دەنا و هەڵیاندەقوڕاند. کەس مۆسیقای بۆ لێ نەدەدان. کە یەکێکیان لێ دەمرد (ئاخر چونکە بڵاو بوونەوەی پەتا و خواردنی خراپ زۆری لێ دەکوشتن)، قازی سەرباز دووعایەکی بۆ دەکرد، دوایی وەك زگماك رووت و قووتی دەکردەوە و لە قووڵکەیەکدا دەیانشاردەوە.

ـ باشە بۆ بە رووت و قووتی؟

ـ ئاخر یۆنیفۆرمەکەیان هیی حووکمەتە.

لە لیواکەدا چەند منداڵێکیش هەن، کە پێیان دەڵێن "منداڵانی هۆردوو". ئەوان لە چێشتخانەدا یارمەتیدەرن و خێوەتەکان خاوێن دەکەنەوە و خەزەڵ و گەڵای وەریوی دەوروبەر کۆ دەەنەوە و پاش نانخواردن دەفر و ئامان دەشۆن و ئەوانەی بەتەمەنترن، فێری شەیپوورلێدان و کەرەنا و فلووت دەبن. ئەو داماوانە بەردەوام لەسەر خت و خۆڕایی سزا دەدرێن: چەپۆك و شەق و قەمچی نان و رۆنی شەو و رۆژیانە. ئەو نانەی لە لیواکە دەیاندەنێ، نانێکی تاڵە.

منداڵی هۆردوو، منداڵی کەس نین. هەتیوی ژێرچەپۆکەی هەموو کەسن.

که بێکار دەبوون، دەتگوت حەوت مێشیان لە کونێکدا دیوەتەوە، لەگەڵ ئێمە دەکەوتنە گەمە و هەندێ شتیان فێرمان دەکرد کە لە خەونیشدا نەماندیتبوون. کوڕیژگەیەکی بچکۆلانەیان لەگەڵ بوو، ئەوەندە گورج و چالاك بوو، کەس دەسکی لە دوو نەدەکرد. ئەو کوڕیژگەیە چەقۆهاوێژێکی بێوێنە بوو. دەیتوانی قاپ و بەلەم لەسەر نووکی دارێك بخولێنێتەوە. چاوبەست و بەندبازی و جامبازیی دەزانی و قۆشمەبازیی سەیر سەیری دەزانی. بۆ وێنە: تۆپێکی بچکۆلانەی قووت دەدا و دوایی لە گوێچکەیەوە دەیهێناوە دەرێ. ناوی ئالیکۆئالیپ بوو و لەگەڵ دەستەیەکی سێرك زۆر شوێنان گەڕابوو، بەڵام شەوێکیان رای کردبوو و دوایی برسی و تینوو کەوتبووە داوی لیواکەی سوپاوە. یانی لە مار هەڵاتبوو و بەسەر هەژدیهادا کەوتبوو... لەگەڵ من ببووە برادەر و ئەوەندە لە گەمەکاندا لەبەردەستیدا هاتبووم و چووبووم، بەشێکی زۆری قۆشمەیی و جامبازییەکانی لێ فێر بووم. من پێم وایە شتێکی زۆریش ئەستەم نین.

بە پاڵەپەستۆ و نقورچکان لە قەرەباڵغییەکەی سێرك دێمە دەرێ. سێ چوار شیرینیی گەرم دەکڕم و بە تاسووقەوە دەیانخۆم و لیمۆنادێکی زەردیشی بەدوودا دەکەم. لیمۆنادەکە گەرم و بێتامە. ئاوی سارد شتێکی دیکەیە. بەڵام لە بازاڕی مەکارە بێت و لە تینوێتیان بشکخنکێی، کەس نییە چۆڕێکت ئاو بە دەمەوە بکا.

دەچمە سەیری سێرکە گەورەکە. سێرکی ئاڵمانی. ئەو سێرکە فیلێکی لێیە و زەڕافەیەکی مێ و جووتێك کەرەکێوی و شێرێکی پیری بێ ددان، کە شەکەتی لە لاقە لەرزۆك و گوێچکە شۆڕەکانیەوە دەبارێ.

قەشمەرەکان پشتەك لێ دەدەن و سەرموقلات لێ دەدەن و بە زمانی ئەڵمانی هەندێ شت دەڵێن کە من لێیان تێناگەم. هەندێ سەیرکەر پێدەکەنن و هەندێکیان ئاخ هەڵدەکێشن و هەندێکیشیان هەر وا دەنوێنن.

ئەوەی سەرنجی من رادەکێشێ، ئەو سەپانەیە. چوار ئەسپی وەك شیری سپی بە گالیسکەیەکی بچووکەوە کە تێی کراون، دێنە مەیدان. لێخوڕەکە هەر قەمچی رادەوەشێنێ. ئەسپەکان بێ هەوسار و لغاون. بە دەنگی سوارەکەیان دەڕۆن یان دەچەقن.

لە لای خۆشمان دیتبووم ئەسپی ئاوا بچووك لە گالیسکەیەکی بچکۆلانە بکەن و بەبێ قەمچی و بە بێ هیچ قسەیەك بڕۆن یان راوەستن و بەبێ رەشمە و هەوسار لە گردێك وەسەر بکەون یان داگەڕێن. مەبەستم ئەوەیە، ئاغا دراکۆلێیا و فۆرکۆلێچیش ئەسپی وایان هەبوو.

ئەو هیپۆلیت دراکۆلێ ئاغایەش کابرایەکی تایبەت بوو. خەڵك دەیانگوت پیاوێکی زۆر زیرەکە و زۆر دەزانێ. دەی باشە، خەڵك زۆر شت دەڵێن. بەڵام لە بارەی هیپۆلێتەوە، نە زیرەکییەکەی و نە زانیارییە زۆرەکەشی هیچ کام  کەمایەسییەکانی ئەویان دانەدەپۆشی. رایسپاردبوو خوا بزانێ لە کوێ شەش ئەسپیئاوایان بۆ هێنابوو. هەر شەشیان کوێت. لە گالیسکەیەکی بچکۆلانەی کورتی دەکردن کە تایەکانی زەرد بوون. قایش و تەنگە و زین و زەنگوڵەیان لەبەر تاوێ وا دەدرەوشاوە حوکمی چاویان دەبرد. ئاغا هیپۆلیت بەو ئەسپە بچکۆلانەی کە قەت گالیسکەکەیان نەدەگێڕاوە و وەك کۆیلە گوێلەمستی خاوەنەکەیان بوون، رۆژ تا ئێوارێ بە چوار ناڵە بە گوندەکانی دەم کالتماتزۆییدا دەگەڕا و سەرانسۆی زەوی و زارەکانی دەکرد. خۆ ئەگەر پێی وا بوایە ئەوە ژنێك لەبەری هەڵنەستاوە و جوان وەڵامی

سلاوی نەداوەتەوە یان پیاوێك لە دوورەوە دیتوویەتی و کلاوەکەی لەسەری لانەبردووە، هەرای دەکرد، راوەست:

ئینجا ئەسپ لە جێی خۆیان دەچەقین.

لە گالیسکەکەوە خۆی داویشتە خوارێ و کابرای وەبەر مست و شەقان دەدا. کابرای داماو هەرچۆنێك بێ خۆی لە دەستی قوتار دەکرد و بە زگەخشکێ یان گاگۆلکێ بوایە لەبەر دەستی دەردەپەڕی و لێی دوور دەکەوتەوە و هەلْدەستاوە سەر پێ و قیت رادەوەستا. ئینجا هیپۆلیت بانگی دەکرد و دەیگوت :

ـ وەرە پێشێ. ها، ئەوە لەییەك بۆ تۆ. بێت و شکایەتم لێ بکەی و لەسەر ئەو تێهەلْدانە بمبەیە بەردەم دادگا، بە پێی قانوون یەك لەییم لێ دەستێنن. دەی باشە ئەوەیش یەك لەییەکە بۆ تۆ، خۆم قانوونەکە جێبەجێ دەکەم.

خەلْکێك هەبوون دلْیان نەرم دەبوو یان لە برسان و لە حەوجێیی سەدەقەکەیان لێ قبوولْ دەکرد، بەلاْم ئەوانەی تۆزێك خۆیان بە پیاو دەزانی، پێیان دەگوت:

ـ پوولْەکەت لە گیرفانەکەی دیکەت بنێ ئاغا، ئێمە حەوجێمان بەو پوولاْنە نییە.

هیپۆلیت پێی سەیر دەبوو. دەچۆوە سواری گالیسکەکەی دەبۆوە و ئەسپە وردەکانی غار دەدا.

لە باخەکەی مالْەوەیدا قەفەزی گەورەگەورەی دانابوو و مەیموونی لە رەگەز جیاجیا و جۆراوجۆر و ورچی جۆراوجۆر و گورگی جۆراوجۆر و هەموو جۆرە دڕندەیەکی دیکە، کە لە دەرەوەڕا بۆیان هێنابوو، لەوێدا رایگرتبوون. جیا لەوانەش، لە هەموو جۆر بالْندەیەکیشی کۆ کردبووەوە. بالْندەی وای هەبوو تەنانەت ئێمە رەنگەکەشیمان نەدیتبوو. ماری زیندووی

خستبووە سندووقی شووشەیی جۆراوجۆرەوە کە هەندێکیان لە نێوقەدی بنیادەمێکیش ئەستوورتر بوون و چەند مەترێکیش درێژ بوون. بۆ تەڕ و وشککردنەوەی ئەو ئاژەڵانەش نۆکەری تایبەتی هەبوو. هەموو ئەوانەی ڕێیان دەکەوتە ئەوێ، سەردانی ئاژەڵەکانی هیپۆلیت ئاغا بەشێك لە بەرنامەیان بوو. چ دەکرێ کە خۆشەویستنی ئاژەڵ هات و نەهاتی بۆ وی پێوە بوو: یەکێك لە ئەفعییەکان پێوەی دا و... تەواو.

مۆزیکەکە، ئاوازێکی ڤاڵس لێ دەدا. ئەسپە بچکۆلانەکان هەڵدەستنە سەر پاشووان و وەك ئاغا دەست دەکەن بە سەمای ڤاڵس. یانی هەلینگ لە خۆیان دەدەن و بەدەوری خۆیاندا دەخولێنەوە.

بەرەبەری نیوەشەوێیە. هەواکەی بازاڕی مەکارە لەپڕ قورس قورس بووە. شتێك لە هەواکەدا شەپۆل دەدا کە بنیادەم تووشی دڵەخورپە و هەناسەسواری دەکا. هەور ئاسمان دادەپۆشن. لە سەرووی چراکانی بازاڕی مەکارەوە، دەکرێ هەست بکەی ئەوە تاریکان بەسەردا دێ. ڕەشەبایەك هەڵی کردووە. خێوەتەکان پڕ دەبن لە با و گووپ دەدەن. ئالا ڕەنگینەکان دەشەکێنەوە. لەوانەیە هەموو ئەوانە پێشەکیی تۆفانێك بن، بەڵام من هەست دەکەم ئەوەی ترس و دڵەڕاوکێکەی خستووەتە بازاڕەکەوە تۆفان نییە.

لە بن خێوەتی مەیخانە، دۆمە ژەنیارەکان ئاوازێکی گشت و خێرا لێ دەدەن. بۆ ئەم شەو لە شارەکانی دیکەوە ژنەگۆرانیبێژیان هێناوە.

لە خێوەتێکدا، تووشی مێردەکەی ئالڤیتزای خوشکم دەبم. شاد و بەکەیف و سەرخۆشە و جوانوومایینێکی لەسەر رانی داناوە. ڤیۆلۆنەکان دەنگیان دێ و ئەو زەعیفەیەش گۆرانییەکی هەرزە بە گوێی زاواکەمدا دەچپێنێ:

ئەوەی دەیبینی یاری منە
بە دڵ و گیان کڕیاری منە
قاقم و حەریرم بۆ دێنێ
بە کەیفی خۆی دەمگەوزێنێ

بەخوای ئیڤانگلینی خوشکم ژنێکی ماڵوێران و لێقەوماوە. لەوەتەی مێردی کردووە، نان و شەق دەخوا. چار چییە بوو بە ژنی ئالڤیتزا. چونکە هەڵیگرتبوو، بۆیە چاری نەما. دەسپێکەکەی خراپ بوو. ئالتڤیتزا خانووەکی جوانی هەبوو. مەڕ و ماڵاتی هەبوو و جگە لەوانەش کوڕێکی قۆز بوو. لە سەربازی ئەخلاقی تێك چوو و فێرە بەرەڵایەتی و خواردنەوە و رابواردن بوو.

سەربازییەکەی لە یەکێك لە لیوا سوارچاکەکاندا تەواو کرد. حەفتەیەکی رێك ئیجازەی وەرگرت و هاتەوە ئاوایی. بلووزێکی رەشی لەبەر کردبوو کە قۆپچەی زەرد و جێ قۆپچەی سوور بوون. پانتۆڵێکی سپیی کە لێوارەکانی بە دەزووی رەش گیرابوو. چەکمە رەشە بریقەدارەکان بە قەمچیی شەق و رەق و جووتێکی سمێڵی قەیتانیی کچکوژی وەك چاوەکانی

رەش. ژنان لە دار و دیوارەوە خۆیان بۆ هاویشت. لەگەڵ کۆکۆلێئاسا خۆیان بەسەر یەکدا کێشا. لە ماڵی ئەفسەرێکدا دانرابوو. ببووە مامۆستای کۆنکان و ئارەقخۆری. گایەکانی فرۆشت و کراس و پانتۆڵی تەسکی بۆ ماشووقەکەی کڕی و سەراپا نوێی کردەوە. باقی پارەکەشی لە قوماردا دۆڕاند. خوشکە داماوەکەشم کە منداڵێك بە باوەشەوە و یەك لە زگیدا، بە دەموچاوی پڕ پەڵەوە وە چڵە شقارتەی لێ هاتبوو.

ئالْڤیتزا کە سەربازییەکەی تەواو بوو، ئیدی بستێکیش زەوی چییە نەیمابوو: ئیجازەی وەردەگرت و دەهاتەوە پەڵە زەوییەکی دەفرۆشت و پارەکەی دەدایە فلانە گا و دەڕۆیشت. ئەوجار ملی لەبەر ملی خوشکەکەم نا، چونکە ئیڤانگلین قایل نەدەبوو ئەو زەوییەی لێ بفرۆشێ کە بەناوی ئەوەوە بوو. ئاخری دەستی لە ژنەکەشی هەڵناوە و ئەمجارە تێهەڵدان ببووە بەشێك لە پیشەی رۆژ و شەوی. جا هەلی یۆنانییەکانە کە کار و پیشەیان کڕینەوەی میراتە. ئێڤانگلینی داماو منداڵەکەی بووە و منداڵەکانی رۆژ تا ئێوارێ لە ماڵی ئێمە کەوتوون. بەیانی دێن و شەوێ دەڕۆنەوە و هەر شتێك هەبێ خۆمان بیخۆین بەشی ئەوانیش دەدەین.

ژنە گۆرانیبێژەکە کەپۆیەکی پان و فلّچی هەیە. دیارە بە مست وای لێ هاتووە. دەموچاوی ئەوەندەی سپیاو تێهەڵسویوە، دەبریسکێتەوە.

خۆم دەخزێنمە نێو ئەو دەستەیەوە کە بە جۆشوخرۆشەوە خەریکی قسەکردنن:

نیوەی شەوێ، زەنگی مەترسی، بانگەوازی هەرەوەزیی گشتی دەکا. ئێمەش دەچینە نێو شەڕەکەوە. لە نیکۆپۆلێ واتە بەستێنەکەی ئەوبەرەوە شارەکە وەبەر تۆپ دەدەن. هەندێ

دەڵێن بۆلگارەکان تۆپی وایان نییە ئەوەندە دوور بڕوا. هەندێکی دیکە دەڵێن ئەڵمانییەکان بۆیان ناردوون.

بازاڕی مەکارە و شارەکە بەجێ دێڵم...

ماڵەوەمان هەموو نوستوون. لە بن دار تووەکانی حەوشەکە لێی دەخەوم. چاوەڕوانم شەوگار شەق بێ.

دەی باشە، ئەوەش نیوەی شەو.

وەك بڵێی سێ ساڵی خایاندبێ.

لە ناکاو زەنگەکان لێ دەدرێن و بێدەنگییەکەی شەو دەشکێنێ. دیسان شەیپوورەکە لێ دەدرێتەوە.

گوند لە خەو رادەبێ. ژنان دێنە دەرێ و لەبەر دەرگاکان کۆ دەبنەوە و دەیکەنە شین و گریان.

ـ نەگبەتی بە دوای نەگبەتیدا. ئیۆن دیسان دەبێ بچییەوە؟

باوکم چووەتە قایمقامی. کە دێتەوە پێمان دەڵێ: شەڕ دەستی پێ کردووەتەوە.

لە ماڵی ئێمە کەس ناچێتە جەنگ. باوکم بەتەمەنە و ئیۆنی براشم هێشتا زۆر گەنجە. بەڵام پوورزا و ئامۆزا و خزم و کەسە دوورەکانمان دەبێ بچن. زۆر زۆریشن.

هەموو پەنجەرەکان رووناکن. لە هەموو ماڵێکەوە دەنگی گریان دێ.

دوێ شوێ، نە تۆفان هەستا و نە باران دایکرد. رۆژ، ساو و سامالْ، خۆر بەرز بووەتەوە.

وێستگە بچووکەکە کە زۆربەی جاران ئارامە، وەك شارە مێروولەی لێ هاتووە. شەمەندەفەرە دوورودرێژەکان بەردەوام بە ژووری بەتاڵەوە دێن و بە پڕی دەڕۆن.

بەو چاوانەی لە سێ ساڵی رابردوو بەئەزموونتر بوون، سەیری شەپۆلی ئەو حەشاماتە دەکەم کە لە دوورەوە دێن. هەمووان لە شەکەتییان تینیان لەبەردا نەماوە و خەریکە بەلادا دێن. جەندەرمە تفەنگ بە شانەوە وەپێش خۆیان داون. چاو بریسکەیەکی تاریان لێوە دێ. روخساری ژنان بزرکاون و منداڵی وردی خەپە و پێخواس و چڵکن بە چاوی سوورهەڵگەڕاوی بێخەوەوە بەدوای پیاوەکانەوەن. بوخچەی پیاوەکانیان بە باوەش هەڵگرتووە. منداڵ بە نێوانیاندا دێن و دەچن. دایك ئیدی ئاگایان لە منداڵ بڕاوە. چاویان هەر بڕیوەتە ئەوانەی دەبێ بڕۆن.

ـ دێیەوە کۆدینێ؟

ـ شتفانێ دێیەوە؟

پیاوەکان بێدەنگن. دەڵێی شەویلکەیان رەق بووە.

یەکێکیان وەدەنگ دێ و دەڵێ:

ـ ئیدی ئەوەیان گاڵتەی پێ ناکرێ.

هەموان هەر وا بیر دەکەنەوە: ئەم هەویرەیان ئاو زۆر دەبا.

شەمەندەفەر هەر بە بەتاڵی دێن و بە پڕی دەگەڕێنەوە.

رۆژێك، دوو رۆژ، سێ رۆژ رابردووە و وێستگەکە هەروا رۆژی حەشرە. شەپۆلی خەڵکەکە دەڵێی برانەوەی نییە. لەسەر سەکۆ و لە نێو هێڵەکانی دەوروبەری وێستگەکەدا خەڵکێکی زۆر راوەستاون. شەمەندەفەرەکە پڕ پڕ دەبێ بەڵام دەسبەجێ ئەو خەڵکەی دیکەی دەڵێ لە زەوییەوە هەڵقوڵێون، جێیان دەگرنەوە.

لە نێو ئەوانەدا کە دەچنە جەنگ، ئیانکۆی خالۆزام دەبینم. دەڵێی بووەتە کەسێکی پوختەتر. با رەشی داگێڕاوە و هەتاو سوتاندوویەتی و دەموچاوی رەش هەڵگەڕاوە، بەڵام قەڵافەتی هەروا بەجوانی ماوەتەوە.

ـ دەی، ئەوە تۆش دەچیتە شەڕ کاکە ئیانکۆ؟

ـ ئەدی، ئەمنیش دەچم.

ـ خۆ تۆ پێت گوتووم وەبەر لێخۆشبوون کەوتووی.

ـ وەبەر کەوتبووم، بەڵام بەرپرسە سەربازییەکان رایان گۆڕا. جەنگێکی دوورودرێژ و سەختمان لەپێشە داریە. زۆر کەس تێدا دەچن. برۆ بەختەوەر بی و خۆزگەم بە خۆت کە هێشتا منداڵی، ئەگینا...

ئەگینا منیشیان لەگەڵ ئەوانی دیکە لە شەمەندەفەرەکان دەکرد و دەیانناردمە شەڕگە.

ـ زۆر کەس لەو شەڕانەدا تێدا دەچن.

خالۆزا ئیانکۆ پێی وابوو خۆی یەکێك نییە لەو زۆر کەسانە. هەر باسی مەرگی خەڵکی دەکرد. بەڵام خۆی رێك حەفتەیەك دواتر، بەر لەوەی بگاتە شەڕگە، تێدا چوو.

وێستگەی شەمەندەفەر دیسان چۆل بۆوە. ئیتر گوندەکان پیاویان تێدا نەماوە. هەرچی هەیە ژنە و پیر و منداڵ. سکرتێرەکانی قایمقامی و قەشەکان بوونەتە کەڵەگای گوندەکان و لەوانیش زیاتر کارمەندانی ماڵیاتوەرگر.

ئەوەی کە لە سەردەمی جەنگدا ماڵیاتەکان بە وەخت بدرێن، زۆر گرینگە. هەمیشە بیستوومە کە دەڵێن: "جەنگ پارەی دەوێ." بەڵام قەت نەمزانی کام پارە؟ لەوانەیە هەر ئەو پارەیەی بە ماڵیات وەریدەگرن.

ژنان چیی پەیدای دەکەن و چیی بۆیان ماوەتەوە، لە گیرفانی ماڵیاتوەرگرەکانی دەکەن.

جەنگ لە مەودایەکی دوور لە ئێمەوە گەرمە. لەو بەری دانوبەوە گوێمان لە گرمەی تۆپەکان دەبێ. ئەو هەمووە هاوەنەی وەشاری تۆرنۆ کەوتووە، گەلێك خانووی کاول کردووە. شارییە تۆقیوەکان پشتیان کردووەتە ماڵ و حاڵیان و پەنایان هێناوەتە گوندەکان. هەموو گوندەکان پڕن لە راکردوو. گوندەکەی ئێمەش. ماڵ نییە خێزانێکی شاری داڵدە نەدابێ. هەموو بەیانیان شارەکان بۆ نارەزایەتی دەچنە بەردەم قایمقامی. ئەوان نانیان دەوێ. نانی سپی. ناچارن لەسەر حەسیر بخەون و مێشوولە پێوەیان دەدەن. خەڵکە شارییەکان تف و تووك لەو ماڵانە دەکەن کە داڵدەیان داون، کە بۆچی نازانن خانوویەکی وا دورست بکەن کێچی نەبێ و مێشوولە و قووندرێژە بە خەڵکەوە نەدەن. خانمەکان دەستەوداوێنی ژنە لادێییەکان دەبن جلەکانیان بۆ بشۆن. جا سەیر ئەوەیە و باوەڕ ناکەی کە خەڵکە هەژار و نەدارە چڵکنەکەی گوند بە هیچ نرخێك ئامادە نابن جلوبەرگی ژنە غەریبەکان بشۆن.

کارت پۆستاڵە پۆستکراوەکان هەڵدەپچڕێن: کارتی گلۆڵەکراوی چرچ و لۆچکراو کە دیارە بەپەلە و لەسەر ئەژنۆ لە بەرەکانی شەڕدا نووسراون. دەر و دراوسێ کارتەکانیان دێننە لای من بۆیان بخوێنمەوە. هەر هەموویان بە تۆزە جیاوازییەکەوە لێك دەچن:

"دوعاچيتان وەزعی باشە و تەنيا خەمی ئێوەيەتی. ئەی مەڕ و ماڵاتەکە چۆنن؟ ئاگاتان لە گايەکان بێ. نەکا بيانفرۆشن. ئێمە ئەوە پێشڕەوی دەکەين."

لە پێشدا هەموو هەواڵەکان وا بوون. ئێستاهەواڵی ديکە دێن:

"وا پاشەکشێ دەکەين."

سەربازەکانی ئێمە لە ترانسيلوانی لە دووملانێی چيای کارپاتەوە هێرشيان کردبوو. لە هەموو جێيەك شەڕيان کردبوو و توانيبوويان دوژمن بشکێنن. دەستەی ئەڵمانی کە هەم چەکی باشتريان پێ بوو و هەميش جلوبەرگ و تفاقيان باشتر بوو و، پشتيشيان بە هێزی ئاسمانی قايم بوو، بەپەلە لە بەرەکانی ديکەوە بانگ کران و چارەنووسی جەنگەکەيان گۆڕی. سوپای بێ چەك چەندی ئازا و جوامێر و چاونەترسيش بێ، هەر بەچۆکدا دێ. سەرباز پۆل پۆل کەوتوون. هەواڵی مەرگيان دێتەوە قايمقامی. ژنان رەشپۆش دەبن و لە بەردەم ماڵەکەيان لە شوێنێك کە دەسبەجێ لە چاو بدا، ئاڵايەکی رەش هەڵدەکەن. ديارە ئەگەر گۆڕێك لەبەر چاويان بوايە، شينێکی خەستيان بۆ دەگێڕا، بەڵام ئێستا گۆڕێك لە گۆڕێ نييە و ئەگەر هەشبێ زۆر زۆر دوورە و تەنانەت جێيەکەشی نازانن. قەشە کۆمەڵێك تابووت دەنێژێ، کە تەنيا جلوبەرگێکيان لە بری جەستە تێدايە و پۆتين يان کالەيەکيش لەبری پێيەکان و خاچێکی سپيی بچووکی دارينيش لەسەر گۆڕەکە دەچەقێنن.

گۆڕەکە بەتاڵە. ئەوە راستە. بەڵام هەرچۆنێك بێ شوێنێك هەيە بۆ ژنەکان کە مۆمێکی لێ داگيرسێنن و ئەسپەندەرێك بسووتێنن و فرمێسکێك هەڵوەرێنن، بەوە کوڵی دڵيان دادەمرکێ.

یەکشەممۆیان هێشتا تاو نەکەوتووە، ژنان بە کۆنە قاپێك و چەند لەتە بخوور دەکەونە ڕێ بەرەو گۆڕستانەکە و لە تەنیشت گۆڕی مردووەکەیان چۆك دادەدەن و بخوور دەسووتێنن. هەموو ئاواییەکە بۆنی بخووری لێ دێ. بایەك هەڵدەکا و بۆنەکەی بڵاو دەکاتەوە و فرمێسکان هەڵدەبرینگێنێ.

ـ ئەڵمانییەکان بۆ لێمان دەدەن؟

ـ چونکە ئێمە چەکمان نییە.

سەروسەکتی یەکەم نقوستانبووەکان و سەروگوێ بریندارەکان لە ئاواییدا پەیدا دەبنەوە.

ـ پارچە هاوەنێك قاچی تاتائیکای پەڕاند. لە نەخۆشخانە مرد.

ـ گۆتزا رۆشۆیش هەردوو دەستی پەڕین. ئەو داماوە لەبەر سەربازەکان دەپاڕایەوە بە فیشەکێك نەجاتی بدەن. ئازارێکی سامناکی دەچێشت تا خوێنەکەی هەڵچۆڕا و...تەواو بوو.

ـ ئیۆن دۆدۆییش پارچە هاوەنێکی وەزگی کەوت.... ریخۆڵە و هەناوی بە دەستی خۆی گرتبوو و هەوڵی دەدا بە شوێن خەڵکیدا را بکا. پێی هەڵەنگوت و سەرەنگرێ بوو و ئیتر نەیتوانی هەستێتەوە.

ـ تیتزا ئۆئیە هاتووەتەوە. شەلوکوت بووە.

ـ لە حەوت کوڕەکەی تیۆدۆروریۆ تا ئێستا چواریان کوژراون. خوا بکا هەر نەبێ یەکیانی بە زیندوویی دەربچێ.

باوکە تیۆدۆروریۆ قوماشێکی رەشی لە کڵاوە پاپاخییەکەی بەستووە. رەنگی بە رووەوە نەماوە. ناگری. هیچ ناکڕووزێتەوە و نابۆڵێنێ. ئەوەندە نەبێ دیسان تێڵاکەی لە دەستیدا

بارەوبار دەکاتەوە. هەر ئەوەندە و تەواو. دەڵێی بە شوێن سەرێکدا دەگەڕێ شیاوی وردکردن بێ.

تیتزائۆییێ بە چاکەتێکەوە کە قۆڵێکی بەتاڵە، بە جادەیەکی گەورەدا رادەبرێ. خەڵکەکە بە راکردن دێن و لە دەوری کۆ دەبنەوە و گوێی لێ هەڵدەخەن بزانن دەڵێ چی:

دەڵێ: جەنگ بەو زووانە  تەواو نابێ. کوا وا زوو دەبڕێتەوە؟ تا ئەڵمانییەکان نەبەزن، ئەو جەنگە هەر دەبێ. ئەڵمانییەکان چەکی پێشکەوتوویان هەیە. رەشاش و تۆپیان هەیە. منداڵی ئێمە دەکەونە بەر رەهێڵە و دەسرێژی رەشاش و بیکەیسییەکانی ئەوان و، رێك وەك گەڵای پاییزان هەڵدەوەرن. ئێمەیان بە دەستی بەتاڵ ناردووەتە شەڕ. بە تفەنگی زەمانی تەیارەڕەشەکە و چەند فیشەکێك و رووت و قووت. رێك وەك ئەو حەیوانانەی دەیاننێرنە قەسابخانە.

دۆمیترۆ دۆمیترۆسکۆ دەڵێ:

ـ جەنگ روخساری دنیا دەگۆڕێ.

جێگری پارێزگاریش یەکێکە لەو کەسانەی پەنای بۆ گوندەکەی ئێمە هێناوە.

سێرکی ئەڵمانی چارەنووسێکی دڵتەزێنی تووش بووە. ژن و پیاوەکانی سێرکەکەیان هەر بە دەموچاوی سپیکراوەوە خستووەتە نێو یەکێك لە کەمپەکانەوە. فیل و زەڕافەکانیان داوەتە دەست یەکێك لە گوندییەکانی ئۆلت. ئەسپە بچکۆلانەکانیش، ئالیسترمانزۆ، جێگرەکەی قایمەقام دەستی بەسەردا گرتوون و لە گالیسکە بەریتانییەکەی بەستوون. جا چونکە زۆر

متمانەی پێیان نییە، هەوساری کردوون و کە بە جادە پڕ لە خۆڵ و خاکەکاندا بە چوارناڵە لێیان دەخوڕێ و تاویان دەدا، کەفەڵە ناسکەکانیان دەداتە بەر قەمچی.

ئالیسترمانزۆی جێگری قایمەقام کە هێشتا گەنجێکی کرچوکاڵە، سەرانسۆی گوندەکانی دەم کالماتزۆیی دەکا. لە هەر گوندێکدا کۆمسیۆنێکی دەسبەسەرداگرتنی راسپاردووە، ئەسپی خەڵك بگرن. کۆیان بکەنەوە و بیانهێننە حەوشەکەی قایمقامی و بیاننێرنە شاری بۆ ئەوەی لەوێڕا بنێردرێنە بەرەی جەنگ بۆ ئەوەی تۆپ و سندووقە فیشەك و عارەبانەیان پێ راکێشن. لە جەنگدا خۆ هەر بنیادەم سەکەت نابن، ئاژەڵیش تێدا دەچن. فیشەك خۆ دەستەبژێر ناکەن. هاوەنەکانیش وەك فیشەك.

کۆمسیۆنی دەسبەسەرداگرتن دەست لەسەر گا و مانگاش دادەنێ:

ـ ئاخر، سەربازەکان خۆ دەبێ شتێك هەبێ بیخۆن. وا نییە؟ ئەوانیش گۆشتیان پێویستە.

دیارە ئەگەر گۆشتەکەیان بگاتێ و لە ژووری ئەفسەرەکاندا دەسبەسەر نەکرێ راست دەکەی. هەر کەس سێ کراسی هەبێ، لەبەر خاتری سەربازەکان دەبێ دەست لە دوانیان بەر بدا و هەر کەس دووی هەبێ لە یەکێکیان. تەنیا ئەوانەی یەك کراسیان هەیە بەر ناکەون و زۆربەی خەڵکی گوندەکانیش یەك کراسیان هەیە.

ـ دەزانن ئێوە بۆ چی وا هەژارن؟ چونکە خەڵکێکی تەمبەڵ و تەوەزەلن.

ئالیسترمانزۆ هەر سەری سڕ ماوە لەوەی ئەو خەڵکە وا هەژارن. هەر زۆر زۆری پێ سەیرە. دەڵێ:

ـ دەی باشە، ئەی ئاغاکان بۆ جەنگ چ دەدەن؟

ـ گراسیاغا چ دەدا؟

ـ ئەی گۆگۆ کریستۆفۆ بۆ نالێن؟

ـ ئەی سەرهەنگ پیێنارۆ شتێك دەبەخشێ؟

ـ ئەی ستانێ پانتازی؟

ـ ئەدی ئافاناسییە؟

خەڵك دەیانەوێ لێیان روون بێتەوە. هەر بۆیە بە لەبزێکی تاڵەوە دەیدەنە بەر پرسیاران.

جێگری قایمەقام دەڵێ:

ـ ئەوانیش بەشی خۆیان دەدەن. مەترسن. من کەسێك نیم بەزەییم پێیاندا بێتەوە. بەڵام جارێ نا، راوەستن تا تۆزێك وەزعەکە توندتر و ناخۆشتر بێ. ئێستا لە ئێوە دەستێنم و دواییش نۆرە دەگاتە ئەوان، جا لە مەڕ و ماڵات و ئەسپ و خۆراك چییان هەیە لێیانی زەوت دەکەم. مەترسن، بەڵێنتان پێ دەدەم.

ـ هەرچۆنێك بێ، قورسایی جەنگەکە لە سەر شانی ئێمەیە.

ـ ئەی چی، بۆ ئێوە خەڵکی ئەم وڵاتە نین؟

ـ دیسان شوکرانەبژێرین، کە جار و بارە لانیکەم گوێمان لەوەدەبێ.

خەڵکەکە رۆژ بە رۆژ ماتەمبارتر دەبن. ئاگادار کراونەوە کە بەرەی جەنگ شکاوە و سەرباز هەزار هەزار هەڵدەوەرن و دوژمنیش سات بە سات نزیکتر دەبنەوە. ئەوانەی ساویلکەترن، هیوادارترن کە لە ئۆلت پێشی پێشڕەویی ئەڵمانییەکان بگیردرێ.

ئۆڵت! وەك بڵێی من نەزانم ئۆڵت کوێیە. هەزار دەراوی پتر هەیە کە بکرێ بە ئەسپ لێی بپەڕیتەوە. چۆن دەکرێ بە لەمپەرێکی وا بچووك پێشی سوپایەکی گەورە بگری کە خەریکە دێ؟

ئەڵمانییەکان زۆرمان لێ دوور نین. لە باکوورەوە هاتوونەتە نێو پارێزگاوە. سبەی دەگەنە ئێرەش، هەر سبەی...

شەوێ شەمەندەفەرێکی بنکەی تەندروستی لە نزیك وێستگە راوەستاوە و ئیدی نەجووڵاوە. عارەبانەکان هەڵدەگرین و دەچین نەخۆش و برینداران بێنینەوە. دیسان کورسییەکانی قوتابخانە بەلاوە دەنێین و کلۆش و کا لە تەختی عەرزەکە رادەخەین. بریندار لە سەر کلۆشەکان درێژ دەکەین. ئەو داماوانە بریندار و ریش هاتوو و چڵکنن و دەست و لاق و جەستەیان زامارە.

دکتۆر گانچۆ جێی دیارە. ناردوویانەتە بەرەی جەنگ. بەرپرسی تەندروستی، واتە سیرەش‌یش هەروەتر. ئێمەی منداڵ خۆمان رادەنێین بۆ ئەوەیە جێی ئەوان پڕ بکەینەوە: ماڵ بە ماڵ لە دەرگای خەڵکی ئاوایی دەدەین و داوای خاولیی خاوێن دەکەین و دەیاندڕێنین و دەیانکەینە برینپێچ. برینەکان دەشۆینەوە و گۆشتە ئاوساو و شین و مۆرهەڵگەڕاوەکان دەبەستین.

بریندار چاویان لە ئێمەیە. متمانەمان پێ دەکەن. زۆریان نیوەزیندوون. تەنیا یەك تکایان هەیە: ئاویان بدەینێ. لێوی بەبار و توێ توێی هەر کامەیان رێك لە برینێکی گەورە و زیندوو دەچێ. هەر ئەوەندەیان تێن لەبەر دایە بە هەزار مردن و ژیانەوە بڵێن: ئاو.

ئەوە جەنگە گاڵتە نییە. ئێستا لێم روون بۆتەوە. هەموومان ئەوە ئێستا دەزانین جەنگ چۆنە.

هەموو بەیانییەك چەند تەرم لە قوتابخانە دێنینە دەرێ. سەر و قاچیان دەگرین و دەیانخەینە نێو عارەبانە و دەیانبەینە گۆڕستان و گۆڕێکی تازە هەڵدەکەنین. ئەگەر مردووەکان پێنجیش بن، هەر پێنجیان لە قوولکەیەك دەخەین. ئەگەر دوازدەش بن، بۆ هەر دوازدە تەرمەکەیان هەر قوولکەیەك هەڵدەکەنین.

بەبێ تابووت. ئەوان بەبێ تابووت دەنێژین.

قەشە دووعایەك کاوێژ دەکاتەوە. وایلۆکبێژەکەی کلێسا بخوردانێکی پێیە و رایدەوەشێنێ کە دەمێکە بۆنی بخووری لێوە نایە.

هەر ئەوەندە.

سکرتێرەکەی قایمقامی لە رووی دەفتەرچەکانی زیانە گیانییەکانی سەربازانەوە کە بۆی دێنن، ناوی مردووەکان دەنووسێتەوە.

هەندێکیان تەخت لێی درێژ بوون و گیان دەدەن. هەندێکیان لە حاڵێکدا وەك مارانگاز جینگڵ دەدەن و خۆیان گرمۆڵە دەکەن. هەندێکیان رواڵەتێکی هێمنیان هەیە و دەڵێی مەرگ پاش عومرێك زەجر و ئەشکەنجە ئاخرییەکەی ئەو حەسانەوە و هێمنییەی هەمیشە بە ئاواتییەوە بوون، بە دیاری بۆی هێناون. هەندێکیان روخساریان ئەوەندە ئەشکەنجەدیتوو و وێکهاتووە، هەر دەڵێی زۆر لە مێژە لەگەڵ مەرگ دەستەوئێخەن.

لە دێ دەڵێن: ئەڵمانییەکان گەیشتوونەتە دۆرۆبانتزی و سبەی دەگەنە ئێرەش.

بەیانی، شێدار و تەمومژە. ڕۆژێکی ماوە بۆ نۆئێل. خولێکم بە نێو دێدا لێ داوە و هاتوومەتەوە ماڵێ بۆ نانی نیوەڕۆ. چاوەڕێی باوکمانین. زۆری پێ دەچێ تا دێتەوە.

لە دەوری سفرەکە کۆزیلکە دەبەستین بۆ ئەوەی ئەو برسییەتییەی قەت بەرۆکمان بەرنادا، تۆزێك جڵەوی بکەین. ئیۆنی برام مریشکێکی سەر بڕیوە ـ ئاخر خوای نەخواستە جێژنە ـ و دایکم شۆرباوێکی خۆشی لێ ناوە. لەگەڵ مامالیگا دەیخۆین. مامالیگا و شۆرباو زۆر بە تامن. من رانێکم پێ براوە. پەنجە و لێومان دەلێسینەوە.

باوکم دێتەوە:

ـ ئەڵمانییەکان گەیشتوونەتە سەر گردەکە.

دەردەپەڕینە دەرێ و لە گڵی خەندەقەکەی ئاسنەڕێ وەسەر دەکەوین.

هەر لە مەودای بەردهاوێژێکەوە، چوار سەبازی ئەڵمانی، چوار سوار بە پارێزەوە دێنە پێشێ. خودەی ئاسنیان لەسەرە. ئەسپەکانیان بەهێز و قەڵەون و کلکیان درێژ و پڕە.

چەند سەربازێکی ئێمە هێشتا وێستگەی شەمەندەفەرەکەیان چۆڵ نەکردووە. سەربازەکانی پێشەوەی ئەڵمانییەکان سەری چارەوییان وەردەگێڕن و دەسبەجێ بۆی دەردەچن. خودە بریقەدارەکانی یەکێکیان بەردەبێتەوە. هەڵێدەگرینەوە و بەسەر دارێکییەوە دەکەین و وەك خەنیمەتی جەنگ دەیهێنینەوە ئاوەدانی. ژیکا ستانسکۆی سکرتێر کە پاش ماوەیەك قەڵافەتی نارێکتر بووە، بۆ خۆشخزمەتی و خۆشیرنکردن لای دوژمنان پەلامارمان دەدا و خودەکەمان لە چنگی دەردێنێ:

ـ ئەڵمانییەکان ئەمشەو گوندەکە دەگرن. دیارە یەکەم شت بە دوای ئەو خودەدا دەگەڕێن. بۆیە چار نییە دەبێ بیاندەینەوە.

خودەکە دەباتە نێو قایمقامی و جوان و زەریف دەیسڕێتەوە و دەیخاتەوە بریقەبریق.

سەعاتێك دواتر، تاقە سوارێك لەوبەری ئاواییەوە پەیدا دەبێ و بەوپەڕی ترس و لەرەزەوە تا بەردەم قوتابخانەکە دێ. هەموو خەڵکی ئاوایی هاتوونە دەرێ. چەند سەد کەسێك وەك کوللە بۆی دەچین و تێی دەئاڵێین. هەموو بە سەرسووڕمانەوە لێی ورد دەبینەوە. ئەسپەکەی شەلاڵی ئارەقەیە. بەستەزمانە دەلەرزێ و لە کونەتفنەکانییەوە هەڵم دەردەدا. سوارەکە دیارە چەند حەفتەیەکە ردێنی نەتاشیوە. سەر و ردێنی خۆیشی وەك مووی ئەسپەکەی دەبریسکێتەوە. چاوی کەسکن و بەتەمەنە. شەشلوولێکی پڕ و لەسەرپێی بەدەستەوەیە. ئەسپەکە هەر وا دەلەرزێ و سوار ریشنەش وەك ئەسپەکەی.

پیاوێکی شاری کە ئاڵمانی دەزانێ، دەچێتە پێشێ و دەیدوێنێ.

ئەڵمانییەکە دەیەوێ بزانێ ئاخۆ ئاواییەکە هێشتا سەربازی تێدایە یان نا.

ـ نا، تێیدا نییە.

ئەڵمانییەکە دەیەوێ بزانێ، ئاخۆ ئەو سەربازە بریندارانەی لە پەنجەرەی مەدرەسەکەوە سەریان دیارە، چەکدارن یان نا.

ـ نەخێر، نین.

قەشە بۆلبۆك پەرداخێك شیر دێنێ و خولقی سەربازەکەی دوژمنی دەکا. ئەڵمانییەکە لێی وەرناگرێ. دەترسێ نەکا ژەهریان تێ کردبێ. بۆلبۆك یەکبین هەڵیدەقوڕێنێ. سمێڵی شیراوی

دەبێ. سوارە دڵنیا دەبێتەوە و ئەمجارە لێی وەردەگرێ و یەك بین دەیخواتەوە. پەرداخێکی دیکەش داوا دەکا. دیسان یەکی تر. ئینجا سەری چارەوای وەردەسوورێنێتەوە و بە چوار ناڵە دوور دەکەوێتەوە. تاوێك دواتر دەستەیەك سوار دێن و وێستگەکە دەگرن و بە دوای ئەوانیشدا لەشکری سەربازە ئەڵمانییەکان دێنە نێو ئاواییەوە.

بۆ سەیرکردنی دوژمن لە ئاسنەپەرژینەکان وەسەر دەکەوین. هەمووان یان زۆر گەنجن یان زۆر پیر. یان پیرن و بە زەحمەت خۆیان لە سەر خوانی زین ڕاگرتووە، یان گەنجن و وەك ئیۆنی برام تازە خەتیان لێ داوە. ئەڵمانییە لە ساڵ گەڕاوەکان هەموو لە شەڕدا کوژراون. چەندە شەکەت و ماندوو دیارن. دەموچاوی هەمووان ڕەق هەڵاتووە و ڕەنگیان زەرد هەڵگەڕاوە و ریش و قژیان درێژ و ئاڵۆزە و چاویان لە بێخەوی بەقووڵدا چووە و پرتەیان دێ. ئەسپەکان کە هەتا کەفەڵیان قوڕاوی بووە، سەرەڕای ئەوەی تۆکمە و ساغن، دەڵێی ئێستا نا تاوێکی دیکە وەعەرزی دەکەون.

ئەفسەرەکان فەرمانێك دەردەکەن. سەرباز دادەبەزن و ئەسپەکانیان بە ریز لە پەرژینەکە دەبەستن. چێشتخانە گەڕۆکەکەیان هەڵدەکەن. سەرباز دەستە دەستە دەچنە تەویلەکانەوە یان پەلاماری کولانەی پەلەوەران دەدەن و بە باوەشی پڕ لە مریشك و پەلەوەرەوە دێنەوە. مریشك و قاز تۆقیون و قیڕە و قیژەیانە و خاوەن پەلەوەر لە ترسان وشك هەڵاتوون و نقەیان لێوە نایە. قایمقام و قەشە و سکرتێر کە چووبوونە پێشوازی لەشکرەکە، بەڵێنیان بە فەرماندە ئەڵمانییەکە داوە گوندییەکان نقەیان نەیە. ئالیسترمانزۆی قایمەقام تێی قووچاندووە. پەنای

بردووەتە مۆلداڤیا، کە سەربازەکانی خۆمان برسی و رووت و قووت خەریکن بە تاڵووکە لەوێش دەکشێنەوە.

ـ لە بەردەم دەروازەکانی مۆلداڤیا شەڕێکی قورس دەقەومێ.

ـ سوپاکانی رووسیش شان بە شانی سوپاکانی ئێمە شەڕ دەکەن و دەست دەکەنەوە.

ـ ئەڵمانییەکان لێیان قەوماوە.

ـ لە کۆڵ خۆمانیان دەکەینەوە.

خەڵکی شاری کە پەنایان هێناوەتە بەر دێ و ئەڵمانی دەزانن، ترپیان لێ زل بووە. لە شەقامەکاندا دەردەکەون و لەگەڵ ئەفسەر و سەربازە ئەڵمانییەکان دەکەونە قسەکردن.

دوژمن دەڵێی گورگی برسین. ئەو سووپە رەشەی بۆیان لە قاپەکانیان کردوون، دەمودەست دەیخۆن و وەك نەدی و بدی نانەکەیان دەجاون. نەك هەر بە ددان بە چاو و دەستیش. دەچنەوە چێشتخانە و هەر کەسە و دیسان بە چاوی بە پرتەپرتەوە قاپەکەی پڕ دەکاتەوە لە سووپ. سەرباز ئەو جووچکە و قەل و قاز و شتانەی گرتبوویانن و هێنابوویانن، هەر وا بە خڕی و نەشۆراوی خستوویاننەتە نێو مەنجەڵە زلەکانەوە. لە پشت ئاشەکەوە لە بژوێنەکەدا چوار گایان گرتووە  و لە دەم ڕێیەکە سەریان بڕیون و لەتوکوتیان کردوون و لە سەر دوو عارەبانەیان داناون. خاوەنی گایەکان، دوو گوندیی قوونڕووتی شاقەل درێژی ئەستانی کۆتسین کە ناوێرن بڵێن لەل. پاپاخ بە دەستەوە لە لایەکەوە راوەستاون و زۆرزۆر دەگرین. هەر دەڵێی منداڵەکانیان سەردەبڕن و بگرە لەوەش ناخۆشتر.

ـ ئەی خوایە گیان گایەکانم. وەی خوایە گایەکانم... بەبێ ئەوان چ بەڵایەکم بەسەر دێ.

ئەمشەو لەو گوندەدا یەك كەسیش خەوی لێ ناكەوێ.

ئەڵمانی ئەسپەكانیان هێناوەتە نێو حەوشە و باخ و باخچەكان و خۆشیان لە لایانەوە لەسەر باوەشێك كا و كلۆش یان لاسكە گەنمەشامی لێی خەوتوون.

پاسەوانەكان بە ئاواییدا دەسوورێنەوە. لە هەموو جێیەك ئێشكگریان داناوە.

ئەمشەو مانگەشەو نییە. ئەستێرەش دیار نین. ئەو تەمەی ئاسمانی داپۆشیوە، وا دابەزیوەتە خوارێ دەڵێی لە عەرز دەخشێ. تەمومژی زستانی كێوپارە و ئاواییەكەی لە خۆیدا لوول داوە.

بەرەبەری بەیانی سارد دەبێ. بایەك هاتووە و مژەكەی رەواندووەتەوە و، خۆرێكی بچووك و خڕ و رەنگبزڕكاو، هەتاوێكی دوورەدەستی زستانان لە ئاسمانەكەوە هەڵكشاوە

هەتاو وردە وردە بەرەو گومبەزەكەی ئاسمان دەخزێ.

لەشكرە ئەڵمانییەكان رۆیون. بەرەو رۆژهەڵات كەوتوونە رێ. بەر لەوەی بڕۆن، شەمەندەفەرە بارهەڵگرەكانیان كە لە وێستگەكان راگیرابوون، تاڵان كردووە. چیی پێیان وابووە بەكاریان دێ، هەڵیانگرتووە و بردوویانە. بۆیە پاش ئەوان خەڵكەكەش هرووژم دێننە نێو وێستگەكە و روو دەكەنە شەمەندەفەرەكە. لە خوای بەزیاد بێ: لێفە، مێز، كورسی، پەردە، قاپ و قاچاخ. هەموو شتێكی لێیە. ئەوانە، ئەو ڤارگۆنانەن كە ماڵ و حاڵی خواپێداوانی ئۆڵتیان هەڵگرتبوو بیانبەنە مۆلداڤیا، بەڵام لە سۆنگەی هەڵەیەكی بەرپرسێ وێستگەی كۆسنجتی كە بێ ئەقڵیی كردبوو، گەیشتووە دانووب.

ئیۆنی برام ئەوەندە تووڕەیە چەقۆی لێ بدەی خوێنی ناگەڕێ: لێی روون بۆتەوە کە لە وێستگە چەند ڤارگۆن مەشرووبی لێیە کە ئەڵمانییەکان ئەوانیشیان شکاندووە و ئێستا خەڵکەکە هەرکەسە و بە چەند قەرتاڵەیەکی پڕ لە باشترین مەشرووبی دنیاوە دەچنەوە ماڵی خۆیان.

دایکم لە نێوەڕاستی دەرگاکەوە رادەوەستێ و دەڵێ:

ـ هەر کەس بیەوێ بچێتە دەرێ، دەبێ بەسەر مەیتی مندا بڕوا.

ـ هەمووماں پێمان بە عەرزەوە وشك دەبێ.

ئیۆنی برام دەیەوێ لە پەنجەرەوە بۆی دەربچێ، بەڵام پەنجەرەکە ئاسنەپەرژینی هەیە.

دوای تابووری ئەڵمانییەکان کە ملی رێگەیان گرت و رۆیشتن، سبەینێ سەر و سەکتی عارەبانەی یەکەی سەربازە داگیرکەرەکان دەردەکەون، کە تێکەڵەیەکن لە سەربازی ئەڵمانی و نەمسایی. هەندێکیان ئەو بینایە داگیر دەکەن کە پێشتر پۆلیسخانە بوو. ئاخر مێلۆچیل نیوە شەوێ سیپاڵی خۆی کۆ کردووەتەوە و بۆی دەرچووە، دیارە زیاتر لە ترسی خەڵکەکە نەك لە ترسی دوژمن. باقی سەربازەکانیش هەر لە وێستگەی شەمەندەفەرەکەدا باریان خستووە.

خەڵك ترسەکەیان تۆزێك رەویوەتەوە. زۆربەی سەربازە نەمساییەکان زمانی رۆمانی دەزانن. خەڵکی ترانسیلوانین. زۆر زوو توانیویانە لەگەڵ خەڵکەکە تێکەڵ بن. هەندێکیان کەمئەندامی جەنگن. یان شەلن، یان چەند پەنجەیەکیان پەڕیوە. هەموویان لە جەنگ بێزارن و هەر بۆڵەیان دێ:

ـ ئێمە ئیمپراتۆر ناردووینی بۆ جەنگ. ئیمپراتۆر و دەستڕۆیشتوو و ئاغاکانی دەربار، کە یاخوا عەمریان نەمێنێ و خێر نەبینن.

فەرماندەی یەکەکانی نەمسا و هەنگاری ناوی گانتزە. لە ترانسیلوانی تەنەکەساز بووە. هەر لەبیریشی نەماوە سەربازە و دەستی کردووە بە چاکردنەوەی سۆپە و مەقالّی و قاپ و قاچاخی خەڵکی ئاوایی، بەلاّم لەگەڵ ئەڵمانییەکان بە شێوەیەکی دیکە دەجووڵێتەوە.

فەرماندەی ئەڵمانییەکان ناوی رۆدۆلف بۆرگێرە. گۆڵەکەرێکی زرتەزەلامە و سمێڵی بە حاستەم بەرچاو دەکەوێ. بەردەوام بە نێو ئاواییدا دەخولێتەوە و دەگەڕێ. دەڵێن، بۆیە هەڵیانداشتووەتە نێو یەکەی داگیرکەرانەوە، چونکە لە بەرەی جەنگ ئەقڵی تێك بووە.

بۆرگێریش رۆمانیایی دەزانێ. زۆر دواتر دەردەکەوێ کە جەنابی ملازمیش لە یەکێك لە شارەکانی نزیکدا شاگردی شیرینی سازی بووە.

پاش چەند رۆژان سەربازەکانی بۆرگێر دەست دەکەن بە داگیرکردنی خۆراك و مالاّت و جلوبەرگی خەڵکەکە. ئینجا دەفر و ئامان و مەنجەڵە مسییەکان کۆ دەکەنەوە و بەرێی کارخانەکانی هاوەن دروستکردن دەکرێن. زەنگی کلێساکانیش هەر وا لێ دەکەن.

بەرەی جەنگ دوور کەوتووەتەوە. گەیشتووەتە بوخارێست.

ئینجا هەواڵێك زار و زار دەگەرشێ، کە لە جێیە، لە بەردەم دەروازەکانی مۆلداڤی، رێیان بە ئەڵمانییەکان گرتووە و تورکەکانیش شان بە شانی ئەڵمانییەکان هاتوونەتە شەڕەکەوە.

خەڵك لێك دەپرسن: باشە ئەو تورکانە چ دوژمنایەتییەکیان لەگەڵ ئێمە هەیە؟

سکرتێرەکەی قایمقامی بۆیان روون دەکاتەوە:

ـ ئەوان هاوپەیمانی ئەڵمانیان. هەر بۆیە بە گژ ئێمە و رووسەکاندا دێنەوە.

ئێستا رۆژنامەی دیکەش دەگەنە ئاوایی: ئەو رۆژنامانەی لایەکیان بە ئاڵمانی نووسراوە و لایەکی دیکەشیان بە رۆمانیایی. بە ناوی سکرتێرەکەی ناحییەوە دەیانئێرن و ئەویش بە دەنگی بەرز بۆ خەڵکەکەیان دەخوێنێتەوە.

لەو رۆژنامانەدا تەنیا هەواڵی ئەو سەرکەوتنانە چاپ دەکرێ، کە لە بەرەکانی جەنگدا ئەڵمانییەکان دەستەبەریان کردوون و تەنیا بەو دەرەبەگ و نەجیبزادانە هەڵدەڵێن کە سیاسەتی ئەڵمانیایان پێ باشە.

من هیچ لەو شتانە تێ ناگەم. هەر ئەوەندەیە گوێ رادەگرم و هەوڵ دەدەم شتێکم لێ روون بێتەوە.

لە بریندارەکانی نێو قوتابخانەکە، ئەو چەند دانەیەیان کە بە زیندوویی دەرچوون و نەمردن، بە هەڵەداوان بردیاننە شاری. چەند کەسێکی دیکەشیان لە رێیە مردن. بەڵام بۆنە قورسەکەی چڵك و خوێن و کێم هەر وا قوتابخانەکەی بەر نەداوە.

هەموو بەیانییان دەبیستین:

ـ دوێ شەوێ رادۆی کوڕی تاتازێ هاتووەتەوە.

ـ کوڕەکەی جیۆنکاش هاتووەتەوە.

ـ کوڕەکەی بادۆییش گەڕاوەتەوە.

ئەو سەربازانەی کاتی پاشەکشێ لە یەکەکەیان رایان کردووە، شەو نییە یەکێکیان نەیەتەوە ئاوایی و لە عەمبار و کون و کاژێراندا خۆیان نەشارنەوە.

ڕۆدۆلف بۆرگێر دەزانێتەوە. وەك دیارە، ستانسکۆی سکرتێر ئاگاداری کردووەتەوە. ئەگەر میتزای ژنی قەسابەکەی ئاوایی لە هەرای نەدابێ، ئەوە کاری ستانسکۆیە.

ئەو میتزایە کچی یەکێك لە ئەڵمانییەکانی تۆرنۆیە کە لەگەڵ خەڵکە شارییەکەی دیکە پەنای هێناوەتە گوند و لەوەتەی ئەڵمانییەکان هاتوون، بووەتە دیلماجی یەکەی داگیرکەران.

ڕۆدۆلف بۆرگێر فەرمانێك دەردەکا ئاوا:

ئەمڕۆ دوانیوەڕۆ سەعات چوار، ئەو سەربازانەی رایان کردووە و هاتوونەتەوە ماڵەکانیان، بێنە قایمقامی و خۆیان ئاشکرا بکەن. هیچ کەس بۆی نییە خۆی بشارێتەوە. فەرماندە بەهیچ شێوەیەك نایەوێ بیانداتەوە دەست هۆردوو. ئەو هەر دەیەوێ بزانێ چەند کەسن. ئەوانە هەر دەخرێنە بەر چاودێرییەوە و هەموو شەوێ ناویان دەخوێنرێتەوە کە نەکا چووبێنەوە بەرەی جەنگ. خێزانی راکردووەکان بێت و ئەو فەرمانە جێبەجێ نەکەن، ئەوا قۆڵبەست دەکرێن.

دیش، لە شەیپوورەکەی دەتووڕێنێ و خەڵکەکە لە حەوشەی قایمقامی کۆ دەبنەوە. سکرتێر راگەیەنراوی بنکەکەی ئەڵمانیان بۆ دەخوێنێتەوە و دواییش بە بزمار لە دیوارەکەی دەدا.

راکردووەکان دێن و ناویان دەخوێنرێتەوە: هەشتا و شەش کەسن. هەشتا و شەش گوندی کە بە دڵێکی پڕ لە رق و قین و بێزار لە جەنگەوە رایان کردووە و هاتوونەوە.

ـ بۆ هاتوونەوە؟

ـ چونکە ئەوەندەی کردوومانە ئیدی بەسە. ئەفسەرەکان تێیان هەڵدەداین و بۆخۆیان لە پەناگەکاندا خۆیان دەشاردەوە و ئێمەش بێت و نەچووباینە پێشەوە، تەقەیان لێ دەکردین.

مێرێئاساڤۆ، ئەو ورزێرە دەوڵەمەندەی بۆرگێر کردوویەتی بە قایمقام بەسەریاندا دەنەڕێنێ:
ئێوە درۆ دەکەن. لە پێناوی دایکی نیشتماندا دەبێ بکوژرێی.
پێترێ زگامایێ پێی دەڵێ:
ـ کوڕە تۆزێك هێواش جەنابی مودیر شتێك دەشکێنی بەو دایکی نیشتمانەتەوە. هەر ئەوەندەم پێ بڵێ بزانم لانیکەم تۆ لەسەردەمی هێمنییشدا سەربازییەکەتت کردووە؟
ـ نەخێر نەمکردووە. من تاقانە کوڕیماڵەوەمان بووم. ملك و ماڵمان هەبوو و دەبوو یەکێك پێیان رابگا.
ـ کەوابوو وا باشترە دەمت گرێ بدەی. ئەگەر قەرار بێ یەکێك بێ ئەملاوئەولا بچێتە سەربازی و بچێتە جەنگ، ئەو کەسە هەر تۆی. ملك و ماڵت هەیە و چاوت دەربێ و بچۆ بەرگریی لێ بکە، من بەرگری لە چ بکەم؟ لە ئەسپێی نێو باخەڵم؟
ـ تۆ لەوەتەی هەی، کارت هەر ملبادان بووە. مێشکت پەینی تێدایە. لەو شۆڕشەدا ناخە چەپەڵەکەی خۆتت باش دەرخست. دەتناسم.
ـ دەی باشە، ئێستا کە دەمناسیت باشتریش.
میرێئاساڤۆ کابرایەکی ورگ زلی کورتەبنەیە. زەوی و زار و ماڵاتێکی زۆری هەیە. بۆ ئەوەی ببێتە قایمقام و لەو رێیەوە ماڵ و سامانەکەی لە بەڵای زەوتکردن بپارێزێ، چیی ماستاوچێتی و زمانچەوری و دەمتەڕی بوو بۆ ئەڵمانییەکانی دەکا و پێشی شوورەیی نییە. سوێندی بۆ خواردوون بە دڵ وەفاداریان بێ. شەوانە ئەو ژنە هەرە گەنجانەی مێردەکانیان لەبەرەی جەنگن،

راپیێچی قایمقامی دەکا و لەسەر مێزەکەی یان لەسەر عەرزەکە لەگەڵیان جووت دەبێ. جا ئەگەر نەیکەنە هەرا، ئەوە بێگارییان پێ ناکا وماڵیاتیان لێ وەرناگرێ.

بە ژنەکەی گوتووە با منداڵمان زۆر بێ و کە مردم وەجاغکوێر نەبین و ماڵەکەمان بە خەڵك نەبڕێ.

مامۆستای گوندەکەی ئەوبەر، ئەفسەرێکی یەدەگ بوو. ئێستا ناردوویانەتەوە بەرەی جەنگ و ژنەکەی بە دوو منداڵەوە بێ سەرپەرستن.

ژنە لەسەر چاوی کوێری دانێی چاکی دەکاتەوە. هەم جوانە و هەمیش خوێندەوار. کچی یەکێك لە مڵکدارەکانی دەربەندی دانووبە. لە یەکێك لە قوتابخانە شەوورۆژییەکانی بوخارێست خوێندوویەتی و ئاڵمانیەك دەزانێ وەك بولبول قسەی پێ دەکا. گانتێز بەر لە هەمووان فکری بۆ ئەو چوو، بەڵام تۆزێك دواتر ڕۆدۆلف بۆرگێریش زانیی شتێکی وا دەگمەن لەوێ هەیە. گانتز هەر ئەوەندەی لەو سەودایە پێ بڕا، کە بۆرگێر چەند قەمچییەکی لە پاش قوونی راکێشا. گانتزی داماو، تێهەڵدانەکەی خوارد و لاقی لە عەرزی کوتا و سلاوێکی سەربازیی کرد و وەرسووڕاوە و رۆیشت.

هەموو شەوێ جەنابی ملازم ڕۆدۆلف بۆرگێر لە ماڵەکەی مامۆستا بیڤۆلارۆی خوانێك دەڕازێنێتەوە کە هەتا بەرەبەیانی کۆی ناکەنەوە. شەوی وایە خەڵکی ئاوەدانی ژنەکەی مامۆستا دەبینن کە دەست لە ناو دەستی فەرماندە ئەڵمانییەکەدا پیاسە دەکا. ژنەتیوی ئاوایی هەزار بوختان و قسە و قسەڵۆکیان بۆ هەڵبەستووە و کە لە کۆڵانێش تووشی دەبن، ڕووی لێ وەردەگێڕن.

ئێستا ئیتر هەمووان دەزانن مامۆستاکە بە دیل گیراوە و ناردوویانەتە ئەڵمانیا. هەموو حەفتانە نامەی دوورودرێژ و پڕ لە سۆز و خۆشەویستیی بۆ ژنەکەی دەنووسێ، کە نووسینگەی پشکنین سەریان هەڵدەپچڕێ. هەر بۆیە نامەکانی بە سەری ئاوەڵاوە دەگەنەوە ئاوایی و چەند رۆژان لە قایمقامیدا دەمێننەوە. لە پێشدا سکرتێر دەیانخوێنێتەوە و بە کەیفی دڵی پێیان رادەبوێرێ و دواییش نامەبەر و ئاخرییەکەی پاسەوانەکان و ئیتر وای لێ دێ چیی تێیاندا نووسراوە دەکەونە سەر زار و زمانی خەڵکەکە.

مامۆستای داماو ئازار دەچێژێ و هیوای بە گەڕانەوە نەماوە. ژنەکەی سوێند دەدا ئاگای لە منداڵەکانی بێ. وەبیری دێنێتەوە کە چەندی خۆش ویستووە و ژنەش چەندەی سۆز داوەتێ و ئاخری هانی دەدا بەداوێنپاکی بژی.

*

*

*

خێر و بەرەکەت لە ماڵەکەی تۆماس ئۆکێی نەما و خێزانەکەی پەرش و بڵاو بوون.

مەیخانەچیی داماو وەك بڵێی تیری نەبەدیی وێ کەوتبێ. لە ناکاو کەوت و مرد و ژنەکەشی چەند رۆژێك دوای خۆی لە حەوت ساڵان راستەوە بوو.

کچە گەورەکانی چوونە شاری و ملیان نایە کار و کچە منداڵەکانیشی خزم و کەس باڵیان بەسەردا کێشان. تەنیا میتیکا بەجێ ما، کە بوو بە خاوەنی مەیخانە و میراتەکە.

ـ دیسان دەتەوێ ئەمساڵ پاییزێ بچیتەوە شاری بخوێنی میتیکا؟

ـ جا پاش باوكم چۆن دەتوانم بخوێنم؟

ـ ئەی دەتەوێ چ بكەی؟

ـ هیچ. دار و نەدارەكەم دەفرۆشم و دەیخۆم.

ـ ئەی دوایی؟

ـ دواییش خوا كەریمە.

جا هەر بەراستی هەرچی بووی، فرۆشتی. عەمبار و دووكان و دانەوێڵە و ئەو دارانەی لە حەوشەكەشیاندا لەسەر یەك دانرابوون. تەنیا مانگا و مەڕەكانی نەفرۆشت، ئەویش لەبەر ئەوەی مەڕ و مانگای هەر نەبوو. هەر رۆژە و مریشكێكی سەر دەبڕی و لەسەر ئاگر دەیبرژاند و دەیخوارد. مریشك جووقەواریان بڕا و، قەفەزە و مێزی پێشخانی دووكانەكەشی فرۆشتبوو، پێشتریش مێز و كورسی و شووشە و بەرمیل و چەلەنگەكانی كردبووە پارە. جلوبەرگی دایك و باوكیی دابوو بە دۆمەكان، چونكە كەس جلوبەرگی مردوویەكی نەدەویست كە بە گرانەتا مردبێ.

ـ دیسان شتێك ماوە بیخۆی میتیكا؟

ـ نا، ئیتر هیچم نییە.

ـ ئەی ناتەوێ لە جێیەك كار بكەی؟

ـ نا. من پیاوی كاركردن نیم. باوكم مەیخانەچییەكی متمانەپێكراو بوو. یانی من كوڕی مەیخانەچییەكی متمانەپێكراوم، وا نییە؟ ئەگەر وابێ چۆن دەتوانم لای یەكێك كار بكەم؟

ـ ئەی چ دەكەی؟

ـ هیچ. هیچ ناخۆم.

ـ تاکەی؟

ـ تا لە برسان دەمرم.

ـ خەڵك پێیان وابوو گاڵتە دەکا. بەڵام میتیکا گاڵتەی نەدەکرد.

پاییز تەواو ببوو. چلەی زستانێ بوو. میتیکا لەو ژوورەدا کە لە باقی ژوورەکانی دیکە پەناتر بوو، بەڵام وەك ژوورەکانی دیکە نە دەرگای هەبوو و نە پەنجەرەش، بە باوەشێك کا و کلۆش جێ خەوێکی بۆخۆی دروست کرد و لێی راکشا و چاوەڕێی کرد. گۆزەیەك ئاوی لە نزیك خۆی دانابوو، جارو بارە قومێکی لێ دەخواردەوە و لەجێی خۆی دایدەناوە و دیسان جووڵەی لە خۆی دەبڕی.

لە گوند دەیانگوت: میتیکا لەسەر کلۆشەکە راکشاوە و چاوەڕێیە بمرێ.

ـ نەخۆش کەوتووە؟

ـ نا. نەخۆش نییە، هەر دەیەوێ، بمرێ.

ـ باشە بنیادەمی ساغ و سەلیم چۆن بمرێ؟

ـ وەختایەك هیچ نەخوا دەمرێ ئیتر.

ـ بەڵام شتی وا نابێ نا. هەر هیچ نەبێ بنیادەمێکە و نابێ لە برسان بمرێ.

لە گوندەکاندا قاتوقڕییەکی سەیرە. ئەڵمانییەکان چییان پێ بردرا بردیان. خانوو و باخەکانیان سەروبن کرد نەکا خەڵکەکە شتێکیان شاردبێتەوە. خەڵك کە چاوەڕوانی وەها شتێك بوون، هەرچۆنێك بێ ئازووخە و پێخۆری خۆیانیان باش تاقەت کردبوو، کە

ئەڵمانییەکان سەرەڕای ئەو هەمووە پشکنینە هیچیان دەست نەکەوت. بەڵام قاتی و قڕییەکە لەوە قورسترە کە بە شاردنەوەی ئەوەندە خەلە و دانەوێڵەیە بکرێ بە ئاسانی لێی دەرباز بی. بەو حاڵەشەوە خەڵکەکە و بەتایبەتی دەروجیران هەرچۆنێك بێ لەتەنانێك یان لەتێك پەنیری بۆ دەبەن و دەچنە حەوشە چۆلەکەی مەیخانە بۆلای میتیکا لە ژوورە چۆلەکاندا.

ـ وەرە میتیکا لەتێ نانم بۆ هێناوی.

کوڕی مەیخانەچییەکە هەر وا بێ جووڵە کەوتووە. بە هەزار زەحمەت وەڵام دەداتەوە:

ـ پێویست نییە کاك پانابیت، من خێر و سەدەقە وەرناگرم.

ـ دەمری میتیکا.

ـ دەی منیش ئەوەم دەوێ.

ـ حەیف نییە؟

ـ حەیفی چی؟ ئێستا کە باوکم مردووە با منیش بمرم. حەز ناکەم خەڵك ببینن کار دەکەم. وا دیارە ئێوە تێناگەن من کوڕی مەیخانەچی بوومە؟ چۆن دەکرێ بەرەو دوا بگەڕێمەوە و بچم لە دەشتێ کرێکاریی ئەم و ئەو بکەم و با و باران لێم بدا؟ نا، نا. هەر لێرە دەبم تا دەمرم.

ـ زۆر باشە میتیکا. هەر وا بە. وا بە تا دەمری.

ژنێکیش دێتە لای میتیکا. دەڵێ:

ـ كوڕی باش، شووشەیەك شیر و سێ هێلکەم بۆ هێناوی. سەیر بکە، کاکەش تۆزێ مامالیگای بۆ هێناوی. بیخۆ دەی کوڕی باش، دە بیخۆ دەی.

ژنەکەی تزانتزۆ، ئەو بێوەژنە قوڕبەسەرەی بۆخۆی نانی نییە بیخوا، خواردنی بۆ میتیکا هێناوە.

ـ سپاس پوورێ. بەڵام من بەتەما نیم هیچ بخۆم، هەر دەمەوێ زووتر بمرم.

ـ دەی باشە بمرە میتیکا گیان.

دەنگی نووساوە. چاویشی بە قووڵدا چوون. چەناگەی داچۆڕاوە. خەڵك هەر دێن و دەڕۆن. دێنە پشت پەنجەرەی ماڵە کاولبووەکە و کۆ دەبنەوە و سەیری دەکەن. تاوێك لێی ورد دەبنەوە و دوایی شانێکی لێ هەڵدەتەکێنن. لەو ئاواییە کەس نییە نەچووبێ میتیکا ببینێ و پاروەوە نانێکی بۆ نەبردبێ.

تەنانەت هەندێ جار وایان پێ باش بووە ئەو پارووە نان یان مامالیگایەی بۆیان هێناوە، لە تەنیشتی و لەسەر عەرزەکە داینێن، بۆ ئەوەی ئەگەر هات و برسێتی تینی بۆ هێنا و باوەڕەکەی گۆڕا، شتێکی لەبەردەست بێ، بیخوا.

بەڵام میتیکا لەسەر قسەی خۆی سوور بوو. رای نەگۆڕا. ئێستا ئیتر بە زەحمەت زاری هەڵدەپچڕێ بۆ ئەوەی شتێك بڵێ. دەنگی وا نووساوە، دەڵێی لە بن حەوت بەردەوە دێتە دەر.

ـ هەر ناتهەوێ هیچ بخۆی میتیکا؟

ـ نا.

ـ خەریکە دەمری.

ـ دەمرم، بەڵێ.

چاوی لێك دەنێ. حەز ناکا قسە لەگەڵ کەس بکا. ئێستا ئەوە سێ حەفتەیە کوڕەکەی مەیخانەچی تەنانەت دەم لە ئاویش نادا.

زستانێکی سەختە. تەزووەکە وەك شیر دەبڕێ. بایەکە لە نێو ژوورە بێ دەرك و پەنجەرەکاندا لوورەی دێ. لوورەکەی شووم و خەفەتهێنەرە.

رۆژێك بەیانی دەبینن میتیکا لاقی راکێشاوە.

بە ئاواتەکەی گەیشت. رۆحی شاد.

ـ میتیکا چ لێ بکەین جەنابی سکرتێر؟

ـ خوشکەزاکەم؟

میتیکا بە خوشکەزای سکرتێرەکە دەرچوو.

لە عەمباری مەیخانەدا چەند تەختەیەك دەدۆزنەوە. تەختەی کۆنەی تۆزاوی و خۆڵاوی. ئەگەر میتیکا زانیبای لەوێن، ئەوانەشی دەفرۆشت. بەو تەختانە تابووتێکی بۆ دروست دەکەن و دەینێژن. بەبێ هیچ پرسەیەك.

❊

❊

❊

زەمان دەڕوا. هێواش دەڕوا، بەڵام هەرچۆنێك بێ، دەڕوا.

بەفرەکە هەر نەچۆتەوە و دەشتەکە هەر سپی دەچێتەوە، سپییەکی بێ بن.

ئەڵمانییەکان عەمباری ئاغای سائێلێیان دۆزیوەتەوە. هەتا بن میچ پڕ لە دانەوێڵە. ڕۆدۆلف بۆرگێر فەرمان دەدا سێسەد عارەبانە بەرن و دەغڵ و دانەکە باگوێزنە وێستگەی شەمەندەفەر. سکرتێرەکەی قایمقامی لیستەیەك دەگرێ. تەنیا راکردوەکان نابەنە بێگاری. تازەپێگەیشتووەکانیش کە بەشی خۆیان لێ پاشقول داوە. تەنیا ژنەکانیان دەوێ. ژنی ئەوانەی لە مۆلداڤیا یان لە ئەڵمانیا لە شەڕن.

سێسەد ژن، هەندێ گەنجتر و هەندێ پیرتر لەسەر جادە گەورەکە لەسەرمان هەڵدەلەرزن. سکرتێر ناویان دەخوێنێتەوە بزانێ کێ نەهاتووە. کە پشکنین تەواو بوو، ریزی سۆخرە کە هەر دەڵێی برانەوەی نییە، دەجمێ و بە گردەکە هەڵدەگەڕێن و دەگەنە سەر ئەو جادەیەی دەچێتە عەمبارەکانی سائێلێ. گایەکان لە قوڕ و لیتە دەچەقن. ڕێگە دەگیرێ. ژنان بەفرەکە لادەدەن. هەڵدەنگوون. دەکەون، هەڵدەستنەوە و وەك ژنان دەگرین و وەك پیاوان جنێو دەدەن.

سەرماکە وەك مووس دەبڕێ. لێو و پشتەدەستیان توێ توێ دەبێ. بایەکە وەك مووسی دەلاکی پێستی دەموچاو و قاچەکان کە لە کۆنەپەڕۆ وەرپێچراون، دەبڕێ، بەڵام چار نییە و هەر دەبێ بڕۆن.

سکرتێر و قایمقام و ئەندامانی ئەنجومەنە خۆجێییەکە لە مەیخانەکەی بۆچۆك خەریکی خواردنەوە و رابواردنن.

جەنابی ملازم ڕۆدۆلف بۆرگریش پەیدا دەبێ، بە رواڵەت بە ڕێکەوت هاتووە و، ئەویش چەند پێکێك پێدا دەکا.

*

*

*

جێژنە بەهارییەکەی پاك نزیکە. ئیۆنی برام هەواڵێکی چاوەڕواننەکراومان دەداتێ.

پێشتر دایکمی لێ ئاگادار کردووەتەوە.

ماڵەکەمان جموجۆڵێکی تێ دەکەوێ.

ئێمە یازدە خوشك و براین.

لەو یازدەیە، دوانیان لە ژنەکەی دیکەی باوکمن: یەکێکیان گیۆرکێیە کە زۆر لە مێژە ماڵێی بەجێ هێشتووە و ڕۆیشتوە و ئێستا بۆخۆی بووەتە قەشەیەك و ئەویش دیکەش لێئانایە، ئەو کچەی مامە ژیگۆیی هەڵێگرت و بردییە لای خۆی و دواتریش هەر خۆی نەیویست بێتەوە.

دوانەکەی دیکەش ئەوانەن کە دایکم لە مێردەکەی دیکەی هەیەتی: کاکە ئیۆن و ئێڤانگلینی خوشکم.

ئینجا دەمێنێتەوە ئێمە کە پاش ئەو چوارە لە دایك بووین و منداڵی هەردووکیانین.

دایکم هەر جارێکی ناوی گیۆرکێ و لێئانای بەسەر زاردا دێ، دەسبەجێ دەڵێ: "منداڵەکانی باوکتان." و هەر جارێکی ناوی ئیۆن و ئیڤانگلینیش دێنێ، دەسبەجێ دەڵێ: "منداڵەکانی خۆم."

لێی دەپرسم:

ـ هەر ئەو دووانە هیی تۆن دایە؟ ئەی ئێمە؟ ئەی ئێمە منداڵی کێین؟

ـ دەڵێ: ـ ئێوە؟ ئاخر ئێوە هیی باوکیشتانن، وا نییە؟

جاری وا هەیە باوکم تووڕە دەبێ. دەی باشە، ئەوە شتێکە، کە لە هەموو ماڵێکدا هەیە. لەو وەختانەدا دایکم بە هەڕەشەوە دەڵێ:

ـ ئیدی کوڕە گەورەکەم ئەوە دەبێتە پیاو. قۆڵی لێ هەڵدەماڵم و ژنێکی بۆ دێنم و دەچمە لای ئەو. جا ئەودەم بە تەنێ دەکەویتەوە، هەمووتان بە تەنێ دەبن جا دەزانن دنیا بەری بە کوێوەیە.

دیارە دایکم زیاد لەو هەمووە کوڕە تەنیا یەکێکیان بە کوڕی راستەقینەی خۆی دەزانێ. کە ئەگەر رۆژێك لەگەڵ مێردەکەی نەسازا، دەتوانێ هەستێ و بچێ لەگەڵ ئەو بژی.

دایکم هەمیشە، هەر کاتێکی زۆر تووڕە بێ، هەر دێتە سەر ئەو قەناعەتە و، ئێستاش ئەو ساتەیە کە پێی وابوو وا زوو ناگاتێ بەڵام لە ناکاو گەیشتووە.

ـ دەتەوێ کێ بخوازی رۆڵە؟

ـ لە ئەستانی کۆتز کچێکم دۆزیوەتەوە.

دایکم کەیفی بەو وەڵامە نایە. ئاخر ئەو چەند ساڵان خۆی لە کچە دراوسێییەکمان خۆش کردبوو، بەشکم رۆژێك بچێ و بۆ ئیۆنی بخوازێ. کچە خواروخێچەکەی ئیانکۆبان.

لە گوند، گەورەترین ئاواتی هەر دایکێك ئەوەیە، کچی جووتبەندەیەکی خاوەن زەوی و زار بۆ کوڕەکەی بخوازێ، بەڵام ئەو جۆرە کچانە زۆر نین. کەچی شەق هەڵێنی وە کوڕان دەکەوێ... و

جا خۆشەکە ئەوەیە "نازانم بۆ وایە، بەڵام واقیعەکە وایە" کچی دەوڵەمەندان هەر هەموو ناشیرین و خێچوخوارن.

ئیۆنی برام هەر ئامادە نییە گوێشی لەو قسانە بێ.

ـ دەتەوێ کچی کێ بێنی؟ کچەکەی بان؟

ـ تیەح، بەو لچە ئەستوورانەیەوە. خوا بیبباتەوە.

ـ ئەی ئەوەی دەتەوێ بیخوازی، یەکی چۆنە؟

ـ ئاخری دەیبینی.

ـ کێیە؟

ـ کچی ستانیکا سافتۆ. سێربیاییە.

ستانی کۆتز، گوندێکی تازەیە، لە سەرووی چۆمی کالماتزۆیی، کە نیوەی خەڵکەکەی سێربیایین. کە ئەو گوندەیان دروست کرد، کۆمەڵێك سێربیایی لەو بەری دانووبەوە بار و بنەیان پێچایەوە و هەستان هاتن لەوێ خستیان. ئەوانە خەڵکێکی وردیلە و ئەسمەرن و قەت نەیانتوانیوە واز لە جلوبەرگەکەی خۆیان بێنن. لە پێشدا یەك وشەی رۆمانی چییە نەیاندەزانی، بەڵام ئێستا وا قسە دەکەن، بێت و جلوبەرگەکەیان دیار نەبێ، مەحاڵە لەگەڵ رۆمانیاییەکی رەسەن لێکیان بکەیەوە. بەو حاڵەشەوە کە پێکەوە هەر بە زمانە زگماکەکەی خۆیان قسە دەکەن.

ماوەیەکی زۆریشی پێ چووبوو، باو نەبوو لەگەڵ بێگانان زەماوەند بکەن. دواتر وردە وردە کچەکانیان مێردیان بە رۆمانیاییەکان کرد.کوڕانی رۆمانیایی زۆربەیان چاویان لە دووی کچە سێربیاییەکانە.

ـ چەندی زەوی و زار هەیە؟

ـ من چووزانم؟ لەسەر ئێوەیە لێی بکۆڵنەوە.

ـ ئەی جوانە؟

ـ من بە دڵمە.

ئیۆنی برام کوڕێکی کەڵەگەتە. جەستەی نەرموشلە وەك مار. رەقەڵەیە و چاوی رەش و قووڵن. سمێڵێکی باریکی هەیە کە حەز دەکا بای بدا.

ئێمە منداڵەکانیش دوو قڕانییەکەمان دەکەوێ. خۆشحاڵ دەبین، بەڵام زۆریش نا. هەر هیچ نەبێ، زگێکی دیکە لە سفرە بەتاڵەکەمان زیاد دەبێ.

ـ جا کاکە ئیۆن و براژنم لە کوێ دەنوون؟

ـ باوکم ئەوە چارەسەر دەکا:

ـ تیغەیەك بە نێوەڕاستی ڕاڕەوەکەدا دەکێشین، دەبێتە ژوورێك... باشە. یانی حەزت لێیە ئەو کچە بێنی؟

ـ کچی ستانیا سافتۆ.

ـ پیاوێکی باشە، دەیناسم. کۆشێك منداڵی هەیە و لەم دنیایەدا قرچۆکی وا کەمە.

ریتزاش دەیەوێ شتێکی لێ روون بێتەوە:

ـ دەی کاکە، نەتگوت، ئەو سێربیە ئازیزە ناوی چییە.

ـ ناوی ئۆلنکایە. بەڵام لێرە بانگی دەکەین لینا. منیش هەر پێی دەڵێم لینا.

کەس کێشەی لەگەڵ زەماوەندەکەی ئیۆنی برام نییە. کەسیش ناڕازی نییە لەوەی بووکەخاتوون ببینین.

باوکم و دایکم رێك دەکەون. لە راستیدا خۆ لە ژیانی منداڵەکانیان هەڵناقوتێنن.

ـ کەی بەتەمای بیهێنی؟

ـ سبەی شەو.

ـ دەی باشە. بەڵام ئێمە ناتوانین شایی و هەڵپەڕکێیەکی تێر و تەسەلەت بۆ بکەین.

ـ منیش هەر دەمەوێ ژن بێنم. هەر ئەوەندە و تەواو. شایی و هەڵپەڕکێ هەمیشە هەیە.

بە رۆژ هەوا گەرمە. بەفر تواوەتەوە. ئەو لافاوانەی زەوی بۆی قووت ناچن، تووڕە و کەفچڕێن بە چۆمەکەدا کەوتوونە رێ. دەشتەکە هەڵمی لێ هەڵدەستێ. هەر ئەمڕۆ و سبەینێیە گژ و گیا چەکەرە بکا. قاتی و قڕی گەیوەتە چڵەپۆپە. عەمبار بەتاڵن. پەیداکردنی پارووە نانێك موعجیزەیە. پەیداکردنی لەتێك ماماڵیگاش هەروەتر. بەو حاڵەشەوە لە هەر جێیەك بێ، ربەیەك ئارد بۆ ئەو رۆژەی کاکم ژنەکەی دێنێتە ماڵێ، واتە سبەینێ، پەیدا دەکەین.

لە نیوەڕۆوە دایکم قۆڵ هەڵدەماڵێ و چەند مریشك دەگرێ و دەیانداتە دەست ئیۆن سەریان ببڕێ و ئینجا چاکیان دەکا و لە مەنجەڵەکەیان دەخا.

چڵوچێوەکان لە تەندوورەکەوە بڵێسەیان لێ هەڵدەستێ. هەویر لە تەشتەکەدا خەریکە هەڵدێ.

بۆن و بەرامەی نانی گەرم و گۆشتی مریشك ماڵەکەی داگرتووە.

هەتاو هەڵبزرکاوە. شەوی شەممەیە.

کچان سەر و سیمایان لەبەر دەرگاوە دەردەکەوێ. هەندێکیان دێنە حەوشە. دوور دیارە ئاڤێندرێئا قەرەنەیەکەی لە بن باخەڵێدایە و یەکەم کەسە، ئەگەرچی هێشتا دەستی پێ نەکردووە.

ئیۆنی برام لە دەرگای باخەکەوە کە بەلای ئاسنەڕێدا دەکرێتەوە، دێتە ژوورێ. دەستی ژنەکەی دەگرێ و لە خۆشیان گوێز بە کلك دەشکێنێ*.

ریتزای خوشکم و باوکم و هەموومان لێیان کۆ دەبینەوە.

ـ بەخێر بێن، بەخێر بێن.

دایکم لەبەردەرگاوە چاوەڕێیانە. بڵێی و نەڵێی نێوچاوانی تێك ناوە. ئەو کچەی ئیۆنی برام دەستی گرتووە و دەیهێنێ، یەکی وردیلە و خەپەیە. دەڵێی بەرمیلە. تەنیا چاوی جوان و گەش و بزۆزن، وەك چاوی جوانووەکی سرك. ئەوەی نایزانێ، شەرمە. رێك چاو لە چاوی ئێمە دەبڕێ و دەتریقێتەوە. پێکەنینەکەی تۆزێك گێلانەیە. ددانە وردەکانی دەڵێی ددانی پشیلەن. وەك شیر سپین.

وەك رۆژ عەیانە، کە دایکم کچەی بە دڵ نییە، بەو حاڵەشەوە تۆقەی لەگەڵ دەکا و دەڵێ:

ـ سڵاو کچی باش. وەرە ژوورێ.

بووکە بەقسەی دەکا.

* لە موکریان دەڵێن: بە تڕ گۆزەڵە دەشکێنێ.

ئاڤێندرێئا لە حەوشە فوو بە قەرەنەیەکەیدا دەکا و هۆڕا دەست پێ دەکا. خۆ جاری جاران بوایە، برادەرەکانی کاکم بە تاپڕەکانیان دەیانکردە تەق و تۆق. ئێستا ئەو کارە قەدەغەیە. گوندییە بە پارێزەکان، بەر لەوەی ئەڵمانییەکان بگەنە ئاوایی، دەمانچە و تاپڕەکانیان لە بن گڵ ناوە.

*

*

*

لەو بەری ئاسنەڕێیەکە، ئەسپەکان کە سینگمان بۆ داکوتاون و بەستوومانننەوە، لمبۆزیان لە نێو کا و کلۆشەکەی ئەوێ دەگێڕن و بە دووی ڕەگی گیایەکدا دەگەڕێن. باوکم دەچێ جێیەکەیان دەگۆڕێ. تەورەکەش لەگەڵ خۆی دەبا بۆ ئەوەی سینگەکانی پێ داکوتێ. سەگەکانیش وەدووی دەکەون...

ئێمە دوو سەگمان هەیە: یەکی سپی و یەکی ڕەش، کە خاڵی قاوەیی بە پشتییەوەیە. ئەو سەگانە، لەو دەمەوە کە ئیۆنی برام پێی هەڵگرتووە، لە ماڵی ئێمەن. زستانان ئەودەمەی هێشتا بەفر نەرمە، دەیانبەینە راوە کەروێشك. جاری وایە بەخت و شانسی خۆمان بە دوو سێ کەروێشکەوە دێینەوە ماڵێ و جاری واشە دەست لە گونان درێژتر دەگەڕێینەوە.

پاییزان، کەروێشك لە پڕێك لە بن دەوەن و دڕك و قانگەڵاشك کە لە ڕەنگی خۆین، دەردەپەڕن و وەك فیشەك بۆی دەردەچن. سەگەل سەریان لەدوو دەنێن، دەیگەنێ، لێی دەدەن و پشتەملی دەگرن و دەیهێننەوە. ئێمەش کە بە ئەسپ وەدوویان کەوتووین، دەگەینێ و، خۆ فرێ دەدەین

و کەروێشکە برینداره‌کەیان لێ دەستێنین و لە توورەکەی راوەکەی دەخەین و دیسان بە شوێن سەیەکاندا کە لە خۆشیی دەستکەوتەکەیان شاگەشکە بوون، خۆ دەخەینەوە سەر خوانی زین.

راوی کەروێشك بەتایبەتی زستانان کە بەفرێکی قورس دەکەوێ، زۆر زۆر خۆشە.

ئاسمان ئەوەندە سامالە، هەر دەڵێی پیرۆزەی شینە. تاو هەڵاتووە کەچی سەرماکەی وەك شیر دەبڕێ. کەروێشك خۆیان دەخەنە درز و قەڵشتانەوە. ئەگەر قورس و قەڵەو بن، قاچیان لە بەفرە نەرمەکە دەچەقێ و ناتوانن باش را بکەن و بنیادەم زۆر بە ئاسانی دەتوانێ بیانگرێ. لە چلەی زستانێدا لە ناکاو هەوا گەرم دەبێ. لووساوك ئاو هەڵدەدێرن. بەرەبەری بەیانی بارانێکی بە خوڕەم دەبارێ و دوایی بایەکی سارد هەڵدەکا. کزەبایەکە، دەشت و رێگا بە جەڵغەی سەهۆڵ دادەپۆشێ. سواری ئەسپەکان دەبین و بە دوای سەگ و تاژیدا لە گوندەکە وەدەر دەکەوین. ئەوەندەی پێمان دەکرێ لە گوند دوور دەکەوینەوە.. ئەوەندە دەڕۆین، تا چێرگەکان دەردەکەون. چێرگەکان چونکە قەڵەو و قورسن و لەسەرمان باڵیان سڕ بووە، ناتوانن بفڕن. ناچارن چەندی دەتوانن بفڕن. بەڵام سەگەل دەیانگەنێ و دەیانگرن. هەر کەس چێرگێك بگرێ، دەتوانێ سێ رۆژی رەبەق بیکاتە جێژن.

چێرگ باڵندەیەکی دەگمەنە و لەویش دەگمەنتر گورگە. چونکە گورگ ئیتر نە شوێنێکیان هەیە خۆی لێ حەشار بدەن و نە پەناگەیەك بێچووەکانیانی تێدا بەخێو بکەن. ئاخر دارستانە چڕەکانی جاران چیی وایان لێ نەماوەتەوە. هەموویان بڕیون و دایاندەچێنن. لەو هەمووە دارستانە تەنیا پەڵەیەکی بچووك لە ئادانکاتا ماوە و، دڕووەڵانێکیش لە دەم ئۆڵت. ئیتر هەڵۆکانیش دیار نین. باز و شمقاڕیش نابینی. تەنیا لە نشێوە زۆر لێژەکانی بانێئاسا، ئەو

شوێنەی سێ کانیی لێیە وەك چاوی قرژاڵن، چەند ڕێوییەك ماون. جاری وایە شەوانە کە سەگ ناتوانن بۆنیان بکەن، خۆیان بە کولانکەی مریشکاندا دەکەن و تەواو تالآنی دەکەن.

جارێکیان ئیۆنی برام و ئاڤێندرێئا لە سەر هەڵدێرێك توانییان یەکێك لەو ڕێوییانە بگرن:

بارگینەکانمان بردبووە لەوەڕ. تەنگی ئێوارە چووین ئاویان بدەین. لێژاییەکەی خوار کانییەکە کۆمەڵێك کون و کاژێری لێیە. لە پڕێکدا دیتمان ئەوە ڕێوییەك کلکە سوورە ئەستوورەکەی وەك ئاگر بریسکەی دێ و خۆی خزاندە نێو گژ و گیاکانەوە و خۆی بە کونێکدا کرد.

ئاڤێندرێئا پێی گوتین: کوڕینە، ئێوە هەر لێرە ئاگاتان لێی بێ لە کونەکە دەرنەپەڕێ، من بە غاردان دەچمەوە و دێمەوە.

خۆی خستە سەر ئەسپەکە و چوو و بە لوێچێ بیبەری سوورەوە هاتەوە. یەکی باوەشێك پووشکە و دارمان کۆ کردەوە و لەبەر کونەکە کردمانەوە و بیبەرەکەمان پێوە کرد و قانگمان دا. دووکەڵە تاڵ و خنکێنەرەکە کونەکەی پڕ کرد. ڕێویی بەستەزمان ئەوەندەی پێی کرا خۆی ڕاگرت بەڵام ئیتر تاقەتی بڕا و بە قەڵەمبازان دەرپەڕییە دەرێ و ئێمەش کە دەست بە تێلا لەبەردەم کونەکەی چاوەڕێی بووین، لێمان دا و کوشتمان.

ئاڤێندرێئا کەوڵەکەی بردە بازاڕ و فرۆشتی. لەوانەیە ئێستا چەرمدروویەك بەخە و سەرقۆڵێکی سوور و جوانی لێ دروست کردبێ.

ئەو شارستانییانەی پاش هەڵاییسانی جەنگەکە و تەقاندنی چەند تۆپی پاپۆڕە جەنگییە نەمسایییەکانی گەلەکەشتیی دانووب بەسەر شاری تۆرنۆدا هاتوون پەنایان بۆ گوندەکانی ئێمە هێناوە، هەموویان پاڵتۆکانیان یەخە چەرمین. ژنەکانیان بۆ ئەوەی دەستیان نەچێ،

دەستەوانەی چەرمە رێوییان لە دەست دایە. رێك هێندەی ئەو دەستەوانە و یەخە چەرمییانە رێوی راو کراون، کەوابوو ئیتر سەیر نییە وا رێوی کەم بووە.

شارییە راکردووەکان بە کۆڵانەکانی ئاواییدا دەخولێنەوە یان لەبەردەم بەرێوەبەرایەتیی قایمقامیدا کۆ دەبنەوە یان رۆژ تا شەوێ لە مەیخانە و قاوەخانەکەی کاك لێئانکادا قۆناغ دەخەن و خەریکی کۆنکەنن.

کرێوە دەکا. رێیەکان دەگیرێن. بۆ کردنەوەی رێیەکان، ئەو داماوانە دەبەنە بێگاری، کە تیتۆڵێك جلیان لەبەردا نییە بۆ ئەوەی سەرما نەیانبا. ئاسنەرێیەکەش کە بە شیوێکدا تێدەپەڕێ گیراوە.

شەمەندەفەرەکە لە بەفردا گیراوە. فەرمان دەدەن هەرچی گوندییە بۆ ماڵێنی رێگە بچنە بێگاری.

ـ دەی باشە، جەنابی قایمقام، ئەی بۆ نافەرمووی شارییەکان بچنە بێگاری؟

ـ جا شتی وا چۆن دەکرێ؟ شاری، شارییە. بنیادەمێکی ناسك و نازدار کە نە دەتوانێ شتێك بە شان هەڵگرێ و نە دەزانێ پێمەرە بە دەستەوە بگرێ.

ـ هەر دەزانێ بخوا و بنوێ.

وردە وردە گوندییەکان خەریکن لەو شارییە داڵدەدراوانەی لە بەیانییەوە تا شەوێ خەریکی چەنەبازین و هیچیان لەدەست نایە، وەڕەز دەبن.

ئەوان لە پێشدا بەو کەسانەیان کە گوێیان لێ دەگرتن، دەگوت، مەحاڵە ئەڵمانییەکان بتوانن وڵاتەکە داگیر بکەن. ئێستا بە پێچەوانە، دڵنیایان دەکەنەوە کە ئەمریکییەکان قەت لەم وڵاتە ناچنە دەرێ و هیچ هێز و دەسەڵاتێکیش دەرەقەتیان نایە.

ئێمە ئیتر ئێستا گوێ لە چەڵتەچەڵت و تورەهاتەکانیان ناگرین و کە قسە دەکەن وەدەزانین کەر دەترێ.

باوکە بۆردۆلێئا ئیتر تەواو پیر و کەنفت بووە. سی زاوا و نەوەی لە بەرەی جەنگن. چاوی هێشتا هەر بەحوکمن. گوێچکەشی هەر تیژن. وا دیارە ئیتر ئێستا ناتوانێ بە گۆچانیش بە رێیەدا بڕوا. ئێستاش کە چاوی بە چەند کچ و ژنێکی گەنج دەکەوێ، سوعبەتیان لەگەڵ دەکا و تەوسیان پێدا دەدا. کە لەبەردەم شارەوانی گوێی لە تورەهات و قسەی قۆڕی شاریەکان دەبێ، سەری دەئاوسێ و بەخۆی ناوەستێ و دەڵێ:

ـ هەر ئەمشەو یان سبەی شەو ئەڵمانییەکان پرێسکە و باریان کۆ دەکەنەوە. شەوانە دەبینین وەك هەمیشە لە کۆڵانەکاندا پاسەوان و قەرەوڵیان داناوە، بەڵام بەیانی کە لە خەو هەڵدەستین، سەیر دەکەین، لەوێ نەماون... ئێ، کە رۆیشتوون هەر مێشێکیشمان میوان نییە.

لە بری ئالیسترمانزۆی قایمقام ـ کە پەنای بردە مۆلداڤیا و ئاخرییەکەشی نەمانزانی بە سلامەت دەرچوو یان نا ــ قایمەقامێکی دیکە هاتووە. کابرایەکە بە ناوی متیتیزا بۆزۆئانکا. بنیادەمێکی کورتەبنەی شلەی لاق خوارە. ئەفسەری لەشکر بووە و گیراوە و زیندانیی بۆ بڕدراوەتەوە و ناردبوویانە یەکێك لە کەمپەکان. ئەڵمانییەکان کە وڵاتیان داگیر

کرد، لەوێ ئازادیان کرد. ئێستا لایەنگری ئەوانە. خەڵکی تۆرنۆیە و باوکی بازرگانی پەمۆ بووە. بە خەڵکەکە دەڵێ:

ـ ئەڵمانییەکان زۆر بەهێزن. دەیانەوێ هەموو وڵاتانی دنیا بگرن. وا باشترە پیاو لای ئەوان بگرێ و هەواداری ئەوان بێ.

باوکە بۆردۆلێئا بە پێکەنینەوە وەڵامی دەداتەوە:

ـ دۆستایەتیی ئێمە و ئەوانیش وەك هاوڕێیەتیی ئەسپ و سوارەکەیەتی. ئێمە دەبینە ئەسپەکە و ئەوانیش سوارەکەمان. ئێمە لە بنەوە و ئەوان لەسەرەوە. ئەو وەزعە جارێ هەر وا دەبێ. ئاخرییەکەی رۆژێکی خۆشفەڕی خوا، ئەسپەکە کورژنێك دەکا و دەحیلێنێ و هەڵدەستێتە سەر پاشووان و جووتەیەك لە سوارەکەی دەدا و تڕی ئاخری پێ دەکەنێ و ملی دەشکێنێ و قوونی دەدڕێنێ. ئێمە زۆرمان لەو شتانە دیتووە رۆڵە. ئەو زەمان کێ دەیتوانی لای تورکان سەر هەڵێنێ و بڵێ من پیاوم؟ بەو حاڵەشەوە مەسیحییەکان توانیان کلکیان پێ بنێنە گەلۆزیان و هەتا ئەوبەری شێوەدوورگەی بەلکان راویان بنێن.... ئەدی، پەلە مەکە با چەند رۆژێکیش ئەڵمانیەکان بە تڕ گۆزەڵە بشکێنن.

لامبێ ریگۆپۆل، مامۆستا شارستانییەکە کە پەنای هێناوەتە گوند، هەڵدەداتێ و دەڵێ:

ـ ئەوەی لە تورکان قەوما، لێرە نابێتەوە. چونکە ئەودەم رووسیا بۆ خۆی دەسەڵات و هێز بوو، بەڵام ئێستا وا نەماوە. رووس کردوویانەتە هەرا و قەیسەریان رووخاندووە و سەربازەکانیان ئیتر بەتەمای شەڕ نین. خەریکن زەوی و زاری ئاغاکان دابەش دەکەن. دەزانن؟ شۆڕشیان کردووە.

تیتزائۆئیێ هەڵدەداتێ:

ـ ئەی لەبەریان مرم. کاری باشیان کردووە. جەنگ و قورسایی نەگبەتی، چەقۆیان گەیاندبووە ئێسقانیان.

قۆڵێکی تیتزا شل و شۆڕ و بەتاڵە.

قسەکەی ئەو قایمەقام دەهری دەکا:

ئەگەر هەوای ئازادی لە کەللەی داوی، پێم بڵێ با بدەم لە تەویلەت بکەن.

ـ بەڵام بەو کارە شۆڕش و راپەڕینی رووسەکان دانامرکێ جەنابی قایمەقام.

خەڵك هەموو زانیویانەتەوە کە لە بەرەکانی مۆلداڤیا، لە عەرزە پانوبەرینەکەی رووسیا هەموو وڵات راپەڕیوە. ئاگادار بوونەتەوە کە ئیمپراتۆریان لە تەختە زێڕینەکەی هێناوەتە خوارێ، ئاگادار بوونەتەوە کە شۆڕشەکە خەریکە دەتەنێتەوە، زانیویانە کە ئاغاکان خەریکن را دەکەن، چونکە دەبینن گلۆڵەیان کەوتووەتە لێژی... خەڵك هەموو ئەو شتانەیان بیستووەتەوە و ئێستا چاویان کردووەتەوە و چاوەڕێن بە چاوی خۆیان بیبینن.

جا ئەڵمانییەکانی دەبینن کە جار بە جار پەرێشانتر و بێهێزتر دەبن. ئەو سەربازانەی دەنێردرێنە بەرەی مۆلداڤیا، یان زۆر زۆر گەنج و منداڵن، یان پیر پیر و کەنفت. سەرباز هەن زۆر زۆر منداڵتر یان زۆر پیرتر لەو سەربازانەی حەفتەی پێشوو بە ئێرەدا تێپەڕین بۆ بەرەی جەنگ نێردران.

ـ ئەڵمانییەکان وەزعیان زۆر باشە.

ـ زۆر باشە. ئەرێ بەراست ئێوە مێژووتان خوێندووەتەوە؟

*

*

*

ـ دایه...

ـ چیت لێ قەوماوە؟

ـ مانگاکە وەزعی شڕە.

ـ ئەوەتا. باوکم وا لە دەشتێ دێتەوە. کەوڵی حەیوانەکەی بە سەری دارەکەیەوە کردووە و دێتەوە.

ماوەیەکە یەکێك لە سەربازە ئەڵمانییەکان لە قایمەقامی بە ناوی فرانتز هەموو گوندەکەی لە ئەمان ناوە و زراوی بردوون. ئەویان تازە ناردووەتە ئۆمیدا. یەکی خەپەی کاڵی سمێڵ زلە. لاقی راستەی دەشەلێ. هەموو گوندەکەی چاوترسێن کردووە. بەردەوام وەك بەدمەستان بە نێو گوندەکەدا دەخولێتەوە. قوڕ بەسەر ئەو کەسەی تووشی بێ: بە قەمچی تێی بەر دەبێ و بە قەستی کوشت لێی دەدا.

تووڕەییەکی سەرشێتانەی هەیە. پێنج برا بوون و پێکەوە ناردوویاننەتە جەنگ. چواریان کوژراون. فرانتز پێنجەمیان بووە کە تەنیا قاچی بریندار بووە و نقوستانی کردووە. هیوادار بووە لێی خۆش بن و سەربازیی پێ نەکەن، بەڵام وا دیارە ئاڵمانییەکان وەزعیان لەو بوارەشەوە هەر شڕە و خەڵکیان زۆر کەمە، بۆیە ناردوویانەتە "یەکەی داگیرکەر". رق و قینەکەی بزووتووەو و وای لێ هاتووە تۆڵە لە هەموو کەس بکاتەوە. بۆ جنێو نەبێ زمانی ناگەڕێ. ئەو

خەڵکە شارستانیانەی تۆزە ئەڵمانییەك دەزانن، دەڵێن یەکپشوو جنێو بە پێشەواهیتلەر دەدا کە هەموو دنیای تووشی ئەو ئاگرە کردووە و بەگژی یەکیدا کردوون.

چما قسەی ئەو دیلماجانە جێی بەقایە؟

هەرچۆنێك بێ، باوکم چووبوو جێی ئەسپەکان بگۆڕێ کە لە نێو ئەو کا و کلۆشەی لەوبەری ئاسنەڕێیەکەوە بڵاو بووەتەوە و ئێستا ئەوە دێتەوە. ئەو تەورەی کە بۆ داکوتانی سینگی تەویلەی ئەسپەکانیش لەگەڵ خۆی بردبووی، بەدەستییەوەیە و لە پڕ تووشی فرانتز دەبێ. سەربازە شێتە لەپێشدا دەست دەکا بە نەڕاندن و بە قەمچیان وەردەگەڕێتە شان و پیلی باوکم و بەرەو بنکەکەیانی دەبا.

لەگەڵ یەکەم تەقە، سەمای هۆڕا دەوەستێ و کچ و کوڕ هەموو وەك پۆلێك پاساریی تۆقیو، بڵاو دەبنەوە.

من لە هاوەڵەکانم دادەبڕێم و بە شوێن سەربازە ئەڵمانییەکەدا دەڕۆم و لە سەر سەکۆی بنکە سەربازییەکەیانەوە رادەوستم. گوێم لە دەنگی فرانتزە کە هەروا خەریکە لە باوکم دەدا. ئەڵمانییەکە پێی وابووە باوکم ویستوویەتی بەو تەورە بیکوژێ. خۆم دەخزێنمە نێو بنکەکەیانەوە و هەوڵ دەدەم مەسەلەکە چۆنە، ئاوای بۆ ژنە قەسابەکە باس بکەم. ژنەتیوەش هەوڵ دەدا ئەڵمانییە شێتە لە کەری شەیتانێ بێنێتە خوارێ، بەڵام کابرا وا ئاگای لە خۆی بڕاوە، کە بە قسەی دیلماجەکە پتر هەڵدەچێ. بڕوا ناکا بە سەهوو چووبێ. ئامادە نییە قبووڵی بکا کە مافی ئەوەی نییە ئاوا لەکەس هەڵ بدا.

باوکم بە سەرودەموچاوی خوێناوییەوە خۆی دەگەیەنێتە ژنە وەرگێڕەکە و دەستەوداوێنی دەبێ:

ـ مادام متیزا، لە چنگی ئەو جانەوەرەم رزگار بکە، قازێکت بە دیاری دەدەمێ.

ـ دوو قاز.

ـ باشە، دوو، باشە.

ـ مادام میتزا خۆ دەخاتە نێوانیان و چەنەچەن دەکا تا ئەڵمانییەکە نەرم دەبێتەوە و ئاماژەمان پێ دەکا بڕۆین.

لە بنکەکەیان دێینە دەرێ و دەچینەوە ماڵێ. باوکم لە پێشەوە و من بە دوایدا.

ئاهەنگە خنجیلانەکەی ماڵەوەمان تێك چووە. هەر دوو سێ دراوسێیەکمان بە دەورەوە ماون.

ئیۆنی برام لە داخان چەند شووشە ئارەقی هەڵچۆڕاندووە. روومەتی سوور هەڵگەڕاون. چاوی وەك چاوی گورگیان لێ هاتووە و بە تووڕەییەوە ئەمسەروئەوسەری ژوورەکە دەکا.

ـ دەچم دەیکوژم.

ئینجا کۆڵێك جنێوی حەیابەرانە دەدا.

باوکم پێی دەڵێ: وا باشترە لەسەر خۆ بی. ئەوپەڕەکەی یەك دوانێکیشت لێ کوشتن و گرتیانی گوللەبارانیان کردی. فایدەکەی چییە؟

دەموچاوە خوێناوییەکەی دەشواتەوە و دایکم ئاردی بۆ بە برینەکانییەوە دەکا.

دراوسێکانیش رۆیشتوون. هەر خۆمان ماوینەتەوە و بەس.

براکەم و ژنەکەی لە ڕاڕەوەکە دەنوون.

ئیشەڵڵا بەختەوەر دەبن.

پەڵەکانی تاریکی بە شووشەی پەنجەرەوە دەنووسێن.

شەو تاریکە. ئەوەندە ئەستوورە، کە دەکرێ بە چەقۆ بیبڕی.

سبەی بەیانی سەرباز فرانتز دێتە حەوشەی ماڵەکەمان. سەگەل کە لەسەرمان هەڵدەلەرزن، لەسەر کایەکە گرمۆڵە بوون. ئەڵمانییەکە لێیان دەچێتە پێشێ و تفەنگەکەی دەخاتە سەرپێ و یەکی فیشەکێکیان لێ دەدا. هەمووبمان دێینە بەرهەیوان. سەگەکان هێشتا پەلەقاژەیانە. باوکم و ئیۆنی برام لە تووڕەییان دەلەرزن. خەریکن ئامبازی ئەڵمانییەکە بن. دایکم بە چاوی فرمێسکاوییەوە هێوریان دەکاتەوە.

سەرباز فرانتز تا ئێوارێ هەموو تاژییەکانی ئاوایی دەتۆپێنێ و ئەمر دەکا کەلاکەکانیان بەرینە حەوشەی قوتابخانە. ئێمەش بە درمغ رامانکێشانە ئەوێ.

بۆزۆلیکا و ئۆئانتزا، ئەو دوو دۆمەی لە گوندەکەمان دەژین، بانگ دەکا و ئەمریان پێ دەکا سەگ و تاژییەکان کەوڵ بکەن.

گاردینا ژنەکەی ئۆئانتزای ئاسنگەر رادەکاتە ماڵی قایمەقام و دەستەوداوێنی دەبێ:

ـ وەرە بیکە بۆخاتری خوا، مەهێڵە ئەو کارە بە مێردەکەم بکەن. بێنە با لاقت ماچ بکەم...

ـ من چیم لەدەست نایە، ژنی باش. فەرمانی ئەڵمانییەك، فەرمانێکی پیرۆزە.

بۆزۆلیکا و ئۆئانتزا ملیان ناوە لە راپەڕاندنی ئەرکەکەیان، واتە کەولکردنی سەگەکان. کەوڵەکانیش خوێ دەکەن و لەبەر تاو هەڵیاندەخەن بۆ ئەوەی لەسەر تەناف وشك ببنەوە.

ئینجا کەلاکی سەگەکانیش دەخەنە بن گڵ، بەڵام نەگبەتییەکە بەوەندە نابڕێتەوە، بەڵکو تازە ئەوە سەرەتای عەشقەکەیە.

ئەو ئاشەی بە ئاوی چۆمەکە دەگەڕا، دەمێك بوو ئیتر کاری نەدەکرد.

ڕۆدۆلف بۆرگێر لە قایمقامی پرسیبوو: کەس هەیە لەو ئاوایییە شارەزای سابوون دروستکردن بێ؟

قایمقامیش گوتبووی: ژنەکان هەموویان لێی دەزانن قوربان.

ئەڵمانییەکان مەنجەڵی گەورەگەورەیان لە شارەوە هێنا و ئاشەکەیان کردە کارگەی سابوون. خەڵك دەبوو سەگەکانیان بێنن و لە ئاشەکە بیانکوژن.

دوو دۆمەکەش واتە بۆزۆلیکا و ئۆئانتزا بە کەوڵکردن ڕاناگەن. بەیانی تا شەوێ سەگ کەوڵ دەکەن و پێ ڕاناگەن.

فەرمانێکی دیکە دەردەکرێ:

ـ هەر کەس سەیەکی هەیە، دەبێ بیهێنێتە ئاشەکە و خۆشی دەبێ بیتۆپێنێ و کەوڵیشی بکا.

ئێستا ئیتر بۆگەنی سەگ ئاوایییەکەی هەڵگرتووە. دەچیتە هەر جێیەك، ئەوە کەوڵی سەیان خوێ کردووە و لەبەرتاوێ هەڵیانخستووە وشك بێتەوە. ئاگری بن مەنجەڵیش کە بەزی سەگ و خۆڵەمێش و "قلیا"ی تێدا دەکوڵێ هەر ناکوژێتەوە. لە کارگەی سابوونەکە، ژن و مێرد شان بە شانی یەکتر کار دەکەن و سابوونی سەگ بۆ ئەڵمانیەکان دەکوڵێنن و تووك و لەعنەتیان بۆ دەنێرن.

ـ جا مادام وای لێ هاتووه سەگمان پێ کەولّ دەکەن و پێمان دەکەنە سابوون، ماوەیەکی دیکە ناچارمان دەکەن گۆشتی سەیان بۆ بکەینە چێشت، ئەوە یانی خەریکن ترِی ئاخری دەکەنن.

ئەڵمانییەکان سندووقی هێلکە دەنێرنەوە ولاّتەکەیان و بۆ ئەوەی هێلکەکان نەشکێن، لە نێو گەنمیان دەنێن.

ـ لەوێش دەبێ قاتی و قرِییەکی سامناك هەبێ.

ـ هەر ئەمرِۆ و سبەینێیە بیدۆرِێنن. ئەوە دەبینی، زۆر ناخایەنێ.

ـ جەنابی قایمقام جەنابیشت تەشریفت لەگەڵیان دەرِوا ؟

ـ من برِۆم؟ جا بۆ دەرِۆم؟ ئەڵمانییەکان تا هەتایە لێرە دەبن.

بەو حالّەشەوە هەرِ و گیڤی جەنابی قایمقام هەر دێ و پتر دەنیشێتەوە. لە ناخی دڵیشیدا ئەو باوەرِە لێبرِاوانەیەی بە سەرکەوتنی ئەڵمانییەکانی هەبوو، هەر دێ و لاوازتر دەبێ. هیچ نادرکێنێ بەلاّم خەڵکەکە دەزانن وەك جاری جاران بە ترِ گۆزەڵە ناشکێنێ.

بۆنی گۆشتی سەگ و گۆشتاوی سەگ، هەموو شیوەکەی کالّماتزۆیی داگرتووە.

سابوونەکان لە سندووق دەنێن و بۆ ئەڵمانیان بەرِێ دەکەنەوە. شەمەندەفەرەکانیش بۆگەنێکی ناخۆشیان لێ دێ.

ژنەکان زۆریان هەر لەبیریشیان نەماوە مێردێکیان هەیە وا لە دوورەولاّت لە جەنگە.

چەند مانگان بەسەر رەشبگیری و هەرەوەزییەکەدا تێپەرِیوە.

هەوالّێکی ئەوتۆ لە بەرەی جەنگەوە نایە. نە نامەیەك و نە پەیامێك. جاری وایە ئاگادار دەکرێینەوە کە هەردوو لایەن توند بە گژ یەکتریدا چوونەتەوە. لەو رۆژنامانەدا کە دەگەنە

قایمقامی نووسراوە، لە مۆلداڤی هەر جەنگ خەڵك ناكوژێ، بگرە گەرووەخڕەش یارمەتیدەری جەنگەكەیە.

بەخت و شانسم هەبوو من نەچوومە مۆلداڤی.

ئیلێئانا، غەریبیی مێردەكەت ناكەی؟

ـ وەیش ش ش، زۆر زۆر... بەڵام خۆڵی كوێ وەسەرخۆم بكەم؟

ـ حەز ناكەی ئەمشەو بە دزی بێمە ماڵت و پێكەوە بین؟

ـ وەرە.

وردە وردە سرتوخرت دادەكەوێ. لە پێشدا هەر باسی یەكێك لە ژنەكانە و دوایی یەكی دیكە و ئینجا یەكی دیكەش...

دادە میترای ژنی كاك میهالاكێ گاگیۆ بەردەوام خەفەتبار و خەمینە.

ـ میترا، ئەرێ ئەمشەو بێمە لات؟

ـ خوا ئاگادارە كاك سیمۆن، پێت لە حەوشەی ماڵم بنێی، سەگت تێ بەردەدەم.

من و تۆرتۆریكا بە جادەگەورەكەی ئاواییدا دێین و بە لای پەرژینی ماڵەكەیدا تێدەپەڕین. تومەز دادە میترا لە پشت چەپەرەكانەوە ئێشك دەگرێ:

ـ ئەوە بۆ كوێ داریە؟

ـ دەچینە ماڵی مانوئیۆ.

ـ كە گەڕایەوە لە دەرگا بدە جەرگەكەم.

ـ ئاخر تۆرتۆریكاشم لەگەڵە.

ـ قەیناکا، هەردووکتان وەرن.

ماڵی مانۆئیۆ رێك لەوسەری گوندن. باوکیان چووەتە جەنگ. کوڕە گەورەکەشیان. دایکەکەیان کوێرە. هەر ئەو ماوەتەوە و سێ کچەکەی. ئێمە لەگەڵ کچەکان دەیکەینە بەزمی خۆمان و تەوسیان پێ دادەدەین. بەڵام هەر ئەوەندە. هەر ئەو کوڕە هەراشانەی لە ئاوایی ماونەتەوە بەختیان هێناوێتی و بەکەیفی خۆیان ئەسپەکەیان تاو دەدەن.

لە دەرگای دادە میترا دەدەین. جارێك و دووبارەی ناکەینەوە دەرگا هەڵدەگرێ.

ـ وەرنە ژوورێ، وەرن جەرگ و دڵەکەم.

بە سوورهەڵگەڕاوی دێینەوە. شەرم لە هەموو گیانمان دەبارێ...

❊

❊

❊

ڕاڕەوەکە، بە تیغەیەکی کەرپووچ و قوڕ کراوەتە دووبەش. دیوار و دەرگاکە، دەستکردی مامە پرێدێئایە، کە بە درۆیەکانی خۆی هەموو دنیای وەزاڵە هێناوە. رۆژ تا ئێوارێ یەك قسەی راستی بە زاریدا نایە، بەڵام لە کارەکەی خۆیدا هاوتای نییە.

ژوورەکەی کاکە ئیۆن یەك دوو رۆژە ئامادە بووە. تەختی خەوەکەشی. کێشە و دڵئێشانەکانیش.

کێشەکە رێك لە شەوی جێژنی پاکەوە دەست پێ دەکا:

رانەوەستاین زەنگوڵەکان رابوونەوەی مەسیح رابگەیەنن. سەر لە ئێوارە خەوتین و ئێستا ئەوە نیوەشەوە بەخەبەر هاتووین.

چراکە دادەگیرسێنین، دەست و دەموچاومان دەشۆین و کام شرەی هەرە باشمان وەبەردەست بکەوێ، لەوانەی ناومان ناون جلوبەرگ، لەبەرمانی دەکەین. هەر کامە و چەند هێلکەیەکی رەنگکراومان هەڵگرتووە و وەك جاران دەیبەینە حەوشەی کلێسا و پاش کۆتایی رێورەسمەکە دەیانخۆین.

هەموو ئامادەین. دەست و دەموچاو شۆردراو و پاکوخاوێن لەسەر پێین کە وەرێ بکەوین.

کاکە ئیۆن و لینا وەك مار تێك ئالاون. لە دەرگای ژوورەکەیان دەدەین و بەخەبەریان دێنین.

دایکم دەڵێ: ئەی ئەوە نایەن بۆ کلێسا؟

کاکە ئیۆن بە دەنگێکی خەوالۆوە دەڵێ:

ـ نا دایە ئێمە نایەین.

ـ یانی چی؟ یانی چاوەڕوانن "پاك"تان بۆ بێنینەوە ماڵێ؟

ئیۆن سەڵتەکە بەسەر شانەوە دێتە نێو لاشیپانەی دەرگا و دەڵێ: نا دایە. زەحمەت مەکێشە. من و لینا پێویستمان بە رێورەسمی ئایینی نییە.

دایکم سەرەدەر دەرناکا. دەپرسێ: یانی چی پێویستمان بە رێورەسم نییە؟ مەبەستت چییە؟

ـ ئیتر، هەر وا.

ـ ئەوە چ ئەدا و ئەتوارێکە؟

ـ ئاخر ئێمه بووینەته "ئادون تیست"[*] .

ـ ئەوه له کەنگێوه؟

ـ زۆر له مێژه.

دایکم که زۆر بەو مەسەلەیه تێك چووه، سەری بەر دەداتەوه و بەرەو کلێسا وەڕێ دەکەوین.

باوکم کرمی سوعبەتی دەبزوێ:

ـ وا دیاره کافریشمان له ماڵەوه هەبووه و نەمانزانیوه.

هەر هێندەی سەرەدەرزییەکیش چییه بەو مەسەلەیه تێك نەچووه.

قەشه بۆلبۆك لەگەڵمان چۆن بووه، نێوانەکەی هەر وەك جارانه.

پاش ئەو هەمووه ساڵه که چاوی به بنەماڵەی ئێمه هەڵنەدەهات، جارێکیان هەر کتوپڕ هەلێکی وای رەخساند، یانی دەرفەتێکی بۆ باوکم رێك خست که دەسپێشخەری بکا و نێوانەکەمان خۆش بکاتەوه.

مەسەلەکه چوار ساڵ لەوه پێش بوو:

گیۆرکێی برام قوتابخانەی زانسته ئایینییەکانی تەواو کردبوو. بۆلبۆك و نیکۆلای دیمۆزلی پوورم کلکیان تێك ئالآند و به ئیمزای دایکم تەلەگرفێکیان بۆ گیۆرکێ نارد بەو ناوەرۆکه:

"باوکت له گیانەلآدایه. زۆر زوو بکەوه رێ."

---

[*] تاقمێکی ئایینیی مەسیحین، که له ئەمریکاوه سەری هەڵدا و چاوەڕێی هاتنی عیسایەکی دیکەن.

تەلەگرافەکە کە دەگاتە دەستی گیۆرکێ، سەعاتێك بووە ئاخرین ئیمتیحانی داوە. پارەیەك لە دۆست و برادەرانی قەرز دەکا و بلیتی شەمەندەفەری پێ دەکڕێ و وەڕێ دەکەوێ. نیوەی شەوێ بوو کە تەقەی دەرگا هەموومانی ڕاپەڕاند.

باوکم دەرگای لێ هەڵگرت. گیۆرکێ لە بری تووڕەیی باولەکەی فڕێدایە نێوەڕاستی ژوورەکە و جا وەرە زارت بکەوە و جنێوان بدە. من کە گێژ و وڕی خەوێ بووم، هەر سەیرم دەکرد: گەورە و جوان ببوو. جلوبەرگی ڕەشی یەخەسپیی قەشەیی لەبەردا بوو. کڵاوەکەی بە عەرزیدا دا و گوتی:

ـ ئەوە بۆ ئاوا گاڵتەتان بە من کرد؟

کەسمان نەماندەزانی دەڵێ چی و بۆچی تووڕەیە؟

ـ کێ گاڵتەی پێ کردووی؟

تەلەگرافەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و بۆی خوێندینەوە.

باوکم قاقایەکی کێشا:

ـ ئێمە تەلەگرافمان بۆ نەناردووی. هەر وەك دەشبینی من زەق و زیندووم و زۆریش باشم. هەر شتێك بێ، لە بن سەری نیکۆلای پوورت دایە. ئەو گاڵتە بێتامە دەبێ هەر ئەو کردبێتی. لەگەڵ قەشە بۆلبۆك. چونکە دیتم لە مەیخانەکەی تۆماس ئۆکێی پێکەوە لە گۆشەیەك دانیشتبوون و سرتوخرتیان بوو.

قەشە کچێکی عازەبی هەبوو بە ناوی دۆمیترا. دەیەویست هەرچۆنێك بێ لە ملی گیۆرکێی پەستێوێ.

براکەم وردە وردە رقەکەی نیشتەوە و لەگەڵ باوکم کەوتە تەگبیر و را:

ـ دەی باشە، هەر چۆنێك بێ من ئەوە ئێستا لێرەم. وا باشترە سبەی بچینە لای "قاژوو" و لەسەر ئەو زەماوەندە بیدوێنین.

تۆزێك پتر خۆمان پێکەوە نووساند و لەسەر تەختەکە جێی گۆرکێشمان کردەوە بخەوێ.

بەیانی کە دیتم گیۆرکێ ئەوە فلچیەیەکی بچکۆلانەی دەستك باریك و لوولەیەکی پێیە، کە شتێکی سووری لێ دێتە دەرێ و ددانی پێ دەشوا، هەر خوا دەزانێ چەندەم پێ سەیر بوو.

جلوبەرگی لەبەر کرد و ماهووت ماڵێکی لێ دان و لەگەڵ بابم وەڕێ کەوتن چوونە لای نیکۆلایی پوورم.

نیوەڕۆ هەر سێکیان لە ماڵی قەشە میوان بوون: گیۆرکێ و باوکم و پوورزام.

بەرەبەری ئێوارە بوو کە هاتنەوە ماڵێ. براکەم وا پێدەکەنی چیی نەمابوو ببوورێتەوە.

مەسەلەکەی ئاوا بۆ ئێمە گێڕاوە:

ـ کوڕە ئەو قەشەیە جانەوەرێکی گاڵتەجارە. پێشوازییەکی وا گەرموگوڕی لێ کردین، کە وەك بڵێی لە منداڵییەوە پێکەوە گەورە بووین. ژنەکەی سفرەیەکی تێر و تەسەلی بۆ رازاندبووینەوە. ئارەقێکی خەستی داینێ و خواردمانەوە. گۆشتی مریشکیش مەزەی بوو. ئەوجار شەرابیان هێنا لەگەڵ کەباب. دەی، شەراب و کەبابەکەشمان خوارد. دۆمیترا، بە دەستە ناسکۆڵەکانی کلووچەی بۆ دروست کردبووین و خۆی لە تەپڵی گوڵ دابوو و شلوێش ببوو وهەر دەهات و دەچوو. دەستەپاچە ببوو و نانخواردنیشی لەبیر چووبۆوە. منیش لە بنەوە

چاوم لێ دەکرد و وام دەنواند دڵم چووەتە سەری. کە لە خواردن بووینەوە، هەستا چووە دەرێ. یانی بە بیانووی قاوە و شیرینی. رووم لە قاژوو کرد و گوتم:

ـ دەی باوکە، یانی تۆ دەتەوێ بمکەیە زاوای خۆت؟

ـ ئەوپەڕی ئاواتی منە رۆڵەم.

ـ یانی حەز دەکەی دۆمیترا ببێتە ژنی من.

ـ ئەدی گۆرکێ گیان، چۆن حەزم لێ نییە.

ـ زۆر باشە باوکە بۆلبۆك، جگە لە دۆمیترا، چی دیکەشم دەدەیەی؟

ـ بەڵێ.. دوو "پۆگۆن" یانی هێکتارێکیشت زەوی دەدەمێ کوڕم.

ـ هەر ئەوەندە؟ جا ئەوەندە چییە باوکە؟

ـ ئەی تۆ چەندت لە خەیاڵدا بوو گیۆرکێ گیان؟

ـ زۆر زۆریش نا باوکەگیان.

ـ بڵێ بزانم.

ـ باشە، عەرزت دەکەم. لە پێشدا پازدە پۆگۆن زەویم بدەنێ...

ـ ئەی هاوار، جا سەرلەبەری زەوییەکانم لە بیست پۆگۆن پتر نییە.

ـ دەزانم باوکە دەزانم.

ـ ئەی دوای ئەوە؟

ـ گەورەیی بکە خانووەکی جوانیشمان بۆ دروست بکە. لە ئەسپ و گا و مانگاکانیش بەشمان بدەن و کەوشەنی دەسەڵاتی قەشەییشت بدە بە من.

ـ چی؟ ئەی ئەودەم خۆم چ بکەم؟

ـ خۆشت دەبیتە بەردەستی من باوکە بۆلبۆك.

ـ گیۆرکیێ گیان، ئیشەڵا سوعبەتم لەگەڵ دەکەی.

ـ نەوەڵا سوعبەتی چی؟ ئەی پێت وایە من لە بوخارێستەوە هەستاوم هەڵتەك هەڵتەك هاتوومەتەوە ئێرە گاڵتە بە تۆ بکەم؟

ـ گیۆرکیێ گیان برالە. پێت وا نییە بە رێکەوت یەك دوو پێکت زیاتر پێدا کردبیێ؟

ـ لەوانەشە. وای دانیێ زۆریشم پێدا کردبیێ، هیچ پێوەندیی نییە بەو دەستودیارییانەوە کە وەك جیازی بووك لە خەزوورمی داوا دەکەم. چونکە پێش ئەوەی بێمە ئێرە بیرم لە هەموو شتێك کردبۆوە.

قاژوو لە سەر کورسییەکە وەها خۆی بارەوبار دەکا، وەك بڵێی بە زیندوویی دەیبرژێنن.

دۆمیترا، کە لە پشت دەرگاوە گوێی هەڵخستبوو و هەموو ئەو قسانەی دەبیست، لە پڕ دایە پڕمەی گریان. لە پێشدا بەرەو حەوشەکە رای کرد و لە پشت شۆڕەبییەکانی دەوری هەسێڵەکە خۆی مات کرد، بۆ ئەوەی بتوانیێ دوور لەوان تا کوڵی دڵی دادەمرکێتەوە بگری.

ـ ئەی قاژوو خۆی چیی کرد؟

ـ رەنگی مردووی لیێ نیشت. زانیی پیێ رادەبوێرم. بەو حاڵەشەوە چەند پێکێکی دیکەشی شەراب بۆ تێکردین و هەستاین هاتینەوە.

دوای ئەوە کاکە گیۆرکیێ دەستی لە گیرفانی نا و وێنەیەکی دەرهێنا و نیشانی داین و گوتی:

ـ سەیری بکەن. ئەو کچەی دەمەویێ بیهێنم ئەوەیە. ناوی ماریۆئارایە.

ـ سەیری وێنەکەمان کرد. کچێك بوو نیگای پڕ لە سەرسووڕمان و قژە کەزیکراوە درێژەکەی هێنابووە سەر شانی.

کاکم هەر ئەو شەوە گەڕاوە بوخارێست و ئیتر چاومان پێی نەکەوتەوە. ئێستا لە گوندێکی نێو کێوپارە بووەتە قەشە.

ئیتر لەمەودوا قەشە بولبۆك دڵی هەر چاك نەبۆوە. دیارە وەك جاران بە بێزراوییەوە سەیرمان ناکا و جنێویشمان ناداتێ، بەڵام ڕێزی سەگێکیشمان بۆ دانانێ. ڕۆژانی جێژن، بۆ متفەڕك دەچێتە هەموو جێیەك، جگە لە ماڵی ئێمە.

ئێمەش ئیدی ڕاهاتووین.

❊

❊

❊

کوڕە گەورەکەی بۆلبۆك بووەتە قەشەی سێکارا. ئاخری بە زەبری بەرتیل و دەستودیاریی باوکی توانیی قوتابخانەی شەریعە تەواو بکا.

قەشە سائێلێش یەکێکە لە نەوەکانی خاڵی دایکمە. یانی لائۆرداوودسکۆ، کە چکەکەی بۆلبۆکی هێناوە. هەر ئەو دۆمیترایەی قاژوو دەیەویست لە ملی براکەمی قایم بکا.

قەشەی بانیئاسا، پیاوێکی لە تەمەن گەڕاوەیە. تا چەند ساڵ لەمەوبەر پیاوێکی باش بوو، بەڵام ئەویش وردە وردە کورتانی خوار کرد.

قەشەکانی ئەو سێ گوندە لەوپەڕی بێشەرمیدا، سواری شەپۆلی هەستی ئایینی خەڵکەکە دەبن.

بۆ لە ئاوهەڵکێشان و مارەبڕین و تەڵقینی مردوو، سەرقەڵەمانەیەکی زۆر زۆریان دیاری کردووە. پووڵەکەشیان لەپێشدا وەردەگرن و ئەگەر نەیدەی نایەن.

جووتیار ملیانی بادا و یەکیان گرت. لەگەڵ قەشەی ناحییەکە لێیان بوو بە مقۆمقۆ و چوونە لای ئۆسقۆفەکەی ناحییە کە لە شارەکەی نزیکمانەوە دەژی. چوون سکالاّیان کرد.

ئۆسقۆف بە نەرمونیانی و روویەکی گەشەوەگوێی لە سکالاّکەیان گرت و گوتی:

ـ دەی باشە بفەرموون بزانم ئێمە بلّێن قەشەکان بە چی بژین ها؟ ئەوان تۆزە مووچەیەك وەردەگرن. ئەگەر ئەو بڕە پارەیە بۆ ڕێوڕەسمە ئایینییەکان دیاری نەکەن و وەرینەگرن، خزمەتکارانی کلێسای مەسیح بە چی بژین؟ هیچ دانیشتوون و کلاّوی خۆتان کردووەتە قازی؟ خۆ ئەگەر بێن و کچ و کوڕانتان لێك مارە نەکەن و بەبێ لە ئاوهەڵکێشان گەورەیان بکەن و مردووەکانیشتان بەبێ تەڵقین بنێژن، خەرجتان پتر دەبێ.

خاوەنشکۆ ئۆسقۆف، یەکی زلەی کەتەیە، خەڵکی گوندێکی دەم دانووبە. بە گالیسکەیەك سەرانسۆیی کلێساکانی بندەستی دەکا. کە سوار دەبێ، فەنەر(سپرینگ)ـەکانی گالیسکەکە جیڕەیان دێ و دەنیشن و ئەسپە بەستەزمانەکانیش خۆ ئەگەر وردە وردەش بڕۆن، هێشتا دەسبەجێ شەلاّلی ئارەقە دەبن. خاوەنشکۆ ئۆسقۆف دەلّێی مەشکەیە.

ئیمانداران، تووڕە و ناڕازی، دەست لە گونان درێژتر گەڕانەوە.

برایانی ئیۆڤیتزیۆ هەموو پاییزان دەچنە بوخارێست بۆ کارکردن. بەهاران کە دێنەوە، توورەکەیان پڕە لە کتێب. خەڵك کۆ دەکەنەوە و لە ماڵەکانیاندا قسەیان بۆ دەکەن:

ـ ئەوەی قەشەکان لە کلێساکانیاندا لە بارەی مەسیحەوە دەیڵێن، نە راستن و نە باش. ئەو پڕوپووچانەی ئەوان، رێك پێچەوانەی دەقەکانی کتێبی پیرۆزن.

ئینجا دێن و مانای راستەقینەی ئینجیل بۆ خەڵك لێك دەدەنەوە.

لەمەودوا رۆژ رۆژ ژمارەی ئەو کەسانەی ناچنە کلێسا زۆر دەبن. ژنان کە منداڵیان دەبێ، ئیدی نایبەنە کلێسا لە ئاوی هەڵکێشن، کە زەماوەند دەکەن، هەر ناشچنە لای قەشە مارەیان بکا. کە دەکەونە گیانەڵا و تڕی ئاخری دەکەن، هەر گونیشیان پێی نابزوێ ئاخۆ قەشەیان لە ژوور سەری بێ یان نا. هەر بەوەندە رازین کە یەکێك لە برایانی ئیۆڤیتزیۆ کتێبەکە بکاتەوە و دووعاکەیان بۆ بکا.

کێچ دەکەوێتە کەوڵی قەشەکانەوە. ئایینە نوێیەکە ئەوەندە خێرا بە نێو خەڵکدا بڵاو دەبێتەوە، هەر مەپرسە. زیاتر لە نیوەی خەڵکی هەموو گوندەکان هاتوونە سەر ئەو ئایینە.

داوای یارمەتی لە پارێزگار دەکەن. ئەویش فەرمان بە ژەندرمەکان دەدا "لە دین وەرگەڕاوەکان" بگرن و بیانبەنە پارێزگا. پارێزگاری داماو لە خۆڕا بە چاوسوورکردنەوە و ترساندنی خەڵکەکە خۆی ماندوو دەکا: ژن و پیاو و منداڵ وەك چیا لەسەر ئایینە تازەکەیان سوور و پێداگرن.

چونکه لەو ڕێیەوە هیچی بۆ ناچێتە سەر، ئەمر دەکا هەمووان بخەنە ژێرزەمینەکەی پارێزگاوە و جگە لە ئاو هیچیان نەدەنێ. ئیمانداران لە تاریکیی ژێرزەمینەکەدا یەکپشوو خەریکی چڕینی سروودە ئایینیەکانیانن.

خەڵکی شار هەموو دێنە بەردەم پارێزگا و کۆ دەبنەوە و گوێ لەو سروودانە رادەگرن. رێك وەك بازاڕی مەکارە.

پارێزگار لە ناچارییان فەرمان دەدا، شەوێ هەموویان لە ژێر چاودێریدا بەرنە بەندیخانە.

دوای چەند رۆژان، هەموو بەندییەکان ـــ لە مریشکدزەوە تا چەتە و رێگر ـــ دەنگیان دەخەنە پاڵ دەنگی ئادۆن تیستەکان و لەگەڵ ئەوان مل دەنێن لە گوتنەوەی سروودەکان، کە سنووری دیوارەکان دەبڕێ و لە هەموو شارەکەدا دەبیسرێ. تەنانەت ئۆئیکای بەرپرسی بەندیخانەکەش هاودەنگیان دەبێ.

ئیتر پارێزگار ئیماندارانی دایە دەست فەرماندەی جەندرمان و گوتی: بەیانی و نیوەڕۆ و شەوێ تێیانهەڵدەن و جەڕەبابەیان بدەن. هەر هیچی لێ شین نەبۆوە. تەنانەت یەك کەسیشیان ئامادە نەبوو لە دینە تازەکەی وەرگەڕێ و بچێتەوە سەر دینەکەی جارانی. کە زانییان باشاریان ناکەن، ناچار بەریان دان. بە جلوبەرگی شڕ و دڕاو و نیوەگیانەوە، برسی و شەکەت.

کەس لە چاوسوورکردنەوەی پارێزگار نەترسا و ئادۆن تیستەکان رۆژ بەڕۆژ خەریکن زیاتر دەبن.

باشە دەڵێن چی؟ چییان دەوێ؟

هیچ. هیچیان ناوێ. ئەوان باوەڕیان وایە زەوی و ئەستێرەکان و مانگ خوا دروستی کردوون. باوەڕیان وایە بنیادەم دەبێ لەسەر ئەم گۆی زەوییە شەریف و کردەباش بێ و باوەڕیان وایە بنیادەم لە پێناو مسۆگەرکردنی بەهەشتەکەی ئەو دنیا هیچ پێویست نییە باج و پیتاك بداتە قەشەکان و دار و دیواری کلێساکان پڕ بکا لە پەردەی نەقاشیکراوی پیر و پیاوچاك و فریشتە قوونڕووتەکان.

براژنم زۆر پێش ئەوەی ببێتە بووك، لە ناخی دڵیدا حەزی لێ بوو ببێتە ئادۆن تیست. کە گوێزرایەوە، بەتاقی تەنێ و بەبێ ئەوەی براکەم ئاگادار بێ چووە سائێلێ و بوو بە ئادۆن تیست و هاتەوە و چووە کڵێشەی ئیۆنی مێردیەوە.

ئیۆنیش کە وەك کەرێ لە قوڕ چەقیو چاوەڕێکی چۆشێك بوو.

هەردووکیان شتەکەیان لە نێوان خۆیاندا شاردەوە تا ئەوەی شەوی جێژنی پاك هات و ئیتر ناچار بوون ئاشکرای بکەن.

دایکم باوکی خۆی بیر دێتەوە، بە ردێنە زەردە درێژەکەی و کتێبە زل و ئەستوورەکانییەوە کە شەوانە لە بەر تیشکی مۆمەکە دەیخوێنێتەوە. باوەڕێکی ئەوتۆی بە قەشەکان نییە. هەمیشە لە ئێمەی منداڵەکان دەخوڕێ، کە هەرگیز درۆ نەکەین و قەت دزی نەکەین و نابێ بە تووتووش توخنی ئەو شتانە بکەوین کە هیی خۆمان نین. باوەڕی وایە خوا لە هەموو جێیەکە، لە نێو مانگ و نێو خۆر و تەنانەت لەو هەوایەشدا کە ئێمە هەڵیدەمژین. ئەگەر دەچتە کلێسا، هەر خووی پێوە گرتووە، خوویەك کە خزیوەتە ناخی دڵییەوە: دەی باشە، وەختێك

باوك و باپیره و دایك و داپیره‌كانمان كاری وایان ده‌كرد، دیاره كارێكی باشه... به‌ڵام سه‌ره‌ڕای ئه‌وانه‌ش زۆری پێ ناخۆشه براكه‌م ئایینه‌كه‌ی خۆی گۆڕیوه.

*

*

*

كلێسا وه‌ك پووره‌ی هه‌نگ وزه‌ی دێ. مۆم له چلچراكاندا داگیرساون، فرمێسكه ئاگرینه‌كانیان به‌سه‌رماندا ده‌تكێ و له نێو قژ و ملیوانی كراسه‌كانماندا سارد ده‌بنه‌وه. له‌و سه‌ره‌وه، له ده‌م میحرابه‌كه‌وه، ئاگردانه‌كان بخووریان تێدا ده‌سووتێ. دووكه‌ڵێكی خه‌ستی لێ هه‌ڵده‌ستێ به‌ڵام بۆنه‌كه‌ی خۆشه. به‌رامه‌ی بخووره‌كه، ئه‌و بۆگه‌نه ده‌ڕه‌وێنێته‌وه، كه له جه‌سته‌ی به‌سه‌ریه‌كدا ته‌پیوی خه‌ڵكه‌كه‌وه هه‌ڵده‌ستێ.

هێشتا نوێژ ته‌واو نه‌بووه.

شینگێڕه‌كان خه‌ریكن له هه‌یوانه‌كه نانی متفه‌ڕك له نێو سه‌تڵه گه‌وره پڕ له شه‌رابه‌كان ده‌گوشن. خه‌ریكن "فه‌تیر"ه‌كه ئاماده ده‌كه‌ن.

دوعا گه‌وره‌كه‌ی په‌سڵان ده‌ڵێینه‌وه. قه‌شه له ده‌رگاكه‌ی نێوه‌ڕاستی هه‌یوانه‌كه‌وه دێته ده‌رێ و ده‌ڵێ:

ـ مه‌سیح دیسان زیندوو بۆوه.

ئه‌وانه‌ی لێره خزیونه‌ته نێو كلێساوه، یه‌كده‌نگ وه‌ڵام ده‌ده‌نه‌وه:

ـ راسته. مه‌سیح دیسان هاتووه‌ته‌وه نێو دنیای زیندووه‌كان.

هیچ ئاگام لە قوونی خۆم نییە. نە دەزانم کێیە پێ لە لاقم دەنێ و نە دەشزانم پێم لەسەر قاچی کێ داناوە.

دابەشکردنی "فەتیر"ەکە دەستی پێ کردووە: شینگێڕ لە دەم میحرابەکەوە راوەستاوە و سەتڵی تێکوشینی نان و شەرابەکەی کە ئەسکوێیەکی تێخستووە، لەسەر میحرابەکە داناوە. بۆ ئەوەی بگەیە میحرابەکە، دەبێ بە بەردەم قەشەدا تێپەڕی تا ڕۆنت لە نێوچاوانی هەڵسوێ و دەستی بێنێ ماچی بکەی و ئینجا بچی بۆ لای سەتڵەکە. کە گەیشتێ ئەوێ، ئەسکوێیەکە هەڵدەگری و لە سەتڵەکەی رۆ دەکەی و فەتیرەکەی پێ دەردێنێ و لە زارتی دەخەی و قووتی دەدەی.

کە لەو شتانە بوویەوە، جا بۆت هەیە ئەو هێلکەیەی لە ماڵەوە هێناوتە، لە گیرفانتی دەربێنی و پاکی بکەی و بیخۆی و جا بڕۆی دڵت خۆش بێ کە بەڵێ ڕێوڕەسمی پاکت جێبەجێ کردووە.

قاژووی سەگباب چەند مێزێکی لەمسەر تا ئەوسەری کلێساکەوە ریز کردووە و کردوونی بە لەمپەر. یانی مێزەکانی وا ریز کردووە، کە کۆڵانێکی تەسکی دروست کردووە و خەڵك ناچارن بەوێدا بچنە لای میحرابەکە و بە بەردەمی خۆیدا رەت بن.

قەشە کە دەفتەرێکی لەبەردەم کراوەتەوە، ڕێیەکە دەگرێ. گەورەی خێزان دەگاتێ و دەست لە گیرفانی دەنێ و "لیێئۆ"یەك دەردێنێ و دەیداتە شینگێڕەکە. شینگێڕ ناوی لە دەفتەرەکەدا دەنووسێ. ئینجا قەشە رۆنی لە نێوچاوانی هەڵدەسوێ و ڕێی دەدا بچێ ئەسکوێ لە سەتڵەکە هەڵدا و خێزانەکەشی یەك بەدوای یەکدا بێن و پێیان ببڕدرێ.

فەتیرەکەت کە خوارد، بە دەرگاکەی پشتەوەدا دەچیتە حەوشەکە، بۆ ئەوەی ئەگەر حەزت لێ نەبوو لەوێ لەگەڵ ئاشنا و رۆشنا بکەیتە قسەوباسان، ئەوە ملی رێ دەگری و دەچیەوە ماڵێ نانی شەوت بخۆی.

ئانیشك و کەشکەژنۆی لێ دەخەینە کار و هەوڵ دەدەین بە زەبری نقورچك و نووکە شەق رێیەك بکەینەوە و خۆمان بگەیەنینە قەشە.

رایپچیۆی کوڕی پاڤل ئیلیۆتزا لە پێشمانەوەیە. دوو سێ حەفتەیەکە ژنی هێناوە.

پاڤڵ یەك لیێو دەردێنێ و بۆ شینگێڕەکەی رادەدێرێ و لە تەڵەی قەشە دەرباز دەبێ و دەچێتە لای میحرابەکە. ژنەکەشی بەدوویدا. بەڵام کوڕەکەی کە دەیەوێ تێپەڕێ، قەشە بەرۆکی دەگرێ:

ـ لیێو.

ـ ئێستا باوکم دای.

ـ تۆش دەبێ بیدەی. ئاخر بە ناخێری گیانت تۆش بوویەتە خاوەن خێزان.

ـ هێشتا زەماوەندەکەم نەکردووە باوکە. ئیشەڵا بۆ ساڵێکی دی.

ـ تا نەیدەی ناهێڵم دەست وەفەتیرەکە بکەوێ.

ـ باوکە، جا خۆ ئێستا یەك شاییشم پێ نییە، جارێکی دیکە دەتدەمێ.

ـ بەڵێ، بەڵێ، زۆرم لەو قەول و بەڵێنانەی سەر خەرمانێ بیستووە. ئێوە هەموو شڵتاخچی و درۆزنن. چاکتان دەناسم. ئەگەر هەر ئێستا لە قوڕگتی دەرنەهێنم، تا ساڵێکی دی ئەودەمانە

بەلای کلێسادا نایەوە... تا ساڵێکی دیکەش خوا دەزانێ کێ دەمرێ و کێ دەژی. کێ چووزانێ کە سێوێك هەڵدەدەی، تا دەگاتەوە عەرزی چەند جار چەرخ و خول دەخوا.

ـ وەڵاهی سەیرە، ئەرێ ئەوە تێناگەی باوکە؟ دەڵێم ئێستا هیچ هیچم پێ نییە.

ـ بە جار و جەهەننەم پێت نییە. یەکێکی پارەی پێ نەبێ، فەتیری پێ نابڕێ.

گەنجە کڵاوەکەی پاش و پێش دەکا و ئیدی نازانێ چ بکا. لەبەر چاوی هەموو خەڵکی ئاوایی ئابڕوو و حەیای برد.

ئەوانی دواوە دەیکەنە هەرا:

ـ باوکە زوو بە، باوکە تۆزێك خێرا. ئەوە ڕۆژ بۆوە و ئێمە هەر لێرەین. لێی گەڕێ با بڕوا دوایی پارەت بۆ دێنێ ئیدی.

باوکم دەهری بووە. خوا دەزانێ قەشە ئاوای لە من کردبایە، ئەو ردێنە درێژەیم دەگرت و بە نێو کلێسادا دەمگێڕا و پێم دەگوت فەتیر چۆنە.

خەڵك کە قەشە ئاوا دەبینن، غیرەتیان وەبەر دێ و پتر دەنگ هەڵدێنن:

ـ لێی گەڕێ با بڕوا باوکە.

قەشە دەهری دەبێ:

ـ چی؟ ئەوە واتان لێ هاتووە بەسەر مندا دەشیرێنن؟ زۆر باشە، مادام وایە منیش نە ڕۆنتان تێ هەڵدەسووم و نە ڕێوڕەسمەکەش جێبەجێ دەکەم.

روو لە شینگێڕەکەی دەکا:

ـ لازار، بچۆ فەتیرەکەش هەڵگرە و دەرگاش داخە. تا بە هەمووان پارەی ئەوە نەدەن، ڕێوڕەسمەکە رادەگرم.

ئیتر خەڵك ئیمانیان نامێنێ. هەر جنێو و قسەی ساردوسووکە لە نێوان قەشە و خەڵکەکەدا وەك شەمشەمەکوێرە دێ و دەچێ. قاژوو(قەشە) وەك سۆنە وایە و تەڕ نابێ. تەنگەی ناوەتە بەر باریکە رێیەکە و ناهێڵێ کەس لە میحرابەکە بچێتە پێش. دەستی هەڵدێنێ، دەستێکی بە چاخچەوە و یەکیانی بە گوڵاوپژێنەکەوە و هەرا دەکا:

ـ بێت و بێدەنگ نەبن تووك و نفرینتان لێ دەکەم. تووکتان لێ دەکەم. پەنا بە خوا لە شەڕ و خراپەی هەرچیوپەرچی و لات و لووتان.

خەڵکەکە بە زویرییەوە بێدەنگ دەبن. هەناوێك دەکشێنەوە. دەست لە گیرفانیان دەگێڕن. کڵاوێك بە نێو خەڵکەکەدا دەگێڕن و بیست شایی لە نێو خەڵکەکە بۆ کوڕە تازە زاواکەی پاڤڵ کۆ دەکەنەوە. ئەوەی لە کڵاوەکەدایە لە بەردەم شینگێڕ هەڵیدەڕێژن. قاژوو رێیەکە دەکاتەوە و دەست دەکا بە چەورکردنی خەڵکەکە بە رۆنی متفەڕك. ئێمەش چەور دەکرێین و فەتیر دەخۆین. باوکم هێشتا نەیناوەتە زارییەوە، تف دەکاتەوە و بە قاژوو دەڵێ:

ـ قەشە بۆلبۆك، من بمشرم ئیتر پێ نانێمەوە ئەم کلێسایە.

قاژوو جواب ناداتەوە. زۆر بەپەلەیە تا زووە کۆی بکاتەوە و بیبڕێنێتەوە.

زەنگەکە هەر وا دەزرینگێتەوە و رابوونەوەی عیسا رادەگەیەنێ.

کازیوەی بەیانی هەموومان لە ماڵەوەین و نوستووین.

لەمەودوا هەر قسەی تاڵ و ناخۆش و تەوس و توانجە ئێمە بە ئیۆنی برام و ئەویش بە ئێمەی دەڵێتەوە. وای لێ هاتووە هیچ کاری تێ ناکا. ترووسکەیەکی تازە لە چاوەکانییەوە دێ. پێشتر لەم دنیایەدا بڕوای بە هیچ نەبوو، ئێستا ئیمان و باوەڕەکەی جێی سەرسڕمانە.

لە قوتابخانە سەرەڕای ئەو هەمووە تێهەڵدانەی لە دەستی مامۆستا و باوکم خواردی، دیسانیش فێری خوێندن و نووسین هەر نەبوو. بە هەزار زەحمەت بەو دواییانە توانیبووی یەك دوو پیتی ئەلفوبێ فێر بێ. ئێستا چەند سەعاتان لەسەر یەك دادەنیشێ و کتێبێك لێك دەکاتەوە و لەسەر رانی دایدەنێ و بە حینجەکردنی وشە و تەنانەت رستە درێژ و قورسەکان هەوڵ دەدا هەرچۆنێك بێ کتێبەکە بخوێنێتەوە و رۆژ بە رۆژیش باشتری دەخوێنێتەوە.

تەختەیەکی بۆخۆی کڕیوە و تەباشیر و ئیسفنجێك، خەریکە خۆی فێرە نووسین دەکا. بۆ ئەوەی ژنەکەشی فێرە خوێندنەوە و نووسین بکا، خەریکە پشتی خۆی دەشکێنێ.

ئەو کۆڵنەدانەی، بووەتە مایەی سەرسووڕمانی دایکم، بەڵام ئۆقرەی لە دڵیدا نییە. ئەو ژنە چەندە داماوە. وەك دوو کافر لە براکەم و براژنم دەڕوانێ. وەك دوو بتپەرست.

ئەوان ئیدی لەگەڵ ئێمە نایەنە سەر سفرەیەك. ئیتر لە دەفر و ئامانی ئێمەدا نان ناخۆن و خواردنی خۆیان لە دەفری خۆیاندا لێ دەنێن. تەنانەت بۆ ئاوەکەشیان گۆزەیەکی دیکەیان کڕیوە.

دایکم ئیدی قسەیان لەگەڵ ناکا. وای لێ دێ ئاخری رۆژێك بە ئیۆن دەڵێ:

ـ ئیدی حەز ناکەم چاوم بە چاوت بکەوێ. تەنانەت بشمرم حەز ناکەم بێیەوە سەر مەیتەکەم.

باوکم دیسان وەبن قەرزان دەکەوێتەوە و لەسەر ئەو بستە زەوییەی باپیرەم لە ئەستانی کۆتز وەك میرات بۆ دایکمی بەجێ هێشتووە، خانووەك بۆ دایکم دروست دەکا. هێشتا دایاننەپۆشیوە، کە ئیۆن و ژنەکەی دەچنە نێو خانوویەکی تازەوە، کە هێشتا نە دەرگای تێخراوە و نە پەنجەرەش.

ئەوان کە رۆیشتن، باوکم و دایکم ماوەیەکی زۆر بخوور دەسووتێنن و ئاوی متفەرِك بە دار و دیواری ماڵەوەدا دەکەن.

ـ دایکە، ئەرێ ئەوە بۆ وا لە پڕ دڵت لە کاکم سارد بۆوە؟

ـ ئیمانی فەوتاوە. لەبەر ئەوە. مەسیح لە روخسارێك بەولاوە نییەتی. ئیۆنی پێی وایە مەسیح چەند روخساری هەیە. رێك وەکوو کافران. ئەو کفر و ئیلحادەی باسی دەکەن ئەوەیە.

❊

❊

❊

من رۆژ بە رۆژ پتر لێم روون دەبێتەوە ئیتر لە سەر ئەم سفرەیە جێم نابێتەوە.

جا هەر واشە. لەو رۆژەوە کە شەل بوومە، وەك کەسێکی بێ کەلك سەیرم دەکەن. گاسن و جەنجەڕم پێ هەڵناسوورِێ. کە بۆخۆم بوومە پیاوێك، ئینجا بۆوەی دەبم پشتم پێ ببەستن، بکرێ حیسابم لەسەر بکەن. لەوانەیە، بەڵێ، بەلاّم دیسانیش وەك یەکێکی ساغ و تۆکمە نا.

بۆ کارکردن چووبوومە شار. بەو سێ چوار فلسەوە لە شارەوە هاتوومەوە. جلوبەرگ و پێڵاوم بۆ زستانێم کڕیوە. خۆم ئامادە کردبوو بڕۆمەوە شار و بچمە دواناوەندی بۆ خوێندن، جەنگ

هەڵگیرسا و هەموو ریسەکەی لێ کردمەوە خوری. قوتابخانە هەر نەکرانەوە. یانی هیچ قوتابخانەیەك نەکرایەوە. لە هیچ کوێ. خۆ دەبوو ئاخری ئەو پارەیەش بێنمە دەرێ و بیدەمە باوکم.

ئێستا دیسان بوومەتەوە ئەو کەسەی لە هیچ کوێ شاییەکی دراو نییە. مفت دەخۆم و دەخولێمەوە. دیارە نە باوکم وەڕووم دەدا و نە دایکیشم، بەڵام ئاگایان زۆر لە خوشك و براکانمە و ئاگام لێیە بە خێسەوە سەیرم دەکەن.

کە دێمە سەر سفرەکە، هەر دەڵێی هەمووان پارووەکانم دەبژێرن. وردە وردە خەریکم خۆم بە غەریبە دەزانم.

لە خۆم دەپرسم: دەی باشە بچمە کوێ؟

## ١٨

ژیان بەردەوامە

❊

❊

❊

کە لە گوندەکەمانەوە بەرەو دانوب داگەڕێین، یەکەم گوندی سەر ڕێگەمان کارلۆمانە، دوایی پۆتینێیۆل و پاش ئەویش سێکارا و پاش سێکاراش دراچێئا.

چەند ساڵ پێش، جارێکیان لەگەڵ باوکم چوومەتە دراچێئا. ملکی بنەماڵەی گینێسکۆیە. لەوانەیە بتوانم لەوێ بۆخۆم لە نووسینگەی ملکەکاندا کارێك بدۆزمەوە. برسێتی تەواو بڕستی لێ بڕیوم.

بەر لە جەنگ، یەك دوو جار لە وێستگەی ئاسنەڕێ، خاتوونەکەی ئاغای دراچێئام دیتبوو: ژنێکی باڵابەرزی باریکەڵە و ئەسمەری کەپۆ پان بوو، کە دەوراندەوری زاری مووی لێ شین ببوو.

لەسەرخۆ دەڕۆم. لەوەتەی شەل بوومە، بە پارێزەوە دەڕۆم. لەسەر خۆ دەڕۆم نەکا سەرەنگرێ بم.

بە نێوەڕاستی مەزراکاندا قەدبڕ لێ دەدەم. جادە ئەسڵیەکە پێچ و گەوی زۆرە. ڕێگە لاوەکییەکە نزیکترە.

لاڕێییەکەم گرتووە و دەڕۆم.

بەرەبەری نیوەڕۆیە دەگەمە دراچێئا. لە دەرگای ماڵی ئاغا دەدەم. نۆکەرێك دەرگام لێ دەکاەوە.

ـ چیت دەوێ؟

ـ لە کار دەگەڕێم.

ـ کار نییە.

ـ گینێئاسا لێرەیە؟

ـ کێ؟ نەکامەبەستت ئاغاژن بێ؟

ـ ئا، ئا، راست دەکەی ئاغاژن.

ـ ئەگەر دیتت سلاوی ئێمەشی پێ بگەیەنە. پرێسکەی پێچاوەتەوە و چووەتە مۆلداڤیا.

ـ ئەی ئێستا کێ کارەکان رادەپەڕێنێ؟

ـ کوێخاکان.

ـ ئەی ناکرێ قسەیان لەگەڵ بکەم؟

ـ برۆ ملت بشکێنە بزانم.

قایشی پانتۆڵەکەی دەکاتەوە و بۆم دێ. چاوەڕوانە زارم بکەمەوە و تێم بەربێ. قایشەکەی درێژ و ئەستوورە.

دسان بە نێو کێڵگەکاندا دەکەومەوە رێ. ئەمجارە بەرەو ئۆلۆگی. ئەوەش ملکی ئاغایەکی دیکەیە. بەلام زۆر نییە. چونکە یەنیکا دیاکۆنی خاوەنی هەندێ زەویی هەیە و لەشکرێك کچی عازەب.

لە دەرگا دەدەم.

دەمەوێ دیاکۆن ئاغا ببینم.

ـ چووەتە مۆلداڤیا.

ـ ئەویش؟

ـ بۆ چوویتە جێی دیکەش؟

ـ بەڵێ، چوومەتە دراچێئاش. ئێوە کارتان نییە من بیکەم؟

ـ لەو پرسیارە قۆڕە. ئێستا هەر لە کلۆکۆچی یۆف کار دەست دەکەوێ.

وەڕێ دەکەوم بەرەو کلۆکۆچی یۆف. تەنگی ئێوارە دەگەمێ. هەر کۆشکەکەی ئاغا جێی حەوت پۆگۆن زەویی گرتووە. بینایەکی لە پێشەوەیە سێ نهۆم و بورج و شۆرایەکە شتی وام نەدیتووە. لە پشت کۆشکەکەوە ریزێك خانووی درێژ و نەوی بۆ نۆکەر و کارەکەرەکان دروست کراون و زۆر لەولاتریشەوە تەویلەی گەورە و فرەوان. لە لایەکی کۆشکەکەوە سێ ژووری نەوییان دروست کردووە کە نووسینگەی مڵکەکانە.

لە ژنێك کە ئاو لە بیرەکە هەڵدەهێنجێ، دەپرسم.

ـ ئەرێ کەس هەیە بکرێ پرسیاری لێ بکەم؟

ـ کێت دەوێ؟

ـ یەکێك لەوانەی نووسینگە.

ـ بچۆ بۆ لای جەنابی لاسکار، هۆ لەوێیە.

پەنجەی بۆ لای نووسینگەکە رادەکێشێ.

ـ وەرە ژووریٚ.

ـ سلاو كاكە.

ـ سلاو كوڕی باش.

كابرایەكی كورتەبالای سەرو ردێن سپیی دەموچاو چرچ بە چاویلكەیەكی پەنسییەوە لە پشت مێزێكی دارین دانیشتووە و خەریكە كاغەز رەش دەكاتەوە.

ـ چیت دەویٚ؟

ـ لە كار دەگەڕێم.

كابرا چاویلكەكەی دەردێنیٚ و بە دەسرۆكەیەك خاوێنی دەكاتەوە و دەیكاتەوە چاوی و، سەرتا پیٚ لێم ورد دەبێتەوە و دەڵیٚ:

ـ تۆ منداڵی دێهات نی. وایە؟

ـ نا، خەڵكی كاڵماتزۆیی سەرێم.

ـ كوێرە خوێندەوارییەكیشت هەیە یان نا؟

ـ بەڵیٚ.

ـ بۆ وێنە چەندە؟

ـ تا پێنجی سەرەتایی.

ـ خەتیشت باشە؟

ـ دەخوێنرێتەوە.

ـ دەی باشە. دانیشە و شتێكم بۆ بنووسە بزانم.

لەسەر یەکێك لە کورسییەکان دادەنیشم و کڵاوەکەم لەسەر ئەژنۆم دادەنێم و قەڵەم و کاغەزێك هەڵدەگرم و هەروا لە خۆوە چەند رستەیەك دەنووسم. پیرە هەر وا سەیرێکی دەکا و دەڵێ:

ـ زۆر باشە. لەگەڵ ئاغا قسە دەکەم.

لە نێو ئەو کۆڵە دەفتەرەی لەسەر مێزەکە کەوتوون، زەنگێکی بچکۆڵانەی لێیە، هەڵیدەگرێ و رایدەوەشێنێ. خزمەتکارەکە دێتە ژوورێ.

ـ فەرموو جەنابی لاسکار.

ـ ئەو گەنجە بەرە چێشتخانە. بڵێ خواردنی بدەنێ. لێرە لە لای خۆمان لە نووسینگە کار دەکا.

باشە، وا دیارە ناوی پیرە لاسکارە و هەر کات زەنگەکەی بزرینگێنێتەوە، دەبێ پێی بڵێن: فەرموو قوربان ئەمر کە.

خزمەتکارەکە وەپێش خۆی دام بەرەو دەرگا و ئینجا بەرەو بیناکەی بردم و پێکەوە چووینە نێو تەلارێکی گەورەوە.

ـ هۆی سافتا، شتێك بدە بەو برادەرە بیخوا. ئەمڕۆ و تا سبەی ئەویش جنێوبارانمان دەکا.

ئاخر قەول وایە لە نووسینگە و لای جەنابی لاسکار کار بکا.

سافتا دەڵێ:

ـ بەشکم هیچ نەبێ ئەوەیان جنێوبارانمان نەکا.

ژنێکی قەڵەوەی ئێسک پانە، ران و سمت و کەفەڵی هێندەی قەدی دارێك دەبێ و مەمکی دەڵێی دۆدانەن. لاقی رووت و قەڵشیون و پەنجەی پێی خواروخێچ و نینۆکەکانی رەشن. تەنیا دەستی سپین. لەوانەیە لەبەر ئەوە بێ بەردەوام لە ئاودان، خەریکی شوشتنەوەی دەفر و ئامان و خاوێنکردنەوەی سەوزە و شتی وا.

خزمەتکارەکە دەیەوێ قسەی خۆی بەرێتە سەر:

ـ شەرت و مەرجت لەگەڵ دەکەم کە جنێومان دەداتێ. چما گیۆرگیۆش کە هات هەر ئاوا نەبوو؟ لە برسان زگی بە پشتییەوە نووسابوو و پانتۆڵەکەی بە قوونییەوە رانەدەوەستا. لەوەش شەرمنتر و داپلۆسراوتر دیار بوو. دەی باشە، ئێستا کە ئەوە بووژاوەتەوە و زیندوو بووەتەوە و جنێومان دەداتێ، بگرە وەبەر قەمچیشمان دەدا. بووەتە دەستەراستی جەنابی ئۆسکار.

ـ زۆر باشە بیبڕەوە تۆش. بچۆ خەریك کاری خۆت بە و لەو کوڕە گەڕێ پشوویەك بدا. خزمەتکارەکە کە رۆیشت، سافتا رووی تێکردم و گوتی:

ـ گوێی مەدەیە. ئەو گانیۆیە هەر ئاوایە. زمانی تاڵە بەڵام کەسێکی خراپ نییە. بە هەندی مەگرە.

جێیەکم دەداتێ بۆ دانیشتن و قاپێکی پڕ لە فاسۆلیام بۆ لەسەر مێزەکەی تەنیشت قاپ و کەوچکە شۆردراوەکان دادەنێ. لەتێکی گەورەشم مامالیگا بۆ لە قاپێکی دیکەدا دادەنێ.

ـ خۆت لەوێ کەوچکێك هەڵگرە.

لە نێو سەدان کەوچکدا یەکێکیان هەڵدەگرم و وشکی دەکەمەوە و مل لە خواردن دەنێم. خواردنی چی، ئەگەر راستیت دەوێ هەر قووتی دەدەم. سافتا کە لێم راماوە، دیسان قاپەکەم بۆ پڕ دەکاتەوە:

ـ لە رێیەکی دوورەوە هاتووی؟

ـ زۆر نا. بەیانی وەڕێ کەوتووم.

ـ دیارە هیچیشت نەخواردووە.

ـ هیچ.

سەری قسەی لەگەڵ دەکەمەوە. لە قسەکانیڕا بۆم دەردەکەوێ کە ئاغا یەکێکە لە خواپێداوترین کەسەکانی ناوچەکە. سەدان نۆکەر و قەرەواش و خزمەتکاری لە کۆشکەکەیدا هەیە و سەد کرێکارێکیش ئاگایان لە هەسێڵەکانێتی. لە شیو و دۆڵەکاندا و لەسەر گردەکان سەدان ماڵە دۆم خێوەت و کەپری خۆیان هەڵداوە و شانیان داوەتە بەر بەشێك لە کاروبارەکانی مەزرا.  ناوەندی سەرەکیی کار، کۆشکەکەی ئاغایە، کەچی لە عەمبارەکانیشدا کە لەسەر گردەکانن، هەر جموجۆڵ و کار و کوێرەوەرییە.

ـ خراپت لێ ناگوزەرێ ئەگەر بتنێرنە سەر عەمبارەکان لەوێ کار بکەی. ئەگەر راستیت دەوێ کەس حەز ناکا لەم بیابانەدا بژی.

ئیتر شەو داهاتووە. پەنجەرەی کۆشکەکە رووناك بوونەتەوە. بڕێك لەو شوێنە پان و بەرینەدا دێم و دەچم. سەگەکان کە بەلایاندا دەڕۆم، پێم ناوەڕن، هەر ئەوەندەم بۆن پێوە دەکەن تا بمناسنەوە. نووسینگەی ملکەکان رووناکە. لە دەرگای ژوورەکەی بەڕێز لاسکار دەدەم.

دەپرسیٚ: نانت خوارد ؟

ـ بەڵیٚ.

ـ با بچین بزانین ئاخۆ دەکریٚ لەگەڵ ئاغا قسان بکەین یان نا. وەدووم بکەوە.

وەدووی لاسکار دەکەوم. کە گەیشتینە دەم پلیکانەکان، من لەویٚ رادەوەستم. پلیکانەکان گەورەن لە مەڕمەڕ دروست کراون. بەڕیٚز لاسکار دەچیٚتە ژووریٚ و دەسبەجیٚ دیٚتەوە دەریٚ.

ـ ئاغا دەیەویٚ بتبینیٚ. جوان بەری پیٚت خاویٚن بکەوە.

لاقم جوان جوان خاویٚن دەکەمەوە. دەڵیٚم داخوا ئاغا یەکی چۆنە.

دەمبەنە ژووریٚکی پانوبەرین. بە شەرمەوە پیٚ لەسەر مافوورەکە دادەنیٚم و دەچمە پیٚش. لاقم هەتا گویٚزینگان لە پرزە و تووکی مافوورەکە دەچنە خواریٚ.

بەڕیٚز لاسکار بە لەبزیٚکی ماستاوچیانەوە بە ئاغا دەڵیٚ:

ـ هەر ئیٚستا هاتە کۆشك و خۆی ناساند. لە لای کالماتزۆییەوە هاتووە و لە کار دەگەڕیٚ. دەستوخەتی جوانە. دەکریٚ لە نووسینگەکەدا جیٚیەکی بۆ بکەیەنەوە.

سەیری ئاغا دەکەم: کابرایەکی بە قەڵافەتی چوارشانەیە، کە ئیتر مووی لاشەویلاگەی سپی بوون. نە ردیٚنی هەیە و نە سمیٚڵ. پیٚستی لاملی ئەوەندە چەورە، دەبریسکیٚتەوە. خۆشبژیٚوی و تیٚروپڕی لە قەڵافەتی دەباریٚ. ردیٚنی وا تاشیوە کیٚچی لیٚ هەڵدەخلیسکیٚ و بۆدرەشی لیٚ داوە. قژی جوان داهیٚناوە. شووشەیەکی خڕ لە پیٚش چاوی رادەگریٚ و دەمدویٚنیٚ. ئەوەندە

لەسەرخۆ و بە حینجەوە قسە دەکا، هەر دەڵێی زمانی خۆی رۆمانیایی نییە و شتێکی دیکەیە.

ـ سبەی لەگەڵ خۆم دێیە عەمبار. لەوێ یەکێکم پێویستە. هیوادارم کوڕێکی چوست و چالاك و باش بی. خۆراك و جێ و بانت دەدەمێ و مانگێ دە لەییش بەراتت بێ خۆ دەبینی ئەوە بەراتێکی باشە... جا ئێستا لاسکار بیبە و برۆ.

بەڕێز لاسکار هەموو گیانی دەلەرزێ. لەبەر خۆمەوە دەڵێم، لەوانەیە لە شەکەتییان بێ. شەوخۆش لە ئاغا دەکەم و دەگەڕێمەوە و بەرەو دەرگا دەچم. بەڵام بەڕێز لاسکار پاشەوپاش دێتە دەرێ. لە سەر پلیکانەکان سەری دێنێتە بن گوێم و دەڵێ:

ـ داماو، پشتت لە ئاغا کرد.

ـ پێت ناخۆش نەبێ بەڕێز لاسکار، ناتوانم پاشەوپاش بکشێمەوە. خۆ من قرژاڵ نیم.

بەڕێز لاسکار دەڕوا بەڵام هەوڵ دەدا بە رووەمەوە پێ بکەنێ.

ـ زۆر زۆر ئازای ئابرا.

ـ خۆم نەمزانیبوو، بەڵام کە جەنابت وا دەفەرمووی...

ـ لە ژوورەکەی سافتا دەنووی.

ـ سپاس.

نۆکەرەکان لەبەر بەڕێز لاسکار پتر دەنوشتێنەوە و کڕنۆش دەبەن، هەتا ئاغا.

ـ بەڕێز لاسکار دەمەویست پرسیارێکت لێ بکەم.

ـ دەتەوێ چ بپرسی؟

ـ زەحمەت نەبێ ئاغا ناوی چییە؟

ـ ئارگیر ئاریزان.

تاوێکی پێ دەچێ لەبەر خۆیەوە دەڵێ:

ـ زۆر نارەحەتم.

ـ لەچی نارەحەتی جەنابی لاسکار؟

ـ بە تەما بووم تۆ لە نووسینگە راگرم. من ئیتر بە تەنێ ئەو هەمووە کارەم پێ ناکرێ. هەر جارێکی یەکی دەستوخەت خۆش دێ بۆ کار، خۆشی خۆشی خەنی دەبم کە دەیکەمە بەردەستی خۆم، بەڵام ئاغا دەسبەجێ دەینێرێتە سەر عەمبارەکان. لەوێش کەس تاقەت ناهێنێ. کەس ئەوێی پێخۆش نییە.

ـ بۆچی؟

ـ چووزانم. لەوانەیە بێ تاقەت بن. جێیەکی چەپەکە.

ـ پێم وا نییە من لەوێ وەڕەز بم.

ـ جووچکە، پاییزان بەسەر دەکرێنەوە. بە کورتی من ئەوەندەم کاغەز رەش کردوونەوە، حوکمی چاوم رۆیوە.

دەچمەوە چێشتخانە بۆ لای سافتا.

ـ جەنابی لاسکار گوتی، ئەمشەو لە ژوورەکەی تۆ بنووم. بەیانی لەگەڵ ئاغا دەچمە سەر عەمبارەکان.

ـ پێم وانییە ئەوەندە بە زاکوون بی.

ـ مەبەستت چییە؟

ـ هیچ.

ترۆمبێلێکی گەورە بە هاڕەهاڕ دێتە حەوشەی پێشوازی. چوار ئەفسەری ئەڵمانیی لێ دادەبەزن. شۆفێرەکە پاشەوپاش ترۆمبێلەکەی کە هەمووی قوڕاوییە دەکشێنێتەوە و لە تەنیشت حەوشەوە رایدەگرێ. لەو جادە پڕ لە قووڵکاندا ئەوەندەی زۆر بۆ هاتووە، ماتۆڕەکەی دووکەڵ و هەڵمی لێ هەڵدەستێ.

ئاغا لەسەر پلیکانەکان بە باوەشی ئاوەڵاوە بە پیر میوانانەوە دێ و لە ئامێزیان دەگرێ.

سافتا بە بۆڵەبۆڵ دەڵێ: دیسان ئەو ئەڵمانیانە.

ـ زۆر دێن؟

ـ بەردەوام پێ و پێڵاوێکیان لێرە کەوتووە. برادەری ئاغان. رۆمانیاییە بەندکراوەکان دەخەنە بەردەستی ئاغا بۆ بێگاری و حەمباڵی لە عەمبارەکان. ئاغا گرتوویەتە ئەستۆی خۆی، کە بەبێ ئەوەی پێویستی بە قەرەوڵ و پاسەوان و سەرباز بێ، کاریان پێ بکا. کە چوویە عەمبارەکان لەوێ دەیانبینی. ئەمشەو دیسان لەبەر خاتری ئەڵمانییەکان لە کۆشك بەزم و رابواردنە.

جەنابی گیۆرگیۆ بە چوارناڵە خۆ بە حەوشەدا دەکا. ئەسپەکەی شەلاڵی ئارەقەیە. گیۆرگیۆ خۆی فڕێ دەداتە خوارێ. سێ نۆکەر رادەکەن و رەشمەی ئەسپەکەی دەگرن. یەکێکیان حەیوانەکە دەگێڕێ بۆ ئەوەی جدەو نەبێ و دووانەکەی دیکەش خەریکن زین و شتەکەی لێ دەکەنەوە و لبادێکی بەسەرپشتیدا دەدەن.

گیۆرگیۆئاغا خۆی بە ژووریدا دەکا، بەڵام زۆر نابا بە هەلاتن دێتەوە دەرێ و بە پلیکاناندا دەێتە خوارێ.

ـ ئەسپەکە، ئەسپەکەم بۆ بێنن.

نۆکەر دیسان دەردەپەڕن و لە چاوترووکانێکدا ئەسپەکەی بۆ زین دەکەن و بۆی دێنن.

گیۆرگیۆ ئاغا خۆی داوێتە سەر خوازی زین و قەمچیی لێ رادەوەشێنێ. حەیوان هەڵدەستێتە سەر پاشووان و چوار ناڵە لە حەوشە دەردەپەڕێ.

سافتا بە بۆڵەبۆڵ دەڵێ:

ـ زۆر بە پەلەیە. دەبێ بچێ بە دووی ژنە دۆمەکاندا.

سافتا تەنیا چێشتی نۆکەر و خزمەتکارەکان لێ دەنێ. چێشتی ئاغا و میوانەکانی لە بەشەکانی دیکەی کۆشکەکە بە تایبەتی لێ دەنرێن.

لە چێشتخانەکەی کۆشك جموجۆڵ و بێنە و بەرەیەکە هەر مەپرسە. سافتاشیان بانگ کردووە یارمەتییان بدا. لە پەنجەرەکانییەوە نە بۆنی فاسۆلیا دێ و نە بەرامەی مامالیگا. خواردنی تایبەت بۆ ئاغا دەبەن: نانی سپی، چەند جۆر شیرینی، کەبابی جۆراوجۆر و زۆر شتی دیکە.

من لە ژوورەکەی سافتا دەنووم. تەنانەت لەسەر تەختەخەوەکەشی، کە تەختێکی پان و بەرینی دارە و حەسیرێکیان لەسەر راخستووە. هەر دەڵێی تەختەکەی ماڵی خۆمانە. پێنج شەش کەس لەسەری بنوون وێك ناکەون. خۆم لە گۆشەیەکەوە گرمۆڵە دەکەم و لێفەکە بەسەر خۆم دەکێشم. جا ئێستا دەزانم چەندە شەکەتم. لە بەیانییەوە بەڕێوەم بەبێ ئەوەی وچانێك

بدەم و بحەسێمەوە. بنی پێم دەزوورێتەوە و ماندوویەتی وەك ئاوێکی بۆگەن بە هەموو گیانمدا دەگەڕێ.

بەرەبەری بەیانی لەخەو هەڵدەستم. پشتێکی پان و پڕ بەز و گەرم بە پشتمەوە نووساوە. پشتی سافتایە. لە شیرین خەودایە و پرخەی دێ. لەبەر خۆمەوە فیکەیەك لێ دەدەم. وەك ئەو فیکەیەی بۆ سەگی لێ دەدەن. پرخەکەی دەبڕێتەوە.

یەکێك لە نۆکەرەکان لە شووشەکە دەدا.

ـ هۆی، گەنجۆ کە دوێ شەوێ هاتووی، هەستە ئاغا بانگت دەکا.

لە تاریکییەکەدا جلەکانم لەبەر دەکەم. هێشتا رووناکی نەکردووە. فێنکاییەکەی شەوێ خەریکە دەڕەوێ و ئیتر خەوالّوو نیم.

ئەو نۆکەرەی هاتووە بە دوومدا رێیەکەم پێشان دەدا.

ـ ئەوەتا، لەسەر پلیکانەکان چاوەڕێتە.

لە تاریکوڕوونەکەی بەیانیدا، تارماییەکی چوارشانە و ئەسپێك کە ئاغا لەسەری جووڵەی دێ، دێنە بەر چاوم. لە تەنیشتییەوە ئەسپێکی بچووکی دیکەش بە زینکراوی ئامادەیە.

ـ سوار بە.

نۆکەرێك لغاوەکەیم دەداتێ. لاقە شەلەکەم لە رکێفان دەنێم و بە زگ خۆم دەخەمە سەر ئەسپەکە و هەرچۆنێك بێ سوار دەبم. ئەسپەکە لە بنمدا بە بێ ئۆقرەییەوە دەلەرزێ.

ـ سواری دەزانی؟

ـ بەڵێ.

ـ ئاگات لە خۆت بێ.

قەمچییەك لە كەفەڵی ئەسپەكە دەسرەوێنێ، كە هەڵیدەستێنێتە سەر پاشووان و دەحیلێنێ و وەك برووسكە بەرەو دەرگا دەردەپەڕێ. ئاغا بە دوامدا دێ و وەپیچشم دەكەوێ و هەرام دەكا:

ـ ئاگات لە خۆت بێ نەكەوی.

بە هەردوو دەستم یاڵی ئەسپەكە و قەرپۆزی زینەكە دەگرم. لاقم بە بەر زگی ئەسپەكەوە دەنووسێنم كە وەك بای شەماڵ دەڕوا. ئاغا لێم دوور دەكەوێتەوە. وەك تارمایی و ڕۆحانەتێكی سەرگەردان دڕ بە تاریكایی دەدەین. حەیوان ڕێگەی خۆی دەناسێ. لە تاریكیدا ئەو شتەی كە من هەر نایبینم ئەو جوان دەیبینێ، یانی ئەسپەكەی دیكە كە ئاغا بەردەوام بە قەمچی لێی دەدا.

لە گردەكە دەچینە سەرێ. دەوراندەورمان، شووراى بەرزی تاریكییە. لە پڕ تارمایی ئەسپەكەی ئاغا و سوارەكەی لە لووتكەی گردەكەوە دەڵێی بە ئاسمانەوە نووساون. لەو سەرە دەڵێی پەیكەرێكی زەبەلاحە.

ئەسپەكەی من بە چوارناڵە و هانكەهانك لە هەورازە رژدەكە وەسەر دەكەوێ و ڕێك وەك ئەوەی فەرمانێكی لەگوێ گرتبێ، لە تەنیشت ئاغاوە رادەوەستێ.

ئاغا پێدەكەنێ:

ـ بە دڵمی. چاوەڕێ بووم سەرەنگرێ بی.

ـ پێم وایە ئەسپەكەش هەر چاوەڕێی شتێكی وا بوو. بۆیە خۆمم توند لێ قایم كرد.

ـ لە یەكەم تاقیكردنەوەت باش دەرچووی.

تۆزێك خۆم گورج دەكەم و دەپرسم:

ـ ئیمتیحانی دیكەش هەن؟

ـ لەوانەیە.

لە تاریكاییەكەدا بریسكەی ددانی دەبینم. چاویلكە یەكچاوەكەشی.

دەست لە گیرفانی پانتۆڵەكەی دەنێ و دەمانچەیەك دەردێنێ و بۆمی رادەدێرێ.

ـ تەقە دەزانی؟

ـ نەخێر، نایزانم.

ـ دەبێ فێر بی.

دەمانچەكەی لێ وەردەگرم و دەستی پێدا دێنم. چەكێكی تازەیە. وەك ناغان نییە، بێ مەخزەنە.

رووی لە ئاسمان دەكەم و پەلەپیتكەی دەترازێنم. وەختە چۆڵەمەم بشكێنێ و شانم بێتە دەرێ.

پێم دەڵێ: دەمانچەكە خۆكارە. شانتی ئێشاند؟

ـ تۆزێك.

ـ بیدەوە خۆم.

دەمانچەكەی دەدەمەوە. پڕی دەكاتەوە.

ـ رووی تفەنگت هەمیشە لە عەرزی بكە.

وردەوردە دەكەوینە رێ. تاریكیەكە لەسەر خۆ دەڕەوێتەوە. لە لای خۆرهەڵاتەوە، رووناكاییەكی نەرم، وردە وردە تاریكاییەكەی ئاسۆ دەپێچێتەوە. هەسێڵ و ئەستێركەكانی

بەر دێ وردە وردە دەبریسکێنەوە. لەبەردەمان تارمایی دارێك پاڵی وەئاسمانێ داوە. چەند هەنگاو لەولاوە ئەسپەکان رادەگرین.

ـ سێرە لە قەدی دارەکە بگرە و لێی دە. لە نێوەڕاستەکەی بدە. کە رووناکی کردەوە، دێینەوە بزانین چەندەت لەباران دایە.

دەستم درێژ دەکەم. هەوڵ دەدەم جوان سێرەی بگرم. پەلەپیتکە دەترازێنم.

راتلەکانێك.

دەمانچەکەی دەدەمەوە.

ئەسپەکان تاو دەدەین و دەکەوینەوە رێ. تاریکاییەکە تەواو رەویوەتەوە. بە شانی چەپمدا، لە دوورەوە قۆڕاوەکەی دانوب دەبینم کە وەك مار دەخوشێ. لەو بەری دانووبیشەوە، لە کەنارە بۆلگارییەکەی چۆمی مەزن، ئەو هەڵدێرە هەزار بە هەزارانەی هێشتا لە تەمێکی خەستدا نوقم بوون.

ئاغا بۆ تێگەیاندنم دەڵێ:

ـ مڵکەکەی من زۆر بەرین و هەراوە. زیاتر لە دە هەزار جەریبە.

ـ یانی بیست هەزار پۆگۆن؟

ـ ئەدی، بیست هەزار پۆگۆن. جگە لەوە دوو مڵکی دیکەشم هەن. یەکێکیان لە باراگان واتە نزیك برائیلایە. ئێرەم پێ خۆشترە. ئەوانی دی، هەر جاروبارە سەرانسۆیەکیان دەکەم بزانم کوێخاکان چییان کردووە.

دەشتەکە کاکی بە کاکییە.

بەهارە. شینکە لە گڵ سەری دەرهێناوە. گەنمیش هەروەتر. چەند قولانجێك هەستاوە. چەند رۆژ لەمەوبەر بارانێکی باش باریوە. پەڵەی داوە. زەوی هێشتا نەرمە. سمی ئەسپ لێی دەچەقن.

ئاغا دەیەوێ سەرێك لە گوندییەکاندا بدا، بزانێ ئاخۆ چوونەتە سەر ئیشەکانیان یان نا.

دەنگی عارەبانەکان لە دوورەوە دێ و لێرەو لەوێ ئاگرترووسکەیان دێ. پێخواسەکان بەر لەوەی دنیا رووناك بێتەوە، بەر لەوەی گایەکانیان لە عارەبانە بکەن، لە تەنیشت عارەبانەکەیان دەوەن و کا و کلۆش ئاگر دەدەن بۆ ئەوەیە دەستیان گەرم بکەنەوە.

دەگەینە ریزە عارەبانەیەك.

هەمووان دەزانن ئاغا شەوانە بە ئەسپ بەسەر ملکەکانیدا دەگەڕێ. زرمەی سمی ئەسپەکەی دەناسنەوە و دەزانن ئەوە لێیان نزیك دەبێتەوە. هەمووان وێکڕا کڵاوەکانیان هەڵدەگرن و، بە پێی نەریت بۆ تەمەندرێژیی ئاغا دەپاڕێنەوە. ئاغا بە بەیانیباشێك سڵاویان دەستێنێتەوە و شێلگیرانە دەڵێ:

ـ ئەوە بۆ وا بەدرەنگەوە کەوتوونە رێ؟

ـ مەحتەل نەبووین قوربان.

ـ کوڕە ئێوە دەبوو ئێستا خەریکی تۆوچاندن بن. خەڵکی کام گوندن؟

ـ پیاترا.

ـ گاسنەکانتان زۆر داخەن، ئەگینا خراپ دەبینن. خۆم دێم و سەیری دەکەم.

هەتا سەرەدای عارەبانەکان بە غار دەڕۆین. کۆڵەکەی دووکەڵ وەك تارمایی لە دەشتەکەوە بۆ ئاسمان هەڵچوون.

لە عەمبارەکان نزیك دەبینەوە. تارمایی بیناکان و دارەکانی دەوروبەری دەڵێی بە ئاسمانەوە نووساون. ئاغا ئەسپەکەی کە هەروا بە چوارناڵە دەڕوا، داوەتە بەرقەمچی. من هەر لینگی دەدەم، بەڵام ئەوەش پێویست نییە، ملی لێ درێژ کردووە و هەنگاوی لەگەڵ لۆقەی ئەسپەکەی ئاغا رێك دەخا.

پەنجەرەکانی عەمبار رووناکن. کە دەگەینە بەر دەرگا، هەر دوو تای دەرگاکە دەخرێنە سەر پشت. وەك بڵێی دەستێکی نادیار پاڵیان پێوە بنێ.

بە لینگدان دەچینە حەوشەکەوە و بۆ ئەوەی لە ناکاو ئەسپەکان رانەگرین، خولێکی پێدا لێ دەدەین.

رەشێکی کڵاو بەدەست لە پشت دەرگا راوەستاوە.

ـ هەستاوی ئامۆس؟

ـ وەك هەموو رۆژێك کەڕەی بەیانی.

ئاغا دادەبەزێ. میش دادەبەزم. تارماییەکە ئەسپەکان دەباتە گەوڕ. ئاغا خۆی رێیەکە شارەزایە. منیش دوو هەنگاو لە دواوەی دەڕۆم.

دەرگایەك دەکاتەوە و لە پلیکانێك دەچێتە سەرێ، دەرگایەکی دیکە دەکاتەوە و دەچینە نێو تەلارێکی چوارگۆشە.

ـ قاوە هەیە ئیلۆنکا؟

ـ بەڵێ قوربان.

ـ ئاغا روو لە من دەکا:

ـ ئیلۆنکا ژنی ئامۆسە.

ژنە بە چاو و دەم بۆ ئاغا پێدەکەنێ. لە قاوەجۆشێکی گەورەوە هەڵم هەڵدەستێ. ئیلۆنکا لە کووپێکی گەورەدا قاوە بۆ ئاغا تێدەکا.

ـ بەویش بدە.

ئیلۆنکا لە کووپێکی بچووکدا قاوەم بۆ تێ دەکا.

هەر ئامۆس و ژنەکەی لە عەمبار ناژین. جگە لەو دووانە گەلێك کارەکەریش لەوێن. ئاندرێی کە دەبینم، بە زەینمدا دێ، بێ و نەبێ کوێخای نارەسەنی عەمبارە. جلوبەرگی فەرمیی قوتابییانی دواناوەندیی لەبەردایە. رێك لە هیی ئەو دواناوەندییەی من بە تەما بووم ناومی لێ بنووسم. ئەویش جەنگ لە هەموو شتێکی کردووە. لە ساڵی سێهەمیدا.

کوڕی یەکێك لە جووتبەندەکانی دەربەندی دانووبە. باوکی کۆشێك منداڵی خستووەتەوە و، ئاندرێیی کە لە هەمووان گەورەترە، ناردووەتە ملکی ئاغا کار بکا. ئێستا ئەوە چەند مانگێکە لەوێیە. سێ مانگەی زستان لەوێ بووە.

پێم دەڵێ:

ـ حەیف کە ئێستا هاتووی. نازانی چ زستانێکی خۆشم بەڕێ کرد. ئەو دەشتە پان و بەرینە و ئەو گوندانەی ئاوا خۆیان لە شیوەدا مەڵاس داوە و لەو دۆڵ و دەرەدا مات بوون کە زستانانیش ناتوانی بیاندۆزیتەوە. کە بەفر دەکەوێ، ، لە بن بارستایی بەفردا ون دەبن. تەنیا

هەڵدێرە بەرزەکانی کەناری دانوب بە دیوی بۆلگاریا قوت بوونەتەوە و پێشی ئاسۆ دەگرن. خۆ ئەوانیش ببڕی، دیسان مەزرای دیکە هەن.

شەوانە، ئەو ئاگرانەی لە بانووی بۆلگاریا هەڵدەبن، دەبینین.

ئاندرێی دەڵێ: زەوییەکانی ئەوبەر بەیار و وشکەرۆن و هیچیان لێ ناڕوێ. هەر بۆیە هەر لەوەڕگەی ماڵات کەلکی لێ وەردەگرن.

پێم دەڵێ، کە چۆن چووەتە راوە کەروێشك و چۆن بە ئەسپ دەوری چێرگەکانی داوە:

ـ لەگەڵ زیندانییەکان چوبوومە راوی چێرگ.

لە حەوشەی عەمبارەکان، لە ریزە بینایەك کە لە سۆنگەی جەنگەوە بە نیوەچڵی ماونەتەوە، سەد بەندییەك دەژین. ئاغا لەسەر ئەستۆی خۆی، ئەوانەی لە کامپەکەی تۆرنۆوە هێناوەتە ئێرە. هەموویان گوندی و وەرزێرن. تورك و بۆلگار و لە هەموو جۆرێکیان تێدایە. ئاغا جێ و خواردنیان دەداتێ و لەبری ئەوە کاریان پێ دەکا. هیچ گوێی لەوە نییە ماندوو دەبن یان نا، بگرە کام کار ئەستەمە ئەوەیان پێ دەکا. کەسی واشیان لە نێودایە، خەیاڵی راکردنیان بە مێشکدا هاتووە، بەڵام کە جوان بیریان لێ کردووەتەوە، دیتوویانە بایی ئەوەندە نییە. وای دانێ رایان کرد، جا بۆ کوێ دەچن؟ هەتا چاو بڕ دەکا، لە دوژمن بەولاوە کەسی لێ نییە. دەیانگرن و دەیاننێرنەوە ئەوبەری چیاکانی باکوور بۆ لای ئەڵمانییەکان. دەی باشە، لێرە هەر هیچ نەبێ، شتێك هەیە بیخۆن. دیارە کارەکە قورسە، بەڵام ئیتر لەگەڵی راهاتوون.

سەربازەکان هەندێکیان کڵاوی سوور لەسەر دەکەن. نێوانمیان لەگەڵ خۆش دەکەم و هەوڵ دەدەم تورکییان لێ فێر بم.

ئاندرێی دەمبینیٚ، زمانم بە هەزار جۆر خواروخێچ دەکەمەوە بۆ ئەوەی بتوانم ئەو وشانەی پیتەکانیان سەیروسەمەرەن جوان بلێیمەوە، دەست دەکا بە پێڕابواردنم:

ـ باشە تۆ تورکیت بۆ چییە؟ دیسان ئەگەر زمانی دۆمەکان فێر بی، ئەوە شتێك، چونکە لەوانەیە بەکارت بیٚ.

لە نیوەڕێی نێوان ئاوایی و مەزراکاندا، سالآنێکە دۆمەکانی ئاغا بار و بنەیان خستووە و لە پارچە زەوییەکی نشێودا دەژین.

بەهارەکێلٚ دەستی پیٚ کردووەتەوە. خەڵك خەریکی داچاندنی گەنمەشامین. زۆربەی کارەکان لە ئەستۆی ژنانن، چونکە پیاوەکان یان لە جەنگن، یان لە کەمپی دیلەکان.

هێشتا دۆمەکان نۆرەیان نەهاتووە کاری دەشتیٚ بکەن. زۆریشیان نەماوە.

ڕۆژ هەر دێن و درێژتر دەبن و شەوەکانیش کورت. ڕۆژی وایە ئاسمان هەورە و، ڕۆژی واشە با و بۆران و، پاشانیش ڕۆژ هەیە هەموو شتیٚ شینە، شین شین...

هەر دوێنیٚ گەنم نەدەگەیشتە گوێزینگی پیاو. ئەمڕۆ دەگاتە بەلەك و سبەی وەسەر ئەژنۆ دەکەویٚ. گیا و گەنم ئاوان: بە بەر چاوتەوە بالآ دەکەن. خاکەکە، ڕەش و بەهێزە. هەر تۆوێکی پێوە بکەین دەسبەجیٚ چەکەرە دەکا. خەڵکی ئەم ناوچانە لە تاریفی زەوییەکەیاندا دەڵێن:"زۆر باشە، دەڵێی جوانووە".

زەوییەکە هیی ئاغایە.

ڕۆژێك بە ئاندرێی دەڵێم: ئاغامان زەوی و زاری زۆرە.

ـ دەڵیٚ: هەر زۆر زۆر.

ـ باشە چۆن دەکرێ یەکێك بەتاقەتەنێ ئەو هەمووە زەوییەی هەبێ؟

ـ دەی ئاغاکەی ئێمە سووکە سەربردەیەکیشی هەیە.

ژوورەکەی ئێمە گەورە و فرەوانە و رێك کەوتووەتە بەر باڵەخانەکەوە. پەنجەرەکانیشی پانن. ئاغا چاوەڕێی تەواوبوونی جەنگە بۆ ئەوەی خانووەکانی لای عەمبارەکان تەواو بکا. وەك بۆنی دێ، وا دیارە دەیەوێ زیاتر لێرە بێ.

شەوە. گوندەکە کپ و بێدەنگە و چۆلەکوژ لە بەر پەنجەرەکانەوە رانەوەستاوە گوێ هەڵخا. ژوورەکەی ئامۆس و ئیلۆنکا لە خوارەوە لای دەرگاکەوەن. بەندییەکان لە گەوڕ ئاگایان لە مەحموودی بێزەواد ەماوە و دۆمەکانیش لەو دوورەوە لە هەوارگەکەی خۆیان.

ئاندرێی دەست پێ دەکا و "سووکە سەربردەکە"م بۆ دەگێڕێتەوە.

ـ دوو پیرەپیاویش لە کۆشکەکەدا دەژین: ئیۆرداکێ ئاریزاب و باوکە ئیۆڤکۆ، کە هەردووکیان تەمەنیان لە هەشتا تێپەڕیوە. باوکە ئیۆڤکۆ برای سەلیبیی ئاغا ئیۆرداکێیە. ئاخر ئیۆرداکێیش ئاغایە. پێڵاوەکانی دەبریسکێنەوە و جلوبەرگەکانی دەسکردی باشترین بەرگدرووەکانی بوخارێستن. کراسەکەی بەردەوام ئوتوو کراوە، بەڵام هەرگیز بۆینباغ یان پاپیۆن نابەستێ. بە جلوبەرگی ئاغایەتییەوە راهاتووە، نەك بە بۆینباغەوە. دەڵێ: "کە بۆینباغ دەبەستم، هەر دەڵێی پەتێکم لە ملی خۆم کردووە و خۆم دەخنکێنم." ئەگەر راستیت دەوێ بۆ راکردن لە وەها پەتێکی سێدارە بووە کە نیوسەدە لەوەپێش لەگەڵ باوکە ئیۆڤکۆ لەوبەری دانووبەوە رای کردووە و پەنای هێناوەتە ئەم بەرە. هەردووکیان لە چیاکانی بەلکان رێگر بوون و دنیایەك زێڕ و گەوهەریان لە خەڵك ئەستاندبوو. سوارەی جەندرمە راویان دەنێو

و چەندی چەند رۆژان بە شوێنیانەوە دەبن. ئاخر ئەو جووتە خەڵکی خوایان زۆر کوشتبوو. هەرچۆنێك بێ دەتوانن شارەزایان لە چنگی جەندرمە خۆیان قوتار بکەن و لێڕ و دارستانان ببڕن و بپەڕنەوە ئەم بەرەی دانووب.... باوکە ئیۆرداکێ قۆڵی لێ هەڵدەماڵێ: پەڵە زەوییەك لە دەشتەکەی باراگان بە ئیجارە دەگرێ و دایدەچێنێ. ژن دێنێ و سێ منداڵی لێی دەبێ کە دوانیان دەمرن و هەر یەکێکیانی بۆ دەمێنێتەوە کە ئەویش ئەو ئاغایەی خۆمانە. ژنەکەشی کچی یەکێك لەو گوندییانەی ئێرە بووە و ئێستا نەماوە... باوکە ئیۆڤکۆ قەت حازر نەبووە واز لە جلوبەرگە بەلکانییەکانی خۆی بێنێ و دایانکەنێ: کالەی شەمامەبەند لەپێ دەکا و پانتۆڵی فشوفۆلی دەسچنیش. کلاوێکی چەرمە بەرخیش دەکاتە سەری. بێت و بیبینی، لەگەڵ نۆکەرەکان لێت دەگۆڕدرێ.. دیارە باوکە ئیۆرداکێ هەر لە زووەوە زۆر لەڕ و لاواز بووە. بە دەگمەن لە ژوورەکەی دێتە دەرێ و خۆی دەداتە سەر کەمای گۆچانەکەی و بە باخی کۆشکەکەدا دەگەڕێ. گۆچانێکی پێیە، کەماکەی زێڕە. دەست و ئەژنۆی دەلەرزن. هەر پێست و ئێسکە... بەڵام باوکە ئیۆڤکۆ وا نییە: کە ئاوا لێی ورد دەبییەوە بڕوا ناکە تەمەنی لە پەنجای تێپەڕاندبێ. لە کەڕەی بەیانییەوە تا نیوەی شەوێ نە دەزانێ ماندوویەتی چییە و نە پشوودانیش. خۆی داوێتە سەر خوازی زین و لەسەر ئەستێرۆکان لەگەڵ ماسیگران دەیکاتە هەرا کە بۆچی نەیانتوانیوە بە گوێرەی پێویست ماسی بگرن... ئینجا دەکەوێتە رێ بەرەو لای عەمبارەکان. جا ئەوە خۆت دەیبینی... لێرەوە وەڕێ دەکەوێ دەچێتە زگ شوانەکان و جا وەرە دەیانداتە بەر دار و تێلا و تا دەبزوون لێیان دەدا. بۆچی؟ چونکە پێی وایە نازانن مەڕەکان بەجوانی بدۆشن و شیری زۆر لە گوانی مەڕەکاندا بۆ بەرخەکان بەجێ دێڵن و ئاواش

زیانی لێ دەدەن... هەر دوێنێ لە دانگەی مەڕەکاندا کە لەوسەری خڕەکەیە دیتم. دەستیان کردبوو بە بڕینەوەی مەڕەکان. باوکە ئیۆڤکۆ پێی وابوو شوانەکان نازانن مەڕەکان جوان ببڕنەوەز لە ئەسپەکەی دابەزی و یەکێك لە مەڕەکانی گرت و لە عەرزی دا و داوای برینگ(مقەستی مەڕ بڕینەوە)ی کرد و گوتی:

ـ جا ئێستا فێرتان دەکەم و پێتان دەڵێم خوری چۆن دەبڕدرێتەوە و، ئینجا دەستی کرد بە بڕینەوەی مەڕەکە. ئەوەی دەیبڕییەوە مەڕێکی دابەستەی زل بوو. وای رووت کردەوە کە دەتگوت بە مووسی دەلاك تاشیویانە.

لە ئاندرێی دەپرسم:

ـ جا بۆ خوا غەزەبی لێ گرتووە و ئاوا چاوێکی لەسەر ماڵەکەی ئاغا کردووەتە چوارچاو؟

ـ ئەوەش نهێنییەکی تێدایە. ئیۆکۆ لەسەر سفرەی ئاغا دانانیشێ. لەگەڵ نۆکەرەکان نان دەخوا بەڵام دەچێتەوە ژوورەکەی خۆی دەنوێ. ژوورێکی جیای هەیە کە تەختێکی دارینی تێدایە و کەوڵە مەڕێکی لەسەر راخستووە... بە گەنجێتیش هەر لەسەر وەها تەختێك خەوتووە. یانی ئەو سەردەمانەی رێگر بووە و سوارەی جەندرمەی بەشوێنەوە بوون. چونکە ناچار بووە هەموو دەموساتێك لەسەر پێ بێ بۆ راکردن، بۆیە بەناچاری هەر بە جلوبەرگەکەیەوە نووستووە و وردە وردە لێی بووەتە خوو. کراس و جلەکانیشی بە دوو حەفتە جارێك دادەکەنێ و دەیانگۆڕێ...

ئاندرێی بێدەنگ دەبێ و لە ناکاو دەڵێ:

ـ ئەگەر لەوە زیاتر لە کۆشکدا مابایەوە، لەوانەبوو میتیزاش ببینی.

ـ ئەویان کێیە؟

ـ کوڕەکەی ئاغا.

ـ یانی ئاغا کوڕیشی هەیە؟

ـ ژنەکەی ئاغا مردووە. لێرە کەس نازانێ کەی مردووە و لە کوێ مردووە. هەندێ دەڵێن نەمردووە بەڵکو ئاغای بەجێ هێشتووە و رەدووی یەکێکی دی کەوتووە... با کارمان بەوەی نەبێ، ئیتر رۆژێك لە رۆژان، کوڕیژگەیەك کە لە رێیەکی دوورەوە هاتووە دێتە کۆشك. دەست و پێی وەك داوە دەزوو باریك بوون. بە کورتی لەسەر یەکێك لەو کورسییە خولخولەدارانە گەورەی دەکەن. ئێستا بیستساڵی شیرینی تەمەنە. بەردەوام جلوبەرگی جوان و رازاوەی لەبەر دەکەن وەك بڵێی بچێتە سەر شایی. یەکێك لە ژنە دۆمەکانیان ناردووە لە شاری فێری ئارایشتگەری بێ، تایبەت بۆ کورتکردنەوەی نینۆك و ردێن تاشین و کورتکردنەوەی قژی ئەو. ژنەتیوە رۆژ تا ئێوارە لەگەڵ ئاغازادەیە. ئەو هەتیوەش کە دێتە دەرێ، کەس بە شیاوی ئەوە نازانێ قسەیەکی لەگەڵ بکا. قسەکردن سەری بخوا، تەنانەت پێی وایە کەس لێرە شیاوی ئەوە نییە ئەو جنێوێکیشی بداتێ. ئەگەر یەك دوو جاران نەیاندیتبایە کە خەریکە لەگەڵ باوکی قسە دەکا، لەوانەیە خەڵکەکە وایانزانیبا لاڵە. روخسارێکی هەڵبزرکاوی هەیە، ئەوەندە لەرە رێوی کلکی لێ بدا دەکەوێ. چاویشی زەق زەق ... تووتکە چەتە.

ئاندرێی دەنوێ. ئەستێرەکان لە تاریکایی پەنجەرەکەوە جریوەیان دێ.

ئاندرێی لە خەودا دەڕاوێنێ. لە نێو قسەکانیدا تەنیا لە یەك شتی جوان تێدەگەم: زامبیلا.

دەبێ لەبیرم بێ لێی بپرسم ئاخۆ ئەو زامبیلایە کێیە.

هەرچی دەکەم و دەکرێنم خەوم لێ ناکەوێ. بیر لە زۆر شت دەکەمەوە، لە ئاغا و باوکی ئاغا و کوڕەکەی و لە باوکە ئیۆڤکۆ و لەو شتانەی زانیومن.

کەواتە ئەو پیرە کەنفتانە سەردەمانێك لە چیاکانی بەلکان چەتە بوون.

من زۆرم بەسەرهاتی ئەو چەتە و ڕێگرانە بیستووە کە بە کوشتنی خەڵك و رووتکردنی کاروانچییان زێڕ و گەنجینەیان دەست کەوتووە. بەسەرهاتی ئەو گەنجینانەی لە بن عەرزیان شاردوونەوە و نەچوونەتەوە سەریان و لەبیر کراون.

*

*

*

تەمەنی منداڵیم هەمووی بە خەیاڵی پڕ لە ئازاری ئەم گەنجینەیەوە تێپەڕی کە گۆیا لە ماڵەکەی خۆمان ـ یان هەر لەو دەوروبەرانە ـ شاردرابۆوە و بەهارە و بەهار کە بەفر دەتوانەوە و با زەویی هەڵدەبرینگاندەوە، هەموو خێزانەکەمان چاوەڕێ بوون شەوێکیان لە ناکاو بڵێسەیەکی شین لە عەرزی هەستێ و چەند ساتێك سەما بکا و حەوشەکەمان رووناك بکاتەوە.

دار چنارەکەی ئەوسەری حەوشەکەمان ـ کە ئەوەندە بەرز بوو دەیڕوانییە هەموو ئاوایی و کە لە بەرەڵایەتی دەگەڕامەوە، لەوسەری دێوە سەرچڵووکەکانیم دەدی ـ هەر لەسەر ئەو گەنجینەیە تێداچوو.

باپیرەی باوکم لە گوندەکانی دەم ئۆلت ژنی هێنابوو. دەڵێن دێوەزمەیەکی زەبەلاح بووە.

لە سەراوەردی نێوان گوندەکەی ئێمە و لیتۆری، هێشتا کۆڵەکە بەردێك وەك نیشانە چەقێنراوە، کە بە پێنج شەش پیاوی کەڵەکەڵەش نابزوێ. میترۆیی ئابۆنێئای باپیرم، یەکشەممانە هەموو خەڵکی گوندەکەی وەدووی خۆی دەدا و دەهاتە لای ئەو بەردەی سنوورەکە و دادەهاتەوە و لینگی لێ فش دەکردەوە و باوەشی پێدا دەکرد و دەیخستە سەر شانی و بەرەو پشتەوەی فڕێ دەدا... خۆ ئەگەر پێشتر چەند بوتڵە شەرابێکیشی فڕ کردبایە، ئەوا دەیتوانی بەبێ ئەوەی پشوویەکی بێتەوە بەر، دوازدە جاران لەسەر یەك ئەو شانۆ پاڵەوانییە دووبارە بکاتەوە.

باپیرەی باوکم کە باوکیشم دیتوویەتی و لەبیری ماوە ـ زۆر جاران وا بووە ماڵ و ژیانی خۆی بە ئەمانی خوا بەجێ بێڵێ و چەند حەفتەیەك خۆی بزر بکا. قەت نهێنیی ئەو خۆ بزرکردنەی کە زیاتریش پاییزانە دەبوو، بەکەس نەدەگوت. وەك بڵێی دەبووە دڵۆپێك ئاو و زەوی قووتی دەدا. چونکە نە کەس دەیدی و نە کەسیش باسی دەکردەوە. تەنانەت ژنەکەشی نەیدەزانی ئاخۆ چاوی بە مێردەکەی دەکەوێتەوە یان دیدارەو ئاخیرەت دەبێ؟

ونبوونە پڕ نهێنییەکانی باپیرە هەر وا لە ئارادا بوو، تا ئەوەی وردە وردە تین و گوڕی نەما و مووی شەویلاگەی سپی بوون و چەند تاڵەموویەکی سپی لە برۆو سمێڵیشی دەرکەوتن. پاش ئەوە ئیتر گردەنشین بوو و ژنەکەی زانیی مێردەکەی ئاقڵ بووە. پێی نابووە هەشتاساڵانەوە.

زۆری پێ چوو تا دەرکەت باپیرە و ژن براکانی کە لە دەم چۆمەکەی ئۆلت دەژیان و چەند خزمێکی دیکەش، دەستەیەکی بەناوبانگ بوون کە جاروبارە لە دانووبیان دەدا و دەپەڕینەوە و لە باشووری بەلکانەوە تا ئەو بەری چیاکانی کارپات لە باکوور کە ساکسۆنەکانی لێ

دەژیان، دەستیان دەکرد بە تالآن و بڕۆ و چەتەیی و تەنانەت هرووژمیان دەکردە سەر خاکی تورکەکانیش.

کە تەمەنیان هەڵکشا و پیری هەوساری کردن، هاتن و حیسابەکانی خۆیان لێك داوە و دەستکەوتی ئەو چەند ساڵەیان برایانە لە نێو خۆیاندا بەش کرد و، ئەودەم بوو باپیرەیان شەوێکیان بەرەبەری بەیانی کە دەگەڕاوە ماڵێ، لە بن بارستایی تێڕ و خورجیندا پشتی ئەسپەکەی گەیشتبۆوە عەرزی. هەر تایەکی خورجینەکە مەنجەڵێك بووپڕ لە سکەی زێڕ و لیرەی تورکی و فلۆرێنی ئیمپراتۆری و رۆبڵی گەورە و قورس. هەر ئەوێ شەوێ لە گۆشەیەکی باغەکەی ماڵێ کە لە نیوەی ئێستا گوندەکە گەورەتر بوو، قوڵکەیەکی هەڵکەند و زێڕەکانی تێدا شاردەوە.

باپیرەی باوکم حەوت کوڕی هەبوو. حەوت کوڕ و شەش زاوا، بەڵام لەو هەمووە پارەیەی هەیبوو، تاقە پەناباتێکیش چییە بە هیچیانی نەدا. کوڕ و زاوا لەبەری دەپاڕانەوە، دەستەوداوێنی دەبوون. پێیان دەگوت:

ـ باوکە، ئێمە دەزانین پارەیەکی زۆر و زەوەندت هەیە. ئەو قرچۆکییە بەلاوە بنێ و هەر نەبێ یەکی چەند لیرەیەکمان بدەیە.

پێی دەگوتن: خەم مەخۆن سەرلەبەری بۆ ئێوەیە. پەلە مەکەن. هەر ئەوەندە سەبر بگرن تا شەیتان من دەخاتە ئەسفەلەسافلین و وەك ترِی بن گۆم ون دەبم. هەر هەمووی بە ئێوە دەبڕدرێ.

هەشتا و نۆ ساڵی ڕەبەق ژیا و، خۆ ئەگەر ئەوێ شەوێ لە زەماوەندی یەکێك نەوەکانی ئەو فیشەکە شێتەی لە دەمانچەی کابرایەکی خەمسارد دەرچوو، لاسەری نەگرتبا و دەسبەجێ نەیکوشتبایە، سەد ساڵ پتر دەژیا.

کورتی ببڕینەوە. کوڕ و زاوا تەرمی باپیرەیان بردە گۆڕستان. بەڵام پێم وایە لە بری گریان، بە جنێوان. ئاخر باپیرەم ئەوەندەی دەستخەڕۆ کردن و جێی گەنجینەکەی پێ نەگوتن، تا ترِی ئاخری بەردا و بردییە بن گۆڕ. ئێستا ئیتر بەشەری خوای بە جێیەکەی نازانێ.

باغەکە لە پێشدا کرایە چوار بەش و دوایش هەشت پەڵە. ئەودەم باوکم پێنج شەش ساڵانە بووە.

ڕۆژێکیان باوکی باوکم لەو شوێنەی ئێستا کووخە کاولەکەی مامە دیمۆزلی لێیە، خەریك بووە بناغەیەك هەڵکەنێ و گەوڕێك بۆ ئاژەڵەکانی دروست بکا. دیۆنیسی براشی دێتە یاریدەی. لە پڕ باپیرەم هەست دەست دەکا نووکی پێمەڕەکەی وە شتێك دەکەوێ و گوێی لە دەنگی ئاسنێك دەبێ. دەسبەجێ دووقڕانییەکەی دەکەوێ. پێمەڕەکەی فڕێ دەدا و دەستی بە پشتییەوە دەگرێ و دەست دەکا بە ناڵاندن و جنێودان:

ـ ئەی هاوار، وەی دڵم، خەریکە دەمرم. دەڵێی شتێك توند توند هەناوم ڕێك دەگوشێ.

دیۆنیس ویستی هەڵیستێنێتەوە، بەڵام باپیرە هاوار دەکا:

ـ بڕۆ لێم بەوە. نابینی خەریکە دەمرم؟ بڕۆ سبەی وەرەوە. ئەمڕۆ ئیتر دەبێ پشوو بدەم

که دیۆنیسی بەڕێ کردەوە، هەستا هاتەوە ماڵێ و راوەستا تا تاریك داهات. جا پێمەڕەی هەڵگرت و لەگەڵ ژنەکەی چۆوە ئەو جێیەی پێی وابوو شوێنی گەنجینەشاراوەکەیە و بە هەڵەش نەچووبوو. چارەنووس ئەو زێڕانەی باوکی شاردبوونییەوە بە قسمەتی ئەوی کردن.

مەنجەڵەکە زۆر لەوە قورستر بوو کە بکرێ بیجووڵێنێ. باپیرە هەر لەوێ راوەستا تا ژنەکەی سەتڵ سەتڵ سکەزێڕەکانی راگوێستە ماڵێ.

براگەورەکەی باوکم، واتە مامە ئۆڤیکۆ کە شتەکەی باشتر لە بیرە دەڵێ:

ـ دایکم لە ژووری بەتانییەکی راخست و زێڕەکانی کە سەتڵ سەتڵ دەیهێنانەوە لەسەری رۆ دەکرد. من کە هێشتا منداڵ بووم، لە تەختەکە هاتمە خوارێ و گەمەم پێ دەکردن. تۆدۆر و منداڵەکانی دی نوستبوون. ئاخر سەتڵی کە هێناوە، باوکیشم مەنجەڵە بەتاڵەکەی هێنا ژوورێ. مەنجەڵێکی مسی گەورە بوو، کە شێ و تەڕەشوع دەوراندەورەکەی سەوز کردبوو.

مامە ئۆڤیکۆش خەوتبوو. باپیرە و نەنکم هەتا تاو کەوتبوو، هەوڵیان دابوو و ئەوەندەی توانیبوویان گەنجینەکەیان بردووە شوێنێکی دڵنیاتر. رۆژی دواتر مامە دیۆنیس هاتەوە یارمەتیی باپیرە بۆ دروستکردنی گەوڕەکە، بەڵام هەر نەیزانی چ قەوماوە.

رێك حەفتەیەك دواتر، داپیرەم کە حەوتەمین ژنی باپیرە بوو، لەپڕ دەمرێ: داپیرەم دەستی لە زێڕی گەنجینەکە دابوو.

باپیرەم بەدڵیدا دێ، بێ و نەبێ بەوە مردووە.

باپیرە برایەکی دەبێ بەناوی گۆرگان. لە خۆی بچووکتر.

گۆرگان ژن دێنێ و باپیرە دوو سکەی زێڕی بە دیاری دەداتێ بۆ ئەوەی دەستی براکەی گرتبێ و بتوانێ سفرە و خوانێکی رازاوەتر دابین بکا: بەڵام بووکە هەر ئەو رۆژە بەر لەوەی بچێتە کلێسا، لە ناکاو وەك هەورەتریشقە لێی دابێ دەکەوێ و دەمرێ.

باپیرم لەبەرخۆیەوە دەڵێ: ئەها، ئەوە دووەم مەرگی بنەماڵەکەمانە، کە لە سۆنگەی ئەو زێڕە تووکلێکراوانەوەیە.

ئینجا زێڕەکان دەباتە شوێنێکی دڵنیاتر و دەیانشارێتەوە.

ساڵانی بەسەردا هات.

یەکێك لە خزمەکانی باپیرەم کە لە پۆنتینێ دەژیا، رۆژێکیان هاتە لای و پرێسکەی دڵی خۆی بۆ کردەوە. هەر گوتی و لێی رست و باسی نەگبەتی و چارەڕەشی و هەژاریی خۆی کرد و ئاخری لەبەر باپیرەم پاڕاوە هەر نەبێ دوو سکەی زێڕی بداتێ بەشکم لەو چارەڕەشییە رزگاری بێ.

باپیرە لە روودا ما و داییێ. کابرا کە گەیشتەوە ماڵێ، سەیری کرد ئەوە منداڵەکەی گەرووەخڕەی گرتووە و خەریکە دەمرێ. دەوا و دەرمان چاری نەکرد و مرد.

ـ ئەوەش سێیەمین مەرگ لە سۆنگەی ئەو زێڕە بەدشوومەوە.

لەمەودوا ئیتر کەس نەیزانی گەنجینەکە لە کام کون و کاژێر شاراوەتەوە. باپیرە سوێندی خواردبوو تا زیندووە بیریشی لێ نەکاتەوە. کوڕی پێ گەیشتن و ژنیان هێنا. کچی گەیشتنێ و مێردیان کرد. لە ماڵی باپیرەم هەر گوێت لەم قسەیە دەبوو:

ـ باوکە، ئەی کەنگێ پێمان دەڵێی گەنجینەکەت لە کوێ پەستاوتووە؟

یان:

ـ با بچین لە بن عەرزی دەربێنین و دابەشی بکەین. جەحەننەم، چ دەبێ با ببێ.

بەڵام باپیرەم وەك نە بای دیتبێ و نە بۆران، لەم گوێچکەی دەیبیست و لەویتری دەچووە دەرێ و لە وەڵامیاندا دەیگوت:

ـ ئەرێ خۆ گوتم، هەتا من بم کەس دەستی بەو گەنجینەیە راناگا. ئەو پارەیە، پارەی شەیتانی رەجیمە. پارەیەکە لەعنەتی لێ کراوە و بە کوشتارە و تالاَن کۆ کراوەتەوە. ئەگەر یەکێکتان بەختی هێنای و جێیەکەی دۆزییەوە، نۆشی گیانی بێ...

بەڵێ، گەنجینەکە هەر لەم دەوروبەرانە لە گۆشەیەکی باغەکەدا شاردراوەتەوە. ئەمڕۆ و سبەینێیە، کە یەکێکتان بیدۆزێتەوە و هەڵیگرێ.

وردە وردە کوڕ پیر بوون. کچ دەموچاویان چرچ و لۆچاوی بوو و ددانیان هەڵوەرین و باپیرەش رۆژ بە رۆژ پیرتر بوو ئاخری ژنی بۆ پاشەبەرەشی واتە باوکم هێنا. دۆمیترای بۆ هێنا، کە لە باوکم گەورەتر بوو.

دۆمیترا، سێ منداڵی بۆ باوکم خستەوە. ئاخری رۆژێکیان باپیرەم بەلادا هات و ئیتر نەیتوانی ببزوێ: لاقی لە بڕست کەوتبوون.

باوکم دەچووە دەشتێ بۆ کارکردن و، ژنەکەی و منداڵە ساواکەشی دەبرد. لە ماڵێ هەر باپیرەم بەجێ دەما و گیۆرکێی برام کە ئاگای لێی دەبوو و مێشی لێ دەردەکرد. ئاگالێبوون... دیارە وایان دەگوت، بەڵام هەر خەڵکەکە دەچوونە دەرێ، گیۆرکێ گۆزەیەك ئاو و لەتێك ماماليگای لە پێش باپیرەم دادەنا و خۆی رای دەکردە کۆڵان بۆ گەمەکردن.

ڕۆژێکیان باپیرە هەست دەکا ئەوە دوایین هەناسەکانی ژیانێتی. بانگی براکەم دەکا و پێی دەڵێ:

ـ گیۆرکێ، کوڕی خۆم وەرە ئێرە. وەرە لە نزیکمەوە دانیشە.

گیۆرکێ دەچێتە پێشێ.

باپیرە پێی دەڵێ:

ـ جوان و زەریف گوێچکەت بکەوە. ئەوەی پێتی دەڵێم نابی بە کەسی بڵێی، دەمەوێ جێی گەنجینەکەت پێ بڵێم. دەبێ بەڵێنم بدەیەی تا گەورە نەبی و خۆت نەناسی، دەستی بۆ نەبەی. بە باوکیشت نابێ بڵێی. تێگەیشتی؟

باپیرە، کەنەفت و نەخۆش بوو، بەڵام چرکەیەکیش چییە سەبیلەکەی دانەدەنا. سەبیلەکەی کۆنە گلێنەیەك بوو و هەناسەی باپیرەم بۆگەنی توونتنی سووتاوی لێ دەهات. گیۆرکێ کە رقی لە بۆنی توونتن بوو، پاڵێکی بە باپیرەوە کە خۆی بەلادا نووشتاندبووە، نا. پف ف ف ، بەرم دە بابە دە بەرم دە قڕت کردم. پەکوو لەو بۆگەنەی زارت.

ئینجا رای کردەوە کۆڵان و لەگەڵ منداڵان ملی نا لە گەمە.

ئێوارێ کە دایکم و باوکم و ئەوانی دی هاتنەوە، باپیرە هێشتا گیانی لەبەردا مابوو، بەڵام ئیتر زمانی نەدەگەڕا. دوای ئەوە یەك دوو رۆژی دیکەش ژیا. بەڵام چ ژیانێك، کە ئیتر هەست و خوستی لێ بڕابوو.

کوڕانی خۆی و کچ و کوڕی کچ و کوڕەکانی لە دەوری باپیرە کۆوە ببوون. دەینالاند. سینگی هەڵدەستا و ئەو فرمێسکانەی عومرێك هەستی کردبوو زۆر بۆ پێڵووەکانی دێنن بەڵام هەمیشە توانیبووی پێش بە هەڵڕژانیان بگرێ، لووزەویان بەستبوو.

هەموو دەیانزانی باپیرە بە دەست ئەو نهێنییەوە کە لەدڵیدایە ئازار دەچێژێ. دەیەوێ بیدرکێنێ، بەڵام ئیتر ناتوانێ. دەیانزانی ئەوەش نهێنیی گەنجینەکەیە. دەیانزانی دەیەوێ لەو دواپین دەموساتانەدا پەردە لەسەر ئەو نهێنییە لابدا بەڵام ئیتر درەنگ ببوو. کوڕ و کوڕەزا و کچەزا و کچەکانی و هەموو بنەماڵەکە، هەر خوا دەزانێ چەندەیان پێویست بەو سکە زێڕانە بوو.

ئەوەی چوو، چوو. روژگارێکی دیکە بەسەردا هاتبوو. ئیتر کوڕەکانی باپیرەشم وەك باقی ئەندامانی بنەماڵە دەستیان بە خێر و بەرەکەتەکەی جاران رانەدەگەیشت. هەموو لە هەژاری و دەستکورتیدا دەتلانەوە، لە مەزرای ئەم و ئەو کاریان دەکرد و ئاواش رسقیان لەسەر پشتی بای شەماڵ بوو.

باپیرە مرد و نهێنیی گەنجینەکەی لەگەڵ خۆیدا بردە بن گڵ.

گەنجەکە لە بن گڵدا شاراوە ما.

خزم و کەس دەستبەکار بوون: چوونە لای ئاسنگەر و گوتیان شتێکی وەك رمبیان بۆ دروست بکا کە سەرەکەی وەك دەرزی تیژ بێ و قولاپەیەکیشی لە نێوەڕاستەوە هەبێ کە بکرێ هەموو قورسایی خۆتی بخەیە سەری.

چەند حەفتە و مانگان لەسەر یەك، باغەکەی ئێمە و هیی دراوسێکانیشمان موو بە موو پشکێنران. شەو و رۆژ نێزە ئاسنەکان وەك ئەوەی لە سەلکە رۆنێکیان رۆ بکەی، ئاوا لە عەرزەکە رۆدەکران، بەڵام هیچیان وەبەر نەهات.

باپیرەیان تف و لەعنەت کرد و دەست لە گونان درێژتر چوونەوە ماڵی خۆیان، بەڵام قسە و باسی گەنجینەکە هەر نەبڕایەوە. باوکم بە بیانووی گەوڕدروستکردن هەر ساڵە و گۆشەیەکی باغەکەی هەڵکۆڵی. تەنانەت ئەودەمەی ئیتر بێڵەکەی لە میچی تەویلەش چەقاندبوو، هەر گەوڕدروستکردنی دەکردەوە بیانوویەك بۆ وەرددانەوەی گڵی باخچەکە.

لەوسەری باخچەکەوە سپیدارێکمان هەبوو، سەری لە ئاسمانێ دەسوی. ئەو دەمەی من لە شاری شاگردی دەباغخانە بووم، ئەویشیان بڕی. ئێوَن و باوکم بە تەور تێی بەربوون. سپیدارە بەرزەکەیان بە خشەخش و شڵپەشڵپ بەعەرزی دادا و چیی نەمابوو خانووەکەش کاول بکەن. لك و پۆیان بڕی و رەگ و ریشەکەشیان دەرهێنا. باوکم لە کەللەی دابوو لە رەگی دارەکە بپرسێ گەنجینەکە لە کوێیە. سپیدارەکەیان بڕی و دەی دیارە گەنجینەکەش دیار نەبوو.

دارەکەیان لەتوکوت کرد و کردیانە ئاوردوو. ئاوردووەکەشیان سووتاند.

دەر و دراوسێ هێشتا شەوانە هەر چاوێکیان لە باغەکەی ئێمەیە. لێی غافڵ نابن. دانیان بە جەرگیاندا گرتووە و چاوەڕێن بڵێسەی شین لەسەر گەنجینەکەوە بکەونە سەما. ئەرێ لەوانەیە هەر بەراستی تیشکێك لە باغەکەی ئێمەدا سەما بکا.

لەوانەشە وا نەبێ.

کێ چووزانێ.

سەردەمانێك زۆرم حەز لە پشكنینی عەمبارەكەی ماڵەوەمان بوو. لەوێ هەموو شتێك بەسەر یەكدا درابوو، شتی سەیر و سەمەرە: لەتوپەتی دەفر و پەرداغ، شمشاڵی شكاو، كەو و بێژینگ، قۆڵی پەستەك، پێمەڕە، تەورداس، قوقمۆكەی كۆنە و دۆدانە، كە دیار بوو ساڵانێكە بەلاوە نراون..

كە منداڵ بووم، ئەو شتانە دەیانخستمەوە بیر كەسانێك، كە پێش ئێمە ژیاون. ئەو كەسانەی بەم پێمەڕانە خاكەكەیان شیو و وەرد دابۆوە، ئەوانەی بەو تەورانە دارەكانیان بڕیبۆوە. بەو دۆدانە و مەتارانە تینوێتیی خۆیان شكاندبوو. بیرم بۆ ئەو بنیادەمانە دەچوو، كە بەو پەستەكە چەرمییانەی سەردەمانێك گوڵێكی سووریان پێوە دووردرابوو و تێپەڕینی زەمان كاڵی كردبوونەوە، لە سەرمان پاراستبوو.

شتێكم نەبوو گەمەی پێ بكەم. هیچم نەبوو بیخوێنمەوە. بۆیە لە سایەی ئەو نیشانە و شوێنپێیانەوە ئەو رابردووانەوەم دەخوێندەوە، كە دەمێك بوو تێپەڕیبوون. هەوڵم دەدا ژیانی ئەو بوونەوەرانە بێنمە پیش چاوم، كە من و براكانم خوێنی ئەوانمان بە میرات پێ گەیشتووە، ئەو بوونەوەرانەی زۆر لە مێژە لە گۆڕستانەكەی ئەو یاڵە بوونەتە تەپوتۆز.

رۆژێكیان ئەوەندەم ئەو شڕ و شیتاڵانە سەروبن كرد، هەتا تێلایەكی درێژی سپیم دۆزییەوە. ئەوەندە سپی و بریقەدار بوو، پیاو وای دەزانی ئێسكێكی گەورە بووە و تێپەڕی زەمان وای مشتوماڵ داوە، ئاوای لێ هاتووە.

هێنامە خوارێ و بە شاقەلی كەواكەم سڕیمەوە. شتێكی زۆر دەگمەن بوو. هەتا شەوێ بارەوبارم كرد و گەمەم پێ كرد.

باوكم كە لە مەزراوە هاتەوە و چاوی پێی کەوت، پرسیی: ئەوەت لە کوێ دۆزیەوە؟

تووڕەییەکی نامۆ لە دەنگیدا شەپۆلی دەدا.

گوتم: لە عەمبارێدا.

ـ بیدە بە من.

لە دەستمی دەرکێشا و وەڕێ کەوت و لەوسەری باغەکە ونی کرد.

سەرم لەو کارەی سووڕ ما.

لە سەرسفرە، چونکە پێم وابوو ئیتر تووڕە نییە، لێم پرسی: بابە؟ ئەو شتەت بۆچی لێ ئەستاندم و بردت؟

ـ لەبەر بۆیەکەی.

ـ جا ئەوەش بوو بە جواب؟ باشە بۆ لێت ئەستاندم؟ شتی وا جوان؟

ـ ئەوە تێلای باپیرەمە. مادام دەتەوێ بزانی، فەرموو بزانە. خوا دەزانێ سەری چەند بنیادەمی پێ ئەنجنیوە.

رەنگە بابم ئەو تێلایەی لە جێیەك خستبێتە بن گڵ. لەوانەیە هەر وای کردبێ، بەڵام ئەگەر زۆر قووڵ شاردبێیەوە، قەت نارزێ. نازانم ئەم باوەڕەم لە کوێوە هێناوە. لەوانەیە لەبەر ئەوەی کە پێم وابوو لە ئێسك دروست کراوە. ئەویش ئێسکێك کە نارزێ و هیچ شتێك نایپوێنێ. ئەوەندە سووك بوو، دەتگوت قولەپێیەکی بێ گۆشتە. لەگەڵ ئەو سووکییەی قورسیش بوو.

*

*



ئاندرێی لە خەو هەڵدەستێ. دەبینێ من لەسەر تەختەکەم بێ ئۆقرەم و جنیگڵ دەدەم، ڕێك وەك ئەوەی لەسەر ئاگریان دانابم.

ـ باش خەوتی داریە؟

ـ بەڵێ باش نوستم.

دەچینە خوارێ، بۆ حەوشەی عەمبارەکە.

گەنم زۆر هەستاون. یەك دوو حەفتەی دیکە سێ ئەوەندەیان لێ دێ. گوڵەکەیان گەورە دەبێ و دەنك دەکا. هەر گوڵەی هێندەی چێشکەیەك و دەنکیش پڕ و قورس دەبن.

ئەمساڵ زستانێ بەفرێکی قورس کەوت. بەفر بۆ گەنم زۆر باشە. ئەمساڵ لە هەموو وڵات زۆر باری، تا ئەو بەری ئەو هێڵەی سەربازەکانی ئێمە لەگەڵ دوژمن لەشەڕدان.

بەندییەکانیش لەخەو هەستاون. ئەوەتان: ریزیان بەستووە و دەچنە چێشتخانە. هەموو ڕۆژێ وا دەکەن. لێرەش وەك سەربازخانە، بەر لەوەی بچنە کار، قاپێك نیسکێنەی ڕەشی گەرمیان دەدەنێ هەڵێقوڕێنن. ناوی بەرچاییە. جۆرە چایەکە بەبێ چا.

ئێستا کاتی وەیە کە دەبێ گژ و گیا و دڕك و داڵ لە گەنمەکان بژار بکەن. کاتی وەیە دۆمەکانیش بنێنە بەر کار.

شڕەپۆش و نیوەڕووت و پێخواس، ژن و پیاو و منداڵ، چوارسەد کەسێك دەبن. زستانەکەی لە خڕەکەدا ژیاون و، ڕەشەبا، بە گڤەگڤە شوومەکە دەوری داون. چوارسەد بنیادەم کە ڕووت و قووت دەژین. لە هەوای وەیشوومەی زستان و گەرمای تەمووزی هاویناندا لە باڵندەش

رووتوقووتتر، هەر نەبێ باڵندە پەڕوپۆیەکی هەیە. لە ماریش رووتوقووتتر، کە ماریش هیچ نەبێ کاژێکی هەیە.

پێخواس لەسەر بەفری زستانێ ریز کراون، ئێستاش لە بەر قرچەی هەتاوی هاوینێ ریز دەکرێن.

بۆلیباشا واتە کوێخای هەوارگە، ناوی بۆلاك بۆلانچێئایە. لە تەمەنی ئاغادا دەبێ و نابێ و قەڵافەتیشی هەر هێندەیە، بەڵام ئەموستی بۆلیباشا پڕن لە ئەموستیلەی زل و پان و قورس و، لە ئەنگوستی ئارگیر ئاریزانیش ئەستوورترن.

بۆلیباشا پێخواس نییە. چەکمەی لە پێدایە و هەتا بن ئەژنۆی هاتوون. لای بەلەکی سکەی زیوی لێ دووراوە، وا چڕیش لێی دراوە، کە بنیادەم هەست دەکا ملیوانی چەکمەکانی هەر لە زیو دروست کراون. سکەکان وردە وردە سواون و بوونەتە کۆنە سکەی زیو. ناڵچەی چەکمەکانیشی لە زیوە. پانتۆڵەکەی پەشمینەی خالیسە. پاڵتۆیەکی بەرچەرمین لەبەر دەکا، کە نە قۆڵی هەیە و نە شاقەل و قۆپچەکانیشی زیون. کڵاوە هەشتەرخانەکەی پەڕدارە و دێتە سەر گوێچکەی. بەردەوام قەمچییەکەی بەدەستەوەیە.

دەسەڵاتداری هەوارگەکە بۆلیباشایە. ئاغا تەنانەت چاوێکیش لە دۆمەکان ناکا. هەر کارێکی هەبێ لەگەڵ بۆلیباشا رێك دەکەوێ. وەك ئەو سەربازانەی کۆیلەئاسا خۆی بۆ ماندوو دەکەن، کە لەسەر هەموو شتێکیشیان لەگەڵ بەرپرسە سەربازییەکەی ئەڵمانییەکان لە تۆرنۆ رێك کەوتووە. جگە لەوانەش، تەنانەت هەقی ماندووبوونەکەشیان لەسەر یەك دەداتە

بۆلیباشا، که ئەویش بەشی خۆی لێ هەڵدەگرێ و ئەوی دیکەشی دابەش دەکا بەسەر ئەو دۆمانەدا که کاریان کردووە.

بۆلیباشا کابرایەکی دەوڵەمەندە و لەو هەوارگەیە هەر ئەو تێروتەسەلە. بەو حاڵەشەوە منداڵەکانی وەك باقی دۆمەکان پێخواس و قوون ڕووتن. ژنەکەشی وەك دۆمەکانی دیکە پێخواس و شڕەپۆشە. بەڵام بۆلیباشا ئەوەندەی چاکە بۆ ژنەکەی هەیە کە کاری قورسی پێ ناکا. دەینێرێتە لای ژنە گوندییەکان بۆ ئەوەی وەك بەربێژان، هەقایەتی خۆش و شیرینیان بۆ بگێڕێتەوە. دیارە ئەویش بە خۆڕایی نا، بەڵکو بە گەنمەشامی و ئاردی گەنم.

ئێستا بۆلیباشا قەمچییەکەی خستووەتەوە شریخ و هۆڕ. لە لای عەمبارەکانیشەوە گوێت لە ویزە و شریخەی قەمچییەکەی دەبێ و، دۆم وەك مار و مێروو بە مەزراکەدا بڵاو دەبنەوە.

دۆم بۆ ئەوەی لە هەوارگەکەیانەوە کە لە خڕەکەدایە خۆیان بگەیەننە کێڵگەکان، ناچارن بە سینگەخشکێ و گاگۆڵکێ لە هەورازە رژدەکە وەسەر کەون و خۆ بە بەرد و پنچکانەوە بگرن و بێنە سەر. دیارە بزنەڕێیەکیش هەیە، بەڵام هەر بۆلیباشا بۆی هەیە بەوێدا بڕوا. دۆم بەر لەوەی مل بنێنە کاری رۆژانەیان، دەبێ وەبیریان بێتەوە و هەست بکەن کە ژیان هەر بەراستی، واتە کاری تاقەتبڕ و سامناك.

من و ئاندرێی دێینە سەر لێواری هەڵدێرەکە. دۆم وا خەریکن بەرەو سەرێ دەخوشێن و بە چنگەکرە دێنە سەر. بۆلیباشا لەو سەرەوە چاوەڕێیانە. سواری ئەسپێك بووە دەڵێی قەیتەرانی رەشە. جار نە جارێك قەمچییەکەی لە پشتی رووتی یەکێك لەو دۆمە داماوانە رادەکێشێ و، ئەو داماوەش دەست بە جێی قەمچییەکەوە دەگرێ و را دەکا.

بۆلیباشا زۆر کەسی متمانەپێکراوی هەیە کە چاویان بەسەر خەڵکەکەوەیە. ئەوانە بۆ هەر کەسە و گەوزێك دیاری دەکەن کە دەبێ بژاری بکەنز دۆم ناچارن بەسەری پەنجەیان بە نێو کێڵگەکەدا بڕۆن، نەکا بەرهەمەکە پێخوست بکەن. گژ و گیا و دڕك و داڵ کە لاسکە درێژەکەیان پڕە لە دڕکی رەق و تیژ و وەك دەرزی بە دەستدا رۆدەچن، دەگرن و بە پارێزەوە هەڵیدەکێشن کە نەکا گەنمێکیشی لەگەڵ هەڵکێشرێ. ئەوەی هەڵیانکەندووە، دەبێ بە باوەش هەڵیگرن و هەر کە باوەشیان پڕ بوون دەبێ بیبەنە دەرەوەی کێڵگەکە. دەستی رەشی دۆمەکان هەمووی شەلاڵی خوێن دەبێ. سینگ و باسیکیشیان هەروەتر. ئاغا تەنانەت بە سێرەی چاویش سەیریان ناکا. ئەو هەر سەیری ژنەکان دەکا، ئەویش چەندە چاوبرسیانە و حیزانە.

بۆلیباشا وەبەر قەمچییان دەدا.

پیاوەکانی بۆلیباشاش هەروەتر.

دڕك و وشتراڵوو بە دەستی رووت بژار دەکرێن.

گەنمەکە لە خەرمانکوتەوە، پاکوخاوێن دێتە دەرێ.

رۆژەکان، شین و ساماڵ تێدەپەڕن، لە بن میچی ئاسمانێکی قووڵ و بەریندا.

شەوەکان، رەش و دووکەڵاوی تێدەپەڕن، لە بن ئاسمانێکی هەروا قووڵ و بەریندا.

قەمچی وەك تفەنگی شەشلوول شریخەیان دێ. جا چونکە جگە لە چیاکانی بۆلگاریا تا ئاسۆ هیچ گردێکی لێ نییە کە زایەڵەی شریخەی قەمچییەکان تێیدا دەنگ بداتەوە، لە پاناوکی دەشتەکەدا ون دەبێ.

قەمچی شریخەیان لێ هەڵدەستێ. قەمچیی چاودێرەکانی بۆلیباشا و کوێخاکانی ئاغا.

قەمچی بەسەر هۆزی ئەو دۆمانەدا کە درِك و وشترالّوو دەسکەنە دەکەن، دەشریخێنیٚ و بەسەر شان و ملی ئەو بنیادەمە رەشانەدا دێتە خواریٚ کە هاتوون لە کەوشەنەکانی ئاغادا کار بکەن و، لە شانوملی پالّەی هەشت گوندیش دەئالّیٚ.

لەو مەزرایانەدا کە بژارکردنەکەیان بە دیلەکان ئەسپاردووە، لە بری قەمچی، جنێو و قسەی ساردوسووکی پاسەوانەکان دەباریٚ.

ئەو بەندییانەی کلاّوی سووریان لەسەرە، لەگەلّ تاوهەلاّت و خۆرئاوابوون سوژدە دەبەن. ئەوان نوێژ دەکەن و ئەوانیتریش گالّتەیان پیٚ دەکەن:

ـ لە خۆرِا نوێژ دەکەن برالە. مەلا و ئەلّلاّ ئێوەیان لەبیر نەماوە. ئەلّلاّی ئێوە و خوای ئێمە ئێستا کێشە و گرفتی دیکەیان هەیە. لە پەنجەرەکانی ئاسمانەوە چاویان برِیوەتە مەیدانەکانی جەنگ و لە ناخی دلّیانەوە بە کەریٚتیی ئێمەی بنیادەم پیٚدەکەنن. شێت بووین و ملمان لەبەر ملی یەکتر ناوە و خەریکین یەکتر دەخکێنین و یەکتر دەخۆین و، ئینجا لەسەر چی؟ دەی باشە، سەیری ئەو ئاغایە بکەن: پارووی لە رۆندا بوو. کە بۆلگارەکان بەسەر ولاّتدا زالّ بوون، لە ترسی ئەوەی نەکا ملّکەکەی تێك بدەن، هەستا چووە لای ئەفسەرەکانی دوژمن، بەزمانی بۆلگاری دواندنی و سفرەی شایانەی بۆ رازاندنەوە. دۆمە گۆرانیبێژەکانی بۆ بانگ کردنە کۆشك. کۆرِی خواردنەوە و رابواردنی بۆ گەرم کردن و بەرژەوەندەکانی پارێزران... چەند رۆژ دواتر ئەلّمانی هاتن. ئاغا دیسان دەستی پیٚکردەوە و دەمرِاستەکەی خۆی ناردە هەوارگەی دۆمەکان بۆ ئەوەی کام کچ جوانە ئەویان بۆ بنێرێتە کۆشك بۆ ئەوەی کۆرِی رابواردنی ئەفسەرە ئەلّمانییەکان لە هیچی کەم نەبیٚ و لەگەلّ کچە دۆمەکان خۆشی رابوێرن... ئاغا

کابرایەکی ناسکە. چاویلکەیەکی یەکچاو دادەنێ. دنیای تەقاندووە و بە زۆر زمانان قسە دەکا. چاوە شووشەییەکەی لە بن چاویلکە یەکچاوەکەیدا دەشارێتەوە. ئەو چاوەی لەوبەری دەریاکان کوێر بووە. ئەودەمەی بۆ راوی ئاژەڵە دڕندەکان چووبووە وڵاتە گەرمەکان... ئەو بنیادەمانەی لە وڵاتانی دیکەوە هاتوون و وڵاتەکەی ئێمەیان داگیر کردووە، ئەو بنیادەمانەی ئێمەیان ناچار کرد تەقەیان لێ بکەین و خۆشیان تەقەیان لە ئێمە کرد، ئەو خەڵکەی کە دوژمنی ئێمەن، ئاغا بە دوژمنیان دانانێ. ئەڵمانی هاتن، ئاغا چووە پێشوازیان. بە زمانی خۆیان قسەی لەگەڵ کردن و ئیتر ئەڵمانیی سەگبابیش بەرژەوەندی ئەویان پاراست و بگرە کۆیلەی بێ هەق و مزیشیان لەبەر دەستی دانا. هەر بۆوەی ئێوە بڵێن ئێمە لە کۆمەڵە کۆیلەیەك زیاتر چیین؟ لە جێی ئەوەی کە رۆژ هەتا ئێوارێ گیانمان بۆ ئاغا لەسەر لەپی دەستمانە و کاری بۆ دەکەین، چیمان دەدەنێ؟ حەفتەی چەند گەڵا تووتن و هەر شەوەی قاپێك تاماو و لەتێك ماماليگا... لەوەندە ئێسك و پێستە زیاتر چیمان پێوە ماوە؟

ـ کەواتە ئەو خوا عادل و بەخشندەیە کوا ئیلیێ؟ کوا ئەو خوایەی تۆ دەیپەرستی و نوێژی لە دەرگاکەی دەکەی؟ محەمەد ئەڵڵای تۆ کوا؟  کوا ئەو ئەڵڵایەی دەڵێ پشت و پەنای داماوانم.؟ کێ ئاگای لە ژن و منداڵەکەتە؟ هەر بەراستی محەمەد، چەند منداڵت هەیە؟

ـ چوار منداڵ... خوا بیانپارێزێ.

ئیلیێ، سەربازێکی خەڵکی مۆلداڤیایە، ئاخێك هەڵدەکێشێ و دەڵێ: منیش سێ منداڵم هەیە.

لەگەڵ زیندانییەکان بوومەتە برادەر. بەینمان خۆشە. زۆربەی کاتەکانم لای ئەوانم. هەر بزانم کوێخا دوور کەوتووەتەوە، لە دەم مەزراکە رادەوەستین و مل دەنێین لە قسان. یانی ئەوان دەست پێدەکەن و من گوێ رادەگرم. لە قسەکانیانرا، زۆر شتم لەسەر ژیانی گوندەکانی مۆلداڤیا بۆ روون بۆتەوە. هەندێکیان خەڵکی ناوچە کوێستانییەکانن، هەندێکیشیان هیی دەوری گردۆلکە و دەشتەکان.

ئەو زیندانییانەی خاچەکەیان هیی دۆبرۆجایە، دەگێڕنەوە، کە لە وڵاتی ئەوان زۆربەی گوندەکانیان لە هەموو جۆرە نەتەوەیەکیان تێدا دەژی، رۆمانیایی و تورك و تەتەر و سلاڤ، بە ئارامی پێکەوە دەژین. هەر کەسە و زمان و نەریتی خۆشی پاراستووە. کەسیش کاری بەسەر کەسەوە نییە.

ئیۆنیت زاکاریا دەڵێ:

ـ گوندەکەی ئێمەش بۆلگاریی تێدایە.

ـ ئەی پێکەوە بەشەڕ نایەن؟

ـ جا بۆ شەڕ بکەن؟ هەر کەسە و زەوی و خانوو و ئاژەڵ و خەم و شادیی خۆی هەیە. تەنیا ساڵی ١٩١٣ بوو کە تۆزێك ناخۆشی لە گوندەکەمان پەیدا بوو. بۆلگارییەکان کە بیستیانەوە قەول وایە لەگەڵ بۆلگارییەکانی بۆلگاریا شەڕ بکەین، ملیان نەدەدا. دیارە ئێمە خۆشمان ئەو شتەمان پێ ناخۆش بو. بۆ چما نەگبەتی لەوە گەورەتر هەیە کە بنیادەم بچێ فیشەك بە کەسانێکەوە بنێ کە نە دەیانناسێ و نە قەت دڵی لێیان ئێشاوە، یان لە خت و خۆڕایی خۆی بەدەستی ئەوان بداتە کوشت؟ دیارە ئەوە نەگبەتییەکی گەورەیە. بەڵام خۆ بڕیاری ئەو شتانە

به دەست ئێمە نییە. لەو شتانەدا خەڵکی دیکە لە بری ئێمە بڕیار دەدەن. ئەودەم، وەك ئەم جارە جەندەرمەیان تێ بەرداین و لە ماڵەکانمان هێنایانینە دەرێ و ناردیانینە جەنگ...

دەی باشە، ئەگەر ژیر بوایەین و توانیبامان قسەی خۆمان بکەین و پشتی یەکتر بگرین و خۆمان بڕیار بدەین، ئیدی هەڵنەدەستاین بچین لە خت و خۆڕایی بەگژ بۆلگارەکاندا بچینەوە. ئاخر بۆچی دەبێ کاری وا بکەین؟ دەی باشە چیمان دەست کەوت؟ کۆلێرا...

منیش شان بە شانی دۆمەکان و ژن و منداڵەکان لە مەزرایە کار دەکەم. چاودێرەکانی بۆلیباشا دەست لە من هەڵناهێننەوە. چاودێرەکانی ئاغاش هەروەتر. من پاڵەیەکم کە هەموو کارێکم پێ دەکرێ. ئاخوڕان خاوێن دەکەمەوە، گەوڕان دەماڵم، بۆ لێنانی ماماڵیگا و دابەشکردنی سوپ بەردەستیی چێشتلێنەرەکە دەکەم. لە کار ماندوو نابم. بۆم باشە. زۆر شت فێر دەبم کە دواتر بەکارم دێن. جگە لەوانەش، لەگەڵ تاڵی و سوێریی ژیان رادێم.

دۆم بە جنێو و تێهەڵدان زویر نابن. گوێشیان پێی نابزوێ. پشت و دەست و لاقیان بەردەوام خوێناوییە. بە زمانی خۆیان تووك دەکەن و دوایی بە زمانی خۆیان گۆرانی دەڵێن. زۆربەی شەوەکان دەچمە هەوارگەکەیان بۆ ئەوەی بزانم چۆنن و سەعاتێك لەلایان دەمێنمەوە. لە پێشدا خۆیان لێ دەبواردم و لێم دوور دەکەوتنەوە، بەڵام کە زانییان ئاساییە نانیان لەگەڵ بخۆم و وەك خۆیان لە دەم ئاگرەکە هەڵتووتەکێم، وردە وردە وەك یەکێکی خۆیان سەیریان کردم. تەنانەت لەگەڵ کوڕێژگەیەکیان کە زۆر لە خۆم گەورەتر نییە بوومەتە برادەر. ناوی تاناسێیە. خوشکێکی هەیە بە ناوی کیرا. پێم وانییە تەمەنی لە سێزدە زیاتر بێ، بەڵام هەژدەساڵانە

دیارە. چاوی شینن و پێستی قاوەییەکی مەیلەوزەردە. دەخزێتە نێو خێوەتەوە و بە گیۆکێی[*] داپیرەیەوە دێتەوە دەرێ. سەدەفێکی گەورەی بریقەدار کە لێوارەکانی وەك پەلکە گوڵێکی سەیروسەمەرەی ژاکاو دەرکەوتووە.

لەسەر گژ و گیاکە لە تەنیشت من رادەکشێ و پێم دەڵێ:

ـ گیۆکێکە بە گوێچکەتەوە بنێ.

پێوەی دەنێم.

هیچ نابیستی؟

ـ بۆچی. گوێم لە دەنگی دەریا دەبێ. لە دوورەوە. هەر دەڵێی دەنگی ئاوێکە لە نێو گابەرداندا کەف بچرێنێ.

ـ ئاخر ئەم گیۆکێیە هیی دەریای سوورە. بەر لە جەنگ لەگەڵ هۆزەکەمان بە دنیادا دەگەڕاین. تەنانەت جارێکیان تا مەملەکەتی تورکانیش چووین. من ئەودەم زۆر منداڵ بووم. ئێستا ئیتر سەفەری وا قەت ناکەینەوە. بۆلیباشا ئێمەی بە ئاغای ئێرە فرۆشتووە. ناچارە تا ئەو دەمەی جەنگ هەیە، لێرە کارمان پێ بکا... دەتەوێ ئایندەت لە گیۆکێدا ببینم؟

ـ ئەی چۆن نامەوێ؟

ئاگری بن مەنجەڵی ماماڵیگا و شلەگیایەکە سوور دەچێتەوە. خۆر دەمێکە ئاوا بووە. ئاسمانی ژوور سەرمان نوقمی ئەستێرەی بچووك بچووکی زەرد و سوورە. کیرا بەژن و باڵایەکی

---

[*] Guioc گوێ ماسیلکەیەکی گەورە یان شتێکی فەخفووری وەك گوێماسیلکە، کە دۆمەکانی ئەورووپای ناوەندی پێیانە و بەوشتە بەربێژی دەکەن.

تیشکەڵەی هەیە و بەلەکی بەرز و ڕێکن. بەسەر گیۆکێدا دەنوشتێتەوە کۆمەڵە وێردێك دەخوێنێتەوە و هەندێ جووڵەی پڕ نهێنی دەکا.

ـ تۆ تەمەنت پازدە ساڵانەیە. گیۆکێ وا دەڵێ.

ـ بەڵێ. پازدە ساڵانەم.

ـ چاوت کاڵن. گیۆکێ وا دەڵێ.

ـ جا خۆ کەس ناتوانێ چاوی خۆی ببینێ.

ـ دەی باشە وایە... گیۆکێ دەڵێ تۆ لەم بیابانەدا بەتەنێ دەژیی.

ـ بەتاقی تەنێ.

ـ تۆ وەك کوڕەکانی دیکە نی. گیۆکێ وا دەڵێ.

ـ وەك ئەوانی دیکە نیم دەزانم. من شەلم.

ـ حەز دەکەی کچێك لە باوەش بکەی.

ـ دەی دیارە پێم خۆشە.

ـ کچە دۆمێك.

ـ بەڵێ کچە دۆمێك.

ـ بەڵام ناوی کیرا نییە. چونکە کیرا دەسگیراندارە.

ـ مارەیان کردووی؟

ـ ئەی چۆن، دەسگیرانم هەیە.

ـ کێیە؟

ـ کوڕەدۆمێکی ژیکەڵەیە.

ـ ئاخ، کیرای ناجسن، پێدەکەنێ. قاقا پێدەکەنێ و هەموو ددانەکانی دەردەخا. ددانە وردەکانی دەڵێی کولووی بەفرن. بڵێسەی ئاگرەکە روخساری رووناك کردووەتەوە. منیش بۆ ئەوەی لە گەمژە و حۆلان نەچم، قاقا پێدەکەنم.

ئەگەر راستیت دەوێ سەرەدەر دەرناکەم و نازانم چ باسە: کیرام خۆش دەوێ و وەختێك لەلای دادەنیشم، لەو زیاتر هیچم لە زەین و مێشکدا نییە و جیا لەو کەسم خۆش ناوێ، بەڵام کە زامبیلا دەبینم، زامبیلام زیاتر خۆش دەوێ، خۆ ئەگەر بە دەست خۆم بوایە زامبیلام دێنا...

کە لە شاری رەوشیدەودێ بەردەستی بانیکا بووم ـ کە ئەم پاییزە رێك ساڵێکی بەسەردا تێدەپەڕێ ـ کچێکم خۆش دەویست کە باوکی لە لاکۆڵانێکی سەر رێی نێوان دووکان و ماڵی ئاغاکەم قاوەخانەیەکی بچووکی هەبوو.

هەندێ جاران کچۆڵەکەم دەدی لە لاشیپانەی دەرگای قاوەخانەکەدا راوەستاوە. چاوی سەوز و روخساری خڕ و سپیلکەڵە بوو. کە منی دەدی پێدەکەنی.تەنانەت شەوێکیان دوو قەیسیی گەیویشی دامێ و گوتی: ها بیخۆ، من ناوم زۆئیکایە.

ژنێك لە پشت دەخیلەکەوە بە دەنگێکی جیکن بانگی کرد. دواتر بیستمەوە بە ساوایی هەڵیانگرتووەتەوە و قاوەچی گەورەی کردووە و ئێستا دەفرشۆری دووکانەکەیە. ئەو ژن و پیاوەی بۆی ببوونە دایك و باب، بە بیانووی پەروەردەکردنی ئەوەندەیان لێ دەدا وەك مردووی لێ دەهات. هەموو رۆژێ تێهەڵدانێکی هەبوو. ئیتر لەبزم دە لەبزی هیچ کچێکی دیکە نەگەڕا، کە وەك ئەو سپیکەڵە بێ. قەت لەبیرم نەکردووە. جاری وایە دەنگی لە گوێچکەمدا

دەزرینگێتەوە و وەدەزانم لەلامە، جاری واشە پێکەنینەکەی وەك خەونێك دێتە بەر چاوم و دەنگی دێ دەڵێ: "ها بخۆ، من ناوم زۆئیکایە."

قەیسیەکانی شیرین بوون و باش گەیشتبوون.

تائاسێ هەر بۆ بەدفەڕی لێم دەپرسێ: لە گیۆکێدا داهاتووتی دیت؟

ـ ئەدی دیتی.

ئینجا سێ کەسی قاقا پێدەکەنین.

کیرا دێتە دەرێ: ئەگەر لە سەر عەمبارەکان بمێنیتەوە، پاییزێ بۆ زەماوەندەکەم لێت دەگێڕمەوە.

ـ پێم وایە دەمێنمەوە.

ـ ئەم پاییزە زەماوەند دەکەم.

لێی ناپرسم لەگەڵ کێ.

ئەو ژنە دۆمە قەڵەوە کورتەبنەیەی مامالیگاکەی لێ ناوە و ئێستا زەرد و داغ لە مەنجەڵەکە هێناوێتە دەرێ و لەسەر مێزە پێچك کورتەکەی داناوە، بانگمان دەکا:

ـ دەی یاڵڵا وەرن بخۆن.

لە دەوری مێزەکە دادەنیشین و مل لە خواردن دەنێین.  شلەکە زۆر بەتام و خۆشە.

ـ چەقالەم تێ کردووە.

لە ماڵی خۆشمان، دایکم شلەی پنگەی بە چەقالەوە لێ دەنا. من خۆم چەقالەکانم بۆ لێ دەکردەوە. کە دەچوومە سەر دارەکە، بۆخۆم تێرم دەخوارد. ئەوەندەم دەخوارد تا ددانم ئاڵ

دەبوونەوە. سەرەتاکانی بەهاریش ئەو جیوەیەم دەخوارد، کە لە توێکڵی دار هەڵوچە و قەیسییەکانەوە دەهاتە دەرێ. دیسان هەر باش بوو.

ـ بۆت تێکەمەوە داریە؟

ـ بەڵێ بۆم تێکەوە.

بە چنگەکڕێ و گاگۆڵکێ لە خڕەکە دێمە سەرێ. چنگ لە پنجك و بەردان گیر دەکەم و دەست دەکوتم و ڕێگە دەدۆزمەوە. تا دەگەمە سەرێ، بڕستم لێ دەبڕێ.

لە تاریکاییەکەدا سێبەرێك بەرەوڕووم دێ.

خەنجەرێکی دەسك شاخی دەبانم پێیە و لەوەتەی لێرەم هەر پێم بووە و لە بەر پشتێنمدایە و لە کالانە چەرمییەکەیدا.

دەستم لە سەر مشتووی خەنجەرەکە دادەنێم و دەپرسم کێی؟

ـ بنیادەمێکی بێ زەڕ.

هەنگاوێك دەچێتە دواوە و دیسان دێتەوە پێشێ: ـ دەمەوێ دوو قسەت لەگەڵ بکەم.

ـ فەرموو بزانم.

ـ واز لە کیرا بێنە.

پێی دەڵێم بێتە پێشێ. دێتە پێش. هەنگاوێك لەولامەوە رادەوەستێ. دۆمێکی گەنجە، تاوەسووت و لەڕ، دەیناسم. چیی وای لەبەردا نییە.

پێی دەڵێم: دەی باشە با قسە بکەین.

ـ باشە..

ـ تۆ دۆدۆلیکا نیی؟ دۆدۆلیکای ئاسنگەر؟

ـ با، بۆخۆمم.

ـ جا جوان و زەریف گوێ راگرە و چاوی خۆت خورد بکەوە دۆدۆیکا. من هیچ کارێکم بە کیرا نییە. یانی نەك بەو، بە هیچ کەسی دیکە. هەر بیریشم لەو شتانە نەکردووەتەوە.

ـ بەڵام تۆ هەر دەچیتە لای کیرا. دەچییە رەشماڵەکەی. تەنانەت زۆریش دەچی.

ـ من دەچمە لای تاناسیێ نەك لای کیرا.

ـ بەڵام لەگەڵ کیراش قسان دەکەی.

ـ ئا، وایە قسەی لەگەڵ دەکەم.

ـ دەسگیرانی منە.

ـ پیرۆزباییت پێ دەڵێم. کوڕێکی بەغیرەت دیاری. هەتا لای عەمبارەکان لەگەڵم وەرە دۆدۆلیکا.

لە من گەورەترە. ئەوپەڕەکەی دەبێ حەڤدە یان هەژدەساڵانە بێ.

ـ کیرا لێی گێڕاومەتەوە ئەگەر پاییزێ لێرە بم بێمە زەماوەندەکەتان.

ـ یانی دەتەوێ لێرە بڕۆی؟

ـ چووزانم، لەوانەیە.

ـ ئێمەش دەڕۆین، هەر جەنگ تەواو بێ دەڕۆین. بۆلیباشا تا جەنگ دەبڕێتەوە، ئێمەی لەو زەوییانەی ئاغا بەستووەتەوە.

ـ دەترسی کیرات لەکیس بچێ؟

ـ کوێخا ئاندرێی بە دەوریدا دێ.

ـ پێی دەڵێم بکشێتەوە.

ـ ئەگەر دەست هەڵنەگرێ، هەر بینا شەوێك چەقۆیەکم لە نێو شانی دا.

ـ یانی کیرات ئەوەندە خۆش دەوێ، ئامادە پیاوی لەسەر بکوژی؟

ـ بەڵێ راست وایە.

ـ خۆشی ئاگادارە؟

ـ ئەی چۆن ئاگادار نییە. هەر بۆیە حەز دەکا داغم بە دڵەوە بنێ. با بیگوێزمەوە جا پێی دەڵێم پووتێك چەند کیلۆیە. هەموو رۆژێك چەخسێکی تێهەڵدەدەم.

ـ جا باشە بۆ تێی هەڵدەدەی؟

ـ چونکە ژن دەبێ تێی هەڵدەی.

ـ بۆ مەگەر خۆشت ناوێ؟

ـ رێك بۆیە تێی هەڵدەدەم.

ـ ئەویش سیحرت لێ دەکا کە لێی نەدەی.

ـ سیحر؟ ... ئەوە ئێوەن بڕواتان بە سیحرە. ئێمە دۆمەکان بڕوامان بەو شتانە نییە.

لێك دادەبڕێین. مەزراکان لە بەر بایەکە کەروێشکە دەکەن و، خشەخشەکەیان لە دڵی شەوەکەدا دەنگ دەداتەوە. مانگ، خڕ و سوور هەڵدێ.

ـ بێت و کوێخا ئاندرێی بەدەوری کیرادا بێ، دەیکوژم.

❊

*

*

لێرە، نە نامەیەك دێ بۆ عەمبار و نە رۆژنامەیەك، بەڵام بەردەوام كۆمەڵە هەواڵێك دێن. هەر دەڵێی "با" خەبەرەكان دێنێ و ئەگەر با نەبێ شنە و، دیارە خەڵكی گوند و زیندانییەكانی بێگار هەر لەو رێیەوە زانیویانە كە لەوبەری بەرەی مۆلداڤیا لە رووسیا كرێكارانی كارخانەكان و سەرباز و جووتیاران كە لە جەنگ وەزاڵە هاتبوون، راپەڕیون و دەستیان بە خۆپیشاندان كردووە.

ئانتۆن دیكۆی سەرباز، كە خەڵكی یەكێك لە گوندەكانی مۆلداڤیایە، دەڵێ:

ـ ئێمەش ساڵی ١٩٠٧ راپەڕیین. جا چونكە نەماندەزانی چۆن دەست بدەینە دەستی یەك و وێكڕا راپەڕین، ناچار باجی ئەو نەزانییەمان بە خوێنی خۆمان دا. راپەڕینەكە كە دامركایەوە، جا وەرە ئاغا لە گوندی بەربوون و لە گوندان كێیان پێ خۆش بوو كوشتیان.

مائۆلێ سێیۆ، سەربازێكی دیكەی خەڵكی باكووری مۆلداڤیا دەڵێ:

ـ لە ئاوابییەكەی ئێمە پاش شۆڕش، وەزعمان زۆر لە ئەوەڵێ خراپتر بوو. ژیان ئەستەمتر بوو و چاكردنەوەی ئەو وێران و كاولكارییانەی لە سێ چوار رۆژی شۆڕشدا دروست ببوو، زەحمەتەكەمانی سەد هێندە كرد. جا دەزانن كاولكارییەكان چ بوون؟ خۆ ئێمە تەنیا چەند خەرمانە كایەكمان ئاگردابوو. ئاخر كە گەیشتینە كۆشكەكەی ئاغا، سەرباز هەموو لەوێ بوون، بەڵام ئێمەیان بە راپەڕیو حیساب نەكرد. ئاغا لە گوندەكە مەیخانەیەكی كردبۆوە كە هەندێ لە خەڵكی ناوچەكە هەرچی پەیدایان دەكرد، دەیان برد لەوێ خەرجیان دەكرد، بەڵام

زۆر کەسیش، وەك چۆن جنۆکە لە بیسمیلا دەترسێ، ئاوا خۆیان لە مەیخانەکەی ئاغا دەپەراست. تەنانەت بۆ ئەوەی هەر نەچنە ئەوێ، منداڵەکانیان دەنارد تووتنیان بۆ بکڕێ و ئاغاش رقێکی قورسی لەوانە هەڵگرتوو و لە بیانووەك دەگەڕا پێیان بڕێژێ. جا ئێستا دەرفەتەکەی بۆ رەخسابوو کە تۆڵەیان لێ بکاتەوە و کردییەوە. ناویانی لەسەر کاغەز نووسی و گوتی ئەمانە خەڵکیان دنەداوە راپەڕن. جا لە سەرووی هەمووانەوە ناوی مامۆستاکەی گوندی نووسیبوو. چونکە ئەو بەردەوام خەڵکی ئامۆژگاری دەکرد و دەیگوت بەلای مەیخانەکەی ئاغادا مەچن. دیارە نە خەڵکەکەیان بردە دادگا و نە مامۆستاش. ئەفسەرەکان هاتن و ئەوەندەیان لێ دان پشتیان لە زگیان نەرمتر کردن و ئاوا شەلاڵی خوێن و بە قۆڵبەستراوی و بە کۆت و زنجیرەوە بە ئاواییاندا گێڕان و دواییش لە بەر دیوارەکان ریزیان کردن و گوللەبارانیان کردن.

دراگۆبیرترۆفیم، سەربازی یەدەگە، ئەویش دێتە نێو قسەکانمانەوە:

ـ من پیاوێکی تا بڵێی بە تین و تاقەت و بەهێز بووم کە ئەودەم کابرا نەیدەتوانی هێز و وزەی خۆی بۆخۆی راگرێ. ئێستا ئەوە دەساڵێکی بەسەردا تێپەڕیوە... پاش ئەوەی جوان بیرم لێ کردەوە و زانیم دەبێ چ بکەم، هەستام و چوومە نێو شۆڕشەکەوە. بە گیان و دڵ تێکۆشام. لە دڵی خۆمدا گوتم: دەی جا ئەمجارە کاتی هاتووە لەگەڵ ئاغا لێکی دەربکەین و هەر واشمان کرد، هەر نەبێ ئاغای گوندەکەی خۆمان و هەر لە گوندەکەشماندا... تازە شۆڕشەکە هەڵاییسابوو. ئاغا خۆی بە ئازا زانی. هیچ نەترسا، بیری لە خۆشاردنەوە و راکردن نەکردەوە. کە خۆمان بە کۆشکەکەی داگرت، لەسەر پلیکانەکان راوەستابوو و سەیری دەکردین، پرسیی:

ـ ها جوامێرینه، چیتان دەوێ؟

ـ زەویمان دەوێ، چونکه ئەوەی له سەر زەوییەکان نیوەگیان دەبێ ئێمەین، بەڵێ، زەوی، باشتره سیپاڵت کۆ بکەیەوە و بڕۆیته شار.

ـ بڕۆم؟ باشه بۆ؟ ئاخر زەوییەکەی هیی منه.

ـ ئیتر نییه. زەویی تۆ نییه. ئێستا زەوی و زار هیی ئێمەیە.

پێی گوتین: کەرینه، مەملەکەت قانوونی هەیە.

ـ ئەو قانوونه ئێمه قوونمانی پێ دەسڕینەوە. ئەو قانوونانه "قانوونی مەملەکەت" نین، "قانوونی ئاغاکان"ن. ئەوانه ئاغاکان دایاننناون و بۆخۆیانیان داناون.

هرووژمان بۆ برد. تاپڕێکی له کن خۆی دانابوو. تەقەی له خەڵکەکه کرد. دوو ژن وەعەرزی کەوتن. یەکێکیان ژن من بوو. کەس نەکشاوە، بگره زیاتر بۆچی چووین و خۆمان پێدادا و رامانکێشایه حەوشەکه و به دار و تێلا تێی بەربووین و خزمەتیمان کرد. بۆ سبەینێ سەروسەکتی تۆپ پەیدا بوون. هەموو رووومان کرده جەنگەڵەکه و لەوێدا خۆمان شاردەوە. حەفتەیەکی رەبەق تۆپ هەر گرمەیان هات و که بێدەنگ بوون، ئیتر گوندەکه ئاداری بەسەر پادارییەوە نەمابوو. سەرانسەر سووتابوو و کاول ببوو. ئینجا گەمارۆیان داین و هەموومانیان گرت. پێنج ساڵی رەبەق له بەندیخانەی کاری تاقەتپڕووکێن بووم.

ـ بێت و له رووسیا خەڵك بتوانن شۆڕشەکەیان بەئاکام بگەیەنن، لەوانەیه ئێرەش بگرێتەوە. بێت و وابێ، لەوانەیه ئێمەش بتوانین چوار پێنج رۆژێك له ژیانماندا به ئاسوودەیی بژیین.

ـ ئەوان هەر سەردەکەون و دەگەنە ئاکام. ئاخر سەربازەکانیشیان لەگەڵە. چەکیان پێیە و حکوومەتیشیان رووخاندووە. ئیمپراتۆریش ترِی ئاخری کەندووە.

ـ جاری وایە جەنگ دەبێتە هۆی ئەوەی ئیمپراتۆرەکان هەڵپەسێردرێن.

بەندییەکان هەر وا لە دەوری ئاگرەکە لەسەر چیچکان دانیشتوون. هەوا گەرمە. هاوین داهاتووە. بەڵام دڵیان لە ئاگرەکە نابێتەوە. کە لەبەر ئاگر دادەنشین، کەمتر هەست بە تەنیایی دەکەن. ئاگر زیندووە، وەك دڵێکی لێ بدا.

ـ ماراندا لە ماڵەکەی ئێمە لە دۆبرۆجا، بەتاقی تەنێ چیی پێ دەکرێ؟ چیی لە دەست دێ؟ بە چوار منداڵی سەروپێچکەو لوێچێ ئارد و گەنمەشامییەوە بەجێم هێشت و بە ئەمانی خوام ئەسپاردن. منداڵی پێنجەمیش بە رێگاوە بوو. نازانم کورِ بوو یان کچ. حەزم لێ بوو کچ بێ. ئاخر سیانەکەی دیکەم کورِن... هەڵبەت ئەگەر ژیابێ.

کەس وەڵامی ئیشتراتێ ناداتەوە. کە نازانێ هەر بەراستی ماراداان ــ ئەگەر هێشتا مابێ، ئەگەر لەو جەنگانەی وا لەوێ کراون بە چوار منداڵەکەیەوە تێدا نەچووبێ ــ لە دۆبرۆجا، لەو کوێرە دێیە، چیی لە دەست دێ؟

هیچ کەس ئاگای لە کەسوکارەکەی نییە. ئیشتراتێ خۆشی چاوەڕێ نییە کەس وەڵامێکی بداتەوە. ئەوەندەیە ئەو خەیاڵەی بە مێشکیدا هاتووە بە دەنگی بەرز گوتوویەتی. ئەو خەیاڵانەی لە ناخەوە دەیکرۆژن و دەیخۆن و دەیکرووسێننەوە و دەیتوێننەوە. ئەو خەیاڵانە بە مێشکی هەمووواندا دێن.

یەکی دیکە هەڵدەداتێ:

ـ دوێ شەوێ لەخەونمدا بە کەڵەکێك لە چۆمی بیشتریتزاوە بە چیاکانی لای خۆماندا (نێئامتس) دێمە خوارێ. گەیشتبوومە نزیك تەنگەڵانەکەی تۆئانچێ. گوێم لە شڵپ و هۆڕی شەپۆلان دەبوو. خۆمم توند گرت. ئاخر کەڵەك ئەگەر بێت و جوان و ڕێك نەبەسترابێ و بەستەکانی لێك بترازێن و پەردووەکانی لەو گێژاوە کەفچڕێنەدا لەبەر یەك بڕەوێنەوە، باشترین کەڵەکەچیی دنیاش بی، لە تەنگەڵانەکانی تۆئانچێ بە زیندوویی دەرناچی... دەی باشە، ئێستا لە خەومدا ئەوە گەیشتوومەتە ئەوێ. ئاوەکە ئەوەندە بەخوڕە، کەڵەکەکەم لە دەست دەردەچێ و دەکەومە نێو یەکێك لە گێژاوەکانەوە. لە پەلەقاژەدا بووم کە لەخەو راپەڕیم. بە رای ئێوە تەعبیری ئەو خەوەم چییە؟ لەوانەیە.... مانای وا بێ کە... رووداوێکی ناخۆش ... شتێکی تاڵ بەسەر خێزانەکەم ...

من قەت کێوپارە و کوێستانم نەدیوە. دەریاشم نەدیتووە. هەر دەشتاییم دیتووە و گۆل و دانوب.

دەپرسم:

ـ ئەی کاك نیکیتا لای ئێوە کوێستانە؟

ـ بەڵێ کوێستانە و دەم جەنگەڵە. ماڵەکەم تەنیا ژوورێك و هەیوانێکە. کۆنەخانوویەکی دارینە، کە بە میرات بۆم ماوەتەوە. زستانان لە کارخانەی داربڕین کار دەکەم. لە پیاترا. هاوینانەش کەڵەکەوانم. زستانان چاوم بە ژنەکەم ناکەوێ. بەفر ڕێیەکان دەگرێ. گوندەکەی ئێمە لە سەر گردێکە. تەنانەت ناکرێ ماڵە و ماڵێش بکەین. چەند مانگ هەرچی گورگ و ورچە دێنە بەر پەنجەرەی ماڵان و، کە بۆنی بنیادەم دەکەن، ملی ڕێیە دەگرن و دەڕۆن... پار

که ژنەکەم بە تاقی تەنێ لەگەڵ منداڵەکان لەماڵێ بوو، یەکێك لە کوڕەکانم مرد. ژنەکەم لە گۆنییەکی وەرپێچا و لە عەمبارێ لەبەر سەرماکە داینا. دەزانی کەی توانیومان بینێژین؟ بەهارێ. لە جەژنی پاکدا. ئەودەمەی بەفر توانەوە و لافاو هەرچی شتی وەبەر هات رایماڵی و بردی و زەحمەتی کەم کردەوە. ئەودەم توانیم بچمەوە ماڵەکەی خۆم... لە شاری کالە و جلوبەرگی تازەم بۆ کوڕەکەم کڕیبوو. هەمووانم لەبەری کرد ئینجا ناشتم. ئەدی. لای ئێمە وەزعی ژیان ئاوایە. ئەگەر یەکێك بە زستانێ بمرێ، تەرمەکەی دەبەنە سەرێ و لە عەمبار دایدەنێن و چاوەڕێ دەبن تا بەهار دادێ، بەشکم بتوانن تابووتی بۆ دروست بکەن و بیبەن بینێژن. ئەگەر یەکێك نەخۆش بکەوێ، چاری نییە و هەر دەبێ تەوەکول بە خوا بکا. کەس هیچی لە دەست نایە.

کابرای چیایی چاو دەبڕێتە گەمەی زیندووی ئاگرەکە و کڕ دەبێ. هەموو بێدەنگ دەبن.

کاك نیکیتا لەسەر قسەی خۆی رۆیشت:

ـ بەو حاڵەشەوە، من و کەڵەکەوانەکانی دی، یانی ئێمە ئەو بنیادەمە ئازا و بەجەرگانەی هەموو جارێ گیانمان لەسەر بەری دەستمان دادەنێین و لەگەڵ لافاوی بە لرفەدا بە خڕ و شیواندا دەڕۆینە خوارێ، وەك خەڵکێك سەیر دەکرێین کە پێش چارەنووس و قەدەر کەوتووین. ئەگەر راستیتان دەوێ ئێمە خەڵکێکین کە لەگەڵ هەر هەناسەیەکماندا دەمرین و دەژێینەوە. بەڵام ئەوانەی لە سەرووی ئێمەوەن، یانی لە نێو دارستانەکاندا دەژین، ژیانیان لە ئێمەش تاڵترە. ئەو داماوانە تەنانەت کوخ و کۆلیتێکیش نییە تێیدا بژین، هەموو لە کون و کاژێراندان. چەند سەرماکە سەختتر بێ، دەبێ بچن داری زیاتر ببڕن. خۆ لە داربڕینیشدا

دەست زوو لەكار دەكەون. لەوانەیە لە پێشدا لاقیان سڕ بێ و بیبەستێ. چاویشیان بە دووكەڵ كوێر دەبێ، ئاخر ئەو كون و رەهۆڵانەی لە بن عەرزیان دروست كردوون، كولانكە و دووكەڵكێشیان نییە: دووكەڵەكە دەبێ لە دەرگاوە بچێتە دەرێ، یانی رێك لەو جێیەوە كە سەرما دێتە ژوورێ... كە لە دەم ئاگرەكە دەخەون، لایەكیان دەبرژێ و لایەكەی دیكەیان دەیبەستێ، دەبێ بەردەوام تەنیشتاوتەنیشت بكەن... شەكەتی بڕستی لێ بڕیون. دەخەون، بەڵام خوویان وا گرتووە، وەك مریشكێكی لە شیشت دابێ، بەردەوام بارەوبار دەكەن. كە ئیتر تین و تاقەتی كاریان نەما، كە شەل و گۆج و كوێر بوون، ئیتر لە قەڵاندۆشكانیان دەكەن و دەیانبەنە یەكێك لە شارە نزیكەكان بۆ ئەوەی لە قوژبنی كۆڵان یان شەقامێك دانیشن و بڵێن "لە رێی خوادا خێرێكمان پێ بكەن..." دیارە بنیادەم كە تووشی یەكی لە خۆی داماوتر دەبێ، بەزەیی هەر پێیدا دێتەوە، بەڵام كە دەبینی كابرا بەبێ ئەوەی خۆی ماندوو بكا، خوا پێی داوە و هەرچی خۆشیی دنیایە هەیەتی، ئیتر پیاو بەدەست خۆی نییە لەكەللەی دەدا دەست بداتە تێلایەك و سەروگوێلاكیان تێك بكاتەوە...

سەیر نییە كە لە خۆرهەلات خەڵك راپەڕیون. كاكە بەشمەینەتی و نەدارییش سنوورێكی هەیە. ئاگرەكە كە هەر دێ و خۆش دەبێ، تەق و تۆقی دێ. بایەكە، نەرمە دووكەڵێكی شین لەگەڵ خۆی دەبا.

ئیشتراتێ لە بن لێوەوە دەڵێ:

ـ ئەگەر دادپەروەرییەك لەم دنیایەدا هەبێ، ئاخری رۆژێك بە ئێمەش دەبڕدرێ:

كەڵەكەوان دەڵێ:

ـ عەدالەت قەت هەڵناستێ خۆی بێتە بەردەستت. بنیادەم دەبێ بۆ مافی خۆی تێ بکۆشێ و خەبات بکا. خەڵکی خۆرهەڵات بۆ دەستەبەرکردنی مافەکانیان خەباتیان کردووە، ڕانەوەستاون لە ئاسمانەوە بەسەریاندا بباریێ. دەبێ جوان بیر لەو شتانە بکەینەوە تا کاتی دێ بۆ ئەوەی بتوانین کاروبارەکان بە جوانی ڕێك بخەین.. . سەنگوسووکی بکەین و بە جێ و ڕێ.

ـ بەڵێ. بیری لێ دەکەینەوە.

شەوانە جاری وایە لەگەڵ نیکیتای کەڵەکەوان لە دەوری عەمبارەکان پیاسە دەکەم. کابرایەکی کورتەباڵای ئەسمەری کوڵکنەیە. لەوەتەی گیراوە، ردێنی نەتاشیوە.

بە سوعبەتەوە لێی دەپرسم:

ـ ئەوە دەتەوێ ببیتە قەشە کاك نیکیتا؟

ـ نا ئیشەڵا.

ـ ئەی بۆچی وا هەوساری ریشتت بەرداوە؟

ـ زۆر کەسی دیکەش وایان کردووە...

نیکیتام زۆر خۆش دەوێ. باسی چیا و کوێستانم بۆ دەکا، باسی لافاوی ڕوون و بە لرفە و کەڵەکێوی و مامزان.

ـ جاری وایە دەستەیەك ئاغا دێنە چیا بۆ ڕاو. لە ئێمە ورد دەبنەوە و پێیان سەیرین. وێنەی ماڵەکان و ژن و منداڵەکانمان دەگرن. گوێمان لێ دەبێ دەڵێن: بەخوای ئەوانە بەختەوەرن، لەو دارستانانەدا، لەو هەوا خۆشەدا دەژین، نەهاتون وەك ئێمەی ماڵوێران لە شاری خۆیان بخنکێنن." ئیتر کە سەیریان دەکەی، ئەوەندە تۆکمە و ساغن، خەریکن دەتەقن. ڕۆڵە ئەو

جەماعەتەت دیتووە چۆنن؟ هەقی خۆیەتی ئێمەی گوندی هەموویان وەك شەیتانۆکە لە بن پێماندا بپلێشێنینەوە. ئەگەرچی زۆریشی نەماوە. ئێستا کە لە بەرەی خۆرهەلاّت بلێسەی شۆڕش چەخماغەی داوە، ئیتر ئاخر و ئاقیبەتیان نزیك بووەتەوە. هەر ئەوەندەیە ئەو جەنگە تووکلێکراوە تەواو بێ... بەس بیری لێ بکەوە، ئەو چیایانە، خوای گەورە ئەو رۆژە دروستی کردوون کە بەدەستی خۆی ئەم زەوییەی دروست کردووە. تۆوی ئەو لێڕەوارانەش کە چیاکانیان داپۆشیوە، هەر خوای گەورە بە دەستی قودرەتی خۆی دایچاندووە. ئێستا هەموو زنجیرە چیای کارپات بە دەست کۆمەڵێك قورمساغ و گەوادی پیاترا و ئەیاسییەوەیە. کارخانەکانی داربڕین و دارتاشینیش هەر ئی ئەوانن. دارەکان باران لێیان دەدا و هەڵدەدەن. هەموو بەرەکەتی خوا دەچێتە گیرفانی ئەو ئاغایانەوە کە خاوەنی کوێستان و چیاکانن. ئەو پیاوانەی دارەکان دەبڕنەوە، ئیفلیج دەبن و دەمرن و هەر خواش دەزانێ بەر لە مردنیان، ئەو شەل و ئیلفلیجانە چەندەیان لە برسان دەمرن. ئێمەش کە دارەکان بە کەڵەکی خۆمان دەپەڕێنینەوە، یان ئەوانەی لە کارخانەکانی داربڕینەوەدا کار دەکەن، هەر هەموومان ژیانمان ژیانی سەگە و، وەختێکیش منداڵەکانمان دەمرن، لەتە تەختەیەکمان پێ نابڕدرێ تابووتێکیان بۆ دروست بکەین... ئیتر، من دوێ شەوێ خەونم بە ماڵەوە دیت. ئەوە زۆر خراپە. لەوانەیە ئیتر چارەنووسم وابێ نەگەمەوە. کە کوڕەکەم مرد ـ زۆر پێش جەنگ ــ دیسان هەرنەبێ ژنەکەم ئاگای لە منداڵەکانی دیکە هەبوو. بەلاّم ئەگەر خوای نەخواستە ئەویش بمرێ، منداڵەکانم لە برسان دەمرن. بێت ئەویش مردبایە، لەو ماڵەدا کە بەفر دەروژووری لێ گرتبوون، لە برسان دەمردن.. لە گوندەکەی ئێمە زۆر کەس وایان بەسەر هاتووە.

ـ بەڵام ئێستا خۆ هاوینە کاك نیکینتا. تا زستانێش ئیشەڵا خۆت دەگەڕێیەوە ماڵێ.

ـ ئەگەر توانیم خۆم قوتار بکەم و بە نێوەڕاستی شەڕگەدا خۆم بگەیەنمە ئەوبەر، لەوانەیە.

ـ باشە هەر بەراست بۆچی تاقیی ناکەیەوە بزانی دەکرێ یان نا؟

ـ چەند جاران لە کەللەی داوم وا بکەم. بەس لەوەی ترساوم بێت و بگەمە ئەوبەر، دەمگرن و دیسان دەمنێرنەوە شەڕگە. من ئیتر بێزم لە جەنگ هەڵدەستێ. حەز ناکەم جارێ بمرم. دیارە کەس ناتوانێ لە چنگی مەرگ خۆی قوتار بکا، ئەوەندەیە پاش جەنگ هەبوونی ئەو پیاوانەی بکرێ حیسابێکیان لەسەر بکەی، زۆر پێویستە.

پاش جەنگ زۆر کار هەیە دەبێ بکرێن. تازە ئەوە سەرەتای ئەشقە. گاڵتەی پێ ناکرێ، تێدەگەی؟

دەموچاوی نیکیتا زەردهەڵگەڕاوە و بزڕکاوە. دەستیشی هەروەتر.

دەڵێ: ـ چیاکان لە رادەبەدەر جوانن. ئاوی کوێستانان سارد و روونن. ئاخ ئەگەر بنیادەم شوێنێکی باشتری هەبوایە بۆ ژیان...

شتێکی ئازاردەر باڵی بەسەر دەشتەکە و عەمبارەکاندا کێشاوە، کە بنیادەم پشووسوار دەکا.

ئشتراتێ خەڵکی دۆبرۆجایە. زمانی تەرتەرانیش دەزانێ، چونکە نیوەی خەڵکی گوندەکەیان تەتەرن.

دۆبرۆجا...

ئەو وشەیە کە پاتە دەکەمەوە، تاسە و ئارەزووی سەفەرێك بۆ دوور دوور ـــ زۆر زۆر دوورتر لەو ناوچانەی وەك لەپی دەستم شارەزایانم ـــ بە دڵمدا دەگەڕێ. تاسەی ناسینی جێی دیکە و خەڵکی دیکە. ئارەزووی ئەوەی شتی دیکە و دیمەنی دیکەش ببینم...

*

*

*

لەو چەند ساڵەدا کە دەچوومە قوتابخانە، چیم دەست بکەوتایە دەخوێندەوە. باسی ئەو خەڵکەی هیچ لە خەڵکی لای خۆمان ناچن، ئەو وڵاتانەی دیمەنەکانیان لە دیمەنی لای ئێمە جیاوازن.

جارێکیان کتێبێکم دەست کەوت، زۆر ئەستوور نەبوو. لەو کتێبەدا وێنەی کوڕێژگەیەکم دی لە تەمەنی خۆمدا، کە نەك هەر وەك خۆم پێخواس بوو، بگرە رووت و قووتیش بوو، تەنیا تیتۆڵێکی لە نێوقەدی بەستبوو. دارێکی درێژ و ئەستووری بەدەستەوە بوو و چەند پەڕێکی سەیروسەمەرەی لە قژە رەش و پڕ و لوولەکەی چەقاندبوو. لە بن وێنەکە نووسرابوو:

ئابۆ، ABOU پاشا OULALA

لە ژیانمدا زۆر شتم خوێندووەتەوە و زۆریشم لە بیر چووەتەوە، بەڵام نازانم بۆچی روخساری سوڵتان ئولالا، بیچمی ئابۆ ئاوا وەك نەخشی سەر بەرد لە زەینمداماوەتەوە... لاپەڕەکانی ئەو کتێبۆکەیەکەم وشە بە وشە هەڵلووشی. دەمزانی ئابۆ پادشای دوورگەی ئولالایە. لە

کەللەی دام بزانم ئەو دوورگەیە کوێیە. بەرۆکی مامۆستاکەمانم گرت. گوتی لە دەریاکانی باشوورە، نزیك دوورگەکانی سۆوا.

دەریاکانی جنووب... دەریاکانی دوورگە مەرجانییەکان. ئەو دەریا گەرمانەی خەڵکەکەیان هەمیشە بە رووتی دەگەڕێن. خەڵکێك کە دەتوانن بەو شتانە بژین کە دار و گیا پێیان دەدەن. لە پشووی خوێندندا خۆمم گەیاندە عەمباری قوتابخانە و نەخشەیەکی کۆنەی دەریاکانی باشوورم دۆزییەوە. تۆز و خۆڵێکی زۆری لێ نیشتبوو. تەکاندم. چووم پێشانی مامۆستام دا و لێی پاڕامەوە بمداتێ. قایلم کرد. نەخشەکەم هێناوە ماڵێ و لە هەیوانەکە هەڵمواسی. ئەوە یەکێك لە گەورەترین شادییەکانی سەردەمی منداڵیم بوو. رۆژان هەتا ئێوارێ دادەنیشتم و سەیری ئەو نەخشەیەم دەکرد و ناوی دوورگەکانم دەخوێندەوە. بەینی دوورگەکانم بە پەنجە دەپێوا و هەوڵم دەدا مەودای راستەقینەیان مەزەندە بکەم.

دوورگەی ئۆلالاشم دۆزییەوە و کۆمەڵێك دوورگەی دیکەش کە ناوەکەیان وەك ئەو هەستبزوێن بوو. ئای چەند شەوان تا بەیانی چاوم لێك نەنا و بە خەیاڵی سەفەری خولیایی بۆ ئەو دوورگانە بەخەبەر مامەوە و خەو نەچووە چاوم.

دوایی لەناکاو لەبەرچاوم کەوتن. کەوتمە پرسیار لە خۆم، کە ئەرێ هەر بەراست قەت هەڵدەکەوێ من سەفەرێکی وا دوورودرێژ بکەم کە لە دنیای خەیاڵمدایە؟ لەوانەیە رۆژێك بتوانم بچم و لەوانەشە نەبێ. لەوانەیە وا باشتر بێ قەت سەفەری وام بۆ رێك نەکەوێ. ئەو شتانەی بنیادەم بیریان لێ دەکاتەوە و دەیانهێنێتە پێش چاوی خۆی، هەر وا باشترە قەت وەدی نەیەن.

ئەودەمی لە دەباغخانە یان فرۆشگای فریشتە یان لە بەقاڵیەکەی بانیکا پەینخۆر کارم دەکرد، زۆر جاران بەتایبەتی شەوان وا ڕێك دەکەوت بیرم لە دایك و باوکم و خوشك و برا داماوەکانم دەکردەوە. ئای بە چ خەم و پەژارەیەکەوە بیرم لێ دەکردنەوە چەندە بۆیان بێتاقەت دەبووم. دڵم نیسکێکی لێ دەهاتەوە، بەڵام کە ئاخری توانیم بچمەوە ماڵێ، دایکم لێمی پرسی، برسیمە؟ کەچی نانیشی نەدامێ گوتی ڕاوەستە تا هەمووان دێنەوە. تەنانەت بیری لەوە نەکردەوە هەر نەبێ هەستێ لەتێ ماماڵیگام بداتێ. خوشك و براکەم بۆ ئەوەی سێ چوار فلسەی بە خوێنی دڵم کۆم کردبۆوە لێم بخۆن، چۆن وەك قوڕنوو پێمەوە نووسان و چەندەیان جنێو و قسەی ساردوسووك پێ گوتم و ئاخرییەکەشی خوشکەکەم چۆن رووی خۆی هەڵماڵی و پێی گوتم شەلەی نقوستان و هەزار قسەی ناخۆشیشی لە پارسەنگم نا.

چەندەم حەز لێ بوو دیسان، گوێم لە خشەخشی گەڵای سپیدارەکەی حەوشەمان بێتەوە، بەڵام سپیدارەکە ببووە ئاوردوو و خۆڵەمێش. خۆ کاتێ گەڕامەوە ئەگەر سپیدارەکە لە جێی خۆی مابایەوە، لەوانەیە خشەخشی گەڵا و لکوپۆیەکانی بەدەم شنەی شەماڵەوە وەك جاری جاران لە گوێچکەمدا خۆش بلاوێن نەبوایە.

کە شەکەتی و ماندوویەتی بڕستی لێ دەبڕیم و خەم و پەژارەی دنیام لە دڵی کۆ دەبۆوە، ئەو فکر و خەیاڵانەم بەسەردا دەهاتن و وەك مژێکی رەشی خەست تێم دەئالان. ئەودەم لەخۆم رادەخوڕیم کە ئەگەر بێت و بکەومە دوای ئەو دڵئێشان و ناخۆشیانەوە، ورەم بەجارێك دەڕووخێ و تینم لەبەردا نامێنێ و رۆژ بە رۆژ پتر رۆدەچم و وام لێ دێ ئیتر وەك شەیتانۆکەیەکی بێ وزە تا دەمرم لە زەلکاواندا بژیم. لەخۆم رادەخوڕیم و تین و غیرەتم وەبەر

خۆم دەنا و خەم و پەژارەمم وەك کەپەنكێکی لە بەر باران خووسابیٚ توورِ هەڵدەدا و بە شوێن تیشك و خۆشی و گۆرانیدا رام دەکرد. تەواو دەگۆڕام. ئیتر گەیشتنم بە هیچ ئامانجێك بەلاوە مەحالٚ نەدەبوو. حەزم لیٚ دەبوو بۆ کارکردن و فێربوون و ناسینی ژیان و خەڵك بچمە شارێکی گەورە. لەبەر خۆمەوە دەمگوت:

"دەی باشە، درەنگ یان زوو دەگەمە وەها شارێك." بەردەوام ئەو قسەیەم دەکردەوە و هەستم دەکرد متمانەبەخۆییەکەم گەشە دەکاتەوە و ورە وەك هێز و تین بە هەموو گیانمدا دەگەڕیٚ. خەیاڵم دەبزووت و تا دوور دوور دەڕۆیشت. لە دڵی خۆمدا دەمگوت:"چەند رۆژێکی دیکە وەڕیٚ دەکەوم و هەر چوار قوڕنەی دنیا دەگەڕێم. ئەویش نەك بە خەیالٚ، بەڵکو بە راستی. جاریٚ راوەستە با ئەو یەك بە یەك ئەو هەنگاوانەم دیاری بکەم کە دەبیٚ بەرەو رووناکی بیاننێم." پەنجەم لەسەر نەخشەکە دادەنا و بڕیارم دەدا: ـ شەش مانگ لێرە دەبم. مانگێکیش لێرە. ساڵێکی رێکیش لەویٚ پێی لیٚ رادەکێشم. "تا دەبمە بیست ساڵان لانیکەم دەبیٚ هەموو دنیا گەڕابێم و هەزاران هەزار قەڵافەتی جۆراوجۆرم دیتبیٚ" ئاگرێك لە سەرمدا بڵێسەی دەدا. لە دڵێشمدا هەروەتر. بڵێسەی خەیاڵم سەریان لە ئەستێرەکان دەسوون و لە ئەستێرەکانیش تێدەپەڕی و بە باڵی ئاگرین هەموو دنیای دادەپۆشی.

ـ ئەوە چیت لیٚ قەوماوە لەبەر ئەو پەردەیە ئاوا چاوت لە ژێلاّ هێناوە؟ لەوە دەچیٚ وردە وردە شێت بی.

ئیۆنی برام بەو قسەیە دەیهێنامەوە نێو دنیای راستەقینە.

وەلاّمیم دەداوە:

ـ لەوانەیە. بەڵام بەتۆ چی؟ تۆ بۆ زگت دێشیٚ؟

ـ بۆ هیچ. هەر وا پێم ناخۆشە کە دەتبینم خەرەفاوی و تێك چووی.

ـ پێویست نییە خەم لە من بخۆی.

ـ ئەوەتا دەبینی دەخۆم.

دایکم دەهاتە نێوانمانەوە و دەینەڕاند:

ـ وازی لیٚ بێنە ئیۆن. لێی گەڕیٚ کەیفی خۆیەتی.

سەعاتێك وازی لیٚ دێنام بەڵام دیسان لێم پەیدا دەبۆوە:

ـ ئەو دۆمە قوون زلە کێیە؟

ـ پادشای جێیەکە.

قاقا دەکێشیٚ:

ـ ئەو قولە زەنگییە قوون رووتە؟

ـ بەڵیٚ بەڵیٚ، پادشای رەنگ زەیتوونییەکانە. هیی وڵاتێکە خەڵکەکەی هەموو زەیتوونین.

ـ کوڕە تۆ تەواو شێت بووی رۆڵە، هەر تەواو.

ـ باشە. ئەوە پێوەندیی بەخۆمەوەیە بە تۆچی؟

ـ چۆن پێوەندیی بە منەوە نییە؟

ـ دەی چاوت دەریٚ.

شریخەی شەپلاخەیەك دیٚ.

ـ جنێو بە من مەدە شەل و گێڕ، با ئێسك و پرووسك نەهاڕم.

دانم به جەرگمدا دەگرت. لەبەر خاتری ئابۆی ئۆلالایی هەموو شتێکم قبووڵ دەکرد. هێشتا پادشای ئۆلالام لەبیر نەکردووە. نەمتوانیوە ناوی ئابۆ لەبیر بکەم. چاوی گەش گەش بوون و ئاڵقەی لە گوێچکەیدا بوون، ئاڵقەی گەورەتر لەو بازنانەی کچان لە دەستیانی دەکەن هەندێ پەڕی لە قژی دابوو، لە ژیانمدا رەنگی وا سەیروسەمەرەم نەدیتبوو و، دارێکی درێژی بەدەستەوە بوو کە پێدەچوو نیشانەی دەسەڵات و هێزەکەی بێ. پێستی زگی کە وەك چەرمی تەپڵ لێك کشابوو، شەق و رەق دیار بوو و وەك قەیتەران رەش بوو.

لاقی لاواز و خوار بوون.

پادشا ئۆلالا...

بیرم دەکردەوە: ـ لەوانەیە گۆشتی بنیادەم بخوا. یان لەوانەشە سەربازەکانی ناچار بکا بە رمبەکانی خۆیان بنیادەمەکەی بۆ ئەنجن ئەنجن بکەن...

ئەودەم لە ناکاو خۆشەویستیی ئەو هەتیوە رەشەی نێو وێنەکەم لە دڵیدا نامێنێ کە کتێبەکەش دەیگوت رەنگی زەیتوونییە. بەڵێ، دڵم وەك گۆزەیەکی ئاوەکەی لێ بەتاڵ بکەن، ئاوا هەموو خۆشەویستییەکەی ئابۆی لێ هەڵدەچۆڕێ و بەتاڵ دەبێتەوە. بەڵام تاوێك دواتر دیسان پڕ دەبۆوە لەو ئاوە زوڵاڵ و فێنکە. لەوانەیە ئابۆ لە کۆیلەیەك بەولاوە نەبێ: کۆیلە و داردەستی پیرەسیحربازێك. ... ئەگینا منداڵۆچکەیەك چۆن دەتوانێ پادشایەتیی وڵاتێك بکا؟

*

*

❊

ئاندرێی لێم دەپرسێ:

ـ ئەوە لەبەر خۆتەوە چ کاوێژێکتە؟

ـ هیچ.

ـ کەوابوو دیارە تۆش لە خەودا دەڕاوێنی.

ـ نا، پێم وا نییە. بەس جاری وایە لەبیرم دەچێتەوە کە بەتەنێم و، بە دەنگی بەرز خۆم دەدوێنم.

ـ بڵێ بزانم، کتێبیشت خوێندووەتەوە؟

ـ بەڵێ، هەندێك.

ـ پێت خۆش بوون؟

ـ هەندێکیانم پێ خۆش بوو.

ـ دەزانی، کتێبخوێندنەوە لە من بووەتە مۆتەکەیەکی قورس. باوکم زەوی و زارێکی هەیە، بەڵام نانخۆری زۆر زۆرە. منی ناچار کردووە دەرز بخوێنم. حەز دەکا ببمە ژمێریار. بەڵام خۆم حەز دەکەم لە گوندەکەمان وەمێنم. جووتیاری بکەم. کە سەیری کتێب دەکەم، ژانەسەر دەگرم. چ پێویستە بنیادەم ئەو هەمووە شتە جۆراوجۆرە فێر بێ؟

هەر بۆ ئەوەی دڵیم نەشکاندبێ، دەڵێم:

ـ لەوانەشە بەکاری هیچ نەیە.

ئاندرێی چوار ساڵ لە من گەورەترە. گەنجێکی قۆزە، چاوی ڕەشە. تازە خەتی لێداوە. زۆربەی جار نیوەشەوێ دەیبینم لە تەختەکەی دێتە خوارێ و بە سەر پەنجە لە ژوورەکە دەچێتە دەرێ و لە پلیکانەکان دەچێتە خوارێ. ئەودەم دووقڕانییەکەم دەکەوێ، ئەوە ئامۆسی بە فیڵ ناردووەتە کۆشك و تا بەیانی نایەتەوە. ئیلۆنکاش بەتەنێیە. زۆر جاران پێکەوە لە دەشتێ دیتوومن کە بەرەو کێڵگەی گوڵەبەڕۆژەکە ئەسپ تاو دەدەن.

ئەو کێڵگەیە لە تەنیشت ئەو کێڵگانەیە کە دۆمەکان بژاری دەکەن. ژنێکی گەنج یان کچۆڵەیەکی پێگەیوی دۆمەکان هەڵدەنێ و دەستی دەگرێ و رایدەکێشێتە بن دەوەنەکان. کە دێتەوە ئیتر ئاوا ئەسپەکەی لینگ نادا، لێی دەگەڕێ ئاژەڵەکە بە کەیفی خۆی بڕوا و خۆیشی سەرخۆش و رازی فیکە لێ دەدا.

لێم دەپرسێ:

ـ دا وەرە بزانم، زامبیلا دەناسی؟

ـ بەڵێ، دەیناسم.

ـ پێی گوتم لەسەری داوە ئەمشەو بێتە ئێرە، بێتە عەمبارەکە.

ـ با بێ. کەواتە من ئەمشەو دەچم لە لای بەندییەکان دەنووم.

ـ بۆ؟ تۆ دەتوانی نەڕۆی، من دەچم.

بژار تەواو بووە. دۆمەکانیان ناردووەتە سەر گۆلەکان. لەوێش کار زۆر بووە و ئێستا تەواو بووە و دیسان دۆم دەستە دەستە دەگەڕێنەوە هەوارگەکەیان. ڕەش هەڵگەڕاون و ماندوویەتی بڕستی لێ بڕیون.

گوندەکە بە کۆڵانە باریك و درێژ و پڕ پێچ و گەوەکانی بە داوێنی گردەکەوەیە. کە لە گوندەکە وەدەر دەکەوی دەگەیە چیمەن و بژوێنەکان و دواییش کێڵگەکانی گەنمەشامی. دەبێ زۆر زۆر بڕۆی تا دەگەیە گۆلەکان.

ئاندرێی بە عارەبانە منی ناردووە ماسی بێنم. ئەسپی مل ئەستوور لە عارەبانەکە کراون. ئاغا بۆ کێڵان و چاندنی زەوی و زارەکانی داوای لە ئەڵمانییەکان کردووە چارەویی باشی بۆ بێنن. ئەوانیش هەموو ئاواییەکان گەڕاون و بە ناوی دەستبەسەرداگرتن، دەستیان لەسەر چارەوی و ئاژەڵی خەڵك داناوە و هەموویان هێناوەتە خزمەتی. ئاغا داوای شیری مریشکیش لە ئەڵمانییەکان بکا، لە بن بەردیش بێ بۆی دابین دەکەن.

دۆدۆلیکا و تاناسێش لەگەڵم هاتوون کە بەتەنێ نەبم، یەکێك دەستێکم لەگەڵ بدەنێ.

عارەبانە وردە وردە بەرەوپێشەوە دەڕوا. هیچ پەلەمان نییە. شەوێ لە کن ماسیگرەکان دەنووین و کەرەی بەیانی ماسییەکان بار دەکەین و دێینەوە و بەرەبەری نیوەڕۆیە دەگەینەوە عەمبار.

ـ ئەی هاااا.

هەی دێیان لێ مەکە دۆدۆلیکا، خۆ پەلەیەکمان نییە.

ـ بۆیەیان دەنگ نادەم توند بڕۆن، ئەوانە بێت و تێیان نەخوڕی خەویان لێ دەکەوێ.

جەنگەڵێکی چاخ لە دەم جادەکەوە دەردەکەوێ.

ـ لەم مێرگەدا پار کە ئەڵمانییەکان هاتن، شەڕێکی قورس قەوما. لە بنی بیریشدا بوای گوێت لە تەقە دەبوو. کە شەڕەکە تەواو بوو، کوێخاکان بە ئەمری ئاغا ناچاریان کردین بێین و کوژراوەکان بشارینەوە دیارە ڕۆمانیاییەکان. ئەڵمانییەکان کوژراوی خۆیانیان شاردبۆوە.

ـ جەنگەکە چۆن بوو؟

ـ سەیرکردنەکەی زۆر خۆش نەبوو. سەربازەکانی ئێمە، لیوایەکی سوارە لە دەم مێشەڵانەکەوە پاشەکشێی دەکرد. دەیەویست ڕێیەك بدۆزێتەوە و خۆی بگەیەنێتە بوخارێست. دەیتوانی خۆی لەو گێچەڵە قوتار بکا، بەڵام وای نەکرد. تابوورێکی ئەڵمانییەکان کە لە بۆلگاریاوە هاتبوو، لە دانوب پەڕییەوە و ڕێی پاشەکشێی لێ گرتن. فەرماندەی سوارەکان ئامادە نەبوو تاقە هەنگاوێکیش ڕێیەکی بگۆڕێ. ئەڵمانییەکان دەسبەجێ سەنگەریان هەڵبەست و بیکەیسی و تیرباریان لێ دابەستن. فەرماندە فەرمانی هێرشی دا. سوارە سەرەنێزەیان بەسەری تفەنگانەوە کرد و پەلاماریان دا. ئەڵمانی دەوریان دان. چەند سوارێك کە توانیبوویان دابەزن، لە قوڵکەکاندا مات بوون و تەقەیان کرد و چەند ئەڵمانییەکیان کوشت.

فەرماندە و ئەفسەرەکانیش کە لە دواوە ڕاوەستابوون و سەیری ڕووداوەکەیان دەکرد، پاش ئەوەی خەڵکێکی زۆریان لە خت و خۆڕایی بە کوشت دا، خۆیان بە دەستەوە دا.... ئەسپەکانیانمان تۆزێك لەولاترەوە لە بن گڵ نا. دیارە پاش ئەوەی کەوڵمان کردن... کەوڵەکانیانمان بردە عەمبار. ئاغا دای بۆ پیاوەکانی بکەنە کالەی شەمامەبەند.

گۆڕستانەکە سێ هێندەی گۆڕستانی ئاواییە. خاچەکان باران ڕەشی کردوون و هەتاو هەڵیبرینگاندوون و شەقارشەقاری کردوون.

ـ بەڵێ، بنیادەم و ئەسپەکان و کەلاکی دیکە خەریك بوون بۆگەن دەبوون.

گەلەقازی ئاوایی لە نێو خاچەکاندا خەریکن لە گژ و گیا چڕەکە دەلەوەڕن.

دۆدۆلیکا دەڵێ:

ـ خەریکین دەگەینە لاکریما. ئەوەتا.

لاکریما گوندی ماسیگرەکانە، لە دەم گۆلەکان. ریزێك کەپرن کە دەبێ بە گاگۆڵکێ بچیتە ناویان. کەپری قەوزەگرتوو کە هەڕەمەکی دروست کراون. خواروخێچ و هەر یەکەی جۆرێك. هیچ کام دووکەڵکێشیان نییە. دووکەڵ لە دەرگا و کون و کەلێنی میچ و سەربانەوە دێتە دەرێ. پێم سەیرە خۆ بای ئێرە لەم دەم ئاوە زۆر توندتر و بەتەوژمترە لە بای دەشتێ، چۆنە هەڵێنەگرتوون و نەیبردوون. دەوروبەری کەپرەکان حەوشەی وشك و بەتاڵن. لێرە و لەوێ لە پێش هەندێکیان یەك دوو ئەقاقیا دیارە. لێرە و لەوێ یەك دوو تەیری ماڵی و مریشك و جووچك چینە دەکەن و چەند بەرازێکی رەقەڵە و لاوازی گڕوێ توولەك بوونە. لە بەردەم کەپرەکان، منداڵی جلوبەرگ شڕی چڵکنی نیوەڕووت لەبەر بەرۆچکەکە خۆیان هەڵخستووە. هەر کامە و کوولەکە سەراوییەکیان بەدەستەوەیە و گەمەی پێ دەکەن.

یەکێك لە منداڵەکان لەسەر لەتە دۆشەگێکی شڕ ئاخێزێك دەکا و دەستە زەردەڵە و رەقەڵەکەی درێژ دەکا و کوولەکە سەراوییەکە هەڵدەگرێ و بە دەمییەوە دەنێ.

تاناسێ بە سرتە دەڵێ:

ـ تا، تای لامەزەب. ئەو منداڵە بەستەزمانانە هەموو تووشی نۆبەتێ بوون. نۆبەتێ شیلەی گیانی مشتوون.

لە مەیدانێکی بچووکدا تۆزێك رادەوەستین و بارگینەکان لە بیرەکە ئاو دەدەین. ئاوەێکی پیس و ناخۆشە. بن بیرەکە پڕە لە زبڵ و زاڵ. پیرەژنێك بە لارەلار دێتە پێشێ و بە پاڕانەوەوە دەڵێ:

ـ رۆڵەکانم، بە خاتری خوا ئەو گۆزەیەی منیش پڕ بکەن. من ناتوانم ئاو هەڵێنجم. تین و تاقەتی وەم نییە.

گۆزەکەی بۆ پڕ دەکەین. کە دەگەڕێتەوە لێی دەپرسم:

ـ ئەی خەڵکی ئاوایی لە کوێن داپیرە؟

ـ لە قۆپییەکەن. پیاوانی ئاغا هەموویانیان بردووەتە قامیش دوورینەوە.

هەتا چاو بڕ دەکا گۆلە و قامیشەڵێن... قامیشەکە دەبێ لە نێوەڕاستی هاوینێدا ببڕدرێتەوە و لەبەر تاو دابنرێ تا وشك دەبێتەوە. رەگە بەهێزەکانیان دیسان شین دەبنەوە و هەڵدەدەنەوە. پاییزانە جارێکی دیکەش قامیشەکان دەدوورنەوە.

عارەبانەکە لە تەنیشت گۆلەکە رادەگرین. سەیری خەڵکە رووتەکە دەکەین کە هەتا نێوقەدیان لە ئاوەکەدان و قامیش دەدوورنەوە، سواری لۆتکە و قایقەکانیان دەکەن... هەر قایقێك پڕ بوو، پاڵی پێوە دەنێن بەرەو وشکایی. قایقەکان نوقمی قوڕ و لیتەن.

لە وشکانی قامیشەکان دەکەنە باقە و لەسەر یەکیان دادەنێن بۆ ئەوەیە لەبەر تاوەکە وشك ببنەوە. دوایی دیسان قایقەکە رادەکێشنەوە نێو گۆلەکە و دەیهێننەوە جێیەکەی خۆی و دیسان دەست دەکەنەوە بە بڕین و دوورینەوەی قامیش. سەدان کەسن و ئەوەندەش قایق و ملیۆنان مێش و مەگەز و تەپۆ کە بە لەشە رووتەکانیانەوە دەدەن و خوێنی لێ دێنن...

هەمووان رووت و قووت کار دەکەن. ژنان لە پشتوێند بەرەوخواریان بە لەتە حەسیرێك کە لە سێسوو چنیویانە، داپۆشیوە.

دۆدۆلیکا دەپرسی: ئەسپەکان بکەینەوە؟

ـ بیانکەوە.

بە شوێن کۆڵە قامیشێکدا دەگەڕێین بۆ شەوێ رایخەین و لەسەری بنووین. ئاگرێکی بەدووکەڵ دەکەینەوە بۆ ئەوەی مێشوولە و تەپۆ دەرکەین.

تاناسێ هەڵدەداتێ: ماسیگرەکان تۆڕەکانیان داخستووە. سبەی بەرەبەری بەیانی کۆیان دەکەنەوە.

ـ ئەی ئێستا لە کوێن؟

ـ ئەوەتان.

بە پەنجە ئاماژە بۆ لای قامیش درووەکان دەکا:

ـ بە رۆژ قامیش دەدروونەوە و کەڕەی بەیانییش ماسی دەگرن.

لەسەر لێواری گۆلەکە لەگەڵ لاکریماییەکان نانی ئێوارە دەخۆین.

ـ ئەی ماسی؟ ماسی ناخۆن؟

ـ نا بۆمان نییە. ماسیی هیی ئێمە نییە. ئێمە بەس دەیانگرین. مافی ئەوەمان نییە دەستیشیان لێ بدەین.

ـ باشە بۆ؟

ـ هەقمان نییە دەست لە هیچ شتێك بدەین. لێرە هیچ شتێك هیی ئێمە نییە.

دەبێ پێم سەیر بێ؟ جووتیار تۆو دادەچێنێ و گەنم دەچێنن بەڵام گەنمەکە هیی ئەوان نییە. لە هەموو ماڵە جووتیارەکاندا لەتە نانێکت دەست ناکەوێ. گەنمەشامی دەچێنن و دەیدوورنەوە بەڵام قەت بۆ جارێکیش تێر زگی خۆیان مامالیگایەك ناخۆن... مانگا و گامێشی ئاغا دەلەوەڕێنن، بەڵام رۆحیشیان نازانێ تامی شیر چییە... بەرازەوانی دەکەن، بەڵام شەوی نۆئێل ناچارن مازەپشتکەی بەرنە چێشتخانەی ئاغا و پێشکەشی بکەن... جێژنی پاك چیی هێلکەمریشکی هەیانە، پێشکەشی دەکەن هاوینان جووچکی مریشك و پاییزانیش جووچکە مراوییە قەڵەوەکان...

ترێی ئەو رەزانەی کاریان لەسەر کردوون و ئارەقەیان رشتووە، کۆ دەکەنەوە بەڵام بۆیان نییە تاقە گلە ترێیەك بخەنە زاریانەوە، چونکە تا تەواو دەبن، دەمبێنیان لێ دەدەن.

ـ تۆش دەمبێنت لە دەمی دراوە داریە؟

ـ لە دەمی منیش و دایك و بابم و خوشك و براکانم وهەموو کەسوکارەکەمان...

ماسیگرە دەڵێ:

ـ بەو حاڵەشەوە هەندێ شتە بۆمان هەیە بیانکەین: ئەگەر لە ژیانی خۆمان بێزار ببوبین، مافی ئەوەمان هەیە لە گۆلەکەی ئاغادا خۆمان بخنکێنین یان خۆمان بە دارێکییەوە هەڵواسین. دەتوانین ئەسپێکانمان بکوژین یان ئەگەر پێمان خۆش بوو بۆمان هەیە بە گیای ئاغا بنی پێمان بخورێنین. بۆشمان هەیە بۆ مردووەکانمان بگرین و شینیان بۆ بکەین. ئەوەندەمان بەس نییە دۆدۆلیکا؟

دۆدۆلیکا دەڵێ:

ـ ئێمەی داماو، ئێمەی لێقەوماو.

ـ ئەگەر حەزمان لێ بێ بۆمان هەیە بۆقیش بگرین و بیخۆین. پێم وایە خەتای خۆمانە کە حەزمان لە بۆق نییە.

بۆ سبەی بەیانی بە عارەبانەی پڕ لە ماسییەوە دەگەڕێینەوە بەرەو عەمبار. ماسیی وردورد، کە هەر هێندەی پەنجەی بنیادەمێك دەبن. ماسیە درشتەکان و قزل ئالا خۆشەکان لە عارەبانەکانی دیکە بار دەکەن و دەیاننێرنە زیمنی سێئا و تۆرنۆ بۆ فرۆشتن.

مانگی تەمووزە. گەنم هەستاوە و خەریکە دەگا. با کەروێشکەیان پێ دەکا. گەنمەجاڕ دەڵێی دەریایەکە و بەردەوام دەشنێتەوە. خۆری ئێواران، تار و نارنجی و دووکەڵاوی، ئاوا دەبێ و بەیانیان گورج و گۆڵ هەڵدێ. لە پێشدا رەنگ بزرکاو دوایی خۆڵەمێشی و ئینجا مۆر و ئاخری روون و پڕشنگدار.

شەوانی عەمبارەکان گەرمە. خەو لە چاومان دەزڕێ. لە ژوورەکەی خوارەوەڕا دەنگە گڕەکەی ئامۆس و قاقا زولاڵەکەی ژنەکەی دێ. ئەی لەو ژن و مێردە سەمەرەیە.

زۆر بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕیوە، کە ئامۆس لە قوڕنەیەکی ترانسیلڤانییەوە هاتووەتە ملکی ئاغا و قۆناغی گرتووە. لە پێشدا لە گەوڕەکاندا دەستی بە کار کرد، دوایی لە چێشتخانەدا. کە ئاغا ئیلۆنکای هەنگارییایی لە بوخارێستەوە لەگەڵ خۆی هێنا، ئامۆس هێشتا لە چێشتخانە بوو. کچە ماوەیەك چێشلێنەر بوو، دوایی مەنجەڵ و تاوەی بەلاوە نا مێردی بە ئامۆس کرد. خەڵکی خوا ماوەیەك هەر بەو زەماوەندە پێکەنین و کردیانە بنێشتەخۆشکەی سەر زاریان بۆ گاڵتەوگەپ.

ئامۆس و ژنەکەی پاش زەماوەند نێردرانە سەر عەمبارەکان.

هەموو بەیانیان کە ئامۆس لە گەورەکاندا راکەڕاکێتی و خەریکی کارە، ئاغا دێ قاوەکەی لە کن ئیلۆنکا دەخواتەوە.

*

*

*

قەت بە نەسیبتان بووە شەوێك لە دەشتێ بمێننەوە؟

کێ گوتوویەتی درەخت شەوانە خەوی لێ دەکەوێ؟ بە پێچەوانەوە، دەشت شەوانە بەخەبەرە و دەژی، ئەویش چ ژیانێك. هەر لاسکە گیایە و بەوپەڕی جۆشوخرۆشەوە دەژی. لەسەر هەر گەڵاڵەیەك گیانلەبەرێك دەجوولێ. ئەو گیانلەبەر و مێروانەی بە رۆژ تا ئێواریٚ لە نێو گژ و گیا و کەلێن و قەڵشتەکانی زەویدا خۆیان دەشارنەوە.

کێ گوتوویەتی، دەشت شەوانە خەوی لێ دەکەوێ؟

ژیانی راستەقینەی دەشت بە شەوە. مارمێلکەی درێژی رەنگ خاکی بە جەستە لیچقەکەیانەوە بە نێو گژ و گیادا دەخوشن. هەرچی لاسکی گەنم یان قالۆرێ گوڵەبەڕۆژە یان گەنمەشامییە چاو هەڵدێنن و سەیری قووڵایی ئاسمان دەکەن، زار دەکەنەوە و هەناسە هەڵدەمژن، باوەش دەکەنەوە و خۆشی و نیانی لە ئامێز دەگرن. تەڕایی و تازەیی شەو لە سۆنگەی فرمێسکی ئەستێرەکانەوەیە.

شەوانە سروەش زیندوو دەبێتەوە. ڕێك وەك بنیادەمێك، وەك مارێك، وەك بایەقۆشێك.

شەو ئاسمانیش زیندوو دەبتەوە. دەکرێ ببیینی کە چۆن بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە.

سەر لە ئێوارێ ئەستێرەورچە لەولاوە لای باکوور بوو. ئێستا کە خەریکە ڕۆژ دەبێتەوە هۆوەتا، لەلای باشوورە، لەسەر دەشتە پڕ هەوراز و نشێوەکانی بۆلگاریا.

شەوانە زەوییش زیندووە.

قەت بۆتان هەڵکەوتووە شەوێك لە دەم کانییەك بمێننەوە؟

ئەو زیندووتر و گەشتر هەڵدەقوڵێ. قوڵتەقوڵتەکەی شادمانەیە. بێت و لێوی لێ نزیك بکەیەوە، دەزانی تامێکی دیکەی هەیە. تامی گڵ دەدا.

قەت بۆتان ڕێك کەوتووە شەوێك لە دەشتێ بنوون؟

کەپەنك یان بەتانییەك لە خۆمەوە دەپێچم و لە دەشتێ دەنووم. عەرزەکە ڕەقە، بە ڕۆژ کە دەیشێلی ڕەقە، بەڵام کە شەوێ بۆ خەوتنێ لەسەر چیمەنەکە درێژ دەبی و گژوگیاکە ملکەچانە لە بنتدا درێژ دەبێ، هەست دەکەی زەوییەکەش وەك ئاوریشم نەرمە. هەر دەڵێی لە کوڵکە یان پەڵەی هەوری ڕوون دروست کراوە.

قەت بۆتان هەڵکەوتووە شەوێکی لە دەشتێ بنوون؟

من زۆربەی جاران لە دەشتێ دەنووم و لە قووڵایی خەویشدا بەئاگام. خەون دەبینم و دەزانم خەونە. چاوم لێك ناوە، کەچی ئەستێرەکان و تریفەی مانگ هەر دەبینم. بە پێست دەبینم.

بەڵێ، دەنووم و دەزانم خەوتووم. خۆشحاڵم ئاوا خۆش و هاوکات سووك خەوتووم. گوێچکەشم خەوتوون و بەو حاڵە ئەو دەنگە قووڵانەی دەشتێ دەبیستم و دەزانم گوێم لێیان دەبێ. بە پەنجەکانم، بە پێیەکانم، بە هەموو جەستەم دەبیستم. ئەو دەنگانە خەوەکەم نازڕێنن و بەخەبەرم ناهێنن، بگرە خەوەکەم شیرینتر و قووڵتر دەکەن و چەندی قووڵتریش دەنووم، پتر ئاگام لێیە کە خەوتووم. مانگ و ئەستێرەکان باشتر دەبینم. کە نەمدەتوانی تەنیا بە یارمەتیی چاوەکانی شەوەکە باشتر لە ئامێز بگرم، ئێستا توندتر ئامێزی تێ وەردێنم و دەنگی دەشتەکەشم جوانتر گوێ لێ دەبێ. دەنگی سەیر و سەمەرەی پڕ لە راز و نهێنیی دەشتەکە.

دەنگەکانی دەشتێ، کە شەوانە بە هەزاران زمانی جۆراوجۆر دێنە قسە و گوێچکە بەتەنێ نە دەتوانێ بیانبیستێ و نە لێیان تێ بگا.

*

*

*

جێژنی Pontecole تەواو بووە.

ئەی لەو جێژنە پڕ هەرا و زەنازەنا و هەژانە.

دۆم روخسەتیان لە ئاغا وەرگرت بۆ بەزمگێڕان کالۆشاری Chaloshari* بنێرنە گوندەکانی دەوروبەر کە ملکی خۆی بوون. هەوارگەیان بۆ سێ دەستەی کالۆشاری رێك خست.

* تیپی سەماکەری نیشتمانی کە یەکێك دەکەنە سەرۆکی خۆیان. ئەو کەسە سوێند دەخوا کە ماوەیەکی دیاریکراو متەقی لێوە نەیە و زمانی نەگەڕێ. وشەی کالۆشاری لە بنەڕەتی کالۆشەوە هاتووە، بە واتای دەمبێن.

دیاره ئیجازەکەش زۆر بە سووك و سانایی جێبەجێ نەبوو. هەم دۆمەکان ملکی ئاغان و هەمیش ئەو گوندانەی دەچوون لەوێ بەزم بگێڕن. وایان دانا یەك لەسەر سێی داهاتی دەستەکان بۆ ئاغا بێ، یەك لەسەر سێی بۆ بۆلیباشا و ئەوی دیکەشی دۆمەکان بەسەر خۆیانیدا بەش بکەن.

ـ دیارە دۆمەکانیش شتێکیان هەر پێ دەبڕێ. ئەوان بە خۆڕایی بۆ کەس سەما ناکەن.

کورتی ببڕینەوە، دۆم کام شڕە و کۆنەی هەیانبوو، لەبەریان کرد و دارێکی درێژیان بەدەستەوە گرت و پارچەیەك و چەند چڵە گژنیژیان لەسەری بەست.

رۆژی پێش جێژن، وێکڕا و بە هات و هەرا و قریوە چوونە دەم دانووب. لالەی سەرۆکیان و کالۆسارییەکانی بە سوێندخواردن بە شاخی شەیتان رێوڕەسمی پلەبەخشینیان جێبەجێ کرد و سوێندیان خوارد لەو حەفتەیەدا کە سەما دەکەن، بەهیچ شێوەیەك یەك دەنگیشیان لێوە نەیە. کالۆسارییەکان جگە لەوە سوێندیان خوارد سەرۆکیان هەر شتێك بڵێ ملکەچی بن و ئەگەر ناچار بوو تێیان هەڵبدا، ئەوا لێی تووڕە و دڵمەند نەبن. لە کاتی سوێندخواردنێدا دەستیان بەو دارە درێژەوە دەگرت کە بە کۆنە و گژنیژ رازاندبوویانەوە.

پاشان، کالۆسارییەکان هەر کامە و چەپکێ گژنیژیان لە بەرپشتوێنیان بەست و چەند چڵێکیشیان لە کڵاوەکەیان چەقاند و، هەندێکیشیان لە بن کراسەوە لەسەر گیانیان دانا. سەیر نییە. دەڵێن لەم جێژنەی پەنجاییەدا، بێت و گژنیژت پێ نەبێ، جنۆکە دێن و ئەقڵت دەبەن.

ردێن و سمێڵێکی پان و بابڕیان بۆ سەرۆك دروست کرد. شمشێرێکی دارینی سووریان دایە دەستی.

بەرهەڵبێنەیەکیان بۆ بەست. لەسەر بەرهەڵبێنەکەشەوە قایشێکی پانیان بۆ بەست کە نەقیزەیەکی دێزی مۆریان پێوە هەڵواسیبوو. خولخولۆکەیەکی بچووکیان بە بن دەستی کەرەدارینەکەوە نووساندبوو و دەزوویەکیان لە بن بەرهەڵبێنەکەوە شاردبۆوە کە سەرێکی بە خولخولۆکەکەوە بەسترابوو و سەرەکەی دیکەی بە لاقێکی لالەوە.

کۆنە لۆتییش بە دەستەی خۆیانەوە کەوتبوونە رێ: دۆمێك بە ڤیۆلین و یەکێکی دی بە گیتارەوە.

کالۆشارییەکان بەرلەوەی وەڕێ بکەون بەرەو گوندان، لە کۆشکدا بەزمێکی خۆشیان گێڕا و سەمایان کرد.

ئاغاکان لەسەر پلیکانانەوە لە کورسییە نەرمەکانیاندا تخێڵ ببوون. ئیفلیج خانیشیان بە ڤیلچەرەیەکەیەوە هێنابوو. ئێمە و نۆکەرەکان و کرێکاران و جووتیار و پالەی کۆشك لە حەوشەکە راوەستابووین.

سێ دەستە کالۆشارییەکە کێبڕکێیەکی توندیان لە نێودا بوو، چونکە ئەو دەستەیەی سەمای باشتر کردبایە، خەلاتی لە ئاغا وەردەگرت: سکەیەکی یەك لێئۆی زیو.

لە دەموساتێکی دیاریکراوی سەمادا لالە ئاماژە بە کالۆشارییەکان دەکا ببنە پرد. هەموو دەست دادەدەن و پشتیان کۆم دەکەنەوە. لالە چاوێکیان لێ دەکا بزانێ ئاخۆ ریزەکانیان رێکە یان نا. یەکێك لە کالۆشارییەکان

قوونی دەرپەڕیوەتە دەرێ. لالە توورە دەبێ و دەچێتە پشتەسەری رادەوەستێ و ئەو پێیەی سەری دەزووەکەی پێوە نووساوە راستی دەکاتەوە و نەقیزەکە هەڵدەستێنێتەوە و لەسەر پشتی کالۆشارییەکەی دەچەقێنێ و دەیباتەوە نێو ریزەکە. لالە کە ریزبوونەکەی بەدڵە، وەك فەرماندەیەکی جەنگاوەر کە دەیەوێ هێرش بکا، شمشێرەکەی رادەوەشێنێ و ئامادە دەبێ لە پردەکە بپەڕێتەوە، بەڵام رێك لەو دەمەدا کالۆشارییەکی دیکە ریزەکە تێك دەدا، دیارە ئەوەیان سەری لە ریزەکە دێتە دەرێ. لالە خێرا بۆی دەچێ و شوولکێکی لە تەپڵی سەری دەدا و دیسان خۆی ئامادە دەکا بە پردەکەدا بپەڕێتەوە و هێرش بەرێ، کەچی دیسان رووداوێکی تر رێی لێ دەگرێ:

کالۆشارییەك کە لە نێوەڕاستی ریزەکە راوەستاوە، خۆی دەخا و ئاواش پردەکە کونێکی تێ دەبێ. لالە بە شمشێرەیەکی چەند دانەیەکی تێ دەسرەوێنێ و ئاخری کێشەکان چارەسەر دەبن. ئیتر ئێستا پردەکە تۆکمە بووە. لالە دەچێتە سەر پردەکە و بەسەر شانوملی یەکەم و دووەم و پێنجەمیشدا تێدەپەڕێ. بەڵام شەشەم کەسیان لە ناکاو بەلادا دێ و لە ئاکامدا لالەی شەرکەر سەروبن دەبێ و دەکەوێتە نێو خۆڵ و خاکەکە. کالۆشارییەکان لە ناکاو دەردەپەڕن.

ژەنیار کە چاوەڕوانن و چاویان بریسکەی دێ رێك لەو دەمەدا ئاوازێکی توند و کێویانە لێ دەدەن. کالۆشاری خۆی دەخەنە سەر دارەکانیان و وەك شێتان سەما دەکەن. وەها پێ بە عەرزیدا دەدەن، پێیان نابینی. ئارەقە لە ئازای ئەندامیان دەچۆڕێتەوە.

زەنگوڵەیان بە ئەژنۆ و کالەکانیانەوە هەڵواسیوە و زرینگەزرینگ و سەما تێکەڵی یەکتر دەبن.

لالە لە هەڵسوکەوتی شێتانەی دا کەس دەسکی لە دوو ناکا. لە ناکاو کالۆشارییەك لە نێو سەماکەران دێتە دەرێ و لە دارێك دەچێتە سەرێ. راکردوو پتر هەڵدەکشێ و لالەش بەشوێنیدا. ئاخری دەیگرێتەوە و بە شمشێرەکەی خۆی چەخسێکی باشی دەکوتێ. راکردوو رادەکاتەوە خوارێ. لالەش بەدوویدا و سەماکە دەست پێ دەکاتەوە.

لالە دەچێتە پێشێ و بۆ ئەوەی جەغزەکە هەراوتر بکاتەوە، بە شمشێرە سوورەکەی پیاوەکان دەکشێنێتەوە و نەقیزەدارەکەی لە تەشکوداوێنی ژنەکان دەکوتێ. خەڵکەکەش قاقا پێدەکەنن. ئاغاکانیش. تەنانەت باوکە ئیۆڤکۆش خەریکە دەبوورێتەوە.

کالۆشارییەکان حەفتەیەکی تەواو بە گوندەکاندا گەڕان.

ئاخرین رۆژی پاش جێژنەکە، دوای خۆرئاوابوون، کالۆشارییەکان دیسان چوونەوە لێواری دانووب، هەر ئەو شوێنەی کە بەر لە رۆیشتن رێورەسمی پلەبەخشینیان جێبەجێ کرد و لەوێ دارەکەیان شکاند و بەچۆمەکەیاندا دا، شمشێر و نەقیزە و ردێن و سمێڵە دروستکراوەکەشیان توورِ هەڵدا. سوێندەکەش بەتاڵ بۆوە و سەردەمی لالبوونیش بەسەرچوو.

ئامۆس کەیفی بە ڕێوڕەسمی کالۆسی لای ئێمە نەهاتووە. دەڵێ:

ـ ئێوە زۆرتان حەز لە ئۆین و لووسکەبازاڕیە. کالۆس لە وڵاتی ئێمە لە ترانسیلڤانی جوانترین سەمایە. کام کوڕ ژیکەڵە و بە بەژن و باڵا جوانە دێنە ئەو سەمایە. جوانترین جلوبەرگ لەبەر دەکەن، روخسار و سەروکاکۆڵیان ببینی، پێت وایە دەچنە سەر ژن.

ـ جلوبەرگی ئەوانە جیاوازە.

ـ من پێم وایە ئێوە ئەو جلوبەرگە ناشیرینانەی دەم دانووبتان، لە تورکان وەرگرتووە، چونکە جل نییە لەوانە ناشیرینتر.

ـ لەوانەیە.

کالۆس سەمای تایبەتی دۆمانە، کە هەر بۆخۆشیان دەیکەن. سەمای گوندەکانی لای ئێمە ناوی هۆرایە. خوا دەزانێ سەمای هۆرا چەندە نەجیبانە و جوانە. هەندێکی هێمن و قووڵ و مەندە وەك رووبارێکی مەند کە شکۆمەندانە بەنێو دەشتێکدا تێدەپەڕێ. هەندێکی دیکەشی توند و بەتەوژمە و بە ئاواز و مۆسیقای گشت و تۆفانی دەکرێ.

هۆرا دڵۆپێکی شادییە لە دانووبی قوڕاوی خەم و ناخۆشییەکاندا.

*

*

*

تاوێك پاش تاریکداهاتنی هەوا، زامبیلا بچکۆل خۆی دەگەیەنێتە عەمبار. بەتەنێ نەهاتووە داپیرەی لەگەڵیەتی، بەڵام لە دەرەوە لە پشت دیوارەکانی عەمبار لەسەر کۆگایەك کا خەوتووە.

پێخواسە. کەزییەکانی زۆر ورد و جوان هۆنراونەتەوە و بەسەر شانیدا بەربوونەتەوە پشتی. کراسێکی دەستچنی لەبەردایە. نێوقەدی لە ئاڵقەی تەسکی تەنوورە دێهاتییەکەیدا باریکتر دیارە. دێتە نێوەندی حەوشەکە و لە پلیکانەکان دێتە سەرێ.

ئاندرێی لێرە نییە. بەتەنێی بەجێ هێشتووم و تا بەیانییش نایەتەوە.

لە تاریکاییەکەدا گوێم لە دەنگی لێکخشانی قاچە رووتەکانی زامبیلا دەبێ کە لە پلیکانەکان دێتە سەر.

پەنجەرەکان لەسەر پشتن.

لەپی دەستم دەبرژێنەوە. روومەتم ئاگریان لێ دەبێتەوە. قوڕگم وشك بووە و زمانم وەك تەڵاشە داری لێ هاتووە. گۆزەیەکم ئاو هەڵچۆڕاندووە هێشتا زارم لەبەر وشکی دەزوورێتەوە. دەڵێی ئاگرم قووت داوە. هەر دەڵێی هەموو

گیانم ئاگری گرتووه و چیی نەماوە ببمە خۆڵەمێش. پێم سەیرە چۆنە جلەکانم ئاگر ناگرن. پێم سەیرە کە تەختەی بنی ژوورەکە چۆنە بە ئاگری بەری پێم ناسووتێ.

تارمایی زامبیلا لە نێو دەرگا نیوەکراوەکەدا دەبینم. قاقا پێدەکەنێ. ددانەکانی دەبینم کە وەك بلێسەیەك لە تاریك و ڕوونی ژوورێدا دەبریسکێنەوە. بەسەرمدا دەنووشتێتەوە و دەپرسێ:

ـ ئەوە دەترسی ئاغا؟

یەکەم جارمە لە ژیانمدا یەکێك پێم دەڵێ ئاغا.

وەڵامم داوەتەوە؟ پێم وا نییە. مەحاڵە زمانم بگەڕێ تازە پێ دەنێمە پازدە ساڵانەوە.

ـ تەمەنەت چەندە زامبیلا؟

ـ چواردە.

ـ بۆ لەگەڵ داپیرەت هاتووی؟

ـ بۆ ئەوەی تەنیا نەبم.

ـ خۆ من داوام لێ نەکردبووی بێی.

ـ خۆم حەزم لێ بوو بێم.

لەشی بۆنی گڵی لێ دێ و قژی بۆنی گیا. گیای تازە نا، گیایەکی ئاژەڵ بۆژۆی کردبێ. ئەو بۆنەوم پێخۆشترە. بۆنی گیایەك، کە هەموو گردەکەی داپۆشیوە و دوور دوور ڕۆیوە. تا ئەو چیایانەی پێم وایە دەیانناسم، بەو بایەدا کە لە دەشتەکانی بۆلگاریا و لەوبەری دانووبەوە لە چیاکانی بەلکانەوە دێ.

کازیوە، پەنجەرەکان کاڵ دەکاتەوە. سەعاتێکی دیکە تاو هەڵدێ و دیسان خۆر دەردەکەوێتەوە. ڕۆژی درێژ، ئەوەندە درێژ کە ئەقڵ نایبڕێ.

ـ دیسان دێیەوە زامبیلا؟

ـ ئەی چۆن نایەمەوە. هەر ڕێك بکەوێ دێمەوە.

ـ پەشیمانی لەوەی هاتووی؟

ئیتر بەلایەوە ئاغا نەماوم. دەڵێ:

ـ کەرە گیان، چۆن پەشیمان دەبم؟

پڵتۆکێك لە لووتم دەدا. وەی باوکەڕۆ پڵتۆك لەسەر لووت چەندە دێشێ. دەچێتە دەرێ و بەسەری پەنجە لە پلکیانەکان دەچتە خوارێ.

لە پەنجەرەکەوە دادێمەوە و بە چاو بەڕێی دەکەم. باڵابەرز و تیشکەڵە هەر دەڵێی قالۆری گوڵەبەڕۆژەیەکی بێ ڕەگ و پنجە و لە دڵی شەوەکەدا دەگەڕێ.
تاو هەڵاتووە. وەك چۆن سبەینێ هەڵدێ و دووسبەی هەڵدێ و تا دنیا دنیایە هەر هەڵدێ.
سبەی شەویش چاوەڕێی زامبیلا بووم، بەڵام نەهات. ئاندرێی دیسان بەتەنێی بەجێ هێشتم بەڵام زامبیلا نەهات.
نیوەی شەوێ دەچمە دەرێ. دەچم لە دەشتێ دەنووم.
ـ هەستە داریە، ئاغا هاتووەتە عەمبار و داوات دەکا.
ئاغا کە زۆربەی جاران روخساری سوورهەڵگەڕاوە، ئێستا ڕەنگی بە رووەوە نییە. هەموو گیانی دەلەرزێ. نەك وەك ئەوەدەمەی کۆشکەکەی سووتابێ، بگرە هێندەی وەختێك کە هەموو ملکەکەی لە قوڕگی بلێسەی ئاگردا بێ. هەرهەموو زەویوزارەکانی. تەنانەت قامیشەڵانی قۆپییەکانیشی کە ماسیگرەکان هەموو ڕۆژێ تاریکوڕوونی بەیانی دەیان عارەبانە ماسییان لێ دەگرن بۆ ئەوەی گەورەکانی لە بازاڕی شار بفرۆشێ و وردەکانیشی بدا بە دۆم و کرێکار و خزمەتکارەکانی بیخۆن. خواردنی من و ئاندرێش لەو ڕۆژەوە کە بووینەتە خزمەتکاری ئاغا چاوشووشەییەکەمان، هەر ئەو وردەماسیانەیە.
لێم دەپرسێ:
ـ تۆ قەت چوویەتە بوخارێست؟
ـ نەخێر، قەت قەت.
ـ تۆ دەتوانی بەڕەی خۆت لە ئاوێ دەرکێشی. دەبێ هەستی بچیتە بوخارێست. ئەم نامەیە دەبەیە ئەو ناونیشانەی لەسەری نووسراوە. دەیدەیە دەستی ئەو خانمەی ناوەکەی لەسەر ئەم دەفری نامەیە نووسراوە. خاتوون، گالیسکەیەك دەگرێ و دێتە ئێرە، تۆش لەگەڵی دێیەوە. ئاگات لێ بێ نامەکە بزر نەکەی.
ـ کەی دەبێ بکەومە ڕێ؟
ـ هەر ئێستا.
ـ بە ئەسپ؟
ـ نا. هەتا گیۆرگیۆ بە قایق دەچی و لەوێ سواری شەمەندەفەر دەبی.
ـ کێ دەمباتە گیۆرگیو؟
ـ لە دەم دانووب گەمییەك چاوەڕێتە. گەمیەوانەکە پیاوێکی متمانەپێکراوی خۆمە.
نامەکەم دەداتێ و منیش لە بن کراسەکەمەوە لەسەر سینگمی توند دەکەم.
ئاغا ڕوودەکاتە ئاندرێ و دەڵێ:

ـ هەتا دانووب بەڕێی بکە. جێی گەمییەکە دەزانی؟ ئەسپەکەشی دێنیتەوە عەمبار.

ڕێك سەیری نێو چاوم دەکا:

ـ دەبێ بە سێ ڕۆژ بچی و بێیەوە.

ـ بەچاوان.

بەڵام لە دڵی خۆمدا دەڵێم: "هەڵبەت ئەگەر رەخسا." لە پڕ بە مێشکمدا دێ: "دیارە ئەگەر حەزم لێ بوو بێمەوە."

ئاغا پێنج لەییم بۆ خەرجی سەفەرەکە دەداتێ. سەرم لە دەڵاواییەکەی سوورِ دەمێنێ.

ـ ئامادەی؟

ـ ئامادەم.

سوار دەبین و وەڕێ دەکەوین. ئاغا تاوێك لەگەڵمان دێ و دوایی بای دەداتەوە بەرەو لای ڕاست و جارێکی دیکە سەرێکی ماڵ و سامانەکەی دەداتەوە: گەنمە گوڵپڕەکان کە چاوەڕێی دروێنەن، جۆ و جۆڕەشە و گەنمەشامی و کێڵگەی چڕی گوڵەبەڕۆژە.

بێت و زەوییەکە بەهێز بێ، گەنمەکە دەگاتە بەر زگی ئەسپ. گوڵەبەڕۆژە لەوەش بەرزتر هەڵدەستێ.

کە خۆر هەڵدێ، گوڵەبەڕۆژە ڕوو لە خۆرهەڵات دەکەن. نیوەڕوان ڕێك ڕوو لە ئاسمان دەکا و ئێوارانیش ڕووی لە لای زەردەپەڕە. هەر قالۆرە و چاوێکی خڕی زەردی هەیە کە مژۆڵی درێژ و کەسکن. کێڵگەی گوڵەبەڕۆژەکە بە هەزاران هەزار چاوەوە، هەر لە کەڕەی بەیانییەوە تا ئێوارە چاو دەبڕێتە چاوە خڕ و زەردەکانی خۆرەتاو...

گوڵەبەڕۆژە، خۆیشی وەك هەتاو وایە.

کێڵگەی گەنم لەبەر دەم شنەباکە کەروێشکە دەکا.

ئەسپ بە چوارناڵە دەڕۆن.

ئاندرێی لە من دڕدۆنگە.

ـ باشە ئەوە چۆنە ئەو ئیبلیسە تۆی نارد؟ بۆ منی نەنارد؟ ئاخ چەندەم حەز لێ بوو دەورێکی بوخارێست لێ بدەم.

ـ تا ئێستا قەت چووی؟

ـ ئەی چۆن. جارێکیش نا، دوو جار. جارێك لەگەڵ باوکم چووبووم خوشکەکانم بنێینە بەر خوێندن.

لە دەشتەکەوە دادەگەڕێین. دانووب نزیکە. مێشەیەك کەوتووەتە نێوان ئێمە و دانووبەوە. بە بزنەڕێیەکدا کە بە مێشەکەدا کشاوە، تێدەپەڕین. چڵوکەکان وەدەموچاو و سەر و شانمان دەکەون.

ئەسپەکان بە نەرمەغار دەڕۆن.

دانووب یان شەپۆلە ئالۆزەکانی هێمن تێدەپەڕێ. ڕووناکایی بەرەبەیان لەسەر دانووب دەشکێتەوە.

ئاوەکان، مێشەڵانەکان، کێڵگەکان...

پیاوێك لە تەنیشت گەمییەکەوە ڕاوەستاوە و سەبیلە دەکێشێ و دووکەڵەکەی بە لووتیدا دێنێتەوە دەرێ.

کوڕێژگەیەکی لە تەنیشت ڕاوەستاوە. لە من کەڵەگەتتر بەڵام لاوازتر و لەمنیش ڕەنگبزڕکاوترە. لە گەڕانەوەدا پێدەچێ سەوڵ لەگەڵ باوکی لێ بدا.

ـ سڵاو مام ئۆپریکۆ.

گەمییەوان لە بن لێوانەوە ورتەورتێکی دێ. وێناچێ کابرایەکی زۆربڵێ بێ.

ـ ئەو پیاوە دەبەیە گیۆرگیۆ.

ـ سوار بە.

ماڵاوایی لە ئاندرێی دەکەم. ڕەشمەی ئەسپەکەی دەدەمێ و سواری گەمییەکە دەبم.

ئاو لە بنەبانی گەمییەکەدا دەبریسکێتەوە. لەسەر تەختەکە ئاگام لەخۆمە پێم تەڕ نەبن.

گەمییەوانە ڕیشنەکە بەبێ ئەوەی سەبیلەکەی لە زاری بکاتەوە، ڕووبەڕووم دادەنیشێ و سەوڵ لێ دەدا بۆ ئەوەی گەمییەکە لە بەستێن دوور بخاتەوە و دواییش چەند جاران بەهێزەوە سەوڵ لێ دەدا تا دەگەینە نێوەڕاست ئاوەکە.

ئێستا ئیتر کەوتووینە گەڵ لووزەوی ئاوەکە. تەنیا دەبێ سەوڵ لێ بدرێ و پارسەنگی ڕابگیرێ.

گەمییەکە بەدەم ئاوەکەوە دەڕواتە پێش. لەسەرخۆ دەچێتە پێش.

ئاسمانی بەرەبەیان بەژوور سەرمانەوەیە. بەستێنی پڕ لە داری بی، بە لەرەلەری گەڵا و قاوقیژی تەیروتوور بە پێشوازی بەیانییەوە دەچێ.

دانووب لە نزیکەوە زەردێکی لیمۆییە.

دەستم لە ئاوەکە دەنێم. ساردە، سارد و قوڕاوی.

گەمییەکە هەروا بەرەو پێش دەکشێ. بە بەر ئاواییەکاندا دەڕوا و یەك بە یەك مێشەڵانەکان جێ دێڵێ.

دانووب دەڕوا.

گەمییەکە دەڕوا.

گەمییەوانە ڕیشنەکە بێجووڵە دانیشتووەو مژ لە سەبیلەکەی دەدا.

ـ پێت وایە کەی دەگەینە گیۆرگیۆ مامە ئۆریکۆر؟

ـ لای عەسرێ.

خۆر لە نێوەندی ئاسمانە و هەرچی هەیە لە تیشکەکەیدا نوقمە: ئاو و مێشە و جەنگەڵەکان... و

